# سُنَنُ النَّسَائِي

## بەکوردی

للإمام أحمد بن شعيب أبو عبد الرحمن النسائي

بەرگی سێیەم

وەرگێرانی

عباس محمد أمين

حوکمی فەرموودەکان وەرگیراوە لە

الشيخ محمد صبحي بن حسن حلاق




# سُنَنُ النَّسَائِيِّ

## بەکوردی

نووسینی: **الإمام أحمد بن شعیب أبو عبد الرحمن النسائي**

وەرگێڕانـــی : **عـــباس محـــمد أمین**

دیزاینی ناوەوە : **زەردەشـت کاوانی**

خـەتی بـەرگ : **نـــەوزاد کۆیـــی**


چـاپـی یەکـەم : **١٤٤٢ك - ٢٠٢١ز**

٦٢٧ **لاپـــــەڕە**

١٧ * ٢٤ **ســــم**

بابـەت : **ئـاییني**

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان

ژمارە سپاردنی ( ٨٢٧ ) ی ساڵی ٢٠٢٠ پێدراوە











نووسینی

الإمام أحمد بن شعيب أبو عبد الرحمن النسائي

وەرگێڕان

عـباس محـمد أمـين

## ڕێزو پیرۆزی حەرەم

**٢٨٧٧-** «عَن أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ قَالَ رَسُول اللَّهِ ﷺ يَغْزُو هَذَا الْبَيْتَ جَيْشٌ فَيُخْسَفُ بِهِمْ بِالْبَيْدَاءِ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوپاو لەشکر پەلاماری ئەم بەیتە ئەدەن (خوا ﷻ) هەموویان دەخاتە ناخی زەویدا لە (الْبَيْدَاء) کە شوێنێکی تایبەتە لە (ذي الحُلَيْفة).**

**٢٨٧٨-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبيِّ ﷺ قَالَ: لَا تَنْتَهِي الْبُعُوثُ عَنْ غَزْوِ هَذَا الْبَيْتِ حَتَّى يُخْسَفَ بِجَيْشٍ مِنْهُم»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: سوپا و لەشکرەکان کۆتاییان پێنایەت لە پەلاماردانی ئەم بەیتە کە کەعبەیە تا خوا ﷻ هەندێکیان نەخاتە ناخی زەویەوە.**

**٢٨٧٩-** «عَنْ حَفْصَةَ بِنْتِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَتْ: قَالَ رَسُول اللَّهِ ﷺ يُبْعَثُ جُنْدٌ إلى هَذَا الْحَرَمِ فَإِذَا كَانُوا بِبَيْدَاءَ مِنَ الأَرْضِ خُسِفَ بِأَوَّلِهِمْ وَآخِرْهِم وَلَمْ يَنْجُ أَوْسَطُهُمْ، قُلْتُ: أَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ فِيهِمْ مُؤْمِنُونَ، قَالَ: تَكُونُ لَهُمْ قُبُوراً»[٣].

**واتە: حەفصەی کچی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سوپا دەنێردرێت بۆ ئەم حەرەمە کە کەعبەیە، کاتێ لە (بَيْدَاء) دەبن لەو زەویە، خوا ﷻ سەرەتاو کۆتاییان دەخاتە ناخی زەویەوە، نێوەڕاستیشیان ڕزگاری نابێ، وتم: ئەی ئەگەر بڕواداریان تێدا بوو، فەرمووی: ئەو شوێنە دەبێتە گۆڕ بۆیان.**

**٢٨٨٠-** «عَنْ حَفْصَةُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّهُ قال ﷺ لَيَؤُمَّنَّ هذا الْبَيْتَ جَيْشٌ يَغْزُونَهُ حَتَّى إِذَا كَانُوا بِبَيْدَاءَ مِنَ الأَرْضِ خُسِفَ بِأَوْسَطِهِمْ فَيُنَادِي أَوَّلُهُمْ وأخرهم فَيُخْسَفُ بِهِمْ جَمِيْعَاً، وَلاَ يَنْجُو إلاَّ الشَّرِيدُ الَّذِي يُخْبِرُ عَنْهُمْ»[٤].

---

(١) حسن صحيح.
(٢) صحيح.
(٣) منكر. أخرجه مسلم: ٦ و ٢٨٨٣/٧، وإبن ماجه: ٤٠٦٣.
(٤) صحيح.




**واتە: حەفصە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: سوپایەک نیازی پەلاماردانی ئەم بەیتە دەکەن کە کەعبەیە، تا هەموویان لە زەویەک کۆدەبنەوە بەناو (بَيْدَاء)، خوا ﷻ نێوەڕاستیان دەخاتە ناخی زەویەوە یەکەمین و دوایینیان هاوار دەکەن ئەوانیش هەموویان ڕۆدەچن بەناو زەویدا، هیچ یەکێکیان ڕزگاری نابێت تەنها ئەکەسە نەبێ ڕایکردوە و هەواڵیان لەبارەوە دەدات.**

## ئەوەی دەکوژرێ لە حەرەمدا لە گیاندارەکان

**٢٨٨١-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: خَمْسُ فَوَاسِقَ يُقْتَلْنَ فِي الْحِلِّ وَالْحَرَمِ: الْغُرَابُ وَالْحِدَأَةُ وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ وَالْعَقْرَبُ وَالْفَأْرَةُ»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێنج دەعبا هەن ئازار دەرن دەکوژرێن لە غەیری حەرەم و حەرەمیشدا: قەلەڕەش و کۆلارەو سەگی هارو دووپشک و مشک.**

## کوشتنی مار لە حەرەمدا

**٢٨٨٢-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: خَمْسُ فَوَاسِقَ يُقْتَلْنَ فِي الْحِلِّ وَالْحَرَمِ الْحَيَّةُ وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ وَالْغُرَابُ الأَبْقَعُ وَالْحِدَأَةُ وَالْفَأْرَةُ»[٢].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێنج دەعبا هەن هەموویان زیان بەخشن دەکوژرێن لە غەیری حەرەم و حەرەمیشدا: مارو سەگی هارو ئەو قەلەڕەشەی پەڵەی سپی لەسەر پشتێتی یان لەسەر سنگێتی، کۆلارەو مشک.**

**٢٨٨٣-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِالْخَيْفِ مِنْ مِنًى حَتَّى نَزَلَتْ وَالْمُرْسَلَاتِ عُرْفًا فَخَرَجَتْ حَيَّةٌ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ اقْتُلُوهَا فَابْتَدَرْنَاهَا فَدَخَلَتْ فِي جُحْرِهَا»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨٣٠ و ٣٣١٧ و ٤٩٣٠ و ٤٩٣١ و ٤٩٣٤، ومسلم: ٢٢٣٤ و ٢٢٣٥.




واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین لە (الْخَيْف) لە مینا، تا (وَالْمُرْسَلَاتِ عُرْفاً) دابەزیە خوارەوە، مارێک دەرچوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بیکوژن، ئێمەش پەلەمان کرد لە کوشتنی چووە ناو کونەکەیەوە.

**٢٨٨٤-** «عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَيْلَةَ عَرَفَةَ الَّتِي قَبْلَ يَوْمِ عَرَفَةَ، فَإِذَا حِسُّ الْحَيَّةِ فَقَالَ رَسُول اللَّهِ ﷺ: اقْتُلُوهَا فَدَخَلَتْ شَقَّ جُحْرٍ، فَأَدْخَلْنَا عُوداً، فَقَلَعْنَا بَعْضَ الْجُحْرِ فَأَخَذْنَا سَعَفَةً فَأَضْرَمْنَا فيها نَاراً، فَقَالَ رَسُول اللَّهِ ﷺ وَقَاهَا اللَّه شَرَّكُمْ وَوَقَاكُمْ شَرَّهَا»[١].

واتە: ئەبو عوبەیدە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین لە شەوی عەرەفە پێش ڕۆژی عەرەفە، لە ناکاو خشەی مار هات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بیکوژن، مارەکە چووە ناو کونێکەوە، ئێمەش دارێکمان کردە کونەکەدا، هەندێ لە کونەکەمان هەڵکەند، پاشان گەڵای دارخورمامان تەپانە ناو کونەکەوەو ئاگرمان تێبەردا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوا ئەوی پاراست لە شەڕی ئێوە، ئێوەشی پاراست لە شەڕی ئەو.

## كوشتنی مارمێلكە

**٢٨٨٥-** «عَنْ أُمِّ شَرِيكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: أَمَرَنِي رَسُول اللَّهِ ﷺ بِقَتْلِ الْأَوْزَاغِ»[٢].

واتە: دایکی شەریک (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردم بە کوشتنی مارمێلکەکان.

**٢٨٨٦-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: الْوَزَغُ الْفُوَيْسِقُ»[٣].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مارمێلکە زیانبەخشە.

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٣٠٧ و ٣٣٥٩، ومسلم: ١٤٢ و ٢٢٣٧/١٤٣، وإبن ماجه: ٣٢٢٨.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨٣١ و ٣٣٠٦، ومسلم: ٢٢٣٩، وإبن ماجه: ٣٢٣٠.



## بەشی کوشتنی دووپشک، کۆلاژدم، دەمارە کوڵە

**٢٨٨٧-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ النَّبِيّ ﷺ خَمْسٌ مِنَ الدَّوَابِّ كُلُّهُنَّ فَاسِقٌ يُقْتَلْنَ فِي الْحِلِّ وَالْحَرَمِ: الْكَلْبُ الْعَقُورُ وَالْغُرَابُ وَالْحِدَأَةُ وَالْعَقْرَبُ وَالْفَأْرَةُ»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پێنج دەعبا هەن هەموویان زیانبەخشن دەکوژرێن لە غەیری حەرەم و حەرەمیشدا: سەگی هارو قەلەڕەش و کۆلارەو دووپشک و مشک.**

## کوشتنی مشک لە حەرەم دا

**٢٨٨٨-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: قَالَ رَسُول اللَّهِ ﷺ خَمْسٌ مِنَ الدَّوَابِّ كُلُّهَا فَاسِقٌ يُقْتَلْنَ فِي الْحَرَمِ: الْغُرَابُ وَالْحِدَأَةُ وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ وَالْفَأْرَةُ وَالْعَقْرَبُ»[٢].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێنج دەعبا هەن هەموویان زیانبەخشن دەکوژرێن لە حەرەمدا: قەلەڕەش و کۆلارەو سەگی هارو مشک و دووپشک.**

**٢٨٨٩-** «عَنْ حَفْصَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا زَوْجُ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ رَسُول اللَّهِ ﷺ خَمْسٌ مِنَ الدَّوَابِّ لَا حَرَجَ عَلَى مَنْ قَتَلَهُنَّ: الْعَقْرَبُ وَالْغُرَابُ وَالْحِدَأَةُ وَالْفَأْرَةُ وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ»[٣].

**واتە: حەفصە (خوا لێی ڕازی بێ) خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێنج دەعبا هەن هەر کەس بیانکوژێ گوناهبار نابێ: دووپشک و قەلەڕەش و کۆلارەو مشک و سەگی هار.**

## کوشتنی کۆلارە لە حەرەم دا

**٢٨٩٠-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: خَمْسُ فَوَاسِقَ يُقْتَلْنَ فِي الْحِلِّ وَالْحَرَمِ: الْحِدَأَةُ وَالْغُرَابُ وَالْفَأْرَةُ وَالْعَقْرَبُ وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ»[٤].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨٢٧ و ١٨٢٨، ومسلم: ٧٣ و ٧٤ و ١٢٠٠/٧٥.

(٤) صحيح.




**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێنج دەعبا هەن هەموویان زیانبەخشن دەكوژرێن لە غەیری حەرەم و حەرەمیشدا: كۆلارە و قەڵەڕەش و مشک و دووپشک و سەگی هار).**

## كوشتنی قەلەڕەش لە حەرەم دا

**٢٨٩١-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُول اللَّهِ ﷺ خَمْسُ فَوَاسِقَ يُقْتَلْنَ في الْحَرَمِ الْعَقْرَبُ وَالْفَأْرَةُ وَالْغُرَابُ وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ وَالْحِدَأَةُ»[1].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێنج دەعبا هەن هەموویان زیانبەخشن دەكوژرێن لە حەرەمدا: دووپشک و مشک و قەەلەڕەش و سەگی هار و كۆلارە.**

## قەدەغە كردنی فڕاندن و تاراندنی نێچیری حەرەم

**٢٨٩٢-** «عَنِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: هَذِهِ مَكَّةُ حَرَّمَهَا اللَّهُ ﷻ يَوْمَ خَلَقَ السماوات وَالْأَرْضَ، لم تَحِلَّ لِأَحَدٍ قَبْلِي ولا لِأَحَدٍ بَعْدِي، وَإِنَّمَا أُحِلَّتْ لي سَاعَةً من نَهَارٍ، وَهِيَ سَاعَتِي هذه حَرَامٌ بِحَرَامِ اللَّهِ إلى يَوْمِ الْقِيَامَةِ لَا يختلي خَلَاهَا ولا يُعْضَدُ شَجَرُهَا ولا يُنَفَّرُ صَيْدُهَا ولا تَحِلُّ لُقَطَتُهَا إلا لِمُنْشِدٍ فَقَامَ الْعَبَّاسُ وكان رَجُلاً مُجَرِّباً فَقَالَ: إلاَّ الْإِذْخِرَ، فَإِنَّهُ لِبُيُوتِنَا وَقُبُورِنَا، فَقَالَ: إلاَّ الْإِذْخِرَ»[2].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەم مەككەیە خوا قەدەغەی كردوە لەو ڕۆژەی ئاسمانەكان و زەوی دروست كردوە، پێش من بۆ هیچ كەس حەلاڵی نەكردوە (تیایدا بجەنگێ)، هەروەها بۆ دوای منیش بۆ كەس حەلاڵی نەكردوە، بەڵكو بۆ من حەلاڵی كردوە ساتێک (بجەنگم) لە ڕۆژدا، ئەویش ئەم دوو ساتە بوو، (مەبەستی ئازاد كردنی مەككەیە) ئەمە قەدەغەكراوە، چونكە خوا قەدەغەی كردوە تا ڕۆژی دوایی، ڕووەكەكانی هەڵناكەنرێن، دارەكانی نابڕدرێن و نێچیرەكانی دەربەدەر ناكرێن، دۆزراوەكانیشی**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٤٩ و ١٨٣٣ و ٢٠٩٠.





حەڵاڵ نیە، گەر بۆ کەسێک پێناسەی بکات، عەبباس هەڵسا پیاوێکی خاوەن ئەزمون بوو، وتی: جگە لە (إذْخر) چونکە ئەوە بەکاردێنین بۆ ناو ماڵەکانمان و گۆڕەکانمان، فەرمووی: جگە لە (إِذْخِر).

## پێشوازی کردنی حەج

**٢٨٩٣-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: دَخَلَ النَّبيّ ﷺ مَكَّةَ في عُمْرَةِ الْقَضَاءِ وبن رَوَاحَةَ بين يَدَيْهِ يَقُولُ: خَلُوا بَنِي الْكُفَّارِ عَنْ سَبِيلِهِ، الْيَوْمَ نَضْرِبْكُمْ على تَأْوِيلِهِ، ضَرَباً يُزِيلُ الْهَامَ عن مَقِيلِهِ وَيُذْهِلُ الْخَلِيلَ عن خَلِيلِهِ، قَالَ: عُمَرُ يا بن رَوَاحَةَ في حَرَمِ اللَّهِ وَبَيْنَ يَدَيْ رسول اللَّهِ ﷺ، تَقُولُ: هَذَا الشِّعْرَ، فَقَالَ النَّبيّ ﷺ: خَلِّ عَنْهُ فَوَالَّذِي نَفْسِي بيَدِهِ لَكَلَامُهُ أَشَدُّ عليهم من وَقْعِ النَّبْلِ»[١].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هاتە مەککە بۆ قەزا کردنەوەی عومرەی ساڵی حودەیبیە کە ڕێگری لێکرا، عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە بە بەردەمەیدا دەهات و دەڕۆی و دەیوت: بێبڕوایان با ڕێگای بەردەمی چۆڵ بکەن، ئەمڕۆ لێتان دەدەین تا دادەبەزینە مەککە. لێدانێک سەر لە گەردن جیا دەکاتەوە، خۆشەویست لە خۆشەویست جیا دەکاتەوە، عومەر وتی: ئەی کوڕی ڕەواحە لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و لە حەرەمی خوادا شیعر دەڵێی! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڕاستی ئەو شیعرە کاریگەر ترە لەسەر دڵیان لە تیر باران کردن.

**٢٨٩٤-** «عَنِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبيّ ﷺ لَمَّا قَدِمَ مَكَّةَ اسْتَقْبَلَهُ أُغَيْلِمَةُ بَنِي هَاشِمٍ، قَالَ: فَحَمَلَ وَاحِداً بين يَدَيْهِ وَآخَرَ خَلْفَهُ»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ کاتێ هاتە مەککە هەندێ منداڵی نەوەکانی هاشم پێشوازیان لێ کرد، وتی: دانەیەکیانی خستە باوەشیەوە و ئەوی تر لە پشتی.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٧٩٨ و ٥٩٦٥ و ٥٩٦٦.

## وازهێنان لە دەست بەرز کردنەوە لە کاتی بینینی بەیت

**٢٨٩٥-** «عَنِ الْمُهَاجِرِ الْمَكِّيِّ قال: سُئِلَ جَابِرُ بن عبد اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَنِ الرَّجُلِ يَرَى الْبَيْتَ أَيَرْفَعُ يَدَيْهِ، قَالَ: مَا كُنْتُ أَظُنُّ أَحَداً يَفْعَلُ هَذَا إِلاَّ الْيَهُودَ حَجَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَلَمْ نَكُنْ نَفْعَلُهُ»[١].

واتە: موهاجیری مەککی دەڵێ: پرسیار کرا لە جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەربارەی پیاوێک بەیتی دەبینێ، ئایا دەستی بەرز بکاتەوە، وتی: کەسم نەبینیوە ئەمە بکات جگە لە جولەکە، (ئەوان دەستیان بەرز دەکردەوە بۆ لە ناو چوونی، وە بۆ بەکەمدانانی، چونکە ئەوان دوژمنی سەرسەختی بەیت بوون)، لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ حەجمان کرد ئەوەمان نەدەکرد.

## پاڕانەوە لە کاتی بینینی بەیت

**٢٨٩٦-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَن بْن طَارِقِ بن عَلْقَمَةَ أَخْبَرَهُ، عَنْ أُمِّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبيَّ ﷺ كَانَ إِذَا جَاءَ مَكَاناً في دَارِ يَعْلَى اسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ وَدَعَا»[٢].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی طاریقی کوڕی عەلقەمە هەواڵی پێدا، لە دایکیەوە (خوا لێی ڕازی بێ)، پێغەمبەر ﷺ کاتێ بچوایەتە شوێنێکی بەرز ڕووی دەکرد قیبلە و دەپاڕایەوە.

## فەزڵ و چاکەی نوێژ لە مزگەوتی حەرام

**٢٨٩٧-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: صَلاَةٌ في مَسْجِدِي أَفْضَلُ مِنْ أَلْفِ صَلاَةٍ فِيمَا سِوَاهُ مِنَ الْمَسَاجِدِ إِلاَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ»[٣].

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٨٧٠، والترمذي: ٨٥٥.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٠٠٧.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٣٩٥، وإبن ماجه: ١٤٠٥.

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو فەرمووی: نوێژێک لە مزگەوتەکەمدا چاکترە لە هەزار نوێژی مزگەوتەکانی تر، جگە لە مزگەوتی حەرام.**

**٢٨٩٨-** «عَنْ مَيْمُونَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا زَوْجِ النبي ﷺ قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يقول صَلَاةٌ في مَسْجِدِي هَذَا أَفْضَلُ مِنْ أَلْفِ صَلَاةٍ فِيمَا سِوَاهُ مِنَ الْمَسَاجِدِ إلاَّ الْمَسْجِدَ الْكَعْبَةَ»[١].

**واتە: مەیمونە (خوا لێی ڕازی بێ) خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: نوێژێک لەم مزگەوتەمدا چاکترە لە هەزار نوێژی مزگەوتەکانی تر، جگە لە مزگەوتی کەعبە.**

**٢٨٩٩-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يحدث، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ صَلَاةٌ في مَسْجِدِي هَذَا أَفْضَلُ مِنْ أَلْفِ صَلَاةٍ فِيمَا سِوَاهُ مِنَ الْمَسَاجِدِ إلاَّ الْكَعْبَةَ»[٢].

**واتە: ئەبو هوەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نوێژێک لەم مزگەوتەمدا چاکترە لە هەزار نوێژی مزگەوتەکانی تر، جگە لە کەعبە.**

## بونیادنانی کەعبە

**٢٩٠٠-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَلَمْ تَرَيْ أَنَّ قَوْمَكِ حِينَ بَنَوْا الْكَعْبَةَ اقْتَصَرُوا عَنْ قَوَاعِدِ إِبْرَاهِيمَ عَلَيْهِ السَّلَامُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلَا تَرُدُّهَا عَلَى قَوَاعِدِ إِبْرَاهِيمَ عَلَيْهِ السَّلَامُ؟ قَالَ: لَوْلَا حِدْثَانُ قَوْمِكِ بِالْكُفْرِ، قَالَ: عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ لَئِنْ كَانَتْ عَائِشَةُ سَمِعَتْ هَذَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، مَا أُرَى تَرْكَ اسْتِلَامِ الرُّكْنَيْنِ اللَّذَيْنِ يَلِيَانِ الْحِجْرَ إِلَّا أَنَّ الْبَيْتَ لَمْ يُتَمَّمْ عَلَى قَوَاعِدِ إِبْرَاهِيمَ عَلَيْهِ السَّلَامُ»[٣].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئایا نەتبینیوە قەومەکەت کە قورەیشە کاتێ کەعبەیان بونیاد نایەوە لەسەر بنچینەی**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٩٠، ومسلم: ٥٠٥ و ١٣٩٤/٥٠٨، والترمذي: ٣٢٥ و ٣٩١٦، وإبن ماجه: ١٤٠٤.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٨٣ و ٣٣٦٨ و ٤٤٨٤، ومسلم: ٣٩٩ و ١٣٣٣/٤٠٠.




خۆی دروستیان نەکردەوەو ڕووبەرەکەیان کەم کردەوە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا نایگەڕێنیتەوە بۆ ئەو شوێنەی کە ئیبڕاهیم دروستی کردبوو، فەرمووی: ئەگەر قەومەکەت لەسەردەمی کوفرەوە نزیک نەبوایەن، (مەبەستی ئەوە بوو ئیسلام هێشتا جێگیر نەبووە لە دڵیاندا) عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەڵێ: ئەگەر عائیشە ئەمەی بیستبێ لە پێغەمبەری خوا ﷺ، پێم وانیە وازی لە دەست لێدانی ئەو دوو ڕوکنە هێنابێ کە لە نزیکی حیجرن، ئەوە نەبێ کەعبە لەسەر شێوەی دروست کردنی ئیبڕاهیم دروست نەکرایەوە.

**٢٩٠١-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَوْلَا حَدَاثَةُ عَهْدِ قَوْمِكِ بِالْكُفْرِ، لَنَقَضْتُ الْبَيْتَ فَبَنَيْتُهُ عَلَى أَسَاسِ إِبْرَاهِيمَ عَلَيْهِ السَّلَامُ، وَجَعَلْتُ لَهُ خَلْفاً فَإِنَّ قُرَيْشاً لَمَّا بَنَتِ الْبَيْتَ اسْتَقْصَرَتْ»[1].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر قەومەکەت لەسەردەمی کوفرەوە نزیک نەبووایەن، ئەوە کەعبەم تێک دەدا و لەسەر شێوەی ڕاستەقینەی ئیبڕاهیم دروستم دەکردەوە، دەرگایەکیشم لە پشتیەوە بۆی دروست دەکرد، چونکە قورەیش کاتێ دروستیان کردەوە ڕووبەرەکەیان کەم کردەوە.**

**٢٩٠٢-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَوْلَا أَنَّ قَوْمِي «وَفِي حَدِيثِ مُحَمَّدٍ قَوْمَكِ»، حَدِيثُ عَهْدٍ بِجَاهِلِيَّةٍ لَهَدَمْتُ الْكَعْبَةَ، وَجَعَلْتُ لَهَا بَابَيْنِ، فَلَمَّا مَلَكَ ابْنُ الزُّبَيْرِ، جَعَلَ لَهَا بَابَيْنِ»[2].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر قەومەکەم «لە فەرموودەی موحەممەد هاتووە: قەومەکەت» لە سەردەمی نەفامیەوە نزیک نەبوایەن، ئەوە کەعبەم دەڕوخاند و دوو دەرگام لێ دەکردەوە، کاتێ ئیبنو زوبەیر دەسەڵاتی گرتە دەست دوو دەرگای لێکردەوە.**

**٢٩٠٣-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ لَهَا: يَا عَائِشَةُ لَوْلَا أَنَّ قَوْمَكِ حَدِيثُ عَهْدٍ بِجَاهِلِيَّةٍ، لَأَمَرْتُ بِالْبَيْتِ، فَهُدِمَ فَأَدْخَلْتُ فِيهِ مَا أُخْرِجَ مِنْهُ، وَأَلْزَقْتُهُ بِالْأَرْضِ، وَجَعَلْتُ لَهُ بَابَيْنِ: بَاباً شَرْقِيّاً، وَبَاباً غَرْبِيّاً، فَإِنَّهُمْ قَدْ عَجَزُوا عَنْ بِنَائِهِ، فَبَلَغْتُ بِهِ أَسَاسَ إِبْرَاهِيمَ عَلَيْهِ السَّلَامُ قَالَ: فَذَلِكَ

---

**(١) صحيح.**

**(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٦ و ١٥٨٤ و ٧٢٤٣، ومسلم: ٤٠٥ و ١٣٣٣/٤٠٦، والترمذي: ٨٧٥، وإبن ماجه: ٢٩٥٥.**

الَّذِي حَمَلَ ابْنَ الزُّبَيْرِ عَلَى هَدْمِهِ قَالَ يَزِيدُ: وَقَدْ شَهِدْتُ ابْنَ الزُّبَيْرِ حِينَ هَدَمَهُ وَبَنَاهُ، وَأَدْخَلَ فِيهِ مِنَ الْحِجْرِ وَقَدْ رَأَيْتُ أَسَاسَ إِبْرَاهِيمَ عَلَيْهِ السَّلَامُ حِجَارَةً كَأَسْنِمَةِ الْإِبِلِ مُتَلَاحِكَةً»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئەگەر قەومەکەت لەسەردەمی نەفامی نزیک نەبوایەن، فەرمانم دەکرد بەیت بڕوخێنرایە، ئەوەی دەرکراوە لێی دەمخستەوە ناوی و دەم نوساند بەزەویەوە، دوو دەرگاشم لێ دەکردەوە: دەرگایەک لە خۆرهەڵات دەرگایەک لە خۆرئاوا، ئەوان نەیانتوانی وەکو خۆی دروستی بکەنەوە، دەمگەیاند بەو بنەڕەتەی کە ئیبڕاهیم بۆی دانابوو دەڵێ: ئەمە وای کرد لە ئیبنو زوبەیر بیڕوخێنێ، یەزید وتی: بینیم ئیبنو زوبەیر کاتێ ڕوخاندی و دروستی کردەوە گەیاندنی بە بنەڕەتی ئیبڕاهیم، خۆم بنەڕەتەکەی ئیبڕاهیمم بینی بەردێک بوو وەکو سمی وشتر وابوو تێکەڵی یەکتر بوو.**

**٢٩٠٤-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يُخَرِّبُ الْكَعْبَةَ ذُو السُّوَيْقَتَيْنِ مِنَ الْحَبَشَةِ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کەسێک کەعبە دەڕوخێنێ خاوەن دوو لاقی بچوکە لە حەبەشە.**

## چوونە ناوەوەی بەیت

**٢٩٠٥-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ انْتَهَى إِلَى الْكَعْبَةِ وَقَدْ دَخَلَهَا النَّبِيُّ ﷺ وَبِلَالٌ، وَأُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ، وَأَجَافَ عَلَيْهِمْ عُثْمَانُ بْنُ طَلْحَةَ الْبَابَ فَمَكَثُوا فِيهَا مَلِيّاً، ثُمَّ فَتَحَ الْبَابَ، فَخَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ، وَرَكِبْتُ الدَّرَجَةَ، وَدَخَلْتُ الْبَيْتَ فَقُلْتُ: أَيْنَ صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ؟ قَالُوا: هَا هُنَا، وَنَسِيتُ أَنْ أَسْأَلَهُمْ كَمْ صَلَّى فِي الْبَيْتِ»[٣].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: ئەو ڕۆیشت بۆ لای کەعبە، پێغەمبەر چوو بووە ناویەوە لەگەڵ بیلال و ئوسامەی کوڕی زەید، عوسمانی کوڕی طەڵحە دەرگاکەی لێگرتن ماوەیەکی زۆر تیایدا مانەوە، پاشان دەرگاکەی کردەوە، پێغەمبەر ﷺ دەرچوو منیش بە پلەکانەکاندا سەرکەوتم، وتم:**

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٨٥ و ١٥٨٦، ومسلم: ١٣٣٣/٣٩٨..

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٩١ و ١٥٩٦، ومسلم: ٥٧ و ٥٨ و ٢٩٠٩/٥٩..

(٣) صحيح.

پێغەمبەر ﷺ لە کوێدا نوێژی کرد؟ وتیان: لێرەدا، بیرم چوو پرسیاریان لێ بکەم لە ناو کەعبە چەند نوێژی کرد.

**٢٩٠٦-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْبَيْتَ وَمَعَهُ الْفَضْلُ بْنُ عَبَّاسٍ وَأُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ وَعُثْمَانُ بْنُ طَلْحَةَ وَبِلَالٌ فَأَجَافُوا عَلَيْهِمُ الْبَابَ، فَمَكَثَ فِيهِ مَا شَاءَ اللَّهُ، ثُمَّ خَرَجَ قَالَ ابْنُ عُمَرَ: كَانَ أَوَّلُ مَنْ لَقِيتُ بِلَالاً قُلْتُ: أَيْنَ صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ؟ قَالَ: مَا بَيْنَ الْأُسْطُوَانَتَيْنِ»[1].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ چووە ناو کەعبەوە، فەزڵی کوڕی عەبباس و ئوسامەی کوڕی زەیدو عوسمانی کوڕی طەڵحە و بیلالی لەگەڵ بوو، دەرگاکەیان لەسەر خۆیان داخست، مایەوە تیایدا ئەوەندەی خوا ویستی لەسەر بوو، پاشان دەرچوو، ئیبنو عومەر وتی: یەکەم کەس پەیوەندیم پێیەوە کرد بیلال بوو، وتم: پێغەمبەر ﷺ لە کوێدا نوێژی کرد؟ وتی: لە نێوان هەردوو پایەکەدا.**

## شوێنی نوێژ کردن لە ناو بەیت

**٢٩٠٧-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْكَعْبَةَ وَدَنَا خُرُوجُهُ وَوَجَدْتُ شَيْئاً، فَذَهَبْتُ، وَجِئْتُ سَرِيعاً، فَوَجَدْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَارِجاً، فَسَأَلْتُ بِلَالاً أَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي الْكَعْبَةِ؟ قَالَ: نَعَمْ، رَكْعَتَيْنِ بَيْنَ السَّارِيَتَيْنِ»[2].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ چووە ناو کەعبەوە، کاتی دەرچوونی نزیک بوویەوە، شتێکم بینی بە پەلە ڕۆیشتم، تەماشام کرد پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووە؟ پرسیارم کرد لە بیلال، ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناو کەعبە نوێژی کرد؟ وتی: بەڵێ، دوو ڕکاتی کرد لە نێوان هەردوو پایەکەدا.**

**٢٩٠٨-** «عَنْ مُجَاهِدٍ، يَقُولُ: أُتِيَ ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا فِي مَنْزِلِهِ فَقِيلَ هَذَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَدْ دَخَلَ الْكَعْبَةَ فَأَقْبَلْتُ، فَأَجِدُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَدْ خَرَجَ وَأَجِدُ بِلَالاً عَلَى الْبَابِ قَائِماً فَقُلْتُ: يَا بِلَالُ أَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي الْكَعْبَةِ؟ قَالَ: نَعَمْ، قُلْتُ: أَيْنَ؟ قَالَ: مَا بَيْنَ هَاتَيْنِ الْأُسْطُوَانَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ فِي وَجْهِ الْكَعْبَةِ»[3].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




واتە: موجاهید دەڵێ: کەسێک هات بۆ لای ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ چووەتە ناو کەعبەوە، منیش ڕۆیشتم تەماشام کرد پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بوو و بیلالیش لەبەر دەرگاکە وەستا بوو، وتم: ئەی بیلال ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ لە کەعبە نوێژی کرد؟ وتی: بەڵێ، وتم: لە کوێ؟ وتی: لە نێوان ئەو دوو پایەدا دوو ڕکاتی کرد، پاشان دەرچوو دوو ڕکاتی ڕوبەڕوی کەعبە کرد.

**٢٩٠٩-** «عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْكَعْبَةَ، فَسَبَّحَ فِي نَوَاحِيهَا، وَكَبَّرَ، وَلَمْ يُصَلِّ، ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى خَلْفَ الْمَقَامِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ قَالَ: هَذِهِ الْقِبْلَةُ»[١].

واتە: ئوسامەی کوڕی زەید (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ چووە ناو کەعبەوە لە دەوروبەری تەسبیحات و تەکبیری کرد و، نوێژی نەکرد، پاشان دەرچوو دوو ڕکات نوێژی کرد لە پشتی مەقام، پاشان فەرمووی: ئەمە قیبلەیە.

## حیجر (کە دیوارێکی نزمە لە تەنیشت کەعبە پێی دەوترێ حجری ئیسماعیل لە بنچینەدا بەشێک بووە لە کەعبە)

**٢٩١٠-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا تَقُولُ: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: لَوْلَا أَنَّ النَّاسَ حَدِيثٌ عَهْدُهُمْ بِكُفْرٍ، وَلَيْسَ عِنْدِي مِنَ النَّفَقَةِ مَا يُقَوِّي عَلَى بِنَائِهِ، لَكُنْتُ أَدْخَلْتُ فِيهِ مِنَ الْحِجْرِ خَمْسَةَ أَذْرُعٍ، وَجَعَلْتُ لَهُ بَاباً يَدْخُلُ النَّاسُ مِنْهُ، وَبَاباً يَخْرُجُونَ مِنْهُ»[٢].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر خەڵکی لە سەردەمی بێبڕواییەوە نزیک نەبووایەن، ئەوەندەش تێچووم نیەماڵەکەی پێ دروست بکەمەوە، ئەوە پێنج باڵ لە حیجریشم دەخستە ناویەوە، دەرگایەکم دەکردەوە خەڵکی بچوایەنە ناویەوەو دەرگایەکیشم دروست دەکرد لێیەوە دەربچوایەن.

**٢٩١١-** «عَنْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلَا أَدْخُلُ الْبَيْتَ؟ قَالَ: ادْخُلِي الْحِجْرَ فَإِنَّهُ مِنَ الْبَيْتِ»[٣].

---

(١) منكر بذكر المقام.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٠١ و ١٣٣٣/٤٠٢.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢١١/١٣٤.




واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: وتم ئەی پێغەمبەری خوا ئایا نەچمە ناو بەیتەوە؟ فەرمووی: بڕۆ ناو حجرەوە ئەویش هەر بەشێکە لە بەیت.

## نوێژ کردن لە ناو حیجردا

**٢٩١٢-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كُنْتُ أُحِبُّ أَنْ أَدْخُلَ الْبَيْتَ، فَأُصَلِّيَ فِيهِ، فَأَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِيَدِي، فَأَدْخَلَنِي الْحِجْرَ فَقَالَ: إِذَا أَرَدْتِ دُخُولَ الْبَيْتِ فَصَلِّي هَا هُنَا، فَإِنَّمَا هُوَ قِطْعَةٌ مِنَ الْبَيْتِ، وَلَكِنَّ قَوْمَكِ اقْتَصَرُوا حَيْثُ بَنَوْهُ»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: من حەزم دەکرد بچمە ناو بەیتەوە و نوێژی تێدا بکەم، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی گرتم خستمیە ناو حیجرەوە، فەرمووی: ئەگەر ویستت بچیتە ناو بەیتەوە لێردا نوێژ بکە، چونکە ئەوە بەشێکە لە بەیت، بەڵام قەومەکەت کەمیان کردەوە کاتێ بونیادیان نایەوە.**

## تەکبیر (اللّهُ أكبَر) کردن لە دەوروبەری کەعبە

**٢٩١٣-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: لَمْ يُصَلِّ النَّبِيُّ ﷺ فِي الْكَعْبَةِ، وَلَكِنَّهُ كَبَّرَ فِي نَوَاحِيهِ»[٢].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە ناو کەعبە نوێژی نەکرد، بەڵام لە تەنیشتەکانی تەکبیری کرد.**

## یاد کردنەوەو پاڕانەوە لە ناو کەعبەدا

**٢٩١٤-** «عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، أَنَّهُ دَخَلَ هُوَ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْبَيْتَ فَأَمَرَ بِلَالاً فَأَجَافَ الْبَابَ وَالْبَيْتُ إِذْ ذَاكَ عَلَى سِتَّةِ أَعْمِدَةٍ، فَمَضَى حَتَّى إِذَا كَانَ بَيْنَ الْأُسْطُوَانَتَيْنِ اللَّتَيْنِ تَلِيَانِ بَابَ الْكَعْبَةِ، جَلَسَ، فَحَمِدَ اللَّهَ، وَأَثْنَى عَلَيْهِ، وَسَأَلَهُ وَاسْتَغْفَرَهُ، ثُمَّ قَامَ حَتَّى أَتَى مَا اسْتَقْبَلَ مِنْ دُبُرِ الْكَعْبَةِ فَوَضَعَ، وَجْهَهُ، وَخَدَّهُ عَلَيْهِ، وَحَمِدَ اللَّهَ، وَأَثْنَى عَلَيْهِ، وَسَأَلَهُ، وَاسْتَغْفَرَهُ، ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَى كُلِّ رُكْنٍ مِنْ أَرْكَانِ الْكَعْبَةِ فَاسْتَقْبَلَهُ بِالتَّكْبِيرِ، وَالتَّهْلِيلِ، وَالتَّسْبِيحِ، وَالثَّنَاءِ عَلَى

---

(١) حسن صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٠٢٨، والترمذي: ٨٧٦.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٩٨، ومسلم: ١٣٣٠ و ١٣٣١، والترمذي: ٨٧٤.




اللَّهِ، وَالْمَسْأَلَةِ، وَالِاسْتِغْفَارِ، ثُمَّ خَرَجَ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ مُسْتَقْبِلَ وَجْهِ الْكَعْبَةِ، ثُمَّ انْصَرَفَ فَقَالَ: هَذِهِ الْقِبْلَةُ، هَذِهِ الْقِبْلَةُ»[١].

**واتە: ئوسامەی کوڕی زەید (خوا لێی ڕازی بێ)، لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ چووە ناو کەعبەوە، فەرمانی کرد بە بیلال دەرگاکەی داخست، ئەوکاتە کەعبە لەسەر شەش پایە وەستابوو، ڕۆیشت تا گەیشتە نێوان ئەو پایەی کە نزیک دەرگای کەعبە بوو، دانیشت ستایشی خوای کرد و لێی پاڕایەوەو داوای لێخۆشبوونی کرد، پاشان هەڵسا و هاتە ئەو شوێنەی کە ڕوو دەکاتە پشتی کەعبە، ڕوخساری لەسەر داناو سوپاس و ستایشی خوای کرد و داوای لێخۆشبوونی لێکرد، پاشان ڕۆیشت بۆ لای هەر ڕوکنێک لە ڕوکنەکانی کەعبە ڕووی تێکرد تەکبیرو تەهلیل و تەسبیح و ستایشی خوای کرد، وە پاڕایەوەو داوای لێخۆشبوونی لێ کرد، پاشان دەرچوو، دوو ڕکات نوێژی ڕووبەڕوی کەعبە کرد، پاشان لێبویەوەو فەرمووی: ئەمە قیبلەیە، ئەمە قیبلەیە.**

## دانانی سنگ و ڕوخسار لەسەر ئەو شوێنەی ڕووی لە پشتی کەعبەیە

**٢٩١٥-** «عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: دَخَلْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْبَيْتَ، فَجَلَسَ، فَحَمِدَ اللَّهَ، وَأَثْنَى عَلَيْهِ، وَكَبَّرَ، وَهَلَّلَ، ثُمَّ مَالَ إِلَى مَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْبَيْتِ فَوَضَعَ صَدْرَهُ عَلَيْهِ، وَخَدَّهُ، وَيَدَيْهِ، ثُمَّ كَبَّرَ، وَهَلَّلَ، وَدَعَا، فَعَلَ ذَلِكَ بِالْأَرْكَانِ كُلِّهَا، ثُمَّ خَرَجَ فَأَقْبَلَ عَلَى الْقِبْلَةِ وَهُوَ عَلَى الْبَابِ، فَقَالَ: هَذِهِ الْقِبْلَةُ، هَذِهِ الْقِبْلَةُ»[٢].

**واتە: ئوسامەی کوڕی زەید (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ چوومە ناو کەعبەوە دانیشت، ستایشی خوای کرد، وە تەکبیرو تەهلیلی کرد، پاشان لایداوە پێشی خۆی لە کەعبە سنگ و ڕومەت و هەردوو دەستی لەسەر دانا، پاشان تەکبیرو تەهلیلی کرد و پاڕایەوە، لە هەموو ڕوکنەکانی کەعبە ئەمەی کرد، پاشان دەرچوو ڕووی کرد قیبلە، ئەو لەسەر دەرگاکە بوو، فەرمووی: ئەمە قیبلەیە، ئەمە قیبلەیە.**

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح الإسناد.

## شوێنی نوێژ کردن لە کەعبە

**٢٩١٦-** «عَنْ أُسَامَةَ ﷺ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنَ الْبَيْتِ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ فِي قُبُلِ الْكَعْبَةِ، ثُمَّ قَالَ: هَذِهِ الْقِبْلَةُ»[1].

**واتە: ئوسامە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە کەعبە دەرچوو دوو ڕکات نوێژی کرد لە پێش کەعبە، پاشان فەرمووی: ئەمە قیبلەیە.**

**٢٩١٧-** «عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ الْبَيْتَ فَدَعَا فِي نَوَاحِيهِ كُلِّهَا، وَلَمْ يُصَلِّ فِيهِ حَتَّى خَرَجَ مِنْهُ، فَلَمَّا خَرَجَ، رَكَعَ رَكْعَتَيْنِ فِي قُبُلِ الْكَعْبَةِ»[2].

**واتە: ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە کەعبە دەرچوو دوو ڕکات نوێژی کرد لە پێشی کەعبە، پاشان فەرمووی: ئەمە قیبلەیە.**

**٢٩١٨-** «عن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ السَّائِبِ، أَنَّهُ كَانَ يَقُودُ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا وَيُقِيمُهُ عِنْدَ الشُّقَّةِ الثَّالِثَةِ مِمَّا يَلِي الرُّكْنَ الَّذِي يَلِي الْحَجَرَ مِمَّا يَلِي الْبَابَ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ أَمَا أُنْبِئْتَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي هَاهُنَا فَيَقُولُ: نَعَمْ، فَيَتَقَدَّمُ فَيُصَلِّي»[3].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی سائیب دەگێڕێتەوە: ئەو ئیبنو عەبباسی (خوا لێیان ڕازی بێ) لەگەڵ خۆی دەبرد (کاتێ چاوی لەدەستدا)، دایدەنا لە تەنیشت ڕوکنی سێیەم لە نزیک بەردە ڕەشەکە لەلای دەگاکە، (واتە: لە نێوان بەردە ڕەشەکە و دەرگای کەعبە) ئیبنو عەبباس وتی: ئایا نەتزانیوە پێغەمبەری خوا ﷺ لێرەدا نوێژی دەکرد، وتی: بەڵێ، پێش دەکەوت و نوێژی دەکرد.**

## باسی فەزڵ و چاکەی تەواف کردنی بە دەوری کەعبە

**٢٩١٩-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُبَيْدِ بْنِ عُمَيْرٍ، أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ مَا أَرَاكَ تَسْتَلِمُ إِلَّا هَذَيْنِ الرُّكْنَيْنِ؟ قَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: إِنَّ مَسْحَهُمَا: يَحُطَّانِ الْخَطِيئَةَ، وَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: مَنْ طَافَ سَبْعاً، فَهُوَ كَعِدْلِ رَقَبَةٍ»[4].

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٣٣٠.

(٣) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٩٠٠.

(٤) صحيح. أخرجه الترمذي: ٩٥٩.




واتە: لە عوبەیدوڵڵای کوڕی عوبەیدی کوڕی عومەیر دەگێڕێتەوە: پیاوێک وتی: ئەی باوکی عەبدوڕڕەحمان چی دەبینم تەنها دەست ئەدەی لەم دوو ڕووکنە؟ وتی: من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بەڕاستی دەست لێدانیان گوناه دەوەرێنێ، وە گوێم لێ بوو دەیفەرموو: هەرکەس حەوت تەواف بکات وەکو ئازاد کردنی بەندەیەک وایە.

## قسە کردن لە کاتی تەواف

**٢٩٢٠-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ مَرَّ وَهُوَ يَطُوفُ بِالْكَعْبَةِ بِإِنْسَانٍ، يَقُودُهُ إِنْسَانٌ بِخِزَامَةٍ فِي أَنْفِهِ، فَقَطَعَهُ النَّبِيُّ ﷺ بِيَدِهِ، ثُمَّ أَمَرَهُ أَنْ يَقُودَهُ بِيَدِهِ»[١].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ تێپەڕی بەلای کەسێکدا پەتێکی کردبووە ملی کەسێکی تر، پێغەمبەر ﷺ پەتەکەی بڕی بە دەستی، پاشان فەرمانی پێ کرد دەستی بگرێ و بیبات.**

**٢٩٢١-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: مَرَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِرَجُلٍ يَقُودُهُ رَجُلٌ بِشَيْءٍ ذَكَرَهُ فِي نَذْرٍ، فَتَنَاوَلَهُ النَّبِيُّ ﷺ، فَقَطَعَهُ، قَالَ: إِنَّهُ نَذْرٌ»[٢].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ تێپەڕی بەلای پیاوێکدا کەسێکی تری ڕایدەکێشا بە پەتێک، باسی دەکرد کە گوایە ئەوە بەهۆی نەزرێکەوەیە، پێغەمبەر ﷺ پەتەکەی دەستی پچڕاند، وتی: ئەوە نەزرە!**

## ڕەوایەتی قسە کردن لە تەوافدا

**٢٩٢٢-** «عَنْ طَاوُسٍ، عَنْ رَجُلٍ، أَدْرَكَ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: الطَّوَافُ بِالْبَيْتِ صَلَاةٌ، فَأَقِلُّوا مِنَ الْكَلَامِ»[٣].

**واتە: طاوس دەگێڕێتەوە: لە پیاوێکەوە کە گەیشتووە بە پێغەمبەر ﷺ وتی: تەواف کردنی کەعبە نوێژە، کەم قسەی تێدا بکەن.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٢٠، وأبو داود: ٣٣٠٢.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.





**٢٩٢٣-** «عَنْ طَاوُسٍ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَقِلُّوا الْكَلَامَ فِي الطَّوَافِ، فَإِنَّمَا أَنْتُمْ فِي الصَّلَاةِ»[١].

**واتە: طاوس دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) وتی: لە تەوافدا قسە کەم بکەن، چونکە ئێوە لە ناو نوێژدان.**

## ڕێگەدان بە تەواف کردن لە هەموو کاتەکاندا

**٢٩٢٤-** «عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: يَا بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ، لَا تَمْنَعُنَّ أَحَداً طَافَ بِهَذَا الْبَيْتِ، وَصَلَّى أَيَّ سَاعَةٍ شَاءَ مِنْ لَيْلٍ أَوْ نَهَارٍ»[٢].

**واتە: جوبەیری کوڕی موطعیم ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەی نەوەکانی (عَبْدِ مَنَافٍ) ڕێگری مەکەن لە کەسێک تەوافی ئەمماڵە دەکات، وە لە هەرکاتێکدا ویستی نوێژ بکات لە شەودا بێت یان ڕۆژ.**

## چۆنیەتی تەواف کردنی نەخۆش

**٢٩٢٥-** «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: شَكَوْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، إِنِّي أَشْتَكِي، فَقَالَ: طُوفِي مِنْ وَرَاءِ النَّاسِ، وَأَنْتِ رَاكِبَةٌ، فَطُفْتُ، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي إِلَى جَنْبِ الْبَيْتِ يَقْرَأُ بِالطُّورِ وَكِتَابٍ مَسْطُورٍ»[٣].

**واتە: دایکی سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: بە پێغەمبەری خوام ﷺ ڕاگەیاند کە من نەخۆشم، فەرمووی: بەسەر وڵاخەوە تەواف بکە لە دوای خەڵکەوە، منیش تەوافم کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ لە تەنیشتی کەعبە نوێژی دەکرد سورەتی (الطُّورِ وَكِتَابٍ مَسْطُورٍ)ی دەخوێند.**

---

(١) صحيح الإسناد موقوف.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٨٩٤، والترمذي: ٨٦٨، وإبن ماجه: ١٢٥٤.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٦٤، ومسلم: ١٢٧٦، وأبو داود: ١٨٨٢، وإبن ماجه: ٢٩٦١.




## تەواف کردنی پیاوان لەگەڵ ئافرەتان

**٢٩٢٦-** «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا طُفْتُ طَوَافَ الْخُرُوجِ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ فَطُوفِي عَلَى بَعِيرِكِ مِنْ وَرَاءِ النَّاسِ»[١].

**واتە: دایکی سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا تەوافی دەرچوونم نەکرد؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کاتێ دەست بە نوێژ کرا لەسەر وشترەکەت تەواف بکە لە پشتی خەڵکەوە.**

**٢٩٢٧-** «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّهَا قَدِمَتْ مَكَّةَ وَهِيَ مَرِيضَةٌ، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: طُوفِي مِنْ وَرَاءِ الْمُصَلِّينَ وَأَنْتِ رَاكِبَةٌ، قَالَتْ: فَسَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَهُوَ عِنْدَ الْكَعْبَةِ يَقْرَأُ، وَالطُّورِ»[٢].

**واتە: دایکی سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: ئەو هات بۆ مەککە و نەخۆش بوو، ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس کرد، فەرمووی: لەسەر وشترەکەت تەواف بکە لە پشتی نوێژ خوێنەکانەوە وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لای کەعبە سووڕەتی (وَالطُّورِ)ی دەخوێند.**

## تەواف کردنی کەعبە بەسەر وڵاخەوە

**٢٩٢٨-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: طَافَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ حَوْلَ الْكَعْبَةِ عَلَى بَعِيرٍ يَسْتَلِمُ الرُّكْنَ بِمِحْجَنِهِ»[٣].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ تەوافی کرد لە حەجیماڵ ئاوایی بە دەوری کەعبەدا بە گۆچانێکی چەماوە دەستی دەدا لە ڕوکنەکانی.**

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢٧٤.




## تەوافی ئەوکەسەی بەتەنها نیەتی حەجی هێناوە

**٢٩٢٩-** «عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، وَسَأَلَهُ رَجُلٌ أَطُوفُ بِالْبَيْتِ وَقَدْ أَحْرَمْتُ بِالْحَجِّ؟ قَالَ: وَمَا يَمْنَعُكَ؟ قَالَ: رَأَيْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ يَنْهَى عَنْ ذَلِكَ وَأَنْتَ أَعْجَبُ إِلَيْنَا مِنْهُ، قَالَ: رَأَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أَحْرَمَ بِالْحَجِّ فَطَافَ بِالْبَيْتِ، وَسَعَى بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ»[1].

**واتە: عەبدوڵلای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پیاوێک پرسیاری لێ کرد وتی: تەوافی کەعبە بکەم لە کاتێکدا ئیحرامی حەجم بەستووە؟ وتی: چی ڕێگریت لێ دەکات؟ وتی: ئیبنو عەبباسم بینی ڕێگری ئەوەی دەکرد، تۆ لە لای ئێمە لەپێش تری لە ئەو، وتی: پێغەمبەری خوامان ﷺ بینیوە ئیحرامی حەجی بەست و تەوافی کەعبەیشی کرد، وە لە نێوان صەفاو مەروەشدا بەپەلە ڕێی کرد.**

## تەوافی ئەو کەسەی ئیحرام بۆ عومرە دەبەستێ

**٢٩٣٠-** «عَنْ عَمْرٍو، قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، وَسَأَلْنَاهُ عَنْ رَجُلٍ قَدِمَ مُعْتَمِراً، فَطَافَ بِالْبَيْتِ، وَلَمْ يَطُفْ بَيْنَ الصَّفَا، وَالْمَرْوَةِ، أَيَأْتِي أَهْلَهُ؟ قَالَ: لَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَطَافَ سَبْعاً، وَصَلَّى خَلْفَ الْمَقَامِ رَكْعَتَيْنِ، وَطَافَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، وَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ»[2].

**واتە: عەمرٍ دەڵێ: گوێم لە ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) بوو، کە پرسیارمان لێ کرد دەربارەی کەسێک ئیحرامی عومرەی بەستووە، پاشان تەوافی بەیتی کردوە، بەڵام تەوافی نێوان صەفاو مەروەی نەکردوە، ئایا دەتوانێ بچێتە لای خێزانیەوە؟ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ هات حەوت جار تەوافی کرد، لە پشتی مەقامیش دوو ڕکاتی کرد، وە تەوافی نێوان صەفاو مەروەشی کرد، بەڕاستی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئێوە سەرمەشق و پێشەوایەتی چاک هەیە.**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢٣٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٩٥، ومسلم: ١٢٣٤.

## کەسێک ئیحرامی بۆ حەج و عومرەی بەستووە و ئاژەڵی دیاری بۆ قوربانی لەگەڵ خۆی نەهێناوە چی بکات؟

**٢٩٣١-** «عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَخَرَجْنَا مَعَهُ، فَلَمَّا بَلَغَ ذَا الْحُلَيْفَةِ، صَلَّى الظُّهْرَ، ثُمَّ رَكِبَ رَاحِلَتَهُ، فَلَمَّا اسْتَوَتْ بِهِ عَلَى الْبَيْدَاءِ، أَهَلَّ بِالْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ جَمِيعاً، فَأَهْلَلْنَا مَعَهُ، فَلَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَكَّةَ، وَطُفْنَا، أَمَرَ النَّاسَ أَنْ يَحِلُّوا، فَهَابَ الْقَوْمُ، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَوْلَا أَنَّ مَعِي الْهَدْيَ، لَأَحْلَلْتُ، فَحَلَّ الْقَوْمُ حَتَّى حَلُّوا إِلَى النِّسَاءِ، وَلَمْ يَحِلَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَلَمْ يُقَصِّرْ إِلَى يَوْمِ النَّحْرِ»[1].

**واتە: ئەنەس ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو ئێمەش لەگەڵی دەرچووین، (بە مەبەستی حەجی ماڵی خوا) کاتێ گەیشتە (ذَو الْحُلَيْفَة) نوێژی نیوەڕۆی کرد، پاشان سواری وڵاخەکەی بوو، پاشان کاتێ لەسەر وڵاخەکەی دامەزرا و ڕووو کردە (الْبَيْدَاء) ئیحرام بۆ عومرەو حەجی پێکەوە بەست، ئێمەش لەگەڵی ئیحرامان بەست، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە مەککە و تەوافمان لەگەڵی کرد، فەرمانی کرد بە خەڵکی ئیحرام بشکێنن، خەڵکەکە بەلایانەوە گران بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ پێیانی فەرموو: ئەگەر ئاژەڵی قوربانیم بە دیاری لەگەڵ خۆم نەهێنایە، ئیحرامم دەشکاند، خەڵکەکەش ئیحرامیان شکاند تا چوون بۆ لای خێزانەکانیان، پێغەمبەری خوا ﷺ نە ئیحرامی شکاندو نە قژی کورت کردەوە تا ڕۆژی قوربانی (واتە: یەکەم ڕۆژی جەژن).**

## تەوافی ئەو کەسەی ئیحرام دەبەستێ بە حەج و عومرە

**٢٩٣٢-** «عَنْ نَافِعٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَرَنَ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ، فَطَافَ طَوَافاً وَاحِداً، وَقَالَ: هَكَذَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَفْعَلُهُ»[2].

**واتە: نافیع دەگێڕێتەوە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) ئیحرامی عومرەو حەجی پێکەوە بەست، یەک تەوافیشی کرد، وە وتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی بەم شێوەی دەکرد. (واتە: یەک تەوافی کرد بۆ هەردوکیان).**

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح الإسناد.




**٢٩٣٣-** «عَنْ نَافِعٍ، قَالَ: خَرَجَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا فَلَمَّا أَتَى ذَا الْحُلَيْفَةِ، أَهَلَّ بِالْعُمْرَةِ، فَسَارَ قَلِيلاً، فَخَشِيَ أَنْ يُصَدَّ عَنِ الْبَيْتِ فَقَالَ: إِنْ صُدِدْتُ، صَنَعْتُ كَمَا صَنَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: وَاللَّهِ مَا سَبِيلُ الْحَجِّ إِلَّا سَبِيلُ الْعُمْرَةِ، أُشْهِدُكُمْ أَنِّي قَدْ أَوْجَبْتُ مَعَ عُمْرَتِي حَجّاً، فَسَارَ حَتَّى أَتَى قُدَيْداً فَاشْتَرَى مِنْهَا هَدْياً، ثُمَّ قَدِمَ مَكَّةَ، فَطَافَ بِالْبَيْتِ سَبْعاً، وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، وَقَالَ: هَكَذَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَعَلَ»[١].

**واتە: نافیع دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەرچوو تا گەیشتە (ذَو الْحُلَيْفَة) ئیحرامی بە نیەتی عومرە بەست، کەمێک ڕێی کرد ترسا لەوەی ڕێگری بەیتی لێ بکەن، وتی: ئەگەر ڕێگریم لێکرا پێغەمبەری خوا ﷺ چی کرد منیش ئەوە دەکەم، وتی: سوێند بە خوا ڕێگای حەجیش هەر وەکو ڕێگای عومرە وایە، دەتانکەم بە شایەت من لەگەڵ عومرەکەمدا حەجم پێویست کرد لەسەر خۆم، پاشان کەوتە ڕێ تا گەیشتە (قُدَيْد) وڵاخێکی لەوێ کڕی بۆ قوربانی، پاشان هاتە مەککە، حەوت جار تەوافی بەیتی کرد، وە لە نێوان صەفاو مەروەش، وتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی بەم شێوەی کرد.**

**٢٩٣٤-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، طَافَ، طَوَافاً وَاحِداً»[٢].

**واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ یەک تەوافی کرد.**

## باسی بەردە ڕەشەکە

**٢٩٣٥-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: الْحَجَرُ الْأَسْوَدُ مِنَ الْجَنَّةِ»[٣].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەردە ڕەشەکە لە بەردی بەهەشتە.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٣٩، ومسلم: ١٢٣٠.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## دەست لێدانی بەردە ڕەشەکە

**٢٩٣٦-** «عَنْ سُوَيْدِ بْنِ غَفَلَةَ، أَنَّ عُمَرَ ﷺ قَبَّلَ الْحَجَرَ، وَالْتَزَمَهُ، وَقَالَ: رَأَيْتُ أَبَا الْقَاسِمِ ﷺ بِكَ، حَفِيّاً»[١].

**واتە: سوەیدی کوڕی غەفلە دەگێڕێتەوە: عومەر ﷺ ماچی بەردە ڕەشەکەی کرد و باوەشی لێیدا، وتی: باوکی قاسمم ﷺ بینی بۆت میهرەبان بوو.**

## ماچ کردنی بەردە ڕەشەکە

**٢٩٣٧-** «عَنْ عَابِسِ بْنِ رَبِيعَةَ قَالَ: رَأَيْتُ عُمَرَ ﷺ جَاءَ إِلَى الْحَجَرِ فَقَالَ: إِنِّي لَأَعْلَمُ أَنَّكَ حَجَرٌ، وَلَوْلَا أَنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُقَبِّلُكَ، مَا قَبَّلْتُكَ، ثُمَّ دَنَا مِنْهُ، فَقَبَّلَهُ»[٢].

**واتە: عابیسی کوڕی ڕەبیعە دەڵێ: عومەرم ﷺ بینی هات بۆ لای بەردە ڕەشەکە وتی: من دەزانم تۆ تەنها بەردێکیت، ئەگەر پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینایە ماچتی دەکرد ماچتم نەدەکرد، پاشان لێی نزیک بوویەوەو ماچی کرد.**

## چۆن ماچی بەردەڕەشەکە دەکرێ؟

**٢٩٣٨-** «عَنْ حَنْظَلَةَ، قَالَ: رَأَيْتُ طَاوُساً يَمُرُّ بِالرُّكْنِ، فَإِنْ وَجَدَ عَلَيْهِ زِحَاماً مَرَّ، وَلَمْ يُزَاحِمْ، وَإِنْ رَآهُ خَالِياً، قَبَّلَهُ ثَلَاثاً، ثُمَّ قَالَ: رَأَيْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ، وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: رَأَيْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ، فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّكَ حَجَرٌ، لَا تَنْفَعُ وَلَا تَضُرُّ، وَلَوْلَا أَنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَبَّلَكَ، مَا قَبَّلْتُكَ، ثُمَّ قَالَ عُمَرُ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ»[٣].

**واتە: حەنظەلە دەڵێ: طاوسم بینی تێدەپەڕی بەلای ڕوکندا، ئەگەر بیبینایە قەرەباڵغە تێدەپەڕی و قەرەباڵغی دروست نەدەکرد، وە ئەگەر بیبینایە چۆڵە سێ جار ماچی دەکرد، پاشان وتی: ئیبنو عەبباسم بینی (خوا لێیان ڕازی بێ) هەروەکو ئەوەی کرد، ئیبنو عەبباسیش وتی: عومەرم بینی بەو شێوەی کرد، پاشان وتی: تۆ**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢٧١/٢٥٢.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٩٧، ومسلم: ١٢٧٠/٢٥٠، وأبو داود: ١٨٧٣، والترمذي: ٨٦٠، وإبن ماجه: ٢٩٤٣.

(٣) ضعيف الإسناد منكر بهذا السياق.

تەنها بەردێکیت، نەسوود دەگەیەنی و نە زیان لا دەبەیت، ئەگەر پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینایە ماچتی دەکرد ماچتم نەدەکرد، پاشان عومەر وتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی بەوشێوەی کرد.

## (ئەو کەسەی دێتە کەعبە) چۆن تەواف دەکات یەکەم جار کە دێت، وە لەسەر کام لای تەواف دەکات کاتێ ماچی بەردە ڕەشەکەی کرد؟

**٢٩٣٩-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَكَّةَ، دَخَلَ الْمَسْجِدَ فَاسْتَلَمَ الْحَجَرَ، ثُمَّ مَضَى عَلَى يَمِينِهِ، فَرَمَلَ ثَلاثاً، وَمَشَى أَرْبَعاً، ثُمَّ أَتَى الْمَقَامَ فَقَالَ: ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ١٢٥﴾البقرة، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، وَالْمَقَامُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْبَيْتِ ثُمَّ أَتَى الْبَيْتَ بَعْدَ الرَّكْعَتَيْنِ، فَاسْتَلَمَ الْحَجَرَ، ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الصَّفَا»[١].

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە مەککە چووە ناو مزگەوتەکەوە و ماچی بەردە ڕەشەکەی کرد، پاشان بەلای ڕاستی بەردە ڕەشەکەدا ڕۆیشت، سێ جار بە هەروەلە تەوافی کرد، بۆ چوارەم جاریش بەڕێ کردن ڕێکردن تەوافی کرد، پاشان هات بۆ لای مەقامی ئیبراهیم و فەرمووی: ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ١٢٥﴾ واتە: شوێنی ئەو بەردەی ئیبراهیم کەلەسەری ڕادەوستا بکەنە جێگای نوێژ. ئینجا دوو ڕکات نوێژی کرد، مەقام کەوتبووە نێوان ئەوو نێوان کەعبە، پاشان دوای دوو ڕکاتەکە هات بۆ لای کەعبە دەستیدا لە بەردە ڕەشەکە پاشان ڕۆیشت بۆ صەفا.

## چەند جار هەروەلە بە دەوری بەیتدا دەکات؟

**٢٩٤٠-** «عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، كَانَ يَرْمُلُ الثَّلَاثَ، وَيَمْشِي الْأَرْبَعَ، وَيَزْعُمُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَفْعَلُ ذَلِكَ»[٢].

واتە: نافیع دەگێڕێتەوە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، سێ جار هەروەلەی دەکرد و چوار جار ڕێی دەکرد، پێی وابوو پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوەی دەکرد.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢١٨ و ١٢٦٣، والترمذي: ٨٥٦ و ٧٥٧، وإبن ماجه: ٢٩٥١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦١٧، ومسلم: ١٢٦١/٢٣٠.

## چەند جار ڕێ دەکات بە دەوری کەعبە؟

**٢٩٤١-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا طَافَ فِي الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ أَوَّلَ مَا يَقْدَمُ، فَإِنَّهُ يَسْعَى ثَلَاثَةَ أَطْوَافٍ، وَيَمْشِي أَرْبَعاً، ثُمَّ يُصَلِّي سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ يَطُوفُ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ»[١].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ بهاتایە بۆ حەج و عومرە یەکەم جار، سێ جار بە هەروەلە تەوافی دەکرد، چوار جاریش هاتوچۆی کرد، پاشان دوو ڕکات نوێژی دەکرد، پاشان تەوافی دەکرد لە نێوان صەفاو مەروە.**

## هەروەلە لە سێ تەواف لە کۆی حەوت تەوافەکە

**٢٩٤٢-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حِينَ يَقْدَمُ مَكَّةَ، يَسْتَلِمُ الرُّكْنَ الْأَسْوَدَ، أَوَّلَ مَا يَطُوفُ يَخُبُّ ثَلَاثَةَ أَطْوَافٍ مِنَ السَّبْعِ»[٢].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەهاتە مەککە، یەکەم جار کە تەوافی دەکرد دەستی دەدا لە بەردە ڕەشەکە، وە سێ جار بە هەروەلە بە دەوری کەعبەدا دەسوڕایەوە لە کۆی حەوت تەوافەکان.**

## هەروەلە لە حەج و عومرەدا

**٢٩٤٣-** «عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، كَانَ يَخُبُّ فِي طَوَافِهِ حِينَ يَقْدَمُ فِي حَجٍّ أَوْ عُمْرَةٍ ثَلَاثاً، وَيَمْشِي أَرْبَعاً، قَالَ: وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَفْعَلُ ذَلِكَ»[٣].

**واتە: نافیع دەگێڕێتەوە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) کاتێ دەهات بۆ حەج یان عومرە لە تەواف کردنیدا سێ جار هەروەلەی دەکرد، چوار جاریش ڕێی دەکرد، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەوشێوەی دەکرد.**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢٦١/٢٣١.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢٦١/٢٣٢.

(٣) صحيح.




## هەروەلە لە حیجرەوە بۆ حیجر (کە دیوارێکی نزمە لە تەنیشت کەعبە پێی دەوترێ حیجری ئیسماعیل لە بنچینەدا بەشێک بووە لە کەعبە)

**٢٩٤٤-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَمَلَ مِنَ الْحِجْرِ إِلَى الْحِجْرِ حَتَّى انْتَهَى إِلَيْهِ ثَلَاثَةَ أَطْوَافٍ»[1].

**واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی هەروەلەی دەکرد لە حیجرەوە بۆ حیجر تا سێ جار تەوافی کرد.**

## هۆکاری هەروەلە کردنی پێغەمبەر ﷺ بە دەوری کەعبە

**٢٩٤٥-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: لَمَّا قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ وَأَصْحَابُهُ مَكَّةَ قَالَ الْمُشْرِكُونَ: وَهَنَتْهُمْ حُمَّى يَثْرِبَ، وَلَقُوا مِنْهَا شَرّاً، فَأَطْلَعَ اللَّهُ نَبِيَّهُ عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ عَلَى ذَلِكَ فَأَمَرَ أَصْحَابَهُ أَنْ يَرْمُلُوا، وَأَنْ يَمْشُوا مَا بَيْنَ الرُّكْنَيْنِ، وَكَانَ الْمُشْرِكُونَ مِنْ نَاحِيَةِ الْحِجْرِ فَقَالُوا: لَهَؤُلَاءِ أَجْلَدُ مِنْ كَذَا»[2].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر ﷺ وهاوەڵانی هاتن بۆ مەککە، هاوبەشدانەران وتیان: گەرمی (یَثْرِبَ) لاوازی کردوون، تووشی شەڕو خراپە بوون تیایدا، خوا پێغەمبەرەکەی ﷺ ئاگادار کردەوە ئەویش فەرمانی کرد بە هاوەڵانی هەروەلە بکەن، لە نێوانی هەردوو ڕوکنیشدا ڕێ بکەن، هاوبەشدانەران لە لای حیجر بوون، وتیان ئەمانە بە توانا ترن لە فڵانە شت.**

**٢٩٤٦-** «عَنِ الزُّبَيْرِ بْنِ عَرَبِيٍّ، قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ ابْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ اسْتِلَامِ الْحَجَرِ؟، فَقَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَسْتَلِمُهُ، وَيُقَبِّلُهُ، فَقَالَ الرَّجُلُ: أَرَأَيْتَ إِنْ زُحِمْتُ عَلَيْهِ أَوْ غُلِبْتُ عَلَيْهِ؟ فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: اجْعَلْ أَرَأَيْتَ بِالْيَمَنِ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَسْتَلِمُهُ، وَيُقَبِّلُهُ»[3].

**واتە: زوبەیری کوڕی عەرەبی دەڵێ: پیاوێک پرسیاری کرد لە ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەربارەی دەست لێدانی بەردە ڕەشەکە؟ وتی: پێغەمبەری خوام ﷺ**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢٦٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٠٢، ومسلم: ١٢٦٦/٢٤٠.

(٣) صحيح. أخرجه انظر البخاري: ١٦٠٦، ومسلم: ١٢٦٨.




بینی دەستی لێدەدا و ماچی دەکرد، پیاوەکە وتی: ئەی ئەگەر قەرەباڵغ بوو؟ ئیبنو عومەر وتی: بیکە با لە یەمەنیش بێت، پێغەمبەری خوام ﷺ بینی دەستی لێدەداو ماچی دەکرد.

## دەست لێدان لە هەر دوو ڕوکنەکە لە گشت تەوافێکدا

**٢٩٤٧-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، كَانَ يَسْتَلِمُ الرُّكْنَ الْيَمَانِيَ، وَالْحَجَرَ فِي كُلِّ طَوَافٍ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ لە هەموو تەوافێکدا دەستی دەدا لە ڕوکنە یەمانیەکە، هەروەها بەردە ڕەشەکەش.

**٢٩٤٨-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، كَانَ لَا يَسْتَلِمُ إِلَّا الْحَجَرَ وَالرُّكْنَ الْيَمَانِيَ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی نەدەدا تەنها لە بەردە ڕەشەکە و ڕوکنە یەمانیەکە نەبێت.

## دەست لێدانی هەردوو ڕوکنە یەمانیەکە

**٢٩٤٩-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: لَمْ أَرَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَمْسَحُ مِنَ الْبَيْتِ، إِلَّا الرُّكْنَيْنِ الْيَمَانِيَيْنِ»[٣].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینیوە دەست بدا لە هیچ شتێکی بەیت جگە لە دوو ڕوکنە یەمانیەکە نەبێت.

## وازهێنان لە دەست لێدانی هەردوو ڕوکنە یەمانیەکە

**٢٩٥٠-** «عَنْ عُبَيْدِ بْنِ جُرَيْجٍ، قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا رَأَيْتُكَ لَا تَسْتَلِمُ مِنَ الْأَرْكَانِ إِلَّا هَذَيْنِ الرُّكْنَيْنِ الْيَمَانِيَيْنِ، قَالَ: لَمْ أَرَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَسْتَلِمُ إِلَّا هَذَيْنِ الرُّكْنَيْنِ»[٤].

---

(١) حسن.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢٦٧/٢٤٤.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢٦٧/٢٤٢.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢٦٧/٢٤٤.




واتە: عوبەیدی کوڕی جورەیج دەڵێ: بە ئیبنو عومەرم (خوا لێیان ڕازی بێ) وت: تۆم بینیوە دەست لە ڕوکنەکان نادەیت تەنها ئەم دوو ڕوکنە یەمانیانە نەبێت، ئەویش وتی: پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینیوە دەست بدا لە هیچ یەکێک لە ڕوکنەکان، جگە لەم دوو ڕوکنە نەبێت.

**٢٩٥١-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: لَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَسْتَلِمُ مِنْ أَرْكَانِ الْبَيْتِ، إِلَّا الرُّكْنَ الْأَسْوَدَ، وَالَّذِي يَلِيهِ مِنْ نَحْوِ دُورِ الْجُمَحِيِّينَ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی نەدەدا لە ڕوکنەکانی کەعبە، جگە لە ڕوکنی بەردە ڕەشەکە نەبێت، ئەوەشی لە تەنیشتی بوو کە لە ڕووی خانووەکانی جومەحییەکان بوو.

**٢٩٥٢-** «عَنِ عَبْدِ اللَّهِ بنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: مَا تَرَكْتُ اسْتِلَامَ هَذَيْنِ الرُّكْنَيْنِ مُنْذُ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَسْتَلِمُهُمَا الْيَمَانِيَ، وَالْحَجَرَ فِي شِدَّةٍ، وَلَا رَخَاءٍ»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: وازم لە دەست لێدانی ئەم دوو ڕوکنە نەهێناوە لەو کاتەی پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە دەستی دەدا لەو دوو ڕوکنە یەمانیەکە، هەروەها بەردە ڕەشەکەش، نە لە ناخۆشی و نە لە خۆشیدا.

**٢٩٥٣-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: مَا تَرَكْتُ اسْتِلَامَ الْحَجَرِ فِي رَخَاءٍ، وَلَا شِدَّةٍ، مُنْذُ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَسْتَلِمُهُ»[٣].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: وازم لە دەست لێدانی بەردە ڕەشەکە نەهێناوە نە لە خۆشی نە لە ناخۆشیدا لەو کاتەی پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە دەستی لێ دەدا.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢٦٧، وإبن ماجه: ٢٩٤٦.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٠٦، ومسلم: ١٢٦٨/٢٤٥.

(٣) صحيح.




## دەست لێدانی ڕوكنەكە بە گۆچان

**٢٩٥٤-** «عَنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، طَافَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ، عَلَى بَعِيرٍ يَسْتَلِمُ الرُّكْنَ بِمِحْجَنٍ»[(١)].

واتە: عەبدوڵلای كوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ تەوافی كرد لە حەجیماڵئاوائیدا بەسەر وشترەكەیەوە بە گۆچانەكەی دای لە ڕوكن.

## ئاماژە كردن بۆ ڕوكن لە كاتی تەواف

**٢٩٥٥-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، كَانَ يَطُوفُ بِالْبَيْتِ عَلَى رَاحِلَتِهِ، فَإِذَا انْتَهَى إِلَى الرُّكْنِ أَشَارَ إِلَيْهِ»[(٢)].

واتە: عەبدوڵلای كوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ تەوافی كەعبەی كرد بەسەر وڵاخەكەیەوە، كاتێ بگەشتایەتە لای ڕوكن تەنها ئاماژەی بۆ دەكرد.

## فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ ٣١﴾<br>واتە: خۆتان بڕازێننەوە لە هەموو مزگەوتێكدا.

**٢٩٥٦-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَتِ الْمَرْأَةُ تَطُوفُ بِالْبَيْتِ وَهِيَ عُرْيَانَةٌ تَقُولُ: الْيَوْمَ يَبْدُو بَعْضُهُ أَوْ كُلُّهُ ... وَمَا بَدَا مِنْهُ فَلَا أُحِلُّهُ، قَالَ: فَنَزَلَتْ: ﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ ٣١﴾ الأعراف»[(٣)].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێشتر ئافرەتی وابوو بە ڕووتی تەوافی كەعبەی دەكرد، وە دەیوت: ئەمڕۆ هەندێ عەورەت دەردەكەوێ یان هەمووی...... ئەوەیشی دەركەوت حەڵاڵ نیە كەس تەماشای بكات. وتی: دواتر

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٠٧، ومسلم: ١٢٧٢.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٣٠٢٨.




ئەم دەقە دابەزیە خوارەوە: ﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ ﴿٣١﴾﴾ واتە: ئەی نەوەکانی ئادەم خۆتان برازێننەوە لە هەموو مزگەوتێکدا.

**٢٩٥٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ بَعَثَهُ فِي الْحَجَّةِ الَّتِي أَمَّرَهُ عَلَيْهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، قَبْلَ حَجَّةِ الْوَدَاعِ فِي رَهْطٍ يُؤَذِّنُ فِي النَّاسِ، أَلَا لَا يَحُجَّنَّ بَعْدَ الْعَامِ مُشْرِكٌ، وَلَا يَطُوفُ بِالْبَيْتِ عُرْيَانٌ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەبو بەکر لە حەجێکدا ناردی کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردبوو پێش حەجیماڵئاوایی لەگەڵ کۆمەڵێک لە هاوەڵان خەڵکی ئاگادار بکاتەوە کە لە دوای ئەم ساڵ با هیچ هاوبەشدانەرێک حەج نەکات، وە با کەس بە ڕووتی تەواف نەکات.**

**٢٩٥٨-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: جِئْتُ مَعَ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ حِينَ بَعَثَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى أَهْلِ مَكَّةَ بِبَرَاءَةَ، قَالَ: مَا كُنْتُمْ تُنَادُونَ؟ قَالَ: كُنَّا نُنَادِي إِنَّهُ لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ، إِلَّا نَفْسٌ مُؤْمِنَةٌ، وَلَا يَطُوفُ بِالْبَيْتِ عُرْيَانٌ، وَمَنْ كَانَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَهْدٌ، فَأَجَلُهُ أَوْ أَمَدُهُ إِلَى أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ، فَإِذَا مَضَتِ الْأَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ، فَإِنَّ اللَّهَ بَرِيءٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ، وَرَسُولُهُ، وَلَا يَحُجُّ بَعْدَ الْعَامِ مُشْرِكٌ، فَكُنْتُ أُنَادِي حَتَّى صَحِلَ صَوْتِي»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبو طاڵیب هاتم کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بۆ ناو خەڵکی مەککە بە خوێندنی (بَرَاءَةَ)، فەرمووی: ئێوە بانگ بۆ چی دەکەن؟ وتی: ئێمە بانگەشەی ئەوە دەکەین کەس ناچێتە بەهەشتەوە جگە لە کەسی بڕوادار، وە نابێ کەس بە ڕووتی تەواف بکات، هەرکەس پەیمانی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بەستووە، ئەوە ماوەکەی تا چوار مانگە، ئەگەر چوار مانگەکە تێپەڕ بوو، ئەوە خواو پێغەمبەرەکەی بەرین لە هاوبەشدانەران، لە دوای ئەم ساڵ با هاوبەشدانەر حەج نەکات، من هاوارم دەکرد تا دەنگم دانوسا.**

## دوو ڕکاتەکەی تەواف لە چ شوێنێک دا بکات؟

**٢٩٥٩-** «عَنْ الْمُطَّلِبِ بْنِ أَبِي وَدَاعَةَ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ، حِينَ فَرَغَ مِنْ سُبُعِهِ، جَاءَ حَاشِيَةَ الْمَطَافِ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، وَلَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الطَّوَّافِينَ أَحَدٌ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٢٢، ومسلم: ١٣٤٧.

(٢) صحيح.

(٣) ضعيف.




**واتە: موطەڵیبی کوڕی ئەبو وەداعە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی کاتێ لێ بوویەوە لە حەوت تەوافەکە، هاتە پەراوێزی تەواف و دوو ڕکات نوێژی کرد، لە نێوان ئەو و تەوافکاراندا هیچ کەسێک نەبوو.**

**٢٩٦٠-** «عَنْ عَمْرٍو، قَالَ: يَعْنِي ابْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَطَافَ بِالْبَيْتِ سَبْعاً، وَصَلَّى خَلْفَ الْمَقَامِ رَكْعَتَيْنِ، وَطَافَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، وَقَالَ: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴿٢١﴾ ﴾ الأحزاب»[1].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هات، حەوت جار تەوافی کەعبەی کرد، وە لە پشتی مەقام دوو ڕکات نوێژیشی کرد، هەروەها تەوافی نێوان صەفاو مەروەیشی کرد و فەرمووی: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴿٢١﴾ ﴾ واتە: سوێند بە خوا بەڕاستی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئێوە سەرمەشق و پێشەوایەتی چاک هەیە.**

## ئەوەی دەیڵێ لە دوای دوو ڕکاتی تەواف

**٢٩٦١-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: طَافَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالْبَيْتِ سَبْعاً، رَمَلَ مِنْهَا ثَلَاثاً، وَمَشَى أَرْبَعاً، ثُمَّ قَامَ عِنْدَ الْمَقَامِ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿ وَاتَّخِذُوا مِن مَّقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى ﴿١٢٥﴾ ﴾البقرة، وَرَفَعَ صَوْتَهُ يُسْمِعُ النَّاسَ، ثُمَّ انْصَرَفَ فَاسْتَلَمَ، ثُمَّ ذَهَبَ فَقَالَ: نَبْدَأُ بِمَا بَدَأَ اللَّهُ بِهِ، فَبَدَأَ بِالصَّفَا، فَرَقِيَ عَلَيْهَا، حَتَّى بَدَا لَهُ الْبَيْتُ، فَقَالَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، يُحْيِي وَيُمِيتُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، فَكَبَّرَ اللَّهَ وَحَمِدَهُ، ثُمَّ دَعَا بِمَا قُدِّرَ لَهُ، ثُمَّ نَزَلَ مَاشِياً، حَتَّى تَصَوَّبَتْ قَدَمَاهُ فِي بَطْنِ الْمَسِيلِ، فَسَعَى حَتَّى صَعِدَتْ قَدَمَاهُ، ثُمَّ مَشَى حَتَّى أَتَى الْمَرْوَةَ، فَصَعِدَ فِيهَا، ثُمَّ بَدَا لَهُ الْبَيْتُ، فَقَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، قَالَ ذَلِكَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ: ثُمَّ ذَكَرَ اللَّهَ، وَسَبَّحَهُ، وَحَمِدَهُ، ثُمَّ دَعَا عَلَيْهَا بِمَا شَاءَ اللَّهُ فَعَلَ هَذَا حَتَّى فَرَغَ مِنَ الطَّوَافِ»[2].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ حەوت جار تەوافی کرد، سێ دانەیان بە هەروەلە، چوار دانەی دیکەیشیان بە ڕێکردن، پاشان هەڵسا لە لای مەقام دوو**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٩٥، ومسلم: ١٢٣٤.

(٢) صحيح.




ڕکاتی کرد، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ﴿١٢٥﴾ ﴾ (واتە: شوێنی ئەو بەردەی ئیبڕاهیم لەسەری ڕادەوەستا بکەنە جێگای نوێژ). وە دەنگی بەرز کردەوەوە خەڵکی گوێیان لە دەنگی بوو، پاشان لێ بوویەوەو دەستی دا لە بەردە ڕەشەکە، دواتر ڕۆیشت و فەرمووی: بەوە دەست پێ دەکەین کە خوا دەستی پێ کردوە، بە صەفا دەستی پێکرد هەتا سەرکەوت و کەعبەی لێوە دیار بوو، سێ جار فەرمووی: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، يُحْيِي وَيُمِيتُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) تەکبیر و ستایشی خوای کرد، پاشان پاڕایەوە بەوەی بۆی دیاری کراوە، پاشان بە پێ دابەزیە خوارەوە بۆ ناو شیوەکەی نێوان صەفاو مەروە، ئینجا بە هەروەلە ڕۆیشت تا سەرکەوت، پاشان ڕۆیشت تا هاتە مەروە و سەرکەوت و کەعبەی لێوە دیار بوو، فەرمووی: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، يُحْيِي وَيُمِيتُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) سێ جار ئەوەی فەرموو، پاشان یادی خوای کردو سوپاس و ستایشی کرد، پاشان لەو شوێنە پاڕایەوە ئەوەندەی خوا ویستی لە سەر بوو، دواتر لە تەواف بویەوە.

**٢٩٦٢-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، طَافَ سَبْعاً رَمَلَ ثَلَاثاً، وَمَشَى أَرْبَعاً، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿ وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ﴿١٢٥﴾ ﴾البقرة، فَصَلَّى سَجْدَتَيْنِ، وَجَعَلَ الْمَقَامَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْكَعْبَةِ، ثُمَّ اسْتَلَمَ الرُّكْنَ، ثُمَّ خَرَجَ، فَقَالَ: إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ، فَابْدَءُوا بِمَا بَدَأَ اللَّهُ بِهِ»[1].

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ حەوت جار تەوافی کرد، سێ جار بە هەروەلە، چوار جاریش بە ڕێکردن، پاشان (ئەم ئایەتەی) خوێندەوە: ﴿ وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ﴿١٢٥﴾ ﴾ (واتە: شوێنی ئەو بەردەی ئیبڕاهیم لەسەری ڕادەوەستا بکەنە جێگای نوێژ)، ئینجا دوو ڕکات نوێژی کرد، مەقامی خستە نێوان خۆی و کەعبە، پاشان دەستیدا لە ڕوکن، پاشان دەرچوو، پاشان فەرمووی: بەڕاستی صەفاو مەروە لە دروشمەکانی خوان دەست پێ بکەن بەوەی خوا دەستی پێکردوە.

---

١) صحيح.

## قورئان خوێندن لە دوو ڕكاتی تەوافدا

**٢٩٦٣-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمَّا انْتَهَى إِلَى مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ قَرَأَ: ﴿وَاتَّخِذُوا مِن مَّقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى ۝١٢٥﴾البقرة، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، فَقَرَأَ فَاتِحَةَ الْكِتَابِ، وَ ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ ۝١﴾، وَ ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ ثُمَّ عَادَ إِلَى الرُّكْنِ فَاسْتَلَمَهُ، ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الصَّفَا»[1].

واتە: جابری كوڕی عەبدوڵلا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێ كۆتایی هێنا بۆ لای مەقامی ئیبڕاهیم، (ئەم ئایەتەی) خوێندەوە: ﴿وَاتَّخِذُوا مِن مَّقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى ۝١٢٥﴾ (واتە: شوێنی ئەو بەردەی ئیبڕاهیم لەسەری ڕادەوەستا بكەنە جێگای نوێژ)، ئینجا دوو ڕكات نوێژی كرد، سوورەتی فاتیحە و ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ ۝١﴾ و ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ی خوێند، پاشان گەڕایەوە بۆ لای ڕوكن و دەستی لێدا، پاشان ڕۆی بۆ صەفا.

## خواردنەوەی ئاوی زەمزەم

**٢٩٦٤-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، شَرِبَ مِنْ مَاءِ زَمْزَمَ وَهُوَ قَائِمٌ»[2].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئاوی زەمزەمی خواردەوە، بە پێوە وەستابوو.

## خواردنەوەی ئاوی زەمزەم بە پێوە

**٢٩٦٥-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: سَقَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مِنْ زَمْزَمَ، فَشَرِبَهُ وَهُوَ قَائِمٌ»[3].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ئاوم بە پێغەمبەری خوا ﷺدا لە زەمزەم، ئەو خواردیەوە بە پێوە وەستابوو.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٠٢٧/١١٩.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٠٢٧/١١٧.




## باسی دەرچوونی پێغەمبەر ﷺ بۆ صەفا لەو دەرگایەی کە لێیەوە دەردەچێ

**٢٩٦٦-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: لَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَكَّةَ، طَافَ بِالْبَيْتِ سَبْعاً، ثُمَّ صَلَّى خَلْفَ الْمَقَامِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الصَّفَا مِنَ الْبَابِ الَّذِي يُخْرَجُ مِنْهُ، فَطَافَ بِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ»[1].

واتە: عەمری کوڕی دینار دەڵێ: گوێم لە ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) بوو دەیووت: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە مەککە حەوت جار تەوافی کرد، پاشان لە پشتی مەقام دوو ڕکات نوێژی کرد، پاشان دەرچوو بۆ صەفا لەو دەرگایەی کە لێیەوە دەردەچێ، تەوافی صەفاو مەروەی کرد.

## باسی صەفاو مەروە

**٢٩٦٧-** «عَنْ عُرْوَةَ قَالَ: قَرَأْتُ عَلَى عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا ۝١٥٨﴾البقرة، قُلْتُ: مَا أُبَالِي، أَنْ لَا أَطُوفَ بَيْنَهُمَا فَقَالَتْ: بِئْسَ مَا قُلْتَ: إِنَّمَا كَانَ نَاسٌ مِنْ أَهْلِ الْجَاهِلِيَّةِ لَا يَطُوفُونَ بَيْنَهُمَا، فَلَمَّا كَانَ الْإِسْلَامُ وَنَزَلَ الْقُرْآنُ: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ۝١٥٨﴾البقرة، الْآيَةَ فَطَافَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَطُفْنَا مَعَهُ فَكَانَتْ سُنَّةً»[2].

واتە: عوروە دەڵێ: ئەم ئایەتم خوێندەوە بۆ عائیشە (خوا لێیان ڕازی بێ): ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا ۝١٥٨﴾البقرة، (واتە: هیچ گوناهی ناگات کە تەوافی ئەو دووانەیش بکات)، وتم: بەلامەوە ئاساییە تەوافی نێوان صەفا و مەروە نەکەم، وتی: خراپترین شتت وت: بەڕاستی خەڵکانێک لەسەردەمی نەفامی تەوافیان لە نێوانیاندا نەدەکرد، کاتێ ئیسلام هات قورئان دابەزی: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ۝١٥٨﴾ (واتە: بەڕاستی صەفاو مەروە لە دروشمەکانی ئاینی خوان). پێغەمبەر ﷺ تەوافی کردو ئێمەش تەوافمان لەگەڵی کرد، ئینجا واجب بوو.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٩٥، ومسلم: ١٢٣٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٧٩٠، ومسلم: ١٢٧٧.



**٢٩٦٨-** «عَنْ عُرْوَةَ، قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنْ قَوْلِ اللَّهِ ﷻ: ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا ﴿١٥٨﴾﴾البقرة، فَوَاللَّهِ مَا عَلَى أَحَدٍ جُنَاحٌ أَنْ لَا يَطُوفَ بِالصَفَا وَالْمَرْوَةِ، قَالَتْ عَائِشَةُ: بِئْسَمَا قُلْتَ يَا ابْنَ أُخْتِي إِنَّ هَذِهِ الْآيَةَ لَوْ كَانَتْ كَمَا أَوَّلْتَهَا، كَانَتْ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَنْ لَا يَطَّوَّفَ بِهِمَا، وَلَكِنَّهَا نَزَلَتْ فِي الْأَنْصَارِ قَبْلَ أَنْ يُسْلِمُوا، كَانُوا يُهِلُّونَ لِمَنَاةَ الطَّاغِيَةِ الَّتِي كَانُوا يَعْبُدُونَ عِنْدَ الْمُشَلَّلِ، وَكَانَ مَنْ أَهَلَّ لَهَا يَتَحَرَّجُ أَنْ يَطُوفَ بِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، فَلَمَّا سَأَلُوا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ ذَلِكَ؟ أَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ فَمَنْ حَجَّ ٱلْبَيْتَ أَوِ ٱعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا ﴿١٥٨﴾﴾البقرة، ثُمَّ قَدْ سَنَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، الطَّوَافَ بَيْنَهُمَا، فَلَيْسَ لِأَحَدٍ أَنْ يَتْرُكَ الطَّوَافَ بِهِمَا»[١].

**واتە: عوروە دەڵێ: پرسیارم کرد لە عائیشە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەربارەی فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا ﴿١٥٨﴾﴾ (واتە: هیچ گوناهی ناگات کە تەوافی ئەو دووانەیش بکات)، سوێند بە خوا هیچ کەسێک گوناهی ناگات تەوافی صەفاو مەروە نەکات، عائیشە (خوا لێی ڕازی بی) وتی: خراپترین قسەت کرد ئەی برازام، بەڕاستی ئەم ئایەتە ئەگەر بەو شێوە بوایە کە تۆ تەفسیرت کرد، ئەوە هیچ گوناهی نەدەگەیشت تەوافی صەفا مەروەی نەکردبایە، بەڵام دەربارەی ئەنصارەکان دابەزی پێش ئەوەی مسوڵمان بن، ئەوان ئیحرامیان بۆ مەناتی تاغوت دەبەست کە دەیانپەرست لە لای (الْمُشَلَّلِ) جا هەرکەس ئیحرامی بۆی ببەستایە دەترسا لەوەی تەوافی صەفاو مەروە بکات، کاتێ دەربارەی ئەوە پرسیاریان کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ؟ خوا ﷻ ئەم دەقەی دابەزاند: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ فَمَنْ حَجَّ ٱلْبَيْتَ أَوِ ٱعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا ﴿١٥٨﴾﴾البقرة، (واتە: بەڕاستی صەفاو مەروە لە دروشمەکانی ئاینی خوان جا هەرکەس حەجی ماڵی خوای کرد یان عومرەی کرد هیچ گوناهی ناگات، کە تەوافی ئەو دووانەش بکات)، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ تەوافی لە نێوانیان واجب کرد، بۆ هیچ کەسێک نیە واز لە تەوافی نێوانیان بهێنێ.**

**٢٩٦٩-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حِينَ خَرَجَ مِنَ الْمَسْجِدِ وَهُوَ يُرِيدُ الصَّفَا، وَهُوَ يَقُولُ: نَبْدَأُ بِمَا بَدَأَ اللَّهُ بِهِ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو کاتێ دەرچوو لە مزگەوت، مەبەستی ئەوە بوو بچێ بۆ صەفا، دەیفەرموو: بەوە دەستی پێدەکەین کە خوا دەستی پێ کردوە.

**٢٩٧٠-** «عَن جَابِرٍ ﷺ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى الصَّفَا وَقَالَ: نَبْدَأُ بِمَا بَدَأَ اللَّهُ بِهِ، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ﴿١٥٨﴾﴾البقرة»[1].

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بۆ سەر صەفاو مەروە و فەرمووی: بەوە دەست پێدەکەین کە خوا ﷻ دەستی پێکردوە، پاشان (ئەم ئایەتەی) خوێندەوە: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ﴿١٥٨﴾﴾.

## شوێنی وەستان لەسەر صەفا

**٢٩٧١-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، رَقِيَ عَلَى الصَّفَا، حَتَّى إِذَا نَظَرَ إِلَى الْبَيْتِ كَبَّرَ»[2].

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ سەرکەوت بۆ سەر صەفاو مەروە، تا کاتێ تەماشای کەعبەی کرد تەکبیری کرد.

## تەکبیر (اللَّهُ أَكْبَر) کردن لەسەر صەفا

**٢٩٧٢-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، كَانَ إِذَا وَقَفَ عَلَى الصَّفَا يُكَبِّرُ ثَلَاثاً، وَيَقُولُ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، يَصْنَعُ ذَلِكَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، وَيَدْعُو، وَيَصْنَعُ، عَلَى الْمَرْوَةِ مِثْلَ ذَلِكَ»[3].

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ بوەستایە لەسەر صەفا سێ جار تەکبیری دەکرد، وە دەیفەرموو: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) سێ جار ئەوەی دەکرد و دەپاڕایەوە و نزای دەکرد، بەهەمان شێوە لەسەر مەروەش هەر وای دەکرد.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: وهو جزء من حديث ١٢١٨، وأبو داود: ١٩٠٥، والترمذي: ٨٦٢، وإبن ماجه: ٣٠٧٤.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.





## تەهلیل (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) کردن لەسەر صەفاو مەروە

**٢٩٧٣-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: عَنْ حَجَّةِ النَّبِيِّ ﷺ ثُمَّ وَقَفَ النَّبِيُّ ﷺ، عَلَى الصَّفَا يُهَلِّلُ اللَّهَ ﷻ، وَيَدْعُو بَيْنَ ذَلِكَ»[1].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: دەربارەی حەجی پێغەمبەر ﷺ پاشان پێغەمبەر ﷺ لەسەر صەفاو وەستا تەهلیلی خوای دەکرد، لە نێوانیشیدا دەپاڕایەوە.**

## زیکرو پاڕانەوەو نزا کردن لەسەر صەفا

**٢٩٧٤-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: طَافَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالْبَيْتِ سَبْعاً رَمَلَ مِنْهَا ثَلَاثاً، وَمَشَى أَرْبَعاً، ثُمَّ قَامَ عِنْدَ الْمَقَامِ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، وَقَرَأَ: ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ﴿١٢٥﴾﴾البقرة، وَرَفَعَ صَوْتَهُ يُسْمِعُ النَّاسَ، ثُمَّ انْصَرَفَ فَاسْتَلَمَ، ثُمَّ ذَهَبَ، فَقَالَ: نَبْدَأُ بِمَا بَدَأَ اللَّهُ بِهِ، فَبَدَأَ بِالصَّفَا، فَرَقِيَ عَلَيْهَا حَتَّى بَدَا لَهُ الْبَيْتُ وَقَالَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، يُحْيِي وَيُمِيتُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، وَكَبَّرَ اللَّهَ وَحَمِدَهُ، ثُمَّ دَعَا بِمَا قُدِّرَ لَهُ، ثُمَّ نَزَلَ مَاشِياً حَتَّى تَصَوَّبَتْ قَدَمَاهُ فِي بَطْنِ الْمَسِيلِ، فَسَعَى حَتَّى صَعِدَتْ قَدَمَاهُ، ثُمَّ مَشَى حَتَّى أَتَى الْمَرْوَةَ، فَصَعِدَ فِيهَا، ثُمَّ بَدَا لَهُ الْبَيْتُ، فَقَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، قَالَ: ذَلِكَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ ذَكَرَ اللَّهَ وَسَبَّحَهُ وَحَمِدَهُ، ثُمَّ دَعَا عَلَيْهَا بِمَا شَاءَ اللَّهُ فَعَلَ هَذَا حَتَّى فَرَغَ مِنَ الطَّوَافِ»[2].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ حەوت جار تەوافی کەعبەی کرد سێ جاریان بە هەروەلە و چوار جار بە ڕێکردن، پاشان لای مەقام هەستا و دوو ڕکات نوێژی کرد، وە ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ﴿١٢٥﴾﴾ (واتە: شوێنی ئەو بەردەی ئیبراهیم لەسەری ڕادەوەستا بکەنە جێگای نوێژ)، وە دەنگی بەرز کردەوەوە خەڵکی گوێیان لە دەنگی بوو، پاشان لێ بوویەوە و دەستی دا لە بەردە ڕەشەکە، دواتر ڕۆیشت و فەرمووی: دەستی پێ دەکەین بەوەی خوا دەستی پێ کردوە، بە صەفا دەستی پێ کرد تا سەرکەوت و کەعبەی لێوە دیار بوو، سێ جار فەرمووی: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، يُحْيِي**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

وَيُمِيتُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) تەکبیر و ستایشی خوای کرد، پاشان پاڕایەوە بەوەی بۆی دیاری کراوە، پاشان بە پێ دابەزیە خوارەوە بۆ ناو شیوەکەی نێوان صەفاو مەروە، ئینجا بە هەروەلە ڕۆیشت هەتا بە پێیەکانی سەرکەوت، پاشان ڕۆیشت هەتا هاتە مەروە و سەرکەوت و کەعبەی لێوە دیار بوو، فەرمووی: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، يُحْيِي وَيُمِيتُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) سێ جار ئەوەی فەرموو، پاشان یادی خوای کردو سوپاس و ستایشی کرد، پاشان لەو شوێنە پاڕایەوە، ئەوەندەی خوا ویستی لە سەر بوو، ئەمەی کرد تا لە تەواف بویەوە.

## تەواف کردن لە نێوان صەفاو مەروە بەسەر وڵاخەوە

**٢٩٧٥-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: طَافَ النَّبِيُّ ﷺ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ عَلَى رَاحِلَتِهِ بِالْبَيْتِ وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ لِيَرَاهُ النَّاسُ، وَلِيُشْرِفَ، وَلِيَسْأَلُوهُ إِنَّ النَّاسَ غَشُوهُ»[1].

**واتە:** جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە حەجیماڵئاواییدا بەسەر وڵاخەکەیەوە تەوافی کەعبە و نێوان صەفاو مەروەی کرد بۆ ئەوەی خەڵکی ببینن، وە بۆ ئەوەی سەرپەرشتیان بکات، وە بۆ ئەوەی پرسیاری لێ بکەن، بێگومان خەڵکیکی زۆر لێی کۆببنەوە.

## هاتن و چوون لە نێوان صەفاو مەروە

**٢٩٧٦-** «عَنْ كَثِيرِ بْنِ جُمْهَانَ، قَالَ: رَأَيْتُ ابْنَ عُمَرَ ﷺ يَمْشِي بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ فَقَالَ: إِنْ أَمْشِي فَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَمْشِي، وَإِنْ أَسْعَى فَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَسْعَى»[2].

**واتە:** کەثیری کوڕی جومهان دەڵێ: ئیبنو عومەرم ﷺ بینی ڕێی دەکرد لە نێوان صەفاو مەروە، وتی: ئەگەر ڕێ بکەم ئەوە پێغەمبەری خوام ﷺ بینی ڕێی کرد، وە ئەگەر هەروەلەش بکەم ئەوە پێغەمبەری خوام بینی ﷺ هەروەلەی دەکرد.

**٢٩٧٧-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: رَأَيْتُ ابْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا ذَكَرَ نَحْوَهُ إِلَّا أَنَّهُ قَالَ: وَأَنَا شَيْخٌ كَبِيرٌ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢٧٣/٢٥٤، وأبو داود: ١٨٨٠.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٩٠٤، والترمذي: ٨٦٤، وإبن ماجه: ٢٩٨٨.

(٣) صحيح.




**واتە: سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: ئیبنو عومەرم بینی (خوا لێیان ڕازی بێ) هەر وەکو ئەوەی باس کرد، ئەوە نەبێ کە وتی: من پیاوێکی بەساڵا چووم.**

## خێرایی ڕۆیشتن لە نێوان صەفاو مەروە

**٢٩٧٨-** «عَنْ الزُّهْرِيِّ قَالَ: سَأَلُوا ابْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، هَلْ رَأَيْتَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَمَلَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ؟ فَقَالَ: كَانَ فِي جَمَاعَةٍ مِنَ النَّاسِ، فَرَمَلُوا، فَلَا أُرَاهُمْ، رَمَلُوا إِلَّا بِرَمَلِهِ»(١).

**واتە: زوهری دەڵێ: پرسیاریان کرد لە ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، ئایا پێغەمبەری خوات ﷺ بینیوە بەخێرایی ڕێ بکات لە نێوان صەفا و مەروە؟ وتی: لە ناو کۆمەڵێک لە خەڵکی بوو، بەخێرایی ڕێیان کرد، پێم وانیە ئەوان بە خێرایی ڕێیان کردبێت مەگەر بە خێرایی ئەو نەبێت.**

## هەروەلە کردن لە نێوان صەفاو مەروە

**٢٩٧٩-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: إِنَّمَا سَعَى النَّبِيُّ ﷺ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، لِيُرِيَ الْمُشْرِكِينَ قُوَّتَهُ»(٢).

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەبەر ئەوە هەروەلەی کرد لە نێوان صەفاو مەروە، تا هاوبەشدانەران هێزو توانای ببینن.**

## هەروەلە کردن لە (بَطْنِ الْمَسِيلِ)
## (شیوێکی نزمە لافاو دەیگرێ لە نێوان صەفا و مەروە)

**٢٩٨٠-** «عَنْ صَفِيَّةَ بِنْتِ شَيْبَةَ عَنِ امْرَأَةٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَسْعَى فِي بَطْنِ الْمَسِيلِ، وَيَقُولُ: لَا يُقْطَعُ الْوَادِي إِلَّا شَدّاً»(٣).

---

(١) ضعيف الإسناد.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٢٥٧، ومسلم: ٢٤٠ و ١٢٦٦/٢٤١، والترمذي: ٨٦٣.

(٣) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ٢٩٨٧.




واتە: صەفیەی کچی شەیبە دەگێڕێتەوە: لە ئافرەتێک (خوا لێی ڕازی بێ) وتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی هەروەلەی دەکرد لەو شوێنەی لافاوی پێدا دەڕوات لە نێوان صەفاو مەروە، وە دەیوت: شیوەکەی نەدەبڕی بە پەلە نەبێت.

## شوێنی ڕێ کردن بە لەسەرخۆیی لە نێوان صەفا و مەروە

**٢٩٨١-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، كَانَ إِذَا نَزَلَ مِنَ الصَّفَا، مَشَى حَتَّى إِذَا انْصَبَّتْ قَدَمَاهُ فِي بَطْنِ الْوَادِي سَعَى حَتَّى يَخْرُجَ مِنْهُ»[١].

## شوێنی ڕێ کردن بە خێرایی لە نێوان صەفا و مەروە

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ دابەزیبایە لە صەفا، بە هێواشی ڕێی دەکرد تا کاتێ دەچووە ناو شیوەکەوە، پاشان بەخێرایی ڕێی دەکرد تا لێی دەردەچوو.

**٢٩٨٢-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا تَصَوَّبَتْ قَدَمَا رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي بَطْنِ الْوَادِي، رَمَلَ حَتَّى خَرَجَ مِنْهُ»[٢].

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر خۆی دابەزییە ناو شیوەکە، بەخێرایی ڕێی کرد تا لە شیوەکە دەرچوو.

**٢٩٨٣-** «عَن جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، نَزَلَ يَعْنِي عَنِ الصَّفَا حَتَّى إِذَا انْصَبَّتْ قَدَمَاهُ فِي الْوَادِي، رَمَلَ حَتَّى إِذَا صَعِدَ مَشَى»[٣].

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە صەفا دابەزییە خوارەوە تا ناو شیوەکە، پاشان بەخێرایی ڕێی کرد تا کاتێ سەرکەوت بەهێواشی ڕێی کرد.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




## شوێنی وستان لەسەر مەروە

**٢٩٨٤-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَتَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمَرْوَةَ، فَصَعِدَ فِيهَا، ثُمَّ بَدَا لَهُ الْبَيْتُ فَقَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، قَالَ: ذَلِكَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ ذَكَرَ اللَّهَ وَسَبَّحَهُ، وَحَمِدَهُ، ثُمَّ دَعَا بِمَا شَاءَ اللَّهُ فَعَلَ هَذَا حَتَّى فَرَغَ مِنَ الطَّوَافِ»[1].

**واتە: جابری کوڕی عەبدوڵلا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ مەروە سەرکەوت بەسەریدا، پاشان کەعبەی لێوە دیار بوو، فەرمووی: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ)، سێ جار ئەوەی فەرموو، پاشان یادو ستایشی خوای کرد، پاشان پاڕایەوەو نزای کرد ئەوەندەی خوا ویستی لەسەر بوو پاڕایەوە، تا تەوافی تەواو کرد.**

## تەکبیر (اللَّهُ أَكْبَر) کردن لەسەر صەفا

**٢٩٨٥-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ذَهَبَ إِلَى الصَّفَا فَرَقِيَ عَلَيْهَا حَتَّى بَدَا لَهُ الْبَيْتُ، ثُمَّ وَحَّدَ اللَّهَ ﷻ، وَكَبَّرَ، وَقَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ يُحْيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ، عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، ثُمَّ مَشَى حَتَّى إِذَا انْصَبَّتْ قَدَمَاهُ، سَعَى حَتَّى إِذَا صَعِدَتْ قَدَمَاهُ مَشَى حَتَّى أَتَى الْمَرْوَةَ فَفَعَلَ عَلَيْهَا كَمَا فَعَلَ عَلَى الصَّفَا حَتَّى قَضَى طَوَافَهُ»[2].

**واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت بۆ صەفا و سەرکەوت بەسەریدا تا بەیتی لێوە دیار بوو، پاشان خوای بەتاک ڕاگرت و تەکبیری کرد و فەرمووی: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ يُحْيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ، عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) پاشان ڕێی کرد تا دابەزیە خوارەوە، پاشان هەروەلەی کرد تا سەرکەوت، ئینجا ڕێی کرد تا هاتە مەروە، لەسەر مەروە ئەوەی کرد کە لەسەر صەفا کردی تا تەوافەکەی تەواو کرد.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




## تەوافی ئەو کەسەی نیەتی حەج و عومرەی پێکەوە هێناوە چەندە، وە ئەو کەسەیشی چووە بۆ حەج ئیحرامی بە عومرە بەستووە؟

**٢٩٨٦-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ يَقُولُ: لَمْ يَطُفِ النَّبِيُّ ﷺ وَأَصْحَابُهُ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ إِلَّا طَوَافاً وَاحِداً»(١).

**واتە:** جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ وهاوەڵانی تەوافی نێوان صەفاو مەروەیان نەکرد، جگە لە یەک تەواف نەبێت.

## عومەرەکەر لە کوێ قژی کورت دەکاتەوە

**٢٩٨٧-** «عَنْ مُعَاوِيَةَ ﷺ، أَنَّهُ قَصَّرَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِمِشْقَصٍ فِي عُمْرَةٍ عَلَى الْمَرْوَةِ»(٢).

**واتە:** موعاویە ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو قژی پێغەمبەری ﷺ کورت کردەوە بە تیرێکی تیژی دەم درێژ (یان بە مەقەس) لە عومرەدا لەسەر مەروە.

**٢٩٨٨-** «عَنْ مُعَاوِيَةَ ﷺ قَالَ: قَصَّرْتُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَلَى الْمَرْوَةِ بِمِشْقَصِ أَعْرَابِيٍّ»(٣).

**واتە:** موعاویە ﷺ دەڵێ: لەسەر مەروە قژی پێغەمبەری خوام ﷺ کورت کردەوە بە تیرێکی تیژی دەم درێژ (یان بە مەقەس) کە هی پیاوێکی دەشتەکی بوو.

## چۆن قژی کورت دەکاتەوە

**٢٩٨٩-** «عَنْ قَيْسِ بْنِ سَعْدٍ عَنْ عَطَاءٍ عَنْ مُعَاوِيَةَ ﷺ قَالَ: أَخَذْتُ مِنْ أَطْرَافِ شَعْرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِمِشْقَصٍ كَانَ مَعِي بَعْدَ مَا طَافَ بِالْبَيْتِ وَبِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ فِي أَيَّامِ الْعَشْرِ، قَالَ: قَيْسٌ وَالنَّاسُ يُنْكِرُونَ هَذَا عَلَى مُعَاوِيَةَ»(٤).

**واتە:** قەیسی کوڕی سەعد دەگێڕێتەوە: لە عەطاء، لە موعاویەوە ﷺ دەڵێ: هەندێ لە دەوروبەری قژی پێغەمبەری خوام ﷺ کورت کردەوە بە تیرێکی تیژی دەم درێژ

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢١٥، وأبو داود: ١٨٩٥، والترمذي: ٩٤٧، وإبن ماجه: ٢٩٧٢ و ٢٩٧٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٧٣٠، ومسلم: ٢٠٩ و ١٢٤٦/٢١٠، وأبو داود: ١٨٠٢ و ١٨٠٣.

(٣) صحيح.

(٤) شاذ.




(یان بە مەقەس) کە لە لام بوو، لە دوای ئەوەی تەوافی کەعبە و صەفاو مەروەی کرد لە دە ڕۆژەکەی (ذِي الْحِجَّة). قەیس وتی: خەڵکی نکوڵی کورتکردنەوەی قژ دەکەن لە موعاویە.

## ئەو کەسەی ئیحرامی حەجی بەستووە ئاژەڵی قوربانی بە دیاری هێناوە چی بکات

**٢٩٩٠-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، لَا نُرَى إِلَّا الْحَجَّ، قَالَتْ: فَلَمَّا أَنْ طَافَ بِالْبَيْتِ وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ قَالَ: مَنْ كَانَ مَعَهُ هَدْيٌ فَلْيُقِمْ عَلَى إِحْرَامِهِ، وَمَنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ هَدْيٌ، فَلْيَحْلِلْ»[١].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین مەبەستمان هیچ نەبوو جگە لە حەج، وتی: کاتێ تەوافی کەعبە و نێوان صەفاو مەروەی کرد، وتی: هەرکەس قوربانی لەگەڵ خۆی هێناوە با بەردەوام بێت لەسەر ئیحرامەکەی، هەر کەسیش قوربانی نەهێناوە با ئیحرامەکەی بشکێنێ.

## ئەو کەسەی ئیحرامی بۆ عومرە بەستووە ئاژەڵی قوربانی بە دیاری هێناوە چی بکات؟

**٢٩٩١-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ، فَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِالْحَجِّ، وَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ وَأَهْدَى، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ وَلَمْ يُهْدِ فَلْيَحْلِلْ، وَمَنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ فَأَهْدَى فَلَا يَحِلَّ، وَمَنْ أَهَلَّ بِحَجَّةٍ فَلْيُتِمَّ حَجَّهُ، قَالَتْ عَائِشَةُ: وَكُنْتُ مِمَّنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ»[٢].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین لە حەجیماڵئاوایی، تیاماندا بوو ئیحرامی حەجی بەستبوو، وە تیاماندا بوو ئیحرامی عومرەی بەستبوو ئاژەڵی قوربانی بە دیاری لەگەڵ خۆی هێنابوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەرکەس ئیحرامی بە نیەتی عومرە بەستوەو ئاژەڵی قوربانی بە دیاری

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٥٦، ومسلم: ١٢١١/١١١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣١٩، ومسلم: ١٢١١/١١٢.



**نەهێناوە با ئیحرام بشکێنێ، هەرکەسیش ئیحرامی بە نیەتی عومرە بەستوەو ئاژەڵی قوربانی بە دیاری لەگەڵ خۆی هیناوە با ئیحرام نەشکێنێ، هەرکەسیش ئیحرامی بە نیەتی حەج بەستووە با حەجەکەی تەواو بکات، عائیشە دەڵێ: من لەو کەسانە بوون ئیحرامم بە نیەتی عومرە بەستبوو.**

**٢٩٩٢-** «عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَتْ: قَدِمْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مُهِلِّينَ بِالْحَجِّ، فَلَمَّا دَنَوْنَا مِنْ مَكَّةَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ هَدْيٌ فَلْيَحْلِلْ، وَمَنْ كَانَ مَعَهُ هَدْيٌ فَلْيُقِمْ عَلَى إِحْرَامِهِ، قَالَتْ: وَكَانَ مَعَ الزُّبَيْرِ هَدْيٌ، فَأَقَامَ عَلَى إِحْرَامِهِ، وَلَمْ يَكُنْ مَعِي هَدْيٌ فَأَحْلَلْتُ، فَلَبِسْتُ ثِيَابِي وَتَطَيَّبْتُ مِنْ طِيبِي، ثُمَّ جَلَسْتُ إِلَى الزُّبَيْرِ فَقَالَ: اسْتَأْخِرِي عَنِّي، فَقُلْتُ: أَتَخْشَى أَنْ أَثِبَ عَلَيْكَ»[1].

**واتە: ئەسمائی کچی ئەبو بەکر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ هاتین ئیحرامی حەجمان بەستبوو، کاتێ نزیک بووینەوە لە مەککە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەرکەس ئاژەڵی قوربانی بە دیاری نەهێناوە با ئیحرام بشکێنێ، هەر کەسیش ئاژەڵی قوربانی بە دیاری هێناوە با بەردەوام بێت لەسەر ئیحرامەکەی، وتی: زوبەیر ئاژەڵی قوربانی هێنا بوو، لەسەر ئیحرامەکەی مایەوە، بەڵام من ئاژەڵی قوربانیم نەهێنا بوو ئیحرامم شکاند، جلەکانم لەبەر کرد و خۆم بۆن خۆش کرد، پاشان لای زوبەیر دانیشتم، وتی: دوور بکەوەرەوە لێم، منیش وتم: ئایا دەترسی بێمە سەرت؟.**

## وتار دان پێش ڕۆژی (التَّرْوِيَةِ):

**(يَوْم التَّرْوِيَة): بریتیە لە ڕۆژی هەشتەم لە مانگی (ذِي الْحِجَّة) بە مێژووی کۆچی، هەروەها بریتیە لەو ڕۆژەی کە حاجیەکان دەچن بۆ مینا، بۆ مانەوە تیایدا، وەک خۆ ئامادە کردنێک بۆ سەرکەوتن بۆ سەر کێوی عەرەفە.**

**٢٩٩٣-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، حِينَ رَجَعَ مِنْ عُمْرَةِ الْجِعِرَّانَةِ بَعَثَ أَبَا بَكْرٍ عَلَى الْحَجِّ فَأَقْبَلْنَا مَعَهُ، حَتَّى إِذَا كَانَ بِالْعَرْجِ ثَوَّبَ بِالصُّبْحِ، ثُمَّ اسْتَوَى لِيُكَبِّرَ فَسَمِعَ الرَّغْوَةَ خَلْفَ ظَهْرِهِ، فَوَقَفَ عَلَى التَّكْبِيرِ، فَقَالَ: هَذِهِ رَغْوَةُ نَاقَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْجَدْعَاءِ، لَقَدْ بَدَا لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي الْحَجِّ فَلَعَلَّهُ أَنْ يَكُونَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَنُصَلِّيَ مَعَهُ، فَإِذَا عَلِيٌّ عَلَيْهَا، فَقَالَ لَهُ أَبُو بَكْرٍ: أَمِيرٌ أَمْ

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢٣٦.




رَسُولٌ؟ قَالَ: لَا بَلْ رَسُولٌ، أَرْسَلَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِبَرَاءَةَ أَقْرَؤُهَا عَلَى النَّاسِ فِي مَوَاقِفِ الْحَجِّ، فَقَدِمْنَا مَكَّةَ فَلَمَّا كَانَ قَبْلَ التَّرْوِيَةِ بِيَوْمٍ، قَامَ أَبُو بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فَخَطَبَ النَّاسَ فَحَدَّثَهُمْ عَنْ مَنَاسِكِهِمْ حَتَّى إِذَا فَرَغَ قَامَ عَلِيٌّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فَقَرَأَ عَلَى النَّاسِ بَرَاءَةٌ حَتَّى خَتَمَهَا، ثُمَّ خَرَجْنَا مَعَهُ حَتَّى إِذَا كَانَ يَوْمُ عَرَفَةَ قَامَ أَبُو بَكْرٍ فَخَطَبَ النَّاسَ فَحَدَّثَهُمْ عَنْ مَنَاسِكِهِمْ، حَتَّى إِذَا فَرَغَ قَامَ عَلِيٌّ فَقَرَأَ عَلَى النَّاسِ بَرَاءَةٌ حَتَّى خَتَمَهَا، ثُمَّ كَانَ يَوْمُ النَّحْرِ فَأَفَضْنَا، فَلَمَّا رَجَعَ أَبُو بَكْرٍ خَطَبَ النَّاسَ فَحَدَّثَهُمْ عَنْ إِفَاضَتِهِمْ، وَعَنْ نَحْرِهِمْ، وَعَنْ مَنَاسِكِهِمْ، فَلَمَّا فَرَغَ قَامَ عَلِيٌّ فَقَرَأَ عَلَى النَّاسِ بَرَاءَةٌ حَتَّى خَتَمَهَا، فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ النَّفْرِ الْأَوَّلُ، قَامَ أَبُو بَكْرٍ فَخَطَبَ النَّاسَ فَحَدَّثَهُمْ كَيْفَ يَنْفِرُونَ، وَكَيْفَ يَرْمُونَ، فَعَلَّمَهُمْ مَنَاسِكَهُمْ، فَلَمَّا فَرَغَ، قَامَ عَلِيٌّ فَقَرَأَ بَرَاءَةٌ عَلَى النَّاسِ حَتَّى خَتَمَهَا»[١].

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ کاتێ گەڕایەوە لە عومرەی جیعرانە ئەبو بەکری نارد بۆ حەج، ئێمەش لەگەڵی ڕۆیشتین، تا گەیشتە (الْعَرْج) قامەتی نوێژی بەیانی کرد، پاشان ڕاست بوویەوە تەکبیر بکات، گوێبیستی دەنگێک بوو لە پشتیەوە، وەستا لەسەر تەکبیرەکەی، وتی: ئەم دەنگە دەنگی وشترەکەی پێغەمبەری خوایە ﷺ کە لووتی بڕاوە، بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ دەیەوێ حەج بکات، بەڵکو ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بێت، نوێژی لەگەڵدا بکەین، بەڵام عەلی دەرکەوت لەسەر وشترەکە، ئەبو بەکر پێی وت: ئەمیریت یان نێردراو؟ وتی: نا بەڵکو نێردراوم، پێغەمبەری خوا ﷺ منی ناردوە (بَرَاءَة) بەسەر خەڵکدا بیخوێننەوە لە ڕێورەسمی حەجدا (واتە: سوورەتی تەوبە)، ڕۆژێک پێش (بَرَاءَة) چووینە مەککە، ئەبو بەکر هەڵسا وتارێکدا باسی ڕێورەسمی حەجی بۆ کردن، کاتێ لێبویەوە عەلی هەڵسا سوورەتی (بَرَاءَة)ـەی بەسەر خەڵکەکەدا خوێند تا تەواوی کرد، پاشان لەگەڵی دەرچووین تا ڕۆژی عەرەفە، ئەبو بەکر هەڵسا وتارێکی بۆ خەڵکەکە خوێند دەربارەی ڕێورەسمەکانیان، تا کاتێ لێبوویەوە عەلی هەڵسا سوورەتی (بَرَاءَة)ـەی بەسەر خەڵکەکەدا خوێند تا تەواوی کرد، پاشان ڕۆژی قوربانی هات گەڕاینەوە، کاتێ ئەبو بەکر گەڕایەوە وتارێکی بۆ خەڵکەکەدا باسی تەوافی گەڕانەوەی بۆ کردن، هەروەها سەربڕین و ڕێورەسمەکانیش، کاتێ تەواو بوو عەلی هەڵسا سوورەتی (بَرَاءَة)ـەی بۆ خەڵکەکە خوێندەوە تا تەواوی کرد، کاتێ کە ڕۆژی (النَّفْر) هات (کە ڕۆژی دوازدەیەمی (ذِي الْحِجَّةِ)یە، کە خەڵکی

---

(١) ضعيف الإسناد.

پەلە دەکات دەربچێ لە مینا) ئەبو بەکر ﷺ هەڵسا وتارێکی بۆ خەڵکیدا چۆن (النَّفْر) دەکەن، وەچۆن شەیتان ڕەجم دەکەن، فێری ڕێوڕەسمەکانیانی کرد، کاتێ تەواو بوو،، عەلی هەڵسا سوورەتی (بَرَاءَة)ـەی خوێند بەسەر خەڵکەکەدا تا تەواوی کرد،

## ئەو کەسەی (حەجی) تەمەتوع دەکات کەی ئیحرام دەبەستێ بە حەج

**٢٩٩٤-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: قَدِمْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لِأَرْبَعٍ مَضَيْنَ مِنْ ذِي الْحِجَّةِ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: أَحِلُّوا وَاجْعَلُوهَا عُمْرَةً، فَضَاقَتْ بِذَلِكَ صُدُورُنَا، وَكَبُرَ عَلَيْنَا، فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَحِلُّوا، فَلَوْلَا الْهَدْيُ الَّذِي مَعِي لَفَعَلْتُ مِثْلَ الَّذِي تَفْعَلُونَ، فَأَحْلَلْنَا حَتَّى وَطِئْنَا النِّسَاءَ، وَفَعَلْنَا مَا يَفْعَلُ الْحَلَالُ، حَتَّى إِذَا كَانَ يَوْمُ التَّرْوِيَةِ، وَجَعَلْنَا مَكَّةَ بِظَهْرٍ لَبَّيْنَا بِالْحَجِّ»[١].

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتین چوار ڕۆژ تێپەڕی بوو لە (ذِي الْحِجَّة)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئیحرام بشکێنن و بیکەن بە عومرە، بەو هۆیەوە ئێمە دڵتەنگ بوین و بە لامانەوە زۆر گران بوو، ئەوە گەیشت بە پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ئەی خەڵکینە ئیحرام بشکێنن، ئەگەر ئاژەڵی قوربانیم بە دیاری لەگەڵ خۆم نەهێنایە ئەوە وەکو ئێوەم دەکرد، ئێمەیش ئیحرامان شکاند تا چووینە لای خێزانەکانمان، ئەوەی ئیحرام نەبەستوو دەیکات ئێمە کردمان، تا ڕۆژی (التَّرْوِيَة) هات، مەککەمان خستە پشتی خۆمان و تەلبیەی حەجمان کرد.

## ئەوەی باس کراوە دەربارەی مینا

**٢٩٩٥-** «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عِمْرَانَ الْأَنْصَارِيِّ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: عَدَلَ إِلَيَّ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ، وَأَنَا نَازِلٌ، تَحْتَ سَرْحَةٍ بِطَرِيقِ مَكَّةَ، فَقَالَ: مَا أَنْزَلَكَ تَحْتَ هَذِهِ الشَّجَرَةِ؟ فَقُلْتُ: أَنْزَلَنِي ظِلُّهَا قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا كُنْتَ بَيْنَ الْأَخْشَبَيْنِ مِنْ مِنًى، وَنَفَخَ بِيَدِهِ نَحْوَ الْمَشْرِقِ، فَإِنَّ هُنَاكَ وَادِياً يُقَالُ لَهُ السُّرَّبَةُ -وَفِي حَدِيثِ الْحَارِثِ، يُقَالُ لَهُ: السُّرَرُ- بِهِ سَرْحَةٌ سُرَّ تَحْتَهَا سَبْعُونَ نَبِيّاً»[٢].

واتە: موحەممەدی کوڕی عیمرانی ئەنصاری، لە باوکیەوە، ﷺ دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر تێپەڕی بەلاماند لە ڕێگای مەککە منیش لە ژێر درەختێکی گەورەدا

---

(١) صحيح.

(٢) ضعيف.



بووم، وتی: چی تۆی هێنا بۆ ژێر ئەم درەختە؟ وتم: سێبەرەکەی منی هێنا، عەبدوڵلا وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر تۆ لە نێوان ئەو دوو کێوەدا بووی لە مینا، بە دەستی ئاماژەی بۆ خۆرهەڵات کرد، بێگومان لەو شوێنەدا شیوێک هەیە پێی دەوترێ (السُّرَّبَةُ) -لە فەرموودەی حاریسدا هاتووە، پێی دەوترێ: (السُّرَرُ)- دارێکی گەورەی لێیە حەفتا پێغەمبەر لە ژێریدا پشوویانداوە.

**٢٩٩٦-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنُ مُعَاذٍ ﷺ قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِمِنًى، فَفَتَحَ اللَّهُ أَسْمَاعَنَا حَتَّى إِنْ كُنَّا لَنَسْمَعُ مَا يَقُولُ وَنَحْنُ فِي مَنَازِلِنَا، فَطَفِقَ النَّبِيُّ ﷺ، يُعَلِّمُهُمْ مَنَاسِكَهُمْ حَتَّى بَلَغَ الْجِمَارَ فَقَالَ: بِحَصَى الْخَذْفِ، وَأَمَرَ الْمُهَاجِرِينَ أَنْ يَنْزِلُوا فِي مُقَدَّمِ الْمَسْجِدِ، وَأَمَرَ الْأَنْصَارَ أَنْ يَنْزِلُوا فِي مُؤَخَّرِ الْمَسْجِدِ»[1].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی موعاز ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وتارێکی بۆ داین لە مینا، خوا ﷻ گوێیەکانمانی کردەوە تا ئێمە قسەکانیمان دەبیست لە ماڵەکانی خۆماندا، پێغەمبەر ﷺ فێری ڕێوڕەسمەکانی کردن تا گەیشت بە چۆنیەتی بەرد باران کردن، فەرمووی: بە بەردی زۆر بچووک کە بە دوو پەنجە دەهاوێژرێ، وە فەرمانی کرد بە موهاجیرەکان لە پێشی مزگەوتەوە دابەزن، فەرمانیشی کرد بە پشتیوانان لە پشتی مزگەوتەوە دابەزن.

## ئیمام لە ڕۆژی (التَّرْوِيَةِ)دا لە کوێ نوێژی نیوەڕۆ دەکات؟

**٢٩٩٧-** «عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ بْنِ رُفَيْعٍ، قَالَ: سَأَلْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ، فَقُلْتُ: أَخْبِرْنِي بِشَيْءٍ عَقَلْتَهُ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَيْنَ صَلَّى الظُّهْرَ يَوْمَ التَّرْوِيَةِ؟ قَالَ: بِمِنًى، فَقُلْتُ: أَيْنَ صَلَّى الْعَصْرَ يَوْمَ النَّفْرِ؟ قَالَ: بِالْأَبْطَحِ»[2].

واتە: عەبدولعەزیری کوڕی ڕوەیفیع دەڵێ: پرسیارم لە ئەنەسی کوڕی مالک ﷺ کرد وتم: هەواڵم بدەرێ بە شتێک لە پێغەمبەرەوە وەرت گرتبێ، پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی (التَّرْوِيَة)دا لە کوێ نوێژی نیوەڕۆی کرد؟ وتی: لە مینا، وتم: لە ڕۆژی (النَّفْر)دا نوێژی عەسری لە کوێ کرد؟ وتی: لە (الْأَبْطَحِ) (کە شوێنێکە دەکەوێتە نێوان مەککەو مینا).

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٩٥٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٥٣ و ١٦٥٤ و ١٧٦٣، ومسلم: ١٣٠٩، وأبو داود: ١٩١٢، والترمذي: ٩٦٤.




## بەیانی کردنەوە لە میناو دەرچوون لەوێوە بۆ عەرەفە

**٢٩٩٨-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: غَدَوْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنْ مِنًى إِلَى عَرَفَةَ، فَمِنَّا الْمُلَبِّي، وَمِنَّا الْمُكَبِّرُ»[١].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بەیانیمان کردەوە لە میناوە چووین بۆ عەرەفە، تیاماندا بوو تەلبیەی دەکرد، وە تیاماندا بوو تەکبیری دەکرد.**

**٢٩٩٩-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: غَدَوْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَى عَرَفَاتٍ، فَمِنَّا الْمُلَبِّي، وَمِنَّا الْمُكَبِّرُ»[٢].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ڕۆژمان کردەوە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ لە میناوە بۆ عەرەفە، تیاماندا بوو تەلبیەی دەکرد، وە تیاماندا بوو تەکبیری دەکرد.**

## تەکبیر (اللَّهُ أَكْبَر) کردن لە کاتی ڕۆیشتن بۆ عەرەفە

**٣٠٠٠-** «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ الثَّقَفِيُّ، قَالَ: قُلْتُ لِأَنَسٍ ﷺ، وَنَحْنُ غَادِيَانِ مِنْ مِنًى إِلَى عَرَفَاتٍ: مَا كُنْتُمْ تَصْنَعُونَ فِي التَّلْبِيَةِ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي هَذَا الْيَوْمِ؟ قَالَ: كَانَ الْمُلَبِّي يُلَبِّي، فَلَا يُنْكَرُ عَلَيْهِ، وَيُكَبِّرُ الْمُكَبِّرُ، فَلَا يُنْكَرُ عَلَيْهِ»[٣].

**واتە: موحەممەدی کوڕی ئەبو بەکری سەقەفی دەڵێ: هەردووکمان ڕۆژمان کردەوە لە میناوە بەرەوە عەرەفە، بە ئەنەسم ﷺ وت: ئێوە چۆن لەم ڕۆژەدا تەلبیەتان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ دەکرد؟ وتی: تەلبیەکەر تەلبیەی دەکرد، نکوولی لێ نەدەکرا، تەکبیر کەریش تەکبیری دەکرد، نکوولی لێ نەدەکرا.**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٧٢ و ١٢٨٤/٢٧٣، وأبو داود: ١٨١٦.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٧٠ و ١٦٥٩، ومسلم: ٢٧٤ و ١٢٨٥/٢٧٥، وإبن ماجه: ٣٠٠٨.




## تەکبیر (اللَّهُ أَکْبَر) کردن لە کاتی ڕۆیشتن بۆ عەرەفە

**٣٠٠١-** «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ وَهُوَ الثَّقَفِيُّ قَالَ: قُلْتُ لِأَنَسٍ ﷺ غَدَاةَ عَرَفَةَ: مَا تَقُولُ فِي التَّلْبِيَةِ فِي هَذَا الْيَوْمِ؟ قَالَ: سِرْتُ هَذَا الْمَسِيرَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأَصْحَابِهِ، وَكَانَ مِنْهُمُ الْمُهِلُّ، وَمِنْهُمُ الْمُكَبِّرُ، فَلَا يُنْكِرُ أَحَدٌ مِنْهُمْ عَلَى صَاحِبِهِ»[١].

**واتە: موحەممەدی کوڕی ئەبو بەکری سەقەفی وتی: بە ئەنەسم ﷺ وت: سەر لە بەیانی عەرەفە لە تەلبیە کردن چی دەڵێ لەم ڕۆژەدا، وتی: ئەم ڕێگایەم لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی بڕی، تیایاندا بوو تەلبیەی دەکرد، وە تیایاندا بوو تەکبیری دەکرد هیچ کەسێکیان نکوڵی لە هاوەڵەکەی نەدەکرد.**

## ئەوەی باس کراوە لە ڕۆژی عەرەفە

**٣٠٠٢-** «عَنْ طَارِقِ بْنِ شِهَابٍ ﷺ قَالَ: قَالَ يَهُودِيٌّ لِعُمَرَ: لَوْ عَلَيْنَا نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ لَاتَّخَذْنَاهُ عِيدًا: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ ۝٣﴾المائدة، قَالَ عُمَرُ: قَدْ عَلِمْتُ الْيَوْمَ الَّذِي أُنْزِلَتْ فِيهِ، وَاللَّيْلَةَ الَّتِي أُنْزِلَتْ: لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ، وَنَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِعَرَفَاتٍ»[٢].

**واتە: طارقی کوڕی شیهاب ﷺ دەڵێ: جولەکەیەک بە عومەری وت: ئەگەر ئەم ئایەتە بۆ ئێمە دابەزیایە دەمانکرد بە جەژن: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ ۝٣﴾ (واتە: ئەمڕۆ ئاینەکەم بۆتان تەواو کرد). عومەر وتی: بەڕاستی ئەو ڕۆژە دەزانم کە تێیدا دابەزی، هەروەها ئەو شەوەش کە تێیدا دابەزی: شەوی هەینی بوو، ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین لە عەرەفات.**

**٣٠٠٣-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَا مِنْ يَوْمٍ أَكْثَرَ مِنْ أَنْ يُعْتِقَ اللَّهُ ﷻ فِيهِ عَبْدًا أَوْأَمَةً مِنَ النَّارِ مِنْ يَوْمِ عَرَفَةَ، وَإِنَّهُ لَيَدْنُو، ثُمَّ يُبَاهِي بِهِمُ الْمَلَائِكَةَ، وَيَقُولُ: مَا أَرَادَ هَؤُلَاءِ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٥ و ٤٤٠٧ و ٤٦٠٦ و ٧٢٦٨، ومسلم: ٣٠١٧، والترمذي: ٣٠٤٣.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٣٤٨، وإبن ماجه: ٣٠١٤.




واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هیچ ڕۆژێک نیە ئەوەندەی ڕۆژی عەرەفە خوا بەندەی تێدا ئازاد بکات لە ئاگر، بێگومان خوا نزیک دەبێتەوە، پاشان فەزڵ و ڕێزی حەجکاران دەردەخات بۆ فریشتەکان، (واتە: بە سۆزو میهرەبانی خۆی لێیان نزیک دەبێتەوە) وە دەفەرموێ: ئەوانە چیان دەوێ. (کە ماڵ و سامان و وڵاتیان جێهێشتووە جگە لە لێخۆشبوونی خواو نزیک بوونەوە لێی).

## قەدەغە کردن لە بەڕۆژوو بوونی ڕۆژی عەرەفە

**٣٠٠٤-** «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ يَوْمَ عَرَفَةَ وَيَوْمَ النَّحْرِ وَأَيَّامَ التَّشْرِيقِ عِيدُنَا أَهْلَ الْإِسْلَامِ، وَهِيَ أَيَّامُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ»[١].

واتە: عوقبەی کوڕی عامر ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی ڕۆژی عەرەفە و ڕۆژی قوربان و ڕۆژەکانی تەشریق (سێ ڕۆژەکەی دوای جەژنی قوربانە) لای ئێمەی مسوڵمان، ڕۆژانی خواردن و خواردنەوەیە.

## ڕۆیشتن لە ڕۆژی عەرەفەدا

**٣٠٠٥-** «عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: كَتَبَ عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ مَرْوَانَ إِلَى الْحَجَّاجِ بْنِ يُوسُفَ يَأْمُرُهُ أَنْ لَا يُخَالِفَ ابْنَ عُمَرَ، فِي أَمْرِ الْحَجِّ، فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ عَرَفَةَ، جَاءَهُ ابْنُ عُمَرَ، حِينَ زَالَتِ الشَّمْسُ وَأَنَا مَعَهُ، فَصَاحَ عِنْدَ سُرَادِقِهِ: أَيْنَ هَذَا؟ فَخَرَجَ إِلَيْهِ الْحَجَّاجُ وَعَلَيْهِ مِلْحَفَةٌ مُعَصْفَرَةٌ، فَقَالَ لَهُ: مَا لَكَ يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ؟ قَالَ: الرَّوَاحَ إِنْ كُنْتَ تُرِيدُ السُّنَّةَ، فَقَالَ لَهُ: هَذِهِ السَّاعَةَ فَقَالَ لَهُ: نَعَمْ، فَقَالَ: أُفِيضُ عَلَيَّ مَاءً ثُمَّ أَخْرُجُ إِلَيْكَ، فَانْتَظَرَهُ حَتَّى خَرَجَ فَسَارَ بَيْنِي وَبَيْنَ أَبِي، فَقُلْتُ: إِنْ كُنْتَ تُرِيدُ أَنْ تُصِيبَ السُّنَّةَ، فَأَقْصِرِ الْخُطْبَةَ، وَعَجِّلِ الْوُقُوفَ، فَجَعَلَ يَنْظُرُ إِلَى ابْنِ عُمَرَ كَيْمَا يَسْمَعَ ذَلِكَ مِنْهُ، فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ ابْنُ عُمَرَ، قَالَ: صَدَقَ»[٢].

واتە: سالمی کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان نوسراوی کرد بۆ حەجاجی کوڕی یوسف پێی ڕاگەیاند پێچەوانەی ئیبنو عومەر نەکات لە

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٤١٩، والترمذي: ٧٧٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٦٠ و ١٦٦٢، - معلقاً - ومسلم: ١٦٦٣.

کاروباری حەجدا، کاتێ ڕۆژی عەرەفە هات، ئیبن و عومەر هات بۆ لای کاتێ خۆر لەناوەڕاستی ئاسمان ترازابوو دوای نیوەڕۆ منیش لەگەڵی بووم، لای ڕەشماڵی حاجیەکانەوە هاواری کرد: ئەمە کوێیە؟ حەجاج هاتە دەرەوە بۆ لای بە جلێکی ڕەنگاو ڕەنگەوە پێی وت: ئەی باوکی عەبدوڕڕەحمان ئەوە چیە؟ وتی: کاتی دەرچوونە بۆ عەرەفە ئەگەر تۆ سوننەتت دەوێ، پێی وت: ئێستا، وتی بەڵێ، وتی: ئاوێ ئەکەم بەخۆمدا پاشان دێم بۆ لات، چاوەڕوانی کرد تا دەرچوو، لە نێوانی من و باوکمدا ڕێی دەکرد، وتم: ئەگەر تۆ سوننەتت دەوێ، وتارەکەت کورت بکەرەوە و پەلە بکە لە وەستاندا، تەماشای ئیبنو عومەری دەکرد بزان چی دەڵێ، کاتێ ئیبنو عومەر هەستی بەوە کرد، وتی: ڕاستی کرد.

## تەلبیەکردن لە عەرەفە

**٣٠٠٦-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: كُنْتُ مَعَ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، بِعَرَفَاتٍ، فَقَالَ: مَا لِي لَا أَسْمَعُ النَّاسَ يُلَبُّونَ؟ قُلْتُ: يَخَافُونَ مِنْ مُعَاوِيَةَ، فَخَرَجَ ابْنُ عَبَّاسٍ، مِنْ فُسْطَاطِهِ، فَقَالَ: لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ فَإِنَّهُمْ قَدْ تَرَكُوا السُّنَّةَ مِنْ بُغْضِ عَلِيٍّ»[١].

واتە: سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: لەگەڵ ئیبنو عەبباسدا بووم لە عەرەفات، وتی: ئەوە چیە نابیستم خەڵکی تەلبیە بکەن؟ وتم: لە موعاویە دەترسن، ئیبنو عەبباس لە دەوارەکەی دەرچوو وتی: (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ) بەڕاستی ئەوان لە ڕقی عەلی وازیان لە سوننەت هیناوە.

## وتاردان لە عەرەفە پێش نوێژ

**٣٠٠٧-** «عَنْ سَلَمَةَ بْنِ نُبَيْطٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ عَلَى جَمَلٍ أَحْمَرَ بِعَرَفَةَ قَبْلَ الصَّلَاةِ»[٢].

واتە: سەلەمەی کوڕی نوبەیط دەگێڕێتەوە: لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لەسەر وشترێکی سوور وتاری دەدا لە عەرەفە پێش نوێژ.

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح.




## وتاردان لە ڕۆژی عەرەفە لەسەر وشتر

**٣٠٠٨-** «عَنْ سَلَمَةَ بْنِ نُبَيْطٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَخْطُبُ يَوْمَ عَرَفَةَ عَلَى جَمَلٍ أَحْمَرَ»[١].

واتە: سەلەمەی کوڕی نوبەیط دەگێڕێتەوە: لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لە ڕۆژی عەرەفە وتاری دەدا لەسەر وشترێکی سوور.

## کورت کردنەوەی وتار لە عەرەفە

**٣٠٠٩-** «عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ، جَاءَ إِلَى الْحَجَّاجِ بْنِ يُوسُفَ يَوْمَ عَرَفَةَ حِينَ زَالَتِ الشَّمْسُ وَأَنَا مَعَهُ، فَقَالَ: الرَّوَاحَ إِنْ كُنْتَ تُرِيدُ السُّنَّةَ، فَقَالَ: هَذِهِ السَّاعَةَ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ سَالِمٌ: فَقُلْتُ لِلْحَجَّاجِ: إِنْ كُنْتَ تُرِيدُ أَنْ تُصِيبَ الْيَوْمَ السُّنَّةَ فَأَقْصِرِ الْخُطْبَةَ، وَعَجِّلِ الصَّلَاةَ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ: صَدَقَ»[٢].

واتە: سالمی کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر هات بۆ لای حەجاجی کوڕی یوسف کاتێ خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان ترازابوو، منیش لەگەڵی بووم، جا وتی: کاتی دەرچوونە بۆ عەرەفە ئەگەر تۆ سوننەتت دەوێ، ئەویش وتی: ئا ئێستا، وتی بەڵێ، سالم وتی: بە حەجاجم وت: ئەگەر تۆ سوننەتت دەوێ، وتارەکەت کورت بکەرەوەو نوێژ بە پەلە بکە، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر وتی: ڕاستی کرد.

## کۆکردنەوەی نوێژی نیوەڕۆو عەسر لە عەرەفە

**٣٠١٠-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، يُصَلِّي الصَّلَاةَ لِوَقْتِهَا إِلَّا بِجَمْعٍ وَعَرَفَاتٍ»[٣].

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژەکانی لەکاتی خۆیدا دەکرد جگە لە (جمع) نەبێت (واتە: موزدەلیفە)و عەرەفات.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٩١٦، وإبن ماجه: ١٢٨٦.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## بابەت: بەرزکردنەوەی هەردوو دەست لە کاتی نزاکردن لە عەرەفە

**٣٠١١-** «عَنْ عَطَاءٍ قَالَ: قَالَ أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: كُنْتُ رَدِيفَ النَّبِيِّ ﷺ بِعَرَفَاتٍ، فَرَفَعَ يَدَيْهِ يَدْعُو، فَمَالَتْ بِهِ نَاقَتُهُ، فَسَقَطَ خِطَامُهَا فَتَنَاوَلَ الْخِطَامَ بِإِحْدَى يَدَيْهِ، وَهُوَ رَافِعٌ يَدَهُ الْأُخْرَى»[1].

واتە: عەطاء دەڵێ: ئوسامەی کوڕی زەید وتی: من لە پشتی پێغەمبەرەوە ﷺ بووم بەسواری وشتر لە عەرەفات، دەستەکانی بەرزکردەوەو پاڕایەوە، وشترەکەی لاری کردەوە، بە جۆرێک ڕەشمەکەی بەربوویەوە بەدەستێکی ڕەشمەی وشترەکەی گرت دەستەکەی تریشی بڵندکردبویەوە بۆ نزا.

**٣٠١٢-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَتْ قُرَيْشٌ تَقِفُ بِالْمُزْدَلِفَةِ، وَيُسَمَّوْنَ الْحُمْسَ، وَسَائِرُ الْعَرَبِ تَقِفُ بِعَرَفَةَ، فَأَمَرَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى نَبِيَّهُ ﷺ أَنْ يَقِفَ بِعَرَفَةَ، ثُمَّ يَدْفَعُ مِنْهَا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ: ﴿ ثُمَّ أَفِيضُوا۟ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ ﴿١٩٩﴾ ﴾البقرة»[2].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: قورەیشیەکان لە موزدەلیفە دەوەستان، پێیان دەوترا (الْحُمْسَ)، هەموو عەرەبیش لە عەرەفە دەوەستان، خوا فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کرد لە عەرەفە بوەستێ، پاشان گەڕایەوە لێی، خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ ثُمَّ أَفِيضُوا۟ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ ﴿١٩٩﴾ ﴾ (واتە: پاشان بگەڕێنەوە بۆ ئەو شوێنەی خەڵکی بۆی دەگەڕێتەوە).

**٣٠١٣-** «عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ ﷺ قَالَ: أَضْلَلْتُ بَعِيراً لِي، فَذَهَبْتُ أَطْلُبُهُ بِعَرَفَةَ يَوْمَ عَرَفَةَ، فَرَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَاقِفاً، فَقُلْتُ: مَا شَأْنُ هَذَا إِنَّمَا هَذَا مِنَ الْحُمْسِ»[3].

واتە: جوبەیری کوڕی موطعیم ﷺ دەڵێ: وشترێکم لێ بزربوو لە ڕۆژی عەرەفە بە دوایدا دەگەڕام بینیم پێغەمبەر ﷺ لە عەرەفە وەستا بوو وتم: بە خوا ئەمە لە وەچەی قورەیشە ئەبێ لێرە چی بکات.

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٦٥، ومسلم: ١٢١٩/١٥١.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٦٤، ومسلم: ١٢٢٠.




**٣٠١٤-** «عَنْ يَزِيدِ بْنِ شَيْبَانَ ﷺ قَالَ: كُنَّا وُقُوفاً بِعَرَفَةَ مَكَاناً بَعِيداً مِنَ الْمَوْقِفِ، فَأَتَانَا ابْنُ مِرْبَعٍ الْأَنْصَارِيُّ، فَقَالَ: إِنِّي رَسُولُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَيْكُمْ، يَقُولُ: كُونُوا عَلَى مَشَاعِرِكُمْ، فَإِنَّكُمْ عَلَى إِرْثٍ مِنْ إِرْثِ أَبِيكُمْ إِبْرَاهِيمَ عَلَيْهِ السَّلَامُ»[1].

**واتە: یەزیدی کوڕی شەیبان ﷺ دەڵێ: ئێمە لە عەرەفە وەستابووین لە شوێنێکی دوور لە (الْمَوْقِف) (جێگای وەستان لە عەرەفە)، ئیبنو میربەعی ئەنصاڕی هات بۆ لامان وتی: من نێردراوی پێغەمبەری خوام ﷺ بۆ لاتان، دەفەرموێ: (لە شوێنەکانی خۆتان بمێننەوە چونکە میراتیەکە لە باپیرەتان ئیبراهیمەوە هاتوە).**

**٣٠١٥-** «عَنْ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي قَالَ: أَتَيْنَا جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، فَسَأَلْنَاهُ عَنْ حَجَّةِ النَّبِيِّ ﷺ، فَحَدَّثَنَا أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ قَالَ: عَرَفَةُ كُلُّهَا مَوْقِفٌ»[2].

**واتە: جەعفەری کوڕی موحەممەد دەڵێ: باوکم بۆی باس کردم وتی: هاتین بۆ لای جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) پرسیاری چۆنیەتی حەجی پێغەمبەرمان ﷺ لێ کرد، بۆی باس کردین پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو چیای عەرەفە گونجاوە بۆ وەستان.**

## وەستان لە عەرەفە فەرزە

**٣٠١٦-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَعْمَرَ ﷺ قَالَ: شَهِدْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَأَتَاهُ نَاسٌ، فَسَأَلُوهُ عَنِ الْحَجِّ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْحَجُّ عَرَفَةُ، فَمَنْ أَدْرَكَ لَيْلَةَ عَرَفَةَ قَبْلَ طُلُوعِ الْفَجْرِ مِنْ لَيْلَةِ جَمْعٍ، فَقَدْ تَمَّ حَجُّهُ»[3].

**واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی یەعمەر ﷺ دەڵێ: ئامادە بووم لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ خەڵکێک هاتن بۆ لای پرسیاریان لێکرد لەبارەی حەجەوە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: حەج (وەستانی) عەرەفەیە، هەرکەس بگات بە شەوی عەرەفە پێش دەرچوونی بەرەبەیان لە شەوی (جمع) (واتە: موزدەلیفە)، ئەوە حەجەکەی تەواوە.**

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٩١٩، والترمذي: ٨٨٣، وإبن ماجه: ٣٠١١.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٩٤٩، والترمذي: ٨٨٩ و ٨٩٠، وإبن ماجه: ٣٠١٥.

**٣٠١٧-** «عَنِ الْفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: أَفَاضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ عَرَفَاتٍ، وَرِدْفُهُ أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ، فَجَالَتْ بِهِ النَّاقَةُ وَهُوَ رَافِعٌ يَدَيْهِ لَا تُجَاوِزَانِ رَأْسَهُ، فَمَا زَالَ يَسِيرُ عَلَى هِينَتِهِ حَتَّى انْتَهَى إِلَى جَمْعٍ»[١].

**واتە: فەزڵی کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە عەرەفە گەڕایەوە، ئەوەی لە پشتیەوە بوو ئوسامەی کوڕی زەید بوو، وشترەکە لە جێگاکەی خۆی ڕۆیشت و کەوتە ڕێ، ئەویش دەستی بەرز کردبوویەوە لەسەری بەرزتر نەبوو، بەردەوام بە لەسەرخۆیی دەڕۆیی تا گەیشتە (جَمْع) (واتە: موزدەلیفە).**

**٣٠١٨-** «عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: أَفَاضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ عَرَفَةَ وَأَنَا رَدِيفُهُ، فَجَعَلَ يَكْبَحُ رَاحِلَتَهُ حَتَّى أَنَّ ذِفْرَاهَا لَيَكَادُ يُصِيبُ قَادِمَةَ الرَّحْلِ وَهُوَ يَقُولُ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، عَلَيْكُمْ بِالسَّكِينَةِ وَالْوَقَارِ، فَإِنَّ الْبِرَّ لَيْسَ فِي إِيضَاعِ الْإِبِلِ»[٢].

**واتە: ئوسامەی کوڕی زەید (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە عەرەفە گەڕایەوە، منیش لە پشتیەوە بووم، جڵەوی وشترەکەی ڕادەکێشا تا خەریک بوو گوێیەکانی لە زینەکەی دەدا، دەیفەرموو: ئەی خەڵکینە، پێویستە لەسەرتان لەسەرخۆو هێمن بن، چونکە چاکە لە پەلە پەل پێ کردنی وشتردا نیە.**

## فەرمان کردن بە لەسەرخۆیی و هێمنی لە کاتی هاتنەخوارەوە لە عەرەفە

**٣٠١٩-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: لَمَّا دَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ شَنَقَ نَاقَتَهُ حَتَّى أَنَّ رَأْسَهَا لَيَمَسُّ وَاسِطَةَ رَحْلِهِ، وَهُوَ يَقُولُ لِلنَّاسِ: السَّكِينَةَ السَّكِينَةَ عَشِيَّةَ عَرَفَةَ»[٣].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەوی عەرەفە هاتە خوارەوە ئەوەندە ڕەشمەی وشترەکەی بە توندی ڕادەکێشا تا خەریک بوو سەری دەیدا لە ناوەڕاستی زینەکەی، بە خەڵکەکەی دەیفەرموو: لەسەرخۆو هێمن بن لەسەرخۆو هێمن بن.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٩ و ١٨١ و ١٦٦٧ و ١٦٧٢، ومسلم: ١٢٨٠، وأبو داود: ١٩٢٥.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٧١.

**٣٠٢٠-** «عَنِ الْفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، وَكَانَ رَدِيفَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ فِي عَشِيَّةِ عَرَفَةَ وَغَدَاةِ جَمْعٍ لِلنَّاسِ حِينَ دَفَعُوا: عَلَيْكُمُ السَّكِينَةَ، وَهُوَ كَافٌّ نَاقَتَهُ، حَتَّى إِذَا دَخَلَ مُحَسِّراً، وَهُوَ مِنْ مِنًى، قَالَ: عَلَيْكُمْ بِحَصَى الْخَذْفِ الَّذِي يُرْمَى بِهِ، فَلَمْ يَزَلْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُلَبِّي، حَتَّى رَمَى الْجَمْرَةَ»[١].

**واتە: فەزلی کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: کە لە پشتی پێغەمبەری خواوە ﷺ بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەوی عەرەفە و سەر لە بەیانی کۆبوونەوەی خەڵک کاتێ هاتنە خوارەوە فەرمووی: پێوستە هێمن و لەسەرخۆو بن)، ڕەشمەی وشترەکەی گرتبوو نەیدەهێشت بە پەلە ڕێ بکات، تا کاتێ گەیشتە شیوی (مُحَسِّر) کە لە مینایە، ئینجا فەرمووی: پێویستە بەردی (الْخَذْف) (بە ئەندازەی دەنکە نۆکێک دەبێت) بەکاربێنن، بەردەوام پێغەمبەری خوا ﷺ تەلبیەی دەکرد، تا بەردبارانی (الْجَمْرَةَ)ـەی کرد.**

**(الْجَمْرَةَ): تاکی (الجَمَرات)ـە، کە لە مینادا بەردباران دەکرێ، لە کوردەواریی خۆماندا پێی دەوترێ: بەردباران کردنی شەیتان، ئەوەش هەڵەیە).**

**٣٠٢١-** «عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه قَالَ: أَفَاضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَعَلَيْهِ السَّكِينَةُ، وَأَمَرَهُمْ بِالسَّكِينَةِ، وَأَوْضَعَ فِي وَادِي مُحَسِّرٍ، وَأَمَرَهُمْ أَنْ يَرْمُوا الْجَمْرَةَ بِمِثْلِ حَصَى الْخَذْفِ»[٢].

**واتە: جابر رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە خوارەوە لە عەرەفە لەسەرخۆو هێمن بوو، فەرمانی پێکردن لەسەرخۆو هێمن بن، لە شیوی (مُحَسِّر) لایدا، فەرمانی پێ کردن بەردبارانی جەمرە بکەن بە بەردێکی بچووک وەکو بەردەی (الْخَذْف) (کە بە ئەندازەی دەنکە نۆکێک دەبێت).**

**٣٠٢٢-** «عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَفَاضَ مِنْ عَرَفَةَ، وَجَعَلَ يَقُولُ: السَّكِينَةَ عِبَادَ اللَّهِ، يَقُولُ بِيَدِهِ هَكَذَا، وَأَشَارَ أَيُّوبُ، بِبَاطِنِ كَفِّهِ إِلَى السَّمَاءِ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢٨٢.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢٩٧، وأبو داود: ١٩٤٤ و ١٩٧٠، والترمذي: ٨٨٦ و ٨٩٧، وإبن ماجه: ٣٠٢٣.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢٩٧، وأبو داود: ١٩٤٤ و ١٩٧٠، والترمذي: ٨٨٦ و ٨٩٧، وإبن ماجه: ٣٠٢٣.

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هاتە خوارەوە لە عەرەفە لەسەرخۆو هێمن بوو، وە دەیفەرموو: لەسەرخۆبن ئەی بەندەکانی خوا، بەدەستی بەم شێوەی دەکرد، ئەیوب ئاماژەی کرد بەناو لەپی بەرەو ئاسمان.

## چۆنێتی ڕێکردن لە عەرەفە

**٣٠٢٣-** «عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﷺ أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ مَسِيرِ النَّبِيِّ ﷺ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ، قَالَ: كَانَ يَسِيرُ الْعَنَقَ، فَإِذَا وَجَدَ فَجْوَةً نَصَّ»[١].

واتە: ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو پرسیاری لێکرا دەربارەی چۆنیەتی ڕێکردنی پێغەمبەر ﷺ لە حەجی ماڵئاواییدا؟ وتی: بەشێوەیەکی ئاسایی ڕێی دەکرد، بەڵام کاتێ بۆشاییەکی بەدی بکردایە گورج دەچوو.

تێبینی: (الْعَنَقَ) واتە: ڕۆیشتنی ئاسایی، (نَصَّ) واتە: گورج ڕۆیشتن.

## هاتنەخوارەوەو دابەزینی دوای قەرەباڵغی عەرەفە.

**٣٠٢٤-** «عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ حَيْثُ أَفَاضَ مِنْ عَرَفَةَ مَالَ إِلَى الشِّعْبِ، قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ: أَتُصَلِّي الْمَغْرِبَ؟ قَالَ: الْمُصَلَّى أَمَامَكَ»[٢].

واتە: ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ لەو شوێنەی لە عەرەفەوە دادەبەزی پێچی دەکردەوە بەرەو لای شیوەکە، وتی: پێم وت: ئایا نوێژی مەغریب دەکەیت؟ فەرمووی: شوێنی نوێژکردن لە پێشەوەتەیە.

**٣٠٢٥-** «عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَزَلَ الشِّعْبَ الَّذِي يَنْزِلُهُ الْأُمَرَاءُ فَبَالَ، ثُمَّ تَوَضَّأَ وُضُوءاً خَفِيفاً، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ الصَّلَاةَ؟ قَالَ: الصَّلَاةُ أَمَامَكَ. فَلَمَّا أَتَيْنَا الْمُزْدَلِفَةَ لَمْ يَحُلَّ آخِرُ النَّاسِ حَتَّى صَلَّى»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٦٦ و ٢٩٩٩ و ٤٤١٣، ومسلم: ٢٨٣ و ١٢٨٦/٢٨٤، وأبو داود: ١٩٢٣، وإبن ماجه: ٢٠١٧.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٩ و ١٨١ و ١٦٦٧ و ١٦٦٩ و ١٦٧٢، ومسلم: ٢٦٦ و ٢٧٦ و ١٢٨٠/٢٨٠، وأبو داود: ١٩٢١ و ١٩٢٥، وإبن ماجه: ٣٠١٩.





واتە: ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزییە ئەو شێوەی کە دەسەڵاتدارەکان دادەبەزین بۆی، میزی کرد، پاشان دەستنوێژی گرت بە دەستنوێژ گرتنێکی سووک، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژ ناکەی؟ فەرمووی: نوێژ لە پێشتەوەیە، کاتێ هاتینە موزدەلیفە هیچ کەس باری سەر وڵاخی دانەگرت تا نوێژی کرد.

## کۆکردنەوەی دوو نوێژ لە موزدەلیفە

٣٠٢٦- «عَنْ أَبِي أَيُّوبَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ جَمَعَ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ بِجَمْعٍ»[١].

واتە: ئەبو ئەیوب ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی مەغریب و عیشای کۆکردەوە لە (جمع) (واتە: موزدەلیفە).

٣٠٢٧- «عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، جَمَعَ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ بِجَمْعٍ»[٢].

واتە: ئیبنو مەسعود ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ نوێژی مەغریب و عیشای کۆکردەوە لە (جمع) (واتە: موزدەلیفە).

٣٠٢٨- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، جَمَعَ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ بِجَمْعٍ بِإِقَامَةٍ وَاحِدَةٍ، لَمْ يُسَبِّحْ بَيْنَهُمَا، وَلَا عَلَى إِثْرِ كُلِّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا»[٣].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی مەغریب و عیشای کۆکردەوە لە (جمع) (واتە: موزدەلیفە) بە یەک قامەت، تەسبیحاتی لە نێوانیاندا نەکرد، هەروەها لە دوای هەریەکێکیان نەیکرد.

٣٠٢٩- «عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ أَبَاهُ ﷺ قَالَ: جَمَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ، لَيْسَ بَيْنَهُمَا سَجْدَةٌ، صَلَّى الْمَغْرِبَ ثَلَاثَ رَكَعَاتٍ، وَالْعِشَاءَ رَكْعَتَيْنِ وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ، يَجْمَعُ كَذَلِكَ حَتَّى لَحِقَ بِاللَّهِ ﷻ»[٤].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٧٥ و ١٦٨٢ و ١٦٨٣، ومسلم: ١٢٨٩، وأبو داود: ١٩٣٤.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٨٢، ومسلم: ١٢٨٩/٢٩٢.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ٣٠٢٩.




واتە: عوبەیدوڵڵای كوڕی عەبدوڵڵا، هەواڵی داوە بەڕاستی باوكی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی مەغریب و عیشای پێكەوە كۆكردەوە لە نێوانیاندا نوێژی نەكرد، سێ ڕكات نوێژی مەغریبی كرد، دوو ڕكات نوێژی عیشاش، عەبدوڵڵای كوڕی عومەریش بە هەمان شێوە كۆی دەكردەوە تا گەیشت بە خوای زاڵی پایەدار.

**٣٠٣٠**- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ بِجَمْعٍ بِإِقَامَةٍ وَاحِدَةٍ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی مەغریب و عیشای لە موزدەلیفە كرد بە یەك قامەت.

**٣٠٣١**- «عَنْ كُرَيْبٍ قَالَ: سَأَلْتُ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ ﷺ، وَكَانَ رِدْفَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَشِيَّةَ عَرَفَةَ، فَقُلْتُ: كَيْفَ فَعَلْتُمْ؟ قَالَ: أَقْبَلْنَا نَسِيرُ حَتَّى بَلَغْنَا الْمُزْدَلِفَةَ، فَأَنَاخَ، فَصَلَّى الْمَغْرِبَ، ثُمَّ بَعَثَ إِلَى الْقَوْمِ، فَأَنَاخُوا فِي مَنَازِلِهِمْ، فَلَمْ يَحُلُّوا حَتَّى صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْعِشَاءَ الْآخِرَةَ، ثُمَّ حَلَّ النَّاسُ فَنَزَلُوا، فَلَمَّا أَصْبَحْنَا انْطَلَقْتُ عَلَى رِجْلَيَّ فِي سُبَّاقِ قُرَيْشٍ، وَرَدِفَهُ الْفَضْلُ»[٢].

واتە: كورەیب دەڵێ: پرسیارم لە ئوسامەی كوڕی زەید ﷺ كرد، لە پشتی پێغەمبەری خواوە ﷺ بوو لە شەوی عەرەفە، وتم: چیتان كرد، وتی: كەوتینە ڕێ تا گەیشتینە موزدەلیفە، وشترەكەی یەخدا، ئینجا نوێژی مەغریبی كرد، پاشان خەڵكەكەی ئاگاداركردەوە ئەوانیش لە شوێنی خۆیان وشترەكانیان یەخدا، بارەكانیان دانەگرت لەسەر وشترەكان تا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی عیشای كرد، پاشان بارەكانیان داگرت و دابەزین، كاتێ بەیانیان كردەوە بە پێی خۆم لەگەڵ قوڕەیشیەكاندا دەرچووم بۆ مینا، فەزڵیش لە پشتی پێغەمبەرەوە ﷺ بوو.

## پێشخستنی ژن و منداڵەكان بۆ جێگاكانیان لە موزدەلیفە

**٣٠٣٢**- «عَنِ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: أَنَا مِمَّنْ قَدَّمَ النَّبِيُّ ﷺ لَيْلَةَ الْمُزْدَلِفَةِ فِي ضَعَفَةِ أَهْلِهِ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٦٩ و ١٧٧٢، ومسلم: ١٢٨٠.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٧٧ و ١٦٧٨ و ١٨٥٦، ومسلم: ٣٠٠ و ٣٠١ و ١٢٩٣/٣٠٢ و ١٢٩٤، وأبو داود: ١٩٣٩، والترمذي: ٨٩٢، وإبن ماجه: ٣٠٢٦.




**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: من لەو کەسانە بووم، پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ لاوازەکانی بنەماڵەکەی ناردمی لە شەوی موزدەلیفە بۆ مینا (لەبەر ئەوە نوێژی بەیانی لە مینا بکەن و بەرد بارانی جەمرە بکەن پێش ئەوەی خەڵکی بێت).**

**٣٠٣٣-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كُنْتُ فِيمَنْ قَدَّمَ النَّبِيُّ ﷺ لَيْلَةَ الْمُزْدَلِفَةِ فِي ضَعَفَةِ أَهْلِهِ»[1].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: من لەو کەسانە بووم کە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ لاوازەکانی بنەماڵەی (هاشم) ناردمی لە شەوی موزدەلیفە بۆ مینا.**

**٣٠٣٤-** «عَنِ الْفَضْلِ رضي الله عنه أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، أَمَرَ ضَعَفَةَ بَنِي هَاشِمٍ أَنْ يَنْفِرُوا مِنْ جَمْعٍ بِلَيْلٍ»[2].

**واتە: فەزل رضي الله عنه دەڵێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە لاوازەکانی خانەوادەکەی لە شەودا موزدەلیفە بەجێبهێڵن و بچن بۆ مینا.**

**٣٠٣٥-** «عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، أَمَرَهَا أَنْ تُغَلِّسَ مِنْ جَمْعٍ إِلَى مِنًى»[3].

**واتە: دایکی حەبیبە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکرد لە شەودا لە موزدەلیفە دەربچن بۆ مینا.**

**٣٠٣٦-** «عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كُنَّا نُغَلِّسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنَ الْمُزْدَلِفَةِ إِلَى مِنًى»[4].

**واتە: دایکی حەبیبە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ئێمە شەومان دەکردەوە لەسەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ لە موزدەلیفەوە بۆ مینا.**

---

(١) صحيح.

(٢) حسن صحيح الإسناد.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٩٨ و ١٢٩٢/٢٩٩.

## مۆڵەت دان بە ئافرەتان لە هاتنە خوارەوە لە موزدەلیفە پێش بەرەبەیان

**٣٠٣٧-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: إِنَّمَا أَذِنَ النَّبِيُّ ﷺ لِسَوْدَةَ فِي الْإِفَاضَةِ قَبْلَ الصُّبْحِ مِنْ جَمْعٍ لِأَنَّهَا كَانَتِ امْرَأَةً ثَبِطَةً»(١).

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: بۆیە پێغەمبەر ﷺ ڕێگایدا بە سەودە لە هاتنە خوارەوە لە مزدەلیفە پێش بەرەبەیان، چونکە ئافرەتێکی قورس و گران بوو.

## ئەو کاتەی نوێژی بەیانی تێدا ئەنجام دەدرێ لە موزدەلیفە

**٣٠٣٨-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى صَلَاةً قَطُّ إِلَّا لِمِيقَاتِهَا إِلَّا صَلَاةَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ، صَلَّاهُمَا بِجَمْعٍ، وَصَلَاةَ الْفَجْرِ يَوْمَئِذٍ قَبْلَ مِيقَاتِهَا»(٢).

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینیوە نوێژی بکات تەنها لە کاتی خۆیدا نەبێت، جگە لە نوێژی مەغریب و عیشا، هەردووکیانی بە کۆ کرد، وە لەو ڕۆژەشدا نوێژی بەیانی پێش کاتی خۆی کرد.

## دەربارەی ئەو کەسەی ناگات بە نوێژی بەیانی لەگەڵ ئیمام لە موزدەلیفە

**٣٠٣٩-** «عَنْ عُرْوَةَ بْنِ مُضَرِّسٍ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَاقِفاً بِالْمُزْدَلِفَةِ، فَقَالَ: مَنْ صَلَّى مَعَنَا صَلَاتَنَا هَذِهِ هَا هُنَا، ثُمَّ أَقَامَ مَعَنَا وَقَدْ وَقَفَ قَبْلَ ذَلِكَ بِعَرَفَةَ لَيْلاً أَوْ نَهَاراً، فَقَدْ تَمَّ حَجُّهُ»(٣).

واتە: عوروەی کوڕی موضەڕس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرم بینی وەستابوو لە موزدەلیفە، فەرمووی: هەرکەس ئەم نوێژەمان لەگەڵ بکات لێرەدا، پاشان لەگەڵماندا بمێنێتەوە، پێش ئەوەش لە عەرەفە وەستا بێت شەو یان ڕۆژ، ئەوە بێگومان حەجەکەی تەواوە.

**٣٠٤٠-** «عَنْ عُرْوَةَ بْنِ مُضَرِّسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ أَدْرَكَ جَمْعاً مَعَ الْإِمَامِ وَالنَّاسِ حَتَّى يُفِيضَ مِنْهَا، فَقَدْ أَدْرَكَ الْحَجَّ، وَمَنْ لَمْ يُدْرِكْ مَعَ النَّاسِ وَالْإِمَامِ، فَلَمْ يُدْرِكْ»(٤).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٨٠ و ١٦٨١، ومسلم: ٢٩٣ و ١٢٩٠/٢٩٦، وإبن ماجه: ٣٠٢٧.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




**واتە: عوروەی کوڕی موضەڕس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس لە موزدەلیفە بگات بە نوێژدا لەگەڵ ئیمام و خەڵکی، تا لێی دێتە خوارەوە، ئەوە گەیشتووە بە حەج، هەرکەسیش لەگەڵ خەڵک و ئیمام پێی نەگات، ئەوە پێی نەگەیشتووە.**

**٣٠٤١-** «عَنْ عُرْوَةَ بْنِ مُضَرِّسٍ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ بِجَمْعٍ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أَقْبَلْتُ مِنْ جَبَلَيْ طَيِّئٍ لَمْ أَدَعْ حَبْلاً إِلَّا وَقَفْتُ عَلَيْهِ، فَهَلْ لِي مِنْ حَجٍّ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ صَلَّى هَذِهِ الصَّلَاةَ مَعَنَا، وَقَدْ وَقَفَ قَبْلَ ذَلِكَ بِعَرَفَةَ لَيْلاً أَوْ نَهَاراً، فَقَدْ تَمَّ حَجُّهُ، وَقَضَى تَفَثَهُ»(١).

**واتە: عوروەی کوڕی موضەڕس ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لە موزدەلیفە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من لە دوو کێوەکە هۆزی (طَيِّئ) وە هاتووم، گەیشتووم بە هەر تەپۆڵکەیەک لەسەری وەستاوم، ئایا حەجم بۆ هەیە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەرکەس ئەم نوێژە بکات لەگەڵماندا، پێش ئەمەش لە عەرەفە وەستا بێت شەو بێت یان ڕۆژ، ئەوە حەجەکەی تەواو کردووەو هەرچی دروشمەکانە بەجێی هێناوە، دروستە پیسەکان لە خۆی بکاتەوە. (وەکو سەرتاشین و نینۆک کردن و بەر و سمێڵ).**

**٣٠٤٢-** «عَنْ عُرْوَةَ بْنِ مُضَرِّسٍ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ بِجَمْعٍ، فَقُلْتُ: هَلْ لِي مِنْ حَجٍّ؟ فَقَالَ: مَنْ صَلَّى هَذِهِ الصَّلَاةَ مَعَنَا، وَوَقَفَ هَذَا الْمَوْقِفَ حَتَّى يُفِيضَ، وَأَفَاضَ قَبْلَ ذَلِكَ مِنْ عَرَفَاتٍ لَيْلاً أَوْ نَهَاراً، فَقَدْ تَمَّ حَجُّهُ، وَقَضَى تَفَثَهُ»(٢).

**واتە: عوروەی کوڕی موضەڕس ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لە موزدەلیفە، وتم: من حەجم بۆ هەیە؟ فەرمووی: هەرکەس ئەم نوێژەمان لەگەڵدا بکات، لەم جێگایەشدا بوەستێ تا دێتە خوارەوە، پێش ئەمەش لە عەرەفە وەستا بێت شەو بێت یان ڕۆژ، ئەوە حەجەکەی تەواو کردووە، هەرچی دروشمەکانە بەجێی هێناوە و دروستە پیسەکان لەخۆی بکاتەوە. (وەکو سەرتاشین و نینۆک کردن و بەر و سمێڵ).**

**٣٠٤٣-** «عَنْ عُرْوَةَ بْنِ مُضَرِّسٍ الطَّائِيِّ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقُلْتُ: أَتَيْتُكَ مِنْ جَبَلَيْ طَيِّئٍ، أَكْلَلْتُ مَطِيَّتِي، وَأَتْعَبْتُ نَفْسِي، مَا بَقِيَ مِنْ حَبْلٍ إِلَّا وَقَفْتُ عَلَيْهِ، فَهَلْ لِي مِنْ حَجٍّ؟ فَقَالَ: مَنْ صَلَّى صَلَاةَ الْغَدَاةِ هَا هُنَا مَعَنَا، وَقَدْ أَتَى عَرَفَةَ قَبْلَ ذَلِكَ، فَقَدْ قَضَى تَفَثَهُ، وَتَمَّ حَجُّهُ»(٣).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٩٥٠، والترمذي: ٨٩١، وإبن ماجه: ٣٠١٦.

(٣) صحيح.

**واتە: عوروەی کوڕی موضەڕس طائی ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، وتم: لە هەردوو کێوی هۆزی (طَيِّئ)وە هاتووم گوێدرێژەکەم خوارد و خۆم ماندوو کرد، هیچ تەپۆڵکەیەک نەما من لەسەری وەستام، ئایا حەجم بۆ هەیە؟ فەرمووی: هەرکەس نوێژی بەیانی بکات لێرەدا لەگەڵمان، پێشتر هاتبێ بۆ عەرەفە، ئەوە هەرچی دروشمەکانە بەجێی هێناوە و دروستە پیسەکان لە خۆی بکاتەوە، حەجەکەیشی تەواو کردوە.**

**٣٠٤٤-** «عَن عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنَ يَعْمَرَ الدِّيلِيِّ ﷺ قَالَ: شَهِدْتُ النَّبِيَّ ﷺ بِعَرَفَةَ وَأَتَاهُ نَاسٌ مِنْ نَجْدٍ، فَأَمَرُوا رَجُلاً، فَسَأَلَهُ عَنِ الْحَجِّ، فَقَالَ: الْحَجُّ عَرَفَةُ، مَنْ جَاءَ لَيْلَةَ جَمْعٍ قَبْلَ صَلَاةِ الصُّبْحِ فَقَدْ أَدْرَكَ حَجَّهُ، أَيَّامُ مِنًى ثَلَاثَةُ أَيَّامٍ، مَنْ تَعَجَّلَ فِي يَوْمَيْنِ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ، وَمَنْ تَأَخَّرَ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ، ثُمَّ أَرْدَفَ رَجُلاً فَجَعَلَ يُنَادِي بِهَا فِي النَّاسِ»[١].

**واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی یەعمەری دەیلی ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ ئامادە بووم لە عەرەفە خەڵکێک لە نەجدەوە هاتبوون بۆ لای، فەرمانیان بە پیاوێ کرد، پرسیاری لێ کرد دەربارەی حەج، فەرمووی: حەج عەرەفەیە هەرکەس بگات بە شەوی عەرەفە پێش نوێژی بەیانی ئەوە گەیشتووە بە حەجدا، ڕۆژەکانی مینا سێ ڕۆژن، هەرکەس پەلە بکات لە دوو ڕۆژدا بەردبارانی جەمرە بکات گوناهی ناگات، هەرکەسیش دوابکەوێ سێ ڕۆژ ڕەجم بکات گوناهی ناگات، پاشان پیاوێکی خستە دوای خۆیەوە هاواری پێ دەکرد لە ناو خەڵکیدا.**

**٣٠٤٥-** «عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: الْمُزْدَلِفَةُ كُلُّهَا مَوْقِفٌ»[٢].

**واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: موزدەلیفە هەمووی وەستانە.**

## تەلبیە کردن لە موزدەلیفە

**٣٠٤٦-** «عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: وَنَحْنُ بِجَمْعٍ: سَمِعْتُ الَّذِي أُنْزِلَتْ عَلَيْهِ سُورَةُ الْبَقَرَةِ يَقُولُ فِي هَذَا الْمَكَانِ: لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٦٩ و ٢٧٠ و ١٢٨٣/٢٧١.

**واتە: ئیبنو مەسعود ﷺ دەڵێ: ئێمە لە موزدەلیفە بووین: گوێم لێ بوو ئەو کەسەی سوورەتی بەقەرەی بەسەردا دابەزیبوو، لەم شوێنەدا دەیفەرموو: (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ).**

## کاتی گەڕانەوە لە موزدەلیفە

**٣٠٤٧-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ ﷺ قَالَ: شَهِدْتُ عُمَرَ، بِجَمْعٍ، فَقَالَ: إِنَّ أَهْلَ الْجَاهِلِيَّةِ كَانُوا لَا يُفِيضُونَ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَيَقُولُونَ: أَشْرِقْ ثَبِيرُ، وَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، خَالَفَهُمْ، ثُمَّ أَفَاضَ قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ»[١].

**واتە: عەمرِی کوڕی مەیمون ﷺ دەڵێ: لەگەڵ عومەر لە موزدەلیفە بووم، وتی: بەڕاستی نەفامەکان نەدەهاتنە خوارەوە تا خۆر دەرکەوت، وە دەیانوت: با خۆرت لەسەر هەڵبێ لە کێوی (ثَبیر) (کە کێوێکی ناسراوە دەکەوێتە لای چەپی ئەو کەسەی دەچێ بۆ مینا)، بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ پێچەوانەیانی کردوە، پاشان پێش ئەوەی خۆر بکەوێ هاتوەتە خوارەوە.**

## مۆڵەتدان بە لاوازەکان لە ڕۆژی قوربانی کە نوێژی بەیانی لە مینا بکەن

**٣٠٤٨-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: أَرْسَلَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي ضَعَفَةِ أَهْلِهِ، فَصَلَّيْنَا الصُّبْحَ بِمِنًى، وَرَمَيْنَا الْجَمْرَةَ»[٢].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ لاوازەکانی خانەوادەکەیدا ناردمی نوێژی بەیانیمان لە مینا کردو بەردبارانی جەمرەمان کرد.**

**٣٠٤٩-** «عَنْ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: وَدِدْتُ أَنِّي اسْتَأْذَنْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَمَا اسْتَأْذَنَتْهُ سَوْدَةُ، فَصَلَّيْتُ الْفَجْرَ بِمِنًى قَبْلَ أَنْ يَأْتِيَ النَّاسُ، وَكَانَتْ سَوْدَةُ امْرَأَةً ثَقِيلَةً ثَبِطَةً، فَاسْتَأْذَنَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَأَذِنَ لَهَا، فَصَلَّتِ الْفَجْرَ بِمِنًى، وَرَمَتْ قَبْلَ أَنْ يَأْتِيَ النَّاسُ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٨٤ و ٣٨٣٨، وأبو داود: ١٩٣٨، والترمذي: ٨٩٦، وإبن ماجه: ٣٠٢٢.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




**واتە: دایکی ئیمانداران عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)دەڵێ: حەزم دەکرد پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی بدامایە وەکو چۆن مۆڵەتی سەودەی دا، نوێژی بەیانیم لە مینا بکردایە پێش ئەوەی خەڵکی بێت، سەودە ئافرەتێکی قەڵە و قوڕس بوو، داوای کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش مۆڵەتی پێدا، نوێژی بەیانی لە مینا کرد، شەیتانیشی ڕەجم کرد پێش ئەوەی خەڵکی بێت.**

**٣٠٥٠-** «عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي رَبَاحٍ، أَنَّ مَوْلًى لِأَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ ﵄، أَخْبَرَهُ قَالَ: جِئْتُ مَعَ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ، مِنًى بِغَلَسٍ، فَقُلْتُ لَهَا: لَقَدْ جِئْنَا مِنًى بِغَلَسٍ، فَقَالَتْ: قَدْ كُنَّا نَصْنَعُ هَذَا مَعَ مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنْكَ»[1].

**واتە: عەطائی کوڕی ئەبو ڕەباح دەگێڕێتەوە: خزمەتکارێکی ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ﵄ هەواڵی پێدا وتی: لەگەڵ ئەسمائی کچی ئەبو بەکر هاتمە مینا پێش نوێژی بەیانی بە تاریکی، پێم وت: هاتینە مینا بە تاریکی، وتی: ئێمە ئەوەمان دەکرد لەگەڵ کەسێک لە تۆ چاکتر بوو.**

**٣٠٥١-** «عَنْ عُرْوَةَ ﵁ قَالَ: سُئِلَ أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ، وَأَنَا جَالِسٌ مَعَهُ، كَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَسِيرُ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ حِينَ دَفَعَ؟ قَالَ: كَانَ يُسَيِّرُ نَاقَتَهُ، فَإِذَا وَجَدَ فَجْوَةً نَصَّ»[2].

**واتە: عوروە ﵁ دەڵێ: پرسیار کرا لە ئوسامەی کوڕی زەید، منیش دانیشتبووم لەگەڵیدا، ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەجیماڵئاواییدا چۆن دەڕۆیشت کاتێ کە دەرچووە؟ وتی: بە شێوەیەکی ئاسایی دەڕۆیشت، بەڵام کاتێ بۆشاییەکی بەدی بکردایە گورج دەچوو.**

**٣٠٥٢-** «عَنِ الْفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِلنَّاسِ حِينَ دَفَعُوا عَشِيَّةَ عَرَفَةَ وَغَدَاةَ جَمْعٍ: عَلَيْكُمْ بِالسَّكِينَةِ وَهُوَ كَافٌّ نَاقَتَهُ، حَتَّى إِذَا دَخَلَ مِنًى فَهَبَطَ، حِينَ هَبَطَ مُحَسِّراً، قَالَ: عَلَيْكُمْ بِحَصَى الْخَذْفِ الَّذِي يُرْمَى بِهِ الْجَمْرَةُ، وَقَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: يُشِيرُ بِيَدِهِ كَمَا يَخْذِفُ الْإِنْسَانُ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٧٩، ومسلم: ١٢٩١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٦٦، ومسلم: ١٢٨٦، وأبو داود: ١٩٢٣.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢٨٢.

واتە: فەزلی کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: کاتێ خەڵکەکە سەرەتای شەو لە عەرەفە و سەر لە بەیانی لە موزدەلیفە گەڕانەوە پێغەمبەری خوا ﷺ پێیانی فەرموو: پێویستە لەسەرخۆو هێمن بن، ڕەشمەی وشترەکەی گرتبوو نەیدەهێشت بە پەلە ڕێ بکات، تا کاتێ گەیشتە مینا، دابەزیە شیوی (مُحَسِّر)، ئینجا فەرمووی: پێویستە بەردی (الْخَذْف) (بە ئەندازەی دەنکە نۆکێک دەبێت) بەکاربێنن، بۆ بەردباران کردنی جەمرە، وە وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بە دەستی ئاماژەی کرد وەکو چۆن مرۆڤ بەردی بچوک فڕێدەدا.

## پەلەکردن لە شیوی (مُحَسِّر) (واتە: گەمارۆدەر، بۆیە ئەم ناوەی لێنراوە چونکە لەو شوێنە دەوری فیلەکانی ئەبرەهە درا)

**٣٠٥٣-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَوْضَعَ فِي وَادِي مُحَسِّرٍ»[١].

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ لە شیوی (مُحَسِّر) بە گورجی دەڕۆیشت.

**٣٠٥٤-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، دَفَعَ مِنَ الْمُزْدَلِفَةِ قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَأَرْدَفَ الْفَضْلَ بْنَ الْعَبَّاسِ حَتَّى أَتَى مُحَسِّراً حَرَّكَ قَلِيلاً، ثُمَّ سَلَكَ الطَّرِيقَ الْوُسْطَى الَّتِي تُخْرِجُكَ عَلَى الْجَمْرَةِ الْكُبْرَى حَتَّى أَتَى الْجَمْرَةَ الَّتِي عِنْدَ الشَّجَرَةِ، فَرَمَى بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ يُكَبِّرُ مَعَ كُلِّ حَصَاةٍ مِنْهَا «حَصَى الْخَذْفِ» رَمَى مِنْ بَطْنِ الْوَادِي»[٢].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵلا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە موزدەلیفە دەرچوو پێش ئەوەی خۆر بکەوێ، فەزلی کوڕی عەبباسی لە پشتی خۆی دانابوو هەتا گەیشتە (مُحَسِّر) تۆزێ گورجتری کردەوە، پاشان ڕێگای ناوەندی گرتەبەر کە دەتبات بۆ لای بەردباران کردنی جەمرەی گەورە تا گەیشتە جەمرە کە لای دارەکەیە، بە حەوت بەردی بچووک بەردبارانی کرد لەگەڵ هەر بەردباران کردنێک تەکبیری دەکرد، لە ناوەڕاستی شیوەکە بەردبارانی کرد.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢٩٩، وأبو داود: ١٩٤٤، والترمذي: ٨٨٦.

(٢) صحيح.




## تەلبیەکردن لە کاتی ڕێکردن

**٣٠٥٥-** «عَنِ الْفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ كَانَ رَدِيفَ النَّبِيِّ ﷺ، فَلَمْ يَزَلْ يُلَبِّي حَتَّى رَمَى الْجَمْرَةَ»[١].

**واتە: فەزلی کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: ئەو لە پشتی پێغەمبەرەوە ﷺ بوو، بەردەوام تەلبیەی دەکرد تا بەردبارانی جەمرەی کرد.**

**٣٠٥٦-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، لَبَّى حَتَّى رَمَى الْجَمْرَةَ»[٢].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ تەلبیەی کرد تا بەردبارانی جەمرەی کرد.**

## کۆکردنەوەی بەرد بۆ بەردباران کردنی جەمرە

**٣٠٥٧-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ غَدَاةَ الْعَقَبَةِ وَهُوَ عَلَى رَاحِلَتِهِ: هَاتِ، الْقُطْ لِي، فَلَقَطْتُ لَهُ حَصَيَاتٍ هُنَّ حَصَى الْخَذْفِ، فَلَمَّا وَضَعْتُهُنَّ فِي يَدِهِ، قَالَ: بِأَمْثَالِ هَؤُلَاءِ، وَإِيَّاكُمْ وَالْغُلُوَّ فِي الدِّينِ، فَإِنَّمَا أَهْلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمُ الْغُلُوُّ فِي الدِّينِ»[٣].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سەر لە بەیانی عەقەبە بە سەر وڵاخەکەیەوە بوو پێمی فەرموو: بەردم بۆ هەڵبگرە، منیش هەندێ بەردی بچوکم بۆی کۆ کردەوە، (بە ئەندازەی دەنکە نوکێک دەبوو) کاتێ خستمە ناو دەستی، فەرمووی: با وەکو ئەمانە بێت، دەخیلە زێدەڕەۆیی نەکەن لە ئایندا، چونکە بە ڕاستی ئەوانەی پێش ئێوە لە ناوچوون بە هۆی زێدەڕەۆییان بوو لە ئایندا.**

---

(١) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ٣٠٣٩.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ٣٠٢٩.




## لە کوێ بەرد هەڵدەگرێ (بۆ بەردباران کردنی جەمرەکان)

**٣٠٥٨-** «عَنِ الْفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِلنَّاسِ حِينَ دَفَعُوا عَشِيَّةَ عَرَفَةَ وَغَدَاةَ جَمْعٍ: عَلَيْكُمْ بِالسَّكِينَةِ، وَهُوَ كَافٌّ نَاقَتَهُ، حَتَّى إِذَا دَخَلَ مِنًى فَهَبَطَ، حِينَ هَبَطَ مُحَسِّراً قَالَ: عَلَيْكُمْ بِحَصَى الْخَذْفِ الَّذِي تُرْمَى بِهِ الْجَمْرَةُ، قَالَ: وَالنَّبِيُّ ﷺ يُشِيرُ بِيَدِهِ كَمَا يَخْذِفُ الْإِنْسَانُ»(١).

**واتە: فەزلی کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: کاتێ خەڵکەکە سەرەتای شەو لە عەرەفەو سەر لە بەیانی لە موزدەلیفە گەڕانەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێیانی فەرمووی: پێویستە لەسەرخۆو هێمن بن، ڕەشمەی وشترەکەی گرتبوو نەیدەهێشت بە پەلە ڕێ بکات، تا کاتێ گەیشتە مینا، دابەزی، کاتێ دابەزیە شیوی (مُحَسِّر)، ئینجا فەرمووی: پێویستە بەردی (الْخَذْف) (بە ئەندازەی دەنکە نۆکێک دەبێت) بەکاربێنن بۆ بەردباران کردنی جەمرە وتی: پێغەمبەر بە دەستی ئاماژەی کرد وەکو چۆن مرۆڤ بەردی بچوک فڕێدەدا.**

## ئەندازەی ئەو بەردەی بۆ بەردبارانکردن بەکاردێت

**٣٠٥٩-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ غَدَاةَ الْعَقَبَةِ وَهُوَ وَاقِفٌ عَلَى رَاحِلَتِهِ: هَاتِ، الْقُطْ لِي، فَلَقَطْتُ لَهُ حَصَيَاتٍ هُنَّ حَصَى الْخَذْفِ، فَوَضَعْتُهُنَّ فِي يَدِهِ، وَجَعَلَ يَقُولُ بِهِنَّ فِي يَدِهِ وَوَصَفَ يَحْيَى تَحْرِيكَهُنَّ فِي يَدِهِ بِأَمْثَالِ هَؤُلَاءِ»(٢).

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سەر لە بەیانی عەقەبە بەسەر وڵاخەکەیەوە وەستا بوو پێمی فەرموو: بمدەرێ، بۆم کۆبکەرەوە، بەردم بۆ هەڵبگرە، منیش هەندێ بەردی بچوکم بۆی کۆ کردەوە، ئەو بەدانەش بەردی (الْخَذْف) بوون (کە بە ئەندازەی دەنکە نوکێک دەبوون) دواتر خستمە ناو دەستی، جا بە دەستەکانی ئاماژەی پێ دەکرد (هەڵگێڕو وەرگێڕی دەکرد) یەحیا وەسفی جوڵاندنیان دەکات لە ناو دەستیدا وەکو ئەو بەردانە.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## سواربوونی ئاژەڵ بۆ بەردباران کردنی جەمرەکان
## بەسەر وڵاخەوەو دروست کردنی سێبەر بۆ ئیحرام پۆش

**٣٠٦٠-** «عَنْ أُمِّ حُصَيْنٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: حَجَجْتُ فِي حَجَّةِ النَّبِيِّ ﷺ، فَرَأَيْتُ بِلَالاً يَقُودُ بِخِطَامِ رَاحِلَتِهِ، وَأُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ رَافِعٌ عَلَيْهِ ثَوْبَهُ يُظِلُّهُ مِنَ الْحَرِّ وَهُوَ مُحْرِمٌ حَتَّى رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ، ثُمَّ خَطَبَ النَّاسَ، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، وَذَكَرَ قَوْلاً كَثِيراً»[1].

**واتە:** دایکی حوصەین ﵂ دەڵێ: حەجم کرد لە کاتی حەجکردنی پێغەمبەر ﷺ، بیلالم بینی ڕەشمەی وشترەکەی گرتبوو، ئوسامەی کوڕی زەیدیش جلەکانی خۆی بەرزکردبویەوە، سێبەری بۆ دەکرد لە گەرما، ئەو لە ئیحرامدا بوو تا بەردبارانی (جَمْرَةَ الْعَقَبَة)ـەی کرد، پاشان وتاری بۆ خەڵکیدا، ستایشی خوای کرد و قسەی زۆری کرد.

**٣٠٦١-** «عَنْ قُدَامَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵁ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَرْمِي جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ يَوْمَ النَّحْرِ عَلَى نَاقَةٍ لَهُ صَهْبَاءَ، لَا ضَرْبَ، وَلَا طَرْدَ، وَلَا إِلَيْكَ إِلَيْكَ»[2].

**واتە:** قودامەی کوڕی عەبدوڵلا ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی بەردبارانی (جَمْرَةَ الْعَقَبَة)ـەی دەکرد لە ڕۆژی قورباندا لەسەر وشترێکی سپی سوری تێکەڵ بوو، لەوێ لێدان و ڕێگری و پاڵپێوەنان و وتەی لاچۆ لاچۆ نەبوو (واتە: زۆر بە لەسەرخۆیی ڕێوڕەسمەکەی بەڕێوە دەبرد).

**٣٠٦٢-** «عَن جَابِرِ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَرْمِي الْجَمْرَةَ وَهُوَ عَلَى بَعِيرِهِ، وَهُوَ يَقُولُ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، خُذُوا مَنَاسِكَكُمْ، فَإِنِّي لَا أَدْرِي لَعَلِّي لَا أَحُجُّ بَعْدَ عَامِي هَذَا»[3].

**واتە:** جابری کوڕی عەبدوڵلا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی بەردبارانی (الجَمْرَة)ـەی دەکرد بەسەر وشترەکەیەوە، وە دەیفەرموو: ئەی

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٣١١ و ١٢٩٨/٣١٢، وأبو داود: ١٨٣٤.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ٩٠٣، وإبن ماجه: ٣٠٣٥.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩٤٤، وأبو داود: ١٩٤٤ و ١٩٧٠، والترمذي: ٨٨٦ و ٨٩٧، وإبن ماجه: ٣٠٢٣.

خەڵکینە دروشمەکانتانم لێ وەربگرن (لە منەوە فێربن) چونکە من نازانم پێدەچێ دوای ئەم ساڵ حەج نەکەم.

## کاتی بەردباران کردنی جەمرەی عەقەبە لە ڕۆژی قوربانیدا

**٣٠٦٣-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: رَمَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْجَمْرَةَ يَوْمَ النَّحْرِ، ضُحًى وَرَمَى بَعْدَ يَوْمِ النَّحْرِ إِذَا زَالَتِ الشَّمْسُ»[1].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەردبارانی جەمرەی کرد لە چێشتەنگاوی ڕۆژی قوربان، وە دوای ڕۆژی قوربانی بەردبارانی کرد کاتێ خۆر ترازا دوای نیوەڕۆ.**

## قەدەغە کردن لە بەردباران کردنی جەمرەی عەقەبە پێش خۆر دەرچوون

**٣٠٦٤-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: بَعَثَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أُغَيْلِمَةَ بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ عَلَى حُمُرَاتٍ يَلْطَحُ أَفْخَاذَنَا، وَيَقُولُ: أُبَيْنِيَّ، لَا تَرْمُوا جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ»[2].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لامان ئێمەش کۆمەڵە منداڵێک بووین لە نەوەکانی عەبدولموطەڵیب، لەسەر خۆی دەیدا لە ڕانمان و دەیفەرموو: ئەی منداڵە بچوکەکان بەردبارانی جەمرەی عەقەبە مەکەن تا خۆر دەردەچێ.**

**٣٠٦٥-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَدَّمَ أَهْلَهُ، وَأَمَرَهُمْ أَنْ لَا يَرْمُوا الْجَمْرَةَ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ»[3].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ لە پێشدا خێزانەکەی لە موزدەلیفەوە نارد بۆ مینا، فەرمانی پێکردن بەردبارانی جەمرە نەکەن تا خۆر دەردەچێ.**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢٩٩/٣١٤، وأبو داود: ١٩٧١، والترمذي: ٨٩٤، وإبن ماجه: ٣٠٥٣.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٩٤٠ و ١٩٤١، والترمذي: ٨٩٣، وإبن ماجه: ٣٠٥.

(٣) صحيح.





## مۆڵەتدان بە ئافرەتان لە شەودا بەردبارانی جەمرە بکەن

**٣٠٦٦-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَمَرَ إِحْدَى نِسَائِهِ أَنْ تَنْفِرَ مِنْ جَمْعٍ لَيْلَةَ جَمْعٍ، فَتَأْتِيَ جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ فَتَرْمِيَهَا، وَتُصْبِحَ فِي مَنْزِلِهَا. وَكَانَ عَطَاءٌ، يَفْعَلُهُ حَتَّى مَاتَ»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە یەکێک لە خێزانەکانی لە شەوی (جمع) (واتە: موزدەلیفە) بچێت بۆ لای جەمرەی عەقەبە بەردبارانی بکات و لە ماڵەکەی خۆیدا بمێنێتەوە، جا عەطاء تا مرد ئەوەی دەکرد.**

## بەردبارانکردن لە دوای ئێوارە

**٣٠٦٧-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُسْأَلُ أَيَّامَ مِنًى، فَيَقُولُ: لَا حَرَجَ فَسَأَلَهُ رَجُلٌ، فَقَالَ: حَلَقْتُ قَبْلَ أَنْ أَذْبَحَ؟ قَالَ: لَا حَرَجَ، فَقَالَ رَجُلٌ: رَمَيْتُ بَعْدَ مَا أَمْسَيْتُ؟ قَالَ: لَا حَرَجَ»[٢].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژەکانی مینا پرسیاری لێ دەکرا، دەیفەرموو: گوناه نیە، پیاوێک پرسیاری لێکرد وتی: سەرم تاشی پێش ئەوەی قوربانی بکەم؟ فەرمووی: گوناه نیە، پیاوێکی تر وتی: لە دای ئێوارە بەردبارانم کرد؟ فەرمووی: گوناه نیە.**

## بەردباران کردنی جەمرە لە لایەن شوانەکانەوە

**٣٠٦٨-** «عَنْ أَبِي الْبَدَّاحِ بْنِ عَدِيٍّ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، رَخَّصَ لِلرُّعَاةِ أَنْ يَرْمُوا يَوْماً وَيَدَعُوا يَوْماً»[٣].

**واتە: ئەبو بەدداحی کوڕی عەدی دەگێڕێتەوە: لە باوکیەوە ﷺ پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتیدا بە شوانەکان ڕۆژێک بەردباران بکەن ڕۆژێکیش نەیکەن.**

---

(١) ضعيف الإسناد. أخرجه أبو داود: ١٩٤٢ بنحوه.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٨٤ و ١٧٢١ و ١٧٢٢ و ١٧٢٣ و ١٧٣٤ و ١٧٣٥ و ٦٦٦٦، ومسلم: ١٣٠٧، وأبو داود: ١٩٨٣، وإبن ماجه: ٣٠٤٩ و ٣٠٥٠.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٩٧٥ و ١٩٧٦، والترمذي: ٩٥٤ و ٩٥٥، وإبن ماجه: ٣٠٣٧.

**٣٠٦٩-** «عَنْ أَبِي الْبَدَّاحِ بْنِ عَاصِمِ بْنِ عَدِيٍّ، عَنْ أَبِيهِ ﵁ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، رَخَّصَ لِلرُّعَاةِ فِي الْبَيْتُوتَةِ يَرْمُونَ يَوْمَ النَّحْرِ، وَالْيَوْمَيْنِ اللَّذَيْنِ بَعْدَهُ يَجْمَعُونَهُمَا فِي أَحَدِهِمَا»[1].

**واتە: ئەبو بەدداحی کوڕی عاصمی کوڕی عەدی دەگێڕێتەوە: لە باوکیەوە ﵁ پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی داوە بە شوانەکانە لە شەوی جەژنی قورباندا نەمێننەوە بۆ بەردبارانکردنی جەمرەی عەقەبە تەنها بە ڕۆژەکەی بەردبارانی بکەن، پاشان بەردبارانکردنی هەردوو ڕۆژەکەی دوای ڕۆژی قوربان کۆبکەنەوە لە یەکێک لەو دوو ڕۆژە. (چونکە ئەوان سەرقاڵن بە شوانی وشتر).**

**تێبینی: پێشەوا (الطيِّبي) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، دەڵێ: واتە: مۆڵەتی پێداون کە نەمێننەوە لە مینا لە شەوەکانی (أيام التشريق)، وە لە ڕۆژی جەژندا تەنها بەردبارانی جەمرەی عەقبە بکەن، پاشان بەیانیەکەی بەردباران نەکەن، بەڵکو دوای ئەو ڕۆژە بەردباران بکەن، کە دەکاتە بەردبارانکردنی دوو ڕۆژ، هەم قەزاو، هەم ئەداء).**

## ئەو شوێنەی کە بەردبارانی جەمرەی عەقەبەی لێ دەکرێ

**٣٠٧٠-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ابْنَ يَزِيدَ قَالَ: قِيلَ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﵁ إِنَّ نَاساً يَرْمُونَ الْجَمْرَةَ مِنْ فَوْقِ الْعَقَبَةِ، قَالَ: فَرَمَى عَبْدُ اللَّهِ مِنْ بَطْنِ الْوَادِي، ثُمَّ قَالَ: مِنْ هَا هُنَا، وَالَّذِي لَا إِلَهَ غَيْرُهُ رَمَى الَّذِي أُنْزِلَتْ عَلَيْهِ سُورَةُ الْبَقَرَةِ»[2].

**واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی یەزید دەڵێ: بە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﵁ وترا: خەڵکانێک بەردبارانی جەمرە دەکەن لەسەرووی عەقەبە، وتی: عەبدوڵڵا لەناو شیوەکەوە بەردبارانی کردوە، پاشان وتی: لێرەوە، سوێند بەو خوایەی کە هیچ کەس شیاوی پەرستش نیە جگە لە ئەو نەبێ، ئەو کەسەی سوورەتی بەقەرەی لەسەر دابەزیوە بەردبارانی کرد.**

---

**(١) صحيح.**

**(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٧٤٧ و ١٧٤٨ و ١٧٤٩ و ١٧٥٠، ومسلم: ٣٠٥ و ١٢٩٦/٣٠٩، وأبو داود: ١٩٧٤، والترمذي: ٩٠١، وإبن ماجه: ٣٠٣٠.**

**٣٠٧١-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: رَمَى عَبْدُ اللَّهِ ﷺ الْجَمْرَةَ بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ، جَعَلَ الْبَيْتَ عَنْ يَسَارِهِ، وَعَرَفَةَ عَنْ يَمِينِهِ، وَقَالَ: هَا هُنَا مَقَامِ الَّذِي أُنْزِلَتْ عَلَيْهِ سُورَةُ الْبَقَرَةِ، قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: مَا أَعْلَمُ أَحَداً قَالَ فِي هَذَا الْحَدِيثِ مَنْصُورٌ غَيْرَ ابْنِ أَبِي عَدِيٍّ، وَاللَّهُ تَعَالَى أَعْلَمُ»(١).

**واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی یەزید دەڵێ: عەبدوڵلا ﷺ بەردبارانی جەمرەی کرد بە حەوت بەرد، بەیتی خستە لای چەپی و عەرەفەشی خستە لای ڕاستی، وە وتی: ئا ئەم شوێنە جێگای بەردبارانکردنی ئەو کەسەیە کە سووڕەتی بەقەڕەی بەسەردا دابەزی، ئەبو عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: نەمزانیوە کەس دەربارەی ئەم فەرموودە قسەی کردبێ جگە لە ئیبنو عەدی نەبێ، خوا ﷻ زاناترە.**

**٣٠٧٢-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: رَأَيْتُ ابْنَ مَسْعُودٍ ﷺ، رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ مِنْ بَطْنِ الْوَادِي، ثُمَّ قَالَ: هَا هُنَا، وَالَّذِي لَا إِلَهَ غَيْرُهُ مَقَامُ الَّذِي أُنْزِلَتْ عَلَيْهِ سُورَةُ الْبَقَرَةِ»(٢).

**واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی یەزید دەڵێ: عەبدوڵلای کوڕی مەسعودم ﷺ بینی بەردبارانی جەمرەی عەقەبەی کرد لەناو شیوەکەوە، پاشان وتی: سوێند بەو خوایەی هیچ کەس شیاوی پەرستش نیە جگە لە ئەو نەبێت، ئەمە شوێنی بەردباران کردنی ئەو کەسەیە کە سووڕەتی بەقەڕەی بەسەردا دابەزی.**

**٣٠٧٣-** «عَنْ الْأَعْمَشِ، «سَمِعْتُ الْحَجَّاجَ يَقُولُ: لَا تَقُولُوا: سُورَةَ الْبَقَرَةِ، قُولُوا: السُّورَةَ الَّتِي يُذْكَرُ فِيهَا الْبَقَرَةُ» فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِإِبْرَاهِيمَ، فَقَالَ: أَخْبَرَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ يَزِيدَ، أَنَّهُ كَانَ مَعَ عَبْدِ اللَّهِ، حِينَ رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ، فَاسْتَبْطَنَ الْوَادِيَ، وَاسْتَعْرَضَهَا «يَعْنِي الْجَمْرَةَ» فَرَمَاهَا بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ، وَكَبَّرَ مَعَ كُلِّ حَصَاةٍ، فَقُلْتُ: إِنَّ أُنَاساً يَصْعَدُونَ الْجَبَلَ، فَقَالَ: هَا هُنَا، وَالَّذِي لَا إِلَهَ غَيْرُهُ رَأَيْتُ الَّذِي أُنْزِلَتْ عَلَيْهِ سُورَةُ الْبَقَرَةِ رَمَى»(٣).

**واتە: ئەعمەش دەگێڕێتەوە: گوێم لە حەجاج بوو دەیوت: مەڵێن سووڕەتی بەقەرە، بەڵکو بڵێن: ئەو سورەتی باسی بەقەرەی تێدا کراوە، ئەمەم باس کرد بۆ ئیبراهیم، وتی: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی یەزید هەواڵی پێدام کە ئەو لەگەڵ عەبدوڵلادا بوو، کاتێ بەردبارانی جەمرەی عەقەبەی کرد، لە ناو شیوەکەوە، بە حەوت بەرد بەردبارانی**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.





کرد، لەگەڵ هەر بەردێکدا تەکبیرێکی کرد، وتم: خەڵکانێک هەن سەردەکەون بەسەر کێوەکەداو بەردباران دەکەن، وتی: سوێند بەو خوایەی هیچ کەسێک شیاوی پەرستش نیە جگە لە ئەو نەبێت، بینیم ئەو کەسەی سوورەتی بەقەڕەی بەسەردا دابەزی لێرەوە بەردبارانی کرد.

**٣٠٧٤**- «عَنْ جَابِرٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، رَمَى الْجَمْرَةَ بِمِثْلِ حَصَى الْخَذْفِ»[١].

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ بەردبارانی جەمرەی کرد، بە بەردێک وەکو بەردی (الْخَذْف) بوو (کە بە ئەندازەی دەنکە نۆکێک دەبێت).

**٣٠٧٥**- «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَرْمِي الْجِمَارَ بِمِثْلِ حَصَى الْخَذْفِ»[٢].

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام بینی ﷺ بەردبارانی جەمرەی دەکرد، بە بەردێک وەکو بەردی (الْخَذْف) بوو (کە بە ئەندازەی دەنکە نۆکێک دەبێت).

## ژمارەی ئەو بەردانەی کە بەردبارانی جەمرەی پێ دەکرێ

**٣٠٧٦**- «عَن عَلِيِّ بْنِ حُسَيْنٍ قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، فَقُلْتُ: أَخْبِرْنِي عَنْ حَجَّةِ النَّبِيِّ ﷺ؟ فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، رَمَى الْجَمْرَةَ الَّتِي عِنْدَ الشَّجَرَةِ بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ، يُكَبِّرُ مَعَ كُلِّ حَصَاةٍ مِنْهَا، حَصَى الْخَذْفِ، رَمَى مِنْ بَطْنِ الْوَادِي، ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَى الْمَنْحَرِ فَنَحَرَ»[٣].

واتە: عەلی کوڕی حوسەین دەڵێ: ڕۆیشتین بۆ لای جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) وتم: هەواڵم بدەرێ دەربارەی حەجی پێغەمبەر ﷺ؟ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەردبارانی ئەو جەمرەیەی کرد کە لەلای دارەکەیە بە حەوت بەرد، لەگەڵ هاوێشتنی هەر بەردێکی بچوکدا تەکبیرێکی دەکرد، لە ناو شیوەکەوە بەردبارانی کرد، پاشان ڕۆیشت بۆ شوێنی سەربڕین لەوێ ئاژەڵی سەربڕی.

**٣٠٧٧**- «عَنْ مُجَاهِدٍ قال: قَالَ سَعْدٌ ﷺ: رَجَعْنَا فِي الْحَجَّةِ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ وَبَعْضُنَا يَقُولُ: رَمَيْتُ بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ، وَبَعْضُنَا يَقُولُ: رَمَيْتُ بِسِتٍّ، فَلَمْ يَعِبْ بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢٩٧، وأبو داود: ١٩٤٤ و ١٩٧٠، والترمذي: ٨٨٦ و ٨٩٧، وإبن ماجه: ٣٠٢٣.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح الإسناد.

**واتە: موجاهید دەڵێ: سەعد ﷺ وتی: لە حەجی پێغەمبەر ﷺ گەڕاینەوە هەندێکمان دەیوت: بەردبارانم کرد بە حەوت بەرد، وە هەندێکمان دەیوت: بەردبارانم کرد بە شەش بەرد، هیچیان ڕەخنەی لەوی تر نەگرت.**

**٣٠٧٨-** «عَنْ أَبي مِجْلَزٍ يقول سَأَلْتُ ابْن عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنْ شَيْءٍ مِنْ أَمْرِ الْجِمَارِ؟ فَقَالَ: مَا أَدْرِي رَمَاهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِسِتٍّ، أَوْ بِسَبْعٍ»[١].

**واتە: ئەبو میجلەز دەڵێ: پرسیم لە ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەربارەی شتێک لە بەردباران کردنی جەمرەکان؟ وتی: نازانم پێغەمبەری خوا ﷺ بە شەش بەرد یان بە حەوت بەرد بەردبارانی کرد.**

## تەکبیر (اللَّهُ أَكْبَر) کردن لەگەڵ هەر بەردێکدا

**٣٠٧٩-** «عَنِ الْفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كُنْتُ رِدْفَ النَّبِيِّ ﷺ، فَلَمْ يَزَلْ يُلَبِّي حَتَّى رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ، فَرَمَاهَا بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ، يُكَبِّرُ مَعَ كُلِّ حَصَاةٍ»[٢].

**واتە: فەزلی کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: من لە پشتی پێغەمبەرەوە ﷺ بووم بەردەوام تەلبیەی دەکرد تا جەمرەی عەقەبەی بەردباران کرد، بە حەوت بەرد بەردبارانی کرد، لەگەڵ هەر بەردێکدا تەکبیری دەکرد.**

## ئیحرام پۆش کاتێ بەردبارانی جەمرەی عەقبەی کرد تەلبیە کردن دەبڕێنێ

**٣٠٨٠-** «عَنِ الْفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كُنْتُ رِدْفَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَمَا زِلْتُ أَسْمَعُهُ يُلَبِّي حَتَّى رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ، فَلَمَّا رَمَى قَطَعَ التَّلْبِيَةَ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٩٧٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٤٤ و ١٦٧٠ و ١٦٨٧، ومسلم: ١٢٨١/٢٦٧ و ١٢٨٢، وأبو داود: ١٨١٥، والترمذي: ٩١٨، وإبن ماجه: ٣٠٤٠.

(٣) صحيح.




**واتە: فەزلی كوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: من لە پشتی پێغەمبەری خواوە ﷺ بووم گوێم لێ بوو بەردەوام تەلبیەی دەكرد تا بەردبارانی جەمرەی عەقەبەی كرد، كاتێ بەردبارانی كرد تەلبیەی پچڕاند.**

**٣٠٨١-** «عَنِ الْفَضْلِ ﷺ أَنَّهُ أَخْبَرَ: أَنَّهُ كَانَ رَدِيفَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَأَنَّهُ لَمْ يَزَلْ يُلَبِّي حَتَّى رَمَى الْجَمْرَةَ»[١].

**واتە: فەزل ﷺ هەواڵی داوە: ئەو لە پشتی پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، بەردەوام تەلبیەی دەكرد تا بەردبارانی جەمرەی كرد.**

**٣٠٨٢-** «عَنِ الْفَضْلِ بْنِ الْعَبَّاسِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ كَانَ رَدِيفَ النَّبِيِّ ﷺ، فَلَمْ يَزَلْ يُلَبِّي حَتَّى رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ»[٢].

**واتە: فەزلی كوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) هەواڵی داوە: ئەو لە پشتی پێغەمبەرەوە بوو، پێغەمبەر ﷺ بەردەوام تەلبیەی دەكرد تا بەردبارانی (جَمْرَةَ)ـەی كرد.**

## پاڕانەوەو نزاكردن دوای بەردباران كردنی جەمرە

**٣٠٨٣-** «عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: بَلَغَنَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا رَمَى الْجَمْرَةَ الَّتِي تَلِي الْمَنْحَرَ «مَنْحَرَ مِنًى» رَمَاهَا بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ يُكَبِّرُ كُلَّمَا رَمَى بِحَصَاةٍ، ثُمَّ تَقَدَّمَ أَمَامَهَا، فَوَقَفَ مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ رَافِعاً يَدَيْهِ، يَدْعُو يُطِيلُ الْوُقُوفَ، ثُمَّ يَأْتِي الْجَمْرَةَ الثَّانِيَةَ فَيَرْمِيهَا بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ، يُكَبِّرُ كُلَّمَا رَمَى بِحَصَاةٍ، ثُمَّ يَنْحَدِرُ ذَاتَ الشِّمَالِ، فَيَقِفُ مُسْتَقْبِلَ الْبَيْتِ، رَافِعاً يَدَيْهِ يَدْعُو، ثُمَّ يَأْتِي الْجَمْرَةَ الَّتِي عِنْدَ الْعَقَبَةِ، فَيَرْمِيهَا بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ، وَلَا يَقِفُ عِنْدَهَا قَالَ الزُّهْرِيُّ: سَمِعْتُ سَالِماً، يُحَدِّثُ بِهَذَا، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَفْعَلُهُ»[٣].

**واتە: زوهری دەڵێ: پێمان ڕاگەیەنراوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێ بەردبارانی جەمرەی بكردایە كە نزیكە لە جێگای سەربڕین «سەربڕین لە مینا» بەردبارانی دەكرد بە حەوت بەرد، هەر بەردێكی بوەشاندایە تەكبیرێكی دەكرد، پاشان دەچووە پێشەوە**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٧٥١ و ١٧٥٢ و ١٧٥٣، وإبن ماجه: ٣٠٣٢.

دەوەستا، ڕووبەڕووی قیبلە و دەستەکانی بەرزدەکردەوەو دەپاڕایەوە ئەندازەیەکی زۆر دەوەستا، پاشان دەهات بۆ جەمرەی دووەم بە حەوت بەرد بەردبارانی دەکرد، هەر بەردێکی بوەشاندایە تەکبیرێکی دەکرد، پاشان بە لای چەپدا دەڕۆیشت، دەوەستا رووبەڕووی بەیت، دەستەکانی بەرزدەکردەوەو دەپاڕایەوە، پاشان دەهات بۆ ئەو جەمرەی کە لای عەقەبەیە، حەوت جار بەردبارانی دەکرد، لای نەدەوەستا، زوهری دەڵێ: گوێم لە سالم بوو ئەمەی لە باوکیەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ باس کرد، ئیبنو عومەریش هەمان شتی ئەنجام دەدا.

## بابەت: ئەوەی حەڵاڵە بۆ ئیحرام پۆش دوای بەردبارانکردنی جەمرەکان

**٣٠٨٤-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: إِذَا رَمَى الْجَمْرَةَ فَقَدْ حَلَّ لَهُ كُلُّ شَيْءٍ، إِلَّا النِّسَاءَ، قِيلَ: وَالطِّيبُ؟ قَالَ: أَمَّا أَنَا، فَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَتَضَمَّخُ بِالْمِسْكِ، أَفَطِيبٌ هُوَ»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ئەگەر (کەسێک) بەردبارانی جەمرەی کرد، ئەوە هەموو شتێکی بۆ حەڵاڵە، جگە لە (چوونە لای) ئافرەتان، وترا: بۆنی خۆشیش؟ وتی: من خۆم، پێغەمبەری خوام ﷺ بینی بۆنی میسکی لە خۆی دەدا، جا مەگەر ئەمە بۆن نیە؟

کۆتایی بەشی (پەرتووکی ڕێورەسمەکانی حەج کردن) لە بەرگی دووەم

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه إبن ماجه: ٣٠٤١.

## بابەت: پێویست بوون یان واجب بوونی جیهاد

**٣٠٨٥-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: لَمَّا أُخْرِجَ النَّبِيُّ ﷺ مِنْ مَكَّةَ قَالَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ: أَخْرَجُوا نَبِيَّهُمْ، إِنَّا لِلَّهِ، وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ، لَيَهْلِكُنَّ، فَنَزَلَتْ: ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا۟ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ﴿٣٩﴾﴾الحج، فَعَرَفْتُ أَنَّهُ سَيَكُونُ قِتَالٌ، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: فَهِيَ أَوَّلُ آيَةٍ نَزَلَتْ فِي الْقِتَالِ»[1].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر ﷺ لە مەککە دەرکرا، ئەبو بەکر ﷺ وتی: پێغەمبەرەکەیان دەرکرد، ئێمە هەر هی خواین و هەر بۆ لای خوا دەگەڕێینەوە، ئەوانە لە ناودەچن، دواتر ئەم ئایەتە هاتە خوار: ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا۟ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ﴿٣٩﴾﴾، (واتە: ڕێگەدرا بۆ ئەو مسوڵمانانەی شەڕیان لەگەڵدا دەکرێ، جەنگ و جیهاد بکەن، لەبەر ئەوە ستەمیان لێکراوە، بێگومان خوا بۆ سەرخستنیان بە توانایە). بۆیە زانیم لە ماوەیەکی کەمدا جەنگ ڕوودەدا، ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ئەمە یەکەمین ئایەتە لەبارەی جەنگەوە هاتە خوار.**

**٣٠٨٦-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ، وَأَصْحَاباً لَهُ أَتَوْا النَّبِيَّ ﷺ بِمَكَّةَ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا كُنَّا فِي عِزٍّ وَنَحْنُ مُشْرِكُونَ، فَلَمَّا آمَنَّا صِرْنَا أَذِلَّةً، فَقَالَ: إِنِّي أُمِرْتُ بِالْعَفْوِ، فَلَا تُقَاتِلُوا، فَلَمَّا حَوَّلَنَا اللَّهُ إِلَى الْمَدِينَةِ، أَمَرَنَا بِالْقِتَالِ، فَكَفُّوا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّوٓا۟ أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ﴿٧٧﴾﴾النساء»[2].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف و هاوەڵەکانی هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لە مەککە، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئێمە لە عیززەتدا بووین کاتێ کە هاوبەشدانەر بووین، بەڵام کاتێ بڕوامان هێنا زەلیل بووین، فەرمووی: من فەرمانم پێکراوە بە لێبوردن، جەنگ مەکەن، کاتێ خوا گواستمانیەوە بۆ مەدینە، فەرمانی جەنگی پێکردین، ئەوانیش دەستیان هەڵگرت، خوا ﷻ ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّوٓا۟ أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ﴿٧٧﴾﴾،**

---

**(١) صحيح الإسناد. أخرجه الترمذي: ٣١٧١.**

**(٢) صحيح الإسناد.**




(واتە: ئایا سەیری ئەو کەسانەت نەکردوە کە پێیان وترا دەست هەڵبگرن لە جەنگ و کوشتار و نوێژ بکەن).

**٣٠٨٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: بُعِثْتُ بِجَوَامِعِ الْكَلِمِ، وَنُصِرْتُ بِالرُّعْبِ، وَبَيْنَا أَنَا نَائِمٌ أُتِيتُ بِمَفَاتِيحِ خَزَائِنِ الْأَرْضِ، فَوُضِعَتْ فِي يَدِي، قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَذَهَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَنْتُمْ تَنْتَثِلُونَهَا»(١).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نێردراوم بە وتەی کۆکەرەوە، (واتە: وتەی کورت و پڕ مانا)، وە سەرخراوم بەوەی لە دڵی دوژمندا و سام و هەیبەتم هەیە، لە کاتێکدا من خەوتبووم کلیلی خەزێنەکانی سەر زەویم بۆ هێنرا، خرایە نێو دەستمەوە، ئەبو هورەیرە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت و ئێوەش ئەو ماڵ و سامانانە دەردەهێنن.

تێبینی: ئەم خەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئوممەتەکەی زۆربەی سەر زەوی ڕزگار دەکەن و ماڵ و سامانی زۆر بە دەست دەهێنن.

**٣٠٨٨-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، نَحْوَهُ»(٢).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو هەروەکو فەرموودەکەی پێشەوەی گێڕایەوە.

**٣٠٨٩-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: بُعِثْتُ بِجَوَامِعِ الْكَلِمِ، وَنُصِرْتُ بِالرُّعْبِ، وَبَيْنَا أَنَا نَائِمٌ أُتِيتُ بِمَفَاتِيحِ خَزَائِنِ الْأَرْضِ، فَوُضِعَتْ فِي يَدِي، فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَقَدْ ذَهَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَأَنْتُمْ تَنْتَثِلُونَهَا»(٣).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: نێردراوم بە کۆکەرەوەی وشەکان، (واتە: وتەی کورت و پڕ مانا) وە سەرخراوم بەوەی لە دڵی دوژمندا و سام و هەیبەتم هەیە، لە کاتێکدا من خەوتبووم کلیلی گەنجینەکانی سەر

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٩٧٧ و ٦٩٩٨ و ٧٠١٣ و ٧٢٧٣، ومسلم: ٥ و ٥٢٣/٦، والترمذي: ١٥٥٣، وإبن ماجه: ٥٦٧.




زەویان پێدام، خستمە نێو دەستم، ئەبو هورەیرە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوای کردو ئێوەش وا کۆی دەکەنەوە. (واتە: دەسەڵاتی سەر زەوی و دەستکەوتی وڵاتەکان دەکەوێتە دەستی مسوڵمانان).

**٣٠٩٠-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَمَنْ قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، عَصَمَ مِنِّي مَالَهُ وَنَفْسَهُ، إِلَّا بِحَقِّهِ وَحِسَابُهُ عَلَى اللَّهِ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: فەرمانم پێکراوە بجەنگم هەتا دەڵێن: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) هیچ کەس شیاوی پەرستش نیە جگە لە خوا، هەر کەس وتی: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) ئەوە ماڵ و نەفسی پارێزراوە مەگەر بە حەقی ئیسلام نەبێت، لێپرسینەوەشی لای خوایە.**

**٣٠٩١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: لَمَّا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَاسْتُخْلِفَ أَبُو بَكْرٍ، وَكَفَرَ مَنْ كَفَرَ مِنَ الْعَرَبِ، قَالَ عُمَرُ: يَا أَبَا بَكْرٍ، كَيْفَ تُقَاتِلُ النَّاسَ، وَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَمَنْ قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، عَصَمَ مِنِّي نَفْسَهُ وَمَالَهُ، إِلَّا بِحَقِّهِ، وَحِسَابُهُ عَلَى اللَّهِ، قَالَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ: وَاللَّهِ لَأُقَاتِلَنَّ مَنْ فَرَّقَ بَيْنَ الصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ، فَإِنَّ الزَّكَاةَ حَقُّ الْمَالِ، وَاللَّهِ لَوْ مَنَعُونِي عَنَاقاً كَانُوا يُؤَدُّونَهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَقَاتَلْتُهُمْ عَلَى مَنْعِهَا، فَوَاللَّهِ مَا هُوَ إِلَّا أَنْ رَأَيْتُ اللَّهَ ﷻ قَدْ شَرَحَ صَدْرَ أَبِي بَكْرٍ لِلْقِتَالِ وَعَرَفْتُ أَنَّهُ الْحَقُّ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: کاتی پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد، پاشان لە دوای ئەو ئەبو بەکر کرا بە جێنشینی، ئەوەی بێبڕوا بوو بێبڕوا بوویەوە لە عەرەبەکان، عومەر بە ئەبو بەکری وت: چۆن لەگەڵ ئەو خەڵکە دەجەنگیت، لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فەرمانم پێکراوە لەگەڵ خەڵک بجەنگم تا دەڵێن: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) جا هەرکەس وتی: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) ماڵ و نەفسی پارێزراوە، مەگەر بە حەقی ئیسلام نەبێت، لێپرسینەوەشی لای خوایە، ئەبو بەکر وتی: سوێند بە خوا دەجەنگم لەگەڵ ئەوەی جیاوازی بخاتە نێوان نوێژ و زەکات، چونکە زەکات مافی ماڵ و سامانە، سوێند بە خوا ئەگەر ڕێگری بکەن گوریسێکم نەدەنێ کە پێشتر دابێتیان بە پێغەمبەر ﷺ جەنگیان لەگەڵ دەکەم لەسەر نەدانی، عومەر وتی: سوێند**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٩٤٦، ومسلم: ٣٣ و ٢١/٣٥، وأبو داود: ٢٦٤٠، والترمذي: ٢٦٠٦، وإبن ماجه: ٣٩٢٧.

(٢) صحيح.





**بە خوا تەنها خوا دڵی ئەبو بەکری ﷺ خستە سەر بڕیاردانی جەنگ، منیش بۆم دەرکەوت ئەو لەسەر حەقە.**

**٣٠٩٢-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: لَمَّا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ بَعْدَهُ، وَكَفَرَ مَنْ كَفَرَ مِنَ الْعَرَبِ، قَالَ عُمَرُ: يَا أَبَا بَكْرٍ، كَيْفَ تُقَاتِلُ النَّاسَ، وَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَمَنْ قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَقَدْ عَصَمَ مِنِّي مَالَهُ وَنَفْسَهُ، إِلَّا بِحَقِّهِ، وَحِسَابُهُ عَلَى اللَّهِ، قَالَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ: لَأُقَاتِلَنَّ مَنْ فَرَّقَ بَيْنَ الصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ، فَإِنَّ الزَّكَاةَ حَقُّ الْمَالِ، وَاللَّهِ لَوْ مَنَعُونِي عَنَاقاً كَانُوا يُؤَدُّونَهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَقَاتَلْتُهُمْ عَلَى مَنْعِهَا قَالَ عُمَرُ: فَوَاللَّهِ مَا هُوَ إِلَّا أَنْ رَأَيْتُ أَنَّ اللَّهَ ﷻ شَرَحَ صَدْرَ أَبِي بَكْرٍ لِلْقِتَالِ، فَعَرَفْتُ أَنَّهُ الْحَقُّ»[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: کاتی پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد، لە دوای ئەو ئەبو بەکر کرا بە جێنشینی، ئەوەی بێبڕوا بوو بێڕوا بوویەوە لە عەرەبەکان، عومەر بە ئەبو بەکری وت: ئەی ئەبو بەکر ﷺ چۆن لەگەڵ ئەو خەڵکە دەجەنگیت، لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فەرمانم پێکراوە لەگەڵ خەڵک بجەنگم تا دەڵێن: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) جا هەرکەس وتی: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) ماڵ و نەفسی پارێزراوە، مەگەر بە حەقی ئیسلام نەبێت، لێپرسینەوەشی لای خوایە، ئەبو بەکر وتی: سوێند بە خوا دەجەنگم لەگەڵ ئەوەی جیاوازی بخاتە نێوان نوێژ و زەکات، چونکە زەکات مافی ماڵ و سامانە، سوێند بە خوا ئەگەر ڕێگری بکەن گوریسێکم نەدەنێ کە پێشتر دابێتیان بە پێغەمبەر ﷺ جەنگیان لەگەڵ دەکەم لەسەر نەدانی، عومەر وتی: سوێند بە خوا تەنها خوا دڵی ئەبو بەکری خستە سەر بڕیاردانی جەنگ، منیش بۆم دەرکەوت ئەو لەسەر حەقە.**

**٣٠٩٣-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: لَمَّا جَمَعَ أَبُو بَكْرٍ لِقِتَالِهِمْ، فَقَالَ عُمَرُ: يَا أَبَا بَكْرٍ، كَيْفَ تُقَاتِلُ النَّاسَ، وَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَإِذَا قَالُوهَا، عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ، إِلَّا بِحَقِّهَا، قَالَ أَبُو بَكْرٍ: لَأُقَاتِلَنَّ مَنْ فَرَّقَ بَيْنَ الصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ، وَاللَّهِ لَوْ مَنَعُونِي عَنَاقاً كَانُوا يُؤَدُّونَهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَقَاتَلْتُهُمْ عَلَى مَنْعِهَا قَالَ عُمَرُ: فَوَاللَّهِ مَا هُوَ إِلَّا أَنْ رَأَيْتُ أَنَّ اللَّهَ تَعَالَى قَدْ شَرَحَ صَدْرَ أَبِي بَكْرٍ لِقِتَالِهِمْ، فَعَرَفْتُ أَنَّهُ الْحَقُّ»[2].

---

**(١) صحيح.**

**(٢) صحيح.**




واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: كاتی ئەبو بەكر خەڵكی كۆكردەوە بۆ جەنگ لەگەڵیان (ئەوانەی زەكاتیان نەدەدا)، عومەر وتی: ئەی ئەبو بەكر چۆن لەگەڵ ئەو خەڵكە دەجەنگیت، لە كاتێكدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فەرمانم پێكراوە لەگەڵ خەڵک بجەنگم تا دەڵێن: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) جا ئەگەر وتیان، ئەوە ماڵ و نەفسیان پارێزراوە، مەگەر بە حەقی ئیسلام نەبێت، ئەبو بەكر وتی: سوێند بە خوا دەجەنگم لەگەڵ ئەوەی جیاوازی بخاتە نێوان نوێژ و زەكات، سوێند بە خوا ئەگەر رێگری بكەن گوریسێكم نەدەنێ كە پێشتر دابێتیان بە پێغەمبەری خوا ﷺ جەنگیان لەگەڵ دەكەم لەسەر نەدانی، عومەر وتی: سوێند بە خوا تەنها خوا دڵی ئەبو بەكری خستە سەر بڕیاردانی جەنگ كردنیان، منیش بۆم دەركەوت ئەو لەسەر حەقە.

**٣٠٩٤-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ارْتَدَّتْ الْعَرَبُ، قَالَ عُمَرُ: يَا أَبَا بَكْرٍ، كَيْفَ تُقَاتِلُ الْعَرَبَ؟ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: إِنَّمَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ، وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ، وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ، وَاللَّهِ لَوْ مَنَعُونِي عَنَاقاً مِمَّا كَانُوا يُعْطُونَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَقَاتَلْتُهُمْ عَلَيْهِ، قَالَ عُمَرُ: فَلَمَّا رَأَيْتُ رَأْيَ أَبِي بَكْرٍ قَدْ شُرِحَ، عَلِمْتُ أَنَّهُ الْحَقُّ»[١].

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: كاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ كۆچی دوایی كرد، عەرەبەكان هەڵگەڕانەوە، عومەر وتی: ئەی ئەبو بەكر چۆن دەجەنگی لەگەڵ عەرەبەكان؟ ئەبو بەكر وتی: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فەرمانم پێكراوە لەگەڵ خەڵک بجەنگم تا دەڵێن: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) و منیش پێغەمبەری خوام، وە نوێژ دەكەن و زەكاتیش دەدەن، سوێند بە خوا ئەگەر رێگری بكەن گوریسێكم نەدەنێ كە پێشتر دابێتیان بە پێغەمبەری خوا ﷺ جەنگیان لەگەڵ دەكەم لەسەر نەدانی، عومەر وتی: كاتێ بۆچوونی ئەبو بەكرم بینی دڵی كراوەتەوە بۆم دەركەوت ئەو لەسەر حەقە.

**٣٠٩٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَمَنْ قَالَهَا فَقَدْ عَصَمَ مِنِّي نَفْسَهُ وَمَالَهُ، إِلَّا بِحَقِّهِ، وَحِسَابُهُ عَلَى اللَّهِ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فەرمانم پێكراوە لەگەڵ خەڵک بجەنگم تا دەڵێن: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) جا دانی پێدانا، ماڵ و نەفسی لە من پارێزراوە، مەگەر بە حەقی ئیسلام نەبێت، لێپرسینەوەشی لای خوایە.

---

(١) حسن صحيح.

(٢) صحيح.




**٣٠٩٦-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: جَاهِدُوا الْمُشْرِكِينَ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ وَأَلْسِنَتِكُمْ»[١].

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: جیهادی هاوبەشدانەران بکەن بە ماڵ و دەست و زمانتان.

## هەڕەشە کردن لە وازهێنان لە جیهاد

**٣٠٩٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ مَاتَ وَلَمْ يَغْزُ، وَلَمْ يُحَدِّثْ نَفْسَهُ بِغَزْوٍ، مَاتَ عَلَى شُعْبَةِ نِفَاقٍ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس مرد جەنگ و جیهادی نەکردبوو، نیەتیشی نەبوو بێت جیهاد بکات، ئەوە لەسەر بەشێکی دووڕوویی مردوە.

## مۆڵەتدان بە نەڕۆیشتن لەگەڵ سوپا

**٣٠٩٨-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْلَا أَنَّ رِجَالاً مِنَ الْمُؤْمِنِينَ لَا تَطِيبُ أَنْفُسُهُمْ أَنْ يَتَخَلَّفُوا عَنِّي وَلَا أَجِدُ مَا أَحْمِلُهُمْ عَلَيْهِ، مَا تَخَلَّفْتُ عَنْ سَرِيَّةٍ تَغْزُو فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﷻ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوَدِدْتُ أَنِّي أُقْتَلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، ثُمَّ أُحْيَا، ثُمَّ أُقْتَلُ، ثُمَّ أُحْيَا، ثُمَّ أُقْتَلُ، ثُمَّ أُحْيَا، ثُمَّ أُقْتَلُ»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: سوێند بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە پیاوانێک لە بڕواداران دەروونیان ئاسودە نابێ لە من دوابکەون، هەروەها کەلوپەلی ڕێگام نیە بۆیان ئامادە بکەم، لە هیچ سوپایەک دوانەدەکەوتم جیهادی بکردایە لە پێناوی خوا، سوێند بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە، حەزم دەکرد لە پێناوی خوا بکوژرامایە پاشان زیندوو بومایەتەوە، پاشان بکوژرامایە پاشان زیندوو بومایەتەوە، پاشان بکوژرامایە پاشان زیندوو بومایەتەوە، پاشان بکوژرامایە.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٥٠٤.

(٢) صحيح. مسلم: ١٩١٠، وأبو داود: ٢٥٠٢.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧٩٧ و ٧٢٢٦، ومسلم: ١٠٣ و ١٨٧٦.




## فەزڵ و چاکەی موجاهیدەکان لەسەر ئەوانەی دانیشتوون

**٣٠٩٩-** «عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أُنْزِلَ عَلَيْهِ: ﴿لَّا يَسْتَوِي ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٩٥﴾النساء، ﴿وَٱلْمُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٩٥﴾النساء، فَجَاءَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ وَهُوَ يُمِلُّهَا عَلَيَّ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَوْ أَسْتَطِيعُ الْجِهَادَ لَجَاهَدْتُ فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ، وَفَخِذُهُ عَلَى فَخِذِي، فَثَقُلَتْ عَلَيَّ حَتَّى ظَنَنْتُ أَنْ سَتُرَضُّ فَخِذِي، ثُمَّ سُرِّيَ عَنْهُ،﴿غَيْرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ ٩٥﴾النساء، قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ إِسْحَاقَ هَذَا لَيْسَ بِهِ بَأْسٌ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ إِسْحَقَ يَرْوِي عَنْهُ عَلِيُّ بْنُ مُسْهِرٍ، وَأَبُو مُعَاوِيَةَ، وَعَبْدُ الْوَاحِدِ بْنُ زِيَادٍ، عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ سَعْدٍ لَيْسَ بِثِقَةٍ»(١).

**واتە: زەیدی کوڕی ثابت ﷺ دەگێڕێتەوە، ئەم ئایەتە بۆ سەر پێغەمبەری خوا ﷺ: ﴿لَّا يَسْتَوِي ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٩٥﴾النساء (واتە: یەکسان نین دانیشتوان لە جیهادی ڕێی خوا لە بڕواداران)، ﴿وَٱلْمُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٩٥﴾النساء (واتە: وە لەگەڵ تێکۆشەرانی ڕێگەی خوادا)، ئیبنو ئوم مەکتوم هات، ئەو ئایەتەکەی بەسەرمدا دەیخوێندەوە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بمتوانایە جیهادم بکردایە جیهادم دەکرد، خوا ﷻ ئەم ئایەتەی دابەزاند، ڕانی لەسەر ڕانم بوو، قورسایی لەسەرم دروست کرد تا وتم: ڕانم دەشکێنێ، دواتر قورسایی لەسەری نەما ئەم ئایەتە دابەزیە خوارەوە: ﴿غَيْرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ ٩٥﴾النساء، (واتە: جگە لە خاوەن عوزرەکان)، ئەبو عەبدوڕڕەحمان وتی: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئیسحاق هیچی لەسەر نیە، وە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئیسحاق، عەلی کوڕی موسهیر و ئەبو موعاویە و عەبدوڕڕەحمانی کوڕی زیاد لێیەوە ڕیوایەتی کردوە لە نوعمانی کوڕی سەعدەوە کەسێکی متمانە پێکراو نیە.**

**٣١٠٠-** «عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَمْلَى عَلَيْهِ: ﴿لَّا يَسْتَوِي ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٩٥﴾النساء، ﴿وَٱلْمُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٩٥﴾النساء، قَالَ: فَجَاءَهُ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ وَهُوَ يُمِلُّهَا عَلَيَّ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَوْ أَسْتَطِيعُ الْجِهَادَ لَجَاهَدْتُ وَكَانَ رَجُلاً أَعْمَى، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ ﷺ وَفَخِذُهُ عَلَى فَخِذِي، حَتَّى هَمَّتْ تَرُضُّ فَخِذِي، ثُمَّ سُرِّيَ عَنْهُ فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ: ﴿غَيْرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ ٩٥﴾النساء»(٢).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٨٣٢ و ٤٥٩٢، والترمذي: ٣٠٣٣.

(٢) صحيح.

واتە: زەیدی کوڕی ثابت ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بەسەریدا خوێندیەوە: ﴿لَّا يَسْتَوِي ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٩٥﴾﴾، (واتە: یەکسان نین دانیشتوان لە جیهادی ڕێی خوا لە بڕواداران) ﴿وَٱلْمُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴿٩٥﴾﴾ (واتە: لەگەڵ تێکۆشەرانی ڕێگەی خوادا)، ئیبنو ئوممو مەکتوم هات، ئەو بەسەرمدا دەیخوێندەوە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بمتوانایە جیهادم بکردایە جیهادم دەکرد، پیاوێکی نابینا بوو، دواتر خوا ئایەتی دابەزاند بۆ سەر پێغەمبەرەکەی، ڕانی لەسەر ڕانم بوو، تا خەیاڵم کرد ڕانم دەشکێنێ، پاشان ئەو قورساییە لەسەری نەما، خوا ﷻ ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿غَيْرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ ﴿٩٥﴾﴾ (واتە: جگە لە خاوەن عوزرەکان).

**٣١٠١-** «عَنْ الْبَرَاءِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «ثُمَّ ذَكَرَ كَلِمَةً مَعْنَاهَا»، قَالَ: ائْتُونِي بِالْكَتِفِ وَاللَّوْحِ، فَكَتَبَ: ﴿لَّا يَسْتَوِي ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٩٥﴾﴾النساء، وَعَمْرُو بْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ خَلْفَهُ، فَقَالَ: هَلْ لِي رُخْصَةٌ؟ فَنَزَلَتْ: ﴿غَيْرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ ﴿٩٥﴾﴾النساء»[1].

واتە: بەڕاء ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ «پاشان باسی وشەیەکی کرد ماناکەی بەم شێوە بوو» فەرمووی: شان حەیوان و تەختەم بۆ بێنن، نووسی: ﴿لَّا يَسْتَوِي ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٩٥﴾﴾ (واتە: یەکسان نین دانیشتوان لە جیهادی ڕێی خوا لە بڕواداران)، عەمری کوڕی ئوممو مەکتوم لە پشتیەوە بوو، وتی: ئایا مۆڵەت بۆ من هەیە؟ ئینجا ئەمە دابەزی: ﴿غَيْرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ ﴿٩٥﴾﴾ (واتە: جگە لە خاوەن عوزرەکان).

**٣١٠٢-** «عَنْ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿لَّا يَسْتَوِي ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٩٥﴾﴾النساء، جَاءَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ وَكَانَ أَعْمَى فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَكَيْفَ فِيَّ وَأَنَا أَعْمَى؟ قَالَ: فَمَا بَرِحَ، حَتَّى نَزَلَتْ: ﴿غَيْرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ ﴿٩٥﴾﴾النساء»[2].

واتە: بەراء ﷺ دەڵێ: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿لَّا يَسْتَوِي ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٩٥﴾﴾ (واتە: یەکسان نین دانیشتوان لە جیهادی ڕێی خوا لە بڕواداران)، ئیبنو ئوممو مەکتوم هات کەسێکی نابینا بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەی من چی بکەم کە نابینام؟ مەجلیسەکەی بەجێ نەهێشت تا ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿غَيْرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ ﴿٩٥﴾﴾ (واتە: جگە لە خاوەن عوزرەکان).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٨٣١ و ٤٥٩٣ و ٤٥٩٣ و ٤٩٩٠، ومسلم: ١٤١ و ١٨٩٨/١٤٢، والترمذي: ١٦٧٠ و ٣٠٣١.




## مۆڵەتدان لە ئامادە نەبوونی جیهاد بۆ کەسێک خاوەن دوو منداڵ بێت

**٣١٠٣-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، يَسْتَأْذِنُهُ فِي الْجِهَادِ فَقَالَ: أَحَيٌّ وَالِدَاكَ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَفِيهِمَا فَجَاهِدْ»[١].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ داوای مۆڵەتی ڕۆیشتنی کرد بۆ جیهاد، فەرمووی: دایک و باوکت زیندوون؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: دەی با کۆششی تۆ لە خزمەتی ئەواندا بێت.**

## مۆڵەتدان لە ئامادە نەبوونی جیهاد بۆ کەسێک دایکی زیندوو بێت

**٣١٠٤-** «عَنْ جَاهِمَةَ ﷺ، جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَدْتُ أَنْ أَغْزُوَ وَقَدْ جِئْتُ أَسْتَشِيرُكَ، فَقَالَ: هَلْ لَكَ مِنْ أُمٍّ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَالْزَمْهَا، فَإِنَّ الْجَنَّةَ تَحْتَ رِجْلَيْهَا»[٢].

**واتە: جاهیمە ﷺ، هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، دەمەوێ بجەنگم، هاتووم ڕاوێژت پێ بکەم، فەرمووی: دایکت ماوە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: دەی پەیوەست بە پێیەوە. چونکە بەهەشت لە ژێر پێی دایە.**

## چاکەی ئەو کەسەی جیهاد دەکات لە پێناو خوا ﷻ بە گیان وماڵی

**٣١٠٥-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً أَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُّ النَّاسِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: مَنْ جَاهَدَ بِنَفْسِهِ وَمَالِهِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، قَالَ: ثُمَّ مَنْ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: ثُمَّ مُؤْمِنٌ فِي شِعْبٍ مِنَ الشِّعَابِ يَتَّقِي اللَّهَ، وَيَدَعُ النَّاسَ مِنْ شَرِّهِ»[٣].

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چاکترینی خەڵکی کێیە؟ فەرمووی: هەر کەس جیهاد بکات بە گیان و ماڵی لە پێناو خوادا)، وتی: پاشان کێ چاکترینە کەسە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: پاشان بڕوادارێک لە شیوێک لە شیوەکان لە خوا بترسێ، وە خەڵکیش دووربن لە شەڕو خراپەی (واتە: زیانی بۆ خەڵک نەبێ).**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٠٠٤ و ٥٩٧٢، ومسلم: ٢٥٤٩/٥، وأبو داود: ٢٥٢٩، والترمذي: ١٦١٧.

(٢) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ٢٤٠ و ٢٧٨١.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧٨٦ و ٦٤٩٤، ومسلم: ١٨٨٨، وأبو داود: ٢٤٨٥، والترمذي: ١٦٦٠، وإبن ماجه: ٣٩٧٨.




## فەزڵ و چاكەی ئەو كەسەی كار بكات لە پێناوی خوا لەسەر پێیەكانی

**٣١٠٦-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَامَ تَبُوكَ يَخْطُبُ النَّاسَ وَهُوَ مُسْنِدٌ ظَهْرَهُ إِلَى رَاحِلَتِهِ، فَقَالَ: أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِخَيْرِ النَّاسِ وَشَرِّ النَّاسِ؟ إِنَّ مِنْ خَيْرِ النَّاسِ: رَجُلاً عَمِلَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ عَلَى ظَهْرِ فَرَسِهِ، أَوْعَلَى ظَهْرِ بَعِيرِهِ، أَوْ عَلَى قَدَمِهِ، حَتَّى يَأْتِيَهُ الْمَوْتُ، وَإِنَّ مِنْ شَرِّ النَّاسِ: رَجُلاً فَاجِراً، يَقْرَأُ كِتَابَ اللَّهِ لَا يَرْعَوِي إِلَى شَيْءٍ مِنْهُ»(١).

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی تەبوک وتاری بۆ خەڵكیدا پاڵیدابوو بە وڵاخەكەیەوە، فەرمووی: ئایا هەواڵتان بدەمێ كە چاكترینی نێو خەڵكی و خراپترینی نێو خەڵكی كێیە؟ بەڕاستی چاكترینی نێو خەڵك: پیاوێكە لە پێناوی خوادا جیهادی كردبێت لەسەر پشتی ئەسپەكەی خۆی، یان لەسەر پشتی وشترەكەی، یان لەسەر پێی خۆی تا مردن یەخەی دەگرێ، وە بەڕاستی خراپترینی نێو خەڵكی پیاوێكە كتێبی خوا بخوێنێتەوە و دەست لە خراپەكاری هەڵناگرێ.**

**٣١٠٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: لَا يَبْكِي أَحَدٌ مِنْ خَشْيَةِ اللَّهِ فَتَطْعَمَهُ النَّارُ حَتَّى يُرَدَّ اللَّبَنُ فِي الضَّرْعِ، وَلَا يَجْتَمِعُ غُبَارٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَدُخَانُ جَهَنَّمَ فِي مَنْخَرَيْ مُسْلِمٍ أَبَداً»(٢).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: كەسێک نیە لە ترسی خوادا بگریەو ئاگریش بیسوتێنی، مەگەر شیر بگەڕێنرێتەوە بۆ نێو گوانی ئاژەڵ، وە تۆز لە پێناوی خوادا لەگەڵ دووكەڵی دۆزەخ لە لووتی بڕواداردا هەرگیز پێكەوە كۆنابنەوە.**

**٣١٠٨-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَا يَلِجُ النَّارَ رَجُلٌ بَكَى مِنْ خَشْيَةِ اللَّهِ تَعَالَى حَتَّى يَعُودَ اللَّبَنُ فِي الضَّرْعِ، وَلَا يَجْتَمِعُ غُبَارٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَدُخَانُ نَارِ جَهَنَّمَ»(٣).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پیاوێک لە ترسی خوادا بگریێ ئاگر نایسوتێنێ تا شیر نەگەڕێتەوە بۆ نێو گوانی ئاژەڵ، وە تۆزی جیهاد لە پێناوی خوادا لەگەڵ دووكەڵی ئاگری دۆزەخ هەرگیز پێكەوە كۆنابنەوە.**

---

(١) ضعيف الإسناد.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٣٠ و ١٨٩١/١٣١، والترمذي: ١٦٣٣ و ٢٣١١، وإبن ماجه: ٢٧٧٤.

٣١٠٩- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا يَجْتَمِعَانِ فِي النَّارِ مُسْلِمٌ قَتَلَ كَافِراً ثُمَّ سَدَّدَ وَقَارَبَ، وَلَا يَجْتَمِعَانِ فِي جَوْفِ مُؤْمِنٍ غُبَارٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَفَيْحُ جَهَنَّمَ، وَلَا يَجْتَمِعَانِ فِي قَلْبِ عَبْدٍ الْإِيمَانُ وَالْحَسَدُ»(١).

واته: ئەبو هورەیرە ﷺ، دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوو شت پێکەوە کۆنابنەوە لە ناو ئاگر مسوڵمانێک بێبڕوایەکی کوشتبێ، پاشان دوای ئەوە سنووری نەبەزاندبێ، وە تۆزی جیهاد لە پێناو خواداو گەرمی دۆزەخ لە هەناوی بڕواداردا هەرگیز پێکەوە کۆنابنەوە، هەروەها لە دڵدا بڕوابوون و حەسوودیش پێکەوە کۆنابنەوە.

٣١١٠- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا يَجْتَمِعُ غُبَارٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَدُخَانُ جَهَنَّمَ فِي جَوْفِ عَبْدٍ أَبَداً، وَلَا يَجْتَمِعُ الشُّحُّ وَالْإِيمَانُ فِي قَلْبِ عَبْدٍ أَبَداً»(٢).

واته: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوو شت هەن هەرگیز پێکەوە لە هەناوی بەندەدا کۆنابنەوە، تۆزی جیهاد لە پێناوی خوادا لەگەڵ دووکەڵی دۆزەخ، هەروەها ڕەزیلی ئیمانیش لە دڵی بەندەیەکدا هەرگیز پێکەوە کۆنابنەوە.

٣١١١- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَا يَجْتَمِعُ غُبَارٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَدُخَانُ جَهَنَّمَ فِي وَجْهِ رَجُلٍ أَبَداً، وَلَا يَجْتَمِعُ الشُّحُّ وَالْإِيمَانُ فِي قَلْبِ عَبْدٍ أَبَداً»(٣).

واته: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دوو شت هەن هەرگیز پێکەوە لە ڕوخساری کەسێکدا کۆنابنەوە تۆزی جیهاد لە پێناوی خوادا لەگەڵ دووکەڵی دۆزەخ، هەروەها ڕەزیلی و ئیمانیش لە دڵی بەندەیەکدا هەرگیز پێکەوە کۆنابنەوە.

٣١١٢- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا يَجْتَمِعُ غُبَارٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَدُخَانُ جَهَنَّمَ فِي جَوْفِ عَبْدٍ، وَلَا يَجْتَمِعُ الشُّحُّ وَالْإِيمَانُ فِي جَوْفِ عَبْدٍ»(٤).

---

(١) حسن.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوو شت هەن هەرگیز پێکەوە لە هەناوی بەندەدا کۆنابنەوە، تۆزی جیهاد لە پێناوی خوادا لەگەڵ دووکەڵی دۆزەخ، هەروەها ڕەزیلی و ئیمانیش لە هەناوی بەندەیەکدا هەرگیز پێکەوە کۆنابنەوە.**

**٣١١٣-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَا يَجْتَمِعُ غُبَارٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﷻ وَدُخَانُ جَهَنَّمَ فِي مَنْخَرَيْ مُسْلِمٍ أَبَداً»(١).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: تۆزی جیهاد لە پێناوی خوادا و دووکەڵی دۆزەخ هەرگیز پێکەوە لە لووتی مسوڵماندا کۆنابنەوە.**

**٣١١٤-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا يَجْتَمِعُ غُبَارٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَدُخَانُ جَهَنَّمَ فِي مَنْخَرَيْ مُسْلِمٍ، وَلَا يَجْتَمِعُ شُحٌّ وَإِيمَانٌ فِي قَلْبِ رَجُلٍ مُسْلِمٍ»(٢).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: تۆزی جیهاد لە پێناوی خوادا و دووکەڵی دۆزەخ هەرگیز پێکەوە لە لووتی مسوڵماندا کۆنابنەوە، هەروەها ڕەزیلی و ئیمانیش پێکەوە لە دڵی پیاوێکی مسوڵماندا کۆنابنەوە.**

**٣١١٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: لَا يَجْمَعُ اللَّهُ ﷻ غُبَاراً فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَدُخَانَ جَهَنَّمَ فِي جَوْفِ امْرِئٍ مُسْلِمٍ، وَلَا يَجْمَعُ اللَّهُ فِي قَلْبِ امْرِئٍ مُسْلِمٍ الْإِيمَانَ بِاللَّهِ وَالشُّحَّ جَمِيعاً»(٣).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: خوا ﷻ کۆی ناکاتەوە لە هەناوی کەسێکی بڕواداردا، تۆزی جیهاد لە پێناوی خوادا لەگەڵ دووکەڵی دۆزەخ، هەروەها خوا لە دڵی مسوڵمانێکدا ئیمان و ڕەزیلی پێکەوە کۆناکاتەوە.**

## پاداشتی ئەو کەسەی قاچەکانی لە پێناوی خوادا خۆڵاوی دەبن

**٣١١٦-** «عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي مَرْيَمَ، قَالَ: لَحِقَنِي عَبَايَةُ بْنُ رَافِعٍ «وَأَنَا مَاشٍ إِلَى الْجُمُعَةِ» فَقَالَ: أَبْشِرْ، فَإِنَّ خُطَاكَ هَذِهِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، سَمِعْتُ أَبَا عَبْسٍ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ اغْبَرَّتْ قَدَمَاهُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَهُوَ حَرَامٌ عَلَى النَّارِ»(٤).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٠٧ و ٢٨١١، والترمذي: ١٦٣٢.





واتە: یەزیدی کوڕی ئەبی مەریەم دەڵێ: عەبایەی کوڕی ڕافیع پێم گەیشت منیش بۆ نوێژی هەینی دەڕۆیشتم، وتی: مژدەم بدەرێ، بەڕاستی ئەم هەنگاوانەت لە پێناوی خوادایە، گوێم لە ئەبو عەبس بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس قاچەکانی لە پێناوی خوادا تۆزاوی بن، ئاگر لەسەری حەرامە.

## پاداشتی چاوێک لە پێناوی خوادا نەخەوێ

**٣١١٧-** «عَنْ أَبِي رَيْحَانَةَ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: حُرِّمَتْ عَيْنٌ عَلَى النَّارِ سَهِرَتْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ»[١].

**واتە:** ئەبو ڕەیحانە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: چاوێک ئاگری لەسەر حەرام کراوە لە پێناوی خوادا نەخەوێ.

## فەزڵ و چاکەی سەر لە بەیانی دەرچوون بۆ جیهاد لە پێناوی خوادا

**٣١١٨-** «عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْغَدْوَةُ وَالرَّوْحَةُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﷻ أَفْضَلُ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا»[٢].

**واتە:** سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سەر لە بەیانیەک و سەر لە ئێوارەیەک دەرچوون بۆ جیهاد لە پێناوی خوادا ﷻ چاکترە لە دونیاو ئەوەشی تیایدایە.

## فەزڵ و چاکەی سەر لە ئێوارەیەک دەرچوون بۆ جیهاد لە پێناوی خوادا

**٣١١٩-** «عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: غَدْوَةٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَوْ رَوْحَةٌ خَيْرٌ مِمَّا طَلَعَتْ عَلَيْهِ الشَّمْسُ وَغَرَبَتْ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧٩٤ و ٢٨٩٢ و ٣٢٥٠ و ٦٤١٥ و ٦٤١٥، ومسلم: ١١٣ و ١٨٨١/١١٤، والترمذي: ١٦٤٨ و ١٦٦٤، وإبن ماجه: ٢٧٥٦ و ٤٣٣٠.

(٣) صحيح. مسلم: ١٨٨٣.




واتە: ئەبو ئەیوبی ئەنصاری ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: سەر لە بەیانیەک دەرچوون لە پێناوی خوادا، یاخود سەر لە ئێوارەیەک چاکترە لەوەی کە خۆر لەسەری هەڵدێت و ئاواش دەبێت.

**٣١٢٠-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: ثَلَاثَةٌ كُلُّهُمْ حَقٌّ عَلَى اللَّهِ ﷻ: عَوْنُهُ الْمُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَالنَّاكِحُ الَّذِي يُرِيدُ الْعَفَافَ، وَالْمُكَاتَبُ الَّذِي يُرِيدُ الْأَدَاءَ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: سێ شت هەن هەموویان مافن لەسەر خوا ﷻ پشتیوانی کردنی موجاهید لە پێناوی خوادا، ئەو کەسەیشی ژن دەخوازێ بە مەبەستی داوێن پاکی، ئەو کۆیلەی گرێبەستی کردوە لەگەڵ گەورەکەیدا بۆ ئەوەی پارەکەی بداتەوەو خۆی ئازاد بکات.

## بابەت: جەنگاوەران میوانی بەڕێزی لای خوان

**٣١٢١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: وَفْدُ اللَّهِ ﷻ ثَلَاثَةٌ: الْغَازِي، وَالْحَاجُّ، وَالْمُعْتَمِرُ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: میوانە بەڕێزەکانی خوا (لە گەشتیارەکان) سیانن: ئەو کەسەی غەزا دەکات، ئەو کەسەی حەج دەکات، ئەو کەسەی عومرە دەکات.

## بابەت: زامنی و کەفیلی خوا ﷻ بۆ ئەو کەسەی جیهاد دەکات لە پێناویدا

**٣١٢٢-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: تَكَفَّلَ اللَّهُ ﷻ لِمَنْ جَاهَدَ فِي سَبِيلِهِ، لَا يُخْرِجُهُ إِلَّا الْجِهَادُ فِي سَبِيلِهِ، وَتَصْدِيقُ كَلِمَتِهِ بِأَنْ يُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ، أَوْ يَرُدَّهُ إِلَى مَسْكَنِهِ الَّذِي خَرَجَ مِنْهُ مَعَ مَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ أَوْ غَنِيمَةٍ»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا ﷻ کەفیلی و زامنی ئەو کەسەی کردوە جیهاد دەکات لە پێناویدا، هیچ شتێک دەری نەکردبێت لە ماڵ جگە لە جیهاد کردن نەبێ لە پێناویدا، وە بەڕاستدانانی

(١) حسن. أخرجه الترمذي: ١٦٥٥، وإبن ماجه: ٢٥١٨.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣١٢٣ و ٧٤٥٧ و ٧٤٦٣، ومسلم: ١٠٤ و ١٠٥ و ١٨٧٦/١٠٧، وإبن ماجه: ٢٧٥٣.




پێغەمبەرەکەی، بەوەی بیخاتە بەهەشتەوە، یاخود بیگەڕێنێتەوە بۆ ماڵەکەی کە لێی دەرچووە لەگەڵ پاداشت یان دەستکەوت.

**٣١٢٣-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: انْتَدَبَ اللَّهُ ﷻ لِمَنْ يَخْرُجُ فِي سَبِيلِهِ لَا يُخْرِجُهُ إِلَّا الْإِيمَانُ بِي، وَالْجِهَادُ فِي سَبِيلِي، أَنَّهُ ضَامِنٌ حَتَّى أُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ بِأَيِّهِمَا كَانَ، إِمَّا بِقَتْلٍ، أَوْ وَفَاةٍ، أَوْ أَرُدَّهُ إِلَى مَسْكَنِهِ الَّذِي خَرَجَ مِنْهُ، نَالَ مَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ أَوْ غَنِيمَةٍ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: خوا ﷻ کەفیلی و زامنی ئەو کەسەی کردوە لە پێناوی خوادا دەردەچێ هیچ شتێک دەری نەکردبێت لە ماڵ جگە لە بڕوا بوونی نەبێ بە من، وە بۆ جیهاد کردن لە پێناوی مندا، ئەو کەسە زەمانەتی پێدراوە تا دەیخەمە بەهەشتەوە بە هەر یەکێک لەو دووانە: بە کوشتن بێت، یاخود بە مردن، یاخود دەیگەڕێنمەوە بۆ ماڵەکەی کە لێی دەرچووە، لەگەڵ پاداشت یان دەستکەوتی جەنگی.**

**٣١٢٤-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَثَلُ الْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَنْ يُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، كَمَثَلِ الصَّائِمِ الْقَائِمِ، وَتَوَكَّلَ اللَّهُ لِلْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِهِ، بِأَنْ يَتَوَفَّاهُ فَيُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ، أَوْ يُرْجِعَهُ سَالِماً بِمَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ أَوْ غَنِيمَةٍ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: وێنەی موجاهید لە پێناوی خوادا، وە خوا خۆی زاناترە بەوەی جیهاد دەکات لە پێناویدا، وێنەی کەسێکە بە ڕۆژوو بێت و بە شە و شەونوێژ بکات، خوا زامنی ئەو موجاهیدەی کردوە کە لە پێناویدا دەجەنگێ، ئەگەر مراندی بیخاتە بەهەشتەوە، یان بە سەلامەتی بیگەڕێنێتەوە لەگەڵ پاداشتی جیهادەکەی یاخود بە دەستکەوتەوە.**

## بابەت: ئەو سوپایەی کە لە دونیادا بەشێک لە پاداشتەکەی وەردەگرێ

**٣١٢٥-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَا مِنْ غَازِيَةٍ تَغْزُو فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَيُصِيبُونَ غَنِيمَةً، إِلَّا تَعَجَّلُوا ثُلُثَيْ أَجْرِهِمْ مِنَ الْآخِرَةِ وَيَبْقَى لَهُمُ الثُّلُثُ، فَإِنْ لَمْ يُصِيبُوا غَنِيمَةً تَمَّ لَهُمْ أَجْرُهُمْ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧٨٧.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥٣ و ١٩٠٦/١٥٤، وأبو داود: ٢٤٩٧، وإبن ماجه: ٢٧٨٥.




واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هیچ جەنگاوەرێک نیە لە پێناوی خوادا بجەنگێ دەستکەوت بە دەست بهێنن، ئیللا دوو لەسەر سێی بەشی پاداشتەکەیان لە دونیادا وەردەگرن پێش دواڕۆژ، سێ یەکیان بۆ دەمێنێ، جا ئەگەر دەستکەوتیان بە دەست نەهێنا ئەوە پاداشتی تەواویان بۆ هەیە.

**٣١٢٦-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِيمَا يَحْكِيهِ عَنْ رَبِّهِ ﷻ، قَالَ: أَيُّمَا عَبْدٍ مِنْ عِبَادِي خَرَجَ مُجَاهِداً فِي سَبِيلِ اللَّهِ ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِي، ضَمِنْتُ لَهُ أَنْ أَرْجِعَهُ، إِنْ أَرْجَعْتُهُ بِمَا أَصَابَ مِنْ أَجْرٍ أَوْ غَنِيمَةٍ، وَإِنْ قَبَضْتُهُ غَفَرْتُ لَهُ وَرَحِمْتُهُ»(١).

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، لەو فەرمایشتانەی کە لە پەروەردگاریەوە ﷻ دەیگێڕێتەوە، دەفەرموێ: هەر بەندەیەک لە بەندەکانم دەربچێ بە جەنگاوەری لە پێناو ڕەزامەندی خوا، زەمانەتی ئەوەی بۆ دەکەم بیگەڕێنمەوە، ئەگەر گەڕانمەوە ئەوە بە پاداشت یان دەستکەوت دەیگەڕێنمەوە، وە ئەگەر ڕۆحیشی بکێشم لێی خۆش دەبم و میهرەبانی دەبارێنم بە سەریدا.

## نموونەی ئەو کەسەی جیهاد دەکات لە پێناوی خوا ﷻ

**٣١٢٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَثَلُ الْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَنْ يُجَاهِدُ فِي سَبِيلِهِ، كَمَثَلِ الصَّائِمِ الْقَائِمِ الْخَاشِعِ الرَّاكِعِ السَّاجِدِ»(٢).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: نموونەی ئەو کەسەی جیهاد دەکات لە پێناوی خوادا، خوا زاناترە بەوەی جیهاد دەکات لە پێناویدا، وەکو ئەو کەسە وایە بە ڕۆژ بەڕۆژووەو بە شەو شەونوێژ دەکات بە گەردنکەچیەوە ڕکووع و سوژدە دەبات.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧٨٧.

## ئەو کردەوەی دەگاتە ئاستی جیهاد کردن لە پێناو خوا ﷻ

**٣١٢٨-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: دُلَّنِي عَلَى عَمَلٍ يَعْدِلُ الْجِهَادَ؟ قَالَ: لَا أَجِدُهُ، هَلْ تَسْتَطِيعُ إِذَا خَرَجَ الْمُجَاهِدُ تَدْخُلُ مَسْجِداً فَتَقُومَ لَا تَفْتُرَ، وَتَصُومَ لَا تُفْطِرَ؟ قَالَ: مَنْ يَسْتَطِيعُ ذَلِكَ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: کارێکم پێنیشان بدە هاوتا بێت بە جیهاد؟ فەرمووی: هیچ شتێک نابینم، (دواتر پێی فەرموو:) ئایا دەتوانی لەو کاتەی موجاهید دەردەچێ بۆ جەنگ تۆش بچیتە نێو مزگەوتێکەوە بەردەوام نوێژو شەونوێژ بکەیت و خاو نەبیتەوە، وە بە ڕۆژوو بیت و ڕۆژوو نەشکێنی؟ وتی: کێ دەتوانێ ئەوە بکات (واتە: چۆن ئەو پاداشتە لە دەست دەدرێ کە لە جیهاد بە دەست دەهێنرێ).**

**٣١٢٩-** «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ، أَيُّ الْعَمَلِ خَيْرٌ؟ قَالَ: إِيمَانٌ بِاللَّهِ، وَجِهَادٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﷻ»[٢].

**واتە: ئەبو زەر ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد چی کردەوەیەک چاکە؟ وتی: بڕوابوون بە خوا و جیهاد کردن لە پێناوی خوادا.**

**٣١٣٠-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَيُّ الْأَعْمَالِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: إِيمَانٌ بِاللَّهِ، قَالَ: ثُمَّ مَاذَا؟ قَالَ: الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، قَالَ: ثُمَّ مَاذَا؟ قَالَ: حَجٌّ مَبْرُورٌ»[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێک پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ چی کردەوەیەک چاکە؟ فەرمووی: بڕوابوون بەخوا، وتی: پاشان چی تر؟ فەرمووی: جیهاد کردن لە پێناوی خوا، وتی: پاشان چی تر؟ فەرمووی: حەجی وەرگیراو.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧٨٥، ومسلم: ١٨٧٨، والترمذي: ١٦١٩.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٥٨١، ومسلم: ٨٤، وإبن ماجه: ٢٥٢٣.

(٣) صحيح.




## پلەو پایەی موجاهید لە پێناوی خوا ﷻ

**٣١٣١-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: يَا أَبَا سَعِيدٍ، مَنْ رَضِيَ بِاللَّهِ رَبّاً، وَبِالْإِسْلَامِ دِيناً، وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيّاً، وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ، قَالَ: فَعَجِبَ لَهَا أَبُو سَعِيدٍ، قَالَ: أَعِدْهَا عَلَيَّ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَفَعَلَ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: وَأُخْرَى يُرْفَعُ بِهَا الْعَبْدُ مِائَةَ دَرَجَةٍ فِي الْجَنَّةِ، مَا بَيْنَ كُلِّ دَرَجَتَيْنِ كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ، قَالَ: وَمَا هِيَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ»[١].

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەی ئەبو سەعید هەر کەس ڕازی بێت خوا پەروەدگاری بێت و، ئیسلام ئاینی بێت و، موحەممەد پێغەمبەری بێت، بەهەشتی بۆ واجب دەبێ، ئەبو سەعید سەری سوڕما وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆم دووبارە بکەرەوە، ئەویش دووبارەی کردەوە بۆی، پاشان فەرمووی: ئەوی تر بەندەی پێ بەرز دەبێتەوە بە سەد پلە لە بەهەشتدا، لە نێوان هەردوو پلەیەک وەکو نێوانی ئاسمان و زەوی وایە، وتی: ئەوە چیە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: جیهاد کردن لە پێناوی خوا، جیهادکردن لە پێناوی خوا.**

**٣١٣٢-** «عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ أَقَامَ الصَّلَاةَ، وَآتَى الزَّكَاةَ، وَمَاتَ لَا يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئاً، كَانَ حَقّاً عَلَى اللَّهِ ﷻ أَنْ يَغْفِرَ لَهُ هَاجِراً وَمَاتَ فِي مَوْلِدِهِ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَلَا نُخْبِرُ بِهَا النَّاسَ فَيَسْتَبْشِرُوا بِهَا؟ فَقَالَ: إِنَّ لِلْجَنَّةِ مِائَةَ دَرَجَةٍ، بَيْنَ كُلِّ دَرَجَتَيْنِ كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ، أَعَدَّهَا اللَّهُ لِلْمُجَاهِدِينَ فِي سَبِيلِهِ، وَلَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ، وَلَا أَجِدُ مَا أَحْمِلُهُمْ عَلَيْهِ، وَلَا تَطِيبُ أَنْفُسُهُمْ أَنْ يَتَخَلَّفُوا بَعْدِي، مَا قَعَدْتُ خَلْفَ سَرِيَّةٍ، وَلَوَدِدْتُ أَنِّي أُقْتَلُ، ثُمَّ أُحْيَا، ثُمَّ أُقْتَلُ»[٢].

**واتە: ئەبو دەرداء ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەرکەس نوێژەکانی بە جێبهێنێ و زەکاتی ماڵەکەی دەربکات، وە بمرێ و هاوبەشی بۆ خوا دانەنابێ ئەوە حەقە لەسەر خوا لێی خۆش ببێت، ئەگەر چی کۆچیشی نەکردبێ، وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا هەواڵ نەدەین بە خەڵکی مژدەی پێ بدەن؟ فەرمووی:**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٨٨٤.

(٢) حسن الإسناد.




بەڕاستی بەهەشت سەد پلەی هەیە لە نێوان دوو پلەدا وەکو نێوانی ئاسمان و زەوی وایە، خوا ﷻ ئامادەی کردوە بۆ موجاهیدەکان لە پێناویدا، جا ئەگەر گران نەبووایە لەسەر بڕواداران (لەگەڵ لێخۆشبووندا)، ئەوەندەش کەلوپەلی ڕێگام نیە بۆیان ئامادە بکەم، نەفس و دەروونیشیان ئاسودە نابێ لە من دوا بکەون، لە پشتی هیچ سوپایەکەوە دانەدەنیشتم، ئاواتم دەخواست من لە پێناو خوا بکوژرامایە و، پاشان زیندو بکرامایەوە، پاشان بکوژرامایە.

## پاداشتی ئەو کەسەی مسوڵمان دەبێ و کۆچ دەکات و جیهاد دەکات

**٣١٣٣-** «عَنْ فَضَالَةَ بْنَ عُبَيْدٍ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: أَنَا زَعِيمٌ، وَالزَّعِيمُ الْحَمِيلُ لِمَنْ آمَنَ بِي، وَأَسْلَمَ وَهَاجَرَ بِبَيْتٍ فِي رَبَضِ الْجَنَّةِ، وَبِبَيْتٍ فِي وَسَطِ الْجَنَّةِ، وَأَنَا زَعِيمٌ لِمَنْ آمَنَ بِي، وَأَسْلَمَ، وَجَاهَدَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، بِبَيْتٍ فِي رَبَضِ الْجَنَّةِ، وَبِبَيْتٍ فِي وَسَطِ الْجَنَّةِ، وَبِبَيْتٍ فِي أَعْلَى غُرَفِ الْجَنَّةِ، مَنْ فَعَلَ ذَلِكَ فَلَمْ يَدَعْ لِلْخَيْرِ مَطْلَبًا، وَلَا مِنَ الشَّرِّ مَهْرَبًا، يَمُوتُ حَيْثُ شَاءَ أَنْ يَمُوتَ»[1].

واتە: فەضالەی کوڕی عوبەید ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: من زەعیمم، زەعیمیش کەفیلە، بۆ ئەو کەسەی بڕوای پێم هێناوە بە دڵ، وە مسوڵمان بووە بەڕواڵەت و هیجرەتی کردوە، بە ماڵێک لە دەوروبەری بەهەشت، وە ماڵێک لە نێوەڕاستی بەهەشت، وە من کەفیلی ئەو کەسەم بڕوای پێ هێناوم و مسوڵمان بووەو جیهادی لە پێناوی خوادا کردوە، بە ماڵێک لە دەوروبەری بەهەشت، وە ماڵێک لە نێوەڕاستی بەهەشت، وە ماڵێک لە بەرزترین ژووری بەهەشت، هەر کەس ئەوەی کردبێ لە هەر جێگایە خێر هەبوبێ ئامادەی بووە، لە هەر جێگایەکیش شەڕو خراپە هەبووبێ لێی دوورکەوتۆتەوە، لە هەر شوێنێک بیەوێ بمرێ لەوێ دەمرێ.

**٣١٣٤-** «عَنْ سَبْرَةَ بْنِ أَبِي فَاكِهٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: إِنَّ الشَّيْطَانَ قَعَدَ لِابْنِ آدَمَ بِأَطْرُقِهِ، فَقَعَدَ لَهُ بِطَرِيقِ الْإِسْلَامِ، فَقَالَ: تُسْلِمُ وَتَذَرُ دِينَكَ وَدِينَ آبَائِكَ وَآبَاءِ أَبِيكَ، فَعَصَاهُ فَأَسْلَمَ، ثُمَّ قَعَدَ لَهُ بِطَرِيقِ الْهِجْرَةِ، فَقَالَ: تُهَاجِرُ وَتَدَعُ أَرْضَكَ وَسَمَاءَكَ، وَإِنَّمَا مَثَلُ الْمُهَاجِرِ كَمَثَلِ الْفَرَسِ فِي الطِّوَلِ، فَعَصَاهُ فَهَاجَرَ، ثُمَّ قَعَدَ لَهُ بِطَرِيقِ الْجِهَادِ، فَقَالَ: تُجَاهِدُ فَهُوَ جَهْدُ

---

(١) صحيح.




النَّفْسِ وَالْمَالِ، فَتُقَاتِلُ فَتُقْتَلُ، فَتُنْكَحُ الْمَرْأَةُ، وَيُقْسَمُ الْمَالُ، فَعَصَاهُ فَجَاهَدَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: فَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ كَانَ حَقّاً عَلَى اللَّهِ ﷻ أَنْ يُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ، وَمَنْ قُتِلَ كَانَ حَقّاً عَلَى اللَّهِ ﷻ أَنْ يُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ، وَإِنْ غَرِقَ كَانَ حَقّاً عَلَى اللَّهِ أَنْ يُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ، أَوْ وَقَصَتْهُ دَابَّتُهُ كَانَ حَقّاً عَلَى اللَّهِ أَنْ يُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ»[١].

**واته: سەبرەی کوڕی ئەبو فاکیه ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: شەیتان بۆ نەوەی ئادەم دادەنیشێ لە هەموو ڕێگاکانی، سەرەتا لەسەر ڕێگای مسوڵمان بوون دادەنیشێ، دەڵێ: مسوڵمان دەبی و واز لە ئاینەکەت و ئاینی باپیرانت و باوکت دەهێنی، ئەویش سەرپێچی دەکات و مسوڵمان دەبێت، پاشان لە ڕێگای هیجرەت کردن بۆی دادەنیشێ، دەڵێ: هیجرەت دەکەیت و زەویەکەت و ئاسمانەکەت بە جێ دەهێڵی، بەڕاستی نموونەی ئەو کەسەی هیجرەت دەکات وەکو ئەسپێک وایە بە مێخ بەسترابێتەوە، ئەویش سەرپێچی دەکات و هیجرەت دەکات، پاشان لە ڕێگای جیهادا بۆی دادەنیشێ، دەڵێ: جیهاد دەکەی گیان و ماڵ و سامانت دەخەیتە مەشەقەت و ماندوبوونەوە، ئینجا دەجەنگیت و دەکوژرێی، ژنەکەت مارە دەکرێ و ماڵ و سامانەکەت دابەش دەکرێ، ئەویش سەرپێچی دەکات و جیهاد دەکات، هەرکەس ئەوە بکات حەقە لەسەر خوا بیخاتە بەهەشتەوە، یان وڵاخەکەی فڕێی بداتە خوارەوە حەقە لەسەر خوا ﷻ بیخاتە بەهەشتەوە).**

## بابەت: فەزڵ و چاکەی ئەو کەسەی دوو شت لە یەک جۆر ببەخشێ لە پێناوی خوا ﷻ

**٣١٣٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، كَانَ يُحَدِّثُ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ أَنْفَقَ زَوْجَيْنِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ نُودِيَ فِي الْجَنَّةِ: يَا عَبْدَ اللَّهِ هَذَا خَيْرٌ، فَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصَّلَاةِ، دُعِيَ مِنْ بَابِ الصَّلَاةِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الْجِهَادِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الْجِهَادِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصَّدَقَةِ، دُعِيَ مِنْ بَابِ الصَّدَقَةِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصِّيَامِ، دُعِيَ مِنْ بَابِ الرَّيَّانِ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، مَا عَلَى الَّذِي يُدْعَى مِنْ تِلْكَ الْأَبْوَابِ كُلِّهَا مِنْ ضَرُورَةٍ، هَلْ يُدْعَى أَحَدٌ مِنْ تِلْكَ الْأَبْوَابِ كُلِّهَا؟ قَالَ: نَعَمْ، وَأَرْجُو أَنْ تَكُونَ مِنْهُمْ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس دوو شت لە یەک جۆر ببەخشێ لە پێناوی خوا (بۆ نموونە: دوو وشتر، یان دوو مەڕ، یان ... هتد)، لە بەهەشتدا بانگ دەکرێت ئەی بەندەی خوا ئەمە خێرو پاداشتێکە خوا بۆی ئامادە کردووی، جا هەر کەس لە ئەهلی نوێژ بێت لە دەرگای نوێژەوە بانگ دەکرێ، هەرکەسیش لە ئەهلی جیهاد بێت لە دەرگای جیهادەوە بانگ دەکرێ، هەرکەسیش لە ئەهلی خێرو صەدەقە بێت لە دەرگای خێرو صەدەقە بانگ دەکرێ، هەرکەسیش لە ئەهلی ڕۆژوو بێت لە دەرگای ڕەییانەوە بانگ دەکرێ، ئەبو بەکری صدیق وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئایا پێویست دەکات کەسێک لەو هەموو دەرگایانەو بانگ بکرێ (چونکە لە هەر دەرگایەکیانەوە چووە ژوورەوە ڕزگاری دەبێت)، ئایا کەسێک هەیە لە هەموو دەرگاکانەوە بانگ بکرێ؟ فەرمووی: بەڵێ، ئومێد دەکەم تۆ لەوانە بیت.

## ئەو کەسەی دەجەنگێ لەپێناو بەرزکردنەوەی وشەی: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)

**٣١٣٦-** «عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﷺ قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ الرَّجُلُ: يُقَاتِلُ لِيُذْكَرَ، وَيُقَاتِلُ لِيَغْنَمَ، وَيُقَاتِلُ لِيُرَى مَكَانُهُ، فَمَنْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ؟ قَالَ: مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللَّهِ هِيَ الْعُلْيَا فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﷻ»[1].

واتە: ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ دەڵێ: دەشتەکیەک هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: کەسێک دەجەنگێ بۆ ئەوەی باس بکرێ و ناوبانگی هەبێ، کەسێکی تریش دەجەنگێ بۆ ئەوە دەستکەوت وەربگرێ، کەسێکی تریش دەجەنگی لەبەر ئەوەی خەڵکی ببینن چەندە بوێرە، کامەیان لە پێناوی خوادایە؟ فەرمووی: هەرکەس بجەنگێت بۆ ئەوەی وشەی خوا: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) بەرز بێت تەنها ئەوە لە پێناو خوادایە ﷻ.

## ئەو کەسەی بجەنگێ تا پێی بڵێن: بوێرو چاونەترسە

**٣١٣٧-** «عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ قَالَ: تَفَرَّقَ النَّاسُ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، فَقَالَ لَهُ قَائِلٌ مِنْ أَهْلِ الشَّامِ: أَيُّهَا الشَّيْخُ، حَدِّثْنِي حَدِيثًا سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: نَعَمْ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٣ و ٢٨١٠ و ٣١٢٦ و ٧٤٥٨، ومسلم: ١٤٩ و ١٩٠٤/١٥١، وأبو داود: ٢٥١٧ و ٢٥١٨، والترمذي: ١٦٤٦، وإبن ماجه: ٢٧٨٣.





يَقُولُ: أَوَّلُ النَّاسِ يُقْضَى لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ثَلَاثَةٌ: رَجُلٌ اسْتُشْهِدَ فَأُتِيَ بِهِ فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ فَعَرَفَهَا، قَالَ: فَمَا عَمِلْتَ فِيهَا؟ قَالَ: قَاتَلْتُ فِيكَ حَتَّى اسْتُشْهِدْتُ، قَالَ: كَذَبْتَ، وَلَكِنَّكَ قَاتَلْتَ لِيُقَالَ فُلَانٌ جَرِيءٌ، فَقَدْ قِيلَ، ثُمَّ أُمِرَ بِهِ، فَسُحِبَ عَلَى وَجْهِهِ حَتَّى أُلْقِيَ فِي النَّارِ، وَرَجُلٌ تَعَلَّمَ الْعِلْمَ وَعَلَّمَهُ، وَقَرَأَ الْقُرْآنَ فَأُتِيَ بِهِ فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ فَعَرَفَهَا، قَالَ: فَمَا عَمِلْتَ فِيهَا؟ قَالَ: تَعَلَّمْتُ الْعِلْمَ وَعَلَّمْتُهُ، وَقَرَأْتُ فِيكَ الْقُرْآنَ، قَالَ: كَذَبْتَ، وَلَكِنَّكَ تَعَلَّمْتَ الْعِلْمَ لِيُقَالَ عَالِمٌ، وَقَرَأْتَ الْقُرْآنَ لِيُقَالَ قَارِئٌ، فَقَدْ قِيلَ، ثُمَّ أُمِرَ بِهِ، فَسُحِبَ عَلَى وَجْهِهِ حَتَّى أُلْقِيَ فِي النَّارِ، وَرَجُلٌ وَسَّعَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَأَعْطَاهُ مِنْ أَصْنَافِ الْمَالِ كُلِّهِ، فَأُتِيَ بِهِ فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ، فَعَرَفَهَا، فَقَالَ: مَا عَمِلْتَ فِيهَا؟ قَالَ: مَا تَرَكْتُ مِنْ سَبِيلٍ تُحِبُّ « قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: « وَلَمْ أَفْهَمْ تُحِبُّ كَمَا أَرَدْتُ أَنْ يُنْفَقَ فِيهَا إِلَّا أَنْفَقْتُ فِيهَا لَكَ، قَالَ: كَذَبْتَ وَلَكِنْ لِيُقَالَ إِنَّهُ جَوَادٌ، فَقَدْ قِيلَ، ثُمَّ أُمِرَ بِهِ، فَسُحِبَ عَلَى وَجْهِهِ، فَأُلْقِيَ فِي النَّارِ»[1].

**واتە: سولەیمانی کوڕی یەسار دەڵێ: خەڵکی لای ئەبو هورەیرە ﷺ بڵاوەیان کرد، پیاوێک لە خەڵکی شام پێی وت: شێخ باسی فەرموودەیەکم بۆ بکە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستبێتت، وتی: بەڵێ، گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: یەکەم کۆمەڵ دادگەری دەکرێن لە ڕۆژی دواییدا سیانن: پیاوێک شەهید بووە دەهێنرێ و نیعمەتەکانی پێ دەناسێنرێ ئەویش دانی پێدا دەنێ، دەڵێ: تۆ چیت کردوە تیایدا؟ ئەویش دەڵێ: جەنگم کرد تا شەهید بووم، (خوا یان فریشتە پێی) دەڵێ: درۆت کرد، بەڵکو جەنگت کرد بۆ ئەوەی پێت بڵێن بوێرە، بێگومان پێت وترا، پاشان فەرمان دەکرێ لەسەر ڕوخساری ببرێ و فڕێ بدرێتە نێو ئاگر، وە پیاوێک فێری زانست بووەو خەڵکیشی فێرکردوە و قورئانیشی خوێندوە، دەهێنرێ و نیعمەتەکانی پێ دەناسێنرێ ئەویش دانی پێدا دەنێ، دەڵێ: کارت پێ کردون؟ دەڵێ: فێری زانست بووم و خەڵکیشم فێر کرد، قورئانیشم خوێند، (خوا یان فریشتە پێی) دەڵێ: درۆت کرد، بەڵکو فێری زانست بوی بۆ ئەوەی پێت بڵێن: زانایە، وە قورئانت خوێند بۆ ئەوەی پێت بڵێن: قورئان خوێنە، بێگومان پێت وترا، پاشان فەرمانی پێدەکرێ لەسەر ڕوخساری ڕادەکێشرێ و دەخرێتە نێو ئاگرەوە، وە پیاوێک خوا ماڵ و سامانی پێ بەخشیوە بە هەموو جۆرەکان، دەهێنرێ و نیعمەتەکانی پێ دەناسێنرێ ئەویش دانی پێدا دەنێ، دەڵێ: چۆن کارت پێ کردوون؟ دەڵێ: ئەوەی جێم هێشتوە لە پێناو خۆشەویستی تۆیە، ئەبو عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: تێنەگەیشتم (وا بزانم وتی:)**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩٠٥، والترمذي: ٢٣٨٢.




ئەوەی تۆ پێت خۆشە لەو پێناوەدا بەخشیم، (خوا یان فریشتە پێی) دەڵێ: درۆت کرد، بەڵکو لەبەر ئەوەی پێت بڵێن کەسێکی بەخشندەیە، بێگومان پێت وترا، پاشان فەرمانی پێ دەدرێ و لەسەر ڕوخساری ڕادەکێشرێ بۆ نێو ئاگر.

## ئەو کەسەی دەجەنگێ لە پێناو خوادا مەبەستی لە جەنگ کردنەکەیدا تەنها گوریسێک بێ

**٣١٣٨-** «عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ غَزَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَمْ يَنْوِ إِلَّا عِقَالاً فَلَهُ مَا نَوَى»[١].

**واتە: عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لە پێناوی خوادا بجەنگێ و نیەتی ئەوە بێ گوریسێکی دەست بکەوێ ئەوە بە پێی نیەتەکەی خۆیەتی.**

**٣١٣٩-** «عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ غَزَا وَهُوَ لَا يُرِيدُ إِلَّا عِقَالاً فَلَهُ مَا نَوَى»[٢].

**واتە: عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک جیهاد بکات تەنها مەبەستی ئەوە بێ گوریسێکی دەست بکەوێ ئەوە بە پێی نیەتەکەی خۆیەتی.**

## هەر کەسێک بجەنگێ بە مەبەستی بە دەستهێنانی ناوبانگ

**٣١٤٠-** «عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ ﷺ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: أَرَأَيْتَ رَجُلاً غَزَا يَلْتَمِسُ الْأَجْرَ وَالذِّكْرَ، مَالَهُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا شَيْءَ لَهُ، فَأَعَادَهَا ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، يَقُولُ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا شَيْءَ لَهُ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ لَا يَقْبَلُ مِنَ الْعَمَلِ إِلَّا مَا كَانَ لَهُ خَالِصاً، وَابْتُغِيَ بِهِ وَجْهُهُ»[٣].

**واتە: ئەبو ئومامەی باهیلی ﷺ دەڵێ: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: هەواڵم بدەرێ دروستە کەسێک بجەنگێ مەبەستی پاداشت و ناوبانگ و ماڵ و**

---

(١) حسن.

(٢) حسن.

(٣) صحيح لغيره.




سامان بێت؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هیچ پاداشتی بۆ نیە، سێ جار دووبارەی کردووەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: هیچ پاداشتی بۆ نیە، پاشان فەرمووی: بەڕاستی خوا ﷻ هیچ کردەوەیەک وەرناگرێ مەگەر بە دڵسۆزی تەنها بۆ خوا بێت و لە پێناو ئەودا بێت.

## پاداشتی ئەو کەسەی بجەنگێ لە پێناوی خوادا بە قەد وشتر دۆشینێک

**٣١٤١-** «عَنْ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ ﷺ قَالَ: سَمِعتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ قَاتَلَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﷻ مِنْ رَجُلٍ مُسْلِمٍ فَوَاقَ نَاقَةٍ، وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ، وَمَنْ سَأَلَ اللَّهَ الْقَتْلَ مِنْ عِنْدِ نَفْسِهِ صَادِقاً ثُمَّ مَاتَ أَوْ قُتِلَ، فَلَهُ أَجْرُ شَهِيدٍ، وَمَنْ جُرِحَ جُرْحاً فِي سَبِيلِ اللَّهِ، أَوْ نُكِبَ نَكْبَةً، فَإِنَّهَا تَجِيءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَأَغْزَرِ مَا كَانَتْ، لَوْنُهَا كَالزَّعْفَرَانِ وَرِيحُهَا كَالْمِسْكِ، وَمَنْ جُرِحَ جُرْحاً فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَعَلَيْهِ طَابَعُ الشُّهَدَاءِ»[١].

**واتە: موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر پیاوێکی مسوڵمان بجەنگێ لە پێناوی خوادا بە قەد وشتر دۆشینێک، بەهەشتی بۆ پێویست دەبێت، هەرکەسیش داوای کوشتن بکات لە پێناوی خوادا، لە ناخی خۆیەوە بەڕاستی، پاشان بمرێ یان بکوژرێ، ئەوە پاداشتی شەهیدی بۆ هەیە، هەرکەسیش لە پێناوی خوادا بریندار ببێ، یان هەر ناخۆشیەکی بەسەردا بێت، ئەوە لە ڕۆژی دواییدا بە چاکتر لە پێشوو دەهێنرێ ڕەنگی وەکو زەعفەرانەو بۆنیشی وەکو میسکە، هەرکەسیش لە پێناوی خوادا بریندار ببێت ئەوە مۆری شەهیدی وەردەگرێ.**

## پاداشتی ئەو کەسەی لە پێناوی خوا ﷻ تیرێک دەهاوێژێ

**٣١٤٢-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ عَبَسَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ شَابَ شَيْبَةً فِي سَبِيلِ اللَّهِ تَعَالَى، كَانَتْ لَهُ نُوراً يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ رَمَى بِسَهْمٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ تَعَالَى بَلَغَ الْعَدُوَّ، أَوْ لَمْ يَبْلُغْ، كَانَ لَهُ كَعِتْقِ رَقَبَةٍ، وَمَنْ أَعْتَقَ رَقَبَةً مُؤْمِنَةً، كَانَتْ لَهُ فِدَاءَهُ مِنَ النَّارِ عُضْواً بِعُضْوٍ»[٢].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٥٤١، والترمذي: ١٦٥٤ و ١٦٥٧، وإبن ماجه: ٢٧٩٢.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٩٦٥ و ٣٩٦٦، والترمذي: ١٦٣٨.




واتە: عەمری کوڕی عەبەسە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەس بە گەنجێتی جیهاد بکات لە پێناوی خوای بەرزدا تا تاڵە قژەکانی سپی دەبن، ئەوە بۆی دەبێ بە ڕوناکی لە ڕۆژی دواییدا، هەرکەسیش تیرێک لە پێناوی خوای بەرزدا بهاوێژێ و دوژمن بپێکێ یان نەیپێکێ، وەکو ئەوە وایە بەندەیەکی ئازاد کردبێ، هەرکەسیش بەندەیەکی بڕوادار ئازاد بکات، ئەوە دەبێتە مایەی ڕزگار بوونی ئەندام بە ئەندامی جەستەکەی لە ئاگر.

**٣١٤٣-** «عَنْ أَبِي نَجِيحٍ السَّلَمِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ بَلَغَ بِسَهْمٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، فَهُوَ لَهُ دَرَجَةٌ فِي الْجَنَّةِ فَبَلَّغْتُ يَوْمَئِذٍ سِتَّةَ عَشَرَ سَهْماً، قَالَ: وَسَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ رَمَى بِسَهْمٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَهُوَ عِدْلُ مُحَرَّرٍ»[١].

واتە: ئەبو نەجیحی سوللەمی ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەس تیرێک بهاوێژێ لە پێناوی خوادا، ئەوە پلەیەکی بۆ هەیە لە بەهەشتدا، جا ئەو ڕۆژە شازدە تیرم هاوێژت، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەس تیرێک بهاوێژێ لە پێناوی خوا ئەوە وەکو ئەوە وایە بەندەیەک ئازاد بکات.

**٣١٤٤-** «عَنْ كَعْبِ بْنِ مُرَّةَ ﷺ قالَ: عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ شَابَ شَيْبَةً فِي الْإِسْلَامِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، كَانَتْ لَهُ نُوراً يَوْمَ الْقِيَامَةِ قال لَهُ: حَدِّثنا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ واحذر قال سمعتهُ، يَقُولُ: ارْمُوا مَنْ بَلَغَ الْعَدُوَّ بِسَهْمٍ رَفَعَهُ اللَّهُ بِهِ دَرَجَةً، قَالَ ابْنُ النَّحَّامِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَا الدَّرَجَةُ؟ قَالَ: أَمَا إِنَّهَا لَيْسَتْ بِعَتَبَةِ أُمِّكَ، وَلَكِنْ مَا بَيْنَ الدَّرَجَتَيْنِ مِائَةُ عَامٍ»[٢].

واتە: کەعبی کوڕی مورە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس گەنجێتی بەسەر ببات لە ئیسلامدا لە پێناوی خوادا، هەتا تاڵە قژەکانی سپی دەبن ئەوە بۆی دەبن بە ڕووناکی لە ڕۆژی دوایی دا. واتە: کەعبی کوڕی مورە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بهاوێژن، هەر کەس تیرێک بهاوێژێتە دوژمن خوا بە هۆیەوە پلەیەک بەرزی دەکاتەوە، ئیبنو نەححام وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پلە چیە؟ فەرمووی: ئەوە وەکو پلەکانەی ماڵەکەتان نیە، بەڵکو نێوان دوو پلە سەد ساڵە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٦٣٤.




**٣١٤٥-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ عَبَسَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ رَمَى بِسَهْمٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَبَلَغَ الْعَدُوَّ أَخْطَأَ أَوْ أَصَابَ، كَانَ لَهُ كَعِدْلِ رَقَبَةٍ، وَمَنْ أَعْتَقَ رَقَبَةً مُسْلِمَةً، كَانَ فِدَاءُ كُلِّ عُضْوٍ مِنْهُ عُضْواً مِنْهُ مِنْ نَارِ جَهَنَّمَ، وَمَنْ شَابَ شَيْبَةً فِي سَبِيلِ اللَّهِ، كَانَتْ لَهُ نُوراً يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[١].

**واتە: عەمری کوڕی عەبەسە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەس تیرێک بهاوێژێ لە پێناوی خواداو دوژمن بپێکێ یان نەیپێکێ، وەکو ئەوە وایە بەندەیەکی ئازاد کردبێ، هەرکەسیش بەندەیەکی بڕوادار ئازاد بکات، ئەوە دەبێتە مایەی ڕزگاربوونی ئەندام بە ئەندامی لە ئاگر دۆزەخ، هەرکەسیش بە گەنجێتی جیهاد بکات لە پێناوی خوادا هەتا تاڵە قژەکانی سپی دەبن ئەوە بۆی دەبن بە ڕووناکی لە ڕۆژی دوایی دا.**

**٣١٤٦-** «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: اللَّهَ ﷻ يُدْخِلُ ثَلَاثَةَ نَفَرٍ الْجَنَّةَ بِالسَّهْمِ الْوَاحِدِ: صَانِعَهُ يَحْتَسِبُ فِي صُنْعِهِ الْخَيْرَ، وَالرَّامِيَ بِهِ، وَمُنَبِّلَهُ»[٢].

**واتە: عوقبەی کوڕی عامر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوا ﷻ سێ کەس دەخاتە بەهەشتەوە بە یەک تیر: دروستکەرەکەی لە دروستکردنیدا مەبەستی خێر بێت، ئەو کەسیشی دەیهاوێژێ بۆ دوژمن، ئەو کەسەیشی دەیداتە دەستیەوە.**

## بابەت: ئەو کەسەی بریندار دەبێ لە پێناوی خوا ﷻ

**٣١٤٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَا يُكْلَمُ أَحَدٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَنْ يُكْلَمُ فِي سَبِيلِهِ، إِلَّا جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَجُرْحُهُ يَثْعَبُ دَماً، اللَّوْنُ لَوْنُ دَمٍ، وَالرِّيحُ رِيحُ الْمِسْكِ»[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس لە پێناوی خوادا بریندار ببێت، خوا دەزانی بەوەی لە پێناویدا بریندار دەبێت، ئەوە لە ڕۆژی دوایی دا برینەکەی خوێنی لێ دەچۆڕێ، ڕەنگ ڕەنگی خوێنە و بۆنیش بۆنی میسکە.**

---

(١) صحيح.

(٢) ضعيف. أبو داود: ٢٥١٣.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٧ و ٢٨٠٣، ومسلم: ١٨٧٦/١٠٥، والترمذي: ١٦٥٦، وإبن ماجه: ٢٧٩٥.




**٣١٤٨-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ ثَعْلَبَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: زَمِّلُوهُمْ بِدِمَائِهِمْ، فَإِنَّهُ لَيْسَ كَلْمٌ يُكْلَمُ فِي اللَّهِ، إِلَّا أَتَى يَوْمَ الْقِيَامَةِ جُرْحُهُ يَدْمَى، لَوْنُهُ لَوْنُ دَمٍ، وَرِيحُهُ رِيحُ الْمِسْكِ»[1].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی ثەعلەبە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە خوێنەکانیانەوە دایانپۆشن، چونکە هیچ برینداریێک نیە برینەکەی خوێنی لێ بچۆڕێ لەبەر خوا، ئیللا لە ڕۆژی دوایدا دێت برینەکەی خوێنی لێ دەڕوات، ڕەنگەکەی ڕەنگی خوێنە و بۆنەکەی بۆنی میسکە.**

## ئەو وتەی (مسوڵمان) دەیڵێ کاتێ دوژمن بریندارێ کردوە

**٣١٤٩-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ أُحُدٍ وَوَلَّى النَّاسُ، كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي نَاحِيَةٍ فِي اثْنَيْ عَشَرَ رَجُلاً مِنَ الْأَنْصَارِ، وَفِيهِمْ طَلْحَةُ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ، فَأَدْرَكَهُمُ الْمُشْرِكُونَ، فَالْتَفَتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَقَالَ: مَنْ لِلْقَوْمِ؟ فَقَالَ طَلْحَةُ: أَنَا، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كَمَا أَنْتَ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ: أَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ: أَنْتَ فَقَاتَلَ، حَتَّى قُتِلَ، ثُمَّ الْتَفَتَ فَإِذَا الْمُشْرِكُونَ، فَقَالَ: مَنْ لِلْقَوْمِ؟ فَقَالَ طَلْحَةُ: أَنَا، قَالَ: كَمَا أَنْتَ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ: أَنَا، فَقَالَ: أَنْتَ فَقَاتَلَ، حَتَّى قُتِلَ، ثُمَّ لَمْ يَزَلْ يَقُولُ ذَلِكَ، وَيَخْرُجُ إِلَيْهِمْ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ فَيُقَاتِلُ قِتَالَ مَنْ قَبْلَهُ حَتَّى يُقْتَلَ، حَتَّى بَقِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَطَلْحَةُ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ لِلْقَوْمِ؟ فَقَالَ طَلْحَةُ: أَنَا، فَقَاتَلَ طَلْحَةُ قِتَالَ الْأَحَدَ عَشَرَ، حَتَّى ضُرِبَتْ يَدُهُ، فَقُطِعَتْ أَصَابِعُهُ، فَقَالَ: حَسِّ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَوْ قُلْتَ بِسْمِ اللَّهِ لَرَفَعَتْكَ الْمَلَائِكَةُ وَالنَّاسُ يَنْظُرُونَ، ثُمَّ رَدَّ اللَّهُ الْمُشْرِكِينَ»[2].

**واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: کاتێ جەنگی ئوحود ڕوویدا خەڵکانێک پشتیان هەڵکرد، پێغەمبەریش ﷺ لە تەنیشتێکەوە دوازدە کەس لە ئەنصارەکانی لەگەڵ بوو، طەڵحەشیان تێدا بوو، هاوبەشدانەران پێیان گەیشتن، پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوڕی دایەوە فەرمووی: کێ دەجەنگێ لەگەڵیان، طەڵحە وتی: من، فەرمووی: تۆ لە جێگای خۆت بە، پیاوێک لە ئەنصارەکان وتی: من، فەرمووی: تۆ بڕۆ بجەنگە، ئەویش جەنگا تا کوژرا، پاشان ئاوڕی دایەوە بۆ لای هاوبەشدانەران فەرمووی: کێ دەجەنگێ لەگەڵیان، طەڵحە وتی: من، فەرمووی: تۆ**

---

(١) صحيح.

(٢) ضعيف.

له جێگای خۆت به، پیاوێک له ئەنصارەکان وتی: من، فەرمووی: تۆ بڕۆ بجەنگە، ئەویش جەنگا تا کوژرا، پاشان بەردەوام ئەوەی دەوت: کەسێک له ئەنصارەکان دەردەچوو ڕووبەڕوویان دەبوویەوە وەکو پێش خۆی جەنگی لەگەڵ دەکرد تا دەکوژرا، تا پێغەمبەر ﷺو طەڵحە مانەوە، ئینجا طەڵحە کوشتارێکی سەختی کرد تا درا له دەستی و پەنجەیەکی پەڕێنرا، وتی: ئاه، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر بتوتایە (بِسْمِ اللَّه) بە ناوی خوا ﷻ فریشتەکان بەرزیان دەکردیتەوە و خەڵکی دەیان بینی، پاشان خوا ﷻ هاوبەشدانەرانی دوورخستەوە.

## بابەت: ئەو کەسەی لە پێناوی خوادا دەجەنگێ و شمشێرەکەی هەڵدەگەڕێتەوە دەیکوژێ

**٣١٥٠-** «عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ ﷺ قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ خَيْبَرَ قَاتَلَ أَخِي قِتَالاً شَدِيداً مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَارْتَدَّ عَلَيْهِ سَيْفُهُ فَقَتَلَهُ، فَقَالَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي ذَلِكَ وَشَكُّوا فِيهِ رَجُلٌ مَاتَ بِسِلَاحِهِ، قَالَ سَلَمَةُ: فَقَفَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ خَيْبَرَ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَتَأْذَنُ لِي أَنْ أَرْتَجِزَ بِكَ، فَأَذِنَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: اعْلَمْ مَا تَقُولُ، فَقُلْتُ:

وَاللَّهِ لَوْلَا اللَّهُ مَا اهْتَدَيْنَا ... وَلَا تَصَدَّقْنَا وَلَا صَلَّيْنَا

فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: صَدَقْتَ

فَأَنْزِلَنْ سَكِينَةً عَلَيْنَا ... وَثَبِّتِ الْأَقْدَامَ إِنْ لَاقَيْنَا

وَالْمُشْرِكُونَ قَدْ بَغَوْا عَلَيْنَا

فَلَمَّا قَضَيْتُ رَجَزِي، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ قَالَ هَذَا؟ قُلْتُ: أَخِي، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَرْحَمُهُ اللَّهُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَاللَّهِ إِنَّ نَاساً لَيَهَابُونَ الصَّلَاةَ عَلَيْهِ يَقُولُونَ: رَجُلٌ مَاتَ بِسِلَاحِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَاتَ جَاهِداً مُجَاهِداً، قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: ثُمَّ سَأَلْتُ ابْناً لِسَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ، فَحَدَّثَنِي، عَنْ أَبِيهِ، مِثْلَ ذَلِكَ، غَيْرَ أَنَّهُ قَالَ حِينَ قُلْتُ: إِنَّ نَاساً لَيَهَابُونَ الصَّلَاةَ عَلَيْهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كَذَبُوا، مَاتَ جَاهِداً مُجَاهِداً، فَلَهُ أَجْرُهُ مَرَّتَيْنِ، وَأَشَارَ بِأُصْبُعَيْهِ»[1].

**واتە: سەلەمەی کوڕی ئەکوع ﷺ دەڵێ: لە ڕۆژی خەیبەردا براکەم زۆر بە سەختی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دژ بە هاوبەشدانەران دەجەنگا شمشێرەکەی هەڵگەڕایەوەو**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤١٩٦، ومسلم: ١٨٠٢/١٢٤، وأبو داود: ٢٥٣٨.




بەر خۆی کەوت و کوشتی، هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ گومانیان هەبوو کەسێک بە شمشێرەکەی خۆی بمرێ، سەلەمە وتی: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەیبەر گەڕایەوە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەم دەدەی شیعرێک بڵێم، پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی پێدا، عومەری کوڕی خەتتاب وتی: دەزانم چی دەڵێی، وتم:

وەڵڵاهی گەر خوا نەبوایە هیدایەتمان وەرنەدەگرت ... وە نەدەمان بەخشی و نەنوێژمان دەکرد

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ڕاستت کرد

(ئەی خوایە) هێمنی خۆت دابەزێنە بەسەرماندا ... پێیەکانمان جێگیربکە ئەگەر ڕووبەڕووبوینەوە

هاوبەشدانەران دەست درێژییان کرد

کاتێ شیعرەکم تەواو کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کێ ئەمەی وت؟ وتم: براکەم، فەرمووی: خوا ڕەحمی پێ بکات، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سوێند بە خوا خەڵکانێک هەیە دەترسن نوێژی لەسەر بکەن، دەڵێن: بە هۆی شمشێرەکەیەوە مردوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بە جیهادو جەنگاوەری مرد، ئیبنو شیهاب دەڵێ: پاشان پرسیارم لە دوو کوڕەکەی ئەکوع کرد، بۆی گێڕامەوە لە باوکیەوە هەر وەکو ئەوە، ئەوە نەبێت وتی: کاتێ وتم: خەڵکانێک دەترسان نوێژی لەسەر بکەن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ڕاستییان نەکرد، بە جیهاد و جەنگاوەریەوە مرد، دووجار پاداشتی بۆ هەیە، بە هەردوو دەستی ئاماژەی پێکرد.

## بابەت: ئاواتی کوژران و شەهیدبوون لە پێناوی خوا

**٣١٥١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لَمْ أَتَخَلَّفْ عَنْ سَرِيَّةٍ، وَلَكِنْ لَا يَجِدُونَ حَمُولَةً، وَلَا أَجِدُ مَا أَحْمِلُهُمْ عَلَيْهِ، وَيَشُقُّ عَلَيْهِمْ أَنْ يَتَخَلَّفُوا عَنِّي، وَلَوَدِدْتُ أَنِّي قُتِلْتُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، ثُمَّ أُحْيِيتُ، ثُمَّ قُتِلْتُ، ثُمَّ أُحْيِيتُ، ثُمَّ قُتِلْتُ، ثَلَاثاً»[1].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٩٧٢ و ٧٢٢٧، ومسلم: ١٠٦/١٨٧٦.





واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر نەبووایەتە بارگرانی بەسەر ئوممەتەکەمەوە لە هیچ لەشکرێک دوانەدەکەوتم، بەڵام ئەوان سواریان نیە (وشتر، یان ئێستر، یان گوێدرێژی) کەلوپەلی ڕێگاوبانیان بۆ هەڵبگرێ، منیش ئەوەندەم نیە لە ئەستۆی بگرم، بە لایانیشەوە گرانە لە من دوابکەون، وە ئاواتم دەخواست لە پێناوی خوادا بجەنگایەم، پاشان زیندوو بکرایامەتەوە، پاشان بکوژرامایە، پاشان زیندوو بکرامایەتەوە، پاشان بکوژرامایە سێ جار.

**٣١٥٢-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْلَا أَنَّ رِجَالاً مِنَ الْمُؤْمِنِينَ لَا تَطِيبُ أَنْفُسُهُمْ بِأَنْ يَتَخَلَّفُوا عَنِّي، وَلَا أَجِدُ مَا أَحْمِلُهُمْ عَلَيْهِ، مَا تَخَلَّفْتُ عَنْ سَرِيَّةٍ تَغْزُو فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوَدِدْتُ أَنِّي أُقْتَلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، ثُمَّ أُحْيَا، ثُمَّ أُقْتَلُ، ثُمَّ أُحْيَا، ثُمَّ أُقْتَلُ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: سوێند بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە پیاوانێک لە بڕواداران دەروونیان ئاسودە نابێت لە من دوابکەون، هەروەها پێویستی ڕێگاوبانم نیە بۆیان ئامادە بکەم، (لە وشترو ئێسترو گوێدرێژ) لە هیچ سوپایەک دوانەدەکەوتم جیهادی بکردایە لە پێناوی خوا، سوێند بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە، حەزم دەکرد لە پێناوی خوا بکوژرامایە پاشان زیندوو بومایەتەوە، پاشان بکوژرامایە، پاشان زیندوو بومایەتەوە، پاشان بکوژرامایە.

**٣١٥٣-** «عَنِ ابْنِ أَبِي عَمِيرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَا مِنَ النَّاسِ مِنْ نَفْسٍ مُسْلِمَةٍ يَقْبِضُهَا رَبُّهَا تُحِبُّ أَنْ تَرْجِعَ إِلَيْكُمْ، وَأَنَّ لَهَا الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا غَيْرُ الشَّهِيدِ، قَالَ ابْنُ أَبِي عَمِيرَةَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: وَلَأَنْ أُقْتَلَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ يَكُونَ لِي أَهْلُ الْوَبَرِ وَالْمَدَرِ»[٢].

واتە: ئیبنو ئەبو عومەیر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر نەفسێکی مسوڵمان کاتێ خوا دەیمرێنی حەز دەکات بگەڕێتەوە بۆ نێوتان، ئەگەر ئەوەندەی دونیایشی هەبێ و ئەوەشی لە ناویدایە، جگە لە شەهید، ئیبنو ئەبو عەمیرە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر بکوژرامایە لە پێناوی خوادا، پێم خۆشتر بوو لەوەی ئەوەندەی خەڵکی لادێ و شار ماڵ و داراییم هەبووایە.

---

(١) صحیح.

(٢) حسن.

## پاداشتی ئەو كەسەی لە پێناوی خوا ﷻ دەكوژرێ

**٣١٥٤-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَجُلٌ يَوْمَ أُحُدٍ: أَرَأَيْتَ إِنْ قُتِلْتُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، فَأَيْنَ أَنَا؟ قَالَ: فِي الْجَنَّةِ، فَأَلْقَى تَمَرَاتٍ فِي يَدِهِ، ثُمَّ قَاتَلَ حَتَّى قُتِلَ»(١).

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پیاوێک لە ڕۆژی ئوحود وتی: ئەگەر من لە پێناوی خوادا كوژرام، شوێنم كوێیە؟ فەرمووی: لە بەهەشتە، چەند دەنكە خورمایەک لە دەستیدا بوو فڕێیدا، پاشان جەنگا تا كوژرا.**

## هەر كەس لە پێناوی خوادا جەنگاو قەرزی لەسەر بوو

**٣١٥٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ يَخْطُبُ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَقَالَ: أَرَأَيْتَ إِنْ قَاتَلْتُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ صَابِراً مُحْتَسِباً مُقْبِلاً غَيْرَ مُدْبِرٍ، أَيُكَفِّرُ اللَّهُ عَنِّي سَيِّئَاتِي؟ قَالَ: نَعَمْ، ثُمَّ سَكَتَ سَاعَةً، قَالَ: أَيْنَ السَّائِلُ آنِفاً؟ فَقَالَ الرَّجُلُ: هَا أَنَا ذَا، قَالَ: مَا قُلْتَ؟ قَالَ: أَرَأَيْتَ إِنْ قُتِلْتُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ صَابِراً مُحْتَسِباً مُقْبِلاً غَيْرَ مُدْبِرٍ، أَيُكَفِّرُ اللَّهُ عَنِّي سَيِّئَاتِي؟ قَالَ: نَعَمْ، إِلَّا الدَّيْنَ، سَارَّنِي بِهِ جِبْرِيلُ آنِفاً»(٢).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، لەسەر مینبەر وتاری دەدا، وتی: ئایا ئەگەر من بجەنگم لە پێناوی خوا ﷻ بە خۆڕاگریی و چاوەڕوانی پاداشت و ڕووبەڕووی دوژمن بەبێ ئەوەی پشت هەڵبكەم، ئایا خوا گوناهەكانم دەسڕێتەوە، فەرمووی: بەڵێ، پاشان ماوەیەک بێدەنگ بوو، فەرمووی: ئەو كەسە لە كوێیە كەمێک پێش ئێستا پرسیاری كرد؟ پیاوەكە وتی: ئا من لێرم، فەرمووی: چیت وت؟ وتی: ئایا ئەگەر من بجەنگم لە پێناوی خوا ﷻ بە خۆڕاگری و چاوەڕوانی پاداشت و ڕووبەڕووی دوژمن بەبێ ئەوەی پشت هەڵبكەم، ئایا خوا گوناهەكانم دەسڕێتەوە، فەرمووی: بەڵێ، جگە لە قەرز تۆزی پێش ئێستا جبریل ئاگاداری كردمەوە.**

**٣١٥٦-** «عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ إِنْ قُتِلْتُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ صَابِراً مُحْتَسِباً مُقْبِلاً غَيْرَ مُدْبِرٍ، أَيُكَفِّرُ اللَّهُ عَنِّي خَطَايَايَ؟ قَالَ رَسُولُ

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٠٤٦، ومسلم: ١٨٩٩.

(٢) حسن صحيح.




اللَّهِ ﷺ: نَعَمْ، فَلَمَّا وَلَّى الرَّجُلُ، نَادَاهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، أَوْأَمَرَ بِهِ فَنُودِيَ لَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كَيْفَ قُلْتَ؟ فَأَعَادَ عَلَيْهِ قَوْلَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: نَعَمْ، إِلَّا الدَّيْنَ، كَذَلِكَ قَالَ لِي جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ»[١].

**واتە: ئەبو قەتادە ﷺ دەڵێ: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئایا ئەگەر من بکوژرێم لە پێناوی خوا ﷻ بە خۆڕاگریی و چاوەڕوانی پاداشت و ڕووبەڕووی دوژمن بەبێ ئەوەی پشت هەڵبکەم، ئایا خوا گوناهەکانم دەسڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ، کاتێ پیاوەکە پشتی هەڵکردو ڕۆیشت، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کرد، یان فەرمانی کرد بۆی بانگ کرا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: چیت وت؟ قسەکەی بۆی دووبارە کردەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ، جگە لە قەرز، بەم شێوەیە جبریل پێی وتم.**

**٣١٥٧-** «عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ قال: عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَامَ فِيهِمْ، فَذَكَرَ لَهُمْ أَنَّ الْجِهَادَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَالْإِيمَانَ بِاللَّهِ، أَفْضَلُ الْأَعْمَالِ، فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْتَ إِنْ قُتِلْتُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، أَيُكَفِّرُ اللَّهُ عَنِّي خَطَايَايَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: نَعَمْ، إِنْ قُتِلْتَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَأَنْتَ صَابِرٌ مُحْتَسِبٌ، مُقْبِلٌ غَيْرُ مُدْبِرٍ، إِلَّا الدَّيْنَ، فَإِنَّ جِبْرِيلَ عَلَيْهِ السَّلَامُ قَالَ لِي ذَلِكَ»[٢].

**واتە: ئەبو قەتادە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا لە ناویاندا، باسی جیهادی کرد لە پێناوی خوا و بڕوا بوون بە خوا، چاکترینی کردەوەکانە، پیاوێک هەڵسا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ئەگەر بکوژرێم لە پێناوی خوادا، ئایا خوا لە گوناهەکانم خۆش دەبێ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ، ئەگەر بکوژرێی لە پێناوی خوا و خۆڕاگر بێت و ئومێدی پاداشتت هەبێ و، ڕووبەڕووی دوژمن بجەنگی و پشت هەڵنەکەی، جگە لە قەرز نەبێ، چونکە جبریل ئەوەی بۆ باس کردم.**

**٣١٥٨-** «عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ إِنْ ضَرَبْتُ بِسَيْفِي فِي سَبِيلِ اللَّهِ صَابِراً مُحْتَسِباً مُقْبِلاً غَيْرَ مُدْبِرٍ حَتَّى أُقْتَلَ، أَيُكَفِّرُ اللَّهُ عَنِّي خَطَايَايَ؟ قَالَ: نَعَمْ، فَلَمَّا أَدْبَرَ دَعَاهُ، فَقَالَ: هَذَا جِبْرِيلُ يَقُولُ: إِلَّا أَنْ يَكُونَ عَلَيْكَ دَيْنٌ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١١٧ و ١٨٨٥/١١٨، والترمذي: ١٧١٢.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: ئەبو قتادە ﷺ دەڵێ: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لەسەر مینبەر بوو، وتی: ئایا ئەگەر من بە شمشێرەکەم بجەنگم لە پێناوی خوا بە خۆڕاگریی و چاوەڕوانی پاداشت و ڕووبەڕووی دوژمن بەبێ ئەوەی پشت هەڵبکەم تا دەکوژرێم، ئایا خوا گوناهەکانم دەسڕێتەوە؟ فەرمووی: بەڵێ، کاتێ پیاوەکە پشتی هەڵکردو ڕۆیشت، پێغەمبەر ﷺ بانگی کرد، فەرمووی: ئەمە جبریلە دەڵێ: مەگەر قەرزت لەسەر بێت.

## ئەوەی کوژراو ئاواتی پێ دەخوازێ لە پێناوی خوادا

**٣١٥٩-** «عَنْ عُبَادَةَ بْنَ الصَّامِتِ ﷺ قال: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَا عَلَى الْأَرْضِ مِنْ نَفْسٍ تَمُوتُ، وَلَهَا عِنْدَ اللَّهِ خَيْرٌ، تُحِبُّ أَنْ تَرْجِعَ إِلَيْكُمْ وَلَهَا الدُّنْيَا، إِلَّا الْقَتِيلُ، فَإِنَّهُ يُحِبُّ أَنْ يَرْجِعَ فَيُقْتَلَ مَرَّةً أُخْرَى»[١].

واتە: عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ نەفسێک لەسەر زەویدا نیە بمرێ، لای خوا خێرو پاداشتی هەبێت و حەز بکات بگەڕێتەوە بۆ نێوتان، ئەگەر هەموو دونیاشی پێ بدرێ، جگە لە کوژراو، چونکە ئەو حەز دەکات بگەڕێتەوە و جارێکی تر بکوژرێتەوە.

## ئەوەی ئەهلی بەهەشت ئاواتی پێ دەخوازن

**٣١٦٠-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يُؤْتَى بِالرَّجُلِ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، فَيَقُولُ اللَّهُ ﷻ: يَا ابْنَ آدَمَ، كَيْفَ وَجَدْتَ مَنْزِلَكَ؟ فَيَقُولُ: أَيْ رَبِّ خَيْرَ مَنْزِلٍ، فَيَقُولُ: سَلْ وَتَمَنَّ، فَيَقُولُ: أَسْأَلُكَ أَنْ تَرُدَّنِي إِلَى الدُّنْيَا فَأُقْتَلَ فِي سَبِيلِكَ عَشْرَ مَرَّاتٍ، لِمَا يَرَى مِنْ فَضْلِ الشَّهَادَةِ»[٢].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پیاوێک لە ئەهلی بەهەشت دێنن، خوا پێی دەفەموێ: ئەی نەوەی ئادەم، پلە و پایەکەت چۆنە؟ دەڵێ: چاکترین پلە و پایەیە ئەی خودایە، دەڵێ: پرسیار بکەو ئاوات بخوازە، دەڵێ: داوات لێ دەکەم بمگەڕێنیتەوە بۆ دونیا دە جار لە پێناوی خوادا بکوژرێم، کاتێ فەزڵ و چاکەی شەهیدی دەبینێ.

---

(١) حسن صحيح.

(٢) صحيح.

## ئەوەی شەهید دەیبینێ لە ئێش و ئازار

**٣١٦١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: الشَّهِيدُ لَا يَجِدُ مَسَّ الْقَتْلِ إِلَّا كَمَا يَجِدُ أَحَدُكُمُ الْقَرْصَةَ يُقْرَصُهَا»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شەهید ئازاری کوشتن نابینێ تەنها وەکو ئەوە نەبێ یەکێک قونجگێکی لێ بگیرێ.**

## داواکردنی شەهید بوون

**٣١٦٢-** «عَنْ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ سَأَلَ اللَّهَ ﷻ الشَّهَادَةَ بِصِدْقٍ، بَلَّغَهُ اللَّهُ مَنَازِلَ الشُّهَدَاءِ، وَإِنْ مَاتَ عَلَى فِرَاشِهِ»[٢].

**واتە: سەهلی کوڕی حونەیف دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس بەڕاستی داوای شەهید بوون لە خوا بکات، خوا دەیگەیەنێت بە پلە و پایەی شەهیدەکان، ئەگەرچی لەسەر جێگاش مردبێ.**

**٣١٦٣-** «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: خَمْسٌ مَنْ قُبِضَ فِي شَيْءٍ مِنْهُنَّ فَهُوَ شَهِيدٌ: الْمَقْتُولُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ شَهِيدٌ، وَالْغَرِقُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ شَهِيدٌ، وَالْمَبْطُونُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ شَهِيدٌ، وَالْمَطْعُونُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ شَهِيدٌ، وَالنُّفَسَاءُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ شَهِيدٌ»[٣].

**واتە: عوقبەی کوڕی عامر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێنج شت هەن هەرکەس بە هۆی یەکێک لەوانەوە بمرێ ئەوە شەهیدە: کوژراو لە پێناوی خوادا شەهیدە، خنکاو لە پێناوی خوادا شەهیدە، سک ئێشە لە پێناوی خوادا شەهیدە، ئەوەی بە نەخۆشی تاعون دەمرێ لە پێناوی خوا شەهیدە، ئەوانەشی خوێنی زەیستانەیان هەیە لە پێناوی خوادا شەهیدن.**

**٣١٦٤-** «عَنِ الْعِرْبَاضِ بْنِ سَارِيَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: يَخْتَصِمُ الشُّهَدَاءُ وَالْمُتَوَفَّوْنَ عَلَى فُرُشِهِمْ إِلَى رَبِّنَا فِي الَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنَ الطَّاعُونِ، فَيَقُولُ الشُّهَدَاءُ: إِخْوَانُنَا قُتِلُوا كَمَا قُتِلْنَا، وَيَقُولُ

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٦٦٨، وإبن ماجه: ٢٨٠٢.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩٠٩، وأبو داود: ١٥٢٠، والترمذي: ١٦٥٣، وإبن ماجه: ٢٧٩٧.

(٣) صحيح.




الْمُتَوَفَّوْنَ عَلَى فُرُشِهِمْ: إِخْوَانُنَا مَاتُوا عَلَى فُرُشِهِمْ كَمَا مُتْنَا، فَيَقُولُ رَبُّنَا: انْظُرُوا إِلَى جِرَاحِهِمْ، فَإِنْ أَشْبَهَ جِرَاحُهُمْ جِرَاحَ الْمَقْتُولِينَ، فَإِنَّهُمْ مِنْهُمْ وَمَعَهُمْ، فَإِذَا جِرَاحُهُمْ قَدْ أَشْبَهَتْ جِرَاحَهُمْ»[١].

واتە: عیرباضی کوڕی ساریە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شەهیدەکان و ئەوانەی بەهۆی تاعوونەوە مردوون ناکۆکی خۆیان دەبەن بۆ لای خوا لەسەر جێگاکانیان، شەهیدەکان دەڵێن: براکانمان کوژران وەکو چۆن ئێمە کوژراین، پەروەردگارمان دەفەرموێ: تەماشای برینەکانیان بکەن، ئەگەر برینەکانیان لە برینی کوژراوەکان چوو، ئەوە لە ئەوانن و لەگەڵیاندان، تەماشایان کرد برینەکانیان وەکو برینی ئەوان بوو.

## کۆبوونەوەی بکوژو ئەوەی کوژراو لە پێناو خوا، لە بەهەشتدا

**٣١٦٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ ﷻ يَعْجَبُ مِنْ رَجُلَيْنِ يَقْتُلُ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ، وَقَالَ مَرَّةً أُخْرَى: لَيَضْحَكُ مِنْ رَجُلَيْنِ يَقْتُلُ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ «ثُمَّ يَدْخُلَانِ الْجَنَّةَ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوا ﷻ سەرسام دەبێ بە دوو کەس یەکێکیان ئەوی تری کوشتووە، جارێکی تر فەرمووی: بەو دوو کەسە پێدەکەنێ یەکێکیان ئەوی تر دەکوژێ، پاشان هەردووکیان دەچنە بەهەشتەوە.

## تەفسیرکردنی کۆبوونەوەی بکوژ و ئەوەشی کوژراوە لە پێناو خوا لە بەهەشتدا

**٣١٦٦-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: يَضْحَكُ اللَّهُ إِلَى رَجُلَيْنِ يَقْتُلُ أَحَدُهُمَا الْآخَرَ كِلَاهُمَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ، يُقَاتِلُ هَذَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَيُقْتَلُ، ثُمَّ يَتُوبُ اللَّهُ عَلَى الْقَاتِلِ فَيُقَاتِلُ فَيُسْتَشْهَدُ»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا بەو دوو کەسە پێدەکەنێ یەکێکیان ئەوەی دیکە دەکوژێ، هەردووکیان دەچنە بەهەشتەوە،

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٨٢٦، ومسلم: ١٢٨ و ١٨٩٠/١٢٩، وإبن ماجه: ١٩١.

(٣) صحيح.




ئەمیان لە پێناو خوادا دەجەنگێ و دەکوژێ، پاشان خوا لە بکوژەکە خۆش دەبێ، ئەویش دەجەنگێ و شەهید دەبێ.

## فەزڵی چاودێری و پاسەوانی لە پێناوی خوا

**٣١٦٧-** «عَنْ سَلْمَانَ الْخَيْرِ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ رَابَطَ يَوْماً وَلَيْلَةً فِي سَبِيلِ اللَّهِ كَانَ لَهُ كَأَجْرِ صِيَامِ شَهْرٍ وَقِيَامِهِ، وَمَنْ مَاتَ مُرَابِطاً أُجْرِيَ لَهُ مِثْلُ ذَلِكَ مِنَ الأَجْرِ، وَأُجْرِيَ عَلَيْهِ الرِّزْقُ، وَأَمِنَ مِنَ الْفَتَّانِ»[١].

**واتە: سەلمانی خێر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس ڕۆژو شەوێک لە پێناوی خوا پاسەوانی بکات، وەکو ئەوە وایە مانگێک بە ڕۆژ بەڕۆژوو بووبێ و بە شەویش شەونوێژی کردبێ، هەر کەسیش لە کاتی پاسەوانیدا لە پێناو خوا بمرێ، پاداشتی پاسەوانیەکەشی لە دوای مردنی بەردەوام دەبێت، وە ڕزق و ڕۆزی پێ دەدرێ وەکو شەهید لە بەهەشتدا، پارێزراویش دەبێت لە فیتنەی نێو گۆڕ.**

**٣١٦٨-** «عَنْ سَلْمَانَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ رَابَطَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ يَوْماً وَلَيْلَةً كَانَتْ لَهُ كَصِيَامِ شَهْرٍ وَقِيَامِهِ، فَإِنْ مَاتَ جَرَى عَلَيْهِ عَمَلُهُ الَّذِي كَانَ يَعْمَلُ، وَأَمِنَ الْفَتَّانَ، وَأُجْرِيَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ»[٢].

**واتە: سەلمان ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەس شەوو ڕۆژێ پاسەوانی بکات لە پێناوی خوا وەکو ئەوە وایە مانگێک بە بەڕۆژوو بووبێت و بە شەوەکەشی شەونوێژی کردبێ، ئەگەر مرد پاداشتی ئەو کردەوەی کە کردوویەتی بەردەوام دەبێت بە مردنیشی پاداشتەکەی ناپچڕێت، پارێزراویش دەبێت لە فیتنەی نێو گۆڕ، وە ڕزق و ڕۆزی پێدەدرێ وەکو شەهید لە بەهەشتدا.**

**٣١٦٩-** «عَنْ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: رِبَاطُ يَوْمٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ يَوْمٍ فِيمَا سِوَاهُ مِنَ الْمَنَازِلِ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩١٣، والترمذي: ١٦٦٥.

(٢) صحيح.

(٣) حسن لغيره. أخرجه الترمذي: ١٦٦٧، وإبن ماجه: ٢٧٦٦.




**واتە: عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: پاسەوانی ڕۆژێک لە پێناوی خوادا چاکترە لە هەزار ڕۆژ لە ڕۆژەکانی تر.**

**٣١٧٠-** «عَنْ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ ﷺ قال: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: يَوْمٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ يَوْمٍ فِيمَا سِوَاهُ»[١].

**واتە: عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ڕۆژێک لە پێناوی خوادا چاکترە لە هەزار ڕۆژ لە ڕۆژەکانی تر.**

## فەزڵی جیهاد لە نێو دەریادا

**٣١٧١-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا ذَهَبَ إِلَى قُبَاءَ، يَدْخُلُ عَلَى أُمِّ حَرَامٍ بِنْتِ مِلْحَانَ فَتُطْعِمُهُ، وَكَانَتْ أُمُّ حَرَامٍ بِنْتُ مِلْحَانَ تَحْتَ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ، فَدَخَلَ عَلَيْهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْماً، فَأَطْعَمَتْهُ وَجَلَسَتْ تَفْلِي رَأْسَهُ، فَنَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ اسْتَيْقَظَ وَهُوَ يَضْحَكُ، قَالَتْ: فَقُلْتُ: مَا يُضْحِكُكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي عُرِضُوا عَلَيَّ، غُزَاةً فِي سَبِيلِ اللَّهِ يَرْكَبُونَ ثَبَجَ هَذَا الْبَحْرِ، مُلُوكٌ عَلَى الْأَسِرَّةِ، أَوْ مِثْلُ الْمُلُوكِ عَلَى الْأَسِرَّةِ، شَكَّ إِسْحَقُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، فَدَعَا لَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ نَامَ وَقَالَ الْحَارِثُ: فَنَامَ، ثُمَّ اسْتَيْقَظَ فَضَحِكَ، فَقُلْتُ لَهُ: مَا يُضْحِكُكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي عُرِضُوا عَلَيَّ غُزَاةً فِي سَبِيلِ اللَّهِ مُلُوكٌ عَلَى الْأَسِرَّةِ، أَوْ مِثْلُ الْمُلُوكِ عَلَى الْأَسِرَّةِ، كَمَا قَالَ فِي الْأَوَّلِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، قَالَ: أَنْتِ مِنَ الْأَوَّلِينَ، فَرَكِبَتِ الْبَحْرَ فِي زَمَانِ مُعَاوِيَةَ، فَصُرِعَتْ عَنْ دَابَّتِهَا حِينَ خَرَجَتْ مِنَ الْبَحْرِ، فَهَلَكَتْ»[٢].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ بچوایە بۆ قوباء، دەچووە لای دایکی حەرامی کچی میلحان خواردنی بۆی ئامادە دەکرد، جا دایکی حەرامی کچی میلحان خێزانی عوبادەی کوڕی صامیت بوو، پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێک ڕۆیشت بۆ لای، ئەویش خواردنی پێدا و دانیشت ناو سەری دەڕوانی، پێغەمبەر خەوت، پاشان بە خەبەر هاتەوەو پێدەکەنی، وتی: وتم: بۆچی پێدەکەنی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: خەڵکانێک لە ئوممەتەکەم پیشانم دران لە پێناوی**

---

(١) حسن لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧٨٨ و ٢٨٧٧ و ٦٢٨٢ و ٧٠٠١، ومسلم: ١٩١٢، وأبو داود: ٢٤٩١، والترمذي: ١٦٤٥.




خوا دەجەنگان سواری پشتی دەریا ببوون وەک چۆن پادشاکان لەسەر کورسی پادشایەتی دادەنیشن، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، داوا بکە لە خوا من یەکێک بم لەوانە، پێغەمبەری خوا ﷺ نزای بۆ کرد و، پاشان خەوت، حارث دەڵێ: خەوت پاشان لە خەو هەڵساو پێکەنی، پێم وت: چی وای لێکردی پێبکەنی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: خەڵکانێک لە ئوممەتەکەم پیشانم دران دەجەنگان لە پێناوی خوادا سواری پشتی دەریا ببوون وەک چۆن پادشاکان لەسەر کورسی پادشایەتی دادەنیشن، وەکو چۆن لە یەکەمدا وتی، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، داوا بکە لە خوا من یەکێک بم لەوانە، فەرمووی: تۆ لە یەکەمینیانی، لە سەردەمی موعاویەدا سواری کەشتی بووم لە نێو ئەو دەریا، (بۆی نزیکخرایەوە تاوەکو سواری بێت) کاتێ لە دەریاکە دەرچووم لەسەر وڵاخەکە کەوتمە خوارەوەو بە هیلاکدا چووم. (فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ هاتە دی).

**٣١٧٢-** «عَنْ أُمِّ حَرَامٍ بِنْتِ مِلْحَانَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: أَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَقَالَ عِنْدَنَا، فَاسْتَيْقَظَ وَهُوَ يَضْحَكُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، بَأبِي وَأُمِّي مَا أَضْحَكَكَ؟ قَالَ: رَأَيْتُ قَوْماً مِنْ أُمَّتِي يَرْكَبُونَ هَذَا الْبَحْرَ كَالْمُلُوكِ عَلَى الْأَسِرَّةِ، قُلْتُ: ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، قَالَ: فَإِنَّكِ مِنْهُمْ، ثُمَّ نَامَ، ثُمَّ اسْتَيْقَظَ وَهُوَ يَضْحَكُ، فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ يَعْنِي مِثْلَ مَقَالَتِهِ، قُلْتُ: ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، قَالَ: أَنْتِ مِنَ الْأَوَّلِينَ، فَتَزَوَّجَهَا عُبَادَةُ بْنُ الصَّامِتِ، فَرَكِبَ الْبَحْرَ وَرَكِبَتْ مَعَهُ، فَلَمَّا خَرَجَتْ قُدِّمَتْ لَهَا بَغْلَةٌ، فَرَكِبَتْهَا، فَصَرَعَتْهَا فَانْدَقَّتْ عُنُقُهَا»[1].

واتە: ئوممو حەرامی کچی میلحان (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لامان ئەندازەیەک خەوت، لە خەو هەڵسا پێدەکەنی، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دایک و باوکم بە قوربانت بێ بۆچی پێدەکەنی؟ فەرمووی: خەڵکێکم بینی لە ئوممەتەکەم بە کەشتی بە نێو ئەم دەریادا دەڕۆشتن وەکو چۆن پادشاکان لەسەر کورسی پادشایەتی دادەنیشن، وتم: داوا بکە لە خوا من یەکێک بم لەوانە، فەرمووی: تۆ لە یەکەمینەکانی، جا عوبادەی کوڕی صامت خواستی و بوو بە هاوسەری، عوبادە سەرکەوتە سەر دەریاکە و منیش لەگەڵی سەرکەوتم، کاتێ هاتنە وشکایی ئێسترێکیان بۆ هێنا، ئەویش سواری بوو، کەوتە خوارەوە و گەردنی شکا. (فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ هاتە دی).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧٩٩ و ٢٨٩٤، ومسلم: ١٦١ و ١٩١٢/١٦٢، وأبو داود: ٢٤٩٠ و ٢٤٩٢ و ٢٤٩٣، وإبن ماجه: ٢٧٧٦.




## جەنگی هیند

**٣١٧٣-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: وَعَدَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ غَزْوَةَ الْهِنْدِ، فَإِنْ أَدْرَكْتُهَا أُنْفِقْ فِيهَا نَفْسِي وَمَالِي، فَإِنْ أُقْتَلْ كُنْتُ مِنْ أَفْضَلِ الشُّهَدَاءِ، وَإِنْ أَرْجِعْ فَأَنَا أَبُو هُرَيْرَةَ الْمُحَرَّرُ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پەیمانی پێداین جەنگی هیند بکەین، ئەگەر بگەم پێی گیان و ماڵم لەو پێناوەدا بەخت دەکەم، ئەگەر بکوژرێم دەبمە چاکترینی شەهیدەکان، وە ئەگەر بگەڕێمەوە، ئەوە من ئەبو هورەیرەی ئازادکەرم.**

**٣١٧٤-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: وَعَدَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ غَزْوَةَ الْهِنْدِ، فَإِنْ أَدْرَكْتُهَا أُنْفِقْ فِيهَا نَفْسِي وَمَالِي، وَإِنْ قُتِلْتُ كُنْتُ أَفْضَلَ الشُّهَدَاءِ، وَإِنْ رَجَعْتُ فَأَنَا أَبُو هُرَيْرَةَ الْمُحَرَّرُ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پەیمانی پێداین جەنگی هیند بکەین، ئەگەر بگەم پێی گیان و ماڵم لەو پێناوەدا بەخت دەکەم، ئەگەر بکوژرێم دەبمە چاکترینی شەهیدەکان، وە ئەگەر بگەڕێمەوە، ئەوە من ئەبو هورەیرە ئازادکەرم.**

**٣١٧٥-** «عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: عِصَابَتَانِ مِنْ أُمَّتِي أَحْرَزَهُمَا اللَّهُ مِنَ النَّارِ: عِصَابَةٌ تَغْزُو الْهِنْدَ، وَعِصَابَةٌ تَكُونُ مَعَ عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ عَلَيْهِمَا السَّلَام»[٣].

**واتە: ثەوبان ﷺ مەولای پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دوو دەستەی جەنگاوەر هەن لە ئوممەتەکەم خوا لە ئاگر دەیانپارێزێ: دەستەیەکیان جەنگی هیند دەکەن، وە دەستەیەکیان لەگەڵ عیسای کوڕی مەریەم دەبن.**

## جەنگی تورک و حەبەشەکان

**٣١٧٦-** «عَنْ أَبِي سُكَيْنَةَ، رَجُلٍ مِنَ الْمُحَرَّرِينَ، عَنْ رَجُلٍ، مَنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَمَّا أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ بِحَفْرِ الْخَنْدَقِ، عَرَضَتْ لَهُمْ صَخْرَةٌ حَالَتْ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ الْحَفْرِ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَأَخَذَ الْمِعْوَلَ، وَوَضَعَ رِدَاءَهُ نَاحِيَةَ الْخَنْدَقِ، وَقَالَ: ﴿وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا لَا

---

(١) ضعيف الإسناد.

(٢) ضعيف الإسناد.

(٣) صحيح.



مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١١٥﴾ ﴾الأنعام، فَنَدَرَ ثُلُثُ الْحَجَرِ، وَسَلْمَانُ الْفَارِسِيُّ قَائِمٌ يَنْظُرُ، فَبَرَقَ مَعَ ضَرْبَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بَرْقَةٌ، ثُمَّ ضَرَبَ الثَّانِيَةَ، وَقَالَ: ﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًاۚ لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١١٥﴾ ﴾الأنعام، فَنَدَرَ الثُّلُثُ الْآخَرُ، فَبَرَقَتْ بَرْقَةٌ فَرَآهَا سَلْمَانُ، ثُمَّ ضَرَبَ الثَّالِثَةَ، وَقَالَ: ﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًاۚ لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١١٥﴾ ﴾الأنعام، فَنَدَرَ الثُّلُثُ الْبَاقِي، وَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَأَخَذَ رِدَاءَهُ وَجَلَسَ، قَالَ سَلْمَانُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، رَأَيْتُكَ حِينَ ضَرَبْتَ، مَا تَضْرِبُ ضَرْبَةً إِلَّا كَانَتْ مَعَهَا بَرْقَةٌ، قَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَا سَلْمَانُ، رَأَيْتَ ذَلِكَ، فَقَالَ: إِي وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: فَإِنِّي حِينَ ضَرَبْتُ الضَّرْبَةَ الْأُولَى رُفِعَتْ لِي مَدَائِنُ كِسْرَى وَمَا حَوْلَهَا وَمَدَائِنُ كَثِيرَةٌ، حَتَّى رَأَيْتُهَا بِعَيْنَيَّ ، قَالَ لَهُ مَنْ حَضَرَهُ مِنْ أَصْحَابِهِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَفْتَحَهَا عَلَيْنَا وَيُغَنِّمَنَا دِيَارَهُمْ، وَيُخَرِّبَ بِأَيْدِينَا بِلَادَهُمْ، فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِذَلِكَ ، ثُمَّ ضَرَبْتُ الضَّرْبَةَ الثَّانِيَةَ، فَرُفِعَتْ لِي مَدَائِنُ قَيْصَرَ وَمَا حَوْلَهَا، حَتَّى رَأَيْتُهَا بِعَيْنَيَّ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَفْتَحَهَا عَلَيْنَا وَيُغَنِّمَنَا دِيَارَهُمْ، وَيُخَرِّبَ بِأَيْدِينَا بِلَادَهُمْ، فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِذَلِكَ، ثُمَّ ضَرَبْتُ الثَّالِثَةَ، فَرُفِعَتْ لِي مَدَائِنُ الْحَبَشَةِ وَمَا حَوْلَهَا مِنَ الْقُرَى، حَتَّى رَأَيْتُهَا بِعَيْنَيَّ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: عِنْدَ ذَلِكَ دَعُوا الْحَبَشَةَ مَا وَدَعُوكُمْ، وَاتْرُكُوا التُّرْكَ مَا تَرَكُوكُمْ»[1].

**واتە: ئەبو سوکەینە دەگێڕێتەوە: پیاوێک لە ڕزگارکەران لە پیاوێک لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە ﷺ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە هەڵکەندنی خەندەق، بەردێکی گەورە هاتە پێشیان بوو بە ڕێگر لە نێوان ئەوان و هەڵکەندنی چاڵەکەدا، پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵساو قوڵنگەکەی گرتە دەستەوەو عەباکەی لە نزیک چاڵەکە دانا، وە فەرمووی: ﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًاۚ لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١١٥﴾ ﴾ واتە: وە فەرمان و وتەی پەروەردگارت تەواو بووەو بە ئەنجام گەیشت بەڕاستی و دروستی کە هیچ کەس ناتوانێ بڕیارو وتەکانی بگۆڕێ هەر خوا بیسەری زانایە، یەک لە سەر سێی بەردەکەی شکاند، سەلمانی فارسیش وەستابوو تەماشای دەکرد، لەگەڵ هەر لێدانێکی پێغەمبەری خوادا چەخماخەیەکی فڕێ دەدا، پاشان بۆ جاری دووەم لێیداو فەرمووی: ﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًاۚ لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١١٥﴾ ﴾ یەک لە سەر سێ یەکەی تری هێنایە خوارەوە، لە کاتی لێدانیدا چەخماخەیەکی فڕێدا سەلمانیش تەماشای دەکرد، پاشان بۆ جاری سێیەم**

---

(١) حسن. أبو داود: ٤٣٠٢.





لێیدا فەرمووی: ﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ۚ لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِهِ ۚ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴾ ئەو یەک لەسەر سێیەی کە مابوو هاتەخوارەوە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو عاباکەی هەڵگرت و دانیشت، سەلمان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ قوڵنگەکەت دەوەشاند تەماشاتم دەکرد، هەر جارێک لێت دەدا چەخماخەیەکی فڕێ دەدا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی سەلمان ئەوەت بینی، وتی: بەڵێ سوێند بەو زاتەی تۆی بە حەق ناردوە، فەرمووی: جاری یەکەم کە لێمدا دەسەڵاتی کیسرا و دەوروبەریم بۆ بەرز کرایەوە، وە چەند شارێکی زۆریش، تا بە چاوی خۆم هەمووم بینی، ئەوەی لە دەوری بوو لە هاوەڵەکانی وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ داوا بکە خوا لە سەر دەستی ئێمە ڕزگاری بکات و وڵاتەکەیان بکاتە دەستکەوت بۆمان و بە دەستی ئێمە تێک بدرێ، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو داوایەی کرد، پاشان جاری دووەم لێمدا دەسەڵاتی قەیسەرو ئەوەی لە دەوروبەریدایە بۆم بەرزکرایەوە تا بە چاوی خۆم بینیم، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ داوا بکە خوا لەسەر دەستی ئێمە ڕزگار بکات و وڵاتەکەیان بکاتە دەستکەوت بۆمان و بە دەستی ئێمە تێک بدرێ، پێغەمبەر ﷺ ئەو دوعایەی کرد، پاشان بۆ جاری سێیەم لێمدا شاری حەبەشەو دەوروبەریم بۆ بەرزکرایەوە تا بە چاوی خۆم بینیم، پێغەمبەر ﷺ لەو کاتەدا فەرمووی: واز لە حەبەشە بهێنن ئەگەر ئەوان وازیان لێ هێنان، وە واز لە تورک بهێنن ئەگەر وازیان لێ هێنان.

**٣١٧٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يُقَاتِلَ الْمُسْلِمُونَ التُّرْكَ قَوْماً وُجُوهُهُمْ كَالْمَجَانِّ الْمُطْرَقَةِ، يَلْبَسُونَ الشَّعَرَ، وَيَمْشُونَ فِي الشَّعَرِ»(١).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژی دوایی نایەت تا مسوڵمانان جەنگی تورک نەکەن، کە ڕوخساریان وەکو دەمی چەکوش پان بۆتەوە، جل و بەرگی موو دەپۆشن، هەروەها پێڵاویش لە موو دروست دەکەن پێیەوە ڕێ دەکەن.

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٩٢٨ و ٢٩٢٩، ومسلم: ٢٩١٢، وأبو داود: ٤٣٠٣، والترمذي: ٢٢١٥، وإبن ماجه: ٤٠٩٦.




## داواکردنی سەرکەوتن بە لاوازەوە

**٣١٧٨-** «عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ ظَنَّ أَنَّ لَهُ فَضْلاً عَلَى مَنْ دُونَهُ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ: إِنَّمَا يَنْصُرُ اللَّهُ هَذِهِ الْأُمَّةَ بِضَعِيفِهَا، بِدَعْوَتِهِمْ وَصَلَاتِهِمْ وَإِخْلَاصِهِمْ»[(١)].

**واتە: موصعەبی کوڕی سەعد دەگێڕێتەوە، باوکی ﷺ پێی وابوو کە ئەو فەزلی هەیە بەسەر خواری خۆیەوە لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی خوا ئەم ئوممەتە سەردەخات بە هۆی لاوازەکانیەوە، بە نزاو نوێژو دڵسۆزییان.**

**٣١٧٩-** «عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: ابْغُونِي الضَّعِيفَ، فَإِنَّكُمْ إِنَّمَا تُرْزَقُونَ وَتُنْصَرُونَ بِضُعَفَائِكُمْ»[(٢)].

**واتە: ئەبو دەرداء ﷺ دەڵێ: بیستم پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: یارمەتی لاوازەکان بدەن، چونکە بەڕاستی ئێوە بە هۆی لاوازەکانتانەوە سەردەکەون و ڕزق و ڕۆزی دەدرێن.**

## فەزڵ و چاکەی ئەو کەسەی جەنگاوەرێک ئامادە بکات بۆ جەنگ

**٣١٨٠-** «عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ جَهَّزَ غَازِياً فِي سَبِيلِ اللَّهِ، فَقَدْ غَزَا، وَمَنْ خَلَفَهُ فِي أَهْلِهِ بِخَيْرٍ، فَقَدْ غَزَا»[(٣)].

**واتە: زەیدی کوڕی خالد ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس جەنگاوەرێک ئامادە بکات لە پێناوی خوادا ئەوە جیهادی کردوە، هەر کەسیش چاودێری خانەوادەکەی بکات بە چاکی ئەوە جیهادی کردوە.**

**٣١٨١-** «عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ جَهَّزَ غَازِياً، فَقَدْ غَزَا، وَمَنْ خَلَفَ غَازِياً فِي أَهْلِهِ بِخَيْرٍ، فَقَدْ غَزَا»[(٤)].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٥٩٤، والترمذي: ١٧٠٢.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٨٤٣، ومسلم: ١٣٥ و ١٨٩٥/١٣٦، وأبو داود: ٢٥٠٩، والترمذي: ١٦٢٨، وإبن ماجه: ١٦٣١.

(٤) صحيح.




واتە: زەیدی کوڕی خالدی جوهەنی ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس جەنگاوەرێک ئامادە بکات ئەوە جیهادی کردوە، هەر کەسیش چاودێری خانەوادەی جەنگاوەرێک بکات بە چاکی ئەوە جیهادی کردوە.

**٣١٨٢-** «عَنْ الْأَحْنَفِ بْنِ قَيْسٍ قَالَ: خَرَجْنَا حُجَّاجاً فَقَدِمْنَا الْمَدِينَةَ وَنَحْنُ نُرِيدُ الْحَجَّ، فَبَيْنَا نَحْنُ فِي مَنَازِلِنَا نَضَعُ رِحَالَنَا، إِذْ أَتَانَا آتٍ فَقَالَ: إِنَّ النَّاسَ قَدِ اجْتَمَعُوا فِي الْمَسْجِدِ وَفَزِعُوا، فَانْطَلَقْنَا، فَإِذَا النَّاسُ مُجْتَمِعُونَ عَلَى نَفَرٍ فِي وَسَطِ الْمَسْجِدِ، وَفِيهِمْ عَلِيٌّ، وَالزُّبَيْرُ، وَطَلْحَةُ، وَسَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ، فَإِنَّا لَكَذَلِكَ إِذْ جَاءَ عُثْمَانُ، رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَلَيْهِ مُلَاءَةٌ صَفْرَاءُ قَدْ قَنَّعَ بِهَا رَأْسَهُ، فَقَالَ: أَهَاهُنَا طَلْحَةُ، أَهَاهُنَا الزُّبَيْرُ، أَهَاهُنَا سَعْدٌ، قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: فَإِنِّي أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ، أَتَعْلَمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ يَبْتَاعُ مِرْبَدَ بَنِي فُلَانٍ، غَفَرَ اللَّهُ لَهُ، فَابْتَعْتُهُ بِعِشْرِينَ أَلْفاً، أَوْ بِخَمْسَةٍ وَعِشْرِينَ أَلْفاً، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ: اجْعَلْهُ فِي مَسْجِدِنَا وَأَجْرُهُ لَكَ، قَالُوا: اللَّهُمَّ نَعَمْ، قَالَ: أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ، أَتَعْلَمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ ابْتَاعَ بِئْرَ رُومَةَ، غَفَرَ اللَّهُ لَهُ، فَابْتَعْتُهَا بِكَذَا وَكَذَا، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقُلْتُ: قَدْ ابْتَعْتُهَا بِكَذَا وَكَذَا، قَالَ: اجْعَلْهَا سِقَايَةً لِلْمُسْلِمِينَ وَأَجْرُهَا لَكَ، قَالُوا: اللَّهُمَّ نَعَمْ، قَالَ: أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ، أَتَعْلَمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَظَرَ فِي وُجُوهِ الْقَوْمِ، فَقَالَ: مَنْ يُجَهِّزُ هَؤُلَاءِ غَفَرَ اللَّهُ لَهُ «يَعْنِي جَيْشَ الْعُسْرَةِ، فَجَهَّزْتُهُمْ حَتَّى لَمْ يَفْقِدُوا عِقَالاً وَلَا خِطَاماً، فَقَالُوا: اللَّهُمَّ نَعَمْ، قَالَ: اللَّهُمَّ اشْهَدْ، اللَّهُمَّ اشْهَدْ، اللَّهُمَّ اشْهَدْ»[1].

واتە: ئەحنەفی کوڕی قەیس دەڵێ: هاتم بۆ مەدینە بە مەبەستی حەج، لە کاتێکدا ئێمە لە ماڵی خۆماندا بووین بارەکانمان دادەنا، کەسێک هات وتی: خەڵکی لە مزگەوتدا کۆبوونەتەوە، کاتێک تەماشام کرد بینیم خەڵکی کۆبوونەتەوە و پەشۆکاون، لە ناویاندا کەسانێک دانیشتبوون، بینیم عەلی و زوبێر و طەڵحەو سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصیان تێدا بوو (خوایان لێ ڕازی بێ)، ئێمە بەو شێوەیە بووین لە ناکاودا عوسمانی کوڕی عەفان هات و عەبایەکی زەردی لەسەر شان بوو سەری پێ داپۆشیبوو، عوسمان وتی: ئایا طەڵحە لێرەیە؟ ئایا زوبەیر لێرەیە؟ ئایا سەعد لێرەیە؟ وتیان: بەڵێ، وتی: پرسیارتان لێ دەکەم و سوێندتان دەدەم بەو خوایەی کە هیچ پەرستراوێک نیە بە حەق جگە لە ئەو، ئایا زانیوتانە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کێ (مِرْبَدَ) لەوەڕگای وشترو مەڕوماڵاتی نەوەکانی فڵانە کەس بکڕێ ئەوە خوا

(١) صحيح. أخرجه البخاري معلقاً: ٢٧٧٨، والترمذي: ٣٦٩٩ و ٣٧٠٣.




لێی خۆش بووە؟ منیش کڕیم بە بیست هەزار، یان بە بیست و پێنج هەزار، جا هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵم پێدا، فەرمووی: بیخە مزگەوتەکەمان و پاداشتەکەیشی بۆ تۆیە، وتیان: بەڵێ وایە، وتی: پرسیارتان لێ دەکەم و سوێندتان دەدەم بەو خوایەی کە هیچ پەرستراوێک نیە بە حەق جگە لە ئەو، ئایا زانیوتانە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کێ بیری (رُومَةَ) بکڕێ ئەوە خوا لێی خۆش بووە؟، بە ئەوەندەو بە ئەوەندە کڕیم، پاشان هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺو وتم: بە ئەوەندەو ئەوەندە کڕیم، فەرمووی: بیکە شوێنی ئاودانی مسوڵمانان و پاداشتەکەیشی بۆ تۆیە، وتیان: بەڵێ وایە، وتی: پرسیارتان لێ دەکەم و سوێندتان دەدەم بەو خوایەی کە هیچ پەرستراوێک نیە بە حەق جگە لە ئەو، ئایا زانیوتانە پێغەمبەری خوا ﷺ تەماشای ڕوخساری خەڵکەکەی کرد، فەرمووی: هەر کەس سوپای (الْعُسْرَةِ) ئامادە بکات ئەوە خوا لێی خۆش بووە؟ منیش بە تەواوی ئامادەم کردن تەنانەت گوریسێک و ڕەشمەی وڵاخێکیشیان پێویست نەبوو، وتیان: بەڵێ وایە، وتی: خوایە تۆ شایەت بە، خوایە تۆ شایەت بە، خوایە تۆ شایەت بە.

## فەزڵ و گەورەیی نەفەقە لە پێناوی خوا ﷻ

**٣١٨٣-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ أَنْفَقَ زَوْجَيْنِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﷻ، نُودِيَ فِي الْجَنَّةِ: يَا عَبْدَ اللَّهِ هَذَا خَيْرٌ، فَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصَّلَاةِ، دُعِيَ مِنْ بَابِ الصَّلَاةِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الْجِهَادِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الْجِهَادِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصَّدَقَةِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الصَّدَقَةِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصِّيَامِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الرَّيَّانِ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ ﵁: هَلْ عَلَى مَنْ دُعِيَ مِنْ هَذِهِ الْأَبْوَابِ مِنْ ضَرُورَةٍ، فَهَلْ يُدْعَى أَحَدٌ مِنْ هَذِهِ الْأَبْوَابِ كُلِّهَا؟ قَالَ: نَعَمْ، وَأَرْجُو أَنْ تَكُونَ مِنْهُمْ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس دوو شت لە یەک جۆر ببەخشێ لە پێناوی خوا (بۆ نموونە: دوو وشتر، یان دوو مەڕ، یان ... هتد)، لە بەهەشتدا بانگ دەکرێت ئەی بەندەی خوا ئەمە خێرە، جا هەر کەس لە ئەهلی نوێژ بێت لە دەرگای نوێژەوە بانگ دەکرێ، هەر کەس لە ئەهلی جیهاد بێت لە دەرگای جیهادەوە بانگ دەکرێ، هەر کەس لە ئەهلی خێرو صەدەقە بێت لە دەرگای

---

(١) صحیح.

خێرو صەدەقە بانگ دەکرێ، هەر کەس لە ئەهلی ڕۆژوو بێت لە دەرگای ڕەییانەوە بانگ دەکرێ، ئەبو بەکری صدیق (خوا لێی ڕازی بێ)، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئایا پێویست دەکات کەسێک لە هەموو ئەم دەرگایانەو بانگ بکرێ (چونکە لە هەر دەرگایەکیانەوە چووە ژوورەوە ڕزگاری دەبێ)، ئایا کەسێک هەیە لە هەموو دەرگاکانەوە بانگ بکرێ؟ فەرمووی: بەڵێ، ئومێد دەکەم تۆ لەوانە بیت.

**٣١٨٤-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ أَنْفَقَ زَوْجَيْنِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ دَعَتْهُ خَزَنَةُ الْجَنَّةِ مِنْ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ: يَا فُلَانُ، هَلُمَّ فَادْخُلْ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، ذَاكَ الَّذِي لَا تَوَى عَلَيْهِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنِّي لَأَرْجُو أَنْ تَكُونَ مِنْهُمْ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس دوو شت لە یەک جۆر ببەخشێ لە پێناوی خوا (بۆ نموونە: دوو وشتر، یان دوو مەڕ، یان ... هتد)، دەرگاوانەکانی بەهەشت بانگی دەکەن لە دەرگاکانی بەهەشتەوە: ئەی فڵانەکەس بێتە ژوورەوە، ئەبو بەکر (خوا لێی ڕازی بێ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە سەرفراز بو و ئیتر زیانی پێناگات؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: من ئومێد دەکەم تۆ یەکێ بیت لەوانە.

**٣١٨٥-** «عَنْ صَعْصَعَةَ بْنِ مُعَاوِيَةَ قَالَ: لَقِيتُ أَبَا ذَرٍّ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: حَدِّثْنِي، قَالَ: نَعَمْ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَا مِنْ عَبْدٍ مُسْلِمٍ يُنْفِقُ مِنْ كُلِّ مَالٍ لَهُ زَوْجَيْنِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، إِلَّا اسْتَقْبَلَتْهُ حَجَبَةُ الْجَنَّةِ كُلُّهُمْ يَدْعُوهُ إِلَى مَا عِنْدَهُ، قُلْتُ: وَكَيْفَ ذَلِكَ؟ قَالَ: إِنْ كَانَتْ إِبِلاً، فَبَعِيرَيْنِ، وَإِنْ كَانَتْ بَقَراً، فَبَقَرَتَيْنِ»[٢].

واتە: صەعصەعەی کوڕی موعاویە دەڵێ: گەیشتم بە ئەبو زەڕ ﷺ وتی: وتم: باس بکە بۆم وتی: بەڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر مسوڵمانێک لە هەموو ماڵەکەی دوو شت لە یەک جۆر ببەخشێ لە پێناوی خوا (بۆ نموونە: دوو وشتر، یان دوو مەڕ، یان ... هتد)، بێگومان دەرگاوانەکانی بەهەشت هەریەکەیان بانگی دەکات بۆ لای خۆی، وتم: ئەو بەخشینە چۆنە؟ فەرمووی: ئەگەر وشتر بوو دوو وشتر، ئەگەر مانگا بوو دوو مانگا.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




**٣١٨٦-** «عَنْ خُرَيْمِ بْنِ فَاتِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ أَنْفَقَ نَفَقَةً فِي سَبِيلِ اللَّهِ كُتِبَتْ لَهُ بِسَبْعِ مِائَةِ ضِعْفٍ»[١].

**واتە: خورەیمی کوڕی فاتیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس شتێک ببەخشێ لە پێناوی خوا، حەود سەد ئەوەندەی بۆ دەنوسرێ.**

## فەزڵ و گەورەیی بەخشین لە پێناو خوا ﷻ

**٣١٨٧-** «عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً تَصَدَّقَ بِنَاقَةٍ مَخْطُومَةٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَيَأْتِيَنَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِسَبْعِ مِائَةِ نَاقَةٍ مَخْطُومَةٍ»[٢].

**واتە: ئەبو مەسعود ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێک وشترێکی جڵەوکراوی بەخشی لە پێناوی خوادا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لە ڕۆژی دواییدا بە حەود سەد وشتری جڵەوکراوەوە دێت.**

**٣١٨٨-** «عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: الْغزْوُ غَزْوَانِ، فَأَمَّا مَنْ ابْتَغَى وَجْهَ اللَّهِ، وَأَطَاعَ الْإِمَامَ، وَأَنْفَقَ الْكَرِيمَةَ، وَيَاسَرَ الشَّرِيكَ، وَاجْتَنَبَ الْفَسَادَ، كَانَ نَوْمُهُ وَنُبْهُهُ أَجْراً كُلُّهُ، وَأَمَّا مَنْ غَزَا رِيَاءً، وَسُمْعَةً، وَعَصَى الْإِمَامَ، وَأَفْسَدَ فِي الْأَرْضِ، فَإِنَّهُ لَا يَرْجِعُ بِالْكَفَافِ»[٣].

**واتە: موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جەنگ دوو جەنگە، جا هەرکەس مەبەستی ئەوە بێت لە پێناو خوادا جەنگ بکات، وە گوێڕایەڵی ئیمام بکات و ماڵی چاکی ببەخشێ، لەگەڵ شەریک و هاوبەشەکەیدا بە جوانی مامەڵە بکات و دوور بکەوێتەوە لە خراپەکاری، ئەوە خەوتن و نەخەوتنی هەمووی پاداشتە، بەڵام هەرکەس جەنگ بکات لەبەر ڕووپامایی و ناوبانگ، سەرپێچی ئیمامیش بکات، وە فەساد لەسەر زەوی بڵاو بکاتەوە، ئەوە بەوە ناگەڕێتەوە کە بەس بێت بۆی.**

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٦٢٥.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٨٩٢.

(٣) حسن. أخرجه أبو داود: ٢٥١٥.

## قەدەغە بوونی خێزان و هاوسەری موجاهیدەکان

**٣١٨٩-** «عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: حُرْمَةُ نِسَاءِ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ كَحُرْمَةِ أُمَّهَاتِهِمْ، وَمَا مِنْ رَجُلٍ يَخْلُفُ فِي امْرَأَةِ رَجُلٍ مِنَ الْمُجَاهِدِينَ فَيَخُونُهُ فِيهَا، إِلَّا وُقِفَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَأَخَذَ مِنْ عَمَلِهِ مَا شَاءَ، فَمَا ظَنُّكُمْ»[1].

واتە: سولەیمانی کوڕی بورەیدە دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: قەدەغە بوونی هاوسەری موجاهیدان لەسەر نیشتەجێ بووان وەکو قەدەغە بوونی دایکانیان وایە، جا هەر کەس چاودێری هاوسەری موجاهیدەکان بکەوێتە ئەستۆی و خیانەتی لێ بکات، ئیللا لە ڕۆژی قیامەتدا دەوەستێنرێ، لە کردەوەکانی دەبات هەرچەندەی بوێ، گومانتان چۆنە. (ئایا هیچ چاکەیەکی بۆ دەهێڵێتەوە)؟

## هەر کەس خیانەت لە خێزانی موجاهیدێک بکات

**٣١٩٠-** «عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: حُرْمَةُ نِسَاءِ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ كَحُرْمَةِ أُمَّهَاتِهِمْ، وَإِذَا خَلَفَهُ فِي أَهْلِهِ فَخَانَهُ، قِيلَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: هَذَا خَانَكَ فِي أَهْلِكَ فَخُذْ مِنْ حَسَنَاتِهِ مَا شِئْتَ، فَمَا ظَنُّكُمْ»[2].

واتە: سولەیمانی کوڕی بورەیدە دەگێڕێتەوە: لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: قەدەغەبوونی هاوسەری موجاهیدان لەسەر نیشتەجێ بووان وەکو قەدەغە بوونی دایکانیان وایە، جا ئەگەر کردی بە چاودێری بەسەر خانەوادەکەیەوە، بەڵام ئەو خیانەتی لێکرد، لە ڕۆژی قیامەتدا پێی دەوترێ: ئەمە خیانەتی لە خانەوادەت کردوە، لە چاکەکانی ببە هەرچەندەت دەوێ، گومانتان چۆنە. (ئایا هیچ چاکەیەکی بۆ دەهێڵێتەوە)؟

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٣٩ و ١٨٩٧/١٤٠، وأبو داود: ٢٤٩٦.

(٢) صحيح.




**٣١٩١-** «عَنْ ابْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: حُرْمَةُ نِسَاءِ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ فِي الْحُرْمَةِ كَأُمَّهَاتِهِمْ، وَمَا مِنْ رَجُلٍ مِنَ الْقَاعِدِينَ يَخْلُفُ رَجُلاً مِنَ الْمُجَاهِدِينَ فِي أَهْلِهِ إِلَّا نُصِبَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيُقَالُ: يَا فُلَانُ، هَذَا فُلَانٌ فَخُذْ مِنْ حَسَنَاتِهِ مَا شِئْتَ، ثُمَّ الْتَفَتَ النَّبِيُّ ﷺ إِلَى أَصْحَابِهِ فَقَالَ: مَا ظَنُّكُمْ تُرَوْنَ يَدَعُ لَهُ مِنْ حَسَنَاتِهِ شَيْئاً»[1].

**واتە: ئیبنو بورەیدە دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: قەدەغە بوونی هاوسەری موجاهیدان لەسەر نیشتەجێ بووان وەکو قەدەغە بوونی دایکانیان وایە، جا هەر نیشتەجێیەک چاودێری هاوسەرێکی موجاهیدەکان بکەوێتە ئەستۆی و خیانەتی لێ بکات، ئیللا لە ڕۆژی قیامەتدا دەوستێنرێ، دەوترێ: ئەی فڵانە کەس، ئەمە فڵانە کەسە، بە ویستی خۆت لە کردەوە چاکەکانی ببە، پاشان پێغەمبەر ﷺ لای کردەوە بۆ لای هاوەڵەکانی و فەرمووی: گومانتان چۆنە دەبینن هیچ چاکەیەکی بۆ بهێڵێتەوە؟**

**٣١٩٢-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: جَاهِدُوا بِأَيْدِيكُمْ وَأَلْسِنَتِكُمْ وَأَمْوَالِكُمْ»[2].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جیهاد بکەن بە دەستەکانتان و زمانتان و ماڵەکانتان.**

**٣١٩٣-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ أَمَرَ بِقَتْلِ الْحَيَّاتِ وَقَالَ: مَنْ خَافَ ثَأْرَهُنَّ فَلَيْسَ مِنَّا»[3].

**واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە کوشتنی مارەکان، وە فەرمووی: هەر کەس لەوە بترسێ تۆڵەی لێ بکەنەوە لە ئێمە نیە. (لە سەردەمی نەفامی خەڵکی پێیان وابوو: هەر کەس مارێک بکوژێت هاوسەرەکەی دێت تۆڵەی لێدەکاتەوە، پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کرد لەو کردەوەیە).**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٨٩٧.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٥٠٤.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٥٢٤٩ و ٥٢٦١.




**٣١٩٤-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَبْرٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَادَ جَبْراً، فَلَمَّا دَخَلَ سَمِعَ النِّسَاءَ يَبْكِينَ وَيَقُلْنَ: كُنَّا نَحْسَبُ وَفَاتَكَ قَتْلاً فِي سَبِيلِ اللَّهِ، فَقَالَ: وَمَا تَعُدُّونَ الشَّهَادَةَ إِلَّا مَنْ قُتِلَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، إِنَّ شُهَدَاءَكُمْ إِذاً لَقَلِيلٌ، الْقَتْلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ شَهَادَةٌ، وَالْبَطْنُ شَهَادَةٌ، وَالْحَرَقُ شَهَادَةٌ، وَالْغَرَقُ شَهَادَةٌ، وَالْمَغْمُومُ «يَعْنِي الْهَدِمَ» شَهَادَةٌ، وَالْمَجْنُونُ شَهَادَةٌ، وَالْمَرْأَةُ تَمُوتُ بِجُمْعٍ شَهِيدَةٌ، قَالَ رَجُلٌ: أَتَبْكِينَ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَاعِدٌ؟ قَالَ: دَعْهُنَّ، فَإِذَا وَجَبَ فَلَا تَبْكِيَنَّ عَلَيْهِ بَاكِيَةٌ»[١].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی جەبر دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی جەبری کرد، کاتێ هاتە ژوورەوە بیستی ئافرەتان دەگریان و دەیانوت: ئیمە وامان دەزانی مردنت کوشتن دەبێ لە پێناوی خوا، فەرمووی: ئێوە شەهیدی بە چی دەزانن مەگەر کەسێ تەنها لە پێناوی خوادا بکوژرێ، ئەگەر وابێ شەهیدەکانتان کەمن، کوشتن لە پێناوی خوا شەهید بوونە، سک ئێشە شەهید بوونە، سوتان شەهید بوونە، خنکان شەهید بوونە، ڕوخانی دارو دیوار شەهید بوونە، ئەو ئافرەتەش بە هۆی منداڵەکەیەوە دەمرێ شەهیدە، پیاوێک وتی: ئایا دەگرین پێغەمبەریش دانیشتووە؟ فەرمووی: وازیان لێ بهێنە، ئەگەر مرد با ئیتر کەس لەسەری نەگری.**

**٣١٩٥-** «عَنْ جَبْرٍ ﷺ، أَنَّهُ دَخَلَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَلَى مَيِّتٍ، فَبَكَى النِّسَاءُ فَقَالَ جَبْرٌ: أَتَبْكِينَ مَا دَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ جَالِساً، قَالَ: دَعْهُنَّ يَبْكِينَ مَا دَامَ بَيْنَهُنَّ، فَإِذَا وَجَبَ فَلَا تَبْكِيَنَّ بَاكِيَةٌ»[٢].

**واتە: جەبر ﷺ دەگێڕێتەوە، ئەو چووە ژورەوە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ لای مردویەک، ئافرەتەکان دەگریان، جەبر وتی: ئایا دەگرین لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتووە، فەرمووی: وازیان لێ بهێنە با بگرین تا لە نیوانیاندایە، جا ئەگەر مرد با کەس لەسەری نەگری.**

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣١١١، وإبن ماجه: ٢٨٠٣.

(٢) صحيح.




## باسی فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە بارەی ژن مارەکردن و خێزانەکانی و، ئەوەشی خوا ڕێگەی پێداوە بۆ پێغەمبەرەکەی و، قەدەغەی کردوە لە سەر بەدیهێنراوەکانی، وەک زیادە ڕێز لێنانێکی و ئاگادار کردنەوەیش بە گەورەییەکانی

**٣١٩٦-** «عَنْ عَطَاءٍ قَالَ: حَضَرْنَا مَعَ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا جَنَازَةَ مَيْمُونَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ بِسَرِفَ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: هَذِهِ مَيْمُونَةُ إِذَا رَفَعْتُمْ جَنَازَتَهَا، فَلَا تُزَعْزِعُوهَا، وَلَا تُزَلْزِلُوهَا، فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ مَعَهُ تِسْعُ نِسْوَةٍ، فَكَانَ يَقْسِمُ لِثَمَانٍ، وَوَاحِدَةٌ لَمْ يَكُنْ يَقْسِمُ لَهَا»[١].

**واتە:** عەطاء دەڵێ: لەگەڵ ئیبنو عەبباسدا (خوا لێیان ڕازی بێ) ئامادەی تەرمی مەیمونەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ بووین لە (سَرِف)، ئیبنو عەبباس وتی: ئەمە مەیمونەیە، کاتێ تەرمەکەیتان بەرزکردەوە مەیەشۆکێن و ئاڵۆز مەبن، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ نۆ ژنی لەگەڵدا بوو، شەوەکانی دابەش دەکرد بۆ هەشت دانەیان، دانەیەکیشیان بۆی دابەش نەکردبوو. (چونکە ڕۆژو شەوەکەی خۆی پێشکەش کردبوو بە عائیشە خوا لێی ڕازی بێ).

**٣١٩٧-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَعِنْدَهُ تِسْعُ نِسْوَةٍ يُصِيبُهُنَّ إِلَّا سَوْدَةَ، فَإِنَّهَا وَهَبَتْ يَوْمَهَا وَلَيْلَتَهَا لِعَائِشَةَ»[٢].

**واتە:** ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد نۆ ژنی لە لا بوو دەچووە لایانەوە جگە لە سەودە نەبێ، چونکە ئەو ڕۆژو شەوەکەی خۆی پێشکەش کردبوو بە عائیشە (خوا لێی ڕاز بێ).

**٣١٩٨-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قال: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَطُوفُ عَلَى نِسَائِهِ فِي اللَّيْلَةِ الْوَاحِدَةِ، وَلَهُ يَوْمَئِذٍ تِسْعُ نِسْوَةٍ»[٣].

**واتە:** ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە یەک شەودا لەگەڵ هەموو خێزانەکانی جووت دەبوو، ئەو کاتە نۆ ژنی لەلا بوو.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٠٦٧، ومسلم: ٥١ و ١٤٦٥/٥٢.

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٦٨ و ٢٨٤ و ٥٠٦٨ و ٥٢١٢، ومسلم: ٣٠٩.




**٣١٩٩-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كُنْتُ أَغَارُ عَلَى اللَّاتِي وَهَبْنَ أَنْفُسَهُنَّ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَأَقُولُ: أَوَتَهَبُ الْحُرَّةُ نَفْسَهَا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ: ﴿تُرْجِي مَن تَشَآءُ مِنْهُنَّ وَتُـْٔوِيٓ إِلَيْكَ مَن تَشَآءُ ۝٥١﴾الأحزاب، قُلْتُ: وَاللَّهِ مَا أَرَى رَبَّكَ إِلَّا يُسَارِعُ لَكَ فِي هَوَاكَ»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: من غیرەم دەكرد و ڕەخنەم دەگرت لەو ئافرەتانەی خۆیان پێشكەش پێغەمبەر ﷺ دەكرد، دەموت: كەسی ئازاد چۆن خۆی پێشكەش دەكات، خوا ﷻ ئەم ئایەتەی دابەزاندە خوارەوە: ﴿تُرْجِي مَن تَشَآءُ مِنْهُنَّ وَتُـْٔوِيٓ إِلَيْكَ مَن تَشَآءُ ۝٥١﴾، (واتە: ئەی موحەممەد ﷺ سەرەی هەر یەكێك لە خێزانەكانت ویست دوای بخەو، هەر یەكێك لەوانت ویست پێشی بخەو بیهێنە بۆ لای خۆت)، وتم: سوێند بە خوا وا دەبینم پەروەردگارت بە خێرایی تۆ ڕازی دەكات.**

**٣٢٠٠-** «عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: أَنَا فِي الْقَوْمِ إِذْ قَالَتِ امْرَأَةٌ: إِنِّي قَدْ وَهَبْتُ نَفْسِي لَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَرَأْ فِيَّ رَأْيَكَ، فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: زَوِّجْنِيهَا، فَقَالَ: اذْهَبْ، فَاطْلُبْ وَلَوْ خَاتَماً مِنْ حَدِيدٍ، فَذَهَبَ فَلَمْ يَجِدْ شَيْئاً وَلَا خَاتَماً مِنْ حَدِيدٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ: أَمَعَكَ مِنْ سُوَرِ الْقُرْآنِ شَيْءٌ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَزَوَّجَهُ بِمَا مَعَهُ مِنْ سُوَرِ الْقُرْآنِ»[٢].

**واتە: سەهلی كوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: من لەناو خەڵكەكە بووم كاتێ ئافرەتێ وتی: من خۆم پێشكەشی تۆ كردوە بەبێ مارەیی یان كاروباری خۆمم داوە بە دەستی تۆ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، هەرچی تۆ بڵێی ڕازیم، پیاوێك هەڵساو وتی: لێم مارە بكە، فەرمووی: بڕۆ (مارەیی بۆ) پەیدا بكە ئەگەر چی موستیلەیەكی ئاسنیش بێت، ڕۆیشت هیچی دەست نەكەوت، تەنانەت موستیلەیەكی ئاسنیش، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا هیچ لە قورئانت لەبەرە؟ وتی: بەڵێ، وتی: مارەی لێ كرد بەوەی لەبەری بوو لە سووڕەتەكانی قورئان.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٧٨٨ و ٥١١٣، ومسلم: ٤٩ و ١٤٦٤/٥٠، وابن ماجه: ٢٠٠٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣١٠ و ٥٠٢٩ و ٥٠٣٠ و ٥٠٨٧ و ٥١٢١ و ٥١٢٦ و ٥١٣٢ و ٥١٣٥ و ٥١٤١ و ٥١٤٩ و ٧٤١٧، ومسلم: ٧٦ و ١٤٢٥/٧٧، وأبو داود: ٢١١١، والترمذي: ١١١٤، وابن ماجه: ١٨٨٩.

## ئەوەی خوا فەرزی کردوە لە سەر پێغەمبەرەکەی و، قەدەغەی کردوە لەسەر دروستکراوەکانی بۆ ئەوەی بە ویستی خوا ببێتە مایەی نزیک بوونەوە لێی.

**٣٢٠١-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ جَاءَهَا حِينَ أَمَرَهُ اللَّهُ أَنْ يُخَيِّرَ أَزْوَاجَهُ، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَبَدَأَ بِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: إِنِّي ذَاكِرٌ لَكِ أَمْراً، فَلَا عَلَيْكِ أَنْ لَا تُعَجِّلِي حَتَّى تَسْتَأْمِرِي أَبَوَيْكِ، قَالَتْ: وَقَدْ عَلِمَ أَنَّ أَبَوَيَّ لَا يَأْمُرَانِي بِفِرَاقِهِ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيۡنَ أُمَتِّعۡكُنَّ ﴿٢٨﴾ ﴾الأحزاب، فَقُلْتُ: فِي هَذَا أَسْتَأْمِرُ أَبَوَيَّ فَإِنِّي أُرِيدُ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الْآخِرَةَ»[١].

**واتە:** عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لای کاتێ خوا فەرمانی پێکرد خێزانەکانی سەرپشک بکات، عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە منەوە دەستی پێکردو فەرمووی: من شتێکت بۆ باس دەکەم، نابێ پەلە بکەی تا فەرمان لە دایک و باوکت وەردەگری، وتی: بێگومان دەیزانی باوک و دایکم فەرمانی ئەوەم پێناکەن لێی جیاببمەوە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيۡنَ أُمَتِّعۡكُنَّ ﴿٢٨﴾ ﴾، (واتە: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە خێزانەکانت بڵێ: ئەگەر ئێوە ژیانی دونیاو ڕازاوەیی ئەوتان دەوێ دەی هەمووتان وەرن موتعەتان پێ بدەم (کە پارەو شمەکێکە دەدرێت بە ئافرەتی تەڵاقدراو)، وتم: لەمەدا داوای فەرمان لە دایک و باوکم بکەم، بە ڕاستی من خواو پێغەمبەرەکەی و ڕۆژی دواییم دەوێ.

**٣٢٠٢-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَدْ خَيَّرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ نِسَاءَهُ، أَوَكَانَ طَلَاقاً»[٢].

**واتە:** عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ خێزانەکانی سەرپشک کرد لەوەی لەگەڵی دەژین یان تەڵاقیان دەوێ.

**٣٢٠٣-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: خَيَّرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَاخْتَرْنَاهُ، فَلَمْ يَكُنْ طَلَاقاً»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٢٦٢، ومسلم: ٢٢ و ٢٥ و ١٤٧٧/٢٨، وأبو داود: ٢٢٠٣، والترمذي: ١١٧٩، وإبن ماجه: ٢٠٥٢.

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سەرپشكی كردین (لەوەی لەگەڵ ئەو بژین یان داوای تەڵاق بكەین) ئێمەش ئەومان هەڵبژارد، نەک تەڵاق.

تێبینی: هەر كەس هاوسەرەكەی سەرپشک بكات بە تەڵاق هەژمار ناكرێت و تەڵاقیشی ناكەوێت، خوا زاناترە.

**٣٢٠٤-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: مَا مَاتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى أُحِلَّ لَهُ النِّسَاءُ»(١).

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەمرد تا ئافرەتانی بۆ حەڵاڵ كرا (زەواجیان لەگەڵ بكات).

**٣٢٠٥-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: مَا تُوفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى أَحَلَّ اللَّهُ لَهُ أَنْ يَتَزَوَّجَ مِنَ النِّسَاءِ مَا شَاءَ»(٢).

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی نەفەرموو، تا خوا بۆی حەڵاڵ كرد بە ویستی خۆی ژن بهێنێ.

## هاندان لەسەر ژنهێنان

**٣٢٠٦-** «عَنْ عُثْمَانَ ﷺ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى فِتْيَةٍ، قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: فَلَمْ أَفْهَمْ فِتْيَةً كَمَا أَرَدْتُ، فَقَالَ: مَنْ كَانَ مِنْكُمْ ذَا طَوْلٍ فَلْيَتَزَوَّجْ، فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ، وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ، وَمَنْ لَا، فَالصَّوْمُ لَهُ وِجَاءٌ»(٣).

واتە: عوسمان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە بۆ لای كۆمەڵە گەنجێک، ئەبو عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: تێنەگەیشتم گەنج بوو وەكو ئەوەی دەمەوێ، فەرمووی: هەر كەس لە ئێوە توانای ژن هێنانی هەیە با ژن بهێنێ، چونكە ژن هێنان بۆ چاوپارێزی و داوێنپارێزی چاكترین هۆكارە، هەركەسیش توانای نەبوو با بەڕۆژوو بێت، چونكە ڕۆژوو بۆ ئەو قەڵغانە.

---

(١) صحيح الإسناد. أخرجه الترمذي: ٣٢١٦.

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح الإسناد.

**٣٢٠٧-** «عَنْ عُثْمَانَ قَالَ لِابْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: هَلْ لَكَ فِي فَتَاةٍ أُزَوِّجُكَهَا؟ فَدَعَا عَبْدُ اللَّهِ، عَلْقَمَةَ فَحَدَّثَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: مَنِ اسْتَطَاعَ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ، فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ، وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَلْيَصُمْ، فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ»[١].

**واتە: عوسمان بە ئیبنو مەسعودی (خوا لێیان ڕازی بێ) وت: ئایا دەتەوێ کچێکت بۆ بخوازم؟ عەبدوڵڵا بانگی عەلقەمەی کرد باسی کرد پێغەمبەر ﷺ، فەرمووی: هەر کەس توانای ژنهێنانی هەیە با ژن بهێنێ، چونکە ژن هێنان بۆ چاوپارێزی و داوێنپارێزی چاکترین هۆکارە، هەرکەسیش توانای نەبوو با بەڕۆژوو بێت، چونکە ڕۆژوو بۆ ئەو قەڵغانە.**

**٣٢٠٨-** «عَنْ عَلْقَمَةَ وَالْأَسْوَدُ عن عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ، فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ. قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: الْأَسْوَدُ فِي هَذَا الْحَدِيثِ لَيْسَ بِمَحْفُوظٍ»[٢].

**واتە: عەلقەمە و ئەسوەد دەگێڕنەوە لە عەبدوڵڵاوە ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێمانی فەرموو: هەر کەس لە ئێوە توانای ژن هێنانی هەیە با ژن بهێنێ، چونکە ژن هێنان بۆ چاوپارێزی و داوێنپارێزی چاکترین هۆکارە، هەرکەسیش توانای نەبوو با بە ڕۆژوو بێت، چونکە ڕۆژوو بۆ ئەو قەڵغانە، ئەبو عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: ئەسوەد لە سەنەدی فەرموودەدا پارێزراو نیە.**

**٣٢٠٩-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ، مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ فَلْيَنْكِحْ، فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ، وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ، وَمَنْ لَا، فَلْيَصُمْ، فَإِنَّ الصَّوْمَ لَهُ وِجَاءٌ»[٣].

**واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێمانی فەرموو: ئەی کۆمەڵەی گەنجان هەر کەس لە ئێوە توانای ژنهێنانی هەیە با ژن بهێنێ، چونکە ژنهێنان بۆ چاوپارێزی و داوێنپارێزی چاکترین هۆکارە، هەر کەسیش توانای نەبوو با بە ڕۆژوو بێت، چونکە ڕۆژوو بۆ ئەو قەڵغانە.**

---

**(١) صحيح.**

**(٢) صحيح.**

**(٣) صحيح.**

**٣٢١٠-** *«عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ، مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ، وَسَاقَ الْحَدِيثَ»*[١].

**واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەی کۆمەڵەی گەنجان هەر کەس لە ئێوە توانای ژن هێنانی هەیە با ژن بهێنێ، وە فەرموودەکەی باس کرد**

**٣٢١١-** «عَنْ عَلْقَمَةَ قَالَ: كُنْتُ أَمْشِي مَعَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ بِمِنًى، فَلَقِيَهُ عُثْمَانُ، فَقَامَ مَعَهُ يُحَدِّثُهُ فَقَالَ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَلَا أُزَوِّجُكَ جَارِيَةً شَابَّةً فَلَعَلَّهَا أَنْ تُذَكِّرَكَ بَعْضَ مَا مَضَى مِنْكَ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: أَمَا لَئِنْ قُلْتَ ذَاكَ لَقَدْ قَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ، مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ»[٢].

**واتە: عەلقەمە دەڵێ: من لەگەڵ عەبدوڵلا ﷺ دەڕۆیشتم لە مینا عوسمان پێی گەیشت، لەگەڵیدا وەستا باسی و خوازبێنی دەکرد، وتی: ئەی باوکی عەبدوڕڕەحمان ئایا کچێکی گەنجت بۆ نەخوازم، بەو ئومێدەی هەندێ لەو هێزو ئارەزووەی کە ڕابوردوە بۆت بگەڕێتەوە (چونکە هێز و ئارەزوو لەگەڵ تێکەڵبوون بە گەنج بەهێز دەبێت)، عەبدوڵلا وتی: بەڵام ئەگەر تۆ ئەوە وت، بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ پێمانی فەرمووە: ئەی کۆمەڵەی گەنجان هەر کەس لە ئێوە توانای ژن هێنانی هەیە با ژن بهێنێ.**

## بابەت: قەدەغەکردنی وازهێنان لە ئافرەتان

**٣٢١٢-** «عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ قَالَ: لَقَدْ رَدَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى عُثْمَانَ التَّبَتُّلَ، وَلَوْ أَذِنَ لَهُ لَاخْتَصَيْنَا»[٣].

**واتە: سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص ﷺ دەڵێ: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ وازهێنانی لە ئافرەتان ڕەتکردەوە لەسەر عوسمان، ئەگەر مۆڵەتی پێبدایە هەموومان دەخەساین.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٠٧٣ و ٥٠٧٤، ومسلم: ٧ و ١٤٠٢/٨، والترمذي: ١٠٨٣، وإبن ماجه: ١٨٤٨.




**٣٢١٣-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ التَّبَتُّلِ»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ وازهێنانی لە ژن هێنان قەدەغە کرد.**

**٣٢١٤-** «عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ نَهَى عَنِ التَّبَتُّلِ»[٢].

**واتە: سەمورەی کوڕی جوندوب رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ وازهێنانی لە ژن هێنان قەدەغە کرد.**

**٣٢١٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي رَجُلٌ شَابٌّ، قَدْ خَشِيتُ عَلَى نَفْسِيَ الْعَنَتَ، وَلَا أَجِدُ طَوْلاً أَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ، أَفَأَخْتَصِي؟ فَأَعْرَضَ عَنْهُ النَّبِيُّ ﷺ حَتَّى قَالَ ثَلَاثاً، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، جَفَّ الْقَلَمُ بِمَا أَنْتَ لَاقٍ، فَاخْتَصِ عَلَى ذَلِكَ، أَوْ دَعْ»[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، من پیاوێکی گەنجم، دەترسم تووشی گوناهـ ببم، ژیانم باش نیە ژن بهێنم، ئایا خۆم بخەسێنم؟ پێغەمبەر ﷺ بەرپەرچی دایەوە سێ جار، فەرمووی: ئەی ئەبو هورەیرە، قەڵەم وشک بووە لەوەی تووشت دەبێ، ئەگەر ویستت ئەندامێکی جەستەت ببڕی، یان نەیبڕی، (تۆ هەر تووشی قەزاو قەدەری خوا دەبیت).**

**٣٢١٦-** «عَنْ سَعْدِ بْنِ هِشَامٍ، أَنَّهُ دَخَلَ عَلَى أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قُلْتُ: إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أَسْأَلَكِ عَنِ التَّبَتُّلِ، فَمَا تَرَيْنَ فِيهِ؟ قَالَتْ: فَلَا تَفْعَلْ، أَمَا سَمِعْتَ اللَّهَ ﷻ يَقُولُ: ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَاجًا وَذُرِّيَّةً ﴿٣٨﴾ ﴾الرعد، فَلَا تَتَبَتَّلْ»[٤].

**واتە: سەعدی کوڕی هێشام دەگێڕێتەوە: ئەو ڕۆیشت بۆ لای دایکی ئیمانداران عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: وتم: من دەمەوێ پرسیارت لێ بکەم لەبارەی وازهێنان لە ژن هێنان، تۆ چی دەڵێی؟ وتی: کاری وا مەکە، ئەی نەتبیستووە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَاجًا وَذُرِّيَّةً ﴿٣٨﴾ ﴾ (واتە: سوێند**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٠٨٢، وإبن ماجه: ١٨٤٩.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٠٧٦ معلقاً.

(٤) صحيح موقوف.




بە خوا بێگومان پێش تۆ پێغەمبەرانێکمان ناردووەو پێمان دان هاوسەرو نەوەو وەچە، هەرگیز واز لە ژن هێنان مەهێنە).

**٣٢١٧-** «عَنْ أَنَسٍ ﵁، أَنَّ نَفَراً مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ بَعْضُهُمْ: لَا أَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: لَا آكُلُ اللَّحْمَ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: لَا أَنَامُ عَلَى فِرَاشٍ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: أَصُومُ فَلَا أُفْطِرُ، فَبَلَغَ ذَلِكَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: مَا بَالُ أَقْوَامٍ يَقُولُونَ كَذَا وَكَذَا، لَكِنِّي أُصَلِّي وَأَنَامُ، وَأَصُومُ وَأُفْطِرُ وَأَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ، فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي»[(١)].

**واتە:** ئەنەس ﵁ دەگێڕێتەوە: کەسانێک لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ وتیان: هەرگیز ژن ناهێنم، هەندێکی تریان وتیان: هەرگیز گۆشت ناخۆم، هەندێکی تریان وتیان: لەسەر جێگا ناخەوم، هەندێکی تریان وتیان: بەڕۆژوو دەبم هەرگیز بێ ڕۆژوو نابم، ئەو قسانە گەیشت بە پێغەمبەری خوا ﷺ، دواتر سوپاس و ستایشی خوای کرد، پاشان فەرمووی: ئەوە چیانە کۆمەڵێک لە خەڵکی ئاواو ئاوا دەڵێن، بەڵام من نوێژ دەکەم و ئەخەوم، بەڕۆژوو دەبم بەڕۆژووش نابم، ژنیش دەهێنم، هەر کەس لابدات لە ڕێبازی من، ئەوە لە من نیە.

## بابەت: یارمەتی خوا بۆ ئەو کەسەی ژن دێنێ و مەبەستی پێی داوێن پاکیە

**٣٢١٨-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: ثَلَاثَةٌ حَقٌّ عَلَى اللَّهِ ﷻ عَوْنُهُمْ: الْمُكَاتَبُ الَّذِي يُرِيدُ الْأَدَاءَ، وَالنَّاكِحُ الَّذِي يُرِيدُ الْعَفَافَ، وَالْمُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ»[(٢)].

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سێ شت هەن حەقە لەسەر خوا ﷻ پشتیوانیان بکات: ئەو کەسەی گرێبەستی کردوە لەگەڵ گەورەکەیدا بۆ ئەوەی پارەکەی بداتەوەو خۆی ئازاد بکات، ئەو کەسەیشی ژن دەخوازێ بە مەبەستی داوێن پاکی، ئەو کەسەیشی جیهاد دەکات لە پێناوی خوادا.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٠٦٣، ومسلم: ١٤٠١.

(٢) حسن. أخرجه الترمذي: ١٦٥٥، وإبن ماجه: ٢٥١٨.

## مارەکردنی کچەکان

**٣٢١٩-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: تَزَوَّجْتُ فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: أَتَزَوَّجْتَ يَا جَابِرُ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: بِكْراً أَمْ ثَيِّباً؟ فَقُلْتُ: ثَيِّباً، قَالَ: فَهَلَّا بِكْراً تُلَاعِبُهَا وَتُلَاعِبُكَ»[١].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: ژنم هێناو دواتر هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا ژنت هێناوە ئەی جابر؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: کچە، یان بێوەژن؟ وتم: بێوەژنە، فەرمووی: ئەی بۆ کچت نەخواست، یاری لەگەڵدا بکەیت و یاریت لەگەڵ بکات.**

**٣٢٢٠-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: لَقِيَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا جَابِرُ، هَلْ أَصَبْتَ امْرَأَةً بَعْدِي؟ قُلْتُ: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: أَبِكْراً أَمْ أَيِّماً؟ قُلْتُ: أَيِّماً، قَالَ: فَهَلَّا بِكْراً تُلَاعِبُكَ»[٢].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ پێگەیشت فەرمووی: ئەی جابر، ئایا دوای من ژنت هێنا؟ وتم: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: کچە، یان بێوەژن؟ وتم: بێوەژنە، فەرمووی: ئەی بۆ کچت نەخواست یاریت لەگەڵ بکات.**

## خوازبێنی ئافرەتێکی هاوشێوەی خۆی لە تەمەندا

**٣٢٢١-** «عَنْ بُرَيْدَةَ قَالَ: خَطَبَ أَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ فَاطِمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّهَا صَغِيرَةٌ، فَخَطَبَهَا عَلِيٌّ، فَزَوَّجَهَا مِنْهُ»[٣].

**واتە: بورەیدە دەڵێ: ئەبو بەکر و عومەر داوای فاطیمەیان کرد (خوا لێیان ڕازی بێ)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەو منداڵە، بەڵام کە عەلی داوای کرد، پێغەمبەر لێی مارە کرد.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٠٢٥ و ٥٠٨٠ و ٥٣٦٧ و ٦٣٨٧، ومسلم: ٧١٥، والترمذي: ١١٠٠.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح الإسناد.



## هاوسەرگیری مەولا لەگەڵ ئافرەتێکی عەرەبدا

**٣٢٢٢-** «عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ: أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ عُثْمَانَ طَلَّقَ وَهُوَ غُلَامٌ شَابٌّ فِي إِمَارَةِ مَرْوَانَ ابْنَةَ سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ، وَأُمُّهَا بِنْتُ قَيْسٍ الْبَتَّةَ، فَأَرْسَلَتْ إِلَيْهَا خَالَتُهَا فَاطِمَةُ بِنْتُ قَيْسٍ، تَأْمُرُهَا بِالِانْتِقَالِ مِنْ بَيْتِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، وَسَمِعَ بِذَلِكَ مَرْوَانُ، فَأَرْسَلَ إِلَى ابْنَةِ سَعِيدٍ، فَأَمَرَهَا أَنْ تَرْجِعَ إِلَى مَسْكَنِهَا، وَسَأَلَهَا مَا حَمَلَهَا عَلَى الِانْتِقَالِ مِنْ قَبْلِ أَنْ تَعْتَدَّ فِي مَسْكَنِهَا حَتَّى تَنْقَضِيَ عِدَّتُهَا؟ فَأَرْسَلَتْ إِلَيْهِ تُخْبِرُهُ أَنَّ خَالَتَهَا أَمَرَتْهَا بِذَلِكَ، فَزَعَمَتْ فَاطِمَةُ بِنْتُ قَيْسٍ أَنَّهَا كَانَتْ تَحْتَ أَبِي عَمْرِو بْنِ حَفْصٍ، فَلَمَّا أَمَّرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ عَلَى الْيَمَنِ، خَرَجَ مَعَهُ، وَأَرْسَلَ إِلَيْهَا بِتَطْلِيقَةٍ هِيَ بَقِيَّةُ طَلَاقِهَا، وَأَمَرَ لَهَا الْحَارِثَ بْنَ هِشَامٍ، وَعَيَّاشَ بْنَ أَبِي رَبِيعَةَ بِنَفَقَتِهَا، فَأَرْسَلَتْ، زَعَمَتْ إِلَى الْحَارِثِ وَعَيَّاشٍ، تَسْأَلُهُمَا الَّذِي أَمَرَ لَهَا بِهِ زَوْجُهَا، فَقَالَا: وَاللَّهِ مَا لَهَا عِنْدَنَا نَفَقَةٌ إِلَّا أَنْ تَكُونَ حَامِلاً، وَمَا لَهَا أَنْ تَكُونَ فِي مَسْكَنِنَا إِلَّا بِإِذْنِنَا، فَزَعَمَتْ أَنَّهَا أَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لَهُ، فَصَدَّقَهُمَا، قَالَتْ فَاطِمَةُ: فَأَيْنَ أَنْتَقِلُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: انْتَقِلِي عِنْدَ ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ الْأَعْمَى الَّذِي سَمَّاهُ اللَّهُ ﷻ فِي كِتَابِهِ، قَالَتْ فَاطِمَةُ: فَاعْتَدَدْتُ عِنْدَهُ، وَكَانَ رَجُلاً قَدْ ذَهَبَ بَصَرُهُ، فَكُنْتُ أَضَعُ ثِيَابِي عِنْدَهُ حَتَّى أَنْكَحَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ، فَأَنْكَرَ ذَلِكَ عَلَيْهَا مَرْوَانُ، وَقَالَ: لَمْ أَسْمَعْ هَذَا الْحَدِيثَ مِنْ أَحَدٍ قَبْلَكِ، وَسَآخُذُ بِالْقَضِيَّةِ الَّتِي وَجَدْنَا النَّاسَ عَلَيْهَا»[١].

**واتە: عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عوتبە دەگێڕێتەوە، عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عوسمان، گەنجێکی تازە پێگەیشتوو بوو لە سەردەمی دەسەڵاتی مەرواندا، کچەکەی سەعیدی کوڕی زەیدی تەڵاقدا بە هەمیشەیی، دایکی ئەو کچە حەمنەی کچی قەیس بوو، پوریشی فاطیمە کچی قەیس بوو، فەرمانی پێ کرد لە ماڵی عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ دەربچێ، مەڕوان ئەمەی بیست نێردراوی نارد بۆ لای کچەکەی سەعید، فەرمانی پێ کرد بگەڕێتەوە بۆ ماڵەکەی خۆی، وە پرسیاری لێ بکات چی وای لێ کردوە ماڵەکەی جێ بهێڵێ پێش ئەوەی تیایدا عیدەکەی تەواو بکات، تا عیدەکەی تەواو دەکات، نێردراوی نارد بۆ لای و هەواڵی پێدا کە پوری فاطیمە فەرمانی پێ کردوە، فاطیمەی کچی قەیسیش هەواڵی پێداوە پێغەمبەر ﷺ**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٨٠/٤١، وأبو داود: ٢٢٩٠.





فەرمانی پێکردوە بە گواستنەوە، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە عەلی کوڕی ئەبو طاڵیب بچێ بۆ یەمەن، لەگەڵیدا ڕۆیشت بۆ یەمەن، تەڵاقێکی بۆی نارد، ئەوەش کۆتا تەڵاقی بوو کە مابوویەوە، فەرمانی کردبوو بە حارسی کوڕی هیشام و عیاشی کوڕی ئەبو ڕەبیعە نەفەقەی بدەن، فاطیمە ناردی بۆ لای حارس و عیاش داوای ئەو نەفەقەی کرد کە مێردەکەی فەرمانی پێ کردوە؟ وتیان: سوێند بە خوا نەفەقەی لەسەر ئێمە نیە مەگەر دووگیان بێت، مافی ئەوەشی نیە لە ماڵی ئێمەدا دابنیشێ مەگەر بە مۆڵەتی ئێمە، فاطیمەش ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئەوەی بۆی باس کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانی بە ڕاست زانی، فاطیمە وتی: ئەی بۆ کوێ بڕۆم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: بڕۆ بۆ لای کوڕەکەی ئوم مەکتوم، ئەویش ئەو پیاوە نابینایە بوو کە خوا ﷻ لە کتێبەکەیدا باسی کردوە، فاطیمە وتی منیش لە ماڵی کوڕەکەی ئوم مەکتوم مامەوە عیدەم تەواو کرد، ئەو پیاوێک بوو چاوی لەدەست دابوو، منیش جل و بەرگی خۆمم دادەنا هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئوسامەی کوڕی زەیدی مارەکرد، مەڕوان نکوڵی ئەوەی لێ کردو وتی: پێش تۆ ئەم فەرموودەم لە کەس نەبیستووە، کار بەو فەرموودە دەکەم کە خەڵکی لەسەری ڕۆیشتوون.

**٣٢٢٣-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّ أَبَا حُذَيْفَةَ بْنَ عُتْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ بْنِ عَبْدِ شَمْسٍ، وَكَانَ مِمَّنْ شَهِدَ بَدْراً مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، تَبَنَّى سَالِماً وَأَنْكَحَهُ ابْنَةَ أَخِيهِ هِنْدَ بِنْتَ الْوَلِيدِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ بْنِ عَبْدِ شَمْسٍ، وَهُوَ مَوْلًى لِامْرَأَةٍ مِنَ الْأَنْصَارِ، كَمَا، تَبَنَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ زَيْداً، وَكَانَ مَنْ تَبَنَّى رَجُلاً فِي الْجَاهِلِيَّةِ، دَعَاهُ النَّاسُ ابْنَهُ، فَوَرِثَ مِنْ مِيرَاثِهِ، حَتَّى أَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ فِي ذَلِكَ: ﴿ ٱدْعُوهُمْ لِآبَآئِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ فَإِن لَّمْ تَعْلَمُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمْ ﴿٥﴾ ﴾الأحزاب، فَمَنْ لَمْ يُعْلَمْ لَهُ أَبٌ كَانَ مَوْلًى وَأَخاً فِي الدِّينِ»[1].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: ئەبو حوزەیفەی کوڕی عوتبەی کوڕی ڕەبیعەی کوڕی عەبدوشەمش، یەکێک بوو لەوانەی بەشداری جەنگی بەدریان کردبوو لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ، سالمی بە تەبەنی کردە کوڕی خۆی، برازاکەی خۆی لێی مارە کرد، هیندی کچی وەلیدی کوڕی عوتبەی کوڕی ڕەبیعەی کوڕی عەبدو شەمس، سالم مەولای ئافرەتێکی ئەنصاڕی بوو، وەک چۆن پێغەمبەری

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٠٠٠ و ٥٠٨٨.





خوا ﷺ زەیدی کرد بە کوڕی خۆی، جا لە سەردەمی نەفامیدا هەرکەسێ پیاوێکی بکردایە بە کوڕی خۆی، خەڵکی بە کوڕی ئەو بانگیان دەکرد، لە میراتەکەشی دەبرد، تا خوا ﷻ لەو بارەوە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ ٱدۡعُوهُمۡ لِأٓبَآئِهِمۡ هُوَ أَقۡسَطُ عِندَ ٱللَّهِۚ فَإِن لَّمۡ تَعۡلَمُوٓاْ ءَابَآءَهُمۡ فَإِخۡوَٰنُكُمۡ فِي ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمۡۚ ﴿٥﴾ ﴾ (واتە: ئەو بە کوڕکراوانە بە ناوی باوکیانەوە بانگ بکەن ئەوە ڕاسترە بەلای خواوە، ئینجا ئەگەر باوکیان نەناسن ئەوانە برای ئاینی و دۆست و خۆشەویستانن)، جا هەرکەس باوکی نەناسرایە ئەوە دەبووە خۆشەویست و و برا لە دیندا.

**٣٢٢٤-** «عَنْ عَائِشَةَ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، وَأُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ: أَنَّ أَبَا حُذَيْفَةَ بْنَ عُتْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ بْنِ عَبْدِ شَمْسٍ، وَكَانَ مِمَّنْ شَهِدَ بَدْراً مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، تَبَنَّى سَالِماً وَهُوَ مَوْلًى لِامْرَأَةٍ مِنَ الْأَنْصَارِ، كَمَا، تَبَنَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ زَيْدَ بْنَ حَارِثَةَ، وَأَنْكَحَ أَبُو حُذَيْفَةَ بْنُ عُتْبَةَ سَالِماً ابْنَةَ أَخِيهِ هِنْدَ ابْنَةَ الْوَلِيدِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ، وَكَانَتْ هِنْدُ بِنْتُ الْوَلِيدِ بْنِ عُتْبَةَ مِنَ الْمُهَاجِرَاتِ الْأُوَلِ، وَهِيَ يَوْمَئِذٍ مِنْ أَفْضَلِ أَيَامَى قُرَيْشٍ، فَلَمَّا أَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ فِي زَيْدِ بْنِ حَارِثَةَ: ﴿ ٱدۡعُوهُمۡ لِأٓبَآئِهِمۡ هُوَ أَقۡسَطُ عِندَ ٱللَّهِ ﴿٥﴾ ﴾الأحزاب، رُدَّ كُلُّ أَحَدٍ يَنْتَمِي مِنْ أُولَئِكَ إِلَى أَبِيهِ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ يُعْلَمُ أَبُوهُ، رُدَّ إِلَى مَوَالِيهِ»[1].

واتە: عائیشەو ئوممو سەلەمە (خوا لێیان ڕازی بێ) هەردوو خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕنەوە: ئەبو حوزەیفەی کوڕی عوتبەی کوڕی ڕەبیعەی کوڕی عەبدوشەمس، یەکێک بوو لەوانەی بەشداری بەدریان کردبوو لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ، سالمی بە تەبەنی کردە کوڕی خۆی، سالم مەولای ئافرەتێکی ئەنصاڕی بوو، وەک چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ زەیدی کوڕی حاریسەی کرد بە کوڕی خۆی، جا ئەبو حوزەیفە برازاکەی خۆی لێی مارەکرد، هیندی کچی وەلیدی کوڕی عوتبەی کوڕی ڕەبیعە، هیند یەکێک بوو لەو ئافرەتانەی یەکەم جار کۆچی کرد، لەو سەردەمەدا چاکترینی ناو ئافرەتانی قورەیش بوو، کاتێ خوا ﷻ لەبارەی زەیدی کوڕی حاریسە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ ٱدۡعُوهُمۡ لِأٓبَآئِهِمۡ هُوَ أَقۡسَطُ ﴿٥﴾ ﴾ (واتە: ئەو بە کوڕکراوانە بە ناوی باوکیانەوە بانگ بکەن ئەوە ڕاسترە)، هەر کەسەو کوڕێک دراوەتە پاڵی گەڕاندیەوە بۆ لای باوکی خۆی، ئەوەی باوکی نەناسرایە دەگەڕێنرایەوە بۆ بەخێوکەرەکەی.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٠٠٠ و ٥٠٨٨، وأبو داود: ٢٠٦١.





## دەربارەی ڕەچەڵەک

**٣٢٢٥-** «عَنْ بُرَيْدَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ أَحْسَابَ أَهْلِ الدُّنْيَا الَّذِي يَذْهَبُونَ إِلَيْهِ الْمَالُ»[1].

**واتە: بورەیدە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕەچەڵەک و فەزڵ و چاکەکانی خەڵکی دونیا کە بۆی لای دەڕۆن بریتیە لە سەروەت و سامان.**

## ئەوەی ئافرەتی لەسەر مارە دەکرێ

**٣٢٢٦-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّهُ تَزَوَّجَ امْرَأَةً عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَلَقِيَهُ النَّبِيُّ ﷺ، فَقَالَ: أَتَزَوَّجْتَ يَا جَابِرُ؟ قَالَ: قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: بِكْراً أَمْ ثَيِّباً، قَالَ: قُلْتُ: بَلْ ثَيِّباً، قَالَ: فَهَلَّا بِكْراً تُلَاعِبُكَ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كُنَّ لِي أَخَوَاتٌ فَخَشِيتُ أَنْ تَدْخُلَ بَيْنِي وَبَيْنَهُنَّ، قَالَ: فَذَاكَ إِذاً، إِنَّ الْمَرْأَةَ تُنْكَحُ عَلَى دِينِهَا، وَمَالِهَا، وَجَمَالِهَا، فَعَلَيْكَ بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ»[2].

**واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو ئافرەتێکی خوازبێنی کرد لەسەردەم پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەر ﷺ پێی گەیشت فەرمووی: ئەی جابر ژنت هێناوە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: کچە یان بێوەژن؟ وتی: بەڵکو بێوەژنە، فەرمووی: ئەی بۆ کچت نەخواست یاریت لەگەڵ بکات، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من چەند خوشکێکم هەیە ترسام لەوەی بچێتە نێوان من و خوشکەکانم و (دواتر) تەڵاقی بدەم، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: کەواتە کارێکی چاکت کردوە، ئافرەت لەبەر ئاینەکەی و ماڵەکەی و جوانیەکەی مارە دەکرێ، دەست بگرە بە خاوەن ئاینەوە دەستەکانت خۆڵاوی بن.**

**تێبینی: وشەی: (تَرِبَتْ يَدَاكَ) واتە: هەژار بیت، یان بێبەش بیت لە خێر، بۆ سەرزەنشتە، بەڵام عەرەب بۆ هاندان و بەردەوام بوون لەسەر شتی چاک بەکاریان هێناوە.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٧١٥، والترمذي: ١٠٨٦، وإبن ماجه: ١٨٦٠.




## ژن مارەبڕین بۆ کەسی نەزۆک یان وجاخ کوێر باش نیە

**٣٢٢٧-** «عَنْ مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ ﵁ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: إِنِّي أَصَبْتُ امْرَأَةً ذَاتَ حَسَبٍ وَمَنْصِبٍ، إِلَّا أَنَّهَا لَا تَلِدُ، أَفَأَتَزَوَّجُهَا؟ فَنَهَاهُ، ثُمَّ أَتَاهُ الثَّانِيَةَ، فَنَهَاهُ، ثُمَّ أَتَاهُ الثَّالِثَةَ، فَنَهَاهُ، فَقَالَ: تَزَوَّجُوا الْوَلُودَ الْوَدُودَ، فَإِنِّي مُكَاثِرٌ بِكُمْ»[١].

**واتە: مەعقیلی کوڕی یەسار ﵁ دەڵێ: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: من ئافرەتێکی خاوەن بنەماڵە و پلەو پایەم بەدی کردوە، ئەوە نەبێ منداڵی نابێ، ئایا بیخوازم؟ پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی لێکرد، پاشان جارێکی تر هاتەوە، بە هەمان شێوە قەدەغەی لێکرد، ئینجا فەرمووی: ئافرەتانێک بخوازن منداڵیان بێت و خۆشتان بوێن، چونکە من بە ئێوەوە زۆر دەبم لە ڕۆژی دواییدا.**

## مارەبڕینی ئافرەتی زیناکار

**٣٢٢٨-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﵁، أَنَّ مَرْثَدَ بْنَ أَبِي مَرْثَدٍ الْغَنَوِيَّ، وَكَانَ رَجُلاً شَدِيداً، وَكَانَ يَحْمِلُ الْأُسَارَى مِنْ مَكَّةَ، إِلَى الْمَدِينَةِ، قَالَ: فَدَعَوْتُ رَجُلاً لِأَحْمِلَهُ، وَكَانَ بِمَكَّةَ بَغِيٌّ يُقَالُ لَهَا: عَنَاقُ، وَكَانَتْ صَدِيقَتَهُ، خَرَجَتْ فَرَأَتْ سَوَادِي فِي ظِلِّ الْحَائِطِ، فَقَالَتْ: مَنْ هَذَا مَرْثَدٌ، مَرْحَباً وَأَهْلاً يَا مَرْثَدُ، انْطَلِقِ اللَّيْلَةَ فَبِتْ عِنْدَنَا فِي الرَّحْلِ، قُلْتُ: يَا عَنَاقُ، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حَرَّمَ الزِّنَا، قَالَتْ: يَا أَهْلَ الْخِيَامِ، هَذَا الدُّلْدُلُ، هَذَا الَّذِي يَحْمِلُ أُسَرَاءَكُمْ مِنْ مَكَّةَ إِلَى الْمَدِينَةِ، فَسَلَكْتُ الْخَنْدَمَةَ، فَطَلَبَنِي ثَمَانِيَةٌ، فَجَاءُوا حَتَّى قَامُوا عَلَى رَأْسِي، فَبَالُوا، فَطَارَ بَوْلُهُمْ عَلَيَّ، وَأَعْمَاهُمُ اللَّهُ عَنِّي، فَجِئْتُ إِلَى صَاحِبِي، فَحَمَلْتُهُ، فَلَمَّا انْتَهَيْتُ بِهِ إِلَى الْأَرَاكِ، فَكَكْتُ عَنْهُ كَبْلَهُ، فَجِئْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنْكِحُ عَنَاقَ، فَسَكَتَ عَنِّي، فَنَزَلَتْ: ﴿وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوۡ مُشۡرِكٌۚ ٣﴾ النور، فَدَعَانِي، فَقَرَأَهَا عَلَيَّ وَقَالَ: لَا تَنْكِحْهَا»[٢].

**واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، لە باپیرەی ﵁، مەرثەدی کوڕی ئەبو مەرثەدی غەنەوی پیاوێکی بەهێز بوو، دیلەکانی لە مەککەوە دەبرد بۆ مەدینە، وتی: بانگی کەسێکم کرد بیبەم، لە مەککەدا ئافرەتێکی داوێن پیس**

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٠٥٠.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٢٠٥١، والترمذي: ٣١٧٧.

هەبوو پێی دەوترا: عەناق، خۆشەویستی مەرثەد بوو، دەرچوو قەرەباڵغیەکی بینی لە سێبەری دیوارێکدا، وتی: ئەمە مەرثەدە چۆنی ئەی مەرثەد باشی، وەرە ئەم شەو لامان بمێنەوە، وتم: ئەی عەناق پێغەمبەری خوا ﷺ زینای قەدەغە کردوە، وتی: ئەی خەڵکی ڕەشماڵەکە، ئەمەی کە بە پەلە ڕێ دەکات، ئەمەیە کە دیلەکانی ئێوە لە مەککەوە دەگوازێتەوە بۆ مەدینە، منیش ڕامکرد بۆ (الْخَنْدَمَةَ) (کە کێوێکی ناسراو بوو لە مەککە، ئەشکەوتێکی تێدا بوو) هەشت کەس بە دوامدا هاتن تا گەیشتنە سەر سەرم، میزیان کرد خەریک بوو میزەکەیان بەرم بکەوێ، خوا نابینای کردن لە ئاستمدا، پاشان هاتم بۆ لای هاوەڵەکەم لەگەڵ خۆم بردم، کاتێ گەیشتم بە (الْأَرَاكِ)، (شوێنێک بوو لە نزیک مەککە داری ئەراکی لێ بوو) کەلەپچەکەم لێکردەوە، پاشان هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتم: من عەناق دەخوازم، بێدەنگ بوو، پاشان ئەم ئایەتە دابەزیە خوارەوە: ﴿وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ ۝٣﴾ (واتە: ئافرەتی زیناکار نابێ بیخوازێ مەگەر پیاوی زیناکار یان هاوبەشدانەر)، (پێغەمبەری خوا ﷺ) بانگی کردم بۆی خوێندمەوە و فەرمووی: مارەی مەکە.

**٣٢٢٩-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: إِنَّ عِنْدِي امْرَأَةً، هِيَ مِنْ أَحَبِّ النَّاسِ إِلَيَّ، وَهِيَ لَا تَمْنَعُ يَدَ لَامِسٍ، قَالَ: طَلِّقْهَا، قَالَ: لَا أَصْبِرُ عَنْهَا، قَالَ: اسْتَمْتِعْ بِهَا، قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: هَذَا الْحَدِيثُ لَيْسَ بِثَابِتٍ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: من ژنێکم هەیە ئەو ژنە خۆشەویسترین کەسە لام، بەڵام ئەو بێ دڵی کەس ناکات بۆ کاری خراپ، فەرمووی: (تەڵاقیدە)، وتی: خۆم ڕاناگرم بێ ئەو، فەرمووی: لەزەتی لێوەربگرە، ئەبو عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: ئەم فەرموودە جێگیر نیە.

## بابەت: مارە کردنی ئافرەتی زینکار کەراهەتی هەیە.

**٣٢٣٠-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: تُنْكَحُ النِّسَاءُ لِأَرْبَعَةٍ: لِمَالِهَا، وَلِحَسَبِهَا، وَلِجَمَالِهَا، وَلِدِينِهَا، فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ»[٢].

---

(١) صحيح الإسناد. أخرجه أبو داود: ٢٠٤٩، وضعَّفه النسائي بقوله: هَذَا الْحَدِيثُ لَيْسَ بِثَابِتٍ.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٠٩٠، ومسلم: ١٤٦٦، وأبو داود: ٢٠٤٧، وإبن ماجه: ١٨٥٨.




واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئافرەت لەبەر چوار شت مارە دەکرێ: لەبەر ماڵەکەی و پلەو پایەکەی و جوانیەکەی و ئاینەکەی، هەوڵ بدە ئافرەتی خاوەن ئاینت دەست بکەوێت، دەستەکانت خۆڵاوی بن.

## چ ژنێک چاکترینە

**٣٢٣١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قِيلَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ: أَيُّ النِّسَاءِ خَيْرٌ؟ قَالَ: الَّتِي تَسُرُّهُ إِذَا نَظَرَ، وَتُطِيعُهُ إِذَا أَمَرَ، وَلَا تُخَالِفُهُ فِي نَفْسِهَا وَمَالِهَا بِمَا يَكْرَهُ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، چی ژنێک چاکە؟ فەرمووی: ئەوەی کاتێ دەیبینی دڵت خۆش دەبێ، کاتێ فەرمانی پێکرا گوێڕایەڵی بکات، نە لە دەروون و نە لە ماڵیدا شتێ نەکات مێردەکەی پێی ناخۆش بێت.

## ژنی چاکەخواز و خواناس

**٣٢٣٢-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ الدُّنْيَا كُلَّهَا مَتَاعٌ، وَخَيْرُ مَتَاعِ الدُّنْيَا الْمَرْأَةُ الصَّالِحَةُ»[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دونیا هەمووی چێژو لەزەتە، وە چاکترینی چێژو لەزەتەکانی دونیا ژنێکی چاکە.

## ئافرەتی خاوەن غیرەی زۆر

**٣٢٣٣-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَلَا تَتَزَوَّجُ مِنْ نِسَاءِ الْأَنْصَارِ؟ قَالَ: إِنَّ فِيهِمْ لَغَيْرَةً شَدِيدَةً»[3].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بۆچی ژن لە ئەنصارەکان ناخوازی؟ فەرمووی: ئەوان غیرەیان زۆر زۆرە.

---

(١) حسن صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٦٧، والترمذي: ١٨٥٥.

(٣) صحيح الإسناد.




## ڕێگەدان بە تەماشاکردن پێش خوازبێنی

**٣٢٣٤-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: خَطَبَ رَجُلٌ امْرَأَةً مِنَ الأَنْصَارِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: هَلْ نَظَرْتَ إِلَيْهَا؟ قَالَ: لَا، فَأَمَرَهُ أَنْ يَنْظُرَ إِلَيْهَا»[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێک داوای ئافرەتێکی ئەنصاڕی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئایا تەماشات کرد؟ وتی: نەخێر، فەرمانی پێکرد تەماشای بکات.**

**٣٢٣٥-** «عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ قَالَ: خَطَبْتُ امْرَأَةً عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: أَنَظَرْتَ إِلَيْهَا؟ قُلْتُ: لَا، قَالَ: فَانْظُرْ إِلَيْهَا، فَإِنَّهُ أَجْدَرُ أَنْ يُؤْدَمَ بَيْنَكُمَا»[2].

**واتە: موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ، داوای ئافرەتێکم کرد فەرمووی: ئایا تەماشات کرد؟ وتم: نەخێر، فەرمووی: تەماشای بکە، چونکە ئاوا نزیکترە (گرێنتی زیاتری تیایە) کە خۆشەویستی و بەزەیی لە نێوانتاندا دروست بێت.**

## خوازبێنی لە مانگی شەوالدا

**٣٢٣٦-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: تَزَوَّجَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي شَوَّالٍ، وَأُدْخِلْتُ عَلَيْهِ فِي شَوَّالٍ، وَكَانَتْ عَائِشَةُ تُحِبُّ أَنْ تُدْخِلَ نِسَاءَهَا فِي شَوَّالٍ، فَأَيُّ نِسَائِهِ كَانَتْ أَحْظَى عِنْدَهُ مِنِّي»[3].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مانگی شەوال خوازبێنی کردم، هەر لە شەوالیشدا برام بۆ لای، عائیشە حەزی دەکرد خێزانەکانی لە مانگی شەوالدا ببرێن بۆ لای، جا کام لە خێزانەکانی لای لەمن بەختی باشترە. (مەبەستی ئەوە بووە وەلامی ئەوانەی سەردەمی نەفامی بداتەوە کە پێیان وابووە هاوسەرگیری لە مانگی شەوال کارێکی باش نیە).**

---

(١) صحيح. مسلم: ٥٣٢٩ و ٥٣٣٠.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٠٨٧، وإبن ماجه: ١٨٦٦.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٢٣، والترمذي: ١٠٩٣، وإبن ماجه: ١٩٩٠.




## داواکردنی خوازبێنی

**٣٢٣٧-** «عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتَ قَيْسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، وَكَانَتْ مِنَ الْمُهَاجِرَاتِ الْأُوَلِ، قَالَتْ: خَطَبَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ، فِي نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِ مُحَمَّدٍ ﷺ، وَخَطَبَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى مَوْلَاهُ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ، وَقَدْ كُنْتُ حُدِّثْتُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ أَحَبَّنِي فَلْيُحِبَّ أُسَامَةَ فَلَمَّا كَلَّمَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، قُلْتُ: أَمْرِي بِيَدِكَ، فَانْكِحْنِي مَنْ شِئْتَ، فَقَالَ: انْطَلِقِي إِلَى أُمِّ شَرِيكٍ وَأُمُّ شَرِيكٍ امْرَأَةٌ غَنِيَّةٌ مِنَ الْأَنْصَارِ، عَظِيمَةُ النَّفَقَةِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﷻ، يَنْزِلُ عَلَيْهَا الضِّيفَانُ، فَقُلْتُ: سَأَفْعَلُ، قَالَ: لَا تَفْعَلِي، فَإِنَّ أُمَّ شَرِيكٍ كَثِيرَةُ الضِّيفَانِ، فَإِنِّي أَكْرَهُ أَنْ يَسْقُطَ عَنْكِ خِمَارُكِ، أَوْ يَنْكَشِفَ الثَّوْبُ عَنْ سَاقَيْكِ، فَيَرَى الْقَوْمُ مِنْكِ بَعْضَ مَا تَكْرَهِينَ، وَلَكِنِ انْتَقِلِي إِلَى ابْنِ عَمِّكِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ، وَهُوَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي فِهْرٍ، فَانْتَقَلْتُ إِلَيْهِ»[1].

**واتە: فاطیمەی کچی قەیس ؓ، یەکێک بوو لەوانەی یەکەم جار کۆچی کردبوو، وتی: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف داوای کردم بۆ هەندێ کەس لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ داوای کردم بۆ خزمەتکارەکەی ئوسامەی کوڕی زەید، پێشتر بۆم باسکرابوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس منی خۆش دەوێ با ئوسامەی خۆش بوێ، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ قسەی لەگەڵ کردم، وتم: بڕیاری من بە دەستی تۆیە، کێت پێ چاکە لەو مارەم بکە، فەرمووی: بڕۆ بۆ لای دایکی شەریک چونکە ئافرەتێکی دەوڵەمەندی ناو ئەنصارەکانە لە پێناوی خوادا زۆر دەبەخشێ، مێوانیش زۆر دێن بۆ لای، وتم: ئەوە دەکەم، فەرمووی: نا ئەوە مەکە، چونکە دایکی شەریک میوانی زۆرە، من پێم باش نیە لە ئیشو کاری ڕۆژانەی ناو ماڵ هەندێ لە دەست و قاچت دەربکەوێ و خەڵکیش هەندێ شت ببینن تۆ پێت ناخۆش بێت، بەڵام بڕۆ بۆ لای ئامۆزاکەت عەبدوڵڵای کوڕی ئوم مەکتوم، ئەو پیاوێکە لە نەوەکانی فیهر، منیش ڕۆیشتم بۆ لای.**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١١٩ و ٢٩٤٢/١٢٢، وأبو داود: ٢٢٨٨ و ٤٣٢٦ و ٤٣٢٧، والترمذي: ١١٨٠ و ٢٢٥٣، وإبن ماجه: ٢٠٢٤ و ٢٠٣٦ و ٤٠٧٤.

## قەدەغەکردن لەوەی پیاو داوای ژن بکات بەسەر داواکردنی براکەیدا

**٣٢٣٨-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَا يَخْطُبُ أَحَدُكُمْ عَلَى خِطْبَةِ بَعْضٍ»(١).

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: با یەکێک لە ئێوە داوای ژن نەکات بەسەر داوای کەسێکی تر.**

**٣٢٣٩-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تَنَاجَشُوا، وَلَا يَبِعْ حَاضِرٌ لِبَادٍ، وَلَا يَبِعِ الرَّجُلُ عَلَى بَيْعِ أَخِيهِ، وَلَا يَخْطُبْ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ، وَلَا تَسْأَلِ الْمَرْأَةُ طَلَاقَ أُخْتِهَا لِتَكْتَفِئَ مَا فِي إِنَائِهَا»(٢).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زەمکاری مەکەن (واتە: کەسێکی تر بەبێ ئەوەی نیازی کڕینی هەبێت نرخی ماڵەکە بەرز بکاتەوە) وە با هەندێکتان مامەڵە بەسەر مامەڵەی هەندێکتان نەکات، وە با داخوازی ژن نەکات بەسەر داخوازی براکەیەوە، وە با ئافرەت داوای ئەوە نەکات خوشکە مسوڵمانەکەی تەڵاق بدرێ و خۆی بچێتە جێگاکەی.**

**٣٢٤٠-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: لَا يَخْطُبْ أَحَدُكُمْ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ»(٣).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: با هیچ یەکێک لە ئێوە داوای ژن نەکات بەسەر داوای براکەیەوە.**

**٣٢٤١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا يَخْطُبْ أَحَدُكُمْ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ، حَتَّى يَنْكِحَ أَوْ يَتْرُكَ»(٤).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: با هیچ یەکێک لە ئێوە داوای ژن نەکات بەسەر داوای براکەیەوە، تا دەیخوازێ یان وازی لێدێنێ.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥١٤٢، ومسلم: ٤٩ و ١٤١٢/٥٠، وأبو داود: ٢٠١٨، والترمذي: ١٢٩٢، وإبن ماجه: ١٨٦٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٤٠ و ٢٧٢٣، ومسلم: ٥١ و ١٤١٣/٥٥، وأبو داود: ٢٠٨٠ و ٣٤٣٨، والترمذي: ١١٣٤ و ١١٩٠ و ١٢٢٢ و ١٣٠٤، وإبن ماجه: ١٨٦٧ و ٢١٧٢ و ٢١٧٤ و ٢١٧٥.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥١٤٤.

(٤) صحيح.

**٣٢٤٢-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَا يَخْطُبْ أَحَدُكُمْ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ»[1].

**واتە: : ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: با هیچ یەکێک لە ئێوە داوای ژن نەکات بەسەر داوای براکەیەوە، تا دەیخوازێ یان وازی لێدێنێ.**

## داواکردنی پیاو ئەگەر داواکار وازی لێ هێنا یان مۆڵەتی پێدا

**٣٢٤٣-** «عن عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، كَانَ يَقُولُ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَبِيعَ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ، وَلَا يَخْطُبُ الرَّجُلُ عَلَى خِطْبَةِ الرَّجُلِ، حَتَّى يَتْرُكَ الْخَاطِبُ قَبْلَهُ، أَوْ يَأْذَنَ لَهُ الْخَاطِبُ»[2].

**واتە: عەبدوڵلای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە هەندێکتان مامەڵە لەسەر مامەڵەی هەندێکتان بکات، وە با هیچ کەس داوای ژن نەکات بەسەر داوای کەسێکی ترەوە، تا داواکارەکەی پێشەوە وازی لێ دێنێ یان داواکارەکە مۆڵەتی پێدەدا.**

**٣٢٤٤-** «عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتَ قَيْسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: طَلَّقَنِي زَوْجِي ثَلَاثاً، فَكَانَ يَرْزُقُنِي طَعَاماً فِيهِ شَيْءٌ، فَقُلْتُ: وَاللَّهِ لَئِنْ كَانَتْ لِي النَّفَقَةُ وَالسُّكْنَى لَأَطْلُبَنَّهَا وَلَا أَقْبَلُ هَذَا، فَقَالَ الْوَكِيلُ: لَيْسَ لَكِ سُكْنَى وَلَا نَفَقَةٌ، قَالَتْ: فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: لَيْسَ لَكِ سُكْنَى وَلَا نَفَقَةٌ، فَاعْتَدِّي عِنْدَ فُلَانَةَ، قَالَتْ: وَكَانَ يَأْتِيهَا أَصْحَابُهُ، ثُمَّ قَالَ: اعْتَدِّي عِنْدَ ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ فَإِنَّهُ أَعْمَى، فَإِذَا حَلَلْتِ فَآذِنِينِي، قَالَتْ: فَلَمَّا حَلَلْتُ آذَنْتُهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: وَمَنْ خَطَبَكِ؟ فَقُلْتُ: مُعَاوِيَةُ وَرَجُلٌ آخَرُ مِنْ قُرَيْشٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: أَمَّا مُعَاوِيَةُ، فَإِنَّهُ غُلَامٌ مِنْ غِلْمَانِ قُرَيْشٍ، لَا شَيْءَ لَهُ، وَأَمَّا الْآخَرُ، فَإِنَّهُ صَاحِبُ شَرٍّ لَا خَيْرَ فِيهِ، وَلَكِنْ انْكِحِي أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ، قَالَتْ: فَكَرِهْتُهُ، فَقَالَ لَهَا ذَلِكَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، فَنَكَحَتْهُ»[3].

**واتە: فاطیمەی کچی قەیس ﷺ، دەڵێ: مێردەکەم سێ بە سێ تەڵاقیدام، خواردنێکی پێدەدام پیس بوو، وتم: سوێند بە خوا ئەگەر نەفەقە و شوێنی نیشتەجێ**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٠٨/٣٨، والترمذي: ١١٢٥، وإبن ماجه: ١٩٢٩.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٣٦ و ١٤٨٠/٤٠، وأبو داود: ٢٢٧٤ و ٢٢٨٥ و ٢٢٨٦ و ٢٢٨٧ و ٢٢٨٩.

بوونم بۆ هەبێت داوای دەکەم و ئەمە قبوڵ ناکەم، وەکیلەکەی وتی: نە شوێنی نیشتەجێبونت بۆ هەیە نە نەفقە، وتی: هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئەوەم بۆی گێڕایەوە، فەرمووی: نە شوێنی نیشتەجێ بوونت بۆ هەیە نە نەفقە، لای فڵانەکەس عیدەکەت تەواو بکە، وتی: ئەو ئافرەتە میوانی زۆری هەبوو، پاشان فەرمووی: لای کوڕەکەی ئوم مەکتوم عیدەکەت تەواو بکە، چونکە ئەو نابینایە، کاتێ عیدەت تەواو بوو ئاگادارم بکەرەوە، وتی: کاتێ عیدەم تەواو بوو ئاگادارم کردەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کێ داواتی کرد؟ وتم: موعاویەو پیاوێکی تر لە قورەیش، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: موعاویە منداڵێکە لە منداڵەکانی قورەیش هیچی نیە، ئەوی تریش هاوسەرێکی خراپەو خێری تێدانیە، بەڵام شوو بکە بە ئوسامەی کوڕی زەید وتی: حەزم نەکرد، سێ جار ئەوەی پێم فەرموو، ئەویش شووی پێکرد.

## بابەت: ئەگەر ئافرەتێک ڕاوێژی بە پیاوێک کرد لە بارەی ئەو کەسەی مارەی دەکات ئایا ئەوەی دەیزانێ دەربارەی هەواڵی بداتێ؟

**٣٢٤٥-** «عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّ أَبَا عَمْرِو بْنَ حَفْصٍ طَلَّقَهَا الْبَتَّةَ وَهُوَ غَائِبٌ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهَا وَكِيلُهُ بِشَعِيرٍ، فَسَخِطَتْهُ، فَقَالَ: وَاللَّهِ مَا لَكِ عَلَيْنَا مِنْ شَيْءٍ، فَجَاءَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: لَيْسَ لَكِ نَفَقَةٌ، فَأَمَرَهَا أَنْ تَعْتَدَّ فِي بَيْتِ أُمِّ شَرِيكٍ، ثُمَّ قَالَ: تِلْكَ امْرَأَةٌ يَغْشَاهَا أَصْحَابِي، فَاعْتَدِّي عِنْدَ ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ، فَإِنَّهُ رَجُلٌ أَعْمَى، تَضَعِينَ ثِيَابَكِ، فَإِذَا حَلَلْتِ فَآذِنِينِي، قَالَتْ: فَلَمَّا حَلَلْتُ، ذَكَرْتُ لَهُ أَنَّ مُعَاوِيَةَ بْنَ أَبِي سُفْيَانَ وَأَبَا جَهْمٍ خَطَبَانِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَمَّا أَبُو جَهْمٍ، فَلَا يَضَعُ عَصَاهُ عَنْ عَاتِقِهِ، وَأَمَّا مُعَاوِيَةُ فَصُعْلُوكٌ لَا مَالَ لَهُ، وَلَكِنْ انْكِحِي أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ، فَكَرِهْتُهُ، ثُمَّ قَالَ: انْكِحِي أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ، فَنَكَحْتُهُ، فَجَعَلَ اللَّهُ ﷻ فِيهِ خَيْراً، وَاغْتَبَطْتُ بِهِ»[1].

واتە: فاطیمەی کچی قەیس ﵂ دەگێڕێتەوە: باوکی عەمڕی کوڕی حەفص سێ بە سێ تەڵاقیدا خۆشی لەوێ نەبوو، بە وەکیلەکەی هەندێ جۆی بۆی نارد، پێی ناخۆش بوو، وتی: سوێند بە خوا هیچ مەسرفێکت لەسەر ئێمە نیە، پاشات هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی بۆی باس کرد، فەرمووی: بەخێوکردنت لەسەر ئەو نیە، فەرمانی پێکرد لە ماڵی ئوم و شەریک بمێنێتەوە، پاشان فەرمووی: ئەوە

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٨٠.

ئافرەتێکە هاوەڵەکانم میوانی زۆر دێت، لای کوڕی ئوم مەکتوم بمێنەوە، چونکە ئەو پیاوێکی نابینایە، دەتوانی خۆشت بگۆڕی و جلەکانت دانێیت، کاتێ عیدەت تەواو بوو ئاگادارم بکەرەوە، وتی کاتێک عیدەم تەواو بوو پێم وت: موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان و ئەبو جەهم داوایان کردووم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەبو جەهم بەردەوام دارەکەی لەسەر شانیەتی (واتە: ژن فەلاقە دەکات) موعاویەیش پیاوێکی هەژارەو ماڵی نیە، شوو بکە بە ئوسامەی کوڕی زەید، دەڵێ: پێم ناخۆش بوو، پاشان فەرمووی: شوو بکە بە ئوسامەی کوڕی زەید، دەڵێ: شووم پێکرد خوا ﷻ خێرێکی زۆری کردە نێوانمانەوە، زۆر دڵخۆش بووم پێی.

## ئەگەر پیاوێک ڕاوێژی بە پیاوێک کرد لە بارەی ژنێکەوە، ئایا ئەوەی دەیزانێ دەربارەی بۆی باسی بکات؟

**٣٢٤٦-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: إِنِّي تَزَوَّجْتُ امْرَأَةً، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: أَلَا نَظَرْتَ إِلَيْهَا، فَإِنَّ فِي أَعْيُنِ الْأَنْصَارِ شَيْئاً، قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: وَجَدْتُ هَذَا الْحَدِيثَ فِي مَوْضِعٍ آخَرَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ كَيْسَانَ، أَنَّ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ حَدَّثَ، وَالصَّوَابُ أَبُو هُرَيْرَةَ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێک لە ئەنصارەکان هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: من ژنێکم مارە کردوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا تەماشات نەکرد، چونکە لە چاوی ئەنصارەکاندا شتێ هەیە، (کە سروشتی مرۆڤ لێی ڕا دەکات)، ئەبو عەبدوڕڕەحمان وتی: ئەم فەرموودەم لە شوێنێکی تر بینیوە، لە زەیدی کوڕی کەیسان، جابری کوڕی عەبدوڵڵا باسی کردوە، ئەوەی ڕاست و دروستە فەرموودەکەی ئەبو هورەیرە.

**٣٢٤٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَجُلاً أَرَادَ أَنْ يَتَزَوَّجَ امْرَأَةً، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: انْظُرْ إِلَيْهَا، فَإِنَّ فِي أَعْيُنِ الْأَنْصَارِ شَيْئاً»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پیاوێک ویستی ژنێک مارە بکات پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: تەماشای بکە، چونکە لە چاوی ئەنصارەکاندا شتێ هەیە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٥٣٢٩ و ٥٣٣٠.




## بابەت: پیاو كچەكەی بخاتە ڕوو بۆ ئەوەی كەسێك بیخوازێت

**٣٢٤٨-** «عَنْ عُمَرَ ﷺ قَالَ: تَأَيَّمَتْ حَفْصَةُ بِنْتُ عُمَرَ مِنْ خُنَيْسٍ يَعْنِي ابْنَ حُذَافَةَ، وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، مِمَّنْ شَهِدَ بَدْراً، فَتُوُفِّيَ بِالْمَدِينَةِ، فَلَقِيتُ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ فَعَرَضْتُ عَلَيْهِ حَفْصَةَ، فَقُلْتُ: إِنْ شِئْتَ أَنْكَحْتُكَ حَفْصَةَ، فَقَالَ: سَأَنْظُرُ فِي ذَلِكَ، فَلَبِثْتُ لَيَالِيَ فَلَقِيتُهُ، فَقَالَ: مَا أُرِيدُ أَنْ أَتَزَوَّجَ يَوْمِي هَذَا، قَالَ عُمَرُ: فَلَقِيتُ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ، رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فَقُلْتُ: إِنْ شِئْتَ أَنْكَحْتُكَ حَفْصَةَ، فَلَمْ يَرْجِعْ إِلَيَّ شَيْئاً، فَكُنْتُ عَلَيْهِ أَوْجَدَ مِنِّي عَلَى عُثْمَانَ ﷺ، فَلَبِثْتُ لَيَالِيَ، فَخَطَبَهَا إِلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَأَنْكَحْتُهَا إِيَّاهُ، فَلَقِيَنِي أَبُو بَكْرٍ فَقَالَ: لَعَلَّكَ وَجَدْتَ عَلَيَّ حِينَ عَرَضْتَ عَلَيَّ حَفْصَةَ، فَلَمْ أَرْجِعْ إِلَيْكَ شَيْئاً، قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: فَإِنَّهُ لَمْ يَمْنَعْنِي حِينَ عَرَضْتَ عَلَيَّ أَنْ أَرْجِعَ إِلَيْكَ شَيْئاً، إِلَّا أَنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَذْكُرُهَا، وَلَمْ أَكُنْ لِأُفْشِيَ سِرَّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَلَوْ تَرَكَهَا نَكَحْتُهَا»[1].

**واتە: عومەر ﷺ دەڵێ: حەفصەی كچی عومەر بێوەژن كەوت لە خونەیسی كوڕی حوزافە، لە هاوەڵانی پێغەمبەر بوو، بەشداری جەنگی بەدری كردبوو لە مەدینە كۆچی دوایی كرد، گەیشتم بە عوسمانی كوڕی عەفان، حەفصەم بۆی پێشنیار كرد، وتم: ئەگەر دەتەوێ حەفصەت لێ مارە دەكەم، وتی: بیرێكی لێ دەكەمەوە، چەند شەوێكی پێچوو پاشان وتی پێم باشە جارێ ژن نەهێنم، پاشان گەیشتم بە ئەبو بەكر وتم: ئەگەر دەتەوێ حەفصەت لێ مارە دەكەم، بێدەنگ بوو هیچ وەڵامی نەدامەوە، ئەوە لە هەڵوێستەكەی عوسمان ﷺ زیاتر دڵگرانی كردم، چەند شەوێكی پێچوو، پێغەمبەری خوا ﷺ داوای خوازبێنی لێ كردم، ئیتر لەوم مارەكرد، ئەبو بەكر پێم گەیشت وتی: وابزانم شتێك لە دڵتدا دروست بوو كاتێ باسی حەفصەت بۆ كردم منیش وەڵامم نەدایەوە، لە ڕاستیدا لەبەرئەوە وەڵامم نەدایەوە گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو باسی كرد، حەزم نەكرد نهێنی پێغەمبەری خوا ﷺ بڵاو بكەمەوە، ئەگەر مارەی نەكردایە من مارەم دەكرد.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٠٠٥ و ٥١٢٢ و ٥١٢٩ و ٥١٤٥.




## بابەت: ئافرەت خۆی پیشان بدات بۆ ئەو کەسەی دێتە داوای

**٣٢٤٩-** «عَنْ ثَابِتٍ الْبُنَانِيِّ يَقُولُ: كُنْتُ عِنْدَ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، وَعِنْدَهُ ابْنَةٌ لَهُ، فَقَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَعَرَضَتْ عَلَيْهِ نَفْسَهَا، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَلَكَ فِيَّ حَاجَةٌ»[١].

**واتە: ثابتی بونانی دەڵێ: من لای ئەنەس ﷺ بووم، کچێکی خۆی لەلای بوو، وتی: ئافرەتێک هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی خستە ڕوو وتی: ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ، پێویستیت بە من هەیە.**

**٣٢٥٠-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ: أَنَّ امْرَأَةً عَرَضَتْ نَفْسَهَا عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَضَحِكَتِ ابْنَةُ أَنَسٍ، فَقَالَتْ: مَا كَانَ أَقَلَّ حَيَاءَهَا فَقَالَ أَنَسٌ: هِيَ خَيْرٌ مِنْكِ، عَرَضَتْ نَفْسَهَا عَلَى النَّبِيِّ ﷺ»[٢].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە، ئافرەتێک خۆی خستە ڕوو بۆ پێغەمبەر ﷺ کچەکەی ئەنەس پێکەنی و وتی: ئای کە چەندە بێ شەرمە، ئەنەس وتی: ئەوە لە تۆ چاکترە، خۆی خستوەتە ڕوو بۆ پێغەمبەر ﷺ.**

## ئافرەت کاتێ داواکرا نوێژی ئیستیخارە بکات

**٣٢٥١-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا انْقَضَتْ عِدَّةُ زَيْنَبَ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِزَيْدٍ: اذْكُرْهَا عَلَيَّ، قَالَ زَيْدٌ: فَانْطَلَقْتُ، فَقُلْتُ: يَا زَيْنَبُ أَبْشِرِي، أَرْسَلَنِي إِلَيْكِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَذْكُرُكِ، فَقَالَتْ: مَا أَنَا بِصَانِعَةٍ شَيْئاً حَتَّى أَسْتَأْمِرَ رَبِّي، فَقَامَتْ إِلَى مَسْجِدِهَا، وَنَزَلَ الْقُرْآنُ، وَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَدَخَلَ بِغَيْرِ أَمْرٍ»[٣].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: کاتێ عیدەی زەینەب تەواو بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ بە زەیدی فەرموو: باسی منی لەلا بکات، زەید وتی: ڕۆیشتم بۆ لای وتم: ئەی زەینەب مژدەم بدەرێ، پێغەمبەری خوا ﷺ منی ناردوە بۆ لات باسی تۆی کردوە، وتی: من هیچ ناکەم تا داوای فەرمان لە پەروەردگارم دەکەم، هەڵسا ڕۆیشت بۆ لای شوێنی سوژدەکەی، قورئان دابەزی، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژورەوە بە بێ مۆڵەت.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥١٢٠ و ٦١٢٣، وابن ماجه: ٢٠٠١.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٢٨.




**٣٢٥٢-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ يَقُولُ: كَانَتْ زَيْنَبُ بِنْتُ جَحْشٍ تَفْخَرُ عَلَى نِسَاءِ النَّبِيِّ ﷺ تَقُولُ: إِنَّ اللَّهَ ﷻ أَنْكَحَنِي مِنَ السَّمَاءِ، وَفِيهَا نَزَلَتْ آيَةُ الْحِجَابِ»[١].

**واتە: ئەنەسی کوری مالیک ﷺ دەڵێ: زەینەب شانازی دەکرد بەسەر خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ دەیوت: بێگومان خوا ﷻ لە ئاسمانەوە منی مارەکردوە، (دەشیگوت:) ئایەتی حیجابیش لە بارەی ئەوەوە دابەزی.**

## چۆنیەتی ئیستیخارە کردن

**٣٢٥٣-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُعَلِّمُنَا الاِسْتِخَارَةَ فِي الْأُمُورِ كُلِّهَا كَمَا يُعَلِّمُنَا السُّورَةَ مِنَ الْقُرْآنِ، يَقُولُ: إِذَا هَمَّ أَحَدُكُمْ بِالْأَمْرِ، فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ مِنْ غَيْرِ الْفَرِيضَةِ، ثُمَّ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْتَخِيرُكَ بِعِلْمِكَ، وَأَسْتَعِينُكَ بِقُدْرَتِكَ، وَأَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ الْعَظِيمِ، فَإِنَّكَ تَقْدِرُ وَلَا أَقْدِرُ، وَتَعْلَمُ وَلَا أَعْلَمُ، وَأَنْتَ عَلَّامُ الْغُيُوبِ، اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الْأَمْرَ خَيْرٌ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي، أَوْ قَالَ: فِي عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ، فَاقْدِرْهُ لِي، وَيَسِّرْهُ لِي، ثُمَّ بَارِكْ لِي فِيهِ، وَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الْأَمْرَ شَرٌّ لِي فِي دِينِي، وَمَعَاشِي، وَعَاقِبَةِ أَمْرِي، أَوْ قَالَ: فِي عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ ، فَاصْرِفْهُ عَنِّي، وَاصْرِفْنِي عَنْهُ، وَاقْدُرْ لِي الْخَيْرَ حَيْثُ كَانَ، ثُمَّ أَرْضِنِي بِهِ، قَالَ: وَيُسَمِّي حَاجَتَهُ»[٢].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵلا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ئیستیخارەی فێر دەکردین لە هەموو کاروبارەکانماندا، وەکو چۆن سووڕەتێکی فێردەکردین، جا دەیفەرموو: ئەگەر کەسێک لە ئێوە ویستی کارێک بکات با دوو ڕکات نوێژ بکات جگە لە فەرزەکان، پاشان با بپاڕێتەوەو بڵێ: خوایە من بە زانستی خۆت داوای خێرو چاکەت لێ دەکەم و داوای توانات لێ دەکەم بە توانای خۆت، وە لە فەزلی گەورەت داوات لێ دەکەم، بەڕاستی تۆ دەتوانی و من ناتوانم و تۆ زانایت و من نەزانم و تۆ زانای نهێنی و پەنهانەکانی، خوایە ئەگەر ئەم مەسەلەیە چاکە و خێری تیایە بۆ دین و ژیان و کۆتایی تەمەنم، یان ئێستاو کۆتاییم، ئەوە خوایە بە نسیبم بکەیت و ئاسانی بکەیت لەسەرم و بەرەکەتی تێبخە




بۆم، وە ئەگەر ئەم کارە خراپە بۆ دین و بژێوی کۆتایی تەمەنم، یان ئێستاو کۆتایی، ئەوە خوایە لێم دووربخەرەوەو منیش لەو دووربخەرەوە و خێرو چاکەم بە نسیب بکە لە هەر شوێنێکەو، پاشان دەروونم ڕازی بکە پێی، وتی: وە ناوی کارەکەی دەهێنا.

## بەشوودانی دایک لە لایەن کوڕەوە

**٣٢٥٤-** «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، لَمَّا انْقَضَتْ عِدَّتُهَا، بَعَثَ إِلَيْهَا أَبُو بَكْرٍ يَخْطُبُهَا عَلَيْهِ، فَلَمْ تَزَوَّجْهُ، فَبَعَثَ إِلَيْهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ يَخْطُبُهَا عَلَيْهِ، فَقَالَتْ: أَخْبِرْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَنِّي امْرَأَةٌ غَيْرَى، وَأَنِّي امْرَأَةٌ مُصْبِيَةٌ، وَلَيْسَ أَحَدٌ مِنْ أَوْلِيَائِي شَاهِدٌ، فَأَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: ارْجِعْ إِلَيْهَا فَقُلْ لَهَا: أَمَّا قَوْلُكِ إِنِّي امْرَأَةٌ غَيْرَى، فَسَأَدْعُو اللَّهَ لَكِ فَيُذْهِبُ غَيْرَتَكِ، وَأَمَّا قَوْلُكِ إِنِّي امْرَأَةٌ مُصْبِيَةٌ، فَسَتُكْفَيْنَ صِبْيَانَكِ، وَأَمَّا قَوْلُكِ أَنْ لَيْسَ أَحَدٌ مِنْ أَوْلِيَائِي شَاهِدٌ، فَلَيْسَ أَحَدٌ مِنْ أَوْلِيَائِكِ شَاهِدٌ وَلَا غَائِبٌ يَكْرَهُ ذَلِكَ، فَقَالَتْ لِابْنِهَا: يَا عُمَرُ، قُمْ فَزَوِّجْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَزَوَّجَهُ، مُخْتَصَرٌ»[1].

واتە: ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: کاتێ عیدەکەی تەواو بوو، ئەبو بەکر ناردی بۆ داواکردنی، شووی پێنەکرد، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ عومەری نارد بۆ داواکردنی، وتی: هەواڵ بدە بە پێغەمبەری خوا ﷺ ئافرەتێکم غیرەم زۆرە، هەروەها من ئافرەتێکم لێم قەوماوە کەسێک نیە لە کەسوکارەکەم ئامادە بێت، عومەر گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی بۆی باس کرد، فەرمووی: بگەڕێرەوە بۆ لای و پێی بڵێ: ئەوەی کە دەیڵێی من ئافرەتێکم غیرەم زۆرە نزات بۆ دەکەم خوا لای ببات، ئەوەشی کە دەیڵێی کەسێک نیە لە کەسوکارەکەم ئامادە بێت، هیچ یەکێک لە کەسوکارەت ئەوەی ئامادەیەو ئەوەشی ئامادە نیە ناڕازی نین و پێیان ناخۆش نیە، ئوممو سەلەمە بە کوڕەکەی وت: ئەی عومەر، هەڵسە مارەی بکە لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش مارەی کرد.

---

(١) ضعيف.

## بەشووودانی کچی بچوک لە لایەن باوکەوە

**٣٢٥٥-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، تَزَوَّجَهَا وَهِيَ بِنْتُ سِتٍّ، وَبَنَى بِهَا وَهِيَ بِنْتُ تِسْعٍ»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەش ساڵان مارەی کرد، وە لە نۆ ساڵان گواستیەوە.**

**٣٢٥٦-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَتْ: تَزَوَّجَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِسَبْعِ سِنِينَ، وَدَخَلَ عَلَيَّ لِتِسْعِ سِنِينَ»[٢].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەوت ساڵان مارەی کردم، لە نۆ ساڵانیش گواستمیەوە.**

**٣٢٥٧-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: تَزَوَّجَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِتِسْعِ سِنِينَ وَصَحِبْتُهُ تِسْعاً»[٣].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نۆ ساڵان گواستمیەوەو نۆ ساڵیش لەگەڵی بووم.**

**٣٢٥٨-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، تَزَوَّجَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَهِيَ بِنْتُ تِسْعٍ، وَمَاتَ عَنْهَا وَهِيَ بِنْتُ ثَمَانِيَ عَشْرَةَ»[٤].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ گواستیەوە تەمەنی نۆ ساڵ بوو، وە کۆچی دوایی کرد تەمەنی هەژدە ساڵ بوو.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٨٩٤ و ٣٨٩٦ و ٥١٣٣ و ٥١٣٤ و ٥١٥٦ و ٥١٥٨ و ٥١٦٠، ومسلم: ٦٩ و ١٤٢٢/٧٢، وأبو داود: ٤٩٣٣ و ٤٩٣٤ و ٤٩٣٥ و ٤٩٣٦، وإبن ماجه: ١٨٧٦.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح لغيره.

(٤) صحيح.





## بە شوودانی کچی گەورە لە لایەن باوکەوە

**٣٢٥٩-** «عَنْ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: تَأَيَّمَتْ حَفْصَةُ بِنْتُ عُمَرَ مِنْ خُنَيْسِ بْنِ حُذَافَةَ السَّهْمِيِّ، وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَتُوُفِّيَ بِالْمَدِينَةِ، قَالَ عُمَرُ: فَأَتَيْتُ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّان فَعَرَضْتُ عَلَيْهِ حَفْصَةَ بِنْتَ عُمَرَ، قَالَ: قُلْتُ: إِنْ شِئْتَ أَنْكَحْتُكَ حَفْصَةَ، قَالَ: سَأَنْظُرُ فِي أَمْرِي، فَلَبِثْتُ لَيَالِيَ ثُمَّ لَقِيَنِي، فَقَالَ: قَدْ بَدَا لِي أَنْ لَا أَتَزَوَّجَ يَوْمِي هَذَا، قَالَ عُمَرُ: فَلَقِيتُ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ، فَقُلْتُ: إِنْ شِئْتَ زَوَّجْتُكَ حَفْصَةَ بِنْتَ عُمَرَ، فَصَمَتَ أَبُو بَكْرٍ فَلَمْ يَرْجِعْ إِلَيَّ شَيْئاً، فَكُنْتُ عَلَيْهِ أَوْجَدَ مِنِّي عَلَى عُثْمَانَ، فَلَبِثْتُ لَيَالِيَ، ثُمَّ، خَطَبَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَأَنْكَحْتُهَا إِيَّاهُ فَلَقِيَنِي أَبُو بَكْرٍ فَقَالَ: لَعَلَّكَ وَجَدْتَ عَلَيَّ حِينَ عَرَضْتَ عَلَيَّ حَفْصَةَ فَلَمْ أَرْجِعْ إِلَيْكَ شَيْئاً، قَالَ عُمَرُ: قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: فَإِنَّهُ لَمْ يَمْنَعْنِي أَنْ أَرْجِعَ إِلَيْكَ شَيْئاً فِيمَا عَرَضْتَ عَلَيَّ، إِلَّا أَنِّي قَدْ كُنْتُ عَلِمْتُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَدْ ذَكَرَهَا، وَلَمْ أَكُنْ لِأُفْشِيَ سِرَّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَلَوْ تَرَكَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَبِلْتُهَا»[١].

واتە: عومەر کوڕی خەطاب ﷺ دەڵێ: حەفصەی کچی عومەر بێوەژن کەوت لە خونەیسی کوڕی حوزافەی سەهمی، یەکێک بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەر، لە مەدینە کۆچی دوایی کرد، عومەر وتی: هاتم بۆ لای عوسمانی کوڕی عەففان، حەفصەم بۆی پێشنیار کرد، وتم: ئەگەر دەتەوێ حەفصەت لێ مارە دەکەم، وتی: بیرێکی لێ دەکەمەوە، چەند شەوێکی پێچوو پاشان وتی: پێم باشە جارێ ژن نەهێنم، پاشان گەیشتم بە ئەبو بەکر وتم: ئەگەر دەتەوێ حەفصەت لێ مارە دەکەم، بێدەنگ بوو هیچ وەڵامی نەدامەوە، ئەوە لە هەڵوێستەکەی عوسمان زیاتر دڵگرانی کردم، چەند شەوێکی پێچوو، پێغەمبەری خوا ﷺ داوای خوازبێنی لێکردم، ئیتر لەوم مارە کرد، دواتر ئەبو بەکر پێم گەیشت وتی: وابزانم شتێک لە دڵتدا دروست بوو کاتێ باسی حەفصەت بۆ کردم منیش وەڵامم نەدایەوە، لەڕاستیدا لەبەر ئەوە وەڵامم نەدایەوە بەدڵنیایی زانیم پێغەمبەری خوا ﷺ باسی کرد، حەزم نەکرد نهێنی پێغەمبەری خوا ﷺ بڵاو بکەمەوە، ئەگەر مارەی نەکردایە من مارەم دەکرد.

---

(١) صحيح.

## مۆڵەت وەرگرتن لە کچ بە مەبەستی هاوسەرگیری

**٣٢٦٠-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: الْأَيِّمُ أَحَقُّ بِنَفْسِهَا مِنْ وَلِيِّهَا، وَالْبِكْرُ تُسْتَأْذَنُ فِي نَفْسِهَا، وَإِذْنُهَا صُمَاتُهَا»(١).

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێوەژن خۆی لە پێشترە بە فەرمان وەرگرتن لە سەرپەرشتیارەکەی، وە کچیش مۆڵەتی لێ وەردەگیرێ، مۆڵەت لێ وەرگرتنیشی بێ دەنگ بوونێتی.**

**٣٢٦١-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: الْأَيِّمُ أَحَقُّ بِنَفْسِهَا مِنْ وَلِيِّهَا، وَالْيَتِيمَةُ تُسْتَأْمَرُ، وَإِذْنُهَا صُمَاتُهَا»(٢).

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێوەژن خۆی لە پێشترە بە فەرمان وەرگرتن لە سەرپەرشتیارەکەی، وە کچی هەتیویش فەرمانی لێ وەردەگیرێ، فەرمان لێ وەرگرتنیشی بێ دەنگ بوونێتی.**

**٣٢٦٢-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: الْأَيِّمُ أَوْلَى بِأَمْرِهَا، وَالْيَتِيمَةُ تُسْتَأْمَرُ فِي نَفْسِهَا، وَإِذْنُهَا صُمَاتُهَا»(٣).

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێوەژن لە پێشترە لە فەرمان لێ وەرگرتندا، وە کچی هەتیویش فەرمانی لێ وەردەگیرێ، فەرمان لێ وەرگرتنیشی بێ دەنگ بوونێتی.**

**٣٢٦٣-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَيْسَ لِلْوَلِيِّ مَعَ الثَّيِّبِ أَمْرٌ، وَالْيَتِيمَةُ تُسْتَأْمَرُ، فَصَمْتُهَا إِقْرَارُهَا»(٤).

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: سەرپەرشتیار ناتوانێ فەرمان بکات بەسەر بێوەژندا، وە کچی هەتیویش فەرمانی لێ وەردەگیرێ، بێ دەنگ بوونی بڕیاردانێتی.**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٦٦ و ١٤٢١/٦٨، وأبو داود: ٢٠٩٨ و ٢٠٩٩ و ٢١٠٠، والترمذي: ١١٠٨، وإبن ماجه: ١٨٧٠.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




## مۆڵەت وەرگرتنی باوک لە کچەکەی بە مەبەستی هاوسەرگیری

**٣٢٦٤-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: الثَّيِّبُ أَحَقُّ بِنَفْسِهَا، وَالْبِكْرُ يَسْتَأْمِرُهَا أَبُوهَا، وَإِذْنُهَا صُمَاتُهَا»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێوەژن خۆی لە پێشترە لە سەرپەرشتیارەکەی، وە کچیش باوکی مۆڵەتی لێ وەردەگرێ، وە مۆڵەتدانیشی بێ دەنگ بوونێتی.

## مۆڵەت وەرگرتن لە بێوەژن بە مەبەستی هاوسەرگیری

**٣٢٦٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا تُنْكَحُ الثَّيِّبُ حَتَّى تُسْتَأْذَنَ، وَلَا تُنْكَحُ الْبِكْرُ حَتَّى تُسْتَأْمَرَ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ إِذْنُهَا؟ قَالَ: إِذْنُهَا أَنْ تَسْكُتَ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێوەژن مارە ناکرێ تا فەرمانی لێ وەرنەگیرێ، کچیش مارە ناکرێ تا مۆڵەتی لێ وەرنەگیرێ، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەت لێ وەرگرتنی چۆنە؟ فەرمووی: ئەوەیە کە بێ دەنگ بێت.

## مۆڵەت وەرگرتن لە بێوەژن

**٣٢٦٦-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: اسْتَأْمِرُوا النِّسَاءَ فِي أَبْضَاعِهِنَّ، قِيلَ: فَإِنَّ الْبِكْرَ تَسْتَحِي وَتَسْكُتُ، قَالَ: هُوَ إِذْنُهَا»[٣].

واتە: عائیشە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: مۆڵەت لە ئافرەتان وەربگرن لە خودی خۆیاندا، وترا: بێگومان کچ شەرم دەکات و بێ دەنگ دەبێت، فەرمووی: ئەوە مۆڵەت دانیەتی.

---

(١) صحيح لكن قوله: «أَبُوهَا» غير محفوظ.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥١٣٧ و ٦٩٤٦ و ٦٩٧١، ومسلم: ١٤٢٠، وأبو داود: ٢٠٩٤.





**٣٢٦٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا تُنْكَحُ الْأَيِّمُ حَتَّى تُسْتَأْمَرَ، وَلَا تُنْكَحُ الْبِكْرُ حَتَّى تُسْتَأْذَنَ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ إِذْنُهَا؟ قَالَ: أَنْ تَسْكُتَ»(١).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێوەژن مارە ناکرێت تا فەرمانی لێ وەرنەگیرێ، وە کچیش مارە ناکرێت تا مۆڵەتی لێ وەرنەگیرێ، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەت لێ وەرگرتنی (کچ) چۆنە؟ فەرمووی: ئەوەیە کە بێ دەنگ بێت.**

## بێوەژن باوکی بە شوی بدات، لە کاتێکدا خۆی نارازی بێ

**٣٢٦٨-** «عَنْ خَنْسَاءَ بِنْتِ خِذَامٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّ أَبَاهَا زَوَّجَهَا وَهِيَ ثَيِّبٌ، فَكَرِهَتْ ذَلِكَ، فَأَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَرَدَّ نِكَاحَهُ»(٢).

**واتە: خەنسائی کچی خیزام ﷺ، دەگێڕێتەوە، باوکی بە شووی داو ئەو بێوەژن بوو، ئەوەی پێ ناخۆش بوو، هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش مارەییەکەی هەڵوەشاندەوە.**

## کچ باوکی بە شوی بدات، لەکاتێکدا خۆی نارازی بێت.

**٣٢٦٩-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّ فَتَاةً دَخَلَتْ عَلَيْهَا فَقَالَتْ: إِنَّ أَبِي زَوَّجَنِي ابْنَ أَخِيهِ لِيَرْفَعَ بِي خَسِيسَتَهُ وَأَنَا كَارِهَةٌ، قَالَتْ: اجْلِسِي حَتَّى يَأْتِيَ النَّبِيُّ ﷺ، فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَأَخْبَرَتْهُ، فَأَرْسَلَ إِلَى أَبِيهَا فَدَعَاهُ، فَجَعَلَ الْأَمْرَ إِلَيْهَا، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَدْ أَجَزْتُ مَا صَنَعَ أَبِي، وَلَكِنْ أَرَدْتُ أَنْ أَعْلَمَ أَلِلنِّسَاءِ مِنَ الْأَمْرِ شَيْءٌ»(٣).

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، کچێک هات بۆ لای، وتی: باوکم منی مارە کرد لە برازاکەی بۆ ئەوەی بە هۆی منەوە سوکی و ڕیسوایی خۆی بشارێتەوە، منیش پێم ناخۆشەو ڕازی نیم، وتی: دابنیشە تا پێغەمبەر ﷺ دەگەڕێتەوە،**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥١٣٦ و ٦٩٦٨ و ٦٩٨٠، ومسلم: ١٤١٩، وأبو داود: ٢٠٩٢، والترمذي: ١١٠٧، وإبن ماجه: ١٨٧١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٩٣٩ و ٥١٣٨ و ٥١٣٩ و ٦٩٤٥، وأبو داود: ٢١٠١، وإبن ماجه: ١٨٧٣.

(٣) ضعيف شاذ.




کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەوە هەواڵم پێدا، ناردی بە دوای باوکیدا بانگی کرد، فەرمانی شوو کردنی دابەدەستی کچەکە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ڕێگەمدا بەوەی باوکم کردی، بەڵام حەزم کرد بزانم ئافرەت لەمەدا قسەی هەیە.

**٣٢٧٠-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: تُسْتَأْمَرُ الْيَتِيمَةُ فِي نَفْسِهَا، فَإِنْ سَكَتَتْ فَهُوَ إِذْنُهَا، وَإِنْ أَبَتْ، فَلَا جَوَازَ عَلَيْهَا»(١).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کچ مۆڵەتی لێوەردەگیرێ، ئەگەر بێدەنگ بوو ئەوە ڕازیبونیەتی، وە ئەگەر نەیویست زۆری لێناکرێ.

## ڕێگەدان بەوەی ئیحرام پۆش ئافرەت مارە بکات

**٣٢٧١-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: تَزَوَّجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَيْمُونَةَ بِنْتَ الْحَارِثِ، وَهُوَ مُحْرِمٌ «وَفِي حَدِيثِ يَعْلَى» بِسَرِفَ»(٢).

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ مەیمونەی کچی حارثی مارەکرد لە ئیحرامیشدا بوو (لە فەرموودەی یەعلا هاتووە) لە شوێنێک بە ناوی: (سَرِفَ).

**٣٢٧٢-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ تَزَوَّجَ مَيْمُونَةَ وَهُوَ مُحْرِمٌ»(٣).

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ مەیمونەی مارەکرد لە ئیحرامیشدا بوو.

**٣٢٧٣-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَكَحَ مَيْمُونَةَ وَهُوَ مُحْرِمٌ، جَعَلَتْ أَمْرَهَا إِلَى الْعَبَّاسِ، فَأَنْكَحَهَا إِيَّاهُ»(٤).

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ مەیمونەی مارەکرد لە ئیحرامیشدا بوو، کاروباری دایە دەستی عەبباس، ئەویش لێی مارەکرد.

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٢٠٩٣ و ٢٠٩٤، والترمذي: ١١٠٩.

(٢) شاذ.

(٣) شاذ.

(٤) شاذ.




**٣٢٧٤-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، تَزَوَّجَ مَيْمُونَةَ وَهُوَ مُحْرِمٌ»[١].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ مەیمونەی مارەكرد لە ئیحرامیشدا بوو.**

## قەدەغەكردن لەوەی ئیحرام پۆش ژن مارە بكات

**٣٢٧٥-** «عَنْ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا يَنْكِحُ الْمُحْرِمُ، وَلَا يُنْكِحُ، وَلَا يَخْطُبُ»[٢].

**واتە: عوسمانی كوڕی عەففان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئیحرام پۆش نابێ بۆ خۆی ئافرەت مارە بكات، وە نابێ بۆ كەسێكی تر مارەی بكات، وە نابێ داوای ئافرەتیش بكات.**

**٣٢٧٦-** «عَنْ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: لَا يَنْكِحُ الْمُحْرِمُ، وَلَا يُنْكِحُ، وَلَا يَخْطُبُ»[٣].

**واتە: عوسمانی كوڕی عەففان ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئیحرام پۆش نابێ بۆ خۆی ئافرەت مارە بكات، وە نابێ بۆ كەسێكی تر مارەی بكات، وە نابێ داوای ئافرەتیش بكات.**

## ئەوەی پەسندە لە قسەكردن لە كاتی مارەكردندا

**٣٢٧٧-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: عَلَّمَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ التَّشَهُّدَ فِي الصَّلَاةِ، وَالتَّشَهُّدَ فِي الْحَاجَةِ، قَالَ: التَّشَهُّدُ فِي الْحَاجَةِ: أَنِ الْحَمْدُ لِلَّهِ، نَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللَّهُ، فَلَا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلِ اللَّهُ، فَلَا هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، وَيَقْرَأُ ثَلَاثَ آيَاتٍ»[٤].

**واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فێری تەحیاتی كردین لە نوێژدا، وە (التَّشَهُّدَ) لەكاتی وتاردان، وتی: (التَّشَهُّدَ) لە كاتی وتاردان: بێگومان ستایش هەر**

---

(١) شاذ.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




بۆ خوایە، پشتی پێ دەبەستین و داوای لێخۆشبوونی لێ دەکەین، وە پەنا دەگرین بە خوا لە خراپی نەفس و دەروونمان، هەرکەس خوا هیدایەتی بدات، ئەوە کەس ناتوانێ گومڕای بکات، هەرکەسیش خوا گومڕای بکات، ئەوە هیچ کەسێک نیە هیدایەتی بدات، وە شایەتی دەدەم بەڕاستی هیچ پەرستراوێک بە حەق نیە جگە لە خوای تاک و تەنها، وە شایەتی دەدەم موحەممەد بەندەو پێغەمبەری خوایە، وە سێ ئایەتیشی دەخوێند.

**٣٢٧٨-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَجُلاً كَلَّمَ النَّبِيَّ ﷺ فِي شَيْءٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِنَّ الْحَمْدَ لِلَّهِ، نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، مَنْ يَهْدِهِ اللَّهُ، فَلَا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلِ اللَّهُ، فَلَا هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، أَمَّا بَعْدُ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێک قسەی لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ کرد دەربارەی شتێک، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بێگومان ستایش هەر بۆ خوایە، سوپاسی دەکەین و پشتی پێ دەبەستین، هەرکەس خوا هیدایەتی بدات، ئەوە کەس ناتوانێ گومڕای بکات، هەرکەسیش خوا گومڕای بکات، ئەوە کەس ناتوانێ هیدایەتی بدات، وە شایەتی دەدەم بەڕاستی هیچ پەرستراوێک بە حەق نیە جگە لە خوای تاک و تەنهای بێ هاوبەش، وە شایەتی دەدەم موحەممەد بەندەو پێغەمبەری خوایە، دوای ئەوە.

## ئەوەی قەدەغەکراوە لە وتاردا

**٣٢٧٩-** «عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ قَالَ: تَشَهَّدَ رَجُلَانِ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ أَحَدُهُمَا: مَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ رَشِدَ، وَمَنْ يَعْصِهِمَا فَقَدْ غَوَى؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: بِئْسَ الْخَطِيبُ أَنْتَ»[٢].

واتە: عەدی کوڕی حاتەم ﷺ وتی: دوو پیاو وتاریاندا لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ، یەکێکیان وتی: هەرکەس گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی بکات ئەوە ڕێ نیشاندراوە، هەرکەسیش سەرپێچیان بکات ئەوە گومڕا بووە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خراپترین وتارخوێن تۆی.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٨٦٨، وإبن ماجه: ١٨٩٣.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٨٧٠، وأبو داود: ١٠٩٩ و ٣٩٨١.

## بابەت: ئەو قسانەی کە مارەیی پێ دادەمەزرێ

**٣٢٨٠-** «عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ يَقُولُ: إِنِّي لَفِي الْقَوْمِ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَامَتِ امْرَأَةٌ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهَا قَدْ وَهَبَتْ نَفْسَهَا لَكَ، فَرَأْ فِيهَا رَأْيَكَ، فَسَكَتَ، فَلَمْ يُجِبْهَا النَّبِيُّ ﷺ بِشَيْءٍ، ثُمَّ قَامَتْ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهَا قَدْ وَهَبَتْ نَفْسَهَا لَكَ، فَرَأْ فِيهَا رَأْيَكَ، فَقَامَ رَجُلٌ، فَقَالَ: زَوِّجْنِيهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: هَلْ مَعَكَ شَيْءٌ؟ قَالَ: لَا، قَالَ: اذْهَبْ فَاطْلُبْ وَلَوْ خَاتَماً مِنْ حَدِيدٍ، فَذَهَبَ فَطَلَبَ، ثُمَّ جَاءَ، فَقَالَ: لَمْ أَجِدْ شَيْئاً، وَلَا خَاتَماً مِنْ حَدِيدٍ، قَالَ: هَلْ مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ شَيْءٌ؟ قَالَ: نَعَمْ، مَعِي سُورَةُ كَذَا وَسُورَةُ كَذَا، قَالَ: قَدْ أَنْكَحْتُكَهَا عَلَى مَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ»(١).

**واتە: سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: من لە نێو خەڵکێکدا بووم لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، ئافرەتێک هەڵسا، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من خۆمم پێشکەشی تۆ کردوە، بۆچوونی خۆت بڵێ؟ ئەویش بێدەنگ بوو، خۆشی نەویست بە هیچ جۆرێ، پاشان هەڵسا، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من خۆمم پێشکەشی تۆ کرد، بۆچونی خۆت بڵێ؟ پیاوێک هەڵسا وتی: لە منی مارە بکە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: هیچت هەیە؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: برۆ پەیدای بکە ئەگەر موستیلەیەکی ئاسنیش بێت، کابرا ڕۆیشت گەڕا، پاشان هاتەوە، وتی: هیچم دەست نەکەوت، تەنانەت موستیلەیەکی ئاسنیش، فەرمووی: ئایا شتێکت لەبەرە لە قورئان؟ وتی: بەڵێ، سووڕەتی فڵان و سووڕەتی فڵان، فەرمووی: ئەوە لێتم مارە کرد، لەسەر ئەو قورئانەی کە لاتە.**

## مەرجەکان لە مارەکردندا

**٣٢٨١-** «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ أَحَقَّ الشُّرُوطِ أَنْ يُوَفَّى بِهِ مَا اسْتَحْلَلْتُمْ بِهِ الْفُرُوجَ»(٢).

**واتە: عوقبەی کوڕی عامر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی ڕەواترین مەرج کە وەفای پێ بکەن، مەرجی ئەو زەواجەیە کە دامێنتان بە هۆیەوە حەڵاڵ کردوە.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧٢١ و ٥١٥١، ومسلم: ١٤١٨، وأبو داود: ٢١٣٩، والترمذي: ١١٢٧، وإبن ماجه: ١٩٥٤.

**٣٢٨٢-** «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِنَّ أَحَقَّ الشُّرُوطِ أَنْ يُوَفَّى بِهِ مَا اسْتَحْلَلْتُمْ بِهِ الْفُرُوجَ»[١].

**واتە: عوقبەی کوڕی عامر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی ڕەواترین مەرج کە وەفای پێ بکەن، مەرجی ئەو زەواجەیە کە داوێنتان بە هۆیەوە حەلاڵ کردوە.**

## ئەو مارەکردنەی کە تەڵاقدراوەکەی پێ حەلاڵ دەبێ بۆ ئەو کەسەی کە تەڵاقیداوە

**٣٢٨٣-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: جَاءَتِ امْرَأَةُ رِفَاعَةَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: إِنَّ رِفَاعَةَ طَلَّقَنِي، فَأَبَتَّ طَلَاقِي، وَإِنِّي تَزَوَّجْتُ بَعْدَهُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الزَّبِيرِ، وَمَا مَعَهُ إِلَّا مِثْلُ هُدْبَةِ الثَّوْبِ، فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَقَالَ: لَعَلَّكِ تُرِيدِينَ أَنْ تَرْجِعِي إِلَى رِفَاعَةَ، لَا، حَتَّى يَذُوقَ عُسَيْلَتَكِ، وَتَذُوقِي عُسَيْلَتَهُ»[٢].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: ژنەکەی ڕیفاعە هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ڕیفاعە سێ بە سێ تەڵاقی دام، منیش دوای ئەو شووم کرد بە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی زوبەیر، ئەو وەکو چمکی ئەم کراسە وایە (واتا توانای سەرجێی نیە)، پێغەمبەری خوا ﷺ زەردەخەنە گرتی و فەرمووی: دەتەوێ بگەڕێیتەوە بۆ لای ڕیفاعە، نا، تا تۆ چێژ لە ئەو وەردەگریت و ئەویش چێژ لە تۆ وەردەگرێ.**

## قەدەغەکردنی مارەکردنی ئەو کچەی کە لە لای خۆی بەخێوی کردوە

**٣٢٨٤-** «عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ بِنْتَ أَبِي سُفْيَانَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنْكِحْ أُخْتِي بِنْتَ أَبِي سُفْيَانَ، قَالَتْ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَوَتُحِبِّينَ ذَلِكَ؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ، لَسْتُ لَكَ بِمُخْلِيَةٍ، وَأَحَبُّ مَنْ يُشَارِكُنِي فِي خَيْرٍ أُخْتِي، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِنَّ أُخْتَكِ لَا تَحِلُّ لِي، فَقُلْتُ: وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا لَنَتَحَدَّثُ أَنَّكَ تُرِيدُ أَنْ تَنْكِحَ دُرَّةَ بِنْتَ أَبِي سَلَمَةَ، فَقَالَ: بِنْتُ أُمِّ سَلَمَةَ؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ، فَقَالَ:

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٦٣٩ و ٥٢٦٠ و ٥٣٦٥ و ٤٧٩٢ و ٦٠٨٤، ومسلم: ١١١ و ١٤٣٣/١١٤، وأبو داود: ٢٣٠٩، والترمذي: ١١١٨، وإبن ماجه: ١٩٣٢.




وَاللَّهِ لَوْلَا أَنَّهَا رَبِيبَتِي فِي حَجْرِي مَا حَلَّتْ لِي، إِنَّهَا لَابْنَةُ أَخِي مِنَ الرَّضَاعَةِ، أَرْضَعَتْنِي وَأَبَا سَلَمَةَ ثُوَيْبَةُ، فَلَا تَعْرِضْنَ عَلَيَّ بَنَاتِكُنَّ وَلَا أَخَوَاتِكُنَّ»[1].

واتە: ئوممو حەبیبەی کچی ئەبو سوفیان (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خوشکەکەم مارەبکە کە کچی ئەبو سوفیانە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوەت پێ خۆشە؟ وتم: بەڵێ، خۆ من بە تەنها خێزانی تۆ نیم، وە ئەو کەسەی پێم خۆشە کە لە چاکەدا بێتە هاوبەشم خوشکەکەی خۆمە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوشکەکەت حەڵاڵ نیە بۆ من، منیش وتم: سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە وامان بیستووە کە تۆ دەتەوێ کچەکەی ئەبو سەلەمە مارە بکەیت، فەرمووی: کچی ئوم سەلەمە؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: ئەگەر خۆشم پەروەردەم نەکردایە هەر حەڵاڵ نەدەبوو بۆ من، چونکە ئەو برازای شیریمە، ثوەیبە شیری بە من و ئەبو سەلەمە داوە، کچەکانتان و خوشکەکانتان مەخەنە ڕوو بۆ من.

## قەدەغەکردنی کۆکردنەوەی نێوان دایک و کچ

٣٢٨٥- «عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنْكِحْ بِنْتَ أَبِي «تَعْنِي أُخْتَهَا» فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: وَتُحِبِّينَ ذَلِكِ؟ قَالَتْ: نَعَمْ، لَسْتُ لَكَ بِمُخْلِيَةٍ، وَأَحَبُّ مَنْ شَرِكَتْنِي فِي خَيْرٍ أُخْتِي؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ ذَلِكِ لَا يَحِلُّ، قَالَتْ أُمُّ حَبِيبَةَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَاللَّهِ لَقَدْ تَحَدَّثْنَا أَنَّكَ تَنْكِحُ دُرَّةَ بِنْتَ أَبِي سَلَمَةَ، فَقَالَ: بِنْتُ أُمِّ سَلَمَةَ؟ قَالَتْ أُمُّ حَبِيبَةَ: نَعَمْ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: فَوَاللَّهِ لَوْ أَنَّهَا لَمْ تَكُنْ رَبِيبَتِي فِي حَجْرِي مَا حَلَّتْ، إِنَّهَا لَابْنَةُ أَخِي مِنَ الرَّضَاعَةِ، أَرْضَعَتْنِي وَأَبَا سَلَمَةَ ثُوَيْبَةُ، فَلَا تَعْرِضْنَ عَلَيَّ بَنَاتِكُنَّ وَلَا أَخَوَاتِكُنَّ»[2].

واتە: ئوممو حەبیبە ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خوشکەکەم مارە بکە کە کچی ئەبو سوفیانە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوەت پێ خۆشە؟ وتی: بەڵێ، خۆ من بە تەنها خێزانی تۆ نیم، وە ئەو کەسەی پێم خۆشە کە لە چاکەدا بێتە هاوبەشم خوشکەکەی خۆمە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوشکەکەت حەڵاڵ نیە بۆ من، ئوممو حەبیبە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، سوێند بە خوا ئەی ئێمە وامان بیستووە کە تۆ دەتەوێ کچەکەی ئەبو سەلەمە مارە بکەیت، فەرمووی: کچی

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥١٠٦ و ٥١٢٣، ومسلم: ١٥ و ١٤٤٩/١٦، وإبن ماجه: ١٩٣٩.




ئوممو سەلەمە؟ ئوممو حەبیبە وتی بەڵێ، فەرمووی: سوێند بەخوا ئەگەر خۆیشم پەروەردەم نەکردایە هەر حەڵاڵ نەدەبوو بۆ من، چونکە ئەو برازای شیریمە، ثوەیبە شیری بە من و ئەبو سەلەمە داوە، کچەکانتان و خوشکەکانتان مەخەنە ڕوو بۆ من.

**٣٢٨٦-** «عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ: إِنَّا قَدْ تَحَدَّثْنَا أَنَّكَ نَاكِحٌ دُرَّةَ بِنْتَ أَبِي سَلَمَةَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَعَلَى أُمِّ سَلَمَةَ، لَوْ أَنِّي لَمْ أَنْكِحْ أُمَّ سَلَمَةَ مَا حَلَّتْ لِي، إِنَّ أَبَاهَا أَخِي مِنَ الرَّضَاعَةِ»[1].

**واتە:** ئوممو حەبیبە ، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە وامان بیستووە کە تۆ دەتەوێ کچەکەی ئەبو سەلەمە مارە بکەیت، فەرمووی: کچی ئوممو سەلەمە؟ ئەگەر ئوممو سەلەمەشم نەخواستایە حەڵاڵ نەدەبوو بۆم، چونکە باوکی برای شیریمە.

## قەدەغەکردنی کۆکردنەوە لە نێوان دوو خوشکدا

**٣٢٨٧-** «عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّهَا قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَلْ لَكَ فِي أُخْتِي؟ قَالَ: فَأَصْنَعُ مَاذَا؟ قَالَتْ: تَزَوَّجْهَا، قَالَ: فَإِنَّ ذَلِكَ أَحَبُّ إِلَيْكِ؟ قَالَتْ: نَعَمْ، لَسْتُ لَكَ بِمُخْلِيَةٍ، وَأَحَبُّ مَنْ يَشْرَكُنِي فِي خَيْرٍ أُخْتِي قَالَ: إِنَّهَا لَا تَحِلُّ لِي، قَالَتْ: فَإِنَّهُ قَدْ بَلَغَنِي أَنَّكَ تَخْطُبُ دُرَّةَ بِنْتَ أُمِّ سَلَمَةَ، قَالَ: بِنْتُ أَبِي سَلَمَةَ، قَالَتْ: نَعَمْ، قَالَ: وَاللَّهِ لَوْ لَمْ تَكُنْ رَبِيبَتِي مَا حَلَّتْ لِي، إِنَّهَا لَابْنَةُ أَخِي مِنَ الرَّضَاعَةِ، فَلَا تَعْرِضْنَ عَلَيَّ بَنَاتِكُنَّ وَلَا أَخَوَاتِكُنَّ»[2].

**واتە:** ئوممو حەبیبە ، دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خوشکەکەمت دەوێ؟ فەرمووی: بۆچی؟ وتی: مارەی بکە، فەرمووی: ئەوەت پێ خۆشە؟ وتی: بەڵێ، خۆ من بە تەنها خێزانی تۆ نیم، حەز دەکەم ئەو کەسەی لە چاکەدا بێتە هاوبەشم خوشکەکەی خۆم بێت فەرمووی: خوشکەکەت حەڵاڵ نیە بۆ من، وتی: هەواڵم پێگەیشتووە کە تۆ دەتەوێ کچەکەی ئەبو سەلەمە مارە بکەیت، فەرمووی: کچی ئەبو سەلەمە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: سوێند بەخوا ئەگەر خۆیشم پەروەردەم نەکردایە هەر حەڵاڵ نەدەبوو بۆ من، چونکە ئەوە برازای شیریمە، کچەکانتان و خوشکەکانتان مەخەنە ڕوو بۆ من.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




## کۆکردنەوەی ژن و پورەکەی (خوشکی باوکی) بە مەبەستی هاوسەرگیری

**٣٢٨٨-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا يُجْمَعُ بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَعَمَّتِهَا، وَلَا بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَخَالَتِهَا»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ژن و پورەکەی پێکەوە کۆناکرێنەوە، جا خوشکی باوکی بێت، یا خوشکی دایکی.**

**٣٢٨٩-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُجْمَعَ بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَعَمَّتِهَا وَالْمَرْأَةِ وَخَالَتِهَا»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە ژن و پورەکەی پێکەوە کۆبکرێتەوە، جا خوشکی باوکی بێت، یان خوشکی دایکی.**

**٣٢٩٠-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ نَهَى أَنْ تُنْكَحَ الْمَرْأَةُ عَلَى عَمَّتِهَا أَوْ خَالَتِهَا»[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە ژن مارە ببڕدرێت بەسەر خوشکی باوکی یان خوشکی دایکی.**

**٣٢٩١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، نَهَى عَنْ أَرْبَعِ نِسْوَةٍ يُجْمَعُ بَيْنَهُنَّ: الْمَرْأَةِ وَعَمَّتِهَا، وَالْمَرْأَةِ وَخَالَتِهَا»[٤].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە چوار ژن پێکەوە کۆبکرێنەوە: ژن و پورەکەی، خوشکی باوکی بێت، یان خوشکی دایکی.**

**٣٢٩٢-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: لَا تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ عَلَى عَمَّتِهَا وَلَا عَلَى خَالَتِهَا»[٥].

---

(١) صحيح.
(٢) صحيح.
(٣) صحيح.
(٤) صحيح.
(٥) صحيح.




واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ژن بەسەر پوریدا مارە ناكرێ، جا خوشكی باوكی بێت، یان خوشكی دایكی.

**٣٢٩٣-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ تُنْكَحَ الْمَرْأَةُ عَلَى عَمَّتِهَا، أَوْ عَلَى خَالَتِهَا»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی كردوە ژن مارە ببڕدرێت بەسەر خوشكی باوكی یان خوشكی دایكی.

**٣٢٩٤-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: لَا تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ عَلَى عَمَّتِهَا وَلَا عَلَى خَالَتِهَا»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ژن بەسەر پوریدا مارە ناكرێ، جا خوشكی باوكی بێت، یان خوشكی دایكی.

## كۆكردنەوەی ژن و پورەكەی (خوشكی دایكی) بە مەبەستی هاوسەرگیری

**٣٢٩٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَا تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ عَلَى عَمَّتِهَا وَلَا عَلَى خَالَتِهَا»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ژن بەسەر پوریدا مارە ناكرێ، جا خوشكی باوكی بێت، یان خوشكی دایكی.

**٣٢٩٦-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ تُنْكَحَ الْمَرْأَةُ عَلَى عَمَّتِهَا، وَالْعَمَّةُ عَلَى بِنْتِ أَخِيهَا»[٤].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی كردوە ژن مارە ببڕدرێت بەسەر خوشكی باوكیدا، هەروەها خوشكی باوكیشی بەسەر كچی براكەی.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥١٠٩ و ٥١١٠، ومسلم: ٣٣ و ١٤٠٨/٣٧، وأبو داود: ٢٠٦٦.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




٣٢٩٧- «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَا تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ عَلَى عَمَّتِهَا، وَلَا عَلَى خَالَتِهَا»[١].

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ژن مارە ناکرێ بە خوشکی باوکیدا، هەروەها بەسەر خوشکی دایکیدا.

٣٢٩٨- «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ تُنْكَحَ الْمَرْأَةُ عَلَى عَمَّتِهَا وَخَالَتِهَا»[٢].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە ژن مارە ببڕدرێت بەسەر خوشکی باوکی بێت، یان خوشکی دایکی.

٣٢٩٩- «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ تُنْكَحَ الْمَرْأَةُ عَلَى عَمَّتِهَا، أَوْ عَلَى خَالَتِهَا»[٣].

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە ژن مارە ببڕدرێت بەسەر خوشکی باوکی بێت، یان خوشکی دایکی.

## ئەوەی بە هۆی شیردانەوە قەدەغە دەبێ و دەبێتە مەحرەم

٣٣٠٠- «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَا حَرَّمَتْهُ الْوِلَادَةُ حَرَّمَهُ الرَّضَاعُ»[٤].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەوەی بەهۆی منداڵ بوونەوە قەدەغە دەبێ، بە هۆی شیردانیشەوە قەدەغە دەبێ.

٣٣٠١- «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّهَا أَخْبَرَتْهُ أَنَّ عَمَّهَا مِنَ الرَّضَاعَةِ «يُسَمَّى أَفْلَ» اسْتَأْذَنَ عَلَيْهَا فَحَجَبَتْهُ، فَأُخْبِرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: لَا تَحْتَجِبِي مِنْهُ، فَإِنَّهُ يَحْرُمُ مِنَ الرَّضَاعِ مَا يَحْرُمُ مِنَ النَّسَبِ»[٥].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥١٠٨.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٠٥٥، والترمذي: ١١٤٧.

(٥) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٦٤٤، ومسلم: ١٤٤٥، وأبو داود: ٢٠٥٧، والترمذي: ١١٤٨، وإبن ماجه: ١٩٤٨ و ١٩٤٩.

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: هەواڵی پێ گەیشتووە کە مامی لە شیرەوە (کە پێی دەوترا ئەفلەح) مۆڵەتی لێی وەرگرت ئەویش پەردەی خستە نێوانیان، هەواڵیدا بە پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: پەردە مەخە نێوانی خۆت و ئەو، چونکە بێگومان ئەوەی بەهۆی شیرەوە قەدەغە دەبێ، هەروەکو ئەوە وایە کە بە هۆی ڕەچەڵەکەوە قەدەغە بووبێ.

**٣٣٠٢-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: يَحْرُمُ مِنَ الرَّضَاعِ مَا يَحْرُمُ مِنَ النَّسَبِ»[١].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوەی بە هۆی شیرەوە قەدەغە دەبێ، هەروەکو ئەوە وایە کە بە هۆی ڕەچەڵەکەوە قەدەغە بووبێ.

**٣٣٠٣-** «عَنْ عَائِشَة رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا تَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَحْرُمُ مِنَ الرَّضَاعِ مَا يَحْرُمُ مِنَ الْوِلَادَةِ»[٢].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوەی بە هۆی شیرەوە قەدەغە دەبێ، هەروەکو ئەوە وایە کە بە هۆی بنەماڵەوە قەدەغە بووبێ.

## قەدەغە بوونی کچی برا لە شیرەوە

**٣٣٠٤-** «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا لَكَ تَنَوَّقُ فِي قُرَيْشٍ وَتَدَعُنَا؟ قَالَ: وَعِنْدَكَ أَحَدٌ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، بِنْتُ حَمْزَةَ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّهَا لَا تَحِلُّ لِي، إِنَّهَا ابْنَةُ أَخِي مِنَ الرَّضَاعَةِ»[٣].

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە چیە لە قورەیش هەڵدەبژێری بۆ هاوسەرگیری واز لە ئێمە دێنی؟ فەرمووی: کەس شک ئەبەی؟ وتم: بەڵێ؟ کچەکەی حەمزە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەو حەڵاڵ نیە بۆ من، ئەوە برازامە لە شیرەوە.

**٣٣٠٥-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: ذُكِرَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِنْتُ حَمْزَةَ، فَقَالَ: إِنَّهَا ابْنَةُ أَخِي مِنَ الرَّضَاعَةِ»[٤].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٤٦.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٦٤٥ و ٥١٠٠، ومسلم: ١٢ و ١٤٤٧/١٣، وإبن ماجه: ١٩٣٨.





واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: باسی کچەکەی حەمزە کرا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خوازبێنی کردنی، فەرمووی: ئەوە برازامە لە شیرەوە.

**٣٣٠٦-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أُرِيدَ عَلَى بِنْتِ حَمْزَةَ، فَقَالَ: إِنَّهَا ابْنَةُ أَخِي مِنَ الرَّضَاعَةِ، وَإِنَّهُ يَحْرُمُ مِنَ الرَّضَاعِ مَا يَحْرُمُ مِنَ النَّسَبِ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: دەستنیشانی کچەکەی حەمزە کرا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ئەوە برازامە لە شیرەوە، بێگومان ئەوەی بە هۆی شیرەوە قەدەغە دەبێ، هەر وەکو ئەوە وایە کە بە هۆی ڕەچەڵەکەوە قەدەغە بووبێ.

## ئەو ئەندازە شیر خواردنەی کچ و کوڕەکە لە یەکتر قەدەغە دەکات

**٣٣٠٧-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ فِيمَا أَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ، وَقَالَ الْحَارِثُ: فِيمَا أُنْزِلَ مِنَ الْقُرْآنِ: عَشْرُ رَضَعَاتٍ مَعْلُومَاتٍ يُحَرِّمْنَ، ثُمَّ نُسِخْنَ بِخَمْسٍ مَعْلُومَاتٍ، فَتُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَهِيَ مِمَّا يُقْرَأُ مِنَ الْقُرْآنِ»[٢].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ئەوەی خوا دایبەزاندبوو، وە حارثیش دەڵێ: ئایەتی قورئان دابەزی بەوەی: دە شیردانی دیاریکراو (هاوسەرگیری کچ و کوڕەکەی) لە یەکتر قەدەغە کرد، پاشان حوکمی خوێندنەوەکەی هەڵوەشێنرایەوە (نەسخ کرایەوە) بە پێنج شیردانی دیار، پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی کرد، (هێشتا هەندێک نەیانزانی بوو ئەم ئایەتە خوێندنەوەکەی نەماوە) هەر لە قورئاندا دەخوێندرایەوە.

**٣٣٠٨-** «عَنْ أُمِّ الْفَضْلِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ سُئِلَ عَنِ الرَّضَاعِ، فَقَالَ: لَا تُحَرِّمُ الْإِمْلَاجَةُ وَلَا الْإِمْلَاجَتَانِ»[٣].

واتە: ئوممو فەزڵ (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ لە بارەی شیردانەوە، فەرمووی: یەک مژین، یان دوو مژین، قەدەغەی ناکات.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٤ و ١٤٥٢/٢٥، وأبو داود: ٢٠٦٢، والترمذي: ١١٥٠، وإبن ماجه: ١٩٤٢.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤١٥.

**٣٣٠٩-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَا تُحَرِّمُ الْمَصَّةُ وَالْمَصَّتَانِ»[١].

**واته:** عەبدوڵڵای كوڕی زوبەیر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: یەک مژین و دوو مژین قەدەغەی (هاوسەرگیری) ناكات.

**٣٣١٠-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تُحَرِّمُ الْمَصَّةُ، وَالْمَصَّتَانِ»[٢].

**واته:** عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەک مژین و دوو مژین قەدەغەی (هاوسەرگیری) ناكات.

**٣٣١١-** «عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: كَتَبْنَا إِلَى إِبْرَاهِيمَ بْنِ يَزِيدَ النَّخَعِيِّ، نَسْأَلُهُ عَنِ الرَّضَاعِ، فَكَتَبَ أَنَّ شُرَيْحاً، حَدَّثَنَا أَنَّ عَلِيّاً، وَابْنَ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا كَانَا يَقُولَانِ: يُحَرِّمُ مِنَ الرَّضَاعِ قَلِيلُهُ وَكَثِيرُهُ، وَكَانَ فِي كِتَابِهِ، أَنَّ أَبَا الشَّعْثَاءِ الْمُحَارِبِيَّ، حَدَّثَنَا أَنَّ عَائِشَةَ، حَدَّثَتْهُ أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقُولُ: لَا تُحَرِّمُ الْخَطْفَةُ وَالْخَطْفَتَانِ»[٣].

**واته:** قەتادە دەڵێ: نووسراوێكمان نووسی بۆ ئیبڕاهیمی كوڕی یەزیدی نەخەعی، پرسیاری شیردانمان لێ كرد، بۆی نوسین كە شورەیح بۆمانی باس كردوە عەلی و ئیبنو مەسعود (خوا لێیان ڕازی بێ) دەیانوت: قەدەغە دەبێ لە شیرخواردنەوە كەم بێت یان زۆر، وە لە كتێبەكەیدا ئەبو شەعثائی موحاریبی بۆی باس كردین كە عائیشە بۆی باس كردوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەكجار دووجار (شیر خواردن) قەدەغەی ناكات.

**٣٣١٢-** «عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَعِنْدِي رَجُلٌ قَاعِدٌ، فَاشْتَدَّ ذَلِكَ عَلَيْهِ، وَرَأَيْتُ الْغَضَبَ فِي وَجْهِهِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهُ أَخِي مِنَ الرَّضَاعَةِ، فَقَالَ: انْظُرْنَ مَا إِخْوَانُكُنَّ، وَمَرَّةً أُخْرَى: انْظُرْنَ مَنْ إِخْوَانُكُنَّ، مِنَ الرَّضَاعَةِ، فَإِنَّ الرَّضَاعَةَ مِنَ الْمَجَاعَةِ»[٤].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٥٠، وأبو داود: ٢٠٦٣، والترمذي: ١١٥٠، وإبن ماجه: ١٩٤١.

(٣) صحيح الإسناد.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٦٤٧ و ٥١٠٢، ومسلم: ١٤٥٥، وأبو داود: ٢٠٥٨، وإبن ماجه: ١٩٤٥.




واتە: مەسروق دەڵێ: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەوە پیاوێک لام دانیشتبوو، زۆر پێی ناخۆش بوو، هەستم بە توڕەیی کرد لە ڕوخساریدا، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوە برای شیریمە، فەرمووی: تەماشا بکەن کێ برای ئێوەیە؟ جارێکی تر فەرمووی: تەماشا بکەن کێ برای ئێوەیە لە شیرەوە؟ چونکە شیردان لە برسیەتیەوەیە.

## ( لَبَنُ الْفَحْلِ )

(واتە: پیاوێک دوو ژنی هەبێ، ژنێکیان شیری بە کوڕێک داوە هی خۆی نیە، ژنەکەی تریش شیری بە کچێک داوە کچی خۆی نیە، کچەکە شیری لای ژنێک خواردوە، کوڕەکەش لای ژنێکی تر، لەم کاتەدا کوڕەکە دەبێتە برای کچەکە لە باوکەوە لە شیرەوە، بەهۆی ئەوەی ئەو دوو ژنە هەردووکیان خێزانی یەک پیاون).

بەڵگەش لەوبارەوە ئەوەیە: پیاوێک هەبوو بە ناوی ئەبولقوعەیس خێزانەکەی شیری دابوو بە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، ئەبولقوعەیس بوو بە باوکی عائیشە لە شیرەوە، جا برایەکی هەبوو بە ناوی ئەفلەح، ئەفەلەح هات داوای مۆڵەتی کرد بچێتە ژوورەوە بۆ لای عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، وتی: مۆڵەتت پێنادەم تۆ هیچ پەیوەندیەکی (خزمایەتیت) نیە، ئەویش وتی: من مامی تۆم لە شیرەوە، خێزانی براکەم شیری پێداوی، وتی: من ئافرەت شیری پێداوم نەک پیاو، بۆیە مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی پێنەدا، کاتێ پێغەمبەر ﷺ هاتەوە، هەواڵی پێدا، فەرمووی: ئەوە مامی تۆیە با بێتە ژوورەوە بۆ لات، ئەمەش بەڵگەی ئەو زانایانەیە کە پێیان وایە حەرام بوون لە ڕێگای باوکەوە لە شیرەوە، هەروەکو حەرام بوون وایە لە ڕێگای شیر خواردنەوە).

**٣٣١٣**- «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ عِنْدَهَا، وَأَنَّهَا سَمِعَتْ رَجُلاً يَسْتَأْذِنُ فِي بَيْتِ حَفْصَةَ، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَذَا رَجُلٌ يَسْتَأْذِنُ فِي بَيْتِكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أُرَاهُ فُلَاناً لِعَمِّ حَفْصَةَ مِنَ الرَّضَاعَةِ، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَقُلْتُ: لَوْ كَانَ فُلَانٌ حَيّاً لِعَمِّهَا مِنَ الرَّضَاعَةِ دَخَلَ عَلَيَّ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ الرَّضَاعَةَ تُحَرِّمُ مَا يُحَرِّمُ مِنَ الْوِلَادَةِ»[1].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٦٤٦ و ٣١٠٥ و ٥٠٩٩، ومسلم: ١ و ١٤٤٤/٢.




واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لای بوو، گوێی لێ بوو پیاوێک داوای مۆڵەت دەکات بچێتە ماڵی حەفصە، عائیشە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەو پیاوە داوای مۆڵەت دەکات بچێتە ماڵەکەتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: وا دەبینم فڵانەکەسی مامی حەفصەیە لە شیرەوە، عائیشە وتی: ئەگەر فڵانەکەس زیندوو بووایە کە ماممە لە شیرەوە دەهاتە ژوورەوە بۆ لام، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی شیرخواردن قەدەغەی دەکات ئەوەی کە قەدەغە کراوە لە منداڵ بوونەوە.

**٣٣١٤-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: جَاءَ عَمِّي أَبُو الْجَعْدِ مِنَ الرَّضَاعَةِ، فَرَدَدْتُهُ، فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: ائْذَنِي لَهُ»[1].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: مامم ئەبو جەعد لە شیرەوە هات (بۆ لام) ڕەتم کردەوە (ڕێگەی بدەم بێتە ماڵم)، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەوە هەواڵم پێدا، فەرمووی: مۆڵەتی بدە.

**٣٣١٥-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّ أَخَا أَبِي الْقُعَيْسِ اسْتَأْذَنَ عَلَى عَائِشَةَ بَعْدَ آيَةِ الْحِجَابِ فَأَبَتْ أَنْ تَأْذَنَ لَهُ، فَذُكِرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: ائْذَنِي لَهُ فَإِنَّهُ عَمُّكِ، فَقُلْتُ: إِنَّمَا أَرْضَعَتْنِي الْمَرْأَةُ وَلَمْ يُرْضِعْنِي الرَّجُلُ، فَقَالَ: إِنَّهُ عَمُّكِ، فَلْيَلِجْ عَلَيْكِ»[2].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: براکەی ئەبو قوعەیس داوای مۆڵەتی کرد بۆ لای عائیشە لە دوای ئایەتی حیجاب مۆڵەتی پێنەدا، ئەوەی بۆ پێغەمبەر ﷺ باس کرد، فەرمووی: مۆڵەتی پێبدە، چونکە ئەوە مامتە، وتم: من ئافرەت شیری پێداوم خۆ پیاو شیری پێم نەداوە، فەرمووی: ئەوە مامتە، با بێتە ژوورەوە بۆ لات.

**٣٣١٦-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ أَفْلَحُ أَخُو أَبِي الْقُعَيْسِ يَسْتَأْذِنُ عَلَيَّ، وَهُوَ عَمِّي مِنَ الرَّضَاعَةِ، فَأَبَيْتُ أَنْ آذَنَ لَهُ، حَتَّى جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ: ائْذَنِي لَهُ فَإِنَّهُ عَمُّكِ، قَالَتْ عَائِشَةُ: وَذَلِكَ بَعْدَ أَنْ نَزَلَ الْحِجَابُ»[3].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ئەفلەح برای ئەبو قوعەیس داوای مۆڵەتی لێکردم، ئەو مامم بوو لە شیرەوە، مۆڵەتم پێنەدا تا پێغەمبەری خوا ﷺ هات، ئینجا هەواڵم پێدا، فەرمووی: مۆڵەتی پێبدە، چونکە ئەوە مامتە، عائیشە وتی: ئەوە دوای دابەزینی ئایەتی حیجاب بوو.

**٣٣١٧-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: اسْتَأْذَنَ عَلَيَّ عَمِّي أَفْلَحُ بَعْدَمَا نَزَلَ الْحِجَابُ، فَلَمْ آذَنْ لَهُ، فَأَتَانِي النَّبِيُّ ﷺ فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ: ائْذَنِي لَهُ فَإِنَّهُ عَمُّكِ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّمَا أَرْضَعَتْنِي الْمَرْأَةُ وَلَمْ يُرْضِعْنِي الرَّجُلُ، قَالَ: ائْذَنِي لَهُ، تَرِبَتْ يَمِينُكِ فَإِنَّهُ عَمُّكِ»[1].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ئەفلەحی مامم داوای مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی لێکردم دوای دابەزینی ئایەتی حیجاب، مۆڵەتم پێنەدا، پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لام پرسیارم لێ کرد، فەرمووی: مۆڵەتی پێبدە، چونکە ئەوە مامتە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من ئافرەت شیری پێداوم خۆ پیاو شیری پێ نەداوم، فەرمووی: مۆڵەتی پێبدە دەستت بە خۆڵدا بچێت، ئەوە مامتە.

**٣٣١٨-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: جَاءَ أَفْلَحُ أَخُو أَبِي الْقُعَيْسِ يَسْتَأْذِنُ، فَقُلْتُ: لَا آذَنُ لَهُ حَتَّى أَسْتَأْذِنَ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ، فَلَمَّا جَاءَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ، قُلْتُ لَهُ: جَاءَ أَفْلَحُ أَخُو أَبِي الْقُعَيْسِ يَسْتَأْذِنُ، فَأَبَيْتُ أَنْ آذَنَ لَهُ، فَقَالَ: ائْذَنِي لَهُ فَإِنَّهُ عَمُّكِ، قُلْتُ: إِنَّمَا أَرْضَعَتْنِي امْرَأَةُ أَبِي الْقُعَيْسِ وَلَمْ يُرْضِعْنِي الرَّجُلُ، قَالَ: ائْذَنِي لَهُ فَإِنَّهُ عَمُّكِ»[2].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ئەفەلەح برای ئەبو قوعەیس هات داوای مۆڵەتی (هانە ژوورەوەی) لێکردم، وتم: مۆڵەتی نادەم هەتا مۆڵەت لە پێغەمبەری خوا ﷺ وەرنەگرم، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ هات پێم وت: ئەفلەحی کوڕی ئەبو قوعەیس داوای هاتنە ژوورەوە دەکات، منیش مۆڵەتم پێنەدا، فەرمووی: مۆڵەتی پێبدە، چونکە ئەوە مامتە، عائیشە وتی: ئەوە دوای دابەزینی ئایەتی حیجاب بوو، وتم: من ئافرەت شیری پێداوم خۆ پیاو شیری پێ نەداوم، فەرمووی: مۆڵەتی پێبدە، چونکە ئەوە مامتە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٧٩٦ و ٥١٠٣ و ٥٢٣٩ و ٦١٥٦، ومسلم: ٣ و ٥ و ١٤٤٥/١٠، وأبو داود: ٢٠٥٧، والترمذي: ١١٤٨، وإبن ماجه: ١٩٣٧ و ١٩٤٨ و ١٩٤٩.

(٢) صحيح.

## بابەت: شیردان بە گەورە

**٣٣١٩-** «عن عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا تَقُولُ: جَاءَتْ سَهْلَةُ بِنْتُ سُهَيْلٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي لَأَرَى فِي وَجْهِ أَبِي حُذَيْفَةَ مِنْ دُخُولِ سَالِمٍ عَلَيَّ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَرْضِعِيهِ، قُلْتُ: إِنَّهُ لَذُو لِحْيَةٍ، فَقَالَ: أَرْضِعِيهِ يَذْهَبْ مَا فِي وَجْهِ أَبِي حُذَيْفَةَ، قَالَتْ: وَاللَّهِ مَا عَرَفْتُهُ فِي وَجْهِ أَبِي حُذَيْفَةَ بَعْدُ»(١).

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: سەهلەی کچی سوهەیل هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من شتێک دەبینم لە ڕوخساری ئەبو حوزەیفە لە هاتنە ژوورەوەی سالم بۆ لام، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: شیری پێبدە، وتم: ئەو ڕیشی هەیە، فەرمووی: شیری پێبدە ئەوەی لە ڕوخساری ئەبو حوزەیفەیە نامێنێ، وتی: سوێند بە خوا دوای ئەوە هیچم لە ڕوخساری ئەبو حوزەیفەدا نەبینی.**

**٣٣٢٠-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: جَاءَتْ سَهْلَةُ بِنْتُ سُهَيْلٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَتْ: إِنِّي أَرَى فِي وَجْهِ أَبِي حُذَيْفَةَ مِنْ دُخُولِ سَالِمٍ عَلَيَّ، قَالَ: فَأَرْضِعِيهِ، قَالَتْ: وَكَيْفَ أُرْضِعُهُ وَهُوَ رَجُلٌ كَبِيرٌ؟ فَقَالَ: أَلَسْتُ أَعْلَمُ أَنَّهُ رَجُلٌ كَبِيرٌ، ثُمَّ جَاءَتْ بَعْدُ فَقَالَتْ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ نَبِيّاً، مَا رَأَيْتُ فِي وَجْهِ أَبِي حُذَيْفَةَ بَعْدُ شَيْئاً أَكْرَهُهُ»(٢).

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: سەهلەی کچی سوهەیل هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من شتێک دەبینم لە ڕوخساری ئەبو حوزەیفە لە هاتنە ژوورەوەی سالم بۆ لام، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: شیری پێبدە، وتم: چۆن شیری پێبدەم ئەو پیاوێکی گەورەیە، فەرمووی: ئایا نازانم ئەو پیاوێکی گەورەیە، پاشان دوای ئەوە هاتەوە وتی: سوێند بەو خوایەی تۆی بە حەق ڕەوانە کردوە دوای ئەوە هیچ پێ ناخۆش بوونێکم لە ڕوخساری حوزەیفە بەدی نەکرد.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٦ و ١٤٥٣/٣٠، وإبن ماجه: ١٩٤٣.




**٣٣٢١-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ امْرَأَةَ أَبِي حُذَيْفَةَ أَنْ تُرْضِعَ سَالِماً مَوْلَى أَبِي حُذَيْفَةَ، حَتَّى تَذْهَبَ غَيْرَةُ أَبِي حُذَيْفَةَ، فَأَرْضَعَتْهُ وَهُوَ رَجُلٌ قَالَ رَبِيعَةُ: فَكَانَتْ رُخْصَةً لِسَالِمٍ»[١].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە ژنەکەی ئەبو حوزەیفە شیر بدات بە سالمی مەولای ئەبو حوزەیفە، تا غیرەی ئەبو حوزەیفە نەمێنێ، شیری پێدا لە کاتێکدا پیاوێکی گەورە بوو، ڕەبیعە ئەڵێ: ئەوە ڕوخسەتێک بووە بۆ سالم.

**٣٣٢٢-** «عَنْ بْنِ أبي مُلَيْكَةَ عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: جَاءَتْ سَهْلَةُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ سَالِماً يَدْخُلُ عَلَيْنَا وَقَدْ عَقَلَ مَا يَعْقِلُ الرِّجَالُ، وَعَلِمَ مَا يَعْلَمُ الرِّجَالُ، قَالَ: أَرْضِعِيهِ، تَحْرُمِي عَلَيْهِ بِذَلِكَ فَمَكَثْتُ حَوْلاً لَا أُحَدِّثُ بِهِ، وَلَقِيتُ الْقَاسِمَ، فَقَالَ: حَدِّثْ بِهِ، وَلَا تَهَابُهُ»[٢].

واتە: ئیبنو ئەبی مولەیکە دەگێڕێتەوە، لە قاسمی کوڕی موحەممەد لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: سەهلە هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، سالم دێتە ژوورەوە بۆ لامان هەروەکو پیاو عەقڵی کامڵ بووە، ئەوەشی پیاو دەیزانێ ئەویش دەیزانێ، فەرمووی: شیری بدەرێ، بەوە لێی قەدەغە دەبی، ئیبنو ئەبی مولەیکە دەڵێ: ساڵێک مامەوە بۆ کەس باسم نەکرد، گەیشتم بە قاسم وتی: باسی بکەو سەرسام مەبە.

**٣٣٢٣-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّ سَالِماً مَوْلَى أَبِي حُذَيْفَةَ كَانَ مَعَ أَبِي حُذَيْفَةَ وَأَهْلِهِ فِي بَيْتِهِمْ، فَأَتَتْ بِنْتُ سُهَيْلٍ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَتْ: إِنَّ سَالِماً قَدْ بَلَغَ مَا يَبْلُغُ الرِّجَالُ، وَعَقَلَ مَا عَقَلُوهُ، وَإِنَّهُ يَدْخُلُ عَلَيْنَا، وَإِنِّي أَظُنُّ فِي نَفْسِ أَبِي حُذَيْفَةَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئاً، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: أَرْضِعِيهِ تَحْرُمِي عَلَيْهِ، فَأَرْضَعْتُهُ، فَذَهَبَ الَّذِي فِي نَفْسِ أَبِي حُذَيْفَةَ، فَرَجَعْتُ إِلَيْهِ، فَقُلْتُ: إِنِّي قَدْ أَرْضَعْتُهُ، فَذَهَبَ الَّذِي فِي نَفْسِ أَبِي حُذَيْفَةَ»[٣].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: سالمی خزمەتکاری ئەبو حوزەیفە لەگەڵ ئەبو حوزەیفە بوو، خانەوادەکەشی لە ماڵی ئەواندا بوون، کچەکەی سوهەیل هات

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: سالم گەیشتۆتە ئاستی پیاوان و وەکو ئەوانیش عاقڵە، وە دێتە ژوورەوە بۆ لامان، من وا هەست دەکەم ئەبو حوزەیفە ئەوەی پێناخۆشە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: شیری پێبدە قەدەغە دەبی لێی، شیرم پێیدا، ئەوەی لە دەروونی ئەبو حوزەیفەدا بوو نەما، گەڕامەوە بۆ لای، وتم: من شیرم پێدا، ئەوەی لە دەروونی ئەبو حوزەیفەدا بوو نەما.

**٣٣٢٤-** «عَنْ عُرْوَةَ ﵁ قَالَ: أَبَى سَائِرُ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ أَنْ يَدْخُلَ عَلَيْهِنَّ بِتِلْكَ الرَّضْعَةِ أَحَدٌ مِنَ النَّاسِ يُرِيدُ رَضَاعَةَ الْكَبِيرِ، وَقُلْنَ لِعَائِشَةَ: وَاللَّهِ مَا نُرَى الَّذِي أَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ سَهْلَةَ بِنْتَ سُهَيْلٍ، إِلَّا رُخْصَةً فِي رَضَاعَةِ سَالِمٍ وَحْدَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَاللَّهِ لَا يَدْخُلُ عَلَيْنَا أَحَدٌ بِهَذِهِ الرَّضْعَةِ وَلَا يَرَانَا»[١].

واتە: عوروە ﵁ دەڵێ: سەرجەم خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ ڕێگریان کرد لەوەی بە ناوەی شیردانەوە هیچ کەسێک بێت بۆ لایان بە مەبەستی شیردانی گەورە، بە عائیشەیان وت: سوێند بە خوا پێمان وایە ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە سەهلەی کچی سوهەیل تەنها ڕوخسەتێک بوو لە لایەن پێغەمبەرەوە بۆ شیرپێدانی سالم، سوێند بە خوا ڕێگە نادەین بە ناوەی شیردانەوە کەسێک بێت بۆ لامان و بمانبینێ.

**٣٣٢٥-** «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ كَانَتْ تَقُولُ: أَبَى سَائِرُ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ أَنْ يُدْخَلَ عَلَيْهِنَّ بِتِلْكَ الرَّضَاعَةِ، وَقُلْنَ لِعَائِشَةَ: وَاللَّهِ مَا نُرَى هَذِهِ إِلَّا رُخْصَةً رَخَّصَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خَاصَّةً لِسَالِمٍ، فَلَا يَدْخُلْ عَلَيْنَا أَحَدٌ بِهَذِهِ الرَّضَاعَةِ وَلَا يَرَانَا»[٢].

واتە: ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ)، خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: سەرجەم خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ ڕێگریان لەوە کرد کەسێک بچێتە ژوورەوە بۆ لایان بە مەبەستی شیردان بە گەورە، وە بە عائیشەیان وت: پێمان وایە ئەوە تەنها مۆڵەتێک بووە پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی داوە بە سالم، ڕێگە نادەین بە ناوەی ئەم شیردانەوە کەسێک بێت بۆ لامان و بمانبینێ.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٠٦١.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٥٤، وإبن ماجه: ١٩٤٧.

## (الْغِيلَةُ) واتە: جووتبوون لەگەڵ ژنی شیردەر

**٣٣٢٦-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ جُدَامَةَ بِنْتَ وَهْبٍ، حَدَّثَتْهَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ أَنْهَى عَنِ الْغِيلَةِ حَتَّى ذَكَرْتُ أَنَّ فَارِسَ وَالرُّومَ يَصْنَعُهُ، وَقَالَ إِسْحَقُ: يَصْنَعُونَهُ «فَلَا يَضُرُّ أَوْلَادَهُمْ»»[1].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: جودامەی کچی وەهەب بۆی باس کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هات بە خەیاڵمدا ڕێگری بکەم لە جووتبوون لەگەڵ ژنێک کە شیر دەدات، تا بۆم باس کرا کە فارس و ڕۆمەکان دەیکەن، ئیسحاق وتی: دەیکەن و هیچ زیان بە منداڵەکانیان ناگات.

## بابەت: عەزل (واتە: دەرهێنانەوەی ئەندامی نێرینە لە ناو داوێنی ئافرەت لەکاتی ئاوهاتنەوەدا، بۆ ئەوەی ئاوەکەی تێنەکات)

**٣٣٢٧-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: ذُكِرَ ذَلِكَ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: وَمَا ذَاكُمْ؟ قُلْنَا: الرَّجُلُ تَكُونُ لَهُ الْمَرْأَةُ فَيُصِيبُهَا وَيَكْرَهُ الْحَمْلَ، وَتَكُونُ لَهُ الْأَمَةُ فَيُصِيبُ مِنْهَا وَيَكْرَهُ أَنْ تَحْمِلَ مِنْهُ، قَالَ: لَا عَلَيْكُمْ أَنْ لَا تَفْعَلُوا، فَإِنَّمَا هُوَ الْقَدَرُ»[2].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ باسی عەزل کرا، فەرمووی: بۆچی ئێوە وا دەکەن؟ وتمان: پیاوێک دەچێتە لای خێزانەکەیەوەو پێی ناخۆشە دووگیان بێ، وە کەنیزەکی لە لایە دەچێتە لایەوە پێی ناخۆشە لێی دووگیان بێ، فەرمووی: لەسەرتان نیە ئەگەر نەیکەن، بەڵکو ئەوە قەزاو قەدەرە.

**٣٣٢٨-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الزُّرَقِيِّ ﷺ: أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْعَزْلِ، فَقَالَ: إِنَّ امْرَأَتِي تُرْضِعُ وَأَنَا أَكْرَهُ أَنْ تَحْمِلَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِنَّ مَا قَدْ قُدِّرَ فِي الرَّحِمِ سَيَكُونُ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٠ و ١٤٤٢/١٤٢، وأبو داود: ٢٠٧٦ و ٢٠٧٧، وإبن ماجه: ٢٠١١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٥٤٢ و ٥٢١٠، ومسلم: ١٢٥ و ١٤٣٨/١٣٢، وأبو داود: ٢١٧٠ و ٢١٧٦، والترمذي: ١١٣٨، وإبن ماجه: ١٩٢٦.

(٣) صحيح.




واتە: ئەبو سەعیدی زورقی ﷺ دەگێڕێتەوە: پیاوێک پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد لە بارەی عەزلەوە، وتی: خێزانەکەم شیر دەدات و حەز ناکەم دووگیان بێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوەی خوا داینراوە لە ناو ڕەحمی ئافرەتدا هەر دەبێ ببێ.

## حەقی شیردان و قەدەغە بوونی

**٣٣٢٩-** «عَنْ حَجَّاجِ بْنِ حَجَّاجٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا يُذْهِبُ عَنِّي مَذَمَّةَ الرَّضَاعِ؟ قَالَ: غُرَّةٌ عَبْدٌ أَوْ أَمَةٌ»[١].

واتە: حەجاجی کوڕی حەجاج دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ: دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چی شتێک حەق و مافی شیردانم لەسەر لا دەبات؟ فەرمووی: کۆیلەیەکی بە نرخ، یان هەر کۆیلەیەک یان کەنیزەکێک.

## شایەتی لە شیردان

**٣٣٣٠-** «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ الْحَارِثِ ﷺ قَالَ: تَزَوَّجْتُ امْرَأَةً، فَجَاءَتْنَا امْرَأَةٌ سَوْدَاءُ، فَقَالَتْ: إِنِّي قَدْ أَرْضَعْتُكُمَا، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ، فَأَخْبَرْتُهُ، فَقُلْتُ: إِنِّي تَزَوَّجْتُ فُلَانَةَ بِنْتَ فُلَانٍ، فَجَاءَتْنِي امْرَأَةٌ سَوْدَاءُ، فَقَالَتْ: إِنِّي قَدْ أَرْضَعْتُكُمَا، فَأَعْرَضَ عَنِّي، فَأَتَيْتُهُ مِنْ قِبَلِ وَجْهِهِ، فَقُلْتُ: إِنَّهَا كَاذِبَةٌ، قَالَ: وَكَيْفَ بِهَا وَقَدْ زَعَمَتْ أَنَّهَا قَدْ أَرْضَعَتْكُمَا، دَعْهَا عَنْكَ»[٢].

واتە: عوقبەی کوڕی حاریث ﷺ دەڵێ: ژنێکم خوازبێنی کرد، ئافرەتێکی ڕەش پێست هات بۆ لامان، وتی: من شیرم داوە بە هەردووکتان، منیش ڕۆیشتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ هەواڵم پێدا، وتم: من فڵانە کچم خوازبێنی کرد کچی فڵانە کەس، ئافرەتێکی ڕەش پێست هات بۆ لام، وتی: من شیرم داوە بە هەردووکتان، پشتی تێکردم، هاتمە پێشی وتم: ئەمە درۆ دەکات، فەرمووی: چۆن درۆ دەداتە پاڵی یان دەیچەسپێنی، لە کاتێکدا ئەو پێی وایە کە شیری داوە پێتان، وازی لێ بێنە، (واتە: لێی جیابەرەوە).

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٠٤٦، والترمذي: ١١٥٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٨٨ و ٢٠٥٢ و ٢٦٤٠ و ٢٦٥٩ و ٢٦٦٠ و ٥١٠٤، وأبو داود: ٣٦٠٣ و ٣٦٠٤، والترمذي: ١١٥١.




## مارەکردنی ئەو ژنەی کە باوک خواستویەتی

**٣٣٣١**- «عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: لَقِيتُ خَالِي وَمَعَهُ الرَّايَةُ، فَقُلْتُ: أَيْنَ تُرِيدُ؟ قَالَ: أَرْسَلَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى رَجُلٍ تَزَوَّجَ امْرَأَةَ أَبِيهِ مِنْ بَعْدِهِ أَنْ أَضْرِبَ عُنُقَهُ، أَوْ أَقْتُلَهُ»(١).

واتە: بەڕاء ﷺ دەڵێ: گەیشتم بە خاڵم بەیداخێکی پێ بوو، وتم: بۆ کوێ دەچی؟ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەوانەی کردوم بۆ لای پیاوێک ژنی باوکی خۆی خواستووە (زڕدایکی) لە دوای مردنی کە بدەم لە گەردنی، یان بیکوژن.

**٣٣٣٢**- «عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: أَصَبْتُ عَمِّي وَمَعَهُ رَايَةٌ، فَقُلْتُ: أَيْنَ تُرِيدُ؟ فَقَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى رَجُلٍ نَكَحَ امْرَأَةَ أَبِيهِ، فَأَمَرَنِي أَنْ أَضْرِبَ عُنُقَهُ وَآخُذَ مَالَهُ»(٢).

واتە: بەڕاء ﷺ دەڵێ: گەیشتم بە مامم بەیداخێکی پێ بوو، وتم: بۆ کوێ دەچی؟ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەوانەی کردوم بۆ لای پیاوێک ژنی باوکی خۆی خواستووە، (زڕدایکی) فەرمانی پێکردوم بدەم لە گەردنی وماڵەکەشی ببەم.

## تەفسیرکردنی فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ ﴿٢٤﴾﴾ (واتە: وە قەدەغە کراوە لێتان ئەوانەی کە مێردیان هەیە لە ئافرەتان جگە لەوانەی کە بوونەتە موڵکتان لە کەنیزەک).

**٣٣٣٣**- «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ: أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ بَعَثَ جَيْشاً إِلَى أَوْطَاسٍ، فَلَقُوا عَدُوّاً فَقَاتَلُوهُمْ، وَظَهَرُوا عَلَيْهِمْ فَأَصَابُوا لَهُمْ سَبَايَا لَهُنَّ أَزْوَاجٌ فِي الْمُشْرِكِينَ، فَكَانَ الْمُسْلِمُونَ تَحَرَّجُوا مِنْ غِشْيَانِهِنَّ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ: ﴿وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ ﴿٢٤﴾﴾النساء، أَيْ هَذَا لَكُمْ حَلَالٌ إِذَا انْقَضَتْ عِدَّتُهُنَّ»(٣).

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ سوپایەکی نارد بۆ ئەوطاس، گەیشتن بە دوژمن جەنگیان کردن و سەرکەوتن بەسەریاندا، سەبایایان

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٣٥٧، والترمذي: ١٣٦٢، وإبن ماجه: ٢٦٠٧.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٣٣ و ١٤٥٦/٣٥، وأبو داود: ٢١٥٥، والترمذي: ١١٣٢ و ٣٠١٦ و ٣٠١٧.




لێگرتن مێردیان هەبوو لە نێو هاوبەشدانەران، مسوڵمانان شەرمیان دەکرد جیماعیان لەگەڵدا بکەن، خوا ﷻ ئەمەی دابەزاند: ﴿وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ ۝٢٤﴾. (واتە: ئەو ئافرەتانە بۆتان حەڵاڵن کاتێ عیددەیان تەواو دەبێت).

**بابەت: ژن بە ژنی (الشّغار)، (بریتیە لەوەی پیاوێک کچەکەی خۆی دەدات بە پیاوێکی تر، لە بری ئەوەی ئەویش کچەی خۆی بدات بە ئەم، هیچ مارەییەکەیش لە نێوانیاندا نیە، ئەم زەواجە لە ئیسلامدا دروست نیە).**

**٣٣٣٤-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الشِّغَارِ»[1].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ ژن بە ژنی قەدەغە کردوە.

**٣٣٣٥-** «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا جَلَبَ، وَلَا جَنَبَ، وَلَا شِغَارَ فِي الْإِسْلَامِ، وَمَنْ انْتَهَبَ نُهْبَةً فَلَيْسَ مِنَّا»[2].

واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نە (جَلَبُ) و نە (جَنَبَ) و نە (شِغَارَ) لە ئیسلامدا دروست نیە، هەرکەس ماڵێک داگیر بکات لەسەر ڕێگای ئێمە نیە.

تێبینی: (الْجَلَبُ) لە پێشبڕکێدا ئەوەیە پیاوێک شوێنی ئەسپەکەی بکەوێ و قامچی لێ بدات و هاواری بەسەردا بکات بۆ ئەوەی چاک غار بدات.

(الْجَنَبُ) واتە: پێشبڕکێکار لە تەنیشت ئەسپەکەیدا ئەسپێکی تر دادەنێت ئەگەر یەکەم خاوبوویەوە دەچێتە سەر ئەوی تر بۆ ئەوەی پێش بکەوێ.

**٣٣٣٦-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا جَلَبَ، وَلَا جَنَبَ، وَلَا شِغَارَ فِي الْإِسْلَامِ»[3].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نە (جَلَبُ) و نە (جَنَبَ) و نە (شِغَارَ) لە ئیسلامدا دروست نیە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ١٨٨٥.




## ڕاڤەکردنی ژن بە ژنی (الشّغار)

**٣٣٣٧-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، نَهَى عَنِ الشِّغَارِ، وَالشِّغَارُ أَنْ يُزَوِّجَ الرَّجُلُ الرَّجُلَ ابْنَتَهُ عَلَى أَنْ يُزَوِّجَهُ ابْنَتَهُ، وَلَيْسَ بَيْنَهُمَا صَدَاقٌ»[1].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە ژن بە ژن، وە (الشّغار): بریتیە لەوەی پیاوێک کچەکەی خۆی دەدات بە پیاوێک لە بری ئەوەی ئەویش کچەی خۆی بدات بە ئەم، هیچ مارەییەکیش لە نێوانیاندا نیە.**

**٣٣٣٨-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، عَنِ الشِّغَارِ، قَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ: وَالشِّغَارُ: كَانَ الرَّجُلُ يُزَوِّجُ ابْنَتَهُ عَلَى أَنْ يُزَوِّجَهُ أُخْتَهُ»[2].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغە کردوە لە ژن بە ژن، عوبەیدوڵڵا وتی: وە (الشّغَار) بریتیە لەوەی پیاوێک کچەکەی خۆی دەدات بە پیاوێک لە بری ئەوەی ئەویش خوشکەکەی خۆی بدات بە ئەم.**

### بابەت: مارەکردن لە سەر چەند سوورەتێکی قورئان

**٣٣٣٩-** «عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ: أَنَّ امْرَأَةً جَاءَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، جِئْتُ لِأَهَبَ نَفْسِي لَكَ، فَنَظَرَ إِلَيْهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَصَعَّدَ النَّظَرَ إِلَيْهَا وَصَوَّبَهُ، ثُمَّ طَأْطَأَ رَأْسَهُ، فَلَمَّا رَأَتِ الْمَرْأَةُ أَنَّهُ لَمْ يَقْضِ فِيهَا شَيْئاً، جَلَسَتْ، فَقَامَ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِهِ، فَقَالَ: أَيْ رَسُولَ اللَّهِ، إِنْ لَمْ يَكُنْ لَكَ بِهَا حَاجَةٌ فَزَوِّجْنِيهَا، قَالَ: هَلْ عِنْدَكَ مِنْ شَيْءٍ؟ فَقَالَ: لَا، وَاللَّهِ مَا وَجَدْتُ شَيْئاً، فَقَالَ: انْظُرْ، وَلَوْ خَاتَماً مِنْ حَدِيدٍ، فَذَهَبَ، ثُمَّ رَجَعَ فَقَالَ: لَا وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَلَا خَاتَماً مِنْ حَدِيدٍ، وَلَكِنْ هَذَا إِزَارِي، قَالَ سَهْلٌ: مَا لَهُ رِدَاءٌ، فَلَهَا نِصْفُهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَا تَصْنَعُ بِإِزَارِكَ، إِنْ لَبِسْتَهُ لَمْ يَكُنْ عَلَيْهَا مِنْهُ شَيْءٌ، وَإِنْ لَبِسَتْهُ لَمْ يَكُنْ عَلَيْكَ مِنْهُ شَيْءٌ، فَجَلَسَ الرَّجُلُ حَتَّى طَالَ مَجْلِسُهُ، ثُمَّ قَامَ، فَرَآهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُوَلِّياً، فَأَمَرَ بِهِ، فَدُعِيَ، فَلَمَّا جَاءَ قَالَ: مَاذَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ؟ قَالَ: مَعِي سُورَةُ كَذَا وَسُورَةُ كَذَا، عَدَّدَهَا، فَقَالَ: هَلْ تَقْرَؤُهُنَّ عَنْ ظَهْرِ قَلْبٍ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: مَلَّكْتُكَهَا بِمَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥١١٢ و ٦٩٦٠، ومسلم: ٥٧ و ١٤١٥/٦٠، وأبو داود: ٢٠٧٤، والترمذي: ١١٢٤.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤١٦، وإبن ماجه: ١٨٨٤.

(٣) صحيح.





واتە: سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: ئافرەتێک هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من هاتووم خۆم پێشکەش بکەم بە تۆ، ئەویش تێی ڕوانی پاشان سەری جوڵاندەوە، کاتێک ئافرەتەکە بینی هیچ بڕیارێکی لەسەر نەدا دانیشت، پیاوێک هەڵسا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر پێویستت پێی نیە لە منی مارە بکە، فەرمووی: هیچت هەیە؟ وتی: نەخێر، سوێند بە خوا هیچم نیە، فەرمووی: تەماشا بکە، ئەگەر موستیلەیەکی ئاسنیشت بێت، کابرا ڕۆیشت، پاشان هاتەوە، وتی: سوێند بە خوا هیچم دەست نەکەوت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، تەنانەت موستیلەیەکی ئاسنیش، بەڵام ئەمە عەباکەمە، نیوەی بۆ ئەو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: چی دەکەی لە عەباکەت، ئەگەر لەبەری بکەی هیچ بۆ ئەو نامێنێ، ئەگەر ئەویش لەبەری بکات تۆش هیچت بۆ نامێنێ، پیاوەکەیش ئەندازەیەکی زۆر دانیشت، پاشان هەڵسا، پێغەمبەری خوا ﷺ بینی پشتی هەڵکردو ڕۆیشت، فەرمانی کرد بانگ کرا، کاتێ هات فەرمووی: تۆ چیت لەبەرە لە قورئان؟ وتی: ئەم سوورەتەو ئەو سوورەتەم لە بەرە، بۆی ژمارد، جا فەرمووی: ئایا ئەم سوورەتانە بە دڵ دەخوێنی؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: ئەوە مارەم کرد لێت لە سەر ئەو قورئانەی کە لە لاتە.

## مارەکردن لەسەر ئیسلام

**٣٣٤٠-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: تَزَوَّجَ أَبُو طَلْحَةَ أُمَّ سُلَيْمٍ، فَكَانَ صِدَاقُ مَا بَيْنَهُمَا الْإِسْلَامَ، أَسْلَمَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ قَبْلَ أَبِي طَلْحَةَ، فَخَطَبَهَا، فَقَالَتْ: إِنِّي قَدْ أَسْلَمْتُ، فَإِنْ أَسْلَمْتَ نَكَحْتُكَ، فَأَسْلَمَ فَكَانَ صِدَاقَ مَا بَيْنَهُمَا»[1].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: ئەبو طەڵحە ئوممو سولەیمی خوازبێنی کرد، مارەیی نێوانیان ئیسلام بوو، ئوممو سولەیم پێش ئەبو طەڵحە مسوڵمان بوو، ئەویش داوای کرد، وتی: من مسوڵمان بووم، ئەگەر مسوڵمان ببی شووت پێدەکەم، ئەویش مسوڵمان بوو، ئەوە مارەیی نێوانیان بوو.

**٣٣٤١-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: خَطَبَ أَبُو طَلْحَةَ أُمَّ سُلَيْمٍ، فَقَالَتْ: وَاللَّهِ مَا مِثْلُكَ يَا أَبَا طَلْحَةَ يُرَدُّ، وَلَكِنَّكَ رَجُلٌ كَافِرٌ، وَأَنَا امْرَأَةٌ مُسْلِمَةٌ، وَلَا يَحِلُّ لِي أَنْ أَتَزَوَّجَكَ، فَإِنْ تُسْلِمْ فَذَاكَ مَهْرِي وَمَا أَسْأَلُكَ

---

(١) صحيح.




غَيْرَهُ، فَأَسْلَمَ فَكَانَ ذَلِكَ مَهْرَهَا، قَالَ ثَابِتٌ: فَمَا سَمِعْتُ بِامْرَأَةٍ قَطُّ كَانَتْ أَكْرَمَ مَهْراً مِنْ أُمِّ سُلَيْمٍ الْإِسْلَامَ، فَدَخَلَ بِهَا فَوَلَدَتْ لَهُ»[١].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: ئەبو طەڵحە داوای ئوممو سولەیمی کرد، ئەویش وتی: سوێند بە خوا وێنەی کەسی وەکو تۆ ڕەت ناکرێتەوە، بەڵام تۆ بێبڕوای و منیش مسوڵمانم، حەڵاڵ نیە شووت پێبکەم، ئەگەر مسوڵمان بیت ئەوە مارەییمە، جگە لەوە داوای هیچت لێ ناکەم، ئەویش مسوڵمان بوو، ئەوە بوو بە مارەییەکەی، ثابت دەڵێ: هیچ ئافرەتێکم نەبینیوە مارەییەکەی بەڕێزتر بێت لە ئوممو سولەیم کە ئیسلام بوو، چووە لایەوە منداڵی بوو.

## مارەکردن لەسەر ئازادکردن

**٣٣٤٢-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أَعْتَقَ صَفِيَّةَ وَجَعَلَهُ صَدَاقَهَا»[٢].

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ صەفیەی ئازاد کرد، ئازادکردنەکەشی خستە بری مارەیی.

**٣٣٤٣-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَعْتَقَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَفِيَّةَ، وَجَعَلَ عِتْقَهَا مَهْرَهَا»[٣].

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ صەفیەی ئازادکرد، ئازادکردنەکەشی خستە بری مارەیی.

## ئازادکردنی کەنیزەک لە لایەن خاوەنەکەیەوە، پاشان خواستنی

**٣٣٤٤-** «عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: ثَلَاثَةٌ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُمْ مَرَّتَيْنِ: رَجُلٌ كَانَتْ لَهُ أَمَةٌ فَأَدَّبَهَا فَأَحْسَنَ أَدَبَهَا، وَعَلَّمَهَا فَأَحْسَنَ تَعْلِيمَهَا، ثُمَّ أَعْتَقَهَا وَتَزَوَّجَهَا، وَعَبْدٌ يُؤَدِّي حَقَّ اللَّهِ وَحَقَّ مَوَالِيهِ، وَمُؤْمِنُ أَهْلِ الْكِتَابِ»[٤].

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٢٠٠ و ٥٠٨٦ و ٥١٦٩، ومسلم: ١٣٦٥، وأبو داود: ٢٠٥٤، والترمذي: ١١١٥.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٧ و ٢٥٤٤، ومسلم: ١٥٤، وأبو داود: ٢٠٥٣، وإبن ماجه: ١٩٥٦.




واتە: ئەبو موسا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سێ کەس هەن دووجار پاداشت وەردەگرن: کەسێک کەنیزەکێکی هەبێ و بە چاکترین شێوە پەروەردەی کردبێت، پاشان ئازادی بکات و خۆی بیخوازێ، وە بەندەیەک مافی خواو مافی خاوەنەکەی بدات، هەروەها بڕوادارێکی خاوەن کتێبیش (کەسێک پێشتر جوولەکە بووە، یان نەصرانی بووە، دواتر ئیمانی بە ئیسلام هێناوە).

**٣٣٤٥-** «عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ أَعْتَقَ جَارِيَتَهُ، ثُمَّ تَزَوَّجَهَا فَلَهُ أَجْرَانِ»[١].

واتە: ئەبو موسا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس کەنیزەکەکەی ئازاد بکات و، پاشان بیخوازێ ئەوە دوو پاداشتی بۆ هەیە.

## دادپەروەری لە مارەیەکاندا

**٣٣٤٦-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، عَنْ قَوْلِ اللَّهِ ﷻ: ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا۟ فِى ٱلْيَتَٰمَىٰ فَٱنكِحُوا۟ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ﴿٣﴾ ﴾النساء، قَالَتْ: يَا ابْنَ أُخْتِي، هِيَ الْيَتِيمَةُ، تَكُونُ فِي حَجْرِ وَلِيِّهَا، فَتُشَارِكُهُ فِي مَالِهِ، فَيُعْجِبُهُ مَالُهَا وَجَمَالُهَا، فَيُرِيدُ وَلِيُّهَا أَنْ يَتَزَوَّجَهَا بِغَيْرِ أَنْ يُقْسِطَ فِي صَدَاقِهَا، فَيُعْطِيَهَا مِثْلَ مَا يُعْطِيهَا غَيْرُهُ، فَنُهُوا أَنْ يَنْكِحُوهُنَّ إِلَّا أَنْ يُقْسِطُوا لَهُنَّ، وَيَبْلُغُوا بِهِنَّ أَعْلَى سُنَّتِهِنَّ مِنَ الصَّدَاقِ، فَأُمِرُوا أَنْ يَنْكِحُوا مَا طَابَ لَهُمْ مِنَ النِّسَاءِ سِوَاهُنَّ، قَالَ عُرْوَةُ: قَالَتْ عَائِشَةُ: « ثُمَّ إِنَّ النَّاسَ اسْتَفْتَوْا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَعْدُ فِيهِنَّ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ: ﴿ وَيَسْتَفْتُونَكَ فِى ٱلنِّسَآءِ ۖ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِيهِنَّ ﴿١٢٧﴾ ﴾النساء، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ ﴿١٢٧﴾ ﴾النساء، قَالَتْ عَائِشَةُ: وَالَّذِي ذَكَرَ اللَّهُ تَعَالَى أَنَّهُ يُتْلَى فِي الْكِتَابِ الْآيَةُ الْأُولَى الَّتِي فِيهَا: ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا۟ فِى ٱلْيَتَٰمَىٰ فَٱنكِحُوا۟ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ﴿٣﴾ ﴾النساء، قَالَتْ عَائِشَةُ:وَقَوْلُ اللَّهِ فِي الْآيَةِ الْأُخْرَى: ﴿ وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ ﴿١٢٧﴾ ﴾النساء، رَغْبَةَ أَحَدِكُمْ عَنْ يَتِيمَتِهِ الَّتِي تَكُونُ فِي حَجْرِهِ حِينَ تَكُونُ قَلِيلَةَ الْمَالِ وَالْجَمَالِ، فَنُهُوا أَنْ يَنْكِحُوا مَا رَغِبُوا فِي مَالِهَا مِنْ يَتَامَى النِّسَاءِ إِلَّا بِالْقِسْطِ مِنْ أَجْلِ رَغْبَتِهِمْ عَنْهُنَّ»[٢].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) لەبارەی فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا۟ فِى ٱلْيَتَٰمَىٰ فَٱنكِحُوا۟ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ﴿٣﴾ ﴾، (واتە: وە ئەگەر ترسان دادپەروەر

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤٩٤، ومسلم: ٣٠١٨، وأبو داود: ٢٠٦٨.

نەبن لە مارەیی ئەو ئافرەتە بێ باوکانەدا ئەوە مارە بکەن لەو ئافرەتانەی حەڵاڵن بۆتان)، دەڵێ: ئەی برازاکەم، ئەوە ئافرەتێکی هەتیوە لای بەخێوکەرەکەیەتی، ماڵەکەی لەگەڵدا تێکەڵ دەکات، سەرسام دەبێ بە ماڵ و سامانی و جوانیەکەی، بەخێوکەرەکەی دەیەوێ مارەی بکات بەبێ ئەوەی دادپەروەری بکات لە مارەییەکەیدا، پێی دەبەخشێ وەکو غەیری ئەو، قەدەغەیان لێکرا مارەیان بکەن مەگەر دادپەروەربن لەگەڵیان، وە بە چاکترین شێوە مارەییەکەیان پێ بدەن، وە فەرمانیان پێکراوە ئەو ئافرەتانە مارە بکەن کە حەڵاڵن بۆیان جگە لەوان، عوروە دەڵێ: عائیشە وتی: دواتر خەڵکی پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ کرد لە بارەیانەوە خوا ﷻ ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي ٱلنِّسَآءِ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِيهِنَّ ﴿١٢٧﴾ ﴾ (واتە: ئەی موحەممەد پرسیارت لێدەکەن دەربارەی ئافرەتان، بڵێ: خوا وەڵامتان دەداتەوە دەربارەیان)، تا فەرمایشتی: ﴿ وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ ﴿١٢٧﴾ ﴾ واتە: وە حەز ناکەن مارەیان بکەن، عائیشە وتی: ئەوەی خوا ﷻ باسی کردوە و ئەوەی دەخوێنرێ لە قورئاندا ئایەتی یەکەمە: ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُواْ فِي ٱلْيَتَٰمَىٰ فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ﴿٣﴾ ﴾، عائیشە وتی: هەروەها فەرمایشتی خوا لە ئایەتێکی تردا: ﴿ وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ ﴿١٢٧﴾ ﴾، حەزی یەکێکتان لەبارەی کچێکی هەتیوەوە لای ئەو بەخێو دەکرێ لەکاتێکدا ماڵی کەم بێت و جوان بێت، بۆیە قەدەغەیان لێ کرا ئافرەتانی هەتیو مارە بکەن لە بەر ماڵ و سامانیان مەگەر بە دادپەروەری لەپێناو حەزو ئارەزویان لێیان.

**٣٣٤٧-** «عَنْ أَبِي سَلَمَةَ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَتْ: فَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى اثْنَتَيْ عَشْرَةَ أُوقِيَّةً وَنَشٍّ وَذَلِكَ خَمْسُ مِائَةِ دِرْهَمٍ»(١).

واتە: ئەبو سەلەمە دەڵێ: پرسیارم کرد لە عائیشە (خوا لێیان ڕازی بێ) لەبارەی مارەییەوە، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بە دوازدە ئوقیە و بیست درهەم کردی، ئەویش پێنج سەد درهەم بوو.

**٣٣٤٨-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ الصَّدَاقُ إِذْ كَانَ فِينَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَشْرَةَ أَوَاقٍ»(٢).

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٢٦، وأبو داود: ٢٧٥، وإبن ماجه: ١٨٨٦.

(٢) صحيح الإسناد.




**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: کاتی پێغەمبەر ﷺ لە نێوماندا مارەیی دە ئوقیە بوو.**

**٣٣٤٩-** «عَنْ أَبِي الْعَجْفَاءِ قَالَ: قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ: أَلَا لَا تَغْلُوا صُدُقَ النِّسَاءِ، فَإِنَّهُ لَوْ كَانَ مَكْرُمَةً وَفِي الدُّنْيَا، أَوْتَقْوَى عِنْدَ اللَّهِ ﷻ، كَانَ أَوْلَاكُمْ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ، مَا أَصْدَقَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ امْرَأَةً مِنْ نِسَائِهِ، وَلَا أُصْدِقَتْ امْرَأَةٌ مِنْ بَنَاتِهِ، أَكْثَرَ مِنْ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ أُوقِيَّةً، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيُغْلِي بِصَدُقَةِ امْرَأَتِهِ، حَتَّى يَكُونَ لَهَا عَدَاوَةٌ فِي نَفْسِهِ، وَحَتَّى يَقُولَ: كُلِّفْتُ لَكُمْ عِلْقَ الْقِرْبَةِ، وَكُنْتُ غُلَاماً عَرَبِيّاً مُوَلَّداً فَلَمْ أَدْرِ مَا عِلْقُ الْقِرْبَةِ، قَالَ: وَأُخْرَى يَقُولُونَهَا: لِمَنْ قُتِلَ فِي مَغَازِيكُمْ، أَوْ مَاتَ، قُتِلَ فُلَانٌ شَهِيداً، أَوْ مَاتَ فُلَانٌ شَهِيداً، وَلَعَلَّهُ أَنْ يَكُونَ قَدْ أَوْقَرَ عَجُزَ دَابَّتِهِ، أَوْ دَفَّ رَاحِلَتِهِ ذَهَباً، أَوْ وَرِقاً، يَطْلُبُ التِّجَارَةَ، فَلَا تَقُولُوا ذَاكُمْ، وَلَكِنْ قُولُوا كَمَا قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: مَنْ قُتِلَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، أَوْ مَاتَ فَهُوَ فِي الْجَنَّةِ»[1].

**واتە: ئەبولعەجفاء دەڵێ: عومەری کوڕی خەطاب ﷺ وتی: دەخیلە زێدەڕۆیی مەکەن لە مارەیی ئافرەتاندا، چونکە ئەگەر لە دونیادا ڕێزێک بووایە، یان خۆپارێزی و لە خواترسان بووایە لای خوا، ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ لە پێش هەمووتان دەستپێشخەر دەبوو بۆی، پێغەمبەر ﷺ مارەیی هیچ یەکێک لە خێزانەکانی یان مارەیی کچەکانی زیاتر نەبووە لە دوازدە ئوقیە، کەسی وا هەیە ئەوەندە ڕۆدەچی لە مارەیی ژنەکەیدا تا ئەو مارەیی دەبێتە مایەی شەڕ لە ناخیدا، وە تا دەڵێ هەرچی لە توانامدا بوو خەرجم کرد بۆتان، وە وتی: سیفاتێکی تریش لەبارەی کەسێکەوە لە پێناو خوادا کوژرابێت، یان مردبێت، دەڵێن: فڵانەکەس کوژرا بە شەهیدی،، یان مرد بە شەهیدی، لەوەیە باری قورسی لە وڵاخەکەی نابێ، یان بۆ بازرگانی ڕۆیشتبێ زێڕ بێت یان زیو، وا مەڵێن، بەڵکو بڵێن: هەروەکو پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس لەپێناوی خوادا کوژرا ئەوە شەهیدە، یان مرد ئەوە لە بەهەشتدایە.**

**٣٣٥٠-** «عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، تَزَوَّجَهَا وَهِيَ بِأَرْضِ الْحَبَشَةِ، زَوَّجَهَا النَّجَاشِيُّ، وَأَمْهَرَهَا أَرْبَعَةَ آلَافٍ، وَجَهَّزَهَا مِنْ عِنْدِهِ، وَبَعَثَ بِهَا مَعَ شُرَحْبِيلَ ابْنِ حَسَنَةَ، وَلَمْ يَبْعَثْ إِلَيْهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِشَيْءٍ، وَكَانَ مَهْرُ نِسَائِهِ أَرْبَعَ مِائَةِ دِرْهَمٍ»[2].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢١٠٦، والترمذي: ١١١٤، وإبن ماجه: ١٨٨٧.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٠٨٦ و ٢١٠٧ و ٢١٠٨.

واتە: ئوممو حەبیبە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ مارەی كرد ئەو لە زەوی حەبەشە بوو، نەجاشی لێی مارەكرد، مارەییەكەی چوار هەزار بوو، وە لە لای خۆیەوە ئامادەی كرد، بە شورەحبیلی كوڕی حەسەنەدا ناردی، پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ شتێكی بۆ حەبیبە نەنارد، مارەیی خێزانەكانی چوارسەد درهەم بوو.

## مارەكردن لە سەر پێنج درهەم لە ئاڵتون

**٣٣٥١-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ: أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَبِهِ أَثَرُ الصُّفْرَةِ، فَسَأَلَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَأَخْبَرَهُ، أَنَّهُ تَزَوَّجَ امْرَأَةً مِنَ الأَنْصَارِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كَمْ سُقْتَ إِلَيْهَا؟ قَالَ: زِنَةَ نَوَاةٍ مِنْ ذَهَبٍ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَوْلِمْ وَلَوْ بِشَاةٍ»[١].

واتە: ئەنەسی كوڕی مالك ﷺ دەگێڕێتەوە، عەبدوڕڕەحمانی كوڕی عەوف هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، شوێنەواری زەعفەرانی پێوە بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێكرد، ئەویش هەواڵی پێدا كە ئافرەتێكی لە ئەنصارەكان خواستووە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: چەندێك مارەییت بۆ داناوە؟ ئەویش وتی: كێشی (نَوَاةٍ مِنْ ذَهَبٍ) كە دەكاتە پێنج درهەم لە ئاڵتون، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: چێشت و خواردنی بۆ بكە ئەگەر مەڕێكیش بێت.

**٣٣٥٢-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ ﷺ قَالَ: رَآنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَعَلَيَّ بَشَاشَةُ الْعُرْسِ، فَقُلْتُ: تَزَوَّجْتُ امْرَأَةً مِنَ الأَنْصَارِ، قَالَ: كَمْ أَصْدَقْتَهَا؟ قَالَ: زِنَةَ نَوَاةٍ مِنْ ذَهَبٍ»[٢].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی كوڕی عەوف ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بینیمی دڵخۆشی زاوایەتیم پێوە دیار بوو، وتم: ئافرەتێكم لە ئەنصارەكان خواستووە، فەرمووی: چەندێك مارەییت بۆ داناوە؟ وتی: كێشی (نَوَاةٍ مِنْ ذَهَبٍ) كە دەكاتە پێنج درهەم لە ئاڵتون.

**٣٣٥٣-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: أَيُّمَا امْرَأَةٍ نُكِحَتْ عَلَى صَدَاقٍ أَوْ حِبَاءٍ أَوْ عِدَةٍ قَبْلَ عِصْمَةِ النِّكَاحِ فَهُوَ لَهَا، وَمَا كَانَ بَعْدَ عِصْمَةِ النِّكَاحِ فَهُوَ لِمَنْ أُعْطَاهُ، وَأَحَقُّ مَا أُكْرِمَ عَلَيْهِ الرَّجُلُ ابْنَتُهُ أَوْ أُخْتُهُ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠٤٩، ومسلم: ٧٩ و ١٤٢٧/٨١، وأبو داود: ٢١٠٩، والترمذي: ١٠٩٤ و ١٩٣٣، وإبن ماجه: ١٩٠٧.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٢٧/٨٢.

(٣) حسن. أخرجه أبو داود: ٢١٢٩، وإبن ماجه: ١٩٥٥.




واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕ (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر ئافرەتێک مارە بکرێت لەسەر مارەییەک یان هەر بەخشینێک کە مێردەکەی پێی بدات پێش مارەکردن ئەوە بۆ ئافرەتەکەیە، (نەک باوکی، یان سەرپەرشتیاری) وە ئەوەی لە دوای مارەیی پێی داوە ئەوە بۆ ئەو کەسە دەگەڕێتەوە کە پێی داوە، (ئەوە بۆ پیاوەکەیە) وە چاکترین شتێک کە پیاو ڕێزی پێ لێ بنێ بۆ کچەکەی یان خوشکەکەی مارەکردنیەتی لە پیاوێکی چاک.

## ڕەوایەتی بە شوودان بەبێ مارەیی

**٣٣٥٤-** «عَنْ عَلْقَمَةَ، وَالْأَسْوَدِ، قَالَا: أُتِيَ عَبْدُ اللَّهِ ﷺ فِي رَجُلٍ تَزَوَّجَ امْرَأَةً وَلَمْ يَفْرِضْ لَهَا، فَتُوُفِّيَ قَبْلَ أَنْ يَدْخُلَ بِهَا، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: سَلُوا هَلْ تَجِدُونَ فِيهَا أَثَراً؟ قَالُوا: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، مَا نَجِدُ فِيهَا، يَعْنِي أَثَراً، قَالَ: أَقُولُ بِرَأْيِي فَإِنْ كَانَ صَوَاباً فَمِنَ اللَّهِ، لَهَا كَمَهْرِ نِسَائِهَا، لَا وَكْسَ وَلَا شَطَطَ، وَلَهَا الْمِيرَاثُ، وَعَلَيْهَا الْعِدَّةُ، فَقَامَ رَجُلٌ، مَنْ أَشْجَعَ، فَقَالَ: فِي مِثْلِ هَذَا قَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِينَا، فِي امْرَأَةٍ يُقَالُ لَهَا بَرْوَعُ بِنْتُ وَاشِقٍ تَزَوَّجَتْ رَجُلاً، فَمَاتَ قَبْلَ أَنْ يَدْخُلَ بِهَا ، فَقَضَى لَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِمِثْلِ صَدَاقِ نِسَائِهَا، وَلَهَا الْمِيرَاثُ، وَعَلَيْهَا الْعِدَّةُ، فَرَفَعَ عَبْدُ اللَّهِ يَدَيْهِ وَكَبَّرَ قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: لَا أَعْلَمُ أَحَداً قَالَ فِي هَذَا الْحَدِيثِ الْأَسْوَدُ، غَيْرَ زَائِدَةَ»[1].

واتە: عەلقەمەو ئەسوەد وتیان: پرسیار کرا لە عەبدوڵڵا ﷺ لە بارەی پیاوێکەوە ژنێکی خواستبوو مارەیی بۆ دیاری نەکردبوو، پێش ئەوەی بچێتە لایەوە مردبوو؟ عەبدوڵڵا وتی: تەماشا بکەن بزانن شوێنەوارێک دەدۆزنەوە، وتیان: ئەی باوکی عەبدوڕڕەحمان هیچ شوێنەوارێک بەدی ناکەین، ئەویش وتی: بە بۆچونی خۆم دەڵێم: ئەگەر تەواو بوو ئەوە لە لایەن خواوەیە، مارەیی بۆ هەیە وەکو ژنەکانی تری، نە کەم و نە زۆر، عیدەیشی بۆ هەیە میراتیش دەبات، پیاوێک هەڵساو وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هەر وەکو ئەمە بڕیاریدا لەبارەی ئافرەتێک پێی دەوترا بەروعی کچی واشیق، شوی کردبوو بە پیاوێک مێردەکەی مرد پێش ئەوەی بچێتە لایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دادوەری کرد بۆی بە وێنەی مارەیی ژنەکانی تری، میرات دەبات و عیدەیشی بۆ هەیە، عەبدوڵڵا دەستەکانی بەرزکردەو تەکبیری کرد. ئەبو عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: نەمبیستووە کەس ئەم فەرموودەی ئەسوەدە باس بکات جگە لە زائیدە.

---

(١) صحيح.

**٣٣٥٥-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّهُ أُتِيَ فِي امْرَأَةٍ تَزَوَّجَهَا رَجُلٌ، فَمَاتَ عَنْهَا وَلَمْ يَفْرِضْ لَهَا صَدَاقاً، وَلَمْ يَدْخُلْ بِهَا، فَاخْتَلَفُوا إِلَيْهِ قَرِيباً مِنْ شَهْرٍ لَا يُفْتِيهِمْ، ثُمَّ قَالَ: أَرَى لَهَا صَدَاقَ نِسَائِهَا، لَا وَكْسَ وَلَا شَطَطَ، وَلَهَا الْمِيرَاثُ، وَعَلَيْهَا الْعِدَّةُ، فَشَهِدَ مَعْقِلُ بْنُ سِنَانٍ الْأَشْجَعِيُّ ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَضَى فِي بَرْوَعَ بِنْتِ وَاشِقٍ بِمِثْلِ مَا قَضَيْتَ»[١].

**واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە: ئافرەتێكیان هێنا پیاوێک خواستبووی، پیاوەكەی مردبوو نە مارەیی بۆ دیاری كردبوو، نەچووبووە لایەوە، جیاوازی كەوتە نێوانیان لە بارەیەوە نزیكەی مانگێک فتوای بۆ نەدەن، پاشان وتی: وا دەبینم هەروەكو ژنەكانی تری مارەیی بۆ هەیە، بە بێ زیادو كەم، میرات دەبات و عیدەیشی بۆ هەیە، مەعقیلی كوڕی سینانی ئەشجەعی شایەتیدا كە پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاریدا لەبارەی بەروعی كچی واشیق هەروەكو ئەوەی كە تۆ بڕیارتدا.**

**٣٣٥٦-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، فِي رَجُلٍ تَزَوَّجَ امْرَأَةً فَمَاتَ وَلَمْ يَدْخُلْ بِهَا وَلَمْ يَفْرِضْ لَهَا قَالَ: لَهَا الصَّدَاقُ، وَعَلَيْهَا الْعِدَّةُ، وَلَهَا الْمِيرَاثُ، فَقَالَ مَعْقِلُ بْنُ سِنَانٍ: فَقَدْ سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ قَضَى بِهِ فِي بَرْوَعَ بِنْتِ وَاشِقٍ»[٢].

**واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە: لە بارەی پیاوێكەوە ژنێكی خواستبوو پاشان مرد، نەچووبووە لایەوە نە مارەییشی بۆ دیاری كردبوو، وتی: مارەیی بۆ هەیەو عیدەیشی لەسەرە، میراتیش دەبات، مەعقیلی كوڕی سینان وتی: پێغەمبەر ﷺ بڕیاری پێ داوە لەبارەی بەروعی كچی واشیقەوە.**

**٣٣٥٧-** «عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ مِثْلَهُ»[٣].

**واتە: عەلقەمە دەگێڕێتەوە، لە عەبدوڵلاوە وەكو ئەوە.**

**٣٣٥٨-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّهُ أَتَاهُ قَوْمٌ فَقَالُوا: إِنَّ رَجُلاً مِنَّا تَزَوَّجَ امْرَأَةً وَلَمْ يَفْرِضْ لَهَا صَدَاقاً، وَلَمْ يَجْمَعْهَا إِلَيْهِ حَتَّى مَاتَ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: مَا سُئِلْتُ مُنْذُ فَارَقْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَشَدَّ عَلَيَّ مِنْ هَذِهِ، فَأْتُوا غَيْرِي، فَاخْتَلَفُوا إِلَيْهِ فِيهَا شَهْراً، ثُمَّ قَالُوا لَهُ فِي آخِرِ ذَلِكَ: مَنْ نَسْأَلُ إِنْ لَمْ نَسْأَلْكَ، وَأَنْتَ مِنْ جِلَّةِ أَصْحَابِ مُحَمَّدٍ ﷺ بِهَذَا الْبَلَدِ وَلَا نَجِدُ غَيْرَكَ؟ قَالَ: سَأَقُولُ فِيهَا بِجَهْدِ رَأْيِي، فَإِنْ كَانَ صَوَاباً

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢١١٤ و ٢١١٥، والترمذي: ١١٤٥، وإبن ماجه: ١٨٩١.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




فَمِنَ اللَّهِ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَإِنْ كَانَ خَطَأً فَمِنِّي وَمِنَ الشَّيْطَانِ وَاللَّهُ وَرَسُولُهُ مِنْهُ بُرَآءُ، أُرَى أَنْ أَجْعَلَ، لَهَا صَدَاقَ نِسَائِهَا، لَا وَكْسَ وَلَا شَطَطَ، وَلَهَا الْمِيرَاثُ، وَعَلَيْهَا الْعِدَّةُ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً، قَالَ: وَذَلِكَ بِسَمْعِ أُنَاسٍ مَنْ أَشْجَعَ، فَقَامُوا فَقَالُوا: «نَشْهَدُ أَنَّكَ قَضَيْتَ بِمَا قَضَى بِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي امْرَأَةٍ مِنَّا يُقَالُ لَهَا: بَرْوَعُ بِنْتُ وَاشِقٍ»، قَالَ: فَمَا رُئِيَ عَبْدُ اللَّهِ فَرِحَ، فَرْحَةً يَوْمَئِذٍ إِلَّا بِإِسْلَامِهِ»[١].

**واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە: خەڵکانێک هاتن بۆ لای وتیان: پیاوێک لە ئێمە ژنێکی هێناوە نە مارەیی بۆ دیاری کرد و نە چووە لایەوە تا مرد، عەبدوڵلا وتی: لەوەتەی لە پێغەمبەری خوا ﷺ جیابوومەتەوە پرسیاری لەوە گرانترم لێ نەکراوە، بڕۆن بۆ لای کەسێکی تر جگە لە من، ئەوانیش بۆ ماوەی یەک مانگ جیاوازیان تێ کەوتبوو، پاشان لە کۆتا جاردا پێیان وت: پرسیار لە کێ بکەین ئەگەر تۆ نەبی، تۆش لە پیاوە گەورەکانی هاوەڵی موحەممەدی ﷺ لەم شارەدا، جگە لە تۆ کەس نابینینەوە، وتی: بە بۆچوونی خۆم قسەی لەسەر دەکەم، ئەگەر ڕاست بوو ئەوە لە خوای تاک و تەنهای بێ هاوەڵەوەیە، وە ئەگەر هەڵەیش بوو ئەوە لە من و لە شەیتانەوەیە، خواو پێغەمبەرەکەی لێی بەرین، من پێم وایە: هەروەکو ژنەکانی تری مارەیی پێ بدرێ، بە بێ کەم و زیاد، میراتیشی پێ بدرێت و چوار مانگ و دە ڕۆژیش لە عیدەدا دابنیشێ، ئەویش لە شوێنێکدا بوو خەڵکانێک لە (أَشْجَعَ) گوێ بیستی بوون، هەڵسان و وتیان: شایەتی دەدەین بڕیارتدا هەروەکو چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری پێدا لەبارەی ئافرەتێک لە ئێمەوە پێی دەوترا: بەروعی کچی واشیق، وتی: عەبدوڵلا لەو ڕۆژەدا بە جۆرێ دڵخۆش بوو، دڵخۆشیەک مەگەر بە ئیسلام بوونی.**

## بابەت: ئافرەت خۆی پێشکەش بکات بە پیاو بەبێ مارەیی

**٣٣٥٩-** «عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ جَاءَتْهُ امْرَأَةٌ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي قَدْ وَهَبْتُ نَفْسِي لَكَ، فَقَامَتْ قِيَاماً طَوِيلاً، فَقَامَ رَجُلٌ، فَقَالَ: زَوِّجْنِيهَا إِنْ لَمْ يَكُنْ لَكَ بِهَا حَاجَةٌ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: هَلْ عِنْدَكَ شَيْءٌ؟ قَالَ: مَا أَجِدُ شَيْئاً، قَالَ: الْتَمِسْ وَلَوْ خَاتَماً مِنْ حَدِيدٍ فَالْتَمَسَ، فَلَمْ يَجِدْ شَيْئاً، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: هَلْ مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ شَيْءٌ؟ قَالَ: نَعَمْ، سُورَةُ كَذَا وَسُورَةُ كَذَا، لِسُوَرٍ سَمَّاهَا، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: قَدْ زَوَّجْتُكَهَا عَلَى مَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەگێڕێتەوە: ئافرەتێک هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من خۆمم پێشکەشی تۆ کردوە، زۆر بە پێوە وەستا، پیاوێک هەڵسا، وتی: لە منی مارە بکە ئەگەر هیچ پێویستیەکت پێ نیە، فەرمووی: ئایا شتێکت لە لایە؟ وتی: هیچ شک نابەم، فەرمووی: ئەگەر موستیلەیەکی ئاسنیشت پەیدا کردوە پەیدای بکە، هیچی بۆ پەیدا نەکرا، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئایا شتێکت لەبەرە لە قورئان؟ وتی: بەڵێ، سوورەتی فلان و سوورەتی فلان، بە چەند سوورەتێک ناوی هێنان، (دوای ڕەزامەدنی ئافرەتەکە) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە لێم مارە کردی، لەسەر ئەو قورئانەی کە لاتە.

## بابەت: حەڵاڵ کردنی داوێن

**٣٣٦٠-** «عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي لرَّجُلِ يَأْتِي جَارِيَةَ امْرَأَتِهِ، قَالَ: إِنْ كَانَتْ أَحَلَّتْهَا لَهُ جَلَدْتُهُ مِائَةً، وَإِنْ لَمْ تَكُنْ أَحَلَّتْهَا لَهُ رَجَمْتُهُ»(١).

واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دەگێڕێتەوە: لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەربارەی کەسێک دەچێتە لای کەنیزەکی ژنەکەیەوە، فەرمووی: ئەگەر ژنەکەی بۆی حەڵاڵ کردبێ سەد داری لێ دەدەم، وە ئەگەر بۆی حەڵاڵ نەکردبێ بەردبارانی دەکەم.

**٣٣٦١-** «عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ: أَنَّ رَجُلاً يُقَالُ لَهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ حُنَيْنٍ وَيُنْبَزُ قُرْقُوراً، أَنَّهُ وَقَعَ بِجَارِيَةِ امْرَأَتِهِ، فَرُفِعَ إِلَى النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ، فَقَالَ: لَأَقْضِيَنَّ فِيهَا بِقَضِيَّةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، إِنْ كَانَتْ أَحَلَّتْهَا لَكَ جَلَدْتُكَ، وَإِنْ لَمْ تَكُنْ أَحَلَّتْهَا لَكَ رَجَمْتُكَ بِالْحِجَارَةِ، فَكَانَتْ أَحَلَّتْهَا لَهُ، فَجُلِدَ مِائَةً»(٢).

واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دەگێڕێتەوە: پیاوێک پێی دەوترا عەبدوڕڕەحمانی کوڕی حونەین نازناوی قەڕقوڕ بوو، ئەو چووە لای کەنیزەکی ژنەکەیەوە، ئەو هەواڵە بەرزکرایەوە بۆ لای نوعمانی کوڕی بەشیر، وتی: دادوەری تێدا دەکەم بە دادوەری پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر حەڵاڵی کردبێ بۆت دارت لێ دەدەم، وە ئەگەر حەڵاڵی نەکردبێ بۆت بەردبارانت دەکەم بە بەرد، جا ژنەکەی بۆی حەڵاڵ کردبوو، سەد داری لێدرا.

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤٤٥٨ و ٤٤٥٩، والترمذي: ١٤٥١ و ١٤٥٢، وإبن ماجه: ٢٥٥١.

(٢) ضعيف.

**٣٣٦٢-** «عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ فِي رَجُلٍ وَقَعَ بِجَارِيَةِ امْرَأَتِهِ: إِنْ كَانَتْ أَحَلَّتْهَا لَهُ، فَأَجْلِدْهُ مِائَةً، وَإِنْ لَمْ تَكُنْ أَحَلَّتْهَا لَهُ، فَأَرْجُمْهُ»[١].

**واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی کەسێکەوە کە چووە لای کەنیزەکی ژنەکەیەوە فەرمووی: ئەگەر حەڵاڵی کردبێ بۆی، سەد داری لێ دەدەم، ئەگەر حەڵاڵیشی نەکردبێ بۆی ئەوە بەردبارانی دەکەم.**

**٣٣٦٣-** «عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْمُحَبَّقِ ﷺ قَالَ: قَضَى النَّبِيُّ ﷺ فِي رَجُلٍ وَطِئَ جَارِيَةَ امْرَأَتِهِ، إِنْ كَانَ اسْتَكْرَهَهَا فَهِيَ حُرَّةٌ وَعَلَيْهِ لِسَيِّدَتِهَا مِثْلُهَا، وَإِنْ كَانَتْ طَاوَعَتْهُ فَهِيَ لَهُ وَعَلَيْهِ لِسَيِّدَتِهَا مِثْلُهَا»[٢].

**واتە: سەلەمەی کوڕی موحەبەق ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دادوەری کرد لە بارەی پیاوێکەوە چوو بووە لای کەنیزەکی ژنەکەیەوە، ئەگەر زۆری لێکردبێ ئەوە ئازادە، دەبێ پیاوەکە کەنیزەکێکی وەکو ئەو بۆ ژنەکەی بهێنێ، وە ئەگەر کەنیزەکەکە بە حەزی خۆی بووبێ ئەوە بۆ ئەوە، دەبێ پیاوەکە کەنیزەکێک وەکو ئەو بۆ ژنەکەی بهێنێ.**

**٣٣٦٤-** «عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْمُحَبَّقِ ﷺ: أَنَّ رَجُلاً غَشِيَ جَارِيَةً لِامْرَأَتِهِ، فَرُفِعَ ذَلِكَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: إِنْ كَانَ اسْتَكْرَهَهَا فَهِيَ حُرَّةٌ مِنْ مَالِهِ وَعَلَيْهِ الشَّرْوَى لِسَيِّدَتِهَا، وَإِنْ كَانَتْ طَاوَعَتْهُ فَهِيَ لِسَيِّدَتِهَا وَمِثْلُهَا مِنْ مَالِهِ»[٣].

**واتە: سەلەمەی کوڕی موحەبەق ﷺ دەگێڕێتەوە: پیاوێک چووە لای کەنیزەکی ژنەکەیەوە، ئەوە بەرزکرایەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر زۆری لێ کردبێ ئەوە ئازادە، دەبێ پیاوەکە کەنیزەکێکی وەکو ئەو بۆ ژنەکەی بهێنێ، وە ئەگەر کەنیزەکەکە بە حەزی خۆی بووبێ ئەوە بۆ ژنەکەیەتی، وە پیاوەکەی کەنیزەکێکی تری وەکو ئەو لە پارەی خۆی بۆ خێزانەکەی دەکڕێ.**

## قەدەغەکردنی ژن هێنانی کاتی

**٣٣٦٥-** «عَنِ الْحَسَنِ، وَعَبْدِ اللَّهِ، ابْنَيْ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِيهِمَا، أَنَّ عَلِيّاً ﷺ، بَلَغَهُ أَنَّ رَجُلاً لَا يَرَى

---

**(١) ضعيف.**

**(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤٤٦٠ و ٤٤٦١، وإبن ماجه: ٢٥٥٢.**

**(٣) ضعيف.**




بِالْمُتْعَةِ بَأْساً، فَقَالَ: إِنَّكَ تَائِهٌ، إِنَّهُ نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْهَا، وَعَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الْأَهْلِيَّةِ يَوْمَ خَيْبَرَ»[١].

**واتە: حەسەن و عەبدوڵڵای کوڕی موحەممەد گێڕایانەوە، لە باوکیانەوە، عەلی ﷺ، هەواڵی پێگەیشت کە پیاوێک پێی وایە ژن هێنانی کاتی هیچ کێشەیەکی تێدانیە، وتی: تۆ کەسێکی وێڵ و سەرگەردانی، بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی خەیبەردا ژن هێنانی کاتی قەدەغە کردوە، هەروەها گۆشتی گوێدرێژیماڵیش.**

**٣٣٦٦-** «عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ مُتْعَةِ النِّسَاءِ يَوْمَ خَيْبَرَ، وَعَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الْإِنْسِيَّةِ»[٢].

**واتە: عەلی کوڕی ئەبو طاڵیب ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی خەیبەردا ژن هێنانی کاتی و گۆشتی گوێدرێژی ماڵی قەدەغە کرد.**

**٣٣٦٧-** «عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ خَيْبَرَعَنْ مُتْعَةِ النِّسَاءِ، قَالَ ابْنُ الْمُثَنَّى: يَوْمَ حُنَيْنٍ»[٣].

**واتە: عەلی کوڕی ئەبو طاڵیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی خەیبەردا ژن هێنانی کاتی قەدەغەکرد.**

**٣٣٦٨-** «عَنِ الرَّبِيعِ بْنِ سَبْرَةَ الْجُهَنِيِّ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: أَذِنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالْمُتْعَةِ، فَانْطَلَقْتُ أَنَا وَرَجُلٌ إِلَى امْرَأَةٍ مِنْ بَنِي عَامِرٍ فَعَرَضْنَا عَلَيْهَا أَنْفُسَنَا، فَقَالَتْ: مَا تُعْطِينِي؟ فَقُلْتُ: رِدَائِي، وَقَالَ صَاحِبِي: رِدَائِي، وَكَانَ رِدَاءُ صَاحِبِي أَجْوَدَ مِنْ رِدَائِي، وَكُنْتُ أَشَبَّ مِنْهُ، فَإِذَا نَظَرَتْ إِلَى رِدَاءِ صَاحِبِي أَعْجَبَهَا، وَإِذَا نَظَرَتْ إِلَيَّ أَعْجَبْتُهَا، ثُمَّ قَالَتْ: أَنْتَ وَرِدَاؤُكَ يَكْفِينِي، فَمَكَثْتُ مَعَهَا ثَلَاثاً، ثُمَّ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ كَانَ عِنْدَهُ مِنْ هَذِهِ النِّسَاءِ اللَّاتِي يَتَمَتَّعُ، فَلْيُخَلِّ سَبِيلَهَا»[٤].

**واتە: ڕەبیعی کوڕی سەبرەی جوهەنی دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی دا بە ژن هێنانی کاتی، من و پیاوێک ڕۆیشتین بۆ لای**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٢١٦ و ٥١١٥ و ٥٥٢٣ و ٦٩٦١، ومسلم: ٢٩ و ٣٠ و ١٤٠٧/٣٢، والترمذي: ١١٢١ و ١٧٩٤، وإبن ماجه: ١٩٦١.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩ و ١٤٠٦/٢٨، وأبو داود: ٢٠٧٢ و ٢٠٧٣، وإبن ماجه: ١٩٦٢.




ئافرەتێک لە بەنی عامر، هەردووکمان خۆمان نیشانیدا، وتی: چیم دەدەیتێ؟ وتم: عەباکەم، هاوڕێکەیشم وتی: عەباکەم، عەباکەی هاوڕێکەم لەوەی من تازەتر بوو، منیش لە ئەو گەنجتر بووم، جا کاتێ تەماشای عەبای هاوڕێیەکەمی دەکرد سەرسام دەبوو پێی، وە کاتێ تەماشای منی دەکرد سەرسام دەبوو پێم، پاشان وتی: تۆو عەباکەت بەسە بۆم، سێ شەو لەگەڵی مامەوە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەس لەم ئافرەتانەی لایە کە بە کاتی هێناونی ئەوە با وازیان لێ بهێنێ.

## ئاشکرا کردنی مارەبڕین بە دەنگ و لێدانی دەف

**٣٣٦٩-** «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ حَاطِبٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: فَصْلُ مَا بَيْنَ الْحَلَالِ وَالْحَرَامِ الدُّفُّ وَالصَّوْتُ فِي النِّكَاحِ»[١].

**واتە: موحەممەدی کوڕی حاطەب ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جیاوازی نێوان مارە بڕینی حەڵاڵ و قەدەغە کراو لێدانی دەف و دەنگ بەرزکردنەوەیە.**

**٣٣٧٠-** «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ حَاطِبٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ فَصْلَ مَا بَيْنَ الْحَلَالِ وَالْحَرَامِ الصَّوْتُ»[٢].

**واتە: موحەممەدی کوڕی حاطەب ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جیاوازی نێوان مارە بڕینی حەڵاڵ و قەدەغە کراو لێدانی دەف و دەنگ بەرزکردنەوەیە.**

## پیاو کاتێ ژنی مارەبڕی چ نزایەکی بۆ دەکرێ؟

**٣٣٧١-** «عَنِ الْحَسَنِ قَالَ: تَزَوَّجَ عَقِيلُ بْنُ أَبِي طَالِبٍ ﵁، امْرَأَةً مِنْ بَنِي جَثْمٍ، فَقِيلَ لَهُ: بِالرِّفَاءِ وَالْبَنِينَ، قَالَ: قُولُوا كَمَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: بَارَكَ اللَّهُ فِيكُمْ، وَبَارَكَ لَكُمْ»[٣].

**واتە: حەسەن دەڵێ: عەقیلی کوڕی ئەبو طاڵیب ﵁، ئافرەتێکی خوازبێنی کرد لە نەوەی جەثم، پێی وترا: بە خۆشی و منداڵ بوون، وتی: ئەوە بڵێن کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا پیرۆزی بکا لێتان و بۆتان پیرۆز بێت).**

---

(١) حسن. أخرجه الترمذي: ١٠٨٨، وإبن ماجه: ١٨٩٦.

(٢) حسن. أخرجه الترمذي: ١٠٨٨، وإبن ماجه: ١٨٩٦.

(٣) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ١٩٠٦.

## نزای ئەو کەسەی کە ئامادەی مارەبڕینەکە نەبووە

**٣٣٧٢-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَأَى عَلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَثَرَ صُفْرَةٍ، فَقَالَ: مَا هَذَا؟ قَالَ: تَزَوَّجْتُ امْرَأَةً عَلَى وَزْنِ نَوَاةٍ مِنْ ذَهَبٍ، فَقَالَ: بَارَكَ اللَّهُ لَكَ، أَوْلِمْ وَلَوْ بِشَاةٍ»(١).

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف بینی شوێنەواری زەعفەرانی پێوە بوو، فەرمووی: ئەوە چیە؟ وتی: ژنم هێناوە مارەیەکەی (نَوَاةٍ مِنْ ذَهَبٍ) ناوکێکە لە ئاڵتون، (کە دەکاتە کێشی پێنج درهەم ئاڵتون) فەرمووی: خوا پیرۆزی بکا لێت، چێشت و خواردنی بۆ بکە ئەگەر مەڕێکیش بێت.**

## مۆڵەتدان بۆ بەکارهێنانی زەعفەران لە کاتی ژن مارەکردندا

**٣٣٧٣-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ: أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ جَاءَ وَعَلَيْهِ رَدْعٌ مِنْ زَعْفَرَانٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَهْيَمْ؟ قَالَ: تَزَوَّجْتُ امْرَأَةً، قَالَ: وَمَا أَصْدَقْتَ؟ قَالَ: وَزْنَ نَوَاةٍ مِنْ ذَهَبٍ، قَالَ: أَوْلِمْ وَلَوْ بِشَاةٍ»(٢).

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف هات شوێنەواری زەعفەرانی پێوە بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە چیە؟ وتی: ژنم هێناوە، فەرمووی: مارەیی چیت بۆ دانا؟ وتی: کێشی (نَوَاةٍ مِنْ ذَهَبٍ) ناوکێک لە ئاڵتون، (کە دەکاتە کێشی پێنج درهەم ئاڵتون) فەرمووی: چێشت و خواردنی بۆ بکە ئەگەر مەڕێکیش بێت.**

**٣٣٧٤-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: رَأَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَيَّ، كَأَنَّهُ يَعْنِي عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ، أَثَرَ صُفْرَةٍ، فَقَالَ: مَهْيَمْ؟ قَالَ: تَزَوَّجْتُ امْرَأَةً مِنَ الْأَنْصَارِ، فَقَالَ: أَوْلِمْ وَلَوْ بِشَاةٍ»(٣).

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ عەبدوڕڕەحمانی بینی شوێنەواری زەردی زەعفەرانی پێوە دیار بوو، فەرمووی: ئەوە چیە؟ وتی: ژنێکم لە ئەنصارەکان مارەکردوە، فەرمووی: چێشت و خواردنی بۆ بکە ئەگەر مەڕێکیش بێت.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## حەڵاڵە بۆ كچ و كوڕ دوای مارە بڕین بە تەنها پێكەوە بمێننەوە

**٣٣٧٥-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ عَلِيّاً قَالَ: تَزَوَّجْتُ فَاطِمَةَ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، ابْنِ بِي، قَالَ: أَعْطِهَا شَيْئاً، قُلْتُ: مَا عِنْدِي مِنْ شَيْءٍ، قَالَ: فَأَيْنَ دِرْعُكَ الْحُطَمِيَّةُ؟ قُلْتُ: هِيَ عِنْدِي، قَالَ: فَأَعْطِهَا إِيَّاهُ»(١).

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، عەلی وتی: فاطیمەم مارەكرد وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فاطیمەم بدەری با بیگوازمەوە، فەرمووی: شتێكی بدەرێ، (وەكو مارەیی) وتم: من هیچم لا نیە، فەرمووی: ئەی قەڵغانە حوطەمیەكەت لە كوێیە؟ وتم: لامە، فەرمووی: پێی بدە.**

**٣٣٧٦-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: لَمَّا تَزَوَّجَ عَلِيٌّ فَاطِمَةَ ، قَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَعْطِهَا شَيْئاً، قَالَ: مَا عِنْدِي، قَالَ: فَأَيْنَ دِرْعُكَ الْحُطَمِيَّةُ؟»(٢).

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: كاتێ عەلی فاطیمەی مارەكرد، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: شتێكی بدەرێ (وەكو مارەیی) ئەویش وتی: من هیچم نیە، فەرمووی: ئەی قەڵغانە حوطەمیەكەت لە كوێیە؟!**

## گواستنەوە لە مانگی شەوالدا

**٣٣٧٧-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: تَزَوَّجَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي شَوَّالٍ، وَأُدْخِلْتُ عَلَيْهِ فِي شَوَّالٍ، فَأَيُّ نِسَائِهِ كَانَ أَحْظَى عِنْدَهُ مِنِّي؟»(٣).

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەوالدا مارەی كردم، وە هەر لە شەوالیشدا هاتە لامەوە، جا كام لە خێزانەكانی لای ئەو لە من بەختی چاكترە. (مەبەستی ئەوە بووە وەڵامی ئەوانەی سەردەمی نەفامی بداتەوە كە پێیان وابووە هاوسەرگیری لە مانگی شەوال كارێكی باش نیە)**

---

(١) حسن صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢١٢٥ و ٢١٢٧.

(٣) صحيح.




## گواستنەوەی کچ لە تەمەنی نۆ ساڵیدا

**٣٣٧٨-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: تَزَوَّجَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَنَا بِنْتُ سِتٍّ، وَدَخَلَ عَلَيَّ وَأَنَا بِنْتُ تِسْعِ سِنِينَ، وَكُنْتُ أَلْعَبُ بِالْبَنَاتِ»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەوالدا مارەی کردم من تەمەنم شەش ساڵ بوو، وە گواستمیەوە تەمەنم نۆ ساڵ بوو، ئەو کات یاریم بە بووکەڵە دەکرد.**

**٣٣٧٩-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: تَزَوَّجَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَهِيَ بِنْتُ سِتِّ سِنِينَ، وَبَنَى بِهَا وَهِيَ بِنْتُ تِسْعٍ»[٢].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ مارەی کردم من تەمەنم شەش ساڵ بوو، وە گواستمیەوە تەمەنم نۆ ساڵ بوو.**

## گواستنەوە لە گەشتدا

**٣٣٨٠-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ غَزَا خَيْبَرَ، فَصَلَّيْنَا عِنْدَهَا الْغَدَاةَ بِغَلَسٍ، فَرَكِبَ النَّبِيُّ ﷺ وَرَكِبَ أَبُو طَلْحَةَ، وَأَنَا رَدِيفُ أَبِي طَلْحَةَ، فَأَخَذَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ فِي زُقَاقِ خَيْبَرَ، وَإِنَّ رُكْبَتِي لَتَمَسُّ فَخِذَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَإِنِّي لَأَرَى بَيَاضَ فَخِذِ نَبِيِّ اللَّهِ ﷺ، فَلَمَّا دَخَلَ الْقَرْيَةَ قَالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ، خَرِبَتْ خَيْبَرُ، إِنَّا إِذَا نَزَلْنَا بِسَاحَةِ قَوْمٍ فَسَاءَ صَبَاحُ الْمُنْذَرِينَ، قَالَهَا ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، قَالَ: وَخَرَجَ الْقَوْمُ إِلَى أَعْمَالِهِمْ. قَالَ عَبْدُ الْعَزِيزِ: فَقَالُوا: مُحَمَّدٌ، قَالَ عَبْدُ الْعَزِيزِ: وَقَالَ بَعْضُ أَصْحَابِنَا، وَالْخَمِيسُ وَأَصَبْنَاهَا عَنْوَةً فَجَمَعَ السَّبْيَ، فَجَاءَ دِحْيَةُ، فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، أَعْطِنِي جَارِيَةً مِنَ السَّبْيِ، قَالَ: اذْهَبْ فَخُذْ جَارِيَةً، فَأَخَذَ صَفِيَّةَ بِنْتَ حُيَيٍّ، فَجَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، أَعْطَيْتَ دِحْيَةَ صَفِيَّةَ بِنْتَ حُيَيٍّ سَيِّدَةَ قُرَيْظَةَ وَالنَّضِيرِ، مَا تَصْلُحُ إِلَّا لَكَ، قَالَ: ادْعُوهُ بِهَا، فَجَاءَ بِهَا، فَلَمَّا نَظَرَ إِلَيْهَا النَّبِيُّ ﷺ قَالَ: خُذْ جَارِيَةً مِنَ السَّبْيِ غَيْرَهَا، قَالَ: وَإِنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ أَعْتَقَهَا وَتَزَوَّجَهَا، فَقَالَ لَهُ ثَابِتٌ: يَا أَبَا حَمْزَةَ، مَا أَصْدَقَهَا، قَالَ: نَفْسَهَا أَعْتَقَهَا وَتَزَوَّجَهَا، قَالَ: حَتَّى إِذَا كَانَ بِالطَّرِيقِ جَهَّزَتْهَا لَهُ أُمُّ سُلَيْمٍ، فَأَهْدَتْهَا إِلَيْهِ مِنَ اللَّيْلِ، فَأَصْبَحَ عَرُوساً، قَالَ: مَنْ كَانَ عِنْدَهُ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٨٩٤، ومسلم: ١٤٢٢.




شَيْءٌ فَلْيَجِئْ بِهِ، قَالَ: وَبَسَطَ نِطَعاً، فَجَعَلَ الرَّجُلُ يَجِيءُ بِالْأَقِطِ، وَجَعَلَ الرَّجُلُ يَجِيءُ بِالتَّمْرِ، وَجَعَلَ الرَّجُلُ يَجِيءُ بِالسَّمْنِ، فَحَاسُوا حَيْسَةً، فَكَانَتْ وَلِيمَةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[١].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ جەنگی خەیبەری کرد، نوێژی بەیانیمان لە خزمەتیدا کرد بە تاریکی، جا پێغەمبەری خوا ﷺ سواری وڵاخەکەی بوو، ئەبو طەڵحەیش سوار بوو، منیش لە پشتی ئەبو طەڵحەوە بووم، پێغەمبەر بە ناو کۆڵانەکانی خەیبەردا ڕێی دەکرد، منیش چۆکم دەیدا لە ڕانی پێغەمبەری خوا ﷺ، سپیایەتی ڕانیم دەبینی، کاتێک چووە شارۆچکەکەوە فەرمووی: (اللَّهُ أَكْبَر) خەیبەر وێران بوو، ئەگەر ئێمە هێرش ببەینە سەر هەر قەومێک ئەوسا ترسێنراوان چ ڕۆژێکی خراپ و تەنگانەیان دەبێ، سێ جار ئەمەی فەرموو، وتی: پاشان خەڵکەکە لە ماڵ دەرچوون بۆ لای کاروباری خۆیان، عەبدولعەزیز (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی فەرموودەکە) دەڵێ: وتیان: موحەممەدو ﷺ، عەبدولعەزیز وتی: هەندێ لە هاوەڵانمان (ئەوانەی فەرموودەیان گێڕاوەتەوە) وتویانە، هێزی لەگەڵ خۆی هێناوە، بە زۆر چووینە ناویەوە، دواتر هەموو سەبایەکانی کۆکردەوە، پاشان دیحیە هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کەنیزەکیکم بدەرێ لەو دەستکەوتانە، فەرمووی: بڕۆ دانەیەک ببە، ئەویش صەفیەی کچی حویەی برد، پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ صەفیەی کچی حویەیت بەخشی بە دیحیە کە گەورەی بەنی قورەیزەو نەزیرە، ئەوە تەنها بۆ تۆ گونجاوە، فەرمووی: بانگی بکەن، هێنایان، کاتێ پێغەمبەر تەماشای کرد فەرمووی: بڕۆ دانەیەکی تر ببە جگە لەمە، وتی: پێغەمبەر ﷺ ئازادی کردو بۆ خۆی خواستی، ثابت پێی وت: ئەی باوکی حەمزە، مارەییەکەی چەند بوو؟ وتی: ئازادکردنی نەفسی بوو، پاشان خواستی، وتی: تا لە ڕێگا ئوممو سولەیم ئامادەی دەکرد، بە شەودا پێشکەشی کرد، بەیانی کردەوە بە بووکی، فەرمووی: هەرکەس شتێکی هەیە با بیهێنێ، دواتر پارچە پێستێکی ڕاخست، پیاوی وا هەبوو کەشکی دەهێنا، پیاوی وایش هەبوو خورمای دەهێنا، تێکەڵیان کرد و ئەوە وەلیمەی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٧١، ومسلم: ١٣٦٥، وأبو داود: ٢٩٩٨ و ٣٠٠٩.




**٣٣٨١-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ يَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَقَامَ عَلَى صَفِيَّةَ بِنْتِ حُيَيِّ بْنِ أَخْطَبَ بِطَرِيقِ خَيْبَرَ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ حِينَ عَرَّسَ بِهَا، ثُمَّ كَانَتْ فِيمَنْ ضُرِبَ عَلَيْهَا الْحِجَابُ»[١].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سێ ڕۆژ مایەوە لە لای صەفیەی کچی حویەی کوڕی ئەختەب لە ڕێگای خەیبەر بە بووکێنێ، پاشان ئەو یەکێک بوو لەوانەی پەردەی درا بە سەردا.**

**٣٣٨٢-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: أَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ بَيْنَ خَيْبَرَ وَالْمَدِينَةِ ثَلَاثاً يَبْنِي بِصَفِيَّةَ بِنْتِ حُيَيٍّ، فَدَعَوْتُ الْمُسْلِمِينَ إِلَى وَلِيمَتِهِ، فَمَا كَانَ فِيهَا مِنْ خُبْزٍ وَلَا لَحْمٍ، أَمَرَ بِالْأَنْطَاعِ، وَأَلْقَى عَلَيْهَا مِنَ التَّمْرِ وَالْأَقِطِ وَالسَّمْنِ، فَكَانَتْ وَلِيمَتَهُ، فَقَالَ الْمُسْلِمُونَ: إِحْدَى أُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ، أَوْ مِمَّا مَلَكَتْ يَمِينُهُ، فَقَالُوا: إِنْ حَجَبَهَا، فَهِيَ مِنْ أُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ، وَإِنْ لَمْ يَحْجُبْهَا، فَهِيَ مِمَّا مَلَكَتْ يَمِينُهُ، فَلَمَّا ارْتَحَلَ وَطَّأَ لَهَا خَلْفَهُ، وَمَدَّ الْحِجَابَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ النَّاسِ»[٢].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە نێوانی خەیبەرو مەدینەدا سێ ڕۆژ مایەوە لەگەڵ صەفیەی کچی حویەی، بانگی مسوڵمانانم کرد بۆ خواردنی وەلیمە، نە نانی تێدا بوو نە گۆشت، فەرمانی کرد پارچە پێستێکی ڕابخەن خورماو کەشک و ڕۆنی کرد بە سەریدا، جا ئەوە بوو بە وەلیمە، مسوڵمانان وتیان: یەکێکە لە دایکانی بڕواداران، یان کەنیزەکێتی، وتیان: ئەگەر پەردەی بەسەردا بدات ئەوە یەکێکە لە دایکانی بڕواداران، ئەگەر پەردەیشی بەسەردا نەدا ئەوە کەنیزەکێتی، کاتێ ویستی بڕوا ژێری چاک کردو پەردەی خستە نێوان ئەوو بڕواداران.**

## ڕابواردن و گۆرانی لە کاتی شایی دا

**٣٣٨٣-** «عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى قُرَظَةَ بْنِ كَعْبٍ، وَأَبِي مَسْعُودٍ الْأَنْصَارِيِّ، فِي عُرْسٍ، وَإِذَا جَوَارٍ يُغَنِّينَ، فَقُلْتُ: أَنْتُمَا صَاحِبَا رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَمِنْ أَهْلِ بَدْرٍ، يُفْعَلُ هَذَا عِنْدَكُمْ؟ فَقَالَ: اجْلِسْ إِنْ شِئْتَ فَاسْمَعْ مَعَنَا، وَإِنْ شِئْتَ اذْهَبْ، قَدْ رُخِّصَ لَنَا فِي اللَّهْوِ عِنْدَ الْعُرْسِ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٠٨٥ و ٥١٥٩، وأبو داود: ٢١٢٣.

(٣) صحيح حسن.




واتە: عامری کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: ڕۆیشتم بۆ لای قورظەی کوڕی کەعب و ئەبو مەسعودی ئەنصاڕی لە شاییەکدا، کەنیزەکەکان گۆرانیان دەوت، وتم: ئێوە هەردووکتان هاوەڵی پێغەمبەری خوان ﷺ و لە ئەهلی بەدرن، ئەمە لای ئێوەدا دەکرێ؟ وتی: دابنیشە ئەگەر دەتەوێ گوێ بگرە لەگەڵمان، وە ئەگەر ناتەوێ بڕۆ، پێغەمبەر ﷺ ڕوخسەتی پێداوین بە ڕابواردن لە کاتی شاییدا.

## ئامادەکردنی کچ لە لایەن باوکیەوە بۆ بە شوودان

٣٣٨٤- «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: جَهَّزَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَاطِمَةَ فِي خَمِيلٍ وَقِرْبَةٍ وَوِسَادَةٍ حَشْوُهَا إِذْخِرٌ»[١].

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فاطیمەی ئامادەکرد بە جلێکی خەتدارو جەوەنەیەک و سەرینێک ناوەکەی (إِذْخِرٌ)ی تێدا بوو. (کە گیایەکی بۆن خۆش بوو).

## (دەربارەی) ڕاخەرەکان

٣٣٨٥- «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: فِرَاشٌ لِلرَّجُلِ، وَفِرَاشٌ لِأَهْلِهِ، وَالثَّالِثُ لِلضَّيْفِ، وَالرَّابِعُ لِلشَّيْطَانِ»[٢].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕاخەرێک بۆ پیاوەکە و ڕاخەرێک بۆ خێزانەکەی، سێیەمیان بۆ میوان، چوارەمیان بۆ شەیتانە.

## بەکارهێنانی پۆشاکی ڕەنگاو ڕەنگی قەیفە

٣٣٨٦- «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: هَلْ تَزَوَّجْتَ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: هَلِ اتَّخَذْتُمْ أَنْمَاطاً؟ قُلْتُ: وَأَنَّى لَنَا أَنْمَاطٌ؟ قَالَ: إِنَّهَا سَتَكُونُ»[٣].

---

(١) ضعيف الإسناد.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٠٨٤، وأبو داود: ٤١٤٢.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٦٣١ و ٥٥٦١، ومسلم: ٢٠٨٣، وأبو داود: ٤١٤٥، والترمذي: ٢٧٧٤.




واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو: ئایا ژنت هێناوە؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: ئایا جلی ڕەنگاو ڕەنگی قەیفەتان بەکارهێنا؟ وتم: جلی ڕەنگاو ڕەنگمان لە کوێ؟ فەرمووی: ئەوە لە داهاتوودا دەبێ.

## دیاری بۆ ئەو کەسەی ژن دەهێنێ

**٣٣٨٧-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: تَزَوَّجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَدَخَلَ بِأَهْلِهِ، قَالَ: وَصَنَعَتْ أُمِّي أُمُّ سُلَيْمٍ حَيْساً، قَالَ: فَذَهَبَتْ بِهِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقُلْتُ: إِنَّ أُمِّي تُقْرِئُكَ السَّلَامَ، وَتَقُولُ لَكَ إِنَّ هَذَا لَكَ مِنَّا قَلِيلٌ، قَالَ: ضَعْهُ، ثُمَّ قَالَ: اذْهَبْ فَادْعُ فُلَاناً وَفُلَاناً وَمَنْ لَقِيتَ وَسَمَّى رِجَالاً، فَدَعَوْتُ مَنْ سَمَّى وَمَنْ لَقِيتُهُ، قُلْتُ لِأَنَسٍ: عِدَّةٌ كَمْ كَانُوا؟ قَالَ: يَعْنِي زُهَاءَ ثَلَاثَ مِائَةٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لِيَتَحَلَّقْ عَشَرَةٌ عَشَرَةٌ، فَلْيَأْكُلْ كُلُّ إِنْسَانٍ مِمَّا يَلِيهِ فَأَكَلُوا حَتَّى شَبِعُوا، فَخَرَجَتْ طَائِفَةٌ وَدَخَلَتْ طَائِفَةٌ، قَالَ لِي: يَا أَنَسُ، ارْفَعْ فَرَفَعْتُ، فَمَا أَدْرِي حِينَ رَفَعْتُ كَانَ أَكْثَرَ أَمْ حِينَ وَضَعْتُ»[١].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ژنی هێنا چووە لای خیزانیەوە، وتی: دایکم دایکی سولەیم خواردنی (حَيْس)ی دروست کرد، وتی: بردم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ وتم: دایکم سەلامت لێ دەکات، وە پێت دەڵێ: ئەمە شتێکی کەمە لە لایەن ئێمەوە، فەرمووی: داینێ، پاشان فەرمووی: بڕو فڵانکەس و فڵانکەس و فڵانکەسم بۆ بانگ بکە ئەوەشی پێی گەیشتی، ناوی کۆمەڵە کەسێکی هێنا، بانگی ئەوانەم کرد کە ناوی هێنابوون و ئەوانەش کە پێیان گەیشتبووم، بە ئەنەسم وت: ئەوانە چەن کەس دەبوون؟ وتی: نزیکەی سێ سەد کەس دەبوون، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: با دە کەس دە کەس پێکەوە دانیشن، هەرکەس لە پێشی خۆیەوە بخوات، خواردنیان خوارد تا تێر بوون، دەستەیەک دەچوونە دەرەوەو دەستەیەکیش دەهاتنە ژوورەوە، پێمی فەرموو: ئەی ئەنەس، دەست هەڵگرە دەستم هەڵگرت نەمزانی ئەو کاتەی دەستم هەڵگرت زۆربوو یان ئەو کاتەی دامنا.

**٣٣٨٨-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ يَقُولُ: آخَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْنَ قُرَيْشٍ وَالْأَنْصَارِ، فَآخَى بَيْنَ سَعْدِ بْنِ الرَّبِيعِ وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، فَقَالَ لَهُ سَعْدٌ: إِنَّ لِي مَالاً، فَهُوَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ شَطْرَانِ، وَلِي امْرَأَتَانِ،

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٤٦٦، ومسلم: ١٤٢٨/٩٣.



فَانْظُرْ أَيُّهُمَا أَحَبُّ إِلَيْكَ فَأَنَا أُطَلِّقُهَا، فَإِذَا حَلَّتْ فَتَزَوَّجْهَا، قَالَ: بَارَكَ اللَّهُ لَكَ فِي أَهْلِكَ وَمَالِكَ، دُلُّونِي «أَيْ عَلَى السُّوقِ، فَلَمْ يَرْجِعْ حَتَّى رَجَعَ بِسَمْنٍ وَأَقِطٍ قَدْ أَفْضَلَهُ، قَالَ: وَرَأَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَيَّ أَثَرَ صُفْرَةٍ، فَقَالَ: مَهْيَمْ؟ فَقُلْتُ: تَزَوَّجْتُ امْرَأَةً مِنَ الْأَنْصَارِ، فَقَالَ: أَوْلِمْ وَلَوْ بِشَاةٍ»[1].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ برایەتی لە نێوان قورەیش و ئەنصارەکان دروست کرد، برایەتی لە نێوان سەعدی کوڕی ڕەبیع و عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف دروست کرد، سەعد وتی: ئەو ماڵەی خۆم لە نێوان من و تۆدا دەیکەم بە دوو بەشەوە، وە دوو ژنم هەیە تەماشا بکە کامەیان لە لای تۆ خۆشەویستترە کاتێ حەلاڵ بوو مارەی بکە، وتی: خوا بەرەکەت بخاتە ناو خانەوادەو ماڵتەوە، بازاڕم پێنیشان بدە، نەگەڕایەوە تا ڕۆن و کەشکی هێنا کە ئەو دوانە چاکترینیان بوون، وتی: پێغەمبەر ﷺ شوێنەواری زەردی زەعفەرانی پێمەوە بینی، فەرمووی: ئەوە چیە؟ وتم: ژنێکم لە ئەنصارەکان مارەکردوە، فەرمووی: چێشت و خواردنی بۆ بکە ئەگەر مەڕێکیش بێت.**

---

**(١) صحيح.**




## بابەت: کاتی تەڵاق بۆ ئەو ماوەی کە خوا ﷻ فەرمانی پێ کردوە ئافرەتانی تێدا تەڵاق بدرێ

**٣٣٨٩-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ: أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، فَاسْتَفْتَى عُمَرُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: إِنَّ عَبْدَ اللَّهِ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، فَقَالَ: مُرْ عَبْدَ اللَّهِ فَلْيُرَاجِعْهَا، ثُمَّ يَدَعْهَا حَتَّى تَطْهُرَ مِنْ حَيْضَتِهَا هَذِهِ، ثُمَّ تَحِيضَ حَيْضَةً أُخْرَى، فَإِذَا طَهُرَتْ فَإِنْ شَاءَ فَلْيُفَارِقْهَا قَبْلَ أَنْ يُجَامِعَهَا، وَإِنْ شَاءَ فَلْيُمْسِكْهَا، فَإِنَّهَا الْعِدَّةُ الَّتِي أَمَرَ اللَّهُ ﷻ أَنْ تُطَلَّقَ لَهَا النِّسَاءُ»[١].

**واتە:** عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو ژنەکەی تەڵاقدا لە حەیزدا بوو، عومەر ئەمەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس کرد، وتی: عەبدوڵڵا ژنەکەی تەڵاقدا داوە لە حەیزدا بووە، فەرمووی: فەرمان بکە بە عەبدوڵڵا با بیهێنێتەوە، پاشان بیهێڵێتەوە تا پاک دەبێتەوە لە حەیزەکەی، پاشان جارێکی تر بکەوێتە حەیزەوەو پاکیش ببێتەوە، ئەگەر پاک بوویەوە ئەگەر ویستی تەڵاقی بدات با تەڵاقی بدات پێش ئەوەی بچێتە لای، وە ئەگەر ویستی با بیگەڕێنێتەوە، ئەمە ئەو ماوە دیاریکراوەیە کە خوای ﷻ فەرمانی ژن تەڵاقدانی تیادا داوە.

**٣٣٩٠-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَسَأَلَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا، ثُمَّ لِيُمْسِكْهَا حَتَّى تَطْهُرَ، ثُمَّ تَحِيضَ، ثُمَّ تَطْهُرَ، ثُمَّ إِنْ شَاءَ أَمْسَكَ بَعْدُ، وَإِنْ شَاءَ طَلَّقَ قَبْلَ أَنْ يَمَسَّ، فَتِلْكَ الْعِدَّةُ الَّتِي أَمَرَ اللَّهُ ﷻ أَنْ تُطَلَّقَ لَهَا النِّسَاءُ»[٢].

**واتە:** ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: ئەو ژنەکەی تەڵاقدا لە حەیزدا بوو لە سەردەم پێغەمبەری خوا ﷺ، عومەری کوڕی خەطاب پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی ئەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: فەرمان بکە بە عەبدوڵڵا با بیهێنێتەوە، پاشان بیهێڵێتەوە تا پاک دەبێتەوە لە حەیزەکەی، پاشان جارێکی تر بکەوێتە حەیزەوەو پاکیش ببێتەوە، پاشان ئەگەر ویستی با لای خۆی بیهێڵێتەوە، وە ئەگەر ویستی با تەڵاقی بدات پێش ئەوەی بچێتە لای، ئەمە ئەو ماوە دیاریکراوەیە کە خوای باڵادەست فەرمانی کردوە ژنی تێدا تەڵاق بدرێ.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٢٥١ و ٥٣٣٢، ومسلم: ١ و ٢ و ١٤٧١/٣، وأبو داود: ٢١٧٩ و ٢١٨٠، وإبن ماجه: ٢٠١٩.

(٢) صحيح.





**٣٣٩١-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: طَلَّقْتُ امْرَأَتِي فِي حَيَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهِيَ حَائِضٌ، فَذَكَرَ ذَلِكَ عُمَرُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَتَغَيَّظَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي ذَلِكَ، فَقَالَ: لِيُرَاجِعْهَا، ثُمَّ يُمْسِكْهَا حَتَّى تَحِيضَ حَيْضَةً وَتَطْهُرَ، فَإِنْ بَدَا لَهُ أَنْ يُطَلِّقَهَا طَاهِراً قَبْلَ أَنْ يَمَسَّهَا، فَذَاكَ الطَّلَاقُ لِلْعِدَّةِ كَمَا أَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ: فَرَاجَعْتُهَا وَحَسَبْتُ لَهَا التَّطْلِيقَةَ الَّتِي طَلَّقْتُهَا»[١].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ژنەکەم تەڵاقدا لە حەیزدا بوو لە سەردەم پێغەمبەری خوا ﷺ، عومەری کوڕی خەطاب ئەوەی باس کرد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ توڕە بوو لەو کارە، فەرمووی: با بیهێنێتەوە، پاشان بیهێڵێتەوە تا دەکەوێتە حەیزەوەو پاک دەبێتەوە لە حەیزەکەی، جا ئەگەر ویستی تەڵاقی بدات لە پاکیداو پێش ئەوەی بچێتە لای، ئەوە تەڵاقی ئەو ماوە دیاریکراوەیە کە خوا دایبەزاندوە، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەڵێ: گەڕاندمەوەو یەک تەڵاقم بۆ ژمارد کە تەڵاقم دابوو.**

**٣٣٩٢-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنَ أَيْمَنَ، يَسْأَلُ ابْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، وَأَبُو الزُّبَيْرِ يَسْمَعُ: كَيْفَ تَرَى فِي رَجُلٍ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ حَائِضاً؟ فَقَالَ لَهُ: طَلَّقَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَسَأَلَ عُمَرُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: إِنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لِيُرَاجِعْهَا، فَرَدَّهَا عَلَيَّ، قَالَ: إِذَا طَهُرَتْ فَلْيُطَلِّقْ أَوْ لِيُمْسِكْ، قَالَ ابْنُ عُمَرَ: فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ ﴿١﴾﴾الطلاق، فِي قُبُلِ عِدَّتِهِنَّ»[٢].

**واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەیمەن پرسیاری کرد لە ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) ئەبو زوبەیریش گوێی دەگرت: چی دەڵێی لەبارەی کەسێکەوە ژنەکەی تەڵاقداوە لە کاتی حەیزدا، پێی وت: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ژنەکەی تەڵاقدا لە کاتی حەیزدا بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: با بیگەڕێنێتەوە، ژنەکەمی گەڕاندەوە بۆم، فەرمووی: کاتێ پاک بوویەوە یان تەڵاقی بدە یان بیهێڵەوە، ئیبنو عومەر وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ ﴿١﴾﴾ (واتە:**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٩٠٨ و ٧١٦٠، ومسلم: ١٤٧١/٤، وأبو داود: ٢١٨٢.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٧١/١٤، وأبو داود: ٢١٨٥.




ئەی پێغەمبەر ﷺ بە ئوممەتەکەت بڵێ: هەر کاتێ ویستان ژنانتان تەڵاق بدەن با تەڵاقیان بدەن، لە پێشی عیدەیان).

**٣٣٩٣-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: فِي قَوْلِهِ ﷻ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ ١﴾الطلاق، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: قُبُلِ عِدَّتِهِنَّ»[(١)].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە دەربارەی فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ ١﴾ (واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ بە ئوممەتەکەت بڵێ: هەرکاتێ ویستان ژنانتان تەڵاق بدەن با تەڵاقیان بدەن لە کاتی عیدەیاندا)، ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: لە پێشی عیدەیان.**

## بابەت: تەڵاقی سوننەت (واتە: ئەو تەڵاقەی بەپێی سوننەتە)

**٣٣٩٤-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: طَلَاقُ السُّنَّةِ تَطْلِيقَةٌ وَهِيَ طَاهِرٌ فِي غَيْرِ جِمَاعٍ، فَإِذَا حَاضَتْ وَطَهُرَتْ طَلَّقَهَا أُخْرَى، فَإِذَا حَاضَتْ وَطَهُرَتْ طَلَّقَهَا أُخْرَى، ثُمَّ تَعْتَدُّ بَعْدَ ذَلِكَ بِحَيْضَةٍ، قَالَ الْأَعْمَشُ: سَأَلْتُ إِبْرَاهِيمَ فَقَالَ مِثْلَ ذَلِكَ»[(٢)].

**واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: تەڵاقی سوننەت یەک دانەیە، لە کاتێکدایە پاک بێت و سەرجێیی لەگەڵدا نەکردبێ، جا کاتێ کەوتە حەیزەوەو پاک بوویەوە جارێکی تر تەڵاقی دەدا، پاشان دوای ئەوە یەک حەیزی تر عیدە دەگرێتەوە، ئەعمەش (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرمووده) وتی: پرسیارم لە ئیبراهیم کرد، ئەویش هەمان قسەی کرد.**

**٣٣٩٥-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: طَلَاقُ السُّنَّةِ أَنْ يُطَلِّقَهَا طَاهِراً فِي غَيْرِ جِمَاعٍ»[(٣)].

**واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: تەڵاقی سوننەت ئەوەیە کاتێ تەڵاقی دەدا پاک بێت بەبێ سەرجێی کردن.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ٢٠٢٠ و ٢٠٢١.

(٣) صحيح.

## بابەت: ئەوەی دەیکات ئەگەر لە کاتی حەیزدا یەک جار ژنەکەی تەڵاقدا

**٣٣٩٦-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ: أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ تَطْلِيقَةً، فَانْطَلَقَ عُمَرُ فَأَخْبَرَ النَّبِيَّ ﷺ بِذَلِكَ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: مُرْ عَبْدَ اللَّهِ فَلْيُرَاجِعْهَا، فَإِذَا اغْتَسَلَتْ فَلْيَتْرُكْهَا حَتَّى تَحِيضَ، فَإِذَا اغْتَسَلَتْ مِنْ حَيْضَتِهَا الْأُخْرَى فَلَا يَمَسَّهَا حَتَّى يُطَلِّقَهَا، فَإِنْ شَاءَ أَنْ يُمْسِكَهَا فَلْيُمْسِكْهَا، فَإِنَّهَا الْعِدَّةُ الَّتِي أَمَرَ اللَّهُ ﷻ أَنْ تُطَلَّقَ لَهَا النِّسَاءُ»[١].

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو ژنەکەی تەڵاقدا لە حەیزدا بوو یەک تەڵاق، عومەر ڕۆیشت هەواڵیدا بە پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: فەرمان بکە بە عەبدوڵڵا با بیهێنێتەوە، جا ئەگەر خۆی شۆرد، با وازی لێ بهێنێ تا دەکەوێتە حەیزەوە، ئەگەر لە حەیزەکەی تری پاک بوویەوە با نەچێتە لایەوە تا تەڵاقی دەدا، ئەگەر ویستی بیهێڵێتەوە با بیهێڵێتەوە، چونکە ئەوە ئەو ماوە دیاریکراوەیە کە خوای باڵادەست فەرمانی داوە ژنی تێدا تەڵاق بدرێ.

**٣٣٩٧-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا، ثُمَّ لِيُطَلِّقْهَا وَهِيَ طَاهِرٌ أَوْ حَامِلٌ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: ئەو ژنەکەی تەڵاقدا لە حەیزدا بوو، ئەوەی بۆ پێغەمبەر ﷺ باس کرد فەرمووی: فەرمانی پێبکە با بیگەڕێنێتەوە، پاشان کاتێ تەڵاقی بدات پاک بێت یان دووگیان بێت.

## بابەت: تەڵاقدان بەبێ عیددە

**٣٣٩٨-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، فَرَدَّهَا عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى طَلَّقَهَا وَهِيَ طَاهِرٌ»[٣].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: ئەو ژنەکەی تەڵاقدا لە حەیزدا بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی گەڕاندەوە، هەتا لە کاتی پاک بوونەوەدا تەڵاقیدا.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٧١/٥، وأبو داود: ٢١٨١، وابن ماجه: ٢٠٢٣.

(٣) صحيح.





## تەڵاقدان لە جگە لە عیدە، ئەوەیشی حیساب دەکرێ لەسەر تەڵاقدراو

**٣٣٩٩-** «عَنْ يُونُسَ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنْ رَجُلٍ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، فَقَالَ: هَلْ تَعْرِفُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ، فَإِنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، فَسَأَلَ عُمَرُ النَّبِيَّ ﷺ، فَأَمَرَهُ أَنْ يُرَاجِعَهَا، ثُمَّ يَسْتَقْبِلَ عِدَّتَهَا، فَقُلْتُ لَهُ: فَيَعْتَدُّ بِتِلْكَ التَّطْلِيقَةِ، فَقَالَ: مَهْ، أَرَأَيْتَ إِنْ عَجَزَ وَاسْتَحْمَقَ»[1].

واتە: یونسی کوڕی جوبەیر دەڵێ: پرسیارم کرد لە ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەربارەی پیاوێک ژنەکەی لە کاتی حەیزدا تەڵاقداوە، وتی: ئایا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەناسی، ئەو ژنەکەی تەڵاقدا و لە حەیزدا بوو، عومەر پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد فەرمانی کرد بیگەڕێنێتەوە، پاشان چاوەڕوانی تەواوبوونی عیدەکەی بکات، پێم وت: بەو تەڵاقدانە عیدە دەبەستێ، وتی: ئەی بۆ، ئەی نەتبینیوە بێتوانابێت کاری بێ عەقڵانە بکات.

**٣٤٠٠-** «عَنْ يُونُسَ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: رَجُلٌ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، فَقَالَ: أَتَعْرِفُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ، فَإِنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، فَأَتَى عُمَرُ النَّبِيَّ ﷺ يَسْأَلُهُ ، فَأَمَرَهُ أَنْ يُرَاجِعَهَا، ثُمَّ يَسْتَقْبِلَ عِدَّتَهَا، قُلْتُ لَهُ: إِذَا طَلَّقَ الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، أَيَعْتَدُّ بِتِلْكَ التَّطْلِيقَةِ؟ فَقَالَ: مَهْ، وَإِنْ عَجَزَ وَاسْتَحْمَقَ»[2].

واتە: یونسی کوڕی جوبەیر دەڵێ: پرسیارم کرد لە ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەربارەی پیاوێک ژنەکەی لە کاتی حەیزدا تەڵاقداوە، وتی: ئایا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەناسی، ئەو ژنەکەی تەڵاقداو لە حەیزدا بوو، عومەر هات پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد فەرمانی پێکرد بیگەڕێنێتەوە، پاشان چاوەڕوانی تەواوبوونی عیدەکەی بکات، پێم وت: ئەگەر پیاو ژنەکەی تەڵاق بدات و لە حەیزدا بێت، ئایا بەو تەڵاقدانە عیدە دەبەستێ، وتی: ئەی بۆ، ئەی نەتبینیوە کاری بێ عەقڵانە بکات.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٢٥٢ و ٥٢٥٨ و ٥٣٣٣، ومسلم: ٧ و ٨ و ٩ و ١٤٧١/١٠، وأبو داود: ٢١٨٣ و ٢١٨٤، والترمذي: ١١٧٥، وإبن ماجه: ٢٠٢٢.

(٢) صحيح.




## تەڵاقی سێ بە سێ ئەوەی پەیوەستە پێیەوە لە سەختی و دژواری ئەو ڕەفتارە

**٣٤٠١-** «عَنْ مَحْمُودِ بْنِ لَبِيدٍ ﷺ قَالَ: أُخْبِرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ رَجُلٍ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ ثَلَاثَ تَطْلِيقَاتٍ جَمِيعاً، فَقَامَ غَضْبَاناً ثُمَّ قَالَ: أَيُلْعَبُ بِكِتَابِ اللَّهِ وَأَنَا بَيْنَ أَظْهُرِكُمْ؟ حَتَّى قَامَ رَجُلٌ وَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَلَا أَقْتُلُهُ؟»(١).

**واتە: مەحمودی کوڕی لبید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی داوە لە بارەی پیاوێکەوە ژنەکەی سێ بە سێ تەڵاق دابێ پێکەوە، هەڵساوە سەرپێ بە توڕەییەوە فەرمووی: ئایا گاڵتە بە کتێبی خوا دەکرێ لە کاتێکدا من لە نێوتاندام؟ تا پیاوێک هەڵسا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بدەم لە گەردنی؟**

## بابەت: ڕێگەدان بە تەڵاقی سێ بە سێ

**٣٤٠٢-** «عَنْ عُوَيْمِرٍ الْعَجْلَانِيِّ، جَاءَ إِلَى عَاصِمِ بْنِ عَدِيٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا فَقَالَ: أَرَأَيْتَ يَا عَاصِمُ لَوْ أَنَّ رَجُلاً وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلاً، أَيَقْتُلُهُ فَيَقْتُلُونَهُ أَمْ كَيْفَ يَفْعَلُ؟ سَلْ لِي يَا عَاصِمُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ ذَلِكَ، فَسَأَلَ عَاصِمٌ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَكَرِهَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمَسَائِلَ وَعَابَهَا حَتَّى كَبُرَ عَلَى عَاصِمٍ مَا سَمِعَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَلَمَّا رَجَعَ عَاصِمٌ إِلَى أَهْلِهِ جَاءَهُ عُوَيْمِرٌ فَقَالَ: يَا عَاصِمُ، مَاذَا قَالَ لَكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ فَقَالَ عَاصِمٌ لِعُوَيْمِرٍ: لَمْ تَأْتِنِي بِخَيْرٍ قَدْ كَرِهَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمَسْأَلَةَ الَّتِي سَأَلْتَ عَنْهَا، فَقَالَ عُوَيْمِرٌ: وَاللَّهِ لَا أَنْتَهِي حَتَّى أَسْأَلَ عَنْهَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَأَقْبَلَ عُوَيْمِرٌ حَتَّى أَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَسْطَ النَّاسِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ رَجُلاً وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلاً، أَيَقْتُلُهُ فَتَقْتُلُونَهُ أَمْ كَيْفَ يَفْعَلُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: قَدْ نَزَلَ فِيكَ وَفِي صَاحِبَتِكَ، فَاذْهَبْ فَأْتِ بِهَا، قَالَ سَهْلٌ: فَتَلَاعَنَا وَأَنَا مَعَ النَّاسِ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَلَمَّا فَرَغَ عُوَيْمِرٌ قَالَ: كَذَبْتُ عَلَيْهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنْ أَمْسَكْتُهَا، فَطَلَّقَهَا ثَلَاثاً قَبْلَ أَنْ يَأْمُرَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ»(٢).

**واتە: عوەیمری عەجلانی، هات بۆ لای عاصمی کوڕی عەدی (خوا لێیان ڕازی بێ) وتی: ئایا بینیوتە ئەی عاصم ئەگەر پیاوێک کەسێک لەگەڵ ژنەکەیدا ببینێ،**

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٢٣ و ٥٢٥٩، ومسلم: ١ و ٢ و ١٤٩٢/٣، وأبو داود: ٢٢٤٥ و ٢٢٤٧ و ٢٢٥٢، وإبن ماجه: ٢٠٦٦.




ئایا بیکوژێ و بیکوژنەوە یان چی بکات؟ ئەی عاصم پرسیارم بۆ بکە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ لەو بارەیەوە، عاصمیش پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەریش ئەو پرسیارە پێناخۆش بوو، وە سەرکۆنەی کرد، ئەوەندە بە خراپی دانا لە پێش چاوی عاصم گەورە بوو، کاتێ عاصم گەڕایەوە بۆ ناو خانەوادەکەی، عوەیمیر هات بۆ لای، وتی: ئەی عاصم پێغەمبەری خوا ﷺ چی فەرموو؟ عاصم بە عوەیمری وت: بەخێر نەیەی بەڕاستی پێغەمبەر ﷺ ئەو پرسیارەی پێ ناخۆش بوو کە تۆ پرسیارت لە بارەیەوە کرد، عوەیمیر وتی: سوێند بە خوا وازناهێنم تا پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ نەکەم، عوەیمیر ڕۆیشت تا گەیشتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوەڕاستی خەڵکەکەدا، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ئەگەر پیاوێک کەسێک لەگەڵ ژنەکەیدا بگرێ، بیکوژێ و بیکوژنەوە یان چی بکات؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەربارەی تۆو ژنەکەت ئایەت دابەزیە خوارەوە، بڕۆ بیهێنە، سەهل وتی: من و ژنەکەم مولاعەنەمان کرد لە پێش چاوی خەڵکی لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ، کاتێ عوەیمیر لێبویەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بیهێڵمەوە درۆم بۆی هەڵبەستوە، سێ بە سێ تەڵاقی دا، پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ بکات.

**٣٤٠٣-** «عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ، فَقُلْتُ: أَنَا بِنْتُ آلِ خَالِدٍ، وَإِنَّ زَوْجِي فُلَاناً أَرْسَلَ إِلَيَّ بِطَلَاقِي، وَإِنِّي سَأَلْتُ أَهْلَهُ النَّفَقَةَ وَالسُّكْنَى فَأَبَوْا عَلَيَّ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهُ قَدْ أَرْسَلَ إِلَيْهَا بِثَلَاثِ تَطْلِيقَاتٍ، قَالَتْ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّمَا النَّفَقَةُ وَالسُّكْنَى لِلْمَرْأَةِ إِذَا كَانَ لِزَوْجِهَا عَلَيْهَا الرَّجْعَةُ»(١).

واتە: فاطیمەی کچی قەیس ، دەڵێ: هاتم بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتم: من کچی خانەوادەی خالیدم، مێردەکەم فڵان کەسە تەڵاقی بۆ ناردووم، منیش داوای نەفەقەو شوێنی نیشتەجێ بوونم لە کەس و کارەکەی کرد ئەوانیش ڕازی نەبوون، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەو سێ بە سێ تەڵاقی بۆی ناردوە، ژنەکە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی نەفەقەو شوێنی نیشتەجێ بوون بۆ ئەو ژنەیە کە مێردەکەی بیەوێ بیگێڕێتەوە.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١١٩ و ٢٩٤٢/١٢٢، وأبو داود: ٢٢٨٨ و ٤٣٢٦ و ٤٣٢٧، والترمذي: ١١٨٠ و ٢٢٥٣، وإبن ماجه: ٢٠٢٤ و ٢٠٣٦ و ٤٠٤٧.




**٣٤٠٤-** «عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: الْمُطَلَّقَةُ ثَلَاثاً لَيْسَ لَهَا سُكْنَى وَلَا نَفَقَةٌ»[1].

**واتە: فاطیمەی کچی قەیس ﷺ دەگێڕێتەوە: لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: ژنی تەڵاقدراوی سێ بە سێ نە شوێنی نیشتەجێ بوونی بۆ هەیە نە نەفەقە.**

**٣٤٠٥-** «عَنْ فَاطِمَةُ بِنْتِ قَيْسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّ أَبَا عَمْرِو بْنَ حَفْصٍ الْمَخْزُومِيَّ طَلَّقَهَا ثَلَاثاً، فَانْطَلَقَ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ فِي نَفَرٍ مِنْ بَنِي مَخْزُومٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أَبَا عَمْرِو بْنَ حَفْصٍ طَلَّقَ فَاطِمَةَ ثَلَاثاً، فَهَلْ لَهَا نَفَقَةٌ؟ فَقَالَ: لَيْسَ لَهَا نَفَقَةٌ وَلَا سُكْنَى»[2].

**واتە: فاطیمەی کچی قەیس ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەبو عەمری کوڕی حەفصی مەخزومی سێ بە سێ تەڵاقیدا، خالدی کوڕی وەلید ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ چەند پیاوێکی بەنی مەخزوم، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو عەمری کوڕی حەفص سێ بەسێ فاطیمەی تەڵاقداوە، ئایا نەفەقەی بۆ هەیە؟ فەرمووی: نە نەفەقەی بۆ هەیە نە شوێنی نیشتەجێ بوون.**

## بابەت: تەڵاقی سێ بە سێ بە جیا جیا پێش ئەوەی بچێتە لای ژنەکەیەوە

**٣٤٠٦-** «عَنْ أَبِي الصَّهْبَاءِ أنه جَاءَ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا فَقَالَ: يَا ابْنَ عَبَّاسٍ، أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ الثَّلَاثَ كَانَتْ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأَبِي بَكْرٍ، وَصَدْراً مِنْ خِلَافَةِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا تُرَدُّ إِلَى الْوَاحِدَةِ؟ قَالَ: نَعَمْ»[3].

**واتە: ئەبو صەهبا دەگێڕێتەوە: ئەو ڕۆیشت بۆ لای ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) وتی: ئەی ئیبنو عەبباس ئایا نەتزانیوە تەڵاقی سێ بەسێ لە سەردەم پێغەمبەری خوا ﷺ وئەبو بەکرو سەرەتای خیلافەتی عومەر بە یەک تەڵاق دەژمێردرا؟ وتی: بەڵێ.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥ و ١٦ و ١٤٧٢/١٧، وأبو داود: ٢١٩٩ و ٢٢٠٠.




## تەڵاقدانی ئەو ژنەی شوو دەكات بە پیاوێكی تر، پاشان ناچێتە لایەوە

**٣٤٠٧-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ رَجُلٍ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ فَتَزَوَّجَتْ زَوْجاً غَيْرَهُ فَدَخَلَ بِهَا، ثُمَّ طَلَّقَهَا قَبْلَ أَنْ يُوَاقِعَهَا، أَتَحِلُّ لِلْأَوَّلِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا، حَتَّى يَذُوقَ الْآخَرُ عُسَيْلَتَهَا وَتَذُوقَ عُسَيْلَتَهُ»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پرسیار كرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ لە بارەی كەسێكەوە ژنەكەی تەڵاقداوە و شوی كردوە بە پیاوێكی تر جگە لەو، لەگەڵیدا بووە، پاشان تەڵاقیداوە پێش ئەوەی بچێتە لایەوە، ئایا بۆ (مێردی) یەكەمی حەڵاڵ دەبێتەوە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نەخێر، تا ئەو پیاوەی تر (مێردی دووەمی) چێژی لێ وەردەگرێ و ئەویش چێژ لەو پیاوە وەردەگرێ (واتە: تا جووت دەبن).**

**٣٤٠٨-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: جَاءَتِ امْرَأَةُ رِفَاعَةَ الْقُرَظِيِّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي نَكَحْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الزَّبِيرِ، وَاللَّهِ مَا مَعَهُ إِلَّا مِثْلُ هَذِهِ الْهُدْبَةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَعَلَّكِ تُرِيدِينَ أَنْ تَرْجِعِي إِلَى رِفَاعَةَ، لَا، حَتَّى يَذُوقَ عُسَيْلَتَكِ وَتَذُوقِي عُسَيْلَتَهُ»[٢].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ژنەكەی ڕیفاعەی قورەظی هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من شووم كردوە بە عەبدوڕڕەحمانی كوڕی زوبەیر، سوێند بە خوا ئەو (ئامێری جووتبوونی) وەكو چمكی ئەم كراسە وایە (واتە: توانای سەرجێی نیە)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (ئەگەر) دەتەوێ بگەڕێیتەوە بۆ لای ڕیفاعە، نابێ، تا تۆ چێژ لە ئەو (واتە: عەبدوڕڕەحمانی كوڕی زوبەیر) وەردەگریت و ئەویش چێژ لە تۆ وەردەگرێ.**

## تەڵاقی هەمیشەیی

**٣٤٠٩-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: جَاءَتِ امْرَأَةُ رِفَاعَةَ الْقُرَظِيِّ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَأَبُو بَكْرٍ عِنْدَهُ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي كُنْتُ تَحْتَ رِفَاعَةَ الْقُرَظِيِّ فَطَلَّقَنِي الْبَتَّةَ، فَتَزَوَّجْتُ عَبْدَ

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٣٠٩.

(٢) صحيح.




الرَّحْمَنِ بْنَ الزَّبِيرِ، وَإِنَّهُ وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا مَعَهُ إِلَّا مِثْلُ هَذِهِ الْهُدْبَةِ، وَأَخَذَتْ هُدْبَةً مِنْ جِلْبَابِهَا، وَخَالِدُ بْنُ سَعِيدٍ بِالْبَابِ، فَلَمْ يَأْذَنْ لَهُ، فَقَالَ: يَا أَبَا بَكْرٍ، أَلَا تَسْمَعُ هَذِهِ تَجْهَرُ بِمَا تَجْهَرُ بِهِ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: تُرِيدِينَ أَنْ تَرْجِعِي إِلَى رِفَاعَةَ، لَا، حَتَّى تَذُوقِي عُسَيْلَتَهُ وَيَذُوقَ عُسَيْلَتَكِ»[١].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: ژنەکەی ڕیفاعەی قورەظی هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، ئەبو بەکریش لە خزمەتیدا بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من خێزانی ڕیفاعەی قورەظی بووم سێ بە سێ تەڵاقی دام، منیش دوای ئەو شووم کرد بە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی زوبەیر، سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو (ئامێری جووتبوونی) وەکو چمکی ئەم کراسە وایە (واتە: توانای سەرجێی نیە)، چەمکی کراسەکەی دەرهێنا، خالدی کوڕی سەعیدیش لەبەر دەرگا چاوەڕوان بوو، مۆڵەتی پێ نەدابوو، وتی: ئەی ئەبو بەکر گوێت لەوە نیە بە ئاشکرا چی دەڵێ لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ؟ (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر) دەتەوێ بگەڕێیتەوە بۆ لای ڕیفاعە، نابێ، تا تۆ چێژ لە ئەو وەردەگریت و ئەویش چێژ لە تۆ وەردەگرێ.

## بڕیاری خۆت بە دەستی خۆتە

**٣٤١٠-** «عَنْ حَمَّادِ بن زَيْدٍ قال: قلت لِأَيُّوبَ ﷺ هل عَلِمْتَ أَحَداً قال في أَمْرِكِ بِيَدِكِ أنها ثَلَاثٌ غير الْحَسَنِ فَقَال: لَا ثُمَّ قال اللهم غَفْراً إلا ما حدثني قَتَادَةُ عن كَثِيرٍ مولى بن سَمُرَةَ عن أبي سَلَمَةَ عن أبي هُرَيْرَةَ عَنْ النَّبي ﷺ قَالَ: ثَلَاثٌ فَلَقِيتُ كَثِيراً فَسَأَلْتُهُ فلم يَعْرِفْهُ فَرَجَعْتُ إلى قَتَادَةَ فَأَخْبَرْتُهُ، فقال نَسِيَ، قال: أبو عَبْد الرَّحْمَن: هَذَا حَدِيثٌ مُنْكَرٌ»[٢].

واتە: حەممادی کوڕی زەید دەڵێ: بە ئەیوبم ﷺ وت: ئایا کەسێک دەناسی دەربارەی ئەوەی پیاو بە ژنەکەی بڵێ: بڕیارت بە دەستی خۆتە، وتبێتی: تەڵاقی سێ بە سێ یە، جگە لە حەسەن، وتی: نەخێر، پاشان وتی: خوایە لێم خۆشبە ئەوە نەبێ کە قەتادە بۆی باس کردم لە کەثیری خزمەتکاری سەمورە گێڕایەوە لە ئەبو سەلەمە لە ئەبو هورەیرە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (سێ بە سێ یە) دواتر گەیشتم بە کەثیر

---

(١) صحيح.

(٢) ضعيف مرفوعاً. صحيح من قول الحسن البصري. أخرجه أبو داود: ٢٢٠٤، والترمذي: ١١٧٨.




پرسیارم لێ کرد نەیزانی، گەڕامەوە بۆ لای قەتادە هەواڵم پێدا، وتی: بیری چووە، ئەبو عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: ئەمە فەرموودەیەکی (مُنْكَر)ـە.

## بابەت: حەڵاڵ کردنی ژنی سێ بەسێ تەڵاقدراو، وە ئەو خوازبێنیەش کە حەڵاڵی دەکاتەوە پێی

**٣٤١١-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: جَاءَتِ امْرَأَةُ رِفَاعَةَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَتْ: إِنَّ زَوْجِي طَلَّقَنِي، فَأَبَتَّ طَلَاقِي، وَإِنِّي تَزَوَّجْتُ بَعْدَهُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الزَّبِيرِ وَمَا مَعَهُ إِلَّا مِثْلُ هُدْبَةِ الثَّوْبِ، فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَقَالَ: لَعَلَّكِ تُرِيدِينَ أَنْ تَرْجِعِي إِلَى رِفَاعَةَ، لَا، حَتَّى يَذُوقَ عُسَيْلَتَكِ وَتَذُوقِي عُسَيْلَتَهُ»[١].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ژنەکەی ڕیفاعە هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: مێردەکەم سێ بە سێ تەڵاقی داوم، منیش دوای ئەو شووم کرد بە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی زوبەیر، وە ئەو (ئامێری جووتبوونی) وەکو چمکی ئەم کراسە وایە، (واتا توانای سەرجێی نیە)، پێغەمبەری خوا ﷺ زەردەخەنە گرتی و فەرمووی: (ئەگەر) دەتەوێ بگەڕێیتەوە بۆ لای ڕیفاعە، نابێ، تا تۆ چێژ لە ئەو وەردەگریت و ئەویش چێژ لە تۆ وەردەگرێ.

**٣٤١٢-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّ رَجُلاً طَلَّقَ امْرَأَتَهُ ثَلَاثاً فَتَزَوَّجَتْ زَوْجاً فَطَلَّقَهَا قَبْلَ أَنْ يَمَسَّهَا، فَسُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، أَتَحِلُّ لِلْأَوَّلِ؟ فَقَالَ: لَا، حَتَّى يَذُوقَ عُسَيْلَتَهَا كَمَا ذَاقَ الْأَوَّلُ»[٢].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پیاوێک سێ بە سێ ژنەکەی تەڵاقدا، ئەویش شوی کرد بە پیاوێکی تر، ئەویش پێش ئەوەی بچێتە لایەوە تەڵاقیدا، پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا بۆ یەکەم حەڵاڵە؟ فەرمووی: نەخێر، تا پیاوەکە تامی ژنەکە دەکات وەک چۆن یەکەم پیاو تامی کرد.

**٣٤١٣-** «عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ الْغُمَيْصَاءَ، أَوِ الرُّمَيْصَاءَ أَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ تَشْتَكِي زَوْجَهَا أَنَّهُ لَا يَصِلُ إِلَيْهَا، فَلَمْ يَلْبَثْ أَنْ جَاءَ زَوْجُهَا، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هِيَ كَاذِبَةٌ وَهُوَ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٢٦١، ومسلم: ١٤٣٣/١١٥.




يَصِلُ إِلَيْهَا، وَلَكِنَّهَا تُرِيدُ أَنْ تَرْجِعَ إِلَى زَوْجِهَا الْأَوَّلِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَيْسَ ذَلِكَ حَتَّى تَذُوقِي عُسَيْلَتَهُ»[١].

**واتە: عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: غومەیصا، یان ڕومەیصا هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ سکاڵای لە مێردەکەی دەکرد کە نایەت بۆ لای، زۆری پێ نەچوو مێردەکەی هات، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ درۆ دەکات دەچم بۆ لای، بەڵام ئەو دەیەوێ بگەڕێتەوە بۆ لای مێردی یەکەمی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوەت بۆ نیە تا لەززەتی لێ وەرنەگری.**

**٣٤١٤-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: فِي الرَّجُلِ تَكُونُ لَهُ الْمَرْأَةُ يُطَلِّقُهَا ثُمَّ يَتَزَوَّجُهَا رَجُلٌ آخَرُ فَيُطَلِّقُهَا قَبْلَ أَنْ يَدْخُلَ بِهَا، فَتَرْجِعَ إِلَى زَوْجِهَا الْأَوَّلِ؟ قَالَ: لَا، حَتَّى تَذُوقَ الْعُسَيْلَةَ»[٢].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ: دەربارەی پیاوێک ژنەکەی تەڵاقداوە، پاشان پیاوێکی تر مارەی کردوە، تەڵاقی بدات پێش ئەوەی بچێتە لایەوە، پاشان بگەڕێتەوە بۆ لای پیاوی یەکەمی؟ فەرمووی: نابێ، تا لەزەت وەردەگرێ.**

**٣٤١٥-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنِ الرَّجُلِ يُطَلِّقُ امْرَأَتَهُ ثَلَاثاً فَيَتَزَوَّجُهَا الرَّجُلُ، فَيُغْلِقُ الْبَابَ وَيُرْخِي السِّتْرَ، ثُمَّ يُطَلِّقُهَا قَبْلَ أَنْ يَدْخُلَ بِهَا؟ قَالَ: لَا تَحِلُّ لِلْأَوَّلِ حَتَّى يُجَامِعَهَا الْآخَرُ، قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: هَذَا أَوْلَى بِالصَّوَابِ»[٣].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پرسیار کرا لە پێغەمبەر ﷺ لەبارەی پیاوێک ژنەکەی سێ بە سێ تەڵاق دەدا، پاشان پیاوێکی تر مارەی کردوە، دەرگا دەگیرێ و پەردەش دادەنرێ (واتە: کەس نایانبینێ)، پاشان تەڵاقی دەدات پێش ئەوەی بچێتە لایەوە؟ فەرمووی: حەڵاڵ نابێ بۆ پیاوی یەکەم تا ئەو پیاوەی دووەم لەگەڵیدا جیماع نەکات، ئەبو عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: ئەمە لە پێشتر بە وەرگرتن.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه إبن ماجه: ٩٣٣.

(٣) صحيح لغيره.




## بابەت: حەڵاڵ کردنی تەڵاقدراوی سێ بە سێ و ئەوەشی تێیدایە لە هەڕەشەو دژواری

**٣٤١٦-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْوَاشِمَةَ وَالْمُوتَشِمَةَ، وَالْوَاصِلَةَ وَالْمَوْصُولَةَ، وَآكِلَ الرِّبَا وَمُوكِلَهُ، وَالْمُحَلِّلَ وَالْمُحَلَّلَ لَهُ»[١].

**واتە:** عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی کردوە لەو کەسەی خاڵ دەکوتێ، ئەو کەسەشی خاڵی بۆ کوتراوە، ئەو کەسەشی قژێکی تر جگە لە قژی خۆی دەخاتە سەری، ئەو کەسەشی بۆی ڕێک دەخات، ئەو کەسەشی ڕیبا دەخواو وەکیلەکەشی، ئەو کەسەی ژنی تەڵاقدراو دەخوازێ بە مەبەستی ئەوەی جارێکی تر حەڵاڵ ببێتەوە بۆ مێردی یەکەمی.

## بابەت: تەڵاقدانی ئافرەت لە لایەن پیاوەوە ڕووبەڕوو

**٣٤١٧-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ الْكِلَابِيَّةَ لَمَّا دَخَلَتْ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَقَدْ عُذْتِ بِعَظِيمٍ، الْحَقِي بِأَهْلِكِ»[٢].

**واتە:** عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: ئەو ئافرەتەی کە لە هۆزی کیلابیە بوو (مار بڕا بوو) کاتێ هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ لە شەوی خوازبێنی دا، وتی: پەنا دەگرم بە خوا لە تۆ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بە ڕاستی پەنات گرت بە مەزنترین، بچۆرەوە بۆ نێو خانەوادەکەت.

## ناردنی تەڵاق لە لایەن پیاوەوە بۆ ژنەکەی

**٣٤١٨-** «عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتَ قَيْسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا تَقُولُ: أَرْسَلَ إِلَيَّ زَوْجِي بِطَلَاقِي، فَشَدَدْتُ عَلَيَّ ثِيَابِي ثُمَّ أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: كَمْ طَلَّقَكِ؟ فَقُلْتُ: ثَلَاثاً، قَالَ: لَيْسَ لَكِ نَفَقَةٌ، وَاعْتَدِّي فِي بَيْتِ ابْنِ عَمِّكِ ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ، فَإِنَّهُ ضَرِيرُ الْبَصَرِ تُلْقِينَ ثِيَابَكِ عِنْدَهُ، فَإِذَا انْقَضَتْ عِدَّتُكِ فَآذِنِينِي»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ١١٢٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٢٥٤، وإبن ماجه: ٢٠٥٠.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٧ و ١٤٨٠/٥٠، والترمذي: ١١٣٥، وإبن ماجه: ١٨٦٩ و ٢٠٣٥.




واتە: فاطیمەی کچی قەیس ، دەڵێ: پیاوەکەم تەڵاقی بۆم نارد، جلەکانم پێچایەوە، پاشان هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چەند تەڵاقی داوی؟ وتم: سێ، فەرمووی: نەفەقەت بۆ نیە، وە لە ماڵی ئامۆزاکەت کوڕی ئوم مەکتوم عیدەکەت تەواو بکە، چونکە ئەو پیاوێکی نابینایە، جلەکانت لای دادەنێی، کاتێ عیدەکەت تەواو بوو ئاگادارم بکەرەوە.

**٣٤١٩-** «عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ تَمِيمٍ، مَوْلَى فَاطِمَةَ، عَنْ فَاطِمَةَ، نَحْوَهُ»[(١)].

واتە: موجاهید دەگێڕێتەوە: لە تەمیم مەولای فاطیمە، لە فاطیمەوە وەکو فەرموودەکە پێشوو.

## تەفسیری فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَ ۝١﴾ واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ بۆچی شتێک لە خۆت قەدەغە دەکەی کە خوا بۆی حەڵاڵ کردووی.

**٣٤٢٠-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: أَتَاهُ رَجُلٌ فَقَالَ: إِنِّي جَعَلْتُ امْرَأَتِي عَلَيَّ حَرَاماً، قَالَ: كَذَبْتَ، لَيْسَتْ عَلَيْكَ بِحَرَامٍ، ثُمَّ تَلَا هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَ ۝١﴾ التحريم، عَلَيْكَ أَغْلَظُ الْكَفَّارَةِ: عِتْقُ رَقَبَةٍ»[(٢)].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێک هات بۆ لای، وتی: من ژنەکەم لەسەر خۆم قەدەغە کردوە، ئەویش وتی: درۆت کرد، لەسەرت قەدەغە نابێ، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَ ۝١﴾ قورسترین کەفارەت لەسەرتە: کە ئازادکردنی بەندەیەکە.

## تەفسیری ئەم ئایەتە بە شێوەیەکی دیکە

**٣٤٢١-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَمْكُثُ عِنْدَ زَيْنَبَ وَيَشْرَبُ عِنْدَهَا عَسَلاً، فَتَوَاصَيْتُ وَحَفْصَةُ أَيَّتُنَا، مَا دَخَلَ عَلَيْهَا النَّبِيُّ ﷺ فَلْتَقُلْ: إِنِّي أَجِدُ مِنْكَ

---

(١) صحيح.

(٢) ضعيف الإسناد.

رِيحَ مَغَافِيرَ، فَدَخَلَ عَلَى إِحْدَيْهِمَا فَقَالَتْ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: بَلْ شَرِبْتُ عَسَلاً عِنْدَ زَيْنَبَ، وَقَالَ: لَنْ أَعُودَ لَهُ، فَنَزَلَ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَ ﴿١﴾ ﴾التحريم، ﴿ إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ ﴿٤﴾ ﴾التحريم، لِعَائِشَةَ وَحَفْصَةَ: ﴿ وَإِذْ أَسَرَّ ٱلنَّبِيُّ إِلَىٰ بَعْضِ أَزْوَٰجِهِۦ حَدِيثًا ﴿٣﴾ ﴾التحريم، لِقَوْلِهِ بَلْ شَرِبْتُ عَسَلاً، كُلُّهُ فِي حَدِيثِ عَطَاءٍ»[1].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ لای زەینەب دەمایەوە هەنگوینی لە لای دەخوارد، من و حەفصە بەڵێنمان بە یەکتریدا کە پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لای هەریەکەمان، بڵێ: بۆنی (مَغَافيرَ)ت لێ دێت، (کە شتێکی خۆشە، بەڵام بۆنی ناخۆشە)، جا هات بۆ لای یەکێکیان ئەویش ئەوەی پێ وت، فەرمووی: بەڵکو هەنگوینم خوارد لای زەینەب، فەرمووی: ئیتر هەرگیز نایخۆم، پاشان ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَ ﴿١﴾ ﴾، (واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ بۆچی شتێک لە خۆت حەرام دەکەیت کە خوا بۆی حەڵاڵ کردووی)، ﴿ إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ ﴿٤﴾ ﴾ (واتە: ئەگەر ئەو دووانە داوای لێخۆشبوون بکەن لای خوا)، عائیشە و حەفصە: ﴿ وَإِذْ أَسَرَّ ٱلنَّبِيُّ إِلَىٰ بَعْضِ أَزْوَٰجِهِۦ حَدِيثًا ﴿٣﴾ ﴾ واتە: کاتێک کە پێغەمبەر ﷺ بە نهێنی لای هەندێ لە ژنەکانی قسەیەکی درکاند) لەبەر وتەکەی بەڵکو هەنگوینم خوارد.**

## بابەت: (کاتێک پیاو بە ژنی دەڵێ:) بچۆرەوە بۆ لای خزم و کەست

**٣٤٢٢-** «عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، يُحَدِّثُ حَدِيثَهُ حِينَ تَخَلَّفَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ، وَسَاقَ قِصَّتَهُ، وَقَالَ: إِذَا رَسُولُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَأْتِي، فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَأْمُرُكَ أَنْ تَعْتَزِلَ امْرَأَتَكَ، فَقُلْتُ: أُطَلِّقُهَا أَمْ مَاذَا؟ قَالَ: لَا، بَلْ اعْتَزِلْهَا فَلَا تَقْرَبْهَا، فَقُلْتُ لِامْرَأَتِي: الْحَقِي بِأَهْلِكِ فَكُونِي عِنْدَهُمْ حَتَّى يَقْضِيَ اللَّهُ ﷻ فِي هَذَا الْأَمْرِ»[2].

**واتە: کەعبی کوڕی مالیک ﷺ، باسی خۆی دەکات کاتێ لە جەنگی تەبوک لە پێغەمبەری خوا ﷺ دواکەوت، بەسەرهاتەکەی خۆی گێڕایەوە، وتی: نێردراوی پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لام وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانت پێ دەکات لە**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.





ژنەکەت دوور بکەویتەوە، منیش وتم: تەڵاقی بدەم، یان چی؟ وتی: نەخێر، بەڵکو لێی داببڕێ و نزیکی مەکەوە، بە ژنەکەمم وت: بچۆرەوە بۆ لای حزم و کەست و لایان بمێنەوە تا خوا ﷻ بڕیار لەم کارە دەدات.

**٣٤٢٣-** «عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، وَهُوَ أَحَدُ الثَّلَاثَةِ الَّذِينَ تِيبَ عَلَيْهِمْ يُحَدِّثُ، قَالَ: أَرْسَلَ إِلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَإِلَى صَاحِبَيَّ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَأْمُرُكُمْ أَنْ تَعْتَزِلُوا نِسَاءَكُمْ، فَقُلْتُ لِلرَّسُولِ: أُطَلِّقُ امْرَأَتِي أَمْ مَاذَا أَفْعَلُ؟ قَالَ: لَا، بَلْ تَعْتَزِلُهَا فَلَا تَقْرَبْهَا، فَقُلْتُ لِامْرَأَتِي: الْحَقِي بِأَهْلِكِ فَكُونِي فِيهِمْ، فَلَحِقَتْ بِهِمْ»[١].

واتە: کەعبی کوڕی مالیک ﷺ، یەکێک بوو لەو سیانەی خوا لێیان خۆش بوو دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نێردراوی نارد بۆ لام و بۆ لای هەردوو هاوەڵەکەم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردوون دووربکەونەوە لە ژنەکانتان، منیش وتم: تەڵاقی بدەم، یان چی بکەم؟ وتی: نا، بەڵکو لێی داببڕێ و نزیکی مەکەوە، بە ژنەکەمم وت: بچۆرەوە بۆ لای کەسوکارەکەت و لایان بمێنەوە، ڕۆیشتەوەو لایان مایەوە.

**٣٤٢٤-** «عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، يُحَدِّثُ حَدِيثَهُ حِينَ تَخَلَّفَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ، وَقَالَ فِيهِ: إِذَا رَسُولُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَأْتِينِي وَيَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَأْمُرُكَ أَنْ تَعْتَزِلَ امْرَأَتَكَ، فَقُلْتُ: أُطَلِّقُهَا أَمْ مَاذَا أَفْعَلُ؟ قَالَ: بَلْ اعْتَزِلْهَا وَلَا تَقْرَبْهَا، وَأَرْسَلَ إِلَى صَاحِبَيَّ بِمِثْلِ ذَلِكَ، فَقُلْتُ لِامْرَأَتِي: الْحَقِي بِأَهْلِكِ وَكُونِي عِنْدَهُمْ حَتَّى يَقْضِيَ اللَّهُ ﷻ فِي هَذَا الْأَمْرِ»[٢].

واتە: کەعبی کوڕی مالیک ﷺ، باس خۆی دەکات کاتێ لە جەنگی تەبووک لە پێغەمبەری خوا ﷺ دواکەوت، لەو بارەیەوە دەڵێ: نێردراوی پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لام، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانت پێ دەکات لە ژنەکەت دوور بکەوێتەوە، منیش وتم: تەڵاقی بدەم یان چی بکەم؟ وتی: بەڵکو لێی داببڕێ و نزیکی مەکەوە، بەهەمان شێوە ناردی بۆ لای هەردوو هاوڕێکەم بەو شێوەیە، بە ژنەکەمم وت: بچۆرەوە بۆ لای کەسوکارەکەت و لایان بمێنەوە هەتا خوا ﷻ بڕیار لەم کارە دەدات.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




**٣٤٢٥-** «عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، يُحَدِّثُ قَالَ: أَرْسَلَ إِلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَإِلَى صَاحِبَيَّ، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَأْمُرُكُمْ أَنْ تَعْتَزِلُوا نِسَاءَكُمْ، فَقُلْتُ لِلرَّسُولِ: أُطَلِّقُ امْرَأَتِي أَمْ مَاذَا أَفْعَلُ؟ قَالَ: لَا، بَلْ تَعْتَزِلُهَا وَلَا تَقْرَبْهَا، فَقُلْتُ لِامْرَأَتِي: الْحَقِي بِأَهْلِكِ فَكُونِي فِيهِمْ حَتَّى يَقْضِيَ اللَّهُ ﷻ، فَلَحِقَتْ بِهِمْ»[١].

**واتە: کەعبی کوڕی مالیک ﷺ باس دەکات و دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نێردراوی نارد بۆ لای من و هەردوو هاوەڵەکەم، کە بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانتان پێ دەکات لە ژنەکانتان دوور بکەونەوە، منیش بە نێردراوەکەم وت: ژنەکەم تەڵاق بدەم یان چی بکەم؟ وتی: نا، بەڵکو لێی داببڕێ و نزیکی مەکەوە، بە ژنەکەمم وت: بچۆرەوە بۆ لای کەسوکارەکەت و لایان بمێنەوە هەتا خوا ﷻ بڕیار لەم کارە دەدات.**

**٣٤٢٦-** «عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ فِي حَدِيثِهِ: إِذَا رَسُولٌ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ قَدْ أَتَانِي، فَقَالَ: اعْتَزِلْ امْرَأَتَكَ، فَقُلْتُ: أُطَلِّقُهَا؟ قَالَ: لَا، وَلَكِنْ لَا تَقْرَبْهَا، وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ الْحَقِي بِأَهْلِكِ»[٢].

**واتە: کەعبی کوڕی مالیک ﷺ باس دەکات و دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لام فەرمووی: لە ژنەکەت داببڕێ، منیش وتم: ژنەکەم تەڵاق بدەم، یان چی بکەم؟ فەرمووی: نا، بەڵکو لێی نزیک مەکەرەوە، تیایدا باسی بچۆرەوە بۆ لای کەسوکارەکەتی نەکرد.**

## بابەت: تەڵاقدان لە لایەن کۆیلە

**٣٤٢٧-** «عَنْ أَبِي حَسَنٍ، مَوْلَى بَنِي نَوْفَلٍ قَالَ: كُنْتُ أَنَا وَامْرَأَتِي مَمْلُوكَيْنِ، فَطَلَّقْتُهَا تَطْلِيقَتَيْنِ، ثُمَّ أُعْتِقْنَا جَمِيعاً، فَسَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا فَقَالَ: إِنْ رَاجَعْتَهَا كَانَتْ عِنْدَكَ عَلَى وَاحِدَةٍ، قَضَى بِذَلِكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ»[٣].

**واتە: ئەبو حەسەنی مەولای بەنی نەوفەل دەڵێ: من و ژنەکەم کۆیلە بووین، دوو تەڵاقمدا، پاشان هەردووکمان ئازاد بووین، پرسیارم لە ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) کرد، وتی: ئەگەر بیگێڕیتەوە یەک تەڵاقت دەمێنێ، پێغەمبەری خوا ﷺ بەوە دادوەری کرد.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) ضعيف . أخرجه أبو داود: ٢١٨٧ و ٢١٨٨، وإبن ماجه: ٢٠٨٢.




**٣٤٢٨-** «عَنْ أَبِي الْحَسَنِ، مَوْلَى بَنِي نَوْفَلٍ قَالَ: سُئِلَ ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنْ عَبْدٍ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ تَطْلِيقَتَيْنِ ثُمَّ عُتِقَا، أَيَتَزَوَّجُهَا؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: عَمَّنْ؟ قَالَ: أَفْتَى بِذَلِكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ»(١).

**واتە: ئەبو حەسەنی مەولای بەنی نەوفەل دەڵێ: پرسیار کرا لە ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) لەبارەی کوێلەیەکەوە ژنەکەی تەڵاقدابێ بە دوو تەڵاق، پاشان هەردووکیان ئازاد کرابێتن، ئایا بیخوازێتەوە؟ وتی: بەڵێ، وتی: لە کێ؟ وتی: پێغەمبەر ﷺ بەمە فتوای داوە، دوو تەڵاقمدا، پاشان هەردووکمان ئازاد بووین، پرسیارم لە ئیبنو عەبباس کرد، وتی: ئەگەر بیگێڕیتەوە یەک تەڵاقت دەمێنێ، پێغەمبەری خوا ﷺ بەوە دادوەری کرد.**

## بابەت: کەی تەڵاقی منداڵ دەکەوێ

**٣٤٢٩-** «عَنْ كَثِيرِ بْنِ السَّائِبِ ﷺ قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنَا قُرَيْظَةَ: أَنَّهُمْ عُرِضُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ قُرَيْظَةَ، فَمَنْ كَانَ مُحْتَلِماً، أَوْ نَبَتَتْ عَانَتُهُ قُتِلَ، وَمَنْ لَمْ يَكُنْ مُحْتَلِماً، أَوْ لَمْ تَنْبُتْ عَانَتُهُ تُرِكَ»(٢).

**واتە: کەثیری کوڕی سائیب ﷺ دەڵێ: دوو کوڕەکەی قوڕەیظە بۆیان باس کردم: ئەوان لە ڕۆژی قوڕەیظە پێشنیار کران بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، هەر کەس باڵغ بوو، یان تووکی بەری هاتبوو کوژرا، هەر کەسیش باڵغ نەبوو بوو، یان تووکی بەری نەهاتبوو وازی لێهێنرا.**

**٣٤٣٠-** «عَنْ عَطِيَّةَ الْقُرَظِيِّ قَالَ: كُنْتُ يَوْمَ حُكْمِ سَعْدٍ فِي بَنِي قُرَيْظَةَ غُلَاماً، فَشَكُّوا فِيَّ، فَلَمْ يَجِدُونِي أَنْبَتُّ، فَاسْتُبْقِيتُ، فَهَا أَنَا ذَا بَيْنَ أَظْهُرِكُمْ»(٣).

**واتە: عەطیەی قوڕەیظە دەڵێ: من منداڵ بووم لە ڕۆژی حوکمدانی سەعد لە بارەی بەنی قوڕەیظە، تەماشایان کردم، هیچ توکیان نەبینی دەرچووبێت، منیان هێشتەوە، ئا ئەوە منم لە نێواتاندا.**

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٤٠٤ و ٤٤٠٥، والترمذي: ١٥٨٤، وإبن ماجه: ٢٥٤١ و ٢٥٤٢.




**٣٤٣١-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، عَرَضَهُ يَوْمَ أُحُدٍ وَهُوَ ابْنُ أَرْبَعَ عَشْرَةَ سَنَةً فَلَمْ يُجِزْهُ، وَعَرَضَهُ يَوْمَ الْخَنْدَقِ وَهُوَ ابْنُ خَمْسَ عَشْرَةَ سَنَةً فَأَجَازَهُ»[(١)].

**واته: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ، منی پێشاندرا لە جەنگی ئوحود کە تەمەنم چواردە ساڵ بوو (بۆ بەشداری لەو جەنگە) مۆڵەتی پێ نەدام، لە جەنگی خەندەقدا پیشانی درام، پازدە ساڵ بووم مۆڵەتی پێدام.**

## بابەت: ئەو پیاوەی کە تەڵاقی ناکەوێ

**٣٤٣٢-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلَاثٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ، وَعَنِ الصَّغِيرِ حَتَّى يَكْبُرَ، وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يَعْقِلَ أَوْ يُفِيقَ»[(٢)].

**واته: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: قەڵەم لەسەر سێ کەس هەڵگیراوە: لەسەر خەوتوو تا هەڵدەستێ، وە لەسەر بچووک تا گەورە دەبێ، وە لە سەر شێت تا عاقڵ دەبێ یان چاک دەبێتەوە.**

## بابەت: ئەو کەسەی لە ناخی خۆیدا ژنەکەی تەڵاق بدات

**٣٤٣٣-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى تَجَاوَزَ عَنْ أُمَّتِي كُلَّ شَيْءٍ حَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسَهَا، مَا لَمْ تَكَلَّمْ بِهِ أَوْ تَعْمَلْ»[(٣)].

**واته: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی خوای بەرز چاوپۆشی کردوە لە ئوممەتەکەم لە هەر شتێ بە خەیاڵیدا بێت، بە مەرجێ بە قسە نەیڵێ، یان بە کردەوە ئەنجامی نەدات.**

**٣٤٣٤-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ اللَّهَ ﷻ تَجَاوَزَ لِأُمَّتِي مَا وَسْوَسَتْ بِهِ وَحَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسَهَا، مَا لَمْ تَعْمَلْ أَوْ تَتَكَلَّمْ بِهِ»[(٤)].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٦٦٣ و ٤٠٩٧، ومسلم: ١٨٦٨، وأبو داود: ٢٩٥٧ و ٤٤٠٦ و ٤٤٠٧، والترمذي: ١٣٦١ و ١٧١١، وإبن ماجه: ٢٥٤٣.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٣٩٨، وإبن ماجه: ٢٠٤١.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٥٢٨ و ٢٥٦٩ و ٦٦٦٤، ومسلم: ٢٠١ و ١٢٧/٢٠٢، وأبو داود: ٢٢٠٩، والترمذي: ١١٨٣، وإبن ماجه: ٢٠٤٠ و ٢٠٤٤.




واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی خوا ﷻ چاوپۆشی کردوە لە ئوممەتەکەم لەوەی بە خەیاڵ و خەتەرە دێت بە نەفسیدا، بە مەرجێ بە قسەی نەیڵێ یان بە کردەوە ئەنجامی نەدات.

**٣٤٣٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى تَجَاوَزَ لِأُمَّتِي عَمَّا حَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسَهَا، مَا لَمْ تَكَلَّمْ أَوْ تَعْمَلْ بِهِ»(١).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی خوای بەرز چاوپۆشی کردوە لە ئوممەتەکەم لەوەی بە نەفس و دەروونیدا دێت، بە مەرجێک بە قسەی نەیڵێ، یان بە کردەوە ئەنجامی نەدات.

## تەڵاقدان بە ئاماژەی تێگەینراو

**٣٤٣٦-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ جَارٌ فَارِسِيٌّ طَيِّبُ الْمَرَقَةِ، فَأَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ وَعِنْدَهُ عَائِشَةُ، فَأَوْمَأَ إِلَيْهِ بِيَدِهِ أَنْ تَعَالَ، وَأَوْمَأَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى عَائِشَةَ أَيْ وَهَذِهِ، فَأَوْمَأَ إِلَيْهِ الْآخَرُ هَكَذَا بِيَدِهِ، أَنْ لَا مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلَاثاً»(٢).

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دراوسێیەکی فارسی هەبوو چێشتی شلەی خۆش دروست دەکرد، ڕۆژێک هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ (لە ژوورەکەی عائیشە دانیشتبوو) بە دەستی ئاماژەی کرد وەرە، پێغەمبەری خواش ﷺ ئاماژەی بۆ عائیشە کرد ئەویش لەگەڵمە، (ئەگەر ئەویش بانگهێشت نەکەی نایەم) جارێکی تر بە دەستی ئاماژەی بۆ کرد بەم شێوەیە با نەیەت، جارێ، جارێک یان دووجار.

## بابەت: قسەکردن ئەگەر مەبەست تیایدا ئەو شتە بێت کە ماناکەی لەخۆ دەگرێ

**٣٤٣٧-** «عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّةِ، وَإِنَّمَا لِامْرِئٍ مَا نَوَى، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ، فَهِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ، وَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ لِدُنْيَا يُصِيبُهَا أَوِ امْرَأَةٍ يَتَزَوَّجُهَا، فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ»(٣).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٠٣٧.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٤ و ٥٠٧٠، ومسلم: ١٩٠٧.





**واتە: عومەری کوڕی خەطاب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بێگومان کردەوەکان بە پێی نیەتەکانن، هەر کەس بە پێی نیەتی خۆیەتی، جا ئەوەی هیجرەتەکەی بۆ لای خواو پێغەمبەر بوو ئەوە بۆ لای خواو پێغەمبەرەکەی هیجرەتی کردوە، وە ئەوەی هیجرەتی بۆ دونیا کردبێ، یان بۆ ئافرەتێک مارەی بکات ئەوە هیجرەتەکەی بۆ لای ئەوەیە کە هیجرەتی بۆ کردوە.**

## بابەت: ڕوونکردنەوەو ئاشکراکردنی ئەو وشەی دەربڕاوە، ئەگەر مەبەست پێی ئەوە بێت ماناکە لەخۆ نەگرێ، ئەوە هیچ پێویست ناکات و هیچ حوکمێکیشی لەسەر ناچەسپێ

**٣٤٣٨-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: قَالَ: انْظُرُوا كَيْفَ يَصْرِفُ اللَّهُ عَنِّي شَتْمَ قُرَيْشٍ وَلَعْنَهُمْ، إِنَّهُمْ يَشْتِمُونَ مُذَمَّماً، وَيَلْعَنُونَ مُذَمَّماً، وَأَنَا مُحَمَّدٌ»(١).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: تەماشا بکەن چۆن خوا جنێوو نەفرینی قوڕەیشم لەسەر لا دەبات، بێگومان ئەوان جنێو دەدەنە سەرزەنشت کراو، وە نەفرین دەکەن لە سەرزەنشت کراو، منیش ستایشکراوم.**

## بابەت: دیاری کردنی کات بۆ سەرپشک کردن لە وەرگرتنی تەڵاق

**٣٤٣٩-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَتْ: لَمَّا أُمِرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِتَخْيِيرِ أَزْوَاجِهِ بَدَأَ بِي فَقَالَ: إِنِّي ذَاكِرٌ لَكِ أَمْراً، فَلَا عَلَيْكِ أَنْ لَا تُعَجِّلِي حَتَّى تَسْتَأْمِرِي أَبَوَيْكِ، قَالَتْ: قَدْ عَلِمَ أَنَّ أَبَوَايَ لَمْ يَكُونَا لِيَأْمُرَانِّي بِفِرَاقِهِ، قَالَتْ: ثُمَّ تَلَا هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿٢٨﴾﴾ الأحزاب، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿جَمِيلًا ﴿٢٨﴾﴾ الأحزاب، فَقُلْتُ: أَفِي هَذَا أَسْتَأْمِرُ أَبَوَيَّ؟ فَإِنِّي أُرِيدُ اللَّهَ ﷻ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الْآخِرَةَ قَالَتْ عَائِشَةُ: ثُمَّ فَعَلَ أَزْوَاجُ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَ مَا فَعَلْتُ، وَلَمْ يَكُنْ ذَلِكَ حِينَ قَالَ لَهُنَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَاخْتَرْنَهُ طَلَاقاً، مِنْ أَجْلِ أَنَّهُنَّ اخْتَرْنَهُ»(٢).

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە سەرپشک کردنی ژنەکانی لە منەوە دەستی پێکرد، فەرمووی:**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٧٨٥ وتعليقاً ٤٧٨٦، ومسلم: ١٤٧٥، والترمذي: ٣٢٠٤.




من شتێکت بۆ باس دەکەم، نابێ پەلە بکەی (لە بڕیاردان) تا فەرمان لە دایک و باوکت وەردەگری، وتی: بێگومان دەیزانی باوک و دایکم فەرمانی ئەوەم پێناکەن لێی جیاببمەوە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيۡنَ أُمَتِّعۡكُنَّ ﴿٢٨﴾ ﴾ (واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ بە خێزانەکانت بڵێ: ئەگەر ئێوە ژیانی دونیاو ڕازاوەیی ئەوتان دەوێ دەی هەمووتان وەرن موتعەتان پێ بدەم (کە پارەو شمەکێکە دەدرێت بە ئافرەتی تەڵاقدراو)، تا فەرمایشتی خوا: ﴿ جَمِيلًا ﴿٢٨﴾ ﴾ وتم: لەمەدا داوای فەرمان لە دایک و باوکم بکەم؟ بە ڕاستی من خواو پێغەمبەرەکەی و ڕۆژی دواییم دەوێ، عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پاشان خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ هەروەکو منیان کرد، ئەوان کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ سەرپشکی کردن هەرگیز داوای تەڵاقیان نەکرد، لە پێناو ئەوەی ئەوان سەرپشک کران.

**٣٤٤٠-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ﴿٢٩﴾ ﴾الأحزاب، دَخَلَ عَلَيَّ النَّبِيُّ ﷺ بَدَأَ بِي فَقَالَ: يَا عَائِشَةُ، إِنِّي ذَاكِرٌ لَكِ أَمْرًا، فَلَا عَلَيْكِ أَنْ لَا تُعَجِّلِي حَتَّى تَسْتَأْمِرِي أَبَوَيْكِ قَالَتْ: قَدْ عَلِمَ وَاللَّهِ أَنَّ أَبَوَيَّ لَمْ يَكُونَا لِيَأْمُرَانِّي بِفِرَاقِهِ، فَقَرَأَ عَلَيَّ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتَهَا ﴿٢٨﴾ ﴾الأحزاب. فَقُلْتُ: أَفِي هَذَا أَسْتَأْمِرُ أَبَوَيَّ؟ فَإِنِّي أُرِيدُ اللَّهَ وَرَسُولَهُ قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: هَذَا خَطَأٌ وَالْأَوَّلُ أَوْلَى بِالصَّوَابِ، وَاللَّهُ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى أَعْلَمُ»[1].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزیە خوارەوە: ﴿ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ﴿٢٩﴾ ﴾ (واتە: وە ئەگەر ئێوە خواو پێغەمبەرتان دەوێ). پێغەمبەر ﷺ هاتە ژوورەوە بۆ لام، فەرمووی: ئەی عائیشە من شتێکت بۆ باس دەکەم، نابێ پەلە بکەی (لە بڕیاردان)، تا فەرمان لە دایک و باوکت وەردەگری، وتی: سوێند بە خوا دەیزانی باوک و دایکم فەرمانی ئەوەم پێناکەن لێی جیاببمەوە، پاشان ئەم ئایەتەی بەسەرمدا خوێندەوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيۡنَ أُمَتِّعۡكُنَّ ﴿٢٨﴾ ﴾ (واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ بە خێزانەکانت بڵێ: ئەگەر ئێوە ژیانی دونیاو ڕازاوەیی ئەوتان دەوێ دەی هەمووتان وەرن موتعەتان پێبدەم (کە پارەو شمەکێکە دەدرێت بە ئافرەتی تەڵاقدراو)، وتم: لەمەدا داوای فەرمان لە دایک

---

(١) صحيح.




و باوكم بكەم؟ بە ڕاستی من خواو پێغەمبەرەكەیم دەوێ. ئەبو عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: ئەمە هەڵەیە، یەكەم فەرمووده تەواوترە، خوای پاك و بێگەرد زاناترە.

## بابەت: ئافرەتی سەرپشك كراو مێردەكەی هەڵببژێرێ

**٣٤٤١-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: خَيَّرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَاخْتَرْنَاهُ، فَهَلْ كَانَ طَلَاقاً»[١].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سەرپشكی كردین (لەوەی لەگەڵ ئەو بژین یان داوای تەڵاق بكەین) ئێمەش ئەومان هەڵبژارد، ئایا ئەوە دەبێتە تەڵاق؟! (ڕوونكردنەوە هەر كەس هاوسەرەكەی سەرپشك بكات بە تەڵاق هەژمار ناكرێت و تەڵاقیشی ناكەوێت، خوا زاناترە).

**٣٤٤٢-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: قَدْ خَيَّرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ نِسَاءَهُ، فَلَمْ يَكُنْ طَلَاقاً»[٢].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ خێزانەكانی سەرپشك كرد (لەوەی لەگەڵ ئەو بژین یان داوای تەڵاق بكەین) بە هیچ شێوەیەك بە تەڵاق هەژمار نەكرا.

تێبینی: هەر كەس هاوسەرەكەی سەرپشك بكات بە تەڵاق هەژمار ناكرێت و تەڵاقیشی ناكەوێت، خوا زاناترە.

**٣٤٤٣-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: قَدْ خَيَّرَ النَّبِيُّ ﷺ نِسَاءَهُ، فَلَمْ يَكُنْ طَلَاقاً»[٣].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ خێزانەكانی سەرپشك كرد، بە هیچ شێوەیەك بە تەڵاق هەژمار نەكرا.

**٣٤٤٤-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: قَدْ خَيَّرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ نِسَاءَهُ، أَفَكَانَ طَلَاقاً؟»[٤].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ خێزانەكانی سەرپشك كرد، بە هیچ شێوەیەك بە تەڵاق هەژمار نەكرا.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




**٣٤٤٥-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: خَيَّرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَاخْتَرْنَاهُ، فَلَمْ يَعُدَّهَا عَلَيْنَا شَيْئاً»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سەرپشکی کردین، ئێمەش ئەومان هەڵبژارد، بە هیچ شێوەیەک دووبارەی نەکردەوە بۆمان.**

## هەڵبژاردنی یەکێک لەو دوو کۆیلانەی کە ئازاد دەکرێن

**٣٤٤٦-** «عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ قَالَ: كَانَ لِعَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، غُلَامٌ وَجَارِيَةٌ، قَالَتْ: فَأَرَدْتُ أَنْ أُعْتِقَهُمَا، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: ابْدَئِي بِالْغُلَامِ قَبْلَ الْجَارِيَةِ»[٢].

**واتە: قاسمی کوڕی موحەممەد دەڵێ: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، کوڕێک و کچێکی لا بوو، وتی: ویستم ئازادیان بکەم، ئەوەم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس کرد، فەرمووی: بە کوڕەکە دەستی پێ بکە پێش کچەکە.**

## بابەت: سەرپشک کردنی کەنیزەک لە کاتی ئازاد کردنی لە مێردەکەی ئەگەر کۆیلە بوو

**٣٤٤٧-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: كَانَ فِي بَرِيرَةَ ثَلَاثُ سُنَنٍ، إِحْدَى السُّنَنِ أَنَّهَا أُعْتِقَتْ، فَخُيِّرَتْ فِي زَوْجِهَا، وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْوَلَاءُ لِمَنْ أَعْتَقَ وَدَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَالْبُرْمَةُ تَفُورُ بِلَحْمٍ، فَقُرِّبَ إِلَيْهِ خُبْزٌ وَأُدْمٌ مِنْ أُدْمِ الْبَيْتِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَلَمْ أَرَ بُرْمَةً فِيهَا لَحْمٌ؟ فَقَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ، ذَلِكَ لَحْمٌ تُصُدِّقَ بِهِ عَلَى بَرِيرَةَ، وَأَنْتَ لَا تَأْكُلُ الصَّدَقَةَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: هُوَ عَلَيْهَا صَدَقَةٌ، وَهُوَ لَنَا هَدِيَّةٌ»[٣].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: بە هۆی بەریرەوە سێ حوکمی مەسەلەی شەرعی چەسپێنرا، یەکێک لەو حوکمە شەرعیانە، (حوکمی**

---

(١) صحيح.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٢٣٧، وإبن ماجه: ٢٥٣٢.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٥٧٨ و ٥٠٩٧ و ٥٢٧٩، ومسلم: ١٧٢ و ١٠٧٥/١٧٣ و ١١ و ١٥٠٤/١٤، وأبو داود: ٢٢٣٤، وإبن ماجه: ٢٠٧٦.




شەرعی یەکەم) ئەو ئازاد کرا و سەرپشک کرا لە مێردەکەی، (واتە: ئافرەت ئەگەر کەنیزەک بوو مێردەکەیشی کۆیلە بوو، دواتر ئازاد کرا ئەوە سەرپشکە ئەگەر پێی خۆش بوو، دەگەڕێتەوە بۆ لای مێردەکەی، ئەگەر پێی خۆش نەبوو، ناگەڕێتەوەو گرێبەستی هاوسەرگیریان هەڵدەوەشێتەوە)، (دووەم) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: وەلاء بۆ ئەو کەسەیە ئازادی کردوە، (نەک بۆ ئەو کەسەی فرۆشتویەتی، ئەگەرچی مەرجیشی دانابێت وەلاء دەبێ هەر بۆ ئەو بێت)، (سێیەم) پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەوە مەنجەڵ دەکوڵا پڕی لە گۆشت بوو؟ نان و خواردنی ماڵەوەی لێ نزیک کرایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایە مەنجەڵێکم نەبینی گۆشتی تێدا بوو؟ وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوە گۆشتێکە کراوە بە صەدەقە بۆ بەریرە، تۆش صەدەقە ناخۆی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە بۆ ئەو صەدەقەیەو بۆ ئێمە دیاریە.

تێبینی: (الْوَلَاء): واتە: ئەگەر بەریرە کۆچی دوایی کرد، میرات گری نەبوو، ئەوە ئەوان میراتەکەی ببەن.

**٣٤٤٨-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ فِي بَرِيرَةَ ثَلَاثُ قَضِيَّاتٍ، أَرَادَ أَهْلُهَا أَنْ يَبِيعُوهَا وَيَشْتَرِطُوا الْوَلَاءَ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: اشْتَرِيهَا وَأَعْتِقِيهَا، فَإِنَّمَا الْوَلَاءُ لِمَنْ أَعْتَقَ، وَأُعْتِقَتْ فَخَيَّرَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَاخْتَارَتْ نَفْسَهَا، وَكَانَ يُتَصَدَّقُ عَلَيْهَا فَتُهْدِي لَنَا مِنْهُ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: كُلُوهُ، فَإِنَّهُ عَلَيْهَا صَدَقَةٌ، وَهُوَ لَنَا هَدِيَّةٌ»[١].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: لە بەریرەدا سێ مەسەلە و حوکمی شەرعی هەبوو، خاوەنەکانی ویستیان بیفرۆشن بە مەرجی وەلاء، ئەوەم بۆ پێغەمبەر ﷺ باس کرد فەرمووی: بیکڕە و ئازادی بکە، چونکە وەلاء بۆ ئەو کەسەیە ئازادی دەکات، پاشان ئازادی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ سەرپشکی کرد، (لەوەی دەگەڕێتەوە بۆ لای مێردەکەی، یان لێی جیادەبێتەوە) ئەویش جیابوونەوەی هەڵبژارد، دواتر صەدەقەی بۆ دەهێنرا بەشێکی بە دیاری دەدا بە ئێمە، باسی ئەوەم کرد بۆ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بخۆن، ئەوە بۆ بەریرە صەدەقەیەو بۆ ئێمەش دیاریە.

---

(١) صحیح.




## بابەت: سەرپشک کردنی کەنیزەک لە کاتی ئازاد کردنی لە مێردەکەی ئەگەر کۆیلە بوو

**٣٤٤٩-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: اشْتَرَيْتُ بَرِيرَةَ فَاشْتَرَطَ أَهْلُهَا وَلَاءَهَا، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: أَعْتِقِيهَا، فَإِنَّمَا الْوَلَاءُ لِمَنْ أَعْطَى الْوَرِقَ، قَالَتْ: فَأَعْتَقْتُهَا، فَدَعَاهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَخَيَّرَهَا مِنْ زَوْجِهَا، قَالَتْ: لَوْ أَعْطَانِي كَذَا وَكَذَا مَا أَقَمْتُ عِنْدَهُ، فَاخْتَارَتْ نَفْسَهَا، وَكَانَ زَوْجُهَا حُرًّا»(١).

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: بەریرەم کڕی خاوەنەکانی مەرجیان هەبوو بە وەلاء بیفرۆشن، ئەوەم بۆ پێغەمبەر ﷺ باس کرد، فەرمووی: ئازادی بکە، چونکە وەلاء بۆ ئەو کەسەیە پارە دەدات، وتم: ئازادم کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کرد، سەرپشکی کرد لەوەی مێردەکەی دەوێ یان نایەوێ، وتی: ئەگەر ئەوەو ئەوەشم پێ بدات لای دانانیشم، جیابوونەوەی هەڵبژارد، مێردەکەشی ئازاد بوو.**

**٣٤٥٠-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّهَا أَرَادَتْ أَنْ تَشْتَرِيَ بَرِيرَةَ فَاشْتَرَطُوا وَلَاءَهَا، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: اشْتَرِيهَا وَأَعْتِقِيهَا، فَإِنَّ الْوَلَاءَ لِمَنْ أَعْتَقَ، وَأُتِيَ بِلَحْمٍ، فَقِيلَ: إِنَّ هَذَا مِمَّا تُصُدِّقَ بِهِ عَلَى بَرِيرَةَ، فَقَالَ: هُوَ لَهَا صَدَقَةٌ وَلَنَا هَدِيَّةٌ، وَخَيَّرَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَكَانَ زَوْجُهَا حُرًّا»(٢).

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: ئەو ویستی بەریرە بکڕێ، خاوەنەکانی مەرجی ئەوەیان هەبوو بە وەلاء بیفرۆشن، ئەوەی بۆ پێغەمبەر ﷺ باس کرد، فەرمووی: بیکڕەو ئازادی بکە، چونکە وەلاء بۆ ئەو کەسەیە ئازادی دەکات، (پاش ئازاد کردنی) گۆشتیان هێنا، وترا: ئەمە لەو گۆشتەیە بە صەدەقە بۆ بەریرە نێردراوە، فەرمووی: ئەوە بۆ بەریرە صەدەقەیە و بۆ ئێمەش دیاریە)، وە پێغەمبەری خوا ﷺ سەرپشکی کرد، (لەوەی دەگەڕێتەوە بۆ لای مێردەکەی یان لێی جیادەبێتەوە) مێردەکەشی ئازاد بوو.**

---

(١) صحيح. دون قوله: «وَكَانَ زَوْجُهَا حُرًّا» فإنه شاذ.

(٢) صحيح. دون قوله: «حُرًّا» والمحفوظ أنه كان عبداً.




## بابەت: سەرپشک کردنی کەنیزەکی ئازادکراو مێردەکەشی کۆیلە بێت

**٣٤٥١-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَاتَبَتْ بَرِيرَةُ عَلَى نَفْسِهَا بِتِسْعِ أَوَاقٍ، فِي كُلِّ سَنَةٍ بِأُوقِيَّةٍ، فَأَتَتْ عَائِشَةَ تَسْتَعِينُهَا، فَقَالَتْ: لَا، إِلَّا أَنْ يَشَاءُوا أَنْ أَعُدَّهَا لَهُمْ عَدَّةً وَاحِدَةً وَيَكُونُ الْوَلَاءُ لِي، فَذَهَبَتْ بَرِيرَةُ فَكَلَّمَتْ فِي ذَلِكَ أَهْلَهَا فَأَبَوْا عَلَيْهَا، إِلَّا أَنْ يَكُونَ الْوَلَاءُ لَهُمْ، فَجَاءَتْ إِلَى عَائِشَةَ وَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عِنْدَ ذَلِكَ، فَقَالَتْ لَهَا مَا قَالَ أَهْلُهَا، فَقَالَتْ: لَا هَا اللَّهِ إِذاً إِلَّا أَنْ يَكُونَ الْوَلَاءُ لِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَا هَذَا؟ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ بَرِيرَةَ أَتَتْنِي تَسْتَعِينُ بِي عَلَى كِتَابَتِهَا، فَقُلْتُ: لَا، إِلَّا أَنْ يَشَاءُوا أَنْ أَعُدَّهَا لَهُمْ عَدَّةً وَاحِدَةً وَيَكُونُ الْوَلَاءُ لِي، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لِأَهْلِهَا فَأَبَوْا عَلَيْهَا، إِلَّا أَنْ يَكُونَ الْوَلَاءُ لَهُمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: ابْتَاعِيهَا وَاشْتَرِطِي لَهُمُ الْوَلَاءَ، فَإِنَّ الْوَلَاءَ لِمَنْ أَعْتَقَ، ثُمَّ قَامَ فَخَطَبَ النَّاسَ فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: مَا بَالُ أَقْوَامٍ يَشْتَرِطُونَ شُرُوطاً لَيْسَتْ فِي كِتَابِ اللَّهِ ﷻ يَقُولُونَ: أَعْتِقْ فُلَاناً وَالْوَلَاءُ لِي. كِتَابُ اللَّهِ ﷻ أَحَقُّ، وَشَرْطُ اللَّهِ أَوْثَقُ، وَكُلُّ شَرْطٍ لَيْسَ فِي كِتَابِ اللَّهِ فَهُوَ بَاطِلٌ وَإِنْ كَانَ مِائَةَ شَرْطٍ « فَخَيَّرَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، مِنْ زَوْجِهَا وَكَانَ عَبْداً فَاخْتَارَتْ نَفْسَهَا قَالَ عُرْوَةُ: فَلَوْ كَانَ حُرّاً، مَا خَيَّرَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ»[١].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: بەریرە گرێبەستی ئازاد کردنی خۆی لەگەڵ سەیدەکەی کرد بە بڕی نۆ ئوقیە (هەر ئوقیەیەکیش چل درهەمە، کەواتە: نۆ ئوقیە دەکاتە چوار سەد و شەست درهەم زیو) بۆ هەر ساڵێک ئوقیەیەک، هات بۆ لای عائیشە هاوکاری بکات، ئەویش وتی: نا، مەگەر ئەوان ڕازی بن بە یەکجار نرخەکە دەدەم، وەلائیش بۆ من بێت، بەریرە ڕۆیشت لەم بارەیەوە قسەی لەگەڵ کردن، ئەوانیش ڕازی نەبوون، گوتیان: ئیللا دەبێ وەلائی بۆ خۆیان بێت، دواتر هات بۆ لای عائیشە لەو کاتەشدا پێغەمبەری خوا ﷺ هات، ئەوەی خاوەنەکەی پێی وتبوو بۆ عائیشەی باس کرد، عائیشە وتی: نا سوێند بە خوا هەر دەبێ وەلاء بۆ من بێت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەمە چیە؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بەریرە هات بۆ لام داوا دەکات یارمەتی بدەم لەسەر گرێبەستی ئازاد کردنی، وتم: نا، مەگەر ئەوان ڕازی بن بە یەکجار نرخەکە دەدەم، وەلائیش بۆ من بێت، ئەوەی

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٥٥ و ٢٥٦١ و ٢٥٦٣ و ٢٧١٧، ومسلم: ٦ و ٨ و ١٥٠٤/٩، وأبو داود: ٢٢٣٣ و ٣٩٢٩ و ٣٩٣٠، والترمذي: ١١٥٤ و ٢١٢٤، وإبن ماجه: ٢٥٢١.




بۆ خانەوادەکەی باس کرد ئەوانیش ڕازی نەبوون، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بیکڕەو مەرجی وەلائیان بۆ دابنێ، چونکە وەلاء بۆ ئەو کەسەیە ئازادی کردوە، پاشان هەڵسا وتارێکی بۆ خەڵکدا سوپاس و ستایشی خوای کرد، پاشان فەرمووی: ئەوە چیانە خەڵکانێک مەرج دادەنێن لە کتێبی خوادا نیە، دەڵێن: فڵانە کەس ئازاد بکە و وەلائی بۆ منە، کتێبی خوا ﷺ لە پێشترە، مەرجی خوا پتەوترە، هەر مەرجێک لە کتێبی خوادا نەبێ، ئەوە پووچە، ئەگەرچی سەد مەرجیش بێت، پێغەمبەری خوا ﷺ سەرپشکی کرد لە گەڕانەوەی بۆ لای مێردەکەی، مێردەکەی کۆیلە بوو، بۆیە سەرپشکی کرد، عوروە دەڵێ: ئەگەر ئازاد بووایە، پێغەمبەری خوا ﷺ سەرپشکی نەدەکرد.

**٣٤٥٢-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ زَوْجُ بَرِيرَةَ عَبْداً»(١).

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: مێردەکەی بەریرە کۆیلە بوو.**

**٣٤٥٣-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّهَا اشْتَرَتْ بَرِيرَةَ مِنْ أُنَاسٍ مِنَ الْأَنْصَارِ فَاشْتَرَطُوا الْوَلَاءَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْوَلَاءُ لِمَنْ وَلِيَ النِّعْمَةَ، وَخَيَّرَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَكَانَ زَوْجُهَا عَبْداً. وَأَهْدَتْ لِعَائِشَةَ لَحْماً، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَوْ وَضَعْتُمْ لَنَا مِنْ هَذَا اللَّحْمِ. قَالَتْ عَائِشَةُ: تُصُدِّقَ بِهِ عَلَى بَرِيرَةَ، فَقَالَ: هُوَ عَلَيْهَا صَدَقَةٌ وَهُوَ لَنَا هَدِيَّةٌ»(٢).

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، ئەو بەریرەی کڕی لە خەڵکێک لە ئەنصارەکان ئەوان مەرجی وەلائیان هەبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: وەلاء بۆ ئەو کەسەیە ئازادی دەکات، پێغەمبەری خوا ﷺ سەرپشکی کرد (لەوەی دەگەڕێتەوە بۆ لای مێردەکەی، یان لێی جیادەبێتەوە) مێردەکەشی کۆیلە بوو، گۆشتی بە دیاری بۆ عائیشە نارد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر ئەو گۆشتەتان بۆمان دانایە، عائیشە وتی: بە صەدەقە دراوە بە بەریرە، فەرمووی: ئەوە بۆ ئەو صەدەقەیە و بۆ ئێمەش دیاریە.**

**٣٤٥٤-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَت: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ بَرِيرَةَ وَأَرَدْتُ أَنْ أَشْتَرِيَهَا وَاشْتُرِطَ الْوَلَاءُ لِأَهْلِهَا، فَقَالَ: اشْتَرِيهَا، فَإِنَّ الْوَلَاءَ لِمَنْ أَعْتَقَ، قَالَ: وَخُيِّرَتْ وَكَانَ زَوْجُهَا عَبْداً، ثُمَّ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.





قَالَ بَعْدَ ذَلِكَ: مَا أَدْرِي، وَأُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِلَحْمٍ، فَقَالُوا: هَذَا مِمَّا تُصُدِّقَ بِهِ عَلَى بَرِيرَةَ، قَالَ: هُوَ لَهَا صَدَقَةٌ وَلَنَا هَدِيَّةٌ»[١].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ لە بارەی بەریرەوە، وە ویستم بیکڕمەوە، ئەوان مەرجی وەلائیان دانا، فەرمووی: بیکڕەوە، چونکە بەڕاستی وەلاء بۆ ئەو کەسەیە ئازادی دەکات، وە وتی: سەرپشک کرا (لە نێوان ئەوەی دەگەڕێتەوە بۆ لای مێردەکەی، یان لێی جیادەبێتەوە) مێردەکەیشی کۆیلە بوو، پاشان دوای ئەوە وتی: نازانم، گۆشتێک هێنرا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ وتیان: ئەمە لەو گۆشتەیە کە بە صەدەقە بۆ بەریرە هاتووە، فەرمووی: ئەوە بۆ ئەو صەدەقەیەو بۆ ئێمەش دیاریە.

## بابەت: (الإِيلاءِ) (واتە: ئەو کەسەی سوێند دەخوات لەگەڵ ژنەکەی کۆنەبێتەوە)

**٣٤٥٥-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: أَصْبَحْنَا يَوْماً وَنِسَاءُ النَّبِيِّ ﷺ يَبْكِينَ عِنْدَ كُلِّ امْرَأَةٍ مِنْهُنَّ أَهْلُهَا، فَدَخَلْتُ الْمَسْجِدَ فَإِذَا هُوَ مَلْآنٌ مِنَ النَّاسِ، قَالَ: فَجَاءَ عُمَرُ فَصَعِدَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ فِي عُلِّيَّةٍ لَهُ، فَسَلَّمَ عَلَيْهِ فَلَمْ يُجِبْهُ أَحَدٌ، ثُمَّ سَلَّمَ فَلَمْ يُجِبْهُ أَحَدٌ، ثُمَّ سَلَّمَ فَلَمْ يُجِبْهُ أَحَدٌ، فَرَجَعَ، فَنَادَى بِلَالاً، فَدَخَلَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: أَطَلَّقْتَ نِسَاءَكَ؟ فَقَالَ: لَا، وَلَكِنِّي آلَيْتُ مِنْهُنَّ شَهْراً، فَمَكَثَ تِسْعاً وَعِشْرِينَ، ثُمَّ نَزَلَ فَدَخَلَ عَلَى نِسَائِهِ»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ڕۆژێک بەیانیمان کردەوەو خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ هەریەکەیان لای کەسوکاریان دەگریان، چوومە مزگەوتەوە تەماشام کرد پڕە لە خەڵکی، وتی: عومەر هات سەرکەوت بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئەویش لە شوێنێکی بەرز بوو، سڵاوی لێ کرد کەس وەڵامی نەدایەوە، پاشان سڵاوی لێ کرد کەس وەڵامی نەدایەوە، پاشان سڵاوی لێ کرد کەس وەڵامی نەدایەوە، گەڕایەوە بانگی بیلالی کرد، چوو بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: ئایا ژنەکانت تەڵاقداوە؟ فەرمووی: نەخێر، بەڵام سوێندم لێیان خواردوە بۆ مانگێک، بیست و نۆ ڕۆژ مایەوە پاشان چوو بۆ لای ژنەکانی.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٢٠٣.




**٣٤٥٦-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: آلَى النَّبِيُّ ﷺ مِنْ نِسَائِهِ شَهْراً فِي مَشْرُبَةٍ لَهُ، فَمَكَثَ تِسْعاً وَعِشْرِينَ لَيْلَةً ثُمَّ نَزَلَ، فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَلَيْسَ آلَيْتَ عَلَى شَهْرٍ؟ قَالَ: الشَّهْرُ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ»[1].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ سوێندی لەسەر خێزانەکانی خوارد بۆ ماوەی مانگێک لەژورێکی بەرزی خۆیدا بیست و نۆ شەو مایەوە، پاشان دابەزی بۆ لایان، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئایا بۆ ماوەی مانگێک سوێندت لەسەریان نەخوارد؟ فەرمووی: ئەم مانگە بیست و نۆ ڕۆژە.**

## بابەت: (الظِّهَارِ) (واتە: پیاوێک بە ژنەکەی بڵێ: تۆ وەکو پشتی دایکم وای بۆ من).

**٣٤٥٧-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ ﷺ قَدْ ظَاهَرَ مِنَ امْرَأَتِهِ فَوَقَعَ عَلَيْهَا، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي ظَاهَرْتُ مِنَ امْرَأَتِي فَوَقَعْتُ قَبْلَ أَنْ أُكَفِّرَ، قَالَ: وَمَا حَمَلَكَ عَلَى ذَلِكَ يَرْحَمُكَ اللَّهُ؟ قَالَ: رَأَيْتُ خَلْخَالَهَا فِي ضَوْءِ الْقَمَرِ، فَقَالَ: لَا تَقْرَبْهَا حَتَّى تَفْعَلَ مَا أَمَرَ اللَّهُ ﷻ»[2].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ظیهاری لە ژنەکەی کردبوو پاشان چوو بووە لایەوە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من ظیهارم لە ژنەکەم کرد و پاشان چوومە لایەوە پێش ئەوەی کەفارەت بدەم، فەرمووی: چی وای لێ کردی خوا ڕەحمت لێ بکات؟ وتی: خەڵخاڵەکانیم بینی لە ڕوناکی مانگ، فەرمووی: نزیکی مەکەوەرەوە تا ئەوەی خوا ﷻ فەرمانت پێ دەکات.**

**٣٤٥٨-** «عَنْ عِكْرِمَةَ ﷺ قَالَ: تَظَاهَرَ رَجُلٌ مِنَ امْرَأَتِهِ فَأَصَابَهَا قَبْلَ أَنْ يُكَفِّرَ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: مَا حَمَلَكَ عَلَى ذَلِكَ؟ قَالَ: رَحِمَكَ اللَّهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، رَأَيْتُ خَلْخَالَهَا أَوْ سَاقَيْهَا فِي ضَوْءِ الْقَمَرِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: فَاعْتَزِلْهَا حَتَّى تَفْعَلَ مَا أَمَرَكَ اللَّهُ ﷻ»[3].

**واتە: عیکریمە ﷺ دەڵێ: پیاوێک ظیهاری لە ژنەکەی کردبوو، پاشان چوو بووە لایەوە، پێش ئەوەی کەفارەت بدات، ئەوەی بۆ پێغەمبەر ﷺ باسکرد، پێغەمبەر**

---

(١) صحيح الإسناد. أخرجه البخاري: ٥٢٠٣.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٢٢٢٣ و ٢٢٢٥، والترمذي: ١١٩٩، وإبن ماجه: ٢٠٦٥.

(٣) حسن. أخرجه أبو داود: ٢٢٢١ و ٢٢٢٢.




ﷺ پێی فەرمووی: چی وای لێکردی ئەوە بکەی؟ وتی: خوا ڕەحمەت پێبکات ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵخاڵەکانی، یان لاقەکانیم بینی لە ڕوناکی مانگدا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لێی دووربکەوە تا ئەوەی خوا ﷻ فەرمانت پێ دەکات.

**٣٤٥٩-** «عَنْ عِكْرِمَةَ ﷺ قَالَ: أَتَى رَجُلٌ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، إِنَّهُ ظَاهَرَ مِنَ امْرَأَتِهِ ثُمَّ غَشِيَهَا قَبْلَ أَنْ يَفْعَلَ مَا عَلَيْهِ، قَالَ: مَا حَمَلَكَ عَلَى ذَلِكَ؟ قَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، رَأَيْتُ بَيَاضَ سَاقَيْهَا فِي الْقَمَرِ؟ قَالَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ: فَاعْتَزِلْ حَتَّى تَقْضِيَ مَا عَلَيْكَ، قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: الْمُرْسَلُ أَوْلَى بِالصَّوَابِ مِنَ الْمُسْنَدِ، وَاللَّهُ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى أَعْلَمُ»[١].

**واتە: عیکریمە ﷺ دەڵێ: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من ظیهاری ژنەکەمم کرد، پاشان چوومە لایەوە پێش ئەوەی کەفارەت بدەم، فەرمووی: چی وای لێ کردی ئەوە بکەی؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سپیایی لاقەکانیم بینی لە ڕوناکی مانگدا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لێی دوور بکەوە تا ئەوەی لەسەرتە ئەنجامی دەدەی. ئەبو عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: (الْمُرْسَلُ) لە پێشترە لە (الْمُسْنَد) خوا ﷻ زاناترە.**

**٣٤٦٠-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي وَسِعَ سَمْعُهُ الْأَصْوَاتَ، لَقَدْ جَاءَتْ خَوْلَةُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ تَشْكُو زَوْجَهَا، فَكَانَ يَخْفَى عَلَيَّ كَلَامُهَا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ: ﴿ قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِي تُجَٰدِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِيٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآ ﴿١﴾ ﴾ المجادلة»[٢].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێت: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە هەموو دەنگەکان دەبیستێ، خەولە هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ سکاڵای مێردەکەی دەکرد، جا زۆر بە نهێنی قسەی دەکرد لە منی دەشاردەوە، خوا ﷻ ئەم دەقەی دابەزاندە خوارەوە: ﴿ قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِي تُجَٰدِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِيٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآ ﴿١﴾ ﴾ (واتە: بە ڕاستی خوا بیستی وتەی ئەو ژنەی کە لە بارەی مێردەکەیەوە گفتوگۆی لەگەڵ ئەکردی، وە سکاڵای خۆی بۆ لای خوا ئەبرد، خواش گوێبیستی وتووێژی هەردووکتان بوو.**

---

(١) حسن.

(٢) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ١٨٨ و ٢٠٦٣.




## بابەت: ئەوەی هاتووە دەربارەی خولع (کڕینەوەی تەڵاق)

**٣٤٦١-** «عَن أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: الْمُنْتَزِعَاتُ وَالْمُخْتَلِعَاتُ هُنَّ الْمُنَافِقَاتُ، قَالَ الْحَسَنُ: لَمْ أَسْمَعْهُ مِنْ غَيْرِ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: الْحَسَنُ لَمْ يَسْمَعْ مِنْ أَبِي هُرَيْرَةَ شَيْئاً»[(١)].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ، دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەوانەی دەیانەوێ خۆیان دابڕێنن و ئەوانەی داوای خولع دەکەن، ئەوانە ئافرەتانی دووڕوون، حەسەن دەڵێ: لە جگە لە ئەبو هوڕەیرەوە نەمبیستووە، ئەبو عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: حەسەن لە ئەبو هورەیرەوە هیچی نەبیستووە.**

**تێبینی: خولع: بریتیە لە جیاکردنەوەی ژن و مێرد بە بەرانبەرێکی دیاریکراو لەلایەن ژنەوە دەدرێت بە مێردەکەی بە دەستەواژەی تەڵاق، یان خولع.**

**٣٤٦٢-** «عَنْ حَبِيبَةَ بِنْتِ سَهْلٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّهَا كَانَتْ تَحْتَ ثَابِتِ بْنِ قَيْسِ بْنِ شَمَّاسٍ، وَأَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ إِلَى الصُّبْحِ، فَوَجَدَ حَبِيبَةَ بِنْتَ سَهْلٍ عِنْدَ بَابِهِ فِي الْغَلَسِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ هَذِهِ؟ قَالَتْ: أَنَا حَبِيبَةُ بِنْتُ سَهْلٍ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: مَا شَأْنُكِ؟ قَالَتْ: لَا، أَنَا وَلَا ثَابِتُ بْنُ قَيْسٍ لِزَوْجِهَا، فَلَمَّا جَاءَ ثَابِتُ بْنُ قَيْسٍ، قَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: هَذِهِ حَبِيبَةُ بِنْتُ سَهْلٍ قَدْ ذَكَرَتْ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ تَذْكُرَ، فَقَالَتْ حَبِيبَةُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كُلُّ مَا أَعْطَانِي عِنْدِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِثَابِتٍ: خُذْ مِنْهَا، فَأَخَذَ مِنْهَا وَجَلَسَتْ فِي أَهْلِهَا»[(٢)].

**واتە: حەبیبەی کچی سەهل ﷺ، خێزانی ثابتی کوڕی قەیسی کوڕی شەماس بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بۆ نوێژی بەیانی، حەبیبەی کچی سەهلی بینی لە بەردەرگا لە تاریکدا وەستا بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەمە کێیە؟ وتی: ئوممو حەبیبەی کچی سەهلە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: ئیشت چیە؟ وتی: نە من و نە ثابتی کوڕی قەیس، بە مێردەکەی، کاتێ ثابتی کوڕی قەیس هات، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئەمە حەبیبەی کچی سەهلە باسی کرد ئەوەندەی خوا ویستی لەسەر بوو باسی بکات، حەبیبە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوەی پێی داوم**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٢٢٧.




(وەکو مارەیی) لامە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە ثابتی فەرموو: لێی وەربگرە، ئەویش لێی وەرگرت، حەبیبەش گەڕایەوە بۆ ناو کەسوکارەکەی (واتە: تەڵاقی خولعی دا).

**٣٤٦٣-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ امْرَأَةَ ثَابِتِ بْنِ قَيْسٍ أَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، ثَابِتُ بْنُ قَيْسٍ أَمَا إِنِّي مَا أَعِيبُ عَلَيْهِ فِي خُلُقٍ وَلَا دِينٍ، وَلَكِنِّي أَكْرَهُ الْكُفْرَ فِي الْإِسْلَامِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَتَرُدِّينَ عَلَيْهِ حَدِيقَتَهُ؟ قَالَتْ: نَعَمْ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اقْبَلِ الْحَدِيقَةَ وَطَلِّقْهَا تَطْلِيقَةً»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: ژنەکەی ثابتی کوڕی قەیس هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من هیچ کەم و کوڕیەک نابینم لە ڕەوشت و دینی ثابت، بەڵام من حەزم لە ڕەوشتی بێبڕوایی نیە لە ئیسلامدا (واتە: دەترسێم هۆکاربێت بۆ هەڵگەڕانەوەم لە ئایین)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا باخچەکەی بۆ دەگێڕیتەوە (کە مارەییەکەی بوو)؟ (ژنەکە) وتی: بەڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ (بە ثابتی کوڕی قەیسی) فەرموو: باخچەکە وەربگرەوە تەڵاقێکی بدە.

**٣٤٦٤-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: إِنَّ امْرَأَتِي لَا تَمْنَعُ يَدَ لَامِسٍ، فَقَالَ: غَرِّبْهَا إِنْ شِئْتَ، قَالَ: إِنِّي أَخَافُ أَنْ تَتْبَعَهَا نَفْسِي، قَالَ: اسْتَمْتِعْ بِهَا»[٢].

واتە: ئیبنو عەبابس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: بەڕاستی ژنەکەم لە کاری داوێن پیسی کەس ڕەت ناکاتەوە، فەرمووی: ئەگەر حەز دەکەی دووری بخەرەوە، وتی: من لەوە دەترسم نەفسم شوێنی بکەوێ، فەرمووی: لەززەتی لێوەربگرە.

**٣٤٦٥-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ تَحْتِي امْرَأَةً لَا تَرُدُّ يَدَ لَامِسٍ، قَالَ: طَلِّقْهَا قَالَ: إِنِّي لَا أَصْبِرُ عَنْهَا، قَالَ: فَأَمْسِكْهَا، قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: هَذَا خَطَأٌ وَالصَّوَابُ مُرْسَلٌ»[٣].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من ژنێکم هەیە دەستی کەس ناگێڕێتەوە، فەرمووی: تەڵاقی بدە، وتی:

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٢٧٣ و ٥٢٧٤ و ٥٢٧٥ و ٥٢٧٦ و ٥٢٧٧، وإبن ماجه: ٢٠٥٦.

(٢) صحيح الإسناد. أخرجه أبو داود: ٢٠٤٩.

(٣) صحيح الإسناد. أخرجه أبو داود: ٢٠٤٩.

ئارام ناگرم، فەرمووی: بیهێڵەرەوە. ئەبو هورەیرە دەڵێ: ئەم فەرموودە هەڵەیە، ئەوەی ڕاستە (مُرْسَل)ـە.

## بابەت: دەستپێکی (اللِّعَان) واتە: نەفرین کردن

**٣٤٦٦-** «عَنْ عَاصِمِ بْنِ عَدِيٍّ ﷺ قَالَ: جَاءَنِي عُوَيْمِرٌ، رَجُلٌ مِنْ بَنِي الْعَجْلَانِ، فَقَالَ: أَيْ عَاصِمُ، أَرَأَيْتُمْ رَجُلاً رَأَى مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلاً أَيَقْتُلُهُ فَتَقْتُلُونَهُ؟ أَمْ كَيْفَ يَفْعَلُ يَا عَاصِمُ؟ سَلْ لِي رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَسَأَلَ عَاصِمٌ عَنْ ذَلِكَ النَّبِيَّ ﷺ، فَعَابَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمَسَائِلَ وَكَرِهَهَا، فَجَاءَهُ عُوَيْمِرٌ، فَقَالَ: مَا صَنَعْتَ يَا عَاصِمُ؟ فَقَالَ: صَنَعْتُ أَنَّكَ لَمْ تَأْتِنِي بِخَيْرٍ، كَرِهَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمَسَائِلَ وَعَابَهَا، قَالَ عُوَيْمِرٌ: وَاللَّهِ لَأَسْأَلَنَّ عَنْ ذَلِكَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَانْطَلَقَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَسَأَلَهُ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: قَدْ أَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ فِيكَ وَفِي صَاحِبَتِكَ فَأْتِ بِهَا، قَالَ سَهْلٌ: وَأَنَا مَعَ النَّاسِ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَجَاءَ بِهَا فَتَلَاعَنَا، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَاللَّهِ لَئِنْ أَمْسَكْتُهَا لَقَدْ كَذَبْتُ عَلَيْهَا، فَفَارَقَهَا قَبْلَ أَنْ يَأْمُرَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِفِرَاقِهَا، فَصَارَتْ سُنَّةَ الْمُتَلَاعِنَيْنِ»[1].

واتە: عاصمی کوڕی عەدی ﷺ دەڵێ: عوەیمری عەجلانی هات بۆ لام پیاوێک بوو لە نەوەکانی عەجلان وتی: ئەی عاصم ئەگەر پیاوێک کەسێک لەگەڵ ژنەکەیدا ببینێ، ئایا بیکوژێ و بیکوژنەوە یان چی بکات؟ ئەی عاصم پرسیارم بۆ بکە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ لەو بارەیەوە، عاصمیش پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ حەزی لەو پرسیارە نەبوو سەرزەنشتیشی کرد، عوەیمیر هات بۆ لای، وتی ئەی عاصم چیت کرد؟ عاصم بە عومەیری وت: بە خێر نەیەی بەڕاستی پێغەمبەر ئەو پرسیارەی پێ ناخۆش بوو کە تۆ پرسیارت لە بارەیەوە کرد، عوەیمیر وتی: سوێند بەخوا لەو بارەیەوە پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەم، ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێ کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: خوا لەبارەی تۆو ژنەکەتەوە ئایەتی دابەزاند برۆ ئەویش بهێنە، هێنای و هەردووکیان مولاعەنەی یەکتریان کرد، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بیهێڵمەوە مانای ئەوەیە درۆم بۆی هەڵبستوە، پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمان بە جیابوونەوەی بکات لێی جیابوویەوە، ئەوەش بوو بە سوننەتی هەردوو نەفرینکارەکە.

---

(١) صحيح.




## بابەت: مولاعەنە کردن بە ئافرەتی دووگیان

**٣٤٦٧-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: لَاعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْنَ الْعَجْلَانِيِّ وَامْرَأَتِهِ وَكَانَتْ حُبْلَى»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ مولاعەنەی کرد لە نێوان عەجلانی و ژنەکەی، (لە کاتێکدا) ژنەکەشی دووگیان بوو.

## بابەت: مولاعەنە لەوەی پیاو ژنەکەی تۆمەتبار بکات بە پیاوێکی دیاری کراو

**٣٤٦٨-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: إِنَّ هِلَالَ بْنَ أُمَيَّةَ قَذَفَ امْرَأَتَهُ بِشَرِيكِ بْنِ السَّحْمَاءِ، وَكَانَ أَخُو الْبَرَاءِ بْنِ مَالِكٍ لِأُمِّهِ، وَكَانَ أَوَّلَ مَنْ لَاعَنَ، فَلَاعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْنَهُمَا، ثُمَّ قَالَ: ابْصُرُوهُ، فَإِنْ جَاءَتْ بِهِ أَبْيَضَ سَبِطاً قَضِيءَ الْعَيْنَيْنِ فَهُوَ لِهِلَالِ بْنِ أُمَيَّةَ، وَإِنْ جَاءَتْ بِهِ أَكْحَلَ جَعْداً أَحْمَشَ السَّاقَيْنِ فَهُوَ لِشَرِيكِ بْنِ السَّحْمَاءِ، قَالَ: فَأُنْبِئْتُ أَنَّهَا جَاءَتْ بِهِ أَكْحَلَ جَعْداً أَحْمَشَ السَّاقَيْنِ»[٢].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: هیلالی کوڕی ئومەیە ژنەکەی تۆمەتبار کرد بە شەریکی کوڕی سەحماء، برای بەڕائی کوڕی مالیک لە دایکیەوە، ئەو یەکەم کەس بوو مولاعەنەی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ مولاعەنەی لە نێوانیاندا کرد، پاشان فەرمووی: تەماشای بکەن، ئەگەر منداڵەکە دوای لە دایک بوون سپی و قژ خاوو برژانگی چاوی درێژ بوو ئەوە هی هیلالی کوڕی ئومەیەیە، وە ئەگەر چاوی ڕەش بوو لاقەکانیشی باریک بوو، ئەوە هی شەریکی کوڕی سەمحائە، هەواڵم پێگەیشت ئەو ژنە منداڵەکەی بوو چاوی ڕەش و لاقی باریک بوو.

## چۆنیەتی مولاعەنەو نەفرین کردن

**٣٤٦٩-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: إِنَّ أَوَّلَ لِعَانٍ كَانَ فِي الْإِسْلَامِ أَنَّ هِلَالَ بْنَ أُمَيَّةَ قَذَفَ شَرِيكَ بْنَ السَّحْمَاءِ بِامْرَأَتِهِ، فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَأَخْبَرَهُ بِذَلِكَ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: أَرْبَعَةَ شُهَدَاءَ وَإِلَّا

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٩٦.




فَحَدٌّ فِي ظَهْرِكَ، يُرَدِّدُ ذَلِكَ عَلَيْهِ مِرَاراً، فَقَالَ لَهُ هِلَالٌ: وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ اللَّهَ ﷻ لَيَعْلَمُ أَنِّي صَادِقٌ، وَلَيُنْزِلَنَّ اللَّهُ ﷻ عَلَيْكَ مَا يُبَرِّئُ ظَهْرِي مِنَ الْجَلْدِ، فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ إِذْ نَزَلَتْ عَلَيْهِ آيَةُ اللِّعَانِ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ أَزۡوَٰجَهُمۡ ﴿٦﴾ ﴾النور، إِلَى آخِرِ الْآيَةِ، فَدَعَا هِلَالاً فَشَهِدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ، وَالْخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَةَ اللَّهِ عَلَيْهِ إِنْ كَانَ مِنَ الْكَاذِبِينَ، ثُمَّ دُعِيَتِ الْمَرْأَةُ فَشَهِدَتْ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ، فَلَمَّا أَنْ كَانَ فِي الرَّابِعَةِ أَوِ الْخَامِسَةِ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: وَقِّفُوهَا فَإِنَّهَا مُوجِبَةٌ، فَتَلَكَّأَتْ حَتَّى مَا شَكَكْنَا أَنَّهَا سَتَعْتَرِفُ، ثُمَّ قَالَتْ: لَا أَفْضَحُ قَوْمِي سَائِرَ الْيَوْمِ، فَمَضَتْ عَلَى الْيَمِينِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: انْظُرُوهَا، فَإِنْ جَاءَتْ بِهِ أَبْيَضَ سَبِطاً قَضِيءَ الْعَيْنَيْنِ فَهُوَ لِهِلَالِ بْنِ أُمَيَّةَ، وَإِنْ جَاءَتْ بِهِ آدَمَ جَعْداً رَبْعاً حَمْشَ السَّاقَيْنِ فَهُوَ لِشَرِيكِ بْنِ السَّحْمَاءِ، فَجَاءَتْ بِهِ آدَمَ جَعْداً رَبْعاً حَمْشَ السَّاقَيْنِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَوْلَا مَا سَبَقَ فِيهَا مِنْ كِتَابِ اللَّهِ لَكَانَ لِي وَلَهَا شَأْنٌ، قَالَ الشَّيْخُ وَالْقَضِئُ طَوِيلُ شَعْرِ الْعَيْنَيْنِ، لَيْسَ بِمَفْتُوحِ الْعَيْنِ وَلَا جَاحِظِهِمَا، وَاللَّهُ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى أَعْلَمُ»[1].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: یەکەم نەفرین لە ئیسلامدا کرا هیلالی کوڕی ئومەیە بوو شەریکی کوڕی سەمحائی تۆمەتبار کرد بەوەی چووتە لای ژنەکەیەوە، هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ هەواڵی ئەوەی پێدا، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: چوار شایەت بهێنە ئەگینا دار دەدەم لە پشتت، چەند جارێک ئەوەی بۆ دووبارە کردەوە، هیلال پێی وت: سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، خوا دەزانی من ڕاست دەکەم، خوا ئایەت دادەبەزێنێ بۆ ئەوەی پشتی من بەری بکات لە دار، لە کاتێکدا ئەوان لەسەر ئەو حاڵە بوون، ئایەتی نەفرین دابەزی: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ أَزۡوَٰجَهُمۡ ﴿٦﴾ ﴾ (واتە: ئەوانەش ژنەکانیان تۆمەتبار کردوە)، تا کۆتایی ئایەتەکە، هیلالی بانگ کرد چوار جار سوێندی خوارد کە بێگومان ئەو ڕاستگۆیە لەوەی وتی: ژنەکەم بینیوە زینای کردوە، لە پێنجەمین جاردا نەفرینی خوا لەسەر ئەو بێت ئەگەر درۆزن بێت، پاشان ئافرەتەکە بانگ کرا چوار جار سوێندی خوارد کە بێگومان مێردەکەی درۆ دەکات، جا لە چوارەم یان پێنجەمدا بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بیوەستێنن بەڕاستی سزا پێویست بوو بۆ سەر ئەوەیان درۆی کرد، وەستا تا گومانمان برد ئێستا دانی پێدادەنێ، پاشان وتی: قەومەکەم سەرشۆڕ ناکەم بە درێژایی ڕۆژگار، بۆیە بەردەوام بوو لەسەر سوێندەکەی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: تەماشای بکەن،**

---

(١) صحيح الإسناد.




ئەگەر منداڵەکە دوای لە دایک بوون سپی و قژ خاوو برژانگی چاوی درێژ بوو ئەوە هی هیلالی کوڕی ئومەیەیە، وە ئەگەر چاوی ڕەش بوو لاقەکانیشی باریک بوو، ئەوە هی شەریکی کوڕی سەمحائە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر قورئان پێش نەکەوتایە ئەوە دەمزانی چۆن مامەڵەی لەگەڵ دەکەم.

## بابەت: وتەی ئیمام (کە دەڵێ:) خوایە ئاشکرای بکەی

**٣٤٧٠-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ قَالَ: ذُكِرَ التَّلَاعُنُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ عَاصِمُ بْنُ عَدِيٍّ فِي ذَلِكَ قَوْلاً ثُمَّ انْصَرَفَ، فَأَتَاهُ رَجُلٌ مِنْ قَوْمِهِ يَشْكُو إِلَيْهِ أَنَّهُ وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلاً، قَالَ عَاصِمٌ: مَا ابْتُلِيتُ بِهَذَا إِلَّا بِقَوْلِي: فَذَهَبَ بِهِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأَخْبَرَهُ بِالَّذِي وَجَدَ عَلَيْهِ امْرَأَتَهُ، وَكَانَ ذَلِكَ الرَّجُلُ مُصْفَراً قَلِيلَ اللَّحْمِ سَبِطَ الشَّعْرِ، وَكَانَ الَّذِي ادَّعَى عَلَيْهِ أَنَّهُ وَجَدَهُ عِنْدَ أَهْلِهِ آدَمَ خَدْلاً كَثِيرَ اللَّحْمِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اللَّهُمَّ بَيِّنْ، فَوَضَعَتْ شَبِيهاً بِالرَّجُلِ الَّذِي ذَكَرَ زَوْجُهَا أَنَّهُ وَجَدَهُ عِنْدَهَا، فَلَاعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْنَهُمَا فَقَالَ رَجُلٌ لِابْنِ عَبَّاسٍ فِي الْمَجْلِسِ: أَهِيَ الَّتِي قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَوْ رَجَمْتُ أَحَداً بِغَيْرِ بَيِّنَةٍ رَجَمْتُ هَذِهِ؟ قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: لَا، تِلْكَ امْرَأَةٌ كَانَتْ تُظْهِرُ فِي الْإِسْلَامِ الشَّرَّ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: باسی مولاعەنە کرا لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ، عاصمی کوڕی عەدی قسەیەکی لەو بارەیەوە کرد و پاشان ڕۆیشت، پیاوێک لە قەومەکەی هات بۆ لای سکاڵای ئەوەی دەکرد کە پیاوێکی لەگەڵ ژنەکەیدا بینیوە، عاصم وتی: تووشی بەڵای وا نەبووم مەگەر بە هۆی وتەکەی خۆم: لەگەڵ خۆی بردی بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی ئەوەی پێدا کە چۆتە لای ژنەکەیەوە، ئەو پیاوە کەسێکی لاوازو قژ خاو بوو، ئەو پیاوەش کە لەگەڵ ژنەکەیدا بینرا بوو، پیاوێکی لاق پڕو بە خۆوە بوو قژی لوول بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوایە ئاشکرای بکەی، کاتێ ژنەکە منداڵەکەی بوو هەر لەو پیاوە دەچوو کە مێردەکەی باسی کردبوو لەگەڵیدا بینیویەتی، پێغەمبەری خوا ﷺ مولاعەنەی کرد لە نێوانیاندا، پیاوێک لە نێو مەجلیسەکەدا بە ئیبنو عەبباسی وت: ئەمە ئەو ئافرەتە بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەیەوە فەرمووی: ئەگەر کەسێکم

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٣١٠ و ٥٣١٦ و ٦٨٥٥ و ٦٨٥٦ و ٧٢٣٨، ومسلم: ١٢ و ١٤٩٧/١٣، وإبن ماجه: ٣٥٦٠.





**ڕەجم بکردایە بەبێ بەڵگە ئەم ژنەم ڕەجم دەکرد؟ ئیبنو عەبباس وتی: نەخێر، ئەوە ئافرەتێک بوو داوێن پیسی لە ناو ئیسلامدا بڵاو دەکردەوە.**

**٣٤٧١-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ قَالَ: ذُكِرَ التَّلَاعُنُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ عَاصِمُ بْنُ عَدِيٍّ فِي ذَلِكَ قَوْلاً ثُمَّ انْصَرَفَ، فَلَقِيَهُ رَجُلٌ مِنْ قَوْمِهِ فَذَكَرَ أَنَّهُ وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلاً، فَذَهَبَ بِهِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأَخْبَرَهُ بِالَّذِي وَجَدَ عَلَيْهِ امْرَأَتَهُ، وَكَانَ ذَلِكَ الرَّجُلُ مُصْفَرّاً قَلِيلَ اللَّحْمِ سَبِطَ الشَّعْرِ، وَكَانَ الَّذِي ادَّعَى عَلَيْهِ أَنَّهُ وَجَدَ عِنْدَ أَهْلِهِ آدَمَ خَدْلاً كَثِيرَ اللَّحْمِ جَعْداً قَطَطاً، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اللَّهُمَّ بَيِّنْ، فَوَضَعَتْ شَبِيهاً بِالَّذِي ذَكَرَ زَوْجُهَا أَنَّهُ وَجَدَهُ عِنْدَهَا، فَلَاعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْنَهُمَا فَقَالَ رَجُلٌ لِابْنِ عَبَّاسٍ فِي الْمَجْلِسِ: أَهِيَ الَّتِي قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَوْ رَجَمْتُ أَحَداً بِغَيْرِ بَيِّنَةٍ رَجَمْتُ هَذِهِ؟ قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: لَا، تِلْكَ امْرَأَةٌ كَانَتْ تُظْهِرُ الشَّرَّ فِي الْإِسْلَامِ»(١).

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: باسی مولاعەنە کرا لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ عاصمی کوڕی عەدی لەو بارەیەوە قسەیەکی کرد، پاشان هەڵساو ڕۆیشت، پیاوێک لە قەومەکەی پێی گەیشت بۆی باس کرد کە پیاوێکی لەگەڵ ژنەکەیدا گرتووە، ئەویش لەگەڵ خۆی بردی بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵیدا لەبارەی ئەو پیاوەی کە لەگەڵ ژنەکەیدا گرتویەتی، جا ئەو پیاوە ڕەنگی زەرد بوو قەڵەو نەبوو قژی خاو بوو، ئەو پیاوەش کە لەگەڵ ژنەکەیدا بینرا بوو، پیاوێکی لاق پڕو بەخۆوە بوو قژی لوول بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوایە ئاشکرای بکەی، کاتێ ژنەکە منداڵەکەی دانا هەر لەو پیاوە دەچوو کە مێردەکەی لەگەڵیدا بینی بووی، پێغەمبەری خوا ﷺ مولاعەنەی کرد لە نێوانیاندا، پیاوێک لە نێو مەجلیسەکەدا بە ئیبنو عەبباسی وت: ئەمە ئەو ئافرەتە بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەیەوە فەرمووی: ئەگەر کەسێکم ڕەجم بکردایە بەبێ بەڵگە ئەم ژنەم ڕەجم دەکرد؟ ئیبنو عەبباس وتی: نەخێر، ئەوە ئافرەتێک بوو داوێن پیسی لە نێو ئیسلامدا بڵاو دەکردەوە.**

---

(١) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ١٩٠٦.




## بابەت: فەرمان کردن بە دانانی دەست لەسەر دەمی هەردوو نەفرین لێکەرەکە لە پێنجەم جاردا

**٣٤٧٢-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، أَمَرَ رَجُلاً حِينَ أَمَرَ الْمُتَلَاعِنَيْنِ أَنْ يَتَلَاعَنَا، أَنْ يَضَعَ يَدَهُ عِنْدَ الْخَامِسَةِ عَلَى فِيهِ، وَقَالَ: إِنَّهَا مُوجِبَةٌ»[١].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە پیاوێک کاتێ فەرمانی بە دوو نەفرین لێکەرەکە کرد نەفرین لە یەکتری بکەن، لە کاتی پێنجەمدا دەستی بخاتە سەر دەمی، وە بڵی: بێگومان ئەوە سزا واجب دەکات.**

## بابەت: ئامۆژگاری پێشەوا بۆ پیاوەکەو ژنەکە لە کاتی نەفرین کردن لە یەکتر

**٣٤٧٣-** «عَنْ سَعِيدَ بْنَ جُبَيْرٍ يَقُولُ: سُئِلْتُ عَنِ الْمُتَلَاعِنَيْنِ فِي إِمَارَةِ ابْنِ الزُّبَيْرِ أَيُفَرَّقُ بَيْنَهُمَا؟ فَمَا دَرَيْتُ مَا أَقُولُ، فَقُمْتُ مِنْ مَقَامِي إِلَى مَنْزِلِ ابْنِ عُمَرَ، فَقُلْتُ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، الْمُتَلَاعِنَيْنِ أَيُفَرَّقُ بَيْنَهُمَا؟ قَالَ: نَعَمْ، سُبْحَانَ اللَّهِ إِنَّ أَوَّلَ مَنْ سَأَلَ عَنْ ذَلِكَ فُلَانُ بْنُ فُلَانٍ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ وَلَمْ يَقُلْ عَمْرٌو، أَرَأَيْتَ الرَّجُلَ مِنَّا يَرَى عَلَى امْرَأَتِهِ فَاحِشَةً إِنْ تَكَلَّمَ فَأَمْرٌ عَظِيمٌ، وَقَالَ عَمْرٌو: أَتَى أَمْراً عَظِيماً، وَإِنْ سَكَتَ سَكَتَ عَلَى مِثْلِ ذَلِكَ، فَلَمْ يُجِبْهُ، فَلَمَّا كَانَ بَعْدَ ذَلِكَ أَتَاهُ فَقَالَ: إِنَّ الْأَمْرَ الَّذِي سَأَلْتُكَ ابْتُلِيتُ بِهِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ هَؤُلَاءِ الْآيَاتِ فِي سُورَةِ النُّورِ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَٰجَهُمْ ﴿٦﴾ ﴾النور، حَتَّى بَلَغَ: ﴿ وَٱلْخَٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيْهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٩﴾ ﴾النور، فَبَدَأَ بِالرَّجُلِ فَوَعَظَهُ وَذَكَّرَهُ وَأَخْبَرَهُ أَنَّ عَذَابَ الدُّنْيَا أَهْوَنُ مِنْ عَذَابِ الْآخِرَةِ، فَقَالَ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا كَذَبْتُ، ثُمَّ ثَنَّى بِالْمَرْأَةِ فَوَعَظَهَا وَذَكَّرَهَا، فَقَالَتْ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ إِنَّهُ لَكَاذِبٌ، فَبَدَأَ بِالرَّجُلِ فَشَهِدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ، وَالْخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَةَ اللَّهِ عَلَيْهِ إِنْ كَانَ مِنَ الْكَاذِبِينَ، ثُمَّ ثَنَّى بِالْمَرْأَةِ فَشَهِدَتْ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ، وَالْخَامِسَةَ أَنَّ غَضَبَ اللَّهِ عَلَيْهَا إِنْ كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ، فَفَرَّقَ بَيْنَهُمَا»[٢].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٢٥٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٧٤٨، ومسلم: ١٤٩٣/٤، وأبو داود: ٢٢٥٨، والترمذي: ١٢٠٢ و ٣١٧٨.




واتە: سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: لەسەردەمی دەسەڵاتی ئیبنو زوبەیر پرسیارم لێکرا لە بارەی مولاعەنە کردنی ژن و مێرد ئایا جیایان دەکاتەوە لە یەکتر؟ نەمزانی چی بڵێم، لە شوێنی خۆم هەڵسام ڕۆیشتم بۆماڵی ئیبنو عومەر، وتم: ئەی باوکی عەبدوڕڕەحمان ئایا جیایان دەکاتەوە؟ وتی: بەڵێ، پاکی بۆ خوا، یەکەم کەس پرسیاری لەم بارەیەوە کرد، فلانی کوڕی فلان بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئایا ئەگەر یەکێک لە ئێمە کەسێک ببینێ بەسەر ژنەکەیەوە داوێن پیسی بکەن، ئەگەر قسە بکات ئەوە کارەکە گەورە دەبێ، ئەگەر بێدەنگیش بێت بێدەنگ بووە لەسەر شتێکی لەو جۆرە، ئەویش وەلامی نەدایەوە، بەڵام دوای ئەوە هاتەوە، وتی: ئەوەی پرسیارم کرد لەبارەیەوە خۆم تووشی بووم، پاشان خوا ﷻ ئەم ئایەتانەی دابەزاند: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَٰجَهُمْ ﴿٦﴾ ﴾، (واتە: وە ئەوانەی خێزانەکانیان تۆمەتبار دەکەن، تا گەیشتە: ﴿ وَٱلْخَٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيْهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٩﴾ ﴾ (واتە: وە لە پێنجەم جاردا بڵێ: خەشمی خوای لەسەر بێت ئەگەر مێردەکەی لە ڕاستگۆیان بێت)، لە پیاوەکەوە دەستی پێکرد سەرەتا ئامۆژگاری کردو یادی خستەوە کە بەڕاستی سزای دونیا سووکترە لە سزای ڕۆژی دوایی، وتی: سوێند بەو خوایەی تۆی بە حەق ڕەوانە کردوە درۆم نەکردوە، پاشان دووەم جار ئامۆژگاری ئافرەتەکەی کرد و یادی خستەوە ئەویش وتی: سوێند بەو خوایەی تۆی بە حەق ڕەوانە کردوە ئەو درۆ دەکات، لە پیاوەکەوە دەستی پێکرد چوارجار سوێندی خوارد کە بێگومان ئەو لە ڕاستگۆیانە (کە دەڵێ: خێزانەکەم بینیوە زینای کردوە)، وە لە پێنجەمین جاردا نەفرینی خوا لەسەر ئەو بێت ئەگەر درۆزن بێت، پاشان بە ژنەکەی دەستی پێکرد چوارجار سوێندی خوارد بەخوا کە مێردەکەی لە درۆزنەکانە لەو تۆمەتەی دوایەتە پاڵی، وە لە پێنجەمین جاردا بڵێ خەشمی خوای لەسەر بێت ئەگەر مێردەکەی لە ڕاستگۆیان بێت، ئینجا لەیەکتر جیای کردنەوە.

## بابەت: جیاکردنەوە هەردوو نەفرینکەر

**٣٤٧٤-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: لَمْ يُفَرِّقِ الْمُصْعَبُ بَيْنَ الْمُتَلَاعِنَيْنِ. قَالَ سَعِيدٌ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا فَقَالَ: فَرَّقَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْنَ أَخَوَيْ بَنِي الْعَجْلَانِ»[1].

---

(١) صحيح.

واتە: سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: موصعەب ژن و مێردی نەفرینکەری لە یەکتر جیانەکردەوە، سەعید دەڵێ: ئەوەم بۆ ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) باس کرد، ئەویش وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ژن و مێردەکەی بەنی عەجلانی لە یەکتر جیاکردەوە.

## داواکردنی تەوبە لە هەردوو نەفرینکەرەکە دوای نەفرین کردنەکەیان

**٣٤٧٥-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: رَجُلٌ قَذَفَ امْرَأَتَهُ، قَالَ: فَرَّقَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْنَ أَخَوَيْ بَنِي الْعَجْلَانِ، وَقَالَ: اللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّ أَحَدَكُمَا كَاذِبٌ، فَهَلْ مِنْكُمَا تَائِبٌ؟ قَالَ لَهُمَا ثَلَاثاً فَأَبَيَا، فَفَرَّقَ بَيْنَهُمَا قَالَ الرَّجُلُ: مَالِي؟ قَالَ: لَا مَالَ لَكَ إِنْ كُنْتَ صَادِقاً فَقَدْ دَخَلْتَ بِهَا، وَإِنْ كُنْتَ كَاذِباً فَهِيَ أَبْعَدُ مِنْكَ»[١].

واتە: سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: بە ئیبنو عومەرم وت: پیاوێک ژنەکەی تۆمەتبار کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ ژن و مێردەکەی بەنی عەجلانی لە یەکتر جیاکردەوە، وە فەرمووی: خوا دەزانێ بێگومان یەکێکتان درۆ دەکەن، ئایا کەستان تەوبە دەکەن؟ سێ جار ئەمەی پێ فەرموون، بەڵام کەسیان تەوبەیان نەکرد، هەردووکیانی لەیەکتر جیاکردەوە، پیاوەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺماڵەکەم کە بە مارەیی پێم داوە؟ وتی: ماڵت ناکەوێ ئەگەر ڕاست بکەی، ئەوە بێگومان چوویتەتە لایەوەو لەزەتت لێ وەرگرتووە، وە ئەگەر درۆ بکەی ئەوە دوورترە لە تۆوە.

## کۆکردنەوەی هەردوو نەفرینکەرەکە

**٣٤٧٦-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ يَقُولُ: سَأَلْتُ ابْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ الْمُتَلَاعِنَيْنِ، فَقَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺلِلْمُتَلَاعِنَيْنِ: حِسَابُكُمَا عَلَى اللَّهِ، أَحَدُكُمَا كَاذِبٌ، وَلَا سَبِيلَ لَكَ عَلَيْهَا، قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَالِي؟ قَالَ: لَا مَالَ لَكَ إِنْ كُنْتَ صَدَقْتَ عَلَيْهَا فَهُوَ بِمَا اسْتَحْلَلْتَ مِنْ فَرْجِهَا، وَإِنْ كُنْتَ كَذَبْتَ عَلَيْهَا فَذَاكَ أَبْعَدُ لَكَ»[٢].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٣١١ و ٥٣٤٩، ومسلم: ٦ و ١٤٩٣/٧، وأبو داود: ٢٢٥٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٣٥٠، ومسلم: ١٤٥٣/٥، وأبو داود: ٢٢٥٧.





واتە: سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: پرسیارم کرد لە ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەربارەی هەردوو نەفرینکەرەکە، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بە ژن و مێردە نەفرینکەرەکەی فەرموو: لێپرسینەوەتان لای خوایە، یەکێکتان درۆ دەکات، وە هیچ ڕێگایەکت نەماوە بۆ لای، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ماڵەکەم کە بە مارەیی پێم داوە؟ وتی: ماڵت ناکەوێ ئەگەر ڕاست بکەی، ئەوە بێگومان چوویتەتە لایەوەو لەزەتت لێ وەرگرتووە، وە ئەگەر درۆ بکەی ئەوە دوورترە لە تۆوە.

## بابەت: ڕەتکردنەوەی منداڵ بە نەفرین و گەڕاندنەوەی بۆ لای دایکی

**٣٤٧٧-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: لَاعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْنَ رَجُلٍ وَامْرَأَتِهِ، وَفَرَّقَ بَيْنَهُمَا، وَأَلْحَقَ الْوَلَدَ بِالْأُمِّ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ مولاعەنەی لە نێوان پیاوێک و ژنەکەیدا کرد، لە یەکتریش جیای کردنەوە، منداڵەکەشی دایەوە دایکی.

## بابەت: ئەگەر (کەسێک) گومانی لە ژنەکەی هەبوو لە منداڵەکەی و ویستی ئەو منداڵە ڕەت بکاتەوە

٣٤٧٨- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَجُلاً مِنْ بَنِي فَزَارَةَ أَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: إِنَّ امْرَأَتِي وَلَدَتْ غُلَاماً أَسْوَدَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: هَلْ لَكَ مِنْ إِبِلٍ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَمَا أَلْوَانُهَا؟ قَالَ: حُمْرٌ، قَالَ: فَهَلْ فِيهَا مِنْ أَوْرَقَ؟ قَالَ: إِنَّ فِيهَا لَوُرْقاً، قَالَ: فَأَنَّى تَرَى أَتَى ذَلِكَ؟ قَالَ: عَسَى أَنْ يَكُونَ نَزَعَهُ عِرْقٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: وَهَذَا عَسَى أَنْ يَكُونَ نَزَعَهُ عِرْقٌ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێک لە نەوەی فەزارە هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ژنەکەم کوڕێکی ڕەشی بووە (گومانی هەبووە منداڵی خۆی بێ)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا وشترت هەیە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: ڕەنگیان

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٣١٥ و ٦٧٤٨، ومسلم: ١٤٩٤، وأبو داود: ٢٢٥٩، والترمذي: ١٢٠٣، وإبن ماجه: ٢٠٦٩.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٠٥ و ٦٨٤٧ و ٧٣١٤، ومسلم: ١٨ و ١٥٠٠/٢٠، وأبو داود: ٢٢٦٠ و ٢٢٦١ و ٢٢٦٢، والترمذي: ٢١٢٨، وإبن ماجه: ٢٠٠٢.




**چۆنە؟ وتی: سوورن فەرمووی: ئایا ڕەنگ خۆڵەمێشیان تێدایە؟ وتی: تیایاندایە ڕەنگ خۆڵەمێشییە، فەرمووی: ئەوە لە کوێوە هاتووە؟ وتی: لەوانەیە لە باوانیەوە هاتبێ، فەرمووی: ئەمەش لەوانەیە لە باوانیەوە هاتبێ.**

**٣٤٧٩-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي فَزَارَةَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: إِنَّ امْرَأَتِي وَلَدَتْ غُلَاماً أَسْوَدَ وَهُوَ يُرِيدُ الِانْتِفَاءَ مِنْهُ، فَقَالَ: هَلْ لَكَ مِنْ إِبِلٍ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: مَا أَلْوَانُهَا؟ قَالَ: حُمْرٌ، قَالَ: هَلْ فِيهَا مِنْ أَوْرَقَ؟ قَالَ: فِيهَا ذَوْدُ وُرْقٍ، قَالَ: فَمَا ذَاكَ تُرَى؟ قَالَ: لَعَلَّهُ أَنْ يَكُونَ نَزَعَهَا عِرْقٌ، قَالَ: فَلَعَلَّ هَذَا أَنْ يَكُونَ نَزَعَهُ عِرْقٌ. قَالَ: فَلَمْ يُرَخِّصْ لَهُ فِي الِانْتِفَاءِ مِنْهُ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێک لە نەوەی فەزارە هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: ژنەکەم کوڕێکی ڕەشی بووە، مەبەستی ئەوە بوو منداڵە ڕەت بکاتەوە کە لە ئەو بێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا وشترت هەیە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: ڕەنگیان چۆنە؟ وتی: سوورن فەرمووی: ئایا ڕەنگ خۆڵەمێشیان تێدایە؟ وتی: تیایاندایە ڕەنگ خۆڵەمێشییە، فەرمووی: ئەوە لە کوێوە هاتووە؟ وتی: لەوانەیە لە باوانیەوە هاتبێ، فەرمووی: ئەمەش لەوانەیە لە باوانیەوە هاتبێ، وتی: مۆڵەتی نەدا منداڵەکە ڕەتبکاتەوە.**

**٣٤٨٠-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَامَ رَجُلٌ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي وُلِدَ لِي غُلَامٌ أَسْوَدُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: فَأَنَّى كَانَ ذَلِكَ؟ قَالَ: مَا أَدْرِي، قَالَ: فَهَلْ لَكَ مِنْ إِبِلٍ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَمَا أَلْوَانُهَا؟ قَالَ: حُمْرٌ، قَالَ: فَهَلْ فِيهَا جَمَلٌ أَوْرَقُ؟ قَالَ: فِيهَا إِبِلٌ وُرْقٌ، قَالَ: فَأَنَّى كَانَ ذَلِكَ قَالَ: مَا أَدْرِي يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِلَّا أَنْ يَكُونَ نَزَعَهُ عِرْقٌ، قَالَ: وَهَذَا لَعَلَّهُ نَزَعَهُ عِرْقٌ، فَمِنْ أَجْلِهِ قَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، هَذَا لَا يَجُوزُ لِرَجُلٍ أَنْ يَنْتَفِيَ مِنْ وَلَدٍ وُلِدَ عَلَى فِرَاشِهِ، إِلَّا أَنْ يَزْعُمَ أَنَّهُ رَأَى فَاحِشَةً»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەردا بووین پیاوێک هەڵسا، وتی: ژنەکەم کوڕێکی ڕەشی بووە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە لە کوێوە هاتووە؟ وتی: نازانم، فەرمووی: ئایا وشترت هەیە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: ڕەنگیان چۆنە؟ وتی: سوورن فەرمووی: ئایا ڕەنگ خۆڵەمێشیان تێدایە؟**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

وتی: تیایاندایە ڕەنگ خۆڵەمێشییە، فەرمووی: ئەوە لە کوێوە هاتووە؟ وتی: نازانم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەوانەیە لە باوانیەوە هاتبێ، فەرمووی: ئەمەش لەوانەیە لە باوانیەوە هاتبێ، ئا لەبەر ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بەوە دادوەری کرد، کە نابێت پیاوێک منداڵی ببێت لەسەر جێگاکەی ڕەتی بکاتەوە، مەگەر داوێن پیسی لە ژنەکەی ببینێ.

## بابەت: هەڕەشە کردن لە ڕەتکردنەوەی منداڵ

**٣٤٨١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ حِينَ نَزَلَتْ آيَةُ الْمُلَاعَنَةِ: أَيُّمَا امْرَأَةٍ أَدْخَلَتْ عَلَى قَوْمٍ رَجُلاً لَيْسَ مِنْهُمْ فَلَيْسَتْ مِنَ اللَّهِ فِي شَيْءٍ، وَلَا يُدْخِلُهَا اللَّهُ جَنَّتَهُ، وَأَيُّمَا رَجُلٍ جَحَدَ وَلَدَهُ وَهُوَ يَنْظُرُ إِلَيْهِ، احْتَجَبَ اللَّهُ ﷻ مِنْهُ وَفَضَحَهُ عَلَى رُءُوسِ الْأَوَّلِينَ وَالْآخِرِينَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو کاتێ ئایەتی مولاعەنە دابەزی دەیفەرموو: هەر ئافرەتێک منداڵێک بخاتە ناو خەڵکێکەوە لە ئەوان نەبێت، ئەوە لای خوا ﷻ هیچی بۆ نیە و خوا نایخاتە بەهەشتەوە، هەر پیاوێکیش نکوڵی منداڵەکەی بکات و تەماشای بکات، خوا دەرگای میهرەبانی خۆی لێ دادەخات و ڕیسوای دەکات لە پێش چاوی یەکەمین و دوایین لە ڕۆژی دواییدا.

## بابەت: پەیوەست کردنی منداڵ بە سەرجێی، ئەگەر خاوەن جێگاکە ڕەتی نەکاتەوە

**٣٤٨٢-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ وَلِلْعَاهِرِ الْحَجَرُ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: منداڵ هی سەرجێیەو، (واتە: بۆ ئەو کەسەیە کە سەرجێی شەرعی هەیەو، ئافرەتەکە خێزانی خۆیەتی) کەسی داوێن پیسیش سەرشۆڕی پەشیمانی بۆ هەیە.

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٢٦٣، وإبن ماجه: ٢٧٤٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٧٥٠ و ٦٨١٨، ومسلم: ١٤٥٨، والترمذي: ١١٥٧، وإبن ماجه: ٢٠٠٦.




**٣٤٨٣-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ وَلِلْعَاهِرِ الْحَجَرُ»(١).

**واته: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: منداڵ هی سەرجێیەو، (واتە: بۆ ئەو کەسەیە کە سەرجێی شەرعی هەیەو ئافرەتەکە خێزانی خۆیەتی) کەسی داوێن پیسیش سەرشۆڕی پەشیمانی بۆ هەیە.**

**٣٤٨٤-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: اخْتَصَمَ سَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ وَعَبْدُ بْنُ زَمْعَةَ فِي غُلَامٍ، فَقَالَ سَعْدٌ: هَذَا يَا رَسُولَ اللَّهِ ابْنُ أَخِي عُتْبَةَ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ عَهِدَ إِلَيَّ أَنَّهُ ابْنُهُ انْظُرْ إِلَى شَبَهِهِ، وَقَالَ عَبْدُ بْنُ زَمْعَةَ: أَخِي وُلِدَ عَلَى فِرَاشِ أَبِي مِنْ وَلِيدَتِهِ، فَنَظَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى شَبَهِهِ فَرَأَى شَبَهاً بَيِّناً بِعُتْبَةَ، فَقَالَ: هُوَ لَكَ يَا عَبْدُ، الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ وَلِلْعَاهِرِ الْحَجَرُ، وَاحْتَجِبِي مِنْهُ يَا سَوْدَةُ بِنْتُ زَمْعَةَ فَلَمْ يَرَ سَوْدَةَ قَطُّ»(٢).

**واته: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص و عەبدی کوڕی زەمعە بووبە ناکۆکیان لە بارەی منداڵێکەوە، سەعد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەمە کوڕی عوتبەی کوڕی ئەبو وەقاصی برامە وەسیەتی بۆ کردووم ئەوە کوڕیەتی تەماشای هاوشێوەی بکە، عەبدی کوڕی زەمعە وتی: برامە لەسەر جێگەی باوکم لە دایک بووە، پێغەمبەری خوا ﷺ تەماشای کرد بینی بە ئاشکرا لە عوتبە دەچێت، فەرمووی: ئەو منداڵە هی تۆیە ئەی عەبد، منداڵ هی سەرجێیە، (واتە: بۆ ئەو کەسەیە کە سەرجێی شەرعی هەیەو، ئافرەتەکە خێزانی خۆیەتی)، کەسی داوێن پیسیش سەرشۆڕی پەشیمانی بۆ هەیە، وە خۆت لێی داپۆشە ئەی سەودەی کچی زەمعە، ئیتر هەرگیز سەودەی نەبینی.**

**٣٤٨٥-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَتْ لِزَمْعَةَ جَارِيَةٌ يَطَؤُهَا هُوَ، وَكَانَ يَظُنُّ بِآخَرَ يَقَعُ عَلَيْهَا، فَجَاءَتْ بِوَلَدٍ شِبْهِ الَّذِي كَانَ يَظُنُّ بِهِ، فَمَاتَ زَمْعَةُ وَهِيَ حُبْلَى، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ سَوْدَةُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ، وَاحْتَجِبِي مِنْهُ يَا سَوْدَةُ فَلَيْسَ لَكِ بِأَخٍ»(٣).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠٥٣ و ٢٢١٨ و ٢٤٢١ و ٢٥٣٣ و ٢٧٤٥ و ٤٣٠٣ و ٦٧٤٩ و ٦٧٦٥ و ٦٨١٧ و ٧١٨٢، ومسلم: ١٤٥٧، وأبو داود: ٢٢٧٣، وإبن ماجه: ٢٠٠٤.

(٣) صحيح لغيره.




واتە: عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: زەمعە جاریەیەکی هەبوو دەچووە لایەوە، گومانی دەبرد کەسێکی تر بچێتە لایەوە، جا منداڵێکی بوو هاوشێوەی ئەو کەسەی گومانی بۆ دەبرد، زەمعە مرد ئەویش دووگیان بوو، سەودە ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: منداڵ هی سەرجێیە و(واتە بۆ ئەو کەسەیە کە سەرجێی شەرعی هەیە و ئافرەتەکە خێزانی خۆیەتی) کەسی داوێن پیسیش سەرشۆڕی پەشیمانی بۆ هەیە، وە خۆت لێی داپۆشە ئەی سەودە، ئیتر هەرگیز سەودەی نەبینی.

**٣٤٨٦-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ وَلِلْعَاهِرِ الْحَجَرُ، قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: وَلَا أَحْسَبُ هَذَا عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ، وَاللَّهُ تَعَالَى أَعْلَمُ»[١].

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: منداڵ هی سەرجێیەو، (واتە: بۆ ئەو کەسەیە کە سەرجێی شەرعی هەیە و ئافرەتەکە خێزانی خۆیەتی) کەسی داوێن پیسیش سەرشۆڕی پەشیمانی بۆ هەیە، ئەبو عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: وا نازانم ئەمە لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە هاتبێت، خوا زاناترە.

## بابەت: سەرجێی کەنیزەک

**٣٤٨٧-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: اخْتَصَمَ سَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ وَعَبْدُ بْنُ زَمْعَةَ فِي ابْنِ زَمْعَةَ، قَالَ سَعْدٌ: أَوْصَانِي أَخِي عُتْبَةُ إِذَا قَدِمْتَ مَكَّةَ فَانْظُرِ ابْنَ وَلِيدَةِ زَمْعَةَ فَهُوَ ابْنِي، فَقَالَ عَبْدُ بْنُ زَمْعَةَ: هُوَ ابْنُ أَمَةِ أَبِي وُلِدَ عَلَى فِرَاشِ أَبِي، فَرَأَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ شَبَهاً بَيِّناً بِعُتْبَةَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ، وَاحْتَجِبِي مِنْهُ يَا سَوْدَةُ»[٢].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص و عەبدی کوڕی زەمعە بووبە ناکۆکیان لەبارەی منداڵەکەی زەمعە، سەعدی وتی: عوتبەی برام وەسیەتی بۆ کردووم کاتێ چوومە مەککەوە تەماشای کوڕەکەی زەمعە بکەم ئەوە کوڕی منە، عەبدی کوڕی زەمعەش وتی: ئەوە کوڕی کەنیزەکەکەی باوکمە لەسەرجێی باوکی من لە دایک بووە، پێغەمبەر ﷺ تەماشای کرد بینی بە ئاشکرا لە

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح.




عوتبە دەچێت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: منداڵ هی سەرجێیەو، (واتە: بۆ ئەو کەسەیە کە سەرجێی شەرعی هەیەو، ئافرەتەکە خێزانی خۆیەتی)، وە خۆت لێی داپۆشە ئەی سەودە (چونکە نامەحرەم بوو لێی).

## بابەت: تیروپشک بۆ منداڵێک ئەگەر ناکۆکیان لەسەری هەبوو، وە باسی جیاوازی لەسەر شەعبی تیایدا لە فەرموودەی زەیدی کوڕی ئەرقەم

**٣٤٨٨-** «عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ عَبْدِ خَيْرٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ ﷺ قَالَ: أُتِيَ عَلِيٌّ بِثَلَاثَةٍ وَهُوَ بِالْيَمَنِ وَقَعُوا عَلَى امْرَأَةٍ فِي طُهْرٍ وَاحِدٍ، فَسَأَلَ اثْنَيْنِ: أَتُقِرَّانِ لِهَذَا بِالْوَلَدِ؟ قَالَا: لَا، ثُمَّ سَأَلَ اثْنَيْنِ: أَتُقِرَّانِ لِهَذَا بِالْوَلَدِ؟ قَالَا: لَا، فَأَقْرَعَ بَيْنَهُمْ فَأَلْحَقَ الْوَلَدَ بِالَّذِي صَارَتْ عَلَيْهِ الْقُرْعَةُ، وَجَعَلَ عَلَيْهِ ثُلُثَيِ الدِّيَةِ، فَذُكِرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَضَحِكَ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ»[١].

**واتە: شەعبی دەگێڕێتەوە، لە عەبدو خەیر، لە زەیدی کوڕی ئەرقەم ﷺ وتوویەتی: سێ کەسیان هێنا بۆ لای عەلی کاتێک لە یەمەن بوو، چوو بوونە لای ژنێکەوە لە یەک پاکبوونەوەدا، پرسیاری لە دووانیان کرد ئێوە ڕازین ئەم منداڵە بۆ ئەو پیاوە بێت؟ وتیان: نەخێر، پاشان پرسیاری لە دووانەکە کرد ئێوە ڕازین ئەم منداڵە بۆ ئەو پیاوە بێت؟ وتیان: نەخێر، تیروپشکی لە نێوانیاندا کرد، منداڵەکەی دایە ئەوەیان لە تیروپشکەکە دەرچوو، نرخی سێیەکی خوێنێکی لەسەری پێویست کرد، (چونکە هەرسێکەیان بانگەشەی ئەوەیان کرد ئەو منداڵە هی ئەوە)، ئەوە باس کرا بۆ پێغەمبەر ﷺ پێکەنی تا ددانەکانی دەرکەوت.**

**٣٤٨٩-** «عَنِ الشَّعْبِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَبْد اللَّهِ بْنِ أَبِي الْخَلِيلِ الْحَضْرَمِيُّ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ ﷺ قَالَ: بَيْنَا نَحْنُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِذْ جَاءَهُ رَجُلٌ مِنَ الْيَمَنِ، فَجَعَلَ يُخْبِرُهُ وَيُحَدِّثُهُ وَعَلِيٌّ بِهَا، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَتَى عَلِيّاً ثَلَاثَةُ نَفَرٍ يَخْتَصِمُونَ فِي وَلَدٍ، وَقَعُوا عَلَى امْرَأَةٍ فِي طُهْرٍ، وَسَاقَ الْحَدِيثَ»[٢].

**واتە: شەعبی دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو خەلیلی حەظرەمی، لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە ﷺ وتوویەتی: لە کاتێکدا ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ**

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٢٦٩ و ٢٢٧٠، وإبن ماجه: ٢٣٤٨.

(٢) صحيح.




**دانیشتبووین، پیاوێک لە یەمەنەوە هات بۆ لای، باسی ئەو ڕووداوەی بۆ دەکرد، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سێ کەس هاتن بۆ لای عەلی ناکۆکیان هەبوو لەبارەی منداڵێکەوە، کە هەرسێکەیان لە کاتی پاک بوونەوەدا چوو بوونە لای ژنەکەوە، فەرموودەکەی باس کرد.**

**٣٤٩٠-** «عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أبي الْخَلِيلِ، عَنْ زَيْدِ بن أَرْقَمَ ﷺ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ وَعَلِيٌّ يَوْمَئِذٍ بِالْيَمَنِ، فَأَتَاهُ رَجُلٌ فَقَالَ: شَهِدْتُ عَلِيّاً أُتِيَ فِي ثَلَاثَةِ نَفَرٍ ادَّعَوْا وَلَدَ امْرَأَةٍ، فَقَالَ عَلِيٌّ لِأَحَدِهِمْ: تَدَعُهُ لِهَذَا؟ فَأَبَى وَقَالَ لِهَذَا: تَدَعُهُ لِهَذَا؟ فَأَبَى، وَقَالَ لِهَذَا: تَدَعُهُ لِهَذَا؟ فَأَبَى، قَالَ عَلِيٌّ: أَنْتُمْ شُرَكَاءُ مُتَشَاكِسُونَ وَسَأُقْرِعُ بَيْنَكُمْ، فَأَيُّكُمْ أَصَابَتْهُ الْقُرْعَةُ فَهُوَ لَهُ وَعَلَيْهِ ثُلُثَا الدِّيَةِ، فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ»[١].

**واتە: شەعبی دەگێڕێتەوە: لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو خەلیل، لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە ﷺ وتوویەتی: من لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووم، ئەو کات عەلی لە یەمەن بوو، پیاوێک هات بۆ لای و وتی: لەلای عەلی بووم سێ کەسیان هێنا بۆ لای هەرسێکەیان بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە ئەو منداڵەی ئەو ژنە هی ئەوە، عەلی بە یەکێکیانی وت: وازی لێ دێنی بۆ ئەمە؟ ڕازی نەبوو، وە بە ئەویتری وت: وازی لێ دێنی بۆ ئەمە؟ ڕازی نەبوو؟ بە ئەوی تریشی وت: وازی لێ دێنی بۆ ئەمە، ڕازی نەبوو، عەلی وتی: ئێوە هاوبەشێکی ئاژاوەگێڕن، ئێستا تیروپشک لە نێوانتاندا دەکەم، ئەگەر تیروپشکەکە بەر هەرکامەتان کەوت ئەوە بۆ ئەوە، وە دەبێ نرخی سێیەکی خوێنێک بدات، پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەنی تا ددانەکانی دەرکەوت.**

**٣٤٩١-** «عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ رَجُلٍ من حَضْرَمَوْتَ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ ﷺ قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلِيّاً عَلَى الْيَمَنِ، فَأُتِيَ بِغُلَامٍ تَنَازَعَ فِيهِ ثَلَاثَةٌ، وَسَاقَ الْحَدِيثَ»[٢].

**واتە: شەعبی دەگێڕێتەوە: لە پیاوێک لە (حَضْرَمَوْتَ)، لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە ﷺ وتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ عەلی نارد منداڵێکیان بۆ هێنا سێ کەس خۆیان بە خاوەنی دەزانی، فەرموودەکەی باس کرد.**

---

**(١) صحيح.**

**(٢) صحيح لغيره.**




**٣٤٩٢-** «عَنْ الشَّعْبِيَّ يحدث، عَنْ أَبِي الْخَلِيلِ، أَوْ ابْنِ أَبِي الْخَلِيلِ: أَنَّ ثَلَاثَةَ نَفَرٍ اشْتَرَكُوا فِي طُهْرٍ، فَذَكَرَ نَحْوَهُ، وَلَمْ يَذْكُرْ زَيْدَ بْنَ أَرْقَمَ وَلَمْ يَرْفَعْهُ، قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: هَذَا صَوَابٌ، وَاللَّهُ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى أَعْلَمُ»[١].

**واتە: شەعبی دەگێڕێتەوە: لە ئەبو خەلیل، یان کوڕی ئەبو خەلیل، سێ کەس چوو بوونە لای ژنێکەوە لە کاتی پاکیدا، هەروەکو فەرموودەکەی پێشەوەی باس کرد، باسی زەیدی کوڕی ئەرقەمی نەکردو بەرزیشی نەکردەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، ئەبو عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: ئەمە تەواوە، خوای پاک و بێگەرد زاناترە.**

## بابەت: ناسینەوە بە (لاشەو) قیافە

**٣٤٩٣-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَخَلَ عَلَيَّ مَسْرُوراً تَبْرُقُ أَسَارِيرُ وَجْهِهِ، فَقَالَ: أَلَمْ تَرَيْ أَنَّ مُجَزِّزاً نَظَرَ إِلَى زَيْدِ بْنِ حَارِثَةَ وَأُسَامَةَ فَقَالَ: إِنَّ بَعْضَ هَذِهِ الْأَقْدَامِ لَمِنْ بَعْضٍ»[٢].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لام بە دڵخۆشیەوە، ناوچاوانی دەدرەوشایەوە، فەرمووی: ئایا نەتبینی موجەزیز ئێستا تەماشای زەیدی کوڕی حاریسەو ئوسامەی کوڕی زەیدی کرد، وتی: بەڕاستی ئەم قاچانە لە یەکدەچن.**

**تێبینی: زەیدی کوڕی حاریسە پیاوێکی سپی بوو، ئوسامەی کوڕیشی ڕەش بوو، خەڵکی گومانی خراپیان پێ دەبردن، پێغەمبەر ﷺ بەمە بێتاقەت دەبوو، بۆیە بەتانیەکیاندا بەسەر زەیدی کوڕی حاریسەو ئوسامەی کوڕیدا، ئینجا موجەزیزی ڕەگەز ناسیان هێنا کاتێ تەماشای کردن، وتی: ئەم قاچانە لە یەک دەچن، بە مانای ئەوەی لە یەکن. هۆکاری دڵخۆشی پێغەمبەر ﷺ ئەوە بوو.**

**٣٤٩٤-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ مَسْرُوراً، فَقَالَ: يَا عَائِشَةُ، أَلَمْ تَرَيْ أَنَّ مُجَزِّزاً الْمُدْلِجِيَّ دَخَلَ عَلَيَّ وَعِنْدِي أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ، فَرَأَى أُسَامَةَ بْنَ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٥٥٥ و ٣٧٣١ و ٦٧٧٠ و ٦٧٧١، ومسلم: ٣٨ و ١٤٥٩/٤٠، وأبو داود: ٢٢٦٧ و ٢٢٦٨، والترمذي: ٢١٢٩، وإبن ماجه: ٢٣٤٩.




زَيْدٍ وَزَيْداً وَعَلَيْهِمَا قَطِيفَةٌ وَقَدْ غَطَّيَا رُءُوسَهُمَا وَبَدَتْ أَقْدَامُهُمَا فَقَالَ: هَذِهِ أَقْدَامٌ بَعْضُهَا مِنْ بَعْضٍ»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێک هات بۆ لام بە دڵخۆشیەوە، ناوچاوانی دەدرەوشایەوە، فەرمووی: ئەی عائیشە، ئایا نەتبینی موجەزیزی مودلەجی ئێستا هات بۆ لام، ئوسامەی کوڕی زەیدم لابوو، تەماشای ئوسامەی کوڕی زەیدو زەیدی کرد بەتانیەک بە سەریانەوە بوو، تەنها قاچەکانیان دیار بوو، وتی: بەڕاستی ئەم قاچانە لە یەکدەچن.**

## مسوڵمانبوونی یەکێک لە ژن و مێرد و سەرپشک کردنی منداڵ

**٣٤٩٥-** «عَنْ عَبْدِ الْحَمِيدِ بْنِ سَلَمَةَ الْأَنْصَارِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ: أَنَّهُ أَسْلَمَ وَأَبَتْ امْرَأَتُهُ أَنْ تُسْلِمَ، فَجَاءَ ابْنٌ لَهُمَا صَغِيرٌ لَمْ يَبْلُغِ الْحُلُمَ، فَأَجْلَسَ النَّبِيُّ ﷺ الْأَبَ هَاهُنَا وَالْأُمَّ هَاهُنَا ثُمَّ خَيَّرَهُ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ اهْدِهِ فَذَهَبَ إِلَى أَبِيهِ»[٢].

**واتە: عەبدولحەمیدی کوڕی سەلەمەی ئەنصاڕی دەگێڕێتەوە، لە باوکی، لە باپیرەیەوە ﷺ: ئەو مسوڵمان بوو، بەڵام ژنەکەی مسوڵمان نەبوو، منداڵێکی بچووکی هەبوو باڵغ نەبوو بوو، پێغەمبەر ﷺ باوکەکەی لێرە دانیشاندو دایکەکەشی لەوێ دانیشاند، پاشان منداڵەکەی سەرپشک کرد، فەرمووی: خوایە هیدایەتی بدەی، منداڵەکەش ڕۆیشت بۆ لای باوکی.**

**٣٤٩٦-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ فَقَالَ: إِنَّ امْرَأَةً جَاءَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: فِدَاكَ أَبِي وَأُمِّي، إِنَّ زَوْجِي يُرِيدُ أَنْ يَذْهَبَ بِابْنِي وَقَدْ نَفَعَنِي وَسَقَانِي مِنْ بِئْرِ أَبِي عِنَبَةَ، فَجَاءَ زَوْجُهَا وَقَالَ: مَنْ يُخَاصِمُنِي فِي ابْنِي؟ فَقَالَ: يَا غُلَامُ، هَذَا أَبُوكَ وَهَذِهِ أُمُّكَ فَخُذْ بِيَدِ أَيِّهِمَا شِئْتَ، فَأَخَذَ بِيَدِ أُمِّهِ، فَانْطَلَقَتْ بِهِ»[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: ئافرەتێک هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: دایک و باوکم بە قوربانت بن، مێردەکەم دەیەوێ کوڕەکەم ببات، وە سوودی**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٢٤٤، وإبن ماجه: ٢٣٥٢.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٣٥٧، وإبن ماجه: ٢٣٥١.





پێگەیاندووم و ئاوی پێدام لە بیری ئەبو عینبە، مێردەکەی هات، وتی: کێ ناکۆکیم لەگەڵ دەکات لەبارەی کوڕەکەمەوە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی منداڵ، ئەمە باوکتە ئەوەش دایکتە، هەرکامەیانت دەوێ دەستی بگرە، دەستی دایکی گرت و لەگەڵیدا ڕۆیشت.

## عیدەی ئەو ژنەی خولعی کردوە

**٣٤٩٧-** «عَنِ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذِ بْنِ عَفْرَاءَ ﵂ قال: أَنَّ ثَابِتَ بْنَ قَيْسِ بْنِ شَمَّاسٍ ضَرَبَ امْرَأَتَهُ فَكَسَرَ يَدَهَا، وَهِيَ جَمِيلَةُ بِنْتُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُبَيٍّ، فَأَتَى أَخُوهَا يَشْتَكِيهِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى ثَابِتٍ فَقَالَ لَهُ: خُذِ الَّذِي لَهَا عَلَيْكَ وَخَلِّ سَبِيلَهَا، قَالَ: نَعَمْ، فَأَمَرَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ تَتَرَبَّصَ حَيْضَةً وَاحِدَةً، فَتَلْحَقَ بِأَهْلِهَا»[١].

واتە: ڕوبەیعی کچی موعەویزی کوڕی عەفراء ﵂ دەڵێ: ثابتی کوڕی قەیسی کوڕی شەماس دای لە خێزانەکەی و دەستی شکاند، کە جەمیلەی کچی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی بوو، براکەی هات سکاڵای کرد لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بە دوای ثابتدا پێی فەرموو: ئەوەی لەسەرتە بیبەو وازی لێ بێنە، وتی: باشە، ئینجا فەرمانی پێکرد: یەک حەیز چاوەڕوانی بکات و بچێتەوە بۆ لای کەسوکارەکەی.

**٣٤٩٨-** «عَنْ رُبَيِّعَ بِنْتِ مُعَوِّذٍ ﵂ قَالَتْ: اخْتَلَعْتُ مِنْ زَوْجِي ثُمَّ جِئْتُ عُثْمَانَ، فَسَأَلْتُهُ مَاذَا عَلَيَّ مِنَ الْعِدَّةِ؟ فَقَالَ: لَا عِدَّةَ عَلَيْكِ إِلَّا أَنْ تَكُونِي حَدِيثَةَ عَهْدٍ بِهِ، فَتَمْكُثِي حَتَّى تَحِيضِي حَيْضَةً. قَالَ: وَأَنَا مُتَّبِعٌ فِي ذَلِكَ قَضَاءَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي مَرْيَمَ الْمَغَالِيَّةِ، كَانَتْ تَحْتَ ثَابِتِ بْنِ قَيْسِ بْنِ شَمَّاسٍ فَاخْتَلَعَتْ مِنْهُ»[٢].

واتە: ڕوبەیعی کچی موعەویز ﵂ دەڵێ: خولعم کرد لە مێردەکەم، پاشان هاتم بۆ لای عوسمان، پرسیارم لێکرد چیم لەسەرە لە عیدە؟ وتی: عیدەت لەسەر نیە ئەوە نەبێ تازە لەگەڵیدا بوویی، بمێنەوە تا یەک حەیز تەواو دەکەی، وتی: من لەمەدا شوێنی دادوەری کردنی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەوم لەبارەی مەریەمی مەغالیە، ئەو خێزانی ثابتی کوڕی قەیس بوو، داوای خولعی لێ کرد.

---

(١) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ٢٠٥٨.

(٢) حسن.




## ئەوەی جیا كراوەتەوە لە عیدەی تەڵاق دراوەكان

**٣٤٩٩-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: فِي قَوْلِهِ: ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ ﴿١٠٦﴾﴾البقرة، وَقَالَ: ﴿وَإِذَا بَدَّلْنَآ ءَايَةً مَّكَانَ ءَايَةٍ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ ﴿١٠١﴾﴾النحل، وَقَالَ: ﴿يَمْحُواْ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثْبِتُ وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ ﴿٣٩﴾﴾الرعد، فَأَوَّلُ مَا نُسِخَ مِنَ الْقُرْآنِ الْقِبْلَةُ، وَقَالَ: ﴿وَٱلْمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ ﴿٢٢٨﴾﴾البقرة، وَقَالَ: ﴿وَٱلَّٰٓـِٔى يَئِسْنَ مِنَ ٱلْمَحِيضِ مِن نِّسَآئِكُمْ إِنِ ٱرْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَٰثَةُ أَشْهُرٍ ﴿٤﴾﴾الطلاق، فَنُسِخَ مِنْ ذَلِكَ، قَالَ تَعَالَى: ﴿وَإِن طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ ﴿٢٣٧﴾﴾البقرة، ﴿فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا ﴿٤٩﴾﴾الأحزاب»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) لەبارەی فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ ﴿١٠٦﴾﴾ (واتە: ئەگەر ئایەتێک لە ئایەتەكانی قورئان بسڕینەوە، یان پشتگوێی بخەین یەكێكی تر باشتر لەو یان وەک ئەو دێنین)، وە فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا بَدَّلْنَآ ءَايَةً مَّكَانَ ءَايَةٍ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ ﴿١٠١﴾﴾ (واتە: هەر كاتێ ئایەتێک لە جێی ئایەتێكی تر دابەزێنین، وە خوا چاكتر دەزانێ چی دەنێرێتە خوارەوە) وە فەرموویەتی: ﴿يَمْحُواْ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثْبِتُ وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ ﴿٣٩﴾﴾ (واتە: ئەوەی خوا بیەوێ دەیسڕێتەوە ئەوەش بیەوێ دیهێڵێتەوە سەرچاوەی كتێبەكان لای خوایە)، جا یەكەم شت لە قورئاندا حوكمەكەی نەسخ كرایەوە قیبلە بوو، وە فەرموویەتی: ﴿وَٱلْمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ ﴿٢٢٨﴾﴾ (واتە: وە ژنە تەڵاق دراوەكان دان بەخۆیاندا دەگرن تا ماوەی سێ حەیز)، وە فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّٰٓـِٔى يَئِسْنَ مِنَ ٱلْمَحِيضِ مِن نِّسَآئِكُمْ إِنِ ٱرْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَٰثَةُ أَشْهُرٍ ﴿٤﴾﴾ (واتە: ئەوانەی كە بێ هیوا دەبن لە كەوتنە حەیزەوە لە ژنانتان ئەگەر دوودڵ بوون ئەوە عیدەیان سێ مانگە)، پاشان نەسخ كراوەتەوە هەندێ لە ئایەتەكەی پێشەوە بەم ئایەتە: (سێ مانگی پێویست كردوە لە بری سێ حەیز) خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَإِن طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ ﴿٢٣٧﴾﴾ (واتە: وە ئەگەر تەڵاقتاندان پێش ئەوەی بچنە لایانەوە)، ﴿فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا ﴿٤٩﴾﴾ (واتە: ئەوە لەسەریان نیە بۆ ئێوە هیچ عیدەیەک بژمێرن.

---

(١) حسن صحيح. أخرجه أبو داود: ٢١٩٥ و ٢٢٨٢.




## بابەت: عیدەو تەعزێ گێڕانی ئەو ئافرەتەی کە مێردەی دەمرێ

**٣٥٠٠-** «عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ تَحِدُّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ، إِلَّا عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً»(١).

**واتە: ئوممو حەبیبە ﷺ، دەگێڕێتەوە: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: حەڵاڵ نیە بۆ هیچ ئافرەتێک بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەبێ، تەعزێ بگێڕێ لەسەر مردوو لە دوای سێ ڕۆژەوە، مەگەر بۆ مێردەکەی کە چوار مانگ و دە ڕۆژە.**

**٣٥٠١-** «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَت: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ سُئِلَ عَنِ امْرَأَةٍ تُوُفِّيَ عَنْهَا زَوْجُهَا فَخَافُوا عَلَى عَيْنِهَا أَتَكْتَحِلُ؟ فَقَالَ: قَدْ كَانَتْ إِحْدَاكُنَّ تَمْكُثُ فِي بَيْتِهَا فِي شَرِّ أَحْلَاسِهَا حَوْلاً، ثُمَّ خَرَجَتْ فَلَا أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً»(٢).

**واتە: ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی ئافرەتێک مێردەکەی مردبێ، ترسیان هەبوو لەسەر چاوڕەشکردنی، ئایا چاوی ڕەش بکات؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بێگومان یەکێک لە ئێوە لە ماڵی خۆیدا بە جلەکانیەوە بۆ ماوەی ساڵێک، دەردەچێ گوێ بەوە نادات خوا چوار مانگ و دە ڕۆژی داناوە.**

**٣٥٠٢-** «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ، وَأُمِّ حَبِيبَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَتَا: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَتْ: إِنَّ ابْنَتِي تُوُفِّيَ عَنْهَا زَوْجُهَا، وَإِنِّي أَخَافُ عَلَى عَيْنِهَا أَفَأَكْحُلُهَا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: قَدْ كَانَتْ إِحْدَاكُنَّ تَجْلِسُ حَوْلاً، وَإِنَّمَا هِيَ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً، فَإِذَا كَانَ الْحَوْلُ خَرَجَتْ وَرَمَتْ وَرَاءَهَا بِبَعْرَةٍ»(٣).

**واتە: ئوممو سەلەمەو ئوممو حەبیبە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێن: ئافرەتێک هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: کچەکەم مێردەکەی کۆچی دوایی کردوە، من دەترسم لە چاوەکانی، ئایا بیڕەژم (ئایا ڕەشی بکات)؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: یەکێک لە ئێوە ساڵێک دادەنیشی و تەعزێ دەگێڕێ، بەڵکو ماوەکەی چوار مانگ و دە ڕۆژە،**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٨٠ و ١٢٨١ و ٥٣٣٤ و ٥٣٣٩ و ٥٣٤٥، ومسلم: ٥٨ و ١٤٨٦/٥٩، وأبو داود: ٢٢٩٩، والترمذي: ١١٩٥.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٣٣٦ و ٥٣٣٨ و ٥٧٠٦، ومسلم: ٦٠ و ١٤٨٨/٦١، وأبو داود: ٢٢٩٩، والترمذي: ١١٩٧.





کاتێ ساڵەکەی تەواو کرد دەردەچێ و بە دوایدا پشقلێ فڕێدەدا (وەک ئاماژەیەک بۆ تەواو بوونی عیدەکەی).

**٣٥٠٣-** «عَنْ حَفْصَةَ بِنْتَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ تَحِدُّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلَاثٍ إِلَّا عَلَى زَوْجٍ، فَإِنَّهَا تَحِدُّ عَلَيْهِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً»[١].

**واتە: حەفصەی کچی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: حەڵاڵ نیە بۆ هیچ ئافرەتێک بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوای هەبێ، تەعزێ بگێڕێ لەسەر مردوو زیاتر لە سێ ڕۆژ، مەگەر بۆ مێردەکەی کە چوار مانگ و دە ڕۆژە.**

**٣٥٠٤-** «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ تَحِدُّ عَلَى مَيِّتٍ أَكْثَرَ مِنْ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ إِلَّا عَلَى زَوْجٍ، فَإِنَّهَا تَحِدُّ عَلَيْهِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً»[٢].

**واتە: ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: حەڵاڵ نیە بۆ هیچ ئافرەتێک بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوای هەبێ، تەعزێ بگێڕێ لەسەر مردوو زیاتر لە سێ ڕۆژ، مەگەر بۆ مێردەکەی کە چوار مانگ و دە ڕۆژە.**

**٣٥٠٥-** «عَنْ صَفِيَّةَ بِنْتِ أَبِي عُبَيْدٍ عَن بَعْضِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ، وَهِيَ أُمُّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، نَحْوَهُ»[٣].

**واتە: صەفیەی کچی ئەبو عوبەید دەگێڕێتەوە، لە هەندێ لە خێزانەکانی (پێغەمبەرەوە) کە ئەویش ئوممو سەلەمەیە ؓ، لە پێغەمبەرەوە ﷺ وەکو ئەوە.**

## بابەت: عیدەی دووگیان مێردەکەی بمرێ

**٣٥٠٦-** «عَنِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ ؓ: أَنَّ سُبَيْعَةَ الْأَسْلَمِيَّةَ نُفِسَتْ بَعْدَ وَفَاةِ زَوْجِهَا بِلَيَالٍ، فَجَاءَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَاسْتَأْذَنَتْ أَنْ تَنْكِحَ، فَأَذِنَ لَهَا، فَنَكَحَتْ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٦٣ و ١٤٩٠/٦٤، وإبن ماجه: ٢٠٨٦.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٣٢٠، وإبن ماجه: ٢٠٢٩.




**واتە: میسوەری کوڕی مەخرەمە ﷺ دەگێڕێتەوە، سوبەیعەی ئەسلەمیە چەند شەوێک دوای مردنی مێردەکەی منداڵی بوو کەوتە زەیستانیەوە، هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ داوای مۆڵەتی لێ کرد شوو بکات، ئەویش مۆڵەتی پێدا، ئینجا شووی کرد.**

**٣٥٠٧-** «عَنِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، أَمَرَ سُبَيْعَةَ أَنْ تَنْكِحَ إِذَا تَعَلَّتْ مِنْ نِفَاسِهَا»[١].

**واتە: میسوەری کوڕی مەخرەمە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە سوبەیعە کرد شوو بکات کاتێ لە خوێنی منداڵ بوون بوویەوە.**

**٣٥٠٨-** «عَنْ أَبِي السَّنَابِلِ ﷺ قَالَ: وَضَعَتْ سُبَيْعَةُ حَمْلَهَا بَعْدَ وَفَاةِ زَوْجِهَا بِثَلَاثَةٍ وَعِشْرِينَ أَوْ خَمْسَةٍ وَعِشْرِينَ لَيْلَةً، فَلَمَّا تَعَلَّتْ تَشَوَّفَتْ لِلْأَزْوَاجِ فَعِيبَ ذَلِكَ عَلَيْهَا، فَذُكِرَ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: مَا يَمْنَعُهَا، قَدْ انْقَضَى أَجَلُهَا»[٢].

**واتە: ئەبو سەنابیل ﷺ دەڵێ: سوبەیعە لە دوای مردنی مێردەکەی بە بیست و سێ یان بیست و پێنج شەو منداڵەکەی دانا، کاتێ پاک بوویەوە خۆی نیشانی پیاوان دەدا بۆ شووکردن، خەڵکی ئەوەیان بە ناتەواوی لەسەری ژمارد، ئەوە باس کرا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: چی ڕێگری لێ دەکات، ئەو عیدەی تەواو بووە.**

**٣٥٠٩-** «عَنْ أَبِي سَلَمَةَ يَقُولُ: اخْتَلَفَ أَبُو هُرَيْرَةَ وَابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ فِي الْمُتَوَفَّى عَنْهَا زَوْجُهَا إِذَا وَضَعَتْ حَمْلَهَا، قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: تُزَوَّجُ، وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: أَبْعَدَ الْأَجَلَيْنِ؟ فَبَعَثُوا إِلَى أُمِّ سَلَمَةَ، فَقَالَتْ: تُوُفِّيَ زَوْجُ سُبَيْعَةَ فَوَلَدَتْ بَعْدَ وَفَاةِ زَوْجِهَا بِخَمْسَةَ عَشَرَ نِصْفِ شَهْرٍ، قَالَتْ: فَخَطَبَهَا رَجُلَانِ فَحَطَّتْ بِنَفْسِهَا إِلَى أَحَدِهِمَا، فَلَمَّا خَشُوا أَنْ تَفْتَاتَ بِنَفْسِهَا، قَالُوا: إِنَّكِ لَا تَحِلِّينَ، قَالَتْ: فَانْطَلَقْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: قَدْ حَلَلْتِ فَانْكِحِي مَنْ شِئْتِ»[٣].

**واتە: ئەبو سەلەمە دەڵێ: ئەبو هورەیرەو ئیبنو عەبباس ﷺ جیاوازی کەوتە نێوانیان لە بارەی ئەو ژنەی مێردەکەی دەمرێ، ئەگەر منداڵەکەی دانا، (پاک بوویەوە دەتوانێ شوو بکات؟!) ئەبو هورەیرە وتی: بە شوو دەدرێتەوە، ئیبنو عەبباسیش**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ١١٩٣، وإبن ماجه: ٢٠٢٧.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٩٠٩ و ٥٣١٨، ومسلم: ١٤٨٥، والترمذي: ١١٩٤.





وتی: دوورترینی ئەو دوو ماوە، (مەبەستی ئەوەیە دوو ئایەت لەوبارەیەوە هاتووە یەکەمینیان ئەوە دەخوازێ کە عیدەکەی چوار مانگ و دە ڕۆژە، دووەمینیشان بە دانانی منداڵەکەی، واتە: ماوەی کام لەم دوانە دوورتر بوو ئەوە دەژمێردرێت، جا ناردیان بۆ لای ئوممو سەلەمە، وتی: مێردەکەی سوبەیعە مرد، پازدە ڕۆژ دوای مردنی، منداڵەکەی دانا، وتی: دوو پیاو داوایان کرد خۆی دانەیەکیان هەڵبژارد و حەزی لێکرد، کاتێ ترسان لەوەی توشی ناڕەحەتی ببێ وتیان: تۆ حەڵاڵ نیت، وتی: ڕۆیشتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پاک بوویتەتەوە شوو دەکەیتە کێ شوو بکە.

**٣٥١٠-** «عَنْ أَبِي سَلَمَةَ قَالَ: سُئِلَ ابْنُ عَبَّاسٍ، وَأَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ الْمُتَوَفَّى عَنْهَا زَوْجُهَا وَهِيَ حَامِلٌ؟ قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: آخِرُ الْأَجَلَيْنِ، وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: إِذَا وَلَدَتْ فَقَدْ حَلَّتْ، فَدَخَلَ أَبُو سَلَمَةَ إِلَى أُمِّ سَلَمَةَ، فَسَأَلَهَا عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَتْ: وَلَدَتْ سُبَيْعَةُ الْأَسْلَمِيَّةُ بَعْدَ وَفَاةِ زَوْجِهَا بِنِصْفِ شَهْرٍ فَخَطَبَهَا رَجُلَانِ أَحَدُهُمَا شَابٌّ وَالْآخَرُ كَهْلٌ، فَحَطَّتْ إِلَى الشَّابِّ، فَقَالَ الْكَهْلُ: لَمْ تَحْلِلْ، وَكَانَ أَهْلُهَا غُيَّباً، فَرَجَا إِذَا جَاءَ أَهْلُهَا أَنْ يُؤْثِرُوهُ بِهَا، فَجَاءَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: قَدْ حَلَلْتِ فَانْكِحِي مَنْ شِئْتِ»[1].

واتە: ئەبو سەلەمە دەڵێ: پرسیارکرا لە ئیبنو عەبباس و ئەبو هورەیرە ﷺ لەبارەی ئەو ئافرەتەی مێردەکەی مردوەو دووگیانە؟ ئیبنو عەبباس وتی: دوورترینی ئەو دوو ماوەی بۆ هەیە، (مەبەستی ئەوەیە دوو ئایەت لەوبارەیەوە هاتووە یەکەمینیان ئەوە دەخوازێ کە عیدەکەی چوار مانگ و دە ڕۆژە، دووەمینیشان بە دانانی منداڵەکەی، واتە: ماوەی کام لەم دووانە دوورتر بوو ئەوە دەژمێردرێ)، ئەبو هورەیرە وتی: ئەگەر منداڵی بوو ئەوە حەڵاڵە شوو بکات، ئەبو سەلەمە هات بۆ لای ئوممو سەلەمە، لەو بارەوە پرسیاری لێکرد، ئوممو سەلەمە وتی: سوبەیعەی ئەسلەمی دوای نیو مانگ لە مردنی مێردەکەی منداڵی بوو، دوو کەس داوای کرد یەکەمینیان گەنج بوو ئەویتریان گەورەتر بوو، حەزی لە گەنجەکە بوو، پیاوەکەیتر وتی: هێشتا حەڵاڵ نیە زەواج بکەی، کەسوکارەکەی لەو شوێنە نەبوون، ترسا لەوەی کەسوکارەکەی بزانن ئازاری گەنجەکە بدەن بە هۆی ئەمەوە، هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: عیدەت نەماوە کێت دەوێ شووی پێ بکە.

---

(١) صحيح.




**٣٥١١-** «عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ: قِيلَ لِابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، فِي امْرَأَةٍ وَضَعَتْ بَعْدَ وَفَاةِ زَوْجِهَا بِعِشْرِينَ لَيْلَةً: أَيَصْلُحُ لَهَا أَنْ تَزَوَّجَ؟ قَالَ: لَا، إِلَّا آخِرَ الْأَجَلَيْنِ. قَالَ: قُلْتُ: قَالَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: ﴿وَأُوْلَٰتُ ٱلۡأَحۡمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّ ﴿٤﴾﴾الطلاق، فَقَالَ: إِنَّمَا ذَلِكَ فِي الطَّلَاقِ، فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: أَنَا مَعَ ابْنِ أَخِي «يَعْنِي أَبَا سَلَمَةَ» فَأَرْسَلَ غُلَامَهُ كُرَيْباً، فَقَالَ: ائْتِ أُمَّ سَلَمَةَ، فَسَلْهَا هَلْ كَانَ هَذَا سُنَّةٌ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ؟ فَجَاءَ فَقَالَ: قَالَتْ: نَعَمْ، سُبَيْعَةُ الْأَسْلَمِيَّةُ وَضَعَتْ بَعْدَ وَفَاةِ زَوْجِهَا بِعِشْرِينَ لَيْلَةً، فَأَمَرَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ تَزَوَّجَ فَكَانَ أَبُو السَّنَابِلِ فِيمَنْ يَخْطُبُهَا»[١].

**واتە: ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: بە ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) وترا: لە بارەی ئافرەتێکەوە منداڵەکەی دانابێت بیست ڕۆژ دوای مردنی مێردەکەی: ئایا دەگونجێ شوو بکاتەوە؟ وتی: نەخێر، مەگەر دوای دوورترینی ئەو دوو ماوە، وتی: وتم: خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَأُوْلَٰتُ ٱلۡأَحۡمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّ ﴿٤﴾﴾ (واتە: وە ئەو ژنانەی دووگیانن ماوەکەیان دانانی منداڵەکەیە)، وتی: بەڕاستی ئەوە لەبارەی تەڵاقەوە بوو، ئەبو هورەیرە وتی: من لەگەڵ برازاکەم دام (واتە: ئوممو سەلەمە)، کورەیبی خزمەتکاری خۆی نارد، وتی: بچۆ بۆ لای ئوممو سەلەمە، پرسیاری لێ بکە ئایا ئەمە سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ؟ هات و وتی: ئوممو سەلەمە وتویەتی: بەڵێ، سوبەیعەی ئەسلەمیە بیست ڕۆژ دوای مردنی مێردەکەی منداڵی بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکرد شوو بکات، ئەبو سەنابل یەکێک بوو لەوانەی داوای کردبوو.**

**٣٥١٢-** «عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ وَابْنَ عَبَّاسٍ وَأَبَا سَلَمَةَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ تَذَاكَرُوا عِدَّةَ الْمُتَوَفَّى عَنْهَا زَوْجُهَا تَضَعُ عِنْدَ وَفَاةِ زَوْجِهَا، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: تَعْتَدُّ آخِرَ الْأَجَلَيْنِ، وَقَالَ أَبُو سَلَمَةَ: بَلْ تَحِلُّ حِينَ تَضَعُ، فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: أَنَا مَعَ ابْنِ أَخِي، فَأَرْسَلُوا إِلَى أُمِّ سَلَمَةَ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَتْ: وَضَعَتْ سُبَيْعَةُ الْأَسْلَمِيَّةُ بَعْدَ وَفَاةِ زَوْجِهَا بِيَسِيرٍ، فَاسْتَفْتَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَأَمَرَهَا أَنْ تَتَزَوَّجَ»[٢].

**واتە: سولەیمانی کوڕی یەسار ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەبو هورەیرەو ئیبنو عەبباس و ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمان باسی عیدەی ئافرەتی دووگیانیان کرد کە**

---

**(١) صحيح.**

**(٢) صحيح.**




لە دوای مردنی مێردەکەی منداڵی بوو، ئیبنو عەبباس وتی: عیدەی لە کۆتایی دوورترینی ئەو دوو ماوەیە، ئەبو سەلەمە وتی: بەڵکو عیدەی تەواو دەبێ کاتێ منداڵەکەی دانا، ئەبو هورەیرە وتی: منیش لەگەڵ برازاکەمم، ناردیان بۆ لای ئوممو سەلەمە خێزانی پێغەمبەر ﷺ وتی: سوبەیعەی ئەسلەمیە لە دوای مردنی مێردەکەی بە ماوەیەکی کەم منداڵەکەی دانا، داوای فتوای کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش فەرمانی پێکرد شوو بکات.

**٣٥١٣-** «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: وَضَعَتْ سُبَيْعَةُ بَعْدَ وَفَاةِ زَوْجِهَا بِأَيَّامٍ، فَأَمَرَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ تَزَوَّجَ»[١].

واتە: ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: سوبەیعە چەند ڕۆژێک دوای مردنی مێردەکەی منداڵی بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکرد شوو بکات.

**٣٥١٤-** «عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ، وَأَبَا سَلَمَةَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ اخْتَلَفَا فِي الْمَرْأَةِ تُنْفَسُ بَعْدَ وَفَاةِ زَوْجِهَا بِلَيَالٍ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبَّاسٍ: آخِرُ الْأَجَلَيْنِ، وَقَالَ أَبُو سَلَمَةَ: إِذَا نُفِسَتْ فَقَدْ حَلَّتْ، فَجَاءَ أَبُو هُرَيْرَةَ فَقَالَ: أَنَا مَعَ ابْنِ أَخِي «يَعْنِي أَبَا سَلَمَةَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ» فَبَعَثُوا كُرَيْباً مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ، إِلَى أُمِّ سَلَمَةَ، يَسْأَلُهَا عَنْ ذَلِكَ، فَجَاءَهُمْ، فَأَخْبَرَهُمْ أَنَّهَا قَالَتْ: وَلَدَتْ سُبَيْعَةُ بَعْدَ وَفَاةِ زَوْجِهَا بِلَيَالٍ، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: قَدْ حَلَلْتِ»[٢].

واتە: سولەیمانی کوڕی یەسار ﷺ دەگێڕێتەوە: ئیبنو عەبباس و ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمان جیاوازیان بوو لە بارەی ئەو ئافرەتەی چەند شەوێک دوای مردنی مێردەکەی منداڵی دەبێ، (ئایا شوو دەکاتەوە)؟ ئیبنو عەبباس وتی: دوورترینی ئەو دوو ماوەی بۆ هەیە، ئەبو سەلەمە وتی: ئەگەر کەوتە زەیستانیەوە حەڵاڵە شوو بکات، ئەبو هورەیرە هات وتی: منیش لەگەڵ برازاکەمم، (واتە: ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمان)، کورەیب کە خزمەتکاری ئیبنو عەبباس بوو ناردیان بۆ لای ئوممو سەلەمە، پرسیاری لێکرد لەو بارەیەوە، گەڕایەوە بۆ لایان هەواڵی پێدان کە ئەو وتویەتی: سوبەیعە چەند شەوێک دوای مردنی مێردەکەی منداڵەکەی دانا، ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس کرد، ئەویش فەرمووی: حەڵاڵە شوو بکاتەوە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




**٣٥١٥-** «عَنْ أَبي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ قَالَ: كُنْتُ أَنَا وَابْنُ عَبَّاسٍ وَأَبُو هُرَيْرَةَ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: إِذَا وَضَعَتِ الْمَرْأَةُ بَعْدَ وَفَاةِ زَوْجِهَا فَإِنَّ عِدَّتَهَا آخِرُ الْأَجَلَيْنِ، فَقَالَ أَبُو سَلَمَةَ: فَبَعَثْنَا كُرَيْباً، إِلَى أُمِّ سَلَمَةَ، يَسْأَلُهَا عَنْ ذَلِكَ، فَجَاءَنَا مِنْ عِنْدِهَا أَنَّ سُبَيْعَةَ تُوُفِّيَ عَنْهَا زَوْجُهَا، فَوَضَعَتْ بَعْدَ وَفَاةِ زَوْجِهَا بِأَيَّامٍ، فَأَمَرَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ تَتَزَوَّجَ»[١].

**واتە: ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمان ﷺ دەڵێ: من و ئیبنو عەبباس و ئەبو هورەیرە پێکەوە بووین، ئیبنو عەبباس وتی: ئەگەر ژن لە دوای مردنی مێردەکەی منداڵی دانا ئەوە عیدەکەی دوورترینی ئەو دوو ماوەیە، ئەبو سەلەمە وتی: کورەیبمان نارد بۆ لای ئوممو سەلەمە لەوبارەیەوە پرسیاری لێکرد، هاتەوە لەلایەوە هەواڵیدا کە سوبەیعە مێردەکەی کۆچی دوایی کرد، چەند ڕۆژێک لە دوای مردنی مێردەکەی شووی کرد.**

**٣٥١٦-** «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ: أَنَّ امْرَأَةً مِنْ أَسْلَمَ يُقَالُ لَهَا: سُبَيْعَةُ كَانَتْ تَحْتَ زَوْجِهَا، فَتُوُفِّيَ عَنْهَا وَهِيَ حُبْلَى، فَخَطَبَهَا أَبُو السَّنَابِلِ بْنُ بَعْكَكٍ فَأَبَتْ أَنْ تَنْكِحَهُ، فَقَالَ: مَا يَصْلُحُ لَكِ أَنْ تَنْكِحِي حَتَّى تَعْتَدِّي آخِرَ الْأَجَلَيْنِ، فَمَكَثَتْ قَرِيباً مِنْ عِشْرِينَ لَيْلَةً ثُمَّ نُفِسَتْ، فَجَاءَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: انْكِحِي»[٢].

**واتە: ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە: ژنێک لە ئەسلەم پێی دەوترا: سوبەیعە لای مێردەکەی بوو، مێردەکەی مرد ئەویش دووگیان بوو، ئەبو سەنابلی کوڕی بەعکەک داوای کرد، شووی پێ نەکرد، ئینجا وتی: گونجاو نیە شوو بکەیت تا عیدەی دوورترینی ئەو دوو ماوە تەواو نەکەی، نزیکەی بیست شەو مایەوە پاشان کەوتە زەیستانیەوە، هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: شوو بکە.**

**٣٥١٧-** «عَنْ سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ قَالَ: بَيْنَمَا أَنَا وَأَبُو هُرَيْرَةَ عِنْدَ ابْنِ عَبَّاسٍ إِذْ جَاءَتْهُ امْرَأَةٌ فَقَالَتْ: تُوُفِّيَ عَنْهَا زَوْجُهَا وَهِيَ حَامِلٌ، فَوَلَدَتْ لِأَدْنَى مِنْ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ مِنْ يَوْمِ مَاتَ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: آخِرُ الْأَجَلَيْنِ، فَقَالَ أَبُو سَلَمَةَ: أَخْبَرَنِي رَجُلٌ، مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ سُبَيْعَةَ الْأَسْلَمِيَّةَ جَاءَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَتْ: تُوُفِّيَ عَنْهَا زَوْجُهَا وَهِيَ حَامِلٌ، فَوَلَدَتْ لِأَدْنَى مِنْ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ، فَأَمَرَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ تَتَزَوَّجَ قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: وَأَنَا أَشْهَدُ عَلَى ذَلِكَ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




واتە: سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمان ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا من و ئەبو هورەیرە لای ئیبنو عەبباس بووین ئافرەتێک هات وتی: مێردەکەم کۆچی دوایی کردوە، دووگیانیش بوو، منداڵی بوو لە ماوەی کەمتر لە چوار مانگ دوای مردنی مێردەکەی، ئیبنو عەبباس وتی: دوورترینی ئەو دوو ماوە بۆی هەیە شوو بکات، ئەبو سەلەمە وتی: پیاوێک هەواڵی پێداوم لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ کە سوبەیعەی ئەسلەمیە هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمانی پێکرد شوو بکات، ئەبو هورەیرە وتی: من شایەتی دەدەم لەسەر ئەمە.

**٣٥١٨-** «عَنْ سُبَيْعَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّهَا كَانَتْ تَحْتَ سَعْدِ بْنِ خَوْلَةَ وَهُوَ مِنْ بَنِي عَامِرِ بْنِ لُؤَيٍّ وَكَانَ مِمَّنْ شَهِدَ بَدْراً، فَتُوُفِّيَ عَنْهَا زَوْجُهَا فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ وَهِيَ حَامِلٌ، فَلَمْ تَنْشَبْ أَنْ وَضَعَتْ حَمْلَهَا بَعْدَ وَفَاتِهِ، فَلَمَّا تَعَلَّتْ مِنْ نِفَاسِهَا تَجَمَّلَتْ لِلْخُطَّابِ، فَدَخَلَ عَلَيْهَا أَبُو السَّنَابِلِ بْنُ بَعْكَكٍ رَجُلٌ مِنْ بَنِي عَبْدِ الدَّارِ، فَقَالَ لَهَا: مَا لِي أَرَاكِ مُتَجَمِّلَةً لَعَلَّكِ تُرِيدِينَ النِّكَاحَ، إِنَّكِ وَاللَّهِ مَا أَنْتِ بِنَاكِحٍ حَتَّى تَمُرَّ عَلَيْكِ أَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ وَعَشْراً، قَالَتْ سُبَيْعَةُ: فَلَمَّا قَالَ لِي ذَلِكَ جَمَعْتُ عَلَيَّ ثِيَابِي حِينَ أَمْسَيْتُ، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَسَأَلْتُهُ عَنْ ذَلِكَ فَأَفْتَانِي بِأَنِّي قَدْ حَلَلْتُ حِينَ وَضَعْتُ حَمْلِي، وَأَمَرَنِي بِالتَّزْوِيجِ إِنْ بَدَا لِي»[١].

واتە: سوبەیعەی ئەسلەمیە ﷺ، دەگێڕێتەوە: کە ئەو خێزانی سەعدی کوڕی خەولە بوو، لە هۆزی بەنی عامری کوڕی لوئەی بوو، یەکێک لەوانە بوو کە بەشداری جەنگی بەدریان کردبوو، لە حەجیماڵئاواییدا مێردەکەی کۆچی دوایی کرد، ئەویش دووگیان بوو، ئەوەندەی پێنەچوو دوای وەفاتی مێردەکەی منداڵی بوو، کاتێ پاکبووەوە لە زەیستانیەکەی خۆی ڕازاندەوە بۆ خوازبێنی کاران، ئەبو سەنابیلی کوڕی بەعکەک چوو بۆ لای کە پیاوێک بوو لە بەنی (عَبْدِ الدَّارِ) پێی وت: چیە دەتبینم خۆت جوان کردۆتەوە ئەڵێی بە تەمای شوویت؟ سوێند بە خوا ناتوانی شوو بکەی تا چوار مانگ و دە ڕۆژ تەواو نەکەی، سوبەیعە وتی: کاتێ ئەمەی پێ وتم ئیوارە خۆم کۆکردەوە ڕۆیشتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیارم لێکرد لەو بارەیەوە، ئەویش فتوای بۆ دام کە عیدەم تەواو بووە لەو کاتەی کە منداڵەکەم بوو، وە فەرمانی پێکردم کە شوو بکەم ئەگەر پێم باش بوو.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٣١٩، ومسلم: ١٤٨٤، وأبو داود: ٢٣٠٦، وإبن ماجه: ٢٠٢٨.




**٣٥١٩-** «عَنْ أَبي السَّنَابِلِ بْنَ بَعْكَكِ بْنِ السَّبَّاقِ ﷺ، أَنَّه قَالَ لِسُبَيْعَةَ الْأَسْلَمِيَّةِ: لَا تَحِلِّينَ حَتَّى يَمُرَّ عَلَيْكِ أَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ وَعَشْراً أَقْصَى الأَجَلَيْنِ، فَأَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَسَأَلَتْهُ عَنْ ذَلِك، فَزَعَمَتْ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَفْتَاهَا أَنْ تَنْكِحَ إِذَا وَضَعَتْ حَمْلَهَا وَكَانَتْ حُبْلَى فِي تِسْعَةِ أَشْهُرٍ حِينَ تُوُفِّيَ زَوْجُهَا، وَكَانَتْ تَحْتَ سَعْدِ بْنِ خَوْلَةَ فَتُوُفِّيَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَنَكَحَتْ فَتًى مِنْ قَوْمِهَا حِينَ وَضَعَتْ مَا فِي بَطْنِهَا»[١].

**واتە: ئەبو سەنابیلی کوڕی بەعکەکی کوڕی سەباق ﷺ، بە سوبەیعەی ئەسلەمیەی وت: حەڵاڵ نیە شوو بکەیت تا چوارمانگ و دە ڕۆژ تێپەڕ دەکەی کەمترینی ئەو دوو ماوە، هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری ئەوەی لێکرد، پێی وابوو پێغەمبەری خوا ﷺ فتوای بۆ داوە کە هەر کاتێک منداڵەکەی دانا شوو بکات، ئەو دووگیان بوو لە نۆ مانگاندا بوو مێردەکەی کۆچی دوایی کرد، ئەو ئافرەتە خێزانی سەعدی کوڕی خەولە بوو، لە حەجی ماڵئاواییدا کۆچی دوایی کرد، جا کاتێک کە منداڵەکەی دانا شووی کرد بە گەنجێک لە هۆزەکەی.**

**٣٥٢٠-** «عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُتْبَةَ، كَتَبَ إِلَى عُمَرَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْأَرْقَمِ الزُّهْرِيِّ، أَنِ ادْخُلْ عَلَى سُبَيْعَةَ بِنْتِ الْحَارِثِ الْأَسْلَمِيَّةِ، فَاسْأَلْهَا عَمَّا أَفْتَاهَا بِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي حَمْلِهَا؟ قَالَ: فَدَخَلَ عَلَيْهَا عُمَرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ فَسَأَلَهَا فَأَخْبَرَتْهُ أَنَّهَا كَانَتْ تَحْتَ سَعْدِ بْنِ خَوْلَةَ، وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِمَّنْ شَهِدَ بَدْراً، فَتُوُفِّيَ عَنْهَا فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ، فَوَلَدَتْ قَبْلَ أَنْ تَمْضِيَ لَهَا أَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ وَعَشْراً مِنْ وَفَاةِ زَوْجِهَا، فَلَمَّا تَعَلَّتْ مِنْ نِفَاسِهَا، دَخَلَ عَلَيْهَا أَبُو السَّنَابِلِ «رَجُلٌ مِنْ بَنِي عَبْدِ الدَّارِ» فَرَآهَا مُتَجَمِّلَةً، فَقَالَ: لَعَلَّكِ تُرِيدِينَ النِّكَاحَ قَبْلَ أَنْ تَمُرَّ عَلَيْكِ أَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ وَعَشْراً؟ قَالَتْ: فَلَمَّا سَمِعْتُ ذَلِكَ مِنْ أَبِي السَّنَابِلِ جِئْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَحَدَّثْتُهُ حَدِيثِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: قَدْ حَلَلْتِ حِينَ وَضَعْتِ حَمْلَكِ»[٢].

**واتە: عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵا دەگێڕێتەوە: عەبدوڵڵای کوڕی عوتبە، نووسراوی نووسی بۆ عومەری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەرقەمی زوهری، بچۆ بۆ لای سوبەیعەی کچی حارثی ئەسلەمیە پرسیاری لێ بکە لە بارەی ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فتوای داوە لە دووگیانیەکەی؟ وتی: عومەری کوڕی عەبدوڵڵا چوو بۆ لای پرسیاری لێکرد، ئەویش پێی ڕاگەیاند کە خێزانی سەعدی کوڕی خەولە بوو، یەکێک بوو لەوانە**

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح.




بەشداری جەنگی بەدریان کردبوو، لە حەجی ماڵئاواییدا مێردەکەی کۆچی دوایی کرد، ئەویش منداڵی بوو پێش ئەوەی چوار مانگ و دە ڕۆژ بەسەر مردنی مێردەکەیدا تێپەڕ بێت، کاتێ پاک بووەوە لە زەیستانیەکەی، ئەبو سەنابیلی کوڕی بەعکەک چوو بۆ لای (پیاوێک بوو لە بەنی (عَبْد الدَّار)، تەماشای کرد خۆی ڕازاندۆتەوە، پێی وت: ئەڵێی بە تەمای شوو بکەیت پێش ئەوەی چوار مانگ و دەڕۆژ تەواو بکەی؟ سوبەیعە وتی: کاتێ ئەمەم بیست لە ئەبو سەنابیل هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ باسەکەم بۆی گێڕایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کاتێ منداڵەکەت دانا حەڵاڵ بووی.

**٣٥٢١-** «عَنْ مُحَمَّدٍ قَالَ: كُنْتُ جَالِساً فِي نَاسٍ بِالْكُوفَةِ فِي مَجْلِسٍ لِلْأَنْصَارِ عَظِيمٍ فِيهِمْ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي لَيْلَى، فَذَكَرُوا شَأْنَ سُبَيْعَةَ، فَذَكَرْتُ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ فِي مَعْنَى قَوْلِ ابْنِ عَوْنٍ: حَتَّى تَضَعَ، قَالَ ابْنُ أَبِي لَيْلَى: لَكِنَّ عَمَّهُ لَا يَقُولُ ذَلِكَ، فَرَفَعْتُ صَوْتِي وَقُلْتُ: إِنِّي لَجَرِيءٌ أَنْ أَكْذِبَ عَلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ وَهُوَ فِي نَاحِيَةِ الْكُوفَةِ؟ قَالَ: فَلَقِيتُ مَالِكاً، قُلْتُ: كَيْفَ كَانَ ابْنُ مَسْعُودٍ، يَقُولُ فِي شَأْنِ سُبَيْعَةَ؟ قَالَ: قَالَ: أَتَجْعَلُونَ عَلَيْهَا التَّغْلِيظَ وَلَا تَجْعَلُونَ لَهَا الرُّخْصَةَ، لَأُنْزِلَتْ سُورَةُ النِّسَاءِ الْقُصْرَى بَعْدَ الطُّولَى»[1].

واتە: موحەممەد دەڵێ: من دانیشتم لە نێو خەڵکێک لە کوفە لە کۆڕی پیاوە گەورەکان، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو لەیلایان تێدابوو، لەبارەی سوبەیعەوە قسەیان دەکرد، منیش باسم کرد لە عەبدوڵڵای کوڕی عوتبەی کوڕی مەسعود لە مانای وتەی ئیبنو عەون: تا منداڵەکە دادەنێ، ئیبنو ئەبو لەیلا وتی: بەڵام مامی وا ناڵێ، دەنگم بەرزکردەوەو وتم: من ئەوەندە بوێرم درۆ بکەم لەسەر عەبدوڵڵای کوڕی عوتبە، لە کاتێکدا ئەو لە تەنیشتی کوفەیە؟ وتی: گەیشتم بە مالیک، وتم: ئیبنو مەسعود چی دەوت لە بارەی سوبەیعەوە؟ دەڵێ: ئیبنو مەسعود وتی: ئایا دوورترینی ئەو دوو ماوەی بۆ دەژمێرن و ڕوخسەتی بۆ ناژمێرن، ئەگەر وا بووایە ئەوە: ﴿وَأُوْلَٰتُ ٱلْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ ۝٤﴾ الطلاق. لە دوای: ﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا ۝٢٣٤﴾ البقرة. دەهات.

تێبینی: (سُورَةُ النِّسَاءِ الْقُصْرَى) مەبەست پێی سوورەتی (الطلاق)ـە، (بَعْدَ الطُّولَى) مەبەستی پێی سوورەتی (النساء) نیە، بەڵکو مەبەستی پێی درێژترین سوورەتی قورئانە، کە بریتیە لە سوورەتی بەقەڕە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٥٣٢ ومعلقاً ٤٩١٠.




**٣٥٢٢-** «عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ قَيْسٍ، أَنَّ ابْنَ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: مَنْ شَاءَ لَاعَنْتُهُ مَا أُنْزِلَتْ: ﴿وَأُوْلَٰتُ ٱلْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ ﴾﴿٤﴾ الطلاق، إِلَّا بَعْدَ آيَةِ الْمُتَوَفَّى عَنْهَا زَوْجُهَا، إِذَا وَضَعَتِ الْمُتَوَفَّى عَنْهَا زَوْجُهَا فَقَدْ حَلَّتْ»[1].

**واتە: عەلقەمەی کوڕی قەیس دەگێڕێتەوە: ئیبنو مەسعود ﷺ گوتی: هەر کەس دەیەوێ با مولاعەنەی یەکتر بکەین لەسەر ئەوەی دابەزیوە: ﴿وَأُوْلَٰتُ ٱلْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ ﴿٤﴾﴾ لەبارەی ئەو ژنەی مێردەکەی کۆچی دوایی کردوە، ئەگەر لە دوای مردنی منداڵی بوو ئەوە حەڵاڵە شوو بکات.**

**٣٥٢٣-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ: أَنَّ سُورَةَ النِّسَاءِ الْقُصْرَى نَزَلَتْ بَعْدَ الْبَقَرَةِ»[2].

**واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: (سُورَةُ النِّسَاءِ الْقُصْرَى) مەبەست پێی سوورەتی (الطلاق)ـە، دابەزی لە دوای درێژترین سوورەت کە بەقەرەیە.**

## عیدەی ئەو ئافرەتەی مێردەکەی مردوە پێش ئەوەی بچێتە لایەوە

**٣٥٢٤-** «عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ رَجُلٍ تَزَوَّجَ امْرَأَةً وَلَمْ يَفْرِضْ لَهَا صَدَاقاً وَلَمْ يَدْخُلْ بِهَا حَتَّى مَاتَ؟ قَالَ ابْنُ مَسْعُودٍ: لَهَا مِثْلُ صَدَاقِ نِسَائِهَا لَا وَكْسَ وَلَا شَطَطَ، وَعَلَيْهَا الْعِدَّةُ وَلَهَا الْمِيرَاثُ، فَقَامَ مَعْقِلُ بْنُ سِنَانٍ الْأَشْجَعِيُّ، فَقَالَ: قَضَى فِينَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي بَرْوَعَ بِنْتِ وَاشِقٍ امْرَأَةٍ مِنَّا مِثْلَ مَا قَضَيْتَ، فَفَرِحَ ابْنُ مَسْعُودٍ ﷺ»[3].

**واتە: ئیبنو مەسعود ﷺ، پرسیاری لێکرا لە بارەی پیاوێکەوە ژنێکی هێناوە نە مارەیی بۆ دیاری کردووە، نە چۆتە لایەوە تا مردوە؟ ئیبنو مەسعود وتی: مارەیی بۆ هەیە وەکو ژنەکانی تری، نەکەم و نە زۆر، عیدەی بۆ هەیە میراتیش دەبات، مەعقیلی کوڕی سینانی ئەشجەعی هەڵساو وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاریدا لە بارەی بەروەعی کچی واشیقەوە کە ئافرەتێک بوو لە ئێمە هەروەکو ئەم بڕیارەی تۆ، ئیبنو مەسعود زۆر بەمە دڵخۆش بوو.**

---

(١) صحيح الإسناد. أخرجه أبو داود: ٢٣٠٧، وإبن ماجه: ٢٠٣٠.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح.




## بابەت: تەعزێ باری

**٣٥٢٥-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تَحِدُّ عَلَى مَيِّتٍ أَكْثَرَ مِنْ ثَلَاثٍ إِلَّا عَلَى زَوْجِهَا»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حەڵاڵ نیە بۆ هیچ ژنێک بڕوای بە خوا بە ڕۆژی دوایی هێنابێ سێ ڕۆژ زیاتر تەعزێ بار بێت، مەگەر بۆ مێردەکەی.**

**٣٥٢٦-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ أَنْ تَحِدَّ فَوْقَ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ، إِلَّا عَلَى زَوْجٍ»[٢].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: حەڵاڵ نیە بۆ هیچ ژنێک بڕوای بە خوا بە ڕۆژی دوایی هێنابێ سێ ڕۆژ زیاتر تەعزێ بار بێت، مەگەر بۆ مێردەکەی.**

## بابەت: تەعزێ نەگرتن لەسەر ژنی شوێنکەوتەی ئاینەکانی پێشوو کە مێردەکەی کۆچی دوایی کردبێت

**٣٥٢٧-** «عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ عَلَى هَذَا الْمِنْبَرِ: لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ أَنْ تَحِدَّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلَاثِ لَيَالٍ، إِلَّا عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً»[٣].

**واتە: ئوممو حەبیبە ﵂، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لەسەر مینبەر دەیفەرموو: حەڵاڵ نیە بۆ هیچ ژنێک بڕوای بە خوا بە پێغەمبەرەکەی هێنابێ سێ شەو زیاتر تەعزێ بار بێت لەسەر مردو، مەگەر بۆ مێرد، ئەویش چوار مانگ و دە ڕۆژە.**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٩١، وإبن ماجه: ٢٠٨٥.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




## مانەوەی ئەو ژنەی مێردەكەی مردوە لە ماڵەكەی خۆی تا شوو كردنی حەڵاڵ دەبێ

**٣٥٢٨-** «عَنِ الْفَارِعَةِ بِنْتِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّ زَوْجَهَا خَرَجَ فِي طَلَبِ أَعْلَاجٍ فَقَتَلُوهُ، «قَالَ شُعْبَةُ، وَابْنُ جُرَيْجٍ» وَكَانَتْ فِي دَارٍ قَاصِيَةٍ، فَجَاءَتْ وَمَعَهَا أَخُوهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَذَكَرُوا لَهُ فَرَخَّصَ لَهَا، حَتَّى إِذَا رَجَعَتْ دَعَاهَا فَقَالَ: اجْلِسِي فِي بَيْتِكِ حَتَّى يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ»[١].

**واتە: فاریقەی كچی مالیک (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: مێردەكەی دەرچوو بە مەبەستی ئەوەی چەند كۆیلەیەكی عەجەمی هەبوو بهێنێتەوە، پاشان كوشتیان «شوعبە و ئیبنو جورەیج وتیان»: ژنەكەی لە ماڵێكی دوور بوو، خۆی و براكەی هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی پێدا، تا كاتێ گەڕایەوە بانگی كرد، فەرمووی: لە ماڵی خۆت دابنیشە تا عیدەیان تەواو دەبێت.**

**٣٥٢٩-** «عَنِ الْفُرَيْعَةِ بِنْتِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّ زَوْجَهَا تَكَارَى عُلُوجاً لِيَعْمَلُوا لَهُ فَقَتَلُوهُ، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَقَالَتْ: إِنِّي لَسْتُ فِي مَسْكَنٍ لَهُ وَلَا يَجْرِي عَلَيَّ مِنْهُ رِزْقٌ، أَفَأَنْتَقِلُ إِلَى أَهْلِي وَيَتَامَايَ وَأَقُومُ عَلَيْهِمْ؟ قَالَ افْعَلِي، ثُمَّ قَالَ: كَيْفَ قُلْتِ؟ فَأَعَادَتْ عَلَيْهِ قَوْلَهَا، قَالَ: اعْتَدِّي حَيْثُ بَلَغَكِ الْخَبَرُ»[٢].

**واتە: فورەیعەی كچی مالیک (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: مێردەكەی ویستی كۆیلەیەكی عەجەمی بكرێ پێیان زانی كوشتیان، ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باسكرد، وتی: بەڕاستی من لە ماڵی ئەودا نیم بژێوی ئەویشم نەما تا بژێویم بدات، ئایا بچمەوە بۆ لای كەسوكارەكەم لەگەڵ منداڵە هەتیوەكانمداو كاروباریان بەڕێوە ببەم؟ وتی: ئەنجامی بدە، پاشان وتی: چیت وت؟ ئەویش قسەكەی بۆی دووبارە كردەوە، فەرمووی: لەو كاتەی هەواڵی مردنیت پێگەیشتووە بچۆ عیدەوە.**

**٣٥٣٠-** «عَنْ فُرَيْعَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّ زَوْجَهَا خَرَجَ فِي طَلَبِ أَعْلَاجٍ لَهُ فَقُتِلَ بِطَرَفِ الْقَدُّومِ، قَالَتْ: فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ، فَذَكَرْتُ لَهُ النُّقْلَةَ إِلَى أَهْلِي، وَذَكَرَتْ لَهُ حَالاً مِنْ حَالِهَا، قَالَتْ: فَرَخَّصَ لِي، فَلَمَّا أَقْبَلْتُ نَادَانِي فَقَالَ: امْكُثِي فِي أَهْلِكِ حَتَّى يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٣٠٠، والترمذي: ١٢٠٤، وإبن ماجه: ٢٠٣١.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




واتە: فورەیعە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: مێردەکەی دەرچوو بۆ گەڕان بە دوای چەند کۆیلەیەکی خۆیدا لە جێگایەک کوژرا لە قەراغی (الْقَدُّوم) (کە شەش میل لە مەدینەوە دوور بوو)، وتی: هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ باسی گەڕانەوەم کرد بۆ لای کەسوکارم، وە باسی حاڵی خۆی کرد بۆی، وتی: مۆڵەتی پێدام، کاتێ هاتم بانگی کردم، فەرمووی: لە نێو کەسوکارەکەت بمێنەوە تا عیدەت تەواو دەبێت.

## بابەت: ڕوخسەت بۆ ئەو کەسەی مێردەکەی مردوە لە هەر کوێ خۆی ویستی عیدەکەی تەواو بکات

**٣٥٣١-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: نَسَخَتْ هَذِهِ الْآيَةُ عِدَّتَهَا فِي أَهْلِهَا فَتَعْتَدُّ حَيْثُ شَاءَتْ، وَهُوَ قَوْلُ اللَّهِ ﷻ: ﴿غَيْرَ إِخْرَاجٍ ﴿٢٤٠﴾﴾البقرة»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: ئەم ئایەتە نەسخ کراوەتەوە، عیدەکەی لەناو ماڵەکەی خۆی دەبێ، لە هەر شوێنێک بیەوێ عیدەکەی تەواو دەکات، ئەویش فەرمایشتی خوایە کە نەسخ کراوەتەوە: ﴿غَيْرَ إِخْرَاجٍ ﴿٢٤٠﴾﴾ (واتە: بەبێ ئەوەی دەربکرێن).

## عیدەو چاوەڕوانی شوکردنەوەی ژنی مێرد مردوو لەو ڕۆژەوە بۆی حیساب دەکرێ کە هەواڵی مردنی مێردەکەی پێدەگات

**٣٥٣٢-** «عَنْ فُرَيْعَةَ بِنْتِ مَالِكٍ، أُخْتُ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَتْ: تُوُفِّيَ زَوْجِي بِالْقَدُومِ، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَذَكَرْتُ لَهُ إِنَّ دَارَنَا شَاسِعَةٌ، فَأَذِنَ لَهَا، ثُمَّ دَعَاهَا فَقَالَ: امْكُثِي فِي بَيْتِكِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً حَتَّى يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ»[2].

واتە: فورەیعەی کچی مالیک، خوشکی ئەبو سەعیدی خودری (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: مێردەکەم لە (الْقَدُّوم) کۆچی دوایی کرد، هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ باسی ئەوەم بۆ کرد ماڵەکەمان دوورە، مۆڵەتی پێدا، پاشان بانگی کردو فەرمووی: لە ماڵی خۆتدا چوار مانگ و دە ڕۆژ بمێنەوە تا عیدەت تەواو دەبێت.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٥٣١ و ٥٣٤٤، وأبو داود: ٢٣٠١.

(٢) صحيح.





## وازهێنان له خۆ ڕازاندنەوه بۆ ژنی تەعزێ باری مسوڵمان جگه له جولەکەو گاور

**٣٥٣٣-** «عَنْ زَيْنَبَ بِنْتِ أَبِي سَلَمَةَ قَالَتْ: دَخَلْتُ عَلَى أُمِّ حَبِيبَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ حِينَ تُوُفِّيَ أَبُوهَا أَبُو سُفْيَانَ بْنُ حَرْبٍ، فَدَعَتْ أُمُّ حَبِيبَةَ بِطِيبٍ فَدَهَنَتْ مِنْهُ جَارِيَةً، ثُمَّ مَسَّتْ بِعَارِضَيْهَا، ثُمَّ قَالَتْ: وَاللَّهِ مَا لِي بِالطِّيبِ مِنْ حَاجَةٍ غَيْرَ أَنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ تَحِدُّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلَاثِ لَيَالٍ، إِلَّا عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً، قَالَتْ زَيْنَبُ: ثُمَّ دَخَلْتُ عَلَى زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ، حِينَ تُوُفِّيَ أَخُوهَا وَقَدْ دَعَتْ بِطِيبٍ وَمَسَّتْ مِنْهُ، ثُمَّ قَالَتْ: وَاللَّهِ مَا لِي بِالطِّيبِ مِنْ حَاجَةٍ غَيْرَ أَنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ عَلَى الْمِنْبَرِ: لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ تَحِدُّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلَاثِ لَيَالٍ، إِلَّا عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً»[١].

واته: زەینەبی کچی ئەبو سەلەمە دەڵێ: ڕۆیشتم بۆ لای ئوممو حەبیبە (خوا لێی ڕازی بێ)، کاتێ ئەبو سوفیانی کوڕی حەربی باوکی مرد، ئوممو حەبیبە داوای بۆنێکی خۆشی کرد کەنیزەکەی پێ بۆنخۆش کرد، وە بەشێک لە ڕوخساری خویشی، پاشان وتی: سوێند بە خوا من پێویستم بە بۆنی خۆش نیە ئەوە نەبێ گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو، فەرمووی: حەڵاڵ نیە بۆ ئافرەتێک بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هێنابێ تەعزێ باری بۆ مردوویەک بگێڕێ لە سەرووی سێ ڕۆژەوە، مەگەر بۆ مێرد ئەویش چوار مانگ و دەڕۆژە، زینەب وتی: پاشان ڕۆیشتم بۆ لای زەینەبی کچی جەحش، کاتێ براکەی مرد، داوای بۆن خۆشی کرد خۆی پێ بۆنخۆش کرد، پاشان وتی: سوێند بە خوا من پێویستم بە بۆنی خۆش نیە، ئەوە نەبێ گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: حەڵاڵ نیە بۆ ئافرەتێک بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هێنابێ تەعزێ باری بۆ مردوویەک بگێڕێ لە سەرووی سێ ڕۆژەوە، مەگەر بۆ مێرد، ئەویش چوار مانگ و دە ڕۆژە.

**٣٥٣٣-** «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا تَقُولُ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ ابْنَتِي تُوُفِّيَ عَنْهَا زَوْجُهَا وَقَدِ اشْتَكَتْ عَيْنَهَا أَفَأَكْحُلُهَا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا، ثُمَّ قَالَ:

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٨٠ و ١٢٨١ و ١٢٨٢ و ٥٣٣٤ و ٥٣٣٥ و ٥٣٣٦، ومسلم: ١٤٨٦ و ١٤٨٧ و ١٤٨٨، والترمذي: ١١٩٥ و ١١٩٦ ز ١١٩٧.

إِنَّمَا هِيَ أَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ وَعَشْراً، وَقَدْ كَانَتْ إِحْدَاكُنَّ فِي الْجَاهِلِيَّةِ تَرْمِي بِالْبَعْرَةِ عِنْدَ رَأْسِ الْحَوْلِ، قَالَ حُمَيْدٌ: فَقُلْتُ لِزَيْنَبَ: وَمَا تَرْمِي بِالْبَعْرَةِ عِنْدَ رَأْسِ الْحَوْلِ؟ قَالَتْ زَيْنَبُ: كَانَتِ الْمَرْأَةُ إِذَا تُوُفِّيَ عَنْهَا زَوْجُهَا دَخَلَتْ حِفْشاً وَلَبِسَتْ شَرَّ ثِيَابِهَا، وَلَمْ تَمَسَّ طِيباً وَلَا شَيْئاً حَتَّى تَمُرَّ بِهَا سَنَةٌ، ثُمَّ تُؤْتَى بِدَابَّةٍ حِمَارٍ أَوْ شَاةٍ أَوْ طَيْرٍ فَتَفْتَضُّ بِهِ، فَقَلَّمَا تَفْتَضُّ بِشَيْءٍ إِلَّا مَاتَ، ثُمَّ تَخْرُجُ فَتُعْطَى بَعْرَةً فَتَرْمِي بِهَا، وَتُرَاجِعُ بَعْدُ مَا شَاءَتْ مِنْ طِيبٍ أَوْ غَيْرِهِ»[١].

واتە: ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ئافرەتێک هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کچەکەم مێردەکەی مردووەو چاوی دەئێشێ، ئایا بیرەژم (ڕەشی بکەم)؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نەخێر، پاشان فەرمووی: بەڵکو ماوەکەی چوار مانگ و دە ڕۆژە، هەر یەکێک لە ئێوە لە سەردەمی نەفامیدا پاش تەواو بوونیساڵێک پشقل یان تەپاڵەی فڕێ دەدا)، (عیدەکەی بەوە کۆتایی پێدەهێنا)، حومەید دەڵێ: پرسیم لە زەینەب: پاش تەواو بوونی ساڵێک پشقل یان تەپاڵە فڕێ دەدەی؟ زەینەب وتی: ئافرەت ئەگەر مێردەکەی بمردایە دەچووە ژوورێکی بچووکی پیسەوە جلێکی خراپی دەپۆشی و بۆنی خۆشی لە خۆی نەدەدا تەنانەت کەمێکیش، تا ساڵەکەی بەسەردا تێپەڕ دەبوو، پاشان ئاژەڵێکیان دەهێنا ئیتر گوێ درێژ بێت، یان باڵندەیەک، یان مەڕێک، ئەو پیسیەی گیانی پێدا هەڵدەسوو، کەم جار هەبوو ئەو شتەی ئەو خۆی پێی دەسڕی نەمرێت، پاشان دەردەچوو پشقلێکی دەدرایە فڕێی دەدا، پاشان دوای ئەوە دەگەڕایەوە بە ئارەزووی خۆی شووی دەکردو بۆنی خۆشی لە خۆی دەدا.

## ئەوەی ژنی تەعزێ بار خۆی لێ بە دوور دەگرێ لە جلوبەرگی ڕەنگاو ڕەنگ

**٣٥٣٤-** «عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تَحِدُّ امْرَأَةٌ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلَاثٍ إِلَّا عَلَى زَوْجٍ، فَإِنَّهَا تَحِدُّ عَلَيْهِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً وَلَا تَلْبَسُ ثَوْباً مَصْبُوغاً، وَلَا ثَوْبَ عَصْبٍ، وَلَا تَكْتَحِلُ، وَلَا تَمْتَشِطُ، وَلَا تَمَسُّ طِيباً إِلَّا عِنْدَ طُهْرِهَا، حِينَ تَطْهُرُ نُبَذاً مِنْ قُسْطٍ وَأَظْفَارٍ»[٢].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٨٠ و ١٢٨١ و ١٢٨٢ و ٥٣٣٤ و ٥٣٣٥ و ٥٣٣٦، ومسلم: ١٤٨٦ و ١٤٨٧ و ١٤٨٨، والترمذي: ١١٩٥ و ١١٩٦ ز ١١٩٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣١٣ و ٥٣٤٠ و ٥٣٤١ و ٥٣٤٢ و ٥٣٤٣، ومسلم: ٩٣٨، وأبو داود: ٢٣٠٣ و ٢٤٠٢، وإبن ماجه: ٢٠٨٧.





واتە: ئوممو عەطیە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دروست نیە هیچ ژنێک لە سێ ڕۆژ زیاتر تەعزێ بۆ مردوو بگێڕێت مەگەر بۆ مێردەکەی، ئەویش چوار مانگ و دە ڕۆژە، وە نابێ پۆشاکی ڕەنگاو ڕەنگ لەبەر بکات، وە پۆشاکی عەصەبیش (کە پۆشاکێکی یەمەنی سپیە ڕەنگی ڕەش و سپی تێدایە)، وە نابێ چاو بڕێژێ قژی شانە بکات، وە بۆنی خۆش لە خۆی نادات مەگەر دوای پاک بوونەوە، ئەویش کەمێک لە (قُسْطٍ) یان (أَظْفَارٍ) (کە دوو جۆر بۆنی خۆشی ئەو سەردەمە بوون).

**٣٥٣٥-** «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْمُتَوَفَّى عَنْهَا زَوْجُهَا لَا تَلْبَسُ الْمُعَصْفَرَ مِنَ الثِّيَابِ، وَلَا الْمُمَشَّقَةَ، وَلَا تَخْتَضِبُ، وَلَا تَكْتَحِلُ»[١].

واتە: ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەو ژنەی مێردەکەی دەمرێ نابێ پۆشاکی موعەصفەر لەبەر بکات (ڕووەکێکی هاوینەیە لە زەعفەران دەچێ، دەخرێتە ناو خواردنەوە، لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ جلوبەرگی پێ ڕەنگ دەکرا) وە پۆشاکی (الْمُمَشَّقَةَ) (کە پۆشاکێکی ڕەنگ کراوە بە قوڕی سور)، بۆیەش بەکارناهێنێ و چاویشی ڕەش ناکات.

## بابەت: بۆیە کردن بۆ ژنی تەعزێ بار

**٣٥٣٦-** «عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ أَنْ تَحِدَّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلَاثٍ إِلَّا عَلَى زَوْجٍ، وَلَا تَكْتَحِلُ، وَلَا تَخْتَضِبُ، وَلَا تَلْبَسُ ثَوْباً مَصْبُوغاً»[٢].

واتە: ئوممو عەطیە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: حەڵاڵ نیە بۆ هیچ ژنێک بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هێنابێ سێ ڕۆژ زیاتر تەعزێ بار بێت، مەگەر بۆ مێرد، چاویشی ڕەش ناکات و بۆیەش بەکارناهێنێ و پۆشاکی ڕەنگاو ڕەنگیش ناپۆشێ.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٣٠٤.

(٢) صحيح.




## بابەت: مۆڵەتدان بە ژنی تەعزێ بار قژی شانە بکات بە سیدر

**٣٥٣٧-** «عَنْ أُمِّ حَكِيمٍ بِنْتِ أَسِيدٍ، عَنْ أُمِّهَا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّ زَوْجَهَا تُوُفِّيَ وَكَانَتْ تَشْتَكِي عَيْنَهَا فَتَكْتَحِلُ الْجَلَاءَ، فَأَرْسَلَتْ مَوْلَاةً لَهَا إِلَى أُمِّ سَلَمَةَ، فَسَأَلَتْهَا عَنْ كُحْلِ الْجَلَاءِ، فَقَالَتْ: لَا تَكْتَحِلُ، إِلَّا مِنْ أَمْرٍ لَا بُدَّ مِنْهُ، دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حِينَ تُوُفِّيَ أَبُو سَلَمَةَ، وَقَدْ جَعَلْتُ عَلَى عَيْنِي صَبْراً، فَقَالَ: مَا هَذَا يَا أُمَّ سَلَمَةَ؟ قُلْتُ: إِنَّمَا هُوَ صَبْرٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَيْسَ فِيهِ طِيبٌ، قَالَ: إِنَّهُ يَشُبُّ الْوَجْهَ، فَلَا تَجْعَلِيهِ إِلَّا بِاللَّيْلِ، وَلَا تَمْتَشِطِي بِالطِّيبِ وَلَا بِالْحِنَّاءِ، فَإِنَّهُ خِضَابٌ، قُلْتُ: بِأَيِّ شَيْءٍ أَمْتَشِطُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: بِالسِّدْرِ تُغَلِّفِينَ بِهِ رَأْسَكِ»[١].

**واتە: ئوممو حەکیمی کچی ئوسەید دەگێڕێتەوە، لە دایکیەوە (خوا لێی ڕازی بێ): مێردەکەی مرد چاوی ئازاری هەبوو بە (الْجَلَاءَ) (کە جۆرێکە لە کل) دەیڕەشت، خزمەتکارەکەی نارد بۆ لای ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ)، پرسیاری لێکرد دەربارەی چاو ڕەشتن بە (الْجَلَاءَ) وتی: با چاو نەڕەشێ مەگەر زۆر پێویست بکات، پێغەمبەر هات بۆ لام کاتێ ئەبو سەلەمە کۆچی دوایی کردبوو، لەسەر چاوم (صَبْر) م دانابوو (کە گیراوەی دارێکی تاڵە)، فەرمووی: (ئەوە ڕوخسار گەنج دەکاتەوە، بەکاری مەهێنە لە شەودا نەبێ، قژیشت شانە مەکە بە بۆنی خۆش، هەروەها خەنەش، چونکە ئەوە بۆیە کردنە، وتم: بە چی شتێک شانەی بکەم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: سیدر زۆر بدە لە قژت.**

## قەدەغە کردن لە چاوڕەشتنی ئافرەتی تەعزێ بار

**٣٥٣٨-** «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: جَاءَتْ امْرَأَةٌ مِنْ قُرَيْشٍ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ ابْنَتِي رَمِدَتْ، أَفَأَكْحُلُهَا؟ وَكَانَتْ مُتَوَفًّى عَنْهَا، فَقَالَ: أَلَا أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً، ثُمَّ قَالَتْ: إِنِّي أَخَافُ عَلَى بَصَرِهَا، فَقَالَ: لَا، إِلَّا أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً، قَدْ كَانَتْ إِحْدَاكُنَّ فِي الْجَاهِلِيَّةِ تَحِدُّ عَلَى زَوْجِهَا سَنَةً، ثُمَّ تَرْمِي عَلَى رَأْسِ السَّنَةِ بِالْبَعْرَةِ»[٢].

**واتە: ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ئافرەتێک لە قورەیش هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، کچەکەم چاوی ئاوی لێ دێت، ئایا بیڕەژم؟ مێردەکەی**

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٣٠٥.

(٢) صحيح.




**مردبوو، فەرمووی: دوای چوار مانگ و دە ڕۆژ، پاشان وتی: من لە چاوی دەترسم، فەرمووی: نەخێر، لە دوای چوار مانگ و دە ڕۆژ، لە سەردەمی نەفامیدا یەکێک لە ئێوە ساڵێک تەعزێ باری بۆ مێردەکەی دەگێڕا، پاشان لەسەری ساڵدا پشقلێ فڕێدەدا. (وەک ئاماژەیەک بۆ تەواو بوونی عیدەکەی).**

**٣٥٣٩-** «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّ امْرَأَةً أَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ فَسَأَلَتْهُ عَنْ ابْنَتِهَا مَاتَ زَوْجُهَا وَهِيَ تَشْتَكِي، قَالَ: قَدْ كَانَتْ إِحْدَاكُنَّ تَحِدُّ السَّنَةَ، ثُمَّ تَرْمِي الْبَعْرَةَ عَلَى رَأْسِ الْحَوْلِ، وَإِنَّمَا هِيَ أَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ وَعَشْراً»[١].

**واتە: ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: ئافرەتێک هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ پرسیاری کرد لەبارەی کچەکەی کە مێردەکەی مردووە و چاوی دەئێشێ، فەرمووی: بێگومان یەکێک لە ئێوە یەک ساڵ تەعزێ باری دەگێڕا، پاشان لەسەری ساڵدا پشقلی فڕێدەدا، (وەک ئاماژەیەک بۆ تەواو بوونی عیدەکەی) بەڵکو ئەوە تەنها چوار مانگ و دە ڕۆژە.**

**٣٥٤٠-** «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّ امْرَأَةً مِنْ قُرَيْشٍ جَاءَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: إِنَّ ابْنَتِي تُوُفِّيَ عَنْهَا زَوْجُهَا وَقَدْ خِفْتُ عَلَى عَيْنِهَا وَهِيَ تُرِيدُ الْكُحْلَ، فَقَالَ: قَدْ كَانَتْ إِحْدَاكُنَّ تَرْمِي بِالْبَعْرَةِ عَلَى رَأْسِ الْحَوْلِ، وَإِنَّمَا هِيَ أَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ وَعَشْراً، فَقُلْتُ لِزَيْنَبَ: مَا رَأْسُ الْحَوْلِ؟ قَالَتْ: كَانَتِ الْمَرْأَةُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ إِذَا هَلَكَ زَوْجُهَا، عَمَدَتْ إِلَى شَرِّ بَيْتٍ لَهَا، فَجَلَسَتْ فِيهِ حَتَّى إِذَا مَرَّتْ بِهَا سَنَةٌ خَرَجَتْ فَرَمَتْ وَرَاءَهَا بِبَعْرَةٍ»[٢].

**واتە: ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: ئافرەتێک لە قورەیش هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: بەڕاستی کچەکەم مێردەکەی مردووە و دەترسم چاوی شتێکی لێ بێت، پێویستی بە ڕەشتن (ڕەشکردن) هەیە، فەرمووی: بێگومان یەکێک لە ئێوە لەسەری ساڵدا پشقلێ فڕێدەدا، (وەک ئاماژەیەک بۆ تەواو بوونی عیدەکەی) بەڵکو ماوەکەی تەنها چوار مانگ و دە ڕۆژە، بە زەینەبم وت: مانای (رَأْسُ الْحَوْلِ) چیە؟ وتی: ئافرەت لە سەردەمی نەفامیدا کاتێ مێردەکەی بمردایە، دەچووە خراپترین شوێنی ماڵەکەی تیایدا دەمایەوە تا ساڵێکی تێپەڕ دەکرد، پاشان دەهاتە دەرەوە بە دوایدا پشقلێکی فڕێدەدا. (وەک ئاماژەیەک بۆ تەواو بوونی عیدەکەی).**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




**٣٥٤١-** «عَنْ زَيْنَبَ: أَنَّ امْرَأَةً سَأَلَتْ أُمَّ سَلَمَةَ، وَأُمَّ حَبِيبَةَ ﵄، أَتَكْتَحِلُ فِي عِدَّتِهَا مِنْ وَفَاةِ زَوْجِهَا؟ فَقَالَتْ: أَتَتِ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَسَأَلَتْهُ عَنْ ذَلِكَ؟ فَقَالَ: قَدْ كَانَتْ إِحْدَاكُنَّ فِي الْجَاهِلِيَّةِ إِذَا تُوُفِّيَ عَنْهَا زَوْجُهَا أَقَامَتْ سَنَةً، ثُمَّ قَذَفَتْ خَلْفَهَا بِبَعْرَةٍ، ثُمَّ خَرَجَتْ، وَإِنَّمَا هِيَ أَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ وَعَشْراً حَتَّى يَنْقَضِيَ الأَجَلُ»[1].

**واتە: زەینەب دەڵێ: ئافرەتێک پرسیاری لە ئوممو سەلەمە و ئوممو حەبیبە (خوا لێیان ڕازی بێ): ئایا چاوی دەڕەشێ لە عیدەی مردنی مێردەکەی؟ وتی: ئافرەتێک هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ پرسیاری ئەوەی لێکرد؟ فەرمووی: لە سەردەمی نەفامیدا یەکێک لە ئێوە کاتێ مێردەکەی بمردایە ساڵێک دەمایەوە، پاشان بە دوایدا پشقلێ فڕێدەدا (وەک ئاماژەیەک بۆ تەواو بوونی عیدەکەی) پاشان دەهاتە دەرەوە، بەڵکو ئەوە چوار مانگ و دە ڕۆژە، تا ماوەکە تەواو دەبێ چاوی نارەشێت**

## بەکار هێنانی (الْقُسْطُ وَالْأَظْفَارُ) کە دوو جۆرە بۆنی خۆشن بۆ تەعزێ بار

**٣٥٤٢-** «عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ رَخَّصَ لِلْمُتَوَفَّى عَنْهَا عِنْدَ طُهْرِهَا فِي الْقُسْطِ وَالْأَظْفَارِ»[2].

**واتە: ئوممو عەطیە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی داوە بۆ ئەو ژنەی مێردەکەی مردوە لە کاتی پاک بوونەوەدا (الْقُسْطُ وَالْأَظْفَارُ) بەکاربهێنێ کە دوو جۆرە بۆنی خۆشن.**

## بابەت: نەسخ کردنەوەی بەخێوکردنی ئەو ژنەی کە مێردەکەی مردوە، بەوەی بۆی فەرزکراوە لە میرات

**٣٥٤٣-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، فِي قَوْلِهِ: ﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا وَصِيَّةً لِّأَزْوَٰجِهِم مَّتَٰعًا إِلَى ٱلْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ ۝٢٤٠﴾البقرة، نُسِخَ ذَلِكَ بِآيَةِ الْمِيرَاثِ مِمَّا فُرِضَ لَهَا مِنَ الرُّبُعِ وَالثُّمُنِ، وَنَسَخَ أَجَلَ الْحَوْلِ، أَنْ جُعِلَ أَجَلُهَا أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً»[3].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) حسن صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٢٩٨.




واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: لە بارەی فەرمایشتی خوا: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا وَصِيَّةً لِّأَزْوَاجِهِم مَّتَاعًا إِلَى ٱلْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ ﴿٢٤٠﴾ ﴾، (واتە: ئەو پیاوانەی دەمرن لە ئێوەو ژنانی هاوسەر بەجێ دەهێڵن، خوا فەرمانی کردوە بە وەسیەت کردن بۆ ژنەکانیان تا ساڵێک بە خێو بکرێن بەبێ ئەوەی دەربکرێن، پاشان نەسخ کرا بە ئایەتی میرات، لەوەی بۆی دیاری کراوە لە چوار یەک و هەشت یەک، وە ماوەی ساڵەکەشی نەسخ کردوە، ماوەکەی داناوە بۆی بە چوار مانگ و دە ڕۆژ.

٣٥٤٤- «عَنْ عِكْرِمَةَ ﷺ، فِي قَوْلِهِ ﷻ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا وَصِيَّةً لِّأَزْوَاجِهِم مَّتَاعًا إِلَى ٱلْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ ﴿٢٤٠﴾ ﴾البقرة، قَالَ: نَسَخَتْهَا: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا ﴿٢٣٤﴾ ﴾البقرة»[1].

واتە: عیکریمە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: لەبارەی فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا وَصِيَّةً لِّأَزْوَاجِهِم مَّتَاعًا إِلَى ٱلْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ ﴿٢٤٠﴾ ﴾ (واتە: ئەو پیاوانەی دەمرن لە ئێوەو ژنانی هاوسەر بەجێ دەهێڵن، خوا فەرمانی کردوە بە وەسیەت کردن بۆ ژنەکانیان تا ساڵێک بەخێو بکرێن بەبێ ئەوەی دەربکرێن، دەڵێ: ئەم ئایەتە نەسخی کردەوە: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا ﴿٢٣٤﴾ ﴾ (واتە: ئەو پیاوانەی کە دەمرن لە ئێوەو هاوسەران جێ دەهێڵن، هاوسەرەکانیان چاوەڕوانی دەکەن، چوار مانگ و دە شەو.

## ڕێگەدان بە دەرچوونی ئافرەتی تەڵاقدراوی سێ بە سێ لە ماڵەکەی خۆیەوە بۆ جێگایەکی تر عیدەکەی تەواو بکات

٣٥٤٥- «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَاصِمٍ، أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ قَيْسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَخْبَرَتْهُ «وَكَانَتْ عِنْدَ رَجُلٍ مِنْ بَنِي مَخْزُومٍ: أَنَّهُ طَلَّقَهَا ثَلَاثاً وَخَرَجَ إِلَى بَعْضِ الْمَغَازِي، وَأَمَرَ وَكِيلَهُ أَنْ يُعْطِيَهَا بَعْضَ النَّفَقَةِ، فَتَقَالَّتْهَا، فَانْطَلَقَتْ إِلَى بَعْضِ نِسَاءِ النَّبِيِّ ﷺ، فَدَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَهِيَ عِنْدَهَا فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَذِهِ فَاطِمَةُ بِنْتُ قَيْسٍ طَلَّقَهَا فُلَانٌ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهَا بِبَعْضِ النَّفَقَةِ، فَرَدَّتْهَا، وَزَعَمَ أَنَّهُ

---

(١) حسن صحيح.




شَيْءٌ تَطَوَّلَ بِهِ؟ قَالَ: صَدَقَ، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: فَانْتَقِلِي إِلَى أُمِّ كُلْثُومٍ فَاعْتَدِّي عِنْدَهَا، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ أُمَّ كُلْثُومٍ امْرَأَةٌ يَكْثُرُ عُوَّادُهَا، فَانْتَقِلِي إِلَى عَبْدِ اللَّهِ ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ فَإِنَّهُ أَعْمَى فَانْتَقَلَتْ إِلَى عَبْدِ اللَّهِ، فَاعْتَدَّتْ عِنْدَهُ حَتَّى انْقَضَتْ عِدَّتُهَا، ثُمَّ خَطَبَهَا أَبُو الْجَهْمِ وَمُعَاوِيَةُ بْنُ أَبِي سُفْيَانَ، فَجَاءَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، تَسْتَأْمِرُهُ فِيهِمَا، فَقَالَ: أَمَّا أَبُو الْجَهْمِ فَرَجُلٌ أَخَافُ عَلَيْكِ قَسْقَاسَتَهُ لِلْعَصَا، وَأَمَّا مُعَاوِيَةُ فَرَجُلٌ أَمْلَقُ مِنَ الْمَالِ، فَتَزَوَّجَتْ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ بَعْدَ ذَلِكَ»[(١)].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عاصم دەگێڕێتەوە: فاطیمەی کچی قەیس (خوا لێی ڕازی بێ)، هەواڵی پێداوە «خێزانی پیاوێک بوو لە بەنی مەخزوم»: ئەو پیاوە سێ بە سێ تەڵاقیداو ڕۆیشت بۆ هەندێ لە غەزاکان، فەرمانی بە بریکارەکەی کرد هەندێ نەفەقەی پێ بدات، ئەویش ڕەتی کردەوە، پاشان ڕۆیشت بۆ لای هەندێ لە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ، لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەوە ئەویش لە لای دانیشتبوو، خێزانەکەی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمە فاطیمەی کچی قەیسە فڵانە کەس تەڵاقی داوەو هەندێ نەفەقەی بۆ ناردوەو ئەویش ڕەتی کردۆتەوە، پێی وابوو ئەوە شتێکە پێی بەخشیوە؟ وتی: ڕاستی کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بڕۆ بۆ لای ئوم کەلثوم لای ئەو عیدەکەت تەواو بکە، پاشان فەرمووی: بەڕاستی ئوم کەلثوم ئافرەتێکە میوانی زۆر دێت، بڕۆ بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی ئوم مەکتوم چونکە ئەو پیاوێکی نابینایە، ئەویش ڕۆیشت بۆ لای عەبدوڵڵا، لای ئەو مایەوە تا عیدەکەی تەواو کرد، پاشان ئەبو جەهم و موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان داخوازیان کرد، هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ داوای فەرمانی لێکرد لەبارەی ئەو دووانەوە، ئەویش فەرمووی: ئەبو جەهم پیاوێکە دەترسم بە دارەکەی سزات بدات، مەعاویەیش پیاوێکی بێ پارەیە، پاشان دوای ئەوە شوی کردە ئوسامەی کوڕی زەید.

**٣٥٤٦-** «عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّهَا كَانَتْ تَحْتَ أَبِي عَمْرِو بْنِ حَفْصِ بْنِ الْمُغِيرَةِ فَطَلَّقَهَا آخِرَ ثَلَاثِ تَطْلِيقَاتٍ، فَزَعَمَتْ فَاطِمَةُ أَنَّهَا جَاءَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَاسْتَفْتَتْهُ فِي خُرُوجِهَا مِنْ بَيْتِهَا، فَأَمَرَهَا أَنْ تَنْتَقِلَ إِلَى ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ الْأَعْمَى، فَأَبَى مَرْوَانُ، أَنْ يُصَدِّقَ فَاطِمَةَ فِي خُرُوجِ الْمُطَلَّقَةِ مِنْ بَيْتِهَا قَالَ عُرْوَةُ: أَنْكَرَتْ عَائِشَةُ ذَلِكَ عَلَى فَاطِمَةَ»[(٢)].

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح.

واتە: فاطیمەی کچی قەیس (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە: ئەو خێزانی ئەبو عەمرِی کوڕی حەفصی کوڕی موغیرە بوو، سێ بە سێ تەڵاقیدا، فاطیمە پێی وابوو ئەو هاتووە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ داوای دەرچوونی لێکردوە لە ماڵەکەی، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکرد بچێت بۆ لای کوڕی ئوم مەکتوم، مەڕوان نکوڵی ئەوەی کرد بڕوا بە فاطیمە بکات لە دەرچوونی ژنی تەڵاقدراو لە ماڵەکەی، عوروە وتی: عائیشە ئینکاری ئەوەی کرد لە فاطیمە.

**٣٥٤٧-** «عَنْ فَاطِمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، زَوْجِي طَلَّقَنِي ثَلَاثاً وَأَخَافُ أَنْ يُقْتَحَمَ عَلَيَّ، فَأَمَرَهَا فَتَحَوَّلَتْ»[1].

واتە: فاطیمە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، مێردەکەم سێ بە سێ تەڵاقیداوم دەترسم هێرشم بۆ بێنی و بەسەرمدا بدات، فەرمانی پێکرد جێگاکەی خۆی گواستەوە.

**٣٥٤٨-** «عَنِ الشَّعْبِيِّ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، فَسَأَلْتُهَا عَنْ قَضَاءِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَلَيْهَا؟ فَقَالَتْ: طَلَّقَهَا زَوْجُهَا الْبَتَّةَ، فَخَاصَمَتْهُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي السُّكْنَى وَالنَّفَقَةِ، قَالَتْ: فَلَمْ يَجْعَلْ لِي سُكْنَى وَلَا نَفَقَةً، وَأَمَرَنِي أَنْ أَعْتَدَّ فِي بَيْتِ ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ»[2].

واتە: شەعبی دەڵێ: هاتم بۆ لای فاطیمەی کچی قەیس (خوا لێی ڕازی بێ) پرسیارم لێکرد دەربارەی بریاری پێغەمبەری خوا ﷺ بەسەریدا؟ وتی: مێردەکەی سێ بە سێ تەڵاقیداوە، ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ سکاڵای شوێنی نیشتەجێ بوون و نەفەقەی کرد، وتی: نە شوێنی نیشتەجێ بوونم هەیە نە نەفەقە، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردم لە ماڵی کوڕی ئوم مەکتوم عیدەکەم تەواو بکەم.

**٣٥٤٩-** «عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: طَلَّقَنِي زَوْجِي فَأَرَدْتُ النُّقْلَةَ، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: انْتَقِلِي إِلَى بَيْتِ ابْنِ عَمِّكِ عَمْرِو بْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ، فَاعْتَدِّي فِيهِ، فَحَصَبَهُ الْأَسْوَدُ، وَقَالَ: وَيْلَكَ لِمَ تُفْتِي بِمِثْلِ هَذَا؟ قَالَ عُمَرُ: إِنْ جِئْتِ بِشَاهِدَيْنِ يَشْهَدَانِ أَنَّهُمَا

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٨٢/٥٣، وإبن ماجه: ٢٠٣٣.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١١٩ و ٢٩٤٢/١٢٢، وأبو داود: ٢٢٨٨ و ٤٣٢٦ و٤٣٢٧، والترمذي: ١١٨٠ و ٢٢٥٣، وإبن ماجه: ٢٠٢٤ و ٢٠٣٦ و ٤٠٧٤.




سَمِعَاهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَإِلَّا لَمْ نَتْرُكْ كِتَابَ اللَّهِ لِقَوْلِ امْرَأَةٍ:﴿لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ ۚ ١﴾ الطلاق»[1].

**واتە: شەعبی دەگێڕێتەوە، فاطیمەی کچی قەیس (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: مێردەکەم تەڵاقیدام ویستی گواستنەوەم هەبوو، جا هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بچۆ بۆ ماڵ ئامۆزاکەت عەمری کوڕی ئوم مەکتوم، لەوێ عیدەکەت تەواو بکە، ئەسوەد بەردی بۆ شوعبە وەشاند، وتی: وای بۆ تۆ بۆچی فتوای لەم جۆرە دەدەی؟ عومەر وتی: ئەگەر دوو شاهید بهێنی شایەتی بدەن کە ئەوان ئەوەیان لە پێغەمبەرەوە بیستووە، ئەگەرنا ئێمە واز لە کتێبی خوا ناهێنین لەبەر قسەی ژنێک: ﴿لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ ۚ ١﴾ (واتە: ئەو ژنانە دەر مەکەن لە ماڵەکانی خۆیان تا عیدەیان تەواو دەبێ ئافرەتانیش با دەرنەچن لە ماڵەکانیان مەگەر کارێکی خراپی ئاشکرا بکەن).**

### بابەت: دەرچوونی ئەو ژنەی مێردەکەی مردوە بە ڕۆژ

**٣٥٥٠-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: طُلِّقَتْ خَالَتُهُ فَأَرَادَتْ أَنْ تَخْرُجَ إِلَى نَخْلٍ لَهَا، فَلَقِيَتْ رَجُلاً فَنَهَاهَا، فَجَاءَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: اخْرُجِي، فَجُدِّي نَخْلَكِ، لَعَلَّكِ أَنْ تَصَدَّقِي وَتَفْعَلِي مَعْرُوفاً»[2].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پوری (خوشکی دایکی) تەڵاقدرا ویستی بچێ بۆ نێو باخە خورماکەی، گەیشت بە پیاوێک نەهی لێکرد، ئەویش هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بڕۆ دەرەوە، بەرهەمی دار خورماکەت ببڕە، بەڵکو لێی ببەخشی و کاری چاکی پێ بکەیت.**

### بابەت: نەفەقەو خەرجی تەڵاقی سێ بە سێ

**٣٥٥١-** «عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ أَبِي الْجَهْمِ قَالَ: دَخَلْتُ أَنَا وَأَبُو سَلَمَةَ عَلَى فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ ﷺ. قَالَتْ: طَلَّقَنِي زَوْجِي فَلَمْ يَجْعَلْ لِي سُكْنَى وَلَا نَفْقَةً، قَالَتْ: فَوَضَعَ لِي عَشْرَةَ أَقْفِزَةٍ عِنْدَ ابْنِ عَمٍّ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٨٣/٥٥، وأبو داود: ٢٢٩٧، وإبن ماجه: ٢٠٣٤.




لَهُ، خَمْسَةٌ شَعِيرٌ وَخَمْسَةٌ تَمْرٌ، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقُلْتُ لَهُ ذَلِكَ، فَقَالَ: صَدَقَ، وَأَمَرَنِي أَنْ أَعْتَدَّ فِي بَيْتِ فُلَانٍ، وَكَانَ زَوْجُهَا طَلَّقَهَا طَلَاقاً بَائِناً»[١].

**واتە: ئەبو بەكری كوڕی ئەبو جەهم دەڵێ: من و ئەبو ئوسامە هاتین بۆ لای فاطیمەی كچی قەیس ﵂ وتی: مێردەكەم تەڵاقیدام نە شوێنی نیشتەجێ بوونی پێدام نە نەفەقە، وتی: دە (أَقْفِزَة)ی بۆ دانام (كە پێوانەیەک بووە لە كۆندا بەكارهێنراوە لە ئەمڕۆدا هەر یەک (قفیز)ێک دەكاتە نزیک شازدە كیلۆگرام، واتە: ١٦٠ كیلۆگرام دەكات بە گشتی) لای ئامۆزاكەی، پێنجیان جۆ بوون (واتە: ٨٠ كیلۆ جۆ) پێنجیشیان خورما بوون (واتە: ٨٠ كیلۆ خورما) جا هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەم پێ وت، فەرمووی: ڕاستی كرد، وە فەرمانی پێكردم لەماڵی فڵانەكەس عیدەكەم تەواو بكەم، مێردەكەی تەڵاقی سێ بەسێی دابوو.**

## نەفەقەی تەڵاق دراوی سێ بە سێی دووگیان

**٣٥٥٢-** «عَنْ عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ: أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ عُثْمَانَ، طَلَّقَ ابْنَةَ سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ، وَأُمُّهَا حَمْنَةُ بِنْتُ قَيْسٍ الْبَتَّةَ، فَأَمَرَتْهَا خَالَتُهَا فَاطِمَةُ بِنْتُ قَيْسٍ، بِالِانْتِقَالِ مِنْ بَيْتِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، وَسَمِعَ بِذَلِكَ مَرْوَانُ فَأَرْسَلَ إِلَيْهَا فَأَمَرَهَا أَنْ تَرْجِعَ إِلَى مَسْكَنِهَا حَتَّى تَنْقَضِيَ عِدَّتُهَا، فَأَرْسَلَتْ إِلَيْهِ تُخْبِرُهُ، أَنَّ خَالَتَهَا فَاطِمَةَ أَفْتَتْهَا بِذَلِكَ، وَأَخْبَرَتْهَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أَفْتَاهَا بِالِانْتِقَالِ حِينَ طَلَّقَهَا أَبُو عَمْرِو بْنُ حَفْصٍ الْمَخْزُومِيُّ، فَأَرْسَلَ مَرْوَانُ قَبِيصَةَ بْنَ ذُؤَيْبٍ إِلَى فَاطِمَةَ فَسَأَلَهَا عَنْ ذَلِكَ؟ فَزَعَمَتْ أَنَّهَا كَانَتْ تَحْتَ أَبِي عَمْرٍو لَمَّا أَمَّرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ عَلَى الْيَمَنِ، خَرَجَ مَعَهُ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهَا بِتَطْلِيقَةٍ، وَهِيَ بَقِيَّةُ طَلَاقِهَا، فَأَمَرَ لَهَا الْحَارِثَ بْنَ هِشَامٍ، وَعَيَّاشَ بْنَ أَبِي رَبِيعَةَ بِنَفَقَتِهَا، فَأَرْسَلَتْ إِلَى الْحَارِثِ وَعَيَّاشٍ تَسْأَلُهُمَا النَّفَقَةَ الَّتِي أَمَرَ لَهَا بِهَا زَوْجُهَا؟ فَقَالَا: وَاللَّهِ مَا لَهَا عَلَيْنَا نَفَقَةٌ إِلَّا أَنْ تَكُونَ حَامِلاً، وَمَا لَهَا أَنْ تَسْكُنَ فِي مَسْكَنِنَا إِلَّا بِإِذْنِنَا، فَزَعَمَتْ فَاطِمَةُ، أَنَّهَا أَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لَهُ، فَصَدَّقَهُمَا، قَالَتْ: فَقُلْتُ: أَيْنَ أَنْتَقِلُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَقَالَ: انْتَقِلِي عِنْدَ ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ وَهُوَ الْأَعْمَى الَّذِي عَاتَبَهُ اللَّهُ ﷻ فِي كِتَابِهِ، فَانْتَقَلْتُ عِنْدَهُ، فَكُنْتُ أَضَعُ ثِيَابِي عِنْدَهُ حَتَّى أَنْكَحَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، زَعَمَتْ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




واتە: عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عوتبە دەگێڕێتەوە، عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕی کوڕی عوسمان، کچەکەی سەعیدی کوڕی زەیدی تەڵاقدا بە هەمیشەیی، وە دایکی حەمنەی کچی قەیس بوو، پورەکەی فاطیمە کچی قەیس فەرمانی پێ کرد لە ماڵی عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕ دەربچێ، مەڕوان ئەمەی بیست نێردراوی نارد بۆ لای، فەرمانی پێ کرد بگەڕێتەوە بۆ ماڵەکەی خۆی تا عیدەکەی تەواو دەکات، ئەویش وەڵامی دایەوە کە پوری فاطیمە فەتوای بۆ داوە، فاطیمەش هەواڵی پێداوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردوە بە گواستنەوە، کاتێ ئەبو عەمڕی کوڕی حەفصی مەخزومی تەڵاقیدا، مەڕوان قەبیصەی کوری ذوئەیبی نارد بۆ لای فاطیمە لەو بارەیەوە پرسیاری لێ کرد؟ ئەویش وەڵامی دایەوە کە ئەو ژنی ئەبو عەمڕ بوو، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە عەلی کوڕی ئەبو طالب بچێ بۆ یەمەن، لەگەڵیدا ڕۆیشت بۆ یەمەن، تەڵاقێکی بۆی نارد، ئەوەش کۆتا تەڵاقی بوو کە مابوویەوە، فەرمانی کردبوو بە حارسی کوڕی هیشام و عیاشی کوڕی ئەبو ڕەبیعە نەفەقەی بدەن، فاطیمە ناردی بۆ لای حارس و عیاش داوای ئەو نەفەقەی کرد کە مێردەکەی فەرمانی پێکردوە؟ وتیان: سوێند بە خوا نەفەقەی لەسەر ئێمە نیە مەگەر دووگیان بێت، مافی ئەوەشی نیە لە ماڵی ئێمەدا دابنیشێ مەگەر بە مۆڵەتی ئێمە، فاطیمەش ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی بۆی باس کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانی بەڕاست دانا، دەڵێ: وتم: ئەی بۆ کوێ بڕۆم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: بڕۆ بۆ لای کوڕەکەی ئوم مەکتوم، ئەویش ئەو پیاوە نابینایە بوو کە خوا ﷻ لە کتێبەکەیدا باسی کردوە، منیش ڕۆیشتم بۆ لای، لە ماڵی کوڕەکەی ئوم مەکتوم مامەوە جل و بەرگی خۆمم دادەنا، تا پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئوسامەی کوڕی زەیدی مارە کرد.

## حەیز یان پاکبوونەوە (الْأَقْرَاءِ)

**٣٥٥٣-** «عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ فَاطِمَةَ ابْنَةَ أَبِي حُبَيْشٍ، حَدَّثَتْهُ أَنَّهَا أَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَشَكَتْ إِلَيْهِ الدَّمَ؟ فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّمَا ذَلِكَ عِرْقٌ، فَانْظُرِي إِذَا أَتَاكِ قُرْؤُكِ فَلَا تُصَلِّي، فَإِذَا مَرَّ قُرْؤُكِ فَلْتَطْهُرِي، قَالَ: ثُمَّ صَلِّي مَا بَيْنَ الْقُرْءِ إِلَى الْقُرْءِ»[١].

---

(١) صحيح.




واتە: عورووەی کوڕی زوبێر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: فاطیمەی کچی ئەبو حوبەیش بۆی باسکرد، ئەو ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری خوێنی حەیزی لێکرد. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بێگومان ئەوە دەمارێکە، تەماشا بکە ئەگەر حەیزت بۆ هات نوێژ مەکە، ئەگەر حەیزەکەت کاتی نەما خۆت بشۆرە، پاشان نوێژ بکە لە نێوان حەیز بۆ حەیزێکی تر.

## بابەت: نەسخ بوونەوەی گێڕانەوەی ژنی سێ بە سێ تەڵاق دراو

**٣٥٥٤-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، فِي قَوْلِهِ: ﴿ مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ ﴿١٠٦﴾ ﴾ البقرة، وَقَالَ: ﴿ وَإِذَا بَدَّلْنَآ ءَايَةً مَّكَانَ ءَايَةٍ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ ﴿١٠١﴾ ﴾النحل، وَقَالَ: ﴿ يَمْحُواْ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثْبِتُ وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ ﴿٣٩﴾ ﴾الرعد، فَأَوَّلُ مَا نُسِخَ مِنَ الْقُرْآنِ الْقِبْلَةُ، وَقَالَ: ﴿ وَٱلْمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ وَلَا يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِىٓ أَرْحَامِهِنَّ ﴿٢٢٨﴾ ﴾البقرة، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿إِنْ أَرَادُوٓاْ إِصْلَٰحًا ﴿٢٢٨﴾ ﴾البقرة، وَذَلِكَ بِأَنَّ الرَّجُلَ كَانَ إِذَا طَلَّقَ امْرَأَتَهُ فَهُوَ أَحَقُّ بِرَجْعَتِهَا وَإِنْ طَلَّقَهَا ثَلَاثاً فَنَسَخَ ذَلِكَ، وَقَالَ: ﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌۢ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌۢ بِإِحْسَٰنٍ ﴿٢٢٩﴾ ﴾البقرة»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: لە بارەی فەرمایشتی خواوە: ﴿ مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ ﴿١٠٦﴾ ﴾ (واتە: ئەگەر ئایەتێک لە ئایەتەکانی قورئان بسڕینەوە، یان پشت گوێی بخەین یەکێکی تری باشتر لەو، یان وەک ئەو دێنین)، وە فەرموویەتی: ﴿ وَإِذَا بَدَّلْنَآ ءَايَةً مَّكَانَ ءَايَةٍ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ ﴿١٠١﴾ ﴾ (واتە: هەر کاتێ ئایەتێک لە جێی ئایەتێکی تردا دابەزێنین، وە خوا چاکتر دەزانێ چی دەنێرێتە خوارەوە)، ﴿ يَمْحُواْ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثْبِتُ وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ ﴿٣٩﴾ ﴾ (واتە: ئەوەی خوا بیەوێ دەیسڕێتەوە ئەوەشی بیەوێ دەیهێڵێتەوە سەرچاوەی کتێبەکان لای خوایە)، جا یەکەم شت لە قورئاندا نەسخ کرایەوە قیبلە بوو، وە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ وَلَا يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِىٓ أَرْحَامِهِنَّ ﴿٢٢٨﴾ ﴾ (واتە: وە ژنە تەڵاق دراوەکان دان بە خۆیاندا دەگرن تا ماوەی سێ حەیز دروست نیە بۆ ئەوان کە بیشارنەوە ئەوەی خوا لە منداڵدانیاندا

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٢١٩٥ و ٢٢٨٢.




دروستی کردوە، تا فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿إِنْ أَرَادُوٓاْ إِصْلَٰحًا ﴿٢٢٨﴾﴾، واتە: ئەگەر مەبەستیان ئەوە بوو بە باشی بژین، ئەویش کاتێ پیاو ژنەکەی تەڵاق بدایە لە پێشتر بوو بە گەڕاندنەوەی، ئەگەر چی سێ بە سێش بوایە، ئەوەش نەسخ کرایەوە. وە فەرموویەتی: ﴿ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٍ ﴿٢٢٩﴾﴾، واتە: تەڵاق دووجارە دوای ئەوە ڕاگرتنە بە خۆشی یان بەرەڵاکردنە بە باشی.

## بابەت: گەڕاندنەوە بۆ ژیانی هاوژینی

**٣٥٥٥-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: طَلَّقْتُ امْرَأَتِي وَهِيَ حَائِضٌ، فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ عُمَرُ فَذَكَرَ لَهُ ذَلِكَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: مُرْهُ أَنْ يُرَاجِعَهَا، فَإِذَا طَهُرَتْ «يَعْنِي» فَإِنْ شَاءَ فَلْيُطَلِّقْهَا قُلْتُ لِابْنِ عُمَرَ: فَاحْتَسَبْتَ مِنْهَا؟ فَقَالَ: مَا يَمْنَعُهَا، أَرَأَيْتَ إِنْ عَجَزَ وَاسْتَحْمَقَ»[1].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ژنەکەم تەڵاقداو لە حەیزدا بوو، عومەر هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئەوەی بۆ باس کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: فەرمانی پێ بکە بیگەڕێنێتەوە، ئەگەر پاک بوویەوە (مانای ئەوەیە ئەگەر ویستی با تەڵاقی بدا)، بە ئیبنو عومەرم وت: ژماردووتە؟ وتی: چی ڕێگری دەکات، ئەی نەتبینیوە بێتوانا بێت و کاری بێ عەقڵانە بکات.**

**٣٥٥٦-** «عَنْ نَافِعٍ، إِنَّ ابْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، فَذَكَرَ عُمَرُ لِلنَّبِيِّ ﷺ. فَقَالَ: مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا حَتَّى تَحِيضَ حَيْضَةً أُخْرَى، فَإِذَا طَهُرَتْ فَإِنْ شَاءَ طَلَّقَهَا، وَإِنْ شَاءَ أَمْسَكَهَا. فَإِنَّهُ الطَّلَاقُ الَّذِي أَمَرَ اللَّهُ ﷻ بِهِ، قَالَ تَعَالَى: ﴿فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ ﴿١﴾﴾ الطلاق»[2].

**واتە: نافیع دەگێڕێتەوە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) ژنەکەی تەڵاقداو لە حەیزدا بوو، عومەر ئەوەی باس کرد بۆ پێغەمبەر ﷺ، فەرمووی: فەرمانی پێ بکە بابیگەڕێنێتەوە تا دەکەوێتە حەیزێکی دیکەوە، جا ئەگەر پاک بویەوە، ئەگەر ویستی تەڵاقی بدات، وە ئەگەر ویستی با بیهێڵێتەوە، چونکە ئەوە ئەو تەڵاقەیە کە خوای بەرز فەرمانی پێکردوە، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ ﴿١﴾﴾ (واتە: تەڵاقیان بدەن لە کاتی عیدەکانیاندا).**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




**٣٥٥٧-** «عَنْ نَافِعٍ قَالَ: كَانَ ابْنُ عُمَرَ، إِذَا سُئِلَ عَنِ الرَّجُلِ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، فَيَقُولُ: أَمَّا إِنْ طَلَّقَهَا وَاحِدَةً أَوِ اثْنَتَيْنِ فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَمَرَهُ أَنْ يُرَاجِعَهَا ثُمَّ يُمْسِكَهَا حَتَّى تَحِيضَ حَيْضَةً أُخْرَى ثُمَّ تَطْهُرَ، ثُمَّ يُطَلِّقَهَا قَبْلَ أَنْ يَمَسَّهَا، وَأَمَّا إِنْ طَلَّقَهَا ثَلَاثاً، فَقَدْ عَصَيْتَ اللَّهَ فِيمَا أَمَرَكَ بِهِ مِنْ طَلَاقِ امْرَأَتِكَ، وَبَانَتْ مِنْكَ امْرَأَتُكَ»(١).

**واتە: نافیع دەڵێ: ئیبنو عومەر ئەگەر پرسیاری لێ بکرایە لە بارەی پیاوێکەوە ژنەکەی تەڵاق بدایە لە کاتی حەیزدا، دەیوت: ئەگەر یەک تەڵاقی دابێ یان دوو، ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردوە بیگەڕێنێتەوە، پاشان بیهێڵێتەوە تا حەیزێکی تر تەواو دەکات، پاشان پاک دەبێتەوە، پاشان تەڵاقی بدات پێش ئەوەی لەگەڵیدا جووت بێت، بەڵام ئەگەر سێ بە سێ تەڵاقیدا، ئەوە بێگومان سەرپێچی خوات کردوە لەوەی فەرمانی پێ کردووی لە تەڵاقدانی ژنەکەتدا، وە ژنەکەت بە هەمیشەیی لێت جیابۆتەوە.**

**٣٥٥٨-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ فَأَمَرَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَرَاجَعَهَا»(٢).

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، ئەو ژنەکەی تەڵاقدا لە حەیزدا بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کرد گەڕاندیەوە.**

**٣٥٥٩-** «عَنْ طَاوُسٍ، أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، يُسْأَلُ عَنْ رَجُلٍ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ حَائِضاً، فَقَالَ: أَتَعْرِفُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَإِنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ حَائِضاً، فَأَتَى عُمَرُ النَّبِيَّ ﷺ فَأَخْبَرَهُ الْخَبَرَ، فَأَمَرَهُ أَنْ يُرَاجِعَهَا حَتَّى تَطْهُرَ»(٣).

**واتە: طاوس دەگێڕێتەوە: ئەو بیستی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) پرسیاری لێ دەکرا لە بارەی پیاوێکەوە ژنەکەی تەڵاقداوە لە کاتی حەیزدا، وتی: ئایا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەناسی؟ وتی: بەڵێ، وتی: ئەو ژنەکەی تەڵاقدا لە حەیزدا بوو، عومەر هات بۆ لای پێغەمبەرو ﷺ هەواڵی پێدا، فەرمانی پێکرد بیگەڕێنێتەوە تا پاک دەبێتەوە.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٧١/١٣.




**٣٥٦٠-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، كَانَ طَلَّقَ حَفْصَةَ، ثُمَّ رَاجَعَهَا. وَاللَّهُ أَعْلَمُ»[1].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ حەفصەی تەڵاقدا، دواتر گەڕاندیەوە. خوا زاناترە.**

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٢٨٣، وإبن ماجه: ٢٠١٦.




**٣٥٦١-** «عَنْ سَلَمَةَ بْنِ نُفَيْلٍ الْكِنْدِيِّ ﷺ قَالَ: كُنْتُ جَالِساً عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَذَالَ النَّاسُ الْخَيْلَ، وَوَضَعُوا السِّلَاحَ، وَقَالُوا: لَا جِهَادَ قَدْ وَضَعَتِ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا، فَأَقْبَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِوَجْهِهِ، وَقَالَ: كَذَبُوا الْآنَ، الْآنَ جَاءَ الْقِتَالُ، وَلَا يَزَالُ مِنْ أُمَّتِي أُمَّةٌ يُقَاتِلُونَ عَلَى الْحَقِّ، وَيُزِيغُ اللَّهُ لَهُمْ قُلُوبَ أَقْوَامٍ، وَيَرْزُقُهُمْ مِنْهُمْ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ، وَحَتَّى يَأْتِيَ وَعْدُ اللَّهِ، وَالْخَيْلُ مَعْقُودٌ فِي نَوَاصِيهَا الْخَيْرُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَهُوَ يُوحَى إِلَيَّ أَنِّي مَقْبُوضٌ غَيْرَ مُلَبَّثٍ، وَأَنْتُمْ تَتَّبِعُونِي أَفْنَاداً، يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ، وَعُقْرُ دَارِ الْمُؤْمِنِينَ الشَّامُ»[١].

**واتە: سەلەمەی کوڕی نوفەیلی کیندی ﷺ دەڵێ: من دانیشتبووم لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ پیاوێک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکی ئەسپەکانیان سەرزەنشت و ڕیسوا کردوەو چەک و تفاقەکانیان داناوەو دەڵێن: جیهاد نەماوە، جەنگ کۆتایی پێهاتووە، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی تێکردو فەرمووی: ڕاستیان نەکرد، بێگومان ئێستا جەنگ دێت، بە بەردەوام لەناو ئوممەتەکەمدا کۆمەڵێک هەن دەجەنگن لە سەر حەق، خوا بەهۆی ئەوانەوە دڵی خەڵکانێک لادەدا، وە ڕزق و ڕۆزیان دەدات تا ڕۆژی دوایی، تا بەڵێنی خوا دێت، چاوانی ئەسپ تا ڕۆژی دوایی خێری تێدایە، ئەو وەحیم بۆ دەکات من دەمرم و نامێنم، ئێوەش شوێنی شتی پووچ دەکەون، هەندێکتان دەدا لە گەردنی هەندێکی ترتان، وە ناو ماڵی بڕواداران وڵاتی شامە.**

**٣٥٦٢-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْخَيْلُ مَعْقُودٌ فِي نَوَاصِيهَا الْخَيْرُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، الْخَيْلُ ثَلَاثَةٌ: فَهِيَ لِرَجُلٍ أَجْرٌ، وَهِيَ لِرَجُلٍ سَتْرٌ، وَهِيَ عَلَى رَجُلٍ وِزْرٌ، فَأَمَّا الَّذِي هِيَ لَهُ أَجْرٌ، فَالَّذِي يَحْتَبِسُهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَيَتَّخِذُهَا لَهُ، وَلَا تُغَيِّبُ فِي بُطُونِهَا شَيْئاً، إِلَّا كُتِبَ لَهُ بِكُلِّ شَيْءٍ غَيَّبَتْ فِي بُطُونِهَا أَجْرٌ، وَلَوْ عَرَضَتْ لَهُ مَرْجٌ، وَسَاقَ الْحَدِيثَ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ناو چاوانی ئەسپ تا ڕۆژی دوایی خێری تێدایە، ئەسپ سێ (جۆرە): بۆ کەسێک پاداشتە، بۆ کەسێک داپۆشینە (بۆ دۆخی ژیانی و بۆ پاراستنی لە دوژمن)، وە لە سەر کەسێکیش قورسی و بارگرانی و تاوانە، بەڵام ئەوەی کە بۆی دەبێتە پاداشت ئەو کەسەیە لە پێناوی**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




خوادا ئامادەی كردوە بۆ ئەو مەبەستە دایناوە (جیهاد كردن)، هیچ شتێک لە ناو سكیدا پەنهان ناكات ئیللا بۆ هەر شتێ لەناو سكیدا پەنهانی كردوە پاداشت هەیە بۆ خاوەنەكەی، ئەگەر بخرێتە زەویەكی بەرفراوانەوەو گوریسەكەی بۆ درێژ بكرێ، وە فەرموودەكەی باسكرد.

**٣٥٦٣-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: الْخَيْلُ لِرَجُلٍ أَجْرٌ، وَلِرَجُلٍ سِتْرٌ، وَعَلَى رَجُلٍ وِزْرٌ، فَأَمَّا الَّذِي هِيَ لَهُ أَجْرٌ: فَرَجُلٌ رَبَطَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ، فَأَطَالَ لَهَا فِي مَرْجٍ أَوْ رَوْضَةٍ، فَمَا أَصَابَتْ فِي طِيَلِهَا ذَلِكَ فِي الْمَرْجِ أَوِ الرَّوْضَةِ كَانَ لَهُ حَسَنَاتٌ، وَلَوْ أَنَّهَا قَطَعَتْ طِيَلَهَا ذَلِكَ، فَاسْتَنَّتْ شَرَفاً أَوْ شَرَفَيْنِ، كَانَتْ آثَارُهَا «وَفِي حَدِيثِ الْحَارِثِ» وَأَرْوَاثُهَا حَسَنَاتٍ لَهُ، وَلَوْ أَنَّهَا مَرَّتْ بِنَهَرٍ فَشَرِبَتْ مِنْهُ وَلَمْ يُرِدْ أَنْ تُسْقَى، كَانَ ذَلِكَ حَسَنَاتٍ فَهِيَ لَهُ أَجْرٌ، وَرَجُلٌ رَبَطَهَا تَغَنِّياً وَتَعَفُّفاً وَلَمْ يَنْسَ حَقَّ اللَّهِ ﷻ فِي رِقَابِهَا وَلَا ظُهُورِهَا، فَهِيَ لِذَلِكَ سَتْرٌ، وَرَجُلٌ رَبَطَهَا فَخْراً وَرِيَاءً وَنِوَاءً لِأَهْلِ الْإِسْلَامِ، فَهِيَ عَلَى ذَلِكَ وِزْرٌ، وَسُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنِ الْحَمِيرِ، فَقَالَ: لَمْ يَنْزِلْ عَلَيَّ فِيهَا شَيْءٌ إِلَّا هَذِهِ الْآيَةُ الْجَامِعَةُ الْفَاذَّةُ: ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ۝٧ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ۝٨﴾ الزلزلة»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەسپ بۆ پیاوێک دەبێتە مایەی خێرو پاداشت، بۆ پیاوێكی دیكەش دەبێتە داپۆشەری كەم و كوڕیەكانی، لەسەر پیاوێكیش دەبێتە مایەی گوناهو تاوان، ئەوەی كە بۆی دەبێتە مایەی پاداشت و خێر و بێر، ئەو پیاوەیە لە پێناوی خوادا ئامادەی كردوە بۆ (جیهاد كردن)، گورێسەكەی درێژكردوە لە لەوەڕگە و پاوەندا، یان لە سەر تەپۆڵكەو بەرزایەكاندا، جا لەناو ئەو لەوەڕگەو تەپۆڵكەدا چەندە جڵەوی بۆ شۆڕكات و لێی بخوات دەبێتە مایەی چاكەو پاداشت بۆی، وە ئەگەر گوریسەكەی بڕی و تەپۆڵكەیەک یان دوو تەپۆڵكە تێ بپەڕێنێ، ئەوە شوێنەوارو پیسیەكەی بە پاداشت بۆ خاوەنەكەی دەنووسرێ، وە ئەگەر بە لای ڕووبارێكدا تێپەڕی و ئاوی لێ خواردەوە، خاوەنەكەیشی نیازی ئەوەی نەبووبێ ئاوی پێ بدات، ئەوە بۆی دەبێتە پاداشت، وە كەسێک ئامادەی كردبێ بە مەبەستی ئەوەی پێویستی بە خەڵک نەبێ و داوا لە خەڵكی نەكات، لە هەمان كاتدا مافی خوا لە گەردن و پشتیدا

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٧١ و ٢٨٦٠ و ٣٦٤٦ و ٤٩٦٢ و ٤٩٦٣ و ٧٣٥٦، ومسلم: ٢٤ و ٩٨٧/٢٦، وأبو داود: ١٦٥٩، والترمذي: ١٦٣٦، وإبن ماجه: ٢٧٨٨.




پشت گوێ نەخات، ئەوە بۆی دەبێتە داپۆشەر، وە کەسێک ئامادەی کردبێ لە بەر خۆبەزلزانی و ڕیایی و دژایەتی کردنی ئەهلی ئیسلام، ئەوە بۆی دەبێتە قورسایی و تاوان، وە پرسیارکرا لە پێغەمبەر ﷺ لە بارەی گوێدرێژ، فەرمووی: لە بارەیەوە هیچم بۆ دانەبەزیوە جگە لەم ئایەتە کۆکەرەوە تاکە نەبێ کە هاوتای نیە:﴿ فَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍ خَيۡرٗا يَرَهُۥ ۝٧ وَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ شَرّٗا يَرَهُۥ ۝٨ ﴾

## بابەت: خۆشەویستنی ئەسپ

**٣٥٦٤-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: لَمْ يَكُنْ شَيْءٌ أَحَبَّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بَعْدَ النِّسَاءِ مِنَ الْخَيْلِ»[1].

**واتە:** ئەنەس ﷺ دەڵێ: هیچ شتێک نەبووە لە دوای ژنان خۆشەویستتر بێت لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئەسپ.

## ئەوەی چاکە لە ئەسپی ناوچاو سپی

**٣٥٦٥-** «عَنْ أَبِي وَهْبٍ ﷺ «وَكَانَتْ لَهُ صُحْبَةٌ» قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: تَسَمَّوْا بِأَسْمَاءِ الْأَنْبِيَاءِ، وَأَحَبُّ الْأَسْمَاءِ إِلَى اللَّهِ ﷻ، عَبْدُ اللَّهِ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ، وَارْتَبِطُوا الْخَيْلَ، وَامْسَحُوا بِنَوَاصِيهَا وَأَكْفَالِهَا وَقَلِّدُوهَا، وَلَا تُقَلِّدُوهَا الْأَوْتَارَ، وَعَلَيْكُمْ بِكُلِّ كُمَيْتٍ أَغَرَّ مُحَجَّلٍ، أَوْ أَشْقَرَ أَغَرَّ مُحَجَّلٍ، أَوْ أَدْهَمَ أَغَرَّ مُحَجَّلٍ»[2].

**واتە:** ئەبو وەهەب ﷺ هاوەڵ بوو دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە ناوی پێغەمبەرانەوە ناوبنێن، خۆشەویستترین ناو لای خوا ﷻ عەبدوڵلاو عەبدوڕڕەحمانە، ئەسپەکانتان ببەستنەوە، ناوچاوانیان بسڕن و چی دەکەنە ملیان بیکەن، بەڵام کەوانەی تیر مەکەنە ملیان (چونکە لە سەردەمی نەفامیدا بابەتێکی ئاینی بووە) ئامادەیان بکەن لە پێناوی خوا، لە پێناوی ئەوە نەفامیەی لە ناوتاندایە ئامادەی مەکەن، لەسەرتانە هەموو ئەسپێکی سوری تێکەڵ بە ڕەشی ناوچاو سپی و سێ قاچی سپی بێت بەکاربێنن، یان سوری کاڵی ناوچاو سپی و سێ قاچی سپی بێت، یان باینجانی ناوچاو سپی و سێ قاچی سپی بێت.

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٥٤٣ و ٢٥٤٤ و ٢٥٥٣ و ٤٩٥٠.




## ئەو ئەسپەی هەردوو دەست و قاچێکی سپی بێت

**٣٥٦٦-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ، يَكْرَهُ الشِّكَالَ مِنَ الْخَيْلِ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ حەزی نەکردوە لە ئەسپێک هەردوو دەستی و قاچێکی سپی بێت.**

**٣٥٦٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ كَرِهَ الشِّكَالَ مِنَ الْخَيْلِ، قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: الشِّكَالُ مِنَ الْخَيْلِ: أَنْ تَكُونَ ثَلَاثُ قَوَائِمَ مُحَجَّلَةً وَوَاحِدَةٌ مُطْلَقَةً، أَوْ تَكُونَ الثَّلَاثَةُ مُطْلَقَةً وَرِجْلٌ مُحَجَّلَةً، وَلَيْسَ يَكُونُ الشِّكَالُ، إِلَّا فِي رِجْلٍ، وَلَا يَكُونُ فِي الْيَدِ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ حەزی نەکردوە لە ئەسپێک هەردوو دەستی و قاچێکی سپی بێت، ئەبو عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: (الشِّكَالُ) بریتیە لەوەی: هەردوو دەستی و قاچێکی سپی بێت، دانەیەکیشیان هیچی پێوە نەبێ، یان سیانیان هیچی پێوە نەبێ و دانەیەکیان سپی بێت، وە (الشِّكَالُ) تەنها لە قاچدا دەبێت نەک لە دەست.**

## بابەت: شومی و پێ ڕەشی ئەسپ

**٣٥٦٨-** «عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الشُّؤْمُ فِي ثَلَاثَةٍ: الْمَرْأَةِ، وَالْفَرَسِ، وَالدَّارِ»[٣].

**واتە: سالم دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: شومی لە سێ شتدایە: ژن، ئەسپ، خانوو.**

**٣٥٦٩-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: الشُّؤْمُ فِي الدَّارِ وَالْمَرْأَةِ وَالْفَرَسِ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٨٧٥، وأبو داود: ٢٥٤٧، والترمذي: ١٦٩٨، وإبن ماجه: ٢٧٩٠.

(٢) صحيح.

(٣) شاذ.

(٤) شاذ. أخرجه البخاري: ٢٨٥٨ و ٥٠٩٣ و ٥٧٥٣ و ٥٧٧٢، ومسلم: ٢٢٢٥، وأبو داود: ٣٩٢٢، والترمذي: ٢٨٢٤، وإبن ماجه: ١٩٩٥.

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شومی لە خانوو و ژن و ئەسپدایە).**

**٣٥٧٠-** «عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنْ يَكُ فِي شَيْءٍ: فَفِي الرَّبْعَةِ، وَالْمَرْأَةِ، وَالْفَرَسِ»(١).

**واتە: جابر رضي الله عنه دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر لە شتێکدا بەرەکەت هەبێ: ئەوە لە نێو چاوانی ژن و ئەسپدا هەیە.**

## بابەت: فەڕو بەرەکەتی ئەسپ

**٣٥٧١-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْبَرَكَةُ فِي نَوَاصِي الْخَيْلِ»(٢).

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەرەکەت لە ناوچاوانی ئەسپدایە.**

## بابەت: بەستنەوەی ناوچاوانی ئەسپ

**٣٥٧٢-** «عَنْ جَرِيرٍ رضي الله عنه قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَفْتِلُ نَاصِيَةَ فَرَسٍ بَيْنَ أُصْبُعَيْهِ، وَيَقُولُ: الْخَيْلُ مَعْقُودٌ فِي نَوَاصِيهَا الْخَيْرُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ: الْأَجْرُ وَالْغَنِيمَةُ»(٣).

**واتە: جەریر رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی ناوچاوانی ئەسپی دەهۆنیەوە لە نێوان پەنجەکانی و دەیفەرموو: لە ناوچاوانی ئەسپدا تا ڕۆژی دوایی خێر هەیە: پاداشت و دەستکەوت.**

**٣٥٧٣-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: الْخَيْلُ فِي نَوَاصِيهَا الْخَيْرُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ»(٤).

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە ناوچاوانی ئەسپدا تا ڕۆژی دوایی خێر هەیە.**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٢٢٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٨٥١ و ٣٦٤٥، ومسلم: ١٨٧٤.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٨٧٢.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٨٤٩ و ٣٦٤٤، ومسلم: ١٨٧١، وإبن ماجه: ٢٧٨٧.




**٣٥٧٤-** «عَنْ عُرْوَةَ الْبَارِقِيِّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْخَيْلُ مَعْقُودٌ فِي نَوَاصِيهَا الْخَيْرُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ»[١].

**واتە: عوروەی بارقی ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە ناوچاوانی ئەسپدا تا ڕۆژی دوایی خێر هەیە: پاداشت و دەستکەوت، (واتە: پاداشت لە ڕۆژی دوایی و غەنیمەت و دەستکەوت لە ژیانی دونیا).**

**٣٥٧٥-** «عَنْ عُرْوَةَ بْنِ أَبِي الْجَعْدِ ﵁، أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: الْخَيْلُ مَعْقُودٌ فِي نَوَاصِيهَا الْخَيْرُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ: الْأَجْرُ وَالْمَغْنَمُ»[٢].

**واتە: عوروەی کوڕی ئەبو جەعد ﵁ دەگێڕێتەوە: بیستوویەتی پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: لە ناوچاوانی ئەسپدا تا ڕۆژی دوایی خێر هەیە: پاداشت و دەستکەوت.**

**٣٥٧٦-** «عَنْ عُرْوَةَ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: الْخَيْلُ مَعْقُودٌ فِي نَوَاصِيهَا الْخَيْرُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ: الْأَجْرُ وَالْمَغْنَمُ»[٣].

**واتە: عوروە ﵁ دەڵێ: بیستم پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: لە ناوچاوانی ئەسپدا تا ڕۆژی دوایی خێر هەیە: پاداشت و دەستکەوت.**

**٣٥٧٧-** «عَنْ عُرْوَةَ بْنِ أَبِي الْجَعْدِ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْخَيْلُ مَعْقُودٌ فِي نَوَاصِيهَا الْخَيْرُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ: الْأَجْرُ، وَالْمَغْنَمُ»[٤].

**واتە: عوروەی کوڕی ئەبو جەعد ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: لە ناوچاوانی ئەسپدا تا ڕۆژی دوایی خێر هەیە: پاداشت و دەستکەوت.**

## فێر کردنی ئەسپ لە لایەن خاوەنەکەیەوە بە مەبەستی جەنگ و جیهاد

**٣٥٧٨-** «عَنْ خَالِدِ بْنِ يَزِيدَ الْجُهَنِيِّ ﵁ قَالَ: كَانَ عُقْبَةُ بْنُ عَامِرٍ، يَمُرُّ بِي فَيَقُولُ: يَا خَالِدُ، اخْرُجْ بِنَا نَرْمِي، فَلَمَّا كَانَ ذَاتَ يَوْمٍ أَبْطَأْتُ عَنْهُ، فَقَالَ: يَا خَالِدُ، تَعَالَ أُخْبِرْكَ بِمَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٨٥٠ و ٢٨٥٢ و ٣١١٩ و ٣٦٤٣، ومسلم: ١٨٧٣، والترمذي: ١٦٩٤، وإبن ماجه: ٢٣٠٥.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




فَأَتَيْتُهُ، فَقَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ وَلَيْسَ اللَّهْوُ إِلَّا فِي ثَلَاثَةٍ: تَأْدِيبِ الرَّجُلِ فَرَسَهُ، وَمُلَاعَبَتِهِ امْرَأَتَهُ، وَرَمْيِهِ بِقَوْسِهِ، وَنَبْلِهِ، وَمَنْ تَرَكَ الرَّمْيَ بَعْدَ مَا عَلِمَهُ رَغْبَةً عَنْهُ، فَإِنَّهَا نِعْمَةٌ كَفَرَهَا، أَوْ قَالَ: كَفَرَ بِهَا»[١].

**واته: خالدی کوڕی یەزیدی جوهەنی ﷺ دەڵێ: عوقبەی کوڕی عامر بە لامدا تێدەپەڕی و دەیوت: ئەی خالد وەرە دەرەوە با تیر بهاوێژین، ڕۆژێکیان من دواکەوتم وتی: ئەی خالد وەرە با هەواڵت بدەمێ بەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: منیش هاتم بۆ لای، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی یاری و گەمە کردن تەنها لە سێ شتدا هەیە: پیاو ئەسپەکەی خۆی فێر بکات (بە مەبەستی جەنگ و جیهاد)، وە یاری بکات لەگەڵ ژنەکەیدا، وە تیر بهاوێژێ، جا هەرکەس واز لە تیر هاوێشتن بهێنێ دوای ئەوەی فێری بووەو حەزی لێ نەبێ، ئەوە نیعمەتێکە حەقی خۆی پێ نەداوە.**

## بابەت: پاڕانەوەی ئەسپ

**٣٥٧٩-** «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَا مِنْ فَرَسٍ عَرَبِيٍّ إِلَّا يُؤْذَنُ لَهُ عِنْدَ كُلِّ سَحَرٍ بِدَعْوَتَيْنِ: اللَّهُمَّ خَوَّلْتَنِي مَنْ خَوَّلْتَنِي مِنْ بَنِي آدَمَ وَجَعَلْتَنِي لَهُ، فَاجْعَلْنِي أَحَبَّ أَهْلِهِ وَمَالِهِ إِلَيْهِ أَوْ مِنْ أَحَبِّ مَالِهِ وَأَهْلِهِ إِلَيْهِ»[٢].

**واته: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ ئەسپێکی عەرەبی نیە ئیللا لە کاتی بەربانگدا مۆڵەتی پێ دەدرێ بە دوو پاڕانەوە: خوایە منت کردوە بە موڵکی نەوەی ئادەم، بمکە بە خۆشەویسترین کەس و کارو ماڵی بە لایەوە، یان خۆشەویسترین ماڵ و کەس و کاری بە لایەوە.**

## هەڕەشەی توند لەسەر ئەوەی گوێدرێژ بخرێتە سەر ئەسپ

**٣٥٨٠-** «عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ قَالَ: أُهْدِيَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بَغْلَةٌ، فَرَكِبَهَا، فَقَالَ عَلِيٌّ: لَوْ حَمَلْنَا الْحَمِيرَ عَلَى الْخَيْلِ لَكَانَتْ لَنَا مِثْلُ هَذِهِ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّمَا يَفْعَلُ ذَلِكَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ»[٣].

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٥٦٥.




**واتە: عەلی کوڕی ئەبو طالب ﷺ دەڵێ: ئێسترێک بە دیاری پێشکەشی پێغەمبەری خوا ﷺ کرا، و سواری بوو، عەلی وتی: ئەگەر گوێ درێژ بخەینە سەر ئەسپ ئەوە ئەم ئێسترەی دەبێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بێگومان ئەوانەی ئەو کارە دەکەن کەسانێکن هیچ لە حوکمە شەرعیەکان نازانن.**

**٣٥٨١-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، فَسَأَلَهُ رَجُلٌ أَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ فِي الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ؟، قَالَ: لَا، قَالَ: فَلَعَلَّهُ كَانَ يَقْرَأُ فِي نَفْسِهِ؟ قَالَ: خَمْشاً، هَذِهِ شَرٌّ مِنَ الْأُولَى، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَبْدٌ أَمَرَهُ اللَّهُ تَعَالَى بِأَمْرِهِ، فَبَلَّغَهُ، وَاللَّهِ مَا اخْتَصَّنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِشَيْءٍ دُونَ النَّاسِ إِلَّا بِثَلَاثَةٍ: أَمَرَنَا أَنْ نُسْبِغَ الْوُضُوءَ، وَأَنْ لَا نَأْكُلَ الصَّدَقَةَ، وَلَا نُنْزِيَ الْحُمُرَ عَلَى الْخَيْلِ»[١].

**واتە: عەبدوڵلای کوڕی عوبێدوڵلای کوڕی عەبباس دەڵێ: من لە لای ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) بووم پیاوێک پرسیاری لێکرد، ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی نیوەڕۆ و عەسردا قورئانی خوێندوە؟ وتی: نەخێر، وتی: پێ دەچێ لە دەروونی خۆیدا خوێندبێتی، وتی: دەم و چاوت بڕوشێ، ئەمە خراپترە لە یەکەم، پێغەمبەری خوا ﷺ بەندەیەک بووە خوا فەرمانی پێکردوەو ئەویش گەیاندوویەتی، سوێند بەخوا پێغەمبەری خوا ﷺ تایبەتی نەکردووین بە هیچ شتێک لە خەڵکی جگە لە سێ شت نەبێ: فەرمانی پێکردووین دەستنوێژ بە چاکی بگرین، وە ماڵی زەکات نەخۆین، گوێدرێژیش نەخەینە سەر ئەسپ.**

## ئالیک پێدانی ئەسپ

**٣٥٨٢-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنِ احْتَبَسَ فَرَساً فِي سَبِيلِ اللَّهِ إِيمَاناً بِاللَّهِ وَتَصْدِيقاً لِوَعْدِ اللَّهِ كَانَ شِبَعُهُ وَرِيُّهُ وَبَوْلُهُ وَرَوْثُهُ حَسَنَاتٍ فِي مِيزَانِهِ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس ئەسپێک لە پێناوی خوادا دابنێ وەک بڕوابوون بە خواو بە ڕاستدانانی بەڵێنەکانی ئەوە تێرکردن و، ئاودانی و، میزکردنی و پیسیەکەی هەمووی دەبێتە خێرو چاکە بۆ سەر تەرازووەکەی.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٨٥٣.

## ماوەی پێشبڕکێ بۆ ئەو ئەسپانەی کە دابەستە نەکراون

**٣٥٨٣-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سَابَقَ بَيْنَ الْخَيْلِ يُرْسِلُهَا مِنَ الْحَفْيَاءِ، وَكَانَ أَمَدُهَا ثَنِيَّةَ الْوَدَاعِ، وَسَابَقَ بَيْنَ الْخَيْلِ الَّتِي لَمْ تُضْمَرْنَ وَكَانَ أَمَدُهَا مِنَ الثَّنِيَّةِ إِلَى مَسْجِدِ بَنِي زُرَيْقٍ»[١].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێشبڕکێی کرد بەو ئەسپانەی کە دابەستە کرابوون لە (الْحَفْيَاءِ)وە تا دەگاتە (ثَنِيَّةَ الْوَدَاعِ)، وە پێشبڕکێی کرد بەو ئەسپانەی کە دابەستە نەکرابوون، ماوەکەشی لە (الثَّنِيَّةِ)ەوە بۆ مزگەوتی (بَنِي زُرَيْقٍ) بوو.**

## بابەت: دابەستە کردنی ئەسپ بۆ پێشبڕکێ

**٣٥٨٤-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، سَابَقَ بَيْنَ الْخَيْلِ الَّتِي قَدْ أُضْمِرَتْ مِنَ الْحَفْيَاءِ، وَكَانَ أَمَدُهَا ثَنِيَّةَ الْوَدَاعِ، وَسَابَقَ بَيْنَ الْخَيْلِ الَّتِي لَمْ تُضْمَرْ مِنَ الثَّنِيَّةِ إِلَى مَسْجِدِ بَنِي زُرَيْقٍ، وَأَنَّ عَبْدَ اللَّهِ، كَانَ مِمَّنْ سَابَقَ بِهَا»[٢].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێشبڕکێی کرد بەو ئەسپانەی کە دابەستە کرابوون لە (الْحَفْيَاءِ)وە تا دەگاتە (ثَنِيَّةَ الْوَدَاعِ) وە پێشبڕکێی کرد بەو ئەسپانەی کە دابەستە نەکرابوون، ماوەکەشی لە (الثَّنِيَّةِ)ەوە بۆ مزگەوتی (بَنِي زُرَيْقٍ) بوو. وە عەبدوڵڵاش یەکێک بوو لەوانەی پێشبڕکێی پێ دەکرد.**

## بابەت: پێشبڕکێ کردن

**٣٥٨٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا سَبَقَ إِلَّا فِي نَصْلٍ، أَوْ حَافِرٍ، أَوْ خُفٍّ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٨٦٩ و ٢٨٧٠ و ٧٣٣٦، ومسلم: ١٨٧٠، وأبو داود: ٢٥٧٥، والترمذي: ١٦٩٩، وإبن ماجه: ٢٨٧٧.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٥٧٤، والترمذي: ١٧٠٠، وإبن ماجه: ٢٨٧٨.




**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حەڵاڵ نیە وەرگرتنی ماڵ و سامان لە پێشبڕکێدا جگە لە پێشبڕکێ کردنی یەکێک لەمانە: تیر هاوێشتن، یان پێشبڕکێی وشتر، یان پێشبڕکێی ئەسپ.**

**٣٥٨٦-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا سَبَقَ إِلَّا فِي نَصْلٍ، أَوْ خُفٍّ، أَوْ حَافِرٍ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حەڵاڵ نیە وەرگرتنی ماڵ و سامان لە پێشبڕکێدا جگە لە پێشبڕکێ کردنی یەکێک لەمانە: تیر هاوێشتن، یان پێشبڕکێی وشتر، یان پێشبڕکێی ئەسپ.**

**٣٥٨٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: لَا يَحِلُّ سَبَقٌ، إِلَّا عَلَى خُفٍّ، أَوْ حَافِرٍ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێشبڕکێ حەڵاڵ نیە جگە لە پێشبڕکێی وشتر، یان پێشبڕکێی ئەسپ.**

**٣٥٨٨-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ نَاقَةٌ تُسَمَّى الْعَضْبَاءَ لَا تُسْبَقُ، فَجَاءَ أَعْرَابِيٌّ عَلَى قَعُودٍ فَسَبَقَهَا فَشَقَّ عَلَى الْمُسْلِمِينَ، فَلَمَّا رَأَى مَا فِي وُجُوهِهِمْ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، سُبِقَتِ الْعَضْبَاءُ، قَالَ: إِنَّ حَقًّا عَلَى اللَّهِ أَنْ لَا يَرْتَفِعَ مِنَ الدُّنْيَا شَيْءٌ إِلَّا وَضَعَهُ»[٣].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وشترێکی بوو پێی دەوترا (الْعَضْبَاءَ) (واتە: گوێ بڕاو) هیچ وشترێک پێشی نەدەکەوت، دەشتەکیەک هات بەسەر وشترێکی تازە پێگەیشتوە بوو، پێش وشترەکەی پێغەمبەر ﷺ کەوت، مسوڵمانان زۆریان پێناخۆش بوو، تەماشای ڕوخساری کردن، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێشی وشتری (الْعَضْبَاءَ) درایەوە، فەرمووی: بەڕاستی حەقە لەسەر خوا هەر شتێ خۆی بەرز بکاتەوە لە دونیادا خوا دایبەزێنێت.**

**تێبینی: وشەی: (قَعُودٍ) بریتیە لە هەر وشترێک دوو ساڵ تا پێنج ساڵ).**

**٣٥٨٩-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَا سَبَقَ إِلَّا فِي خُفٍّ، أَوْ حَافِرٍ»[٤].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٨٧١ و ٢٨٧٢ و ٦٥٠١، وأبو داود: ٤٨٠٢ و ٤٨٠٣.

(٤) صحيح.




واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: حەڵاڵ نیە وەرگرتنی ماڵ و سامان لە پێشبڕکێدا جگە لە پێشبڕکێ کردنی یەکێک لەمانە: تیر هاوێشتن، یان پێشبڕکێی وشتر، یان پێشبڕکێی ئەسپ.

## (الْجَلَبُ) (لە پێشبڕکێدا ئەوەیە پیاوێک شوێنی ئەسپەکەی بکەوێ و قامچی لێ بدات و هاواری بەسەردا بکات بۆ ئەوەی چاک غار بدات).

**٣٥٩٠-** «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَا جَلَبَ وَلَا جَنَبَ وَلَا شِغَارَ فِي الْإِسْلَامِ، وَمَنْ انْتَهَبَ نُهْبَةً فَلَيْسَ مِنَّا»[١].

واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نە (جَلَبُ) و نە (جَنَبَ) و نە (شِغَارَ) لە ئیسلامدا دروست نیە، (کە بریتیە لەوەی پیاوێک کچەکەی خۆی دەدات بە پیاوێک لە بری ئەوەی ئەویش کچەی خۆی بدات بە ئەم، هیچ مارەییەکەیش لە نێوانیاندا نیە)، هەر کەس ماڵێک داگیر بکات لەسەر ڕێگای ئێمە نیە.

## دەربارەی ( الْجَنَبُ )

تێبینی: (الْجَنَبُ) واتە: پێشبڕکێکار لە تەنیشت ئەسپەکەیدا ئەسپێکی تر دادەنێت ئەگەر یەکەم خاوبوویەوە، دەچێتە سەر ئەوی تر بۆ ئەوەی پێش بکەوێ.

**٣٥٩١-** «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا جَلَبَ وَلَا جَنَبَ وَلَا شِغَارَ فِي الْإِسْلَامِ»[٢].

واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نە (جَلَبُ) و نە (جَنَبَ) و نە (شِغَارَ) (کە بریتیە لەوەی پیاوێک کچەکەی خۆی دەدات بە پیاوێک لە بری ئەوەی ئەویش کچەی خۆی بدات بە ئەم، هیچ مارەییەکەیش لە نێوانیاندا نیە) لە ئیسلامدا دروست نیە.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٥٨١، والترمذي: ١٢٣، وإبن ماجه: ٣٩٣٧.

(٢) صحيح.




**٣٥٩٢-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: سَابَقَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَعْرَابِيٌّ فَسَبَقَهُ، فَكَأَنَّ أَصْحَابَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَجَدُوا فِي أَنْفُسِهِمْ مِنْ ذَلِكَ، فَقِيلَ لَهُ فِي ذَلِكَ، فَقَالَ: حَقٌّ عَلَى اللَّهِ أَنْ لَا يَرْفَعَ شَيْءٌ نَفْسَهُ فِي الدُّنْيَا إِلَّا وَضَعَهُ اللَّهُ»[١].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێشبڕکێی کرد لەگەڵ دەشتەکیەکدا، دەشتەکیەکە پێشی کەوت، هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەیان پێ قوڕس و گران بوو، لەوبارەوە قسەی لەگەڵ کرا، فەرمووی: بەڕاستی حەقە لەسەر خوا هەر شتێک خۆی بەرز بکاتەوە لە دونیادا خوا دایبەزێنێت.**

## بابەت: دوو بەشی ئەسپ لە غەنیمەت

**٣٥٩٣-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: ضَرَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَامَ خَيْبَرَ لِلزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ أَرْبَعَةَ أَسْهُمٍ: سَهْماً لِلزُّبَيْرِ، وَسَهْماً لِذِي الْقُرْبَى لِصَفِيَّةَ بِنْتِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ أُمِّ الزُّبَيْرِ، وَسَهْمَيْنِ لِلْفَرَسِ»[٢].

**واتە: عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەساڵی خەیبەر چوار بەشی دانا بۆ زوبەیری کوڕی عەوام، بەشێک بۆ زوبەیر، دوو بەش بۆ نزیکەکانی بۆ صەفیەی کچی عەبدولموتەلیب دایکی زوبەیر، دوو بەشیش بۆ ئەسپەکەی.**

---

(١) صحیح.

(٢) صحیح لغیره.

**٣٥٩٤-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ الْحَارِثِ ﷺ قَالَ: مَا تَرَك رَسُولُ اللَّهِ ﷺ دِينَاراً وَلَا دِرْهَماً، وَلَا عَبْداً وَلَا أَمَةً، إِلَّا بَغْلَتَهُ الشَّهْبَاءَ الَّتِي كَانَ يَرْكَبُهَا، وَسِلَاحَهُ وَأَرْضاً جَعَلَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ صَدَقَةً»[١].

**واتە: عەمری کوڕی حارث ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نە دینارو نە درهەم و نە کۆیلەو نە کەنیزەکی بەجێ نەهێشت، جگە لە ئێسترە (الشَّهْبَاءَ)ـەکەی، کە سواری دەبوو، هەروەها چەکەکەی، وە زەویەکیشی هەبوو لە پێناوی خوادا کردی بە صەدەقە.**

**٣٥٩٥-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ الْحَارِثِ ﷺ يَقُولُ: مَا تَرَكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَّا بَغْلَتَهُ الْبَيْضَاءَ وَسِلَاحَهُ وَأَرْضاً تَرَكَهَا صَدَقَةً»[٢].

**واتە: عەمری کوڕی حارث ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هیچی بەجێ نەهێشت، جگە لە ئێسترە (الْبَيْضَاءَ)ـەکەی، هەروەها چەکەکەی، وە زەویەکیشی هەبوو وازی لێ هێنا کردی بە صەدەقە.**

**٣٥٩٦-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ الْحَارِثِ ﷺ يَقُولُ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، مَا تَرَكَ إِلَّا بَغْلَتَهُ الشَّهْبَاءَ، وَسِلَاحَهُ وَأَرْضاً تَرَكَهَا صَدَقَةً»[٣].

**واتە: عەمری کوڕی حارث ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام بینی ﷺ هیچی بەجێ نەهێشت، جگە لە ئێسترە (الشَّهْبَاءَ)ـەکەی، هەروەها چەکەکەی، وە زەویەکیشی هەبوو وازی لێ هێنا کردی بە صەدەقە.**

## چۆن وەقف دەنوسرێ، وە باسی جیاوازی لەسەر ئیبنو عەون لە فەرموودەکەی ئیبنو عومەر

**٣٥٩٧-** «عَنِ ابْنِ عَوْنٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: أَصَبْتُ أَرْضاً مِنْ أَرْضِ خَيْبَرَ، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقُلْتُ: أَصَبْتُ أَرْضاً لَمْ أُصِبْ مَالاً أَحَبَّ إِلَيَّ وَلَا أَنْفَسَ عِنْدِي مِنْهَا، قَالَ: إِنْ شِئْتَ تَصَدَّقْتَ بِهَا، فَتَصَدَّقَ بِهَا عَلَى أَنْ لَا تُبَاعَ، وَلَا تُوهَبَ فِي الْفُقَرَاءِ وَذِي الْقُرْبَى وَالرِّقَابِ وَالضَّيْفِ وَابْنِ السَّبِيلِ، لَا جُنَاحَ عَلَى مَنْ وَلِيَهَا أَنْ يَأْكُلَ بِالْمَعْرُوفِ، غَيْرَ مُتَمَوِّلٍ مَالاً، وَيُطْعِمَ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧٣٩ و ٢٨٧٣ و ٢٩١٢ و ٣٠٩٨ و ٤٤٦١.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٣٣.




واتە: ئیبنو عەون دەگێڕێتەوە، لە نافیع، لە ئیبنو عومەر، لە عومەرەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: زەویەکم بەرکەوت لە زەویەکانی خەیبەر، هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتم: زەویەکم بەرکەتووە لە خەیبەر هەرگیز ماڵ و سامانێکم بەر نەکەوتووە لەوە بە نرختر بێت لەلام، فەرمووی: ئەگەر ویستت دەیکەی بە خێر، ئەویش کردی بە خێر بە مەرجێک نە بفرۆشرێ و نە ببەخشرێ بە هەژار و خزم و کەسوکارو کۆیلە و میوان و کاروانی، گوناهیش نیە لەسەر ئەو کەسەی سەرپەرشتی دەکات لێی بخوات، بەڵام بە پێی پێویستی، یاخود بیدات بە یەکێکی تر.

**٣٥٩٨-** «عَنِ ابْنِ عَوْنٍ ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ ، نَحْوَهُ»[١].

واتە: ئیبنو عەون دەگێڕێتەوە، لە نافیع، لە ئیبنو عومەر، لە عومەرەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە هەروەکو ئەو فەرموودەی پێشووە.

**٣٥٩٩-** «عَنِ ابْنِ عَوْنٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: أَصَابَ عُمَرُ، أَرْضاً بِخَيْبَرَ، فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: أَصَبْتُ أَرْضاً لَمْ أُصِبْ مَالاً قَطُّ أَنْفَسَ عِنْدِي، فَكَيْفَ تَأْمُرُ بِهِ؟ قَالَ: إِنْ شِئْتَ حَبَّسْتَ أَصْلَهَا وَتَصَدَّقْتَ بِهَا، فَتَصَدَّقَ بِهَا عَلَى أَنْ لَا تُبَاعَ وَلَا تُوهَبَ وَلَا تُورَثَ فِي الْفُقَرَاءِ وَالْقُرْبَى وَالرِّقَابِ، وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالضَّيْفِ وَابْنِ السَّبِيلِ، لَا جُنَاحَ عَلَى مَنْ وَلِيَهَا أَنْ يَأْكُلَ مِنْهَا بِالْمَعْرُوفِ، وَيُطْعِمَ صَدِيقاً غَيْرَ مُتَمَوِّلٍ فِيهِ»[٢].

واتە: ئیبنو عەون دەگێڕێتەوە، لە نافیع، لە ئیبنو عومەرەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: عومەر زەویەکی لە خەیبەر بەرکەوت، هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: زەویەکم بەرکەتووە لە خەیبەر هەرگیز ماڵ و سامانێکم بەر نەکەوتووە لەوە بەنرختر بێت لەلام، چۆن فەرمانم پێدەکەی؟ فەرمووی: ئەگەر ویستت دەیهێڵیتەوە بە وەقف و بەرهەمەکەی دەکەی بە خێر، ئەویش کردی بە خێر بە مەرجێک کە نە بفرۆشرێ و نە ببەخشرێ و نە بکرێ بە میرات، بەرهەمەکەی بەخشی بە هەژاران و خزم و کەسوکارەکان، کۆیلەکان و ئەوانەش جیهاد دەکەن لە پێناوی خواو میوان و کاروانیەکانیش، گوناهیش نیە لەسەر

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧٣٧ و ٢٧٦٤ و ٢٧٧٢ و ٢٧٧٣، ومسلم: ١٦٣٢، وأبو داود: ٢٨٧٨، والترمذي: ١٣٧٥، وإبن ماجه: ٢٣٩٦ و ٢٣٩٧.




**ئەو کەسەی سەرپەرشتی دەکات لێی بخوات، بەڵام بە پێی پێویستی، یاخود لێی بدات بە هاوڕێکەی بەڵام بە ئەندازەی پێویست.**

**٣٦٠٠-** «عَنِ ابْنِ عَوْنٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: أَصَابَ عُمَرُ، أَرْضاً بِخَيْبَرَ، فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَاسْتَأْمَرَهُ فِيهَا، فَقَالَ: إِنِّي أَصَبْتُ أَرْضاً كَثِيراً لَمْ أُصِبْ مَالاً قَطُّ أَنْفَسَ عِنْدِي مِنْهُ، فَمَا تَأْمُرُ فِيهَا؟ قَالَ: إِنْ شِئْتَ حَبَسْتَ أَصْلَهَا وَتَصَدَّقْتَ بِهَا، فَتَصَدَّقَ بِهَا عَلَى أَنَّهُ لَا تُبَاعُ وَلَا تُوهَبُ، فَتَصَدَّقَ بِهَا فِي الْفُقَرَاءِ وَالْقُرْبَى، وَفِي الرِّقَابِ، وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ وَالضَّيْفِ، لَا جُنَاحَ «يَعْنِي» عَلَى مَنْ وَلِيَهَا أَنْ يَأْكُلَ أَوْ يُطْعِمَ صَدِيقاً، غَيْرَ مُتَمَوِّلٍ»[١].

**واتە: ئیبنو عەون دەگێڕێتەوە، لە نافیع، لە ئیبنو عومەرەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: عومەر زەویەکی لە خەیبەر بەرکەوت، هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ داوای کرد فەرمانی پێ بکات لە بارەویەوە، وتی: زەویەکی زۆرم بەرکەتووە هەرگیزماڵێکم بەر نەکەوتووە لەوە بە نرختر بێت لەلام، چۆن فەرمانم پێدەکەی؟ فەرمووی: ئەگەر ویستت زەویەکە دەیهێڵیتەوە بە وەقف و بەرهەمەکەی دەکەی بە خێر، ئەویش کردی بە خێر بە مەرجێ نە بفرۆشرێ و نە ببەخشرێ، بەرهەمەکەی کرد بە خێر بۆ هەژاران و خزم و کەسوکارەکان و کۆیلەکان و ئەوانەش جیهاد دەکەن لە پێناوی خواو میوانەکان، گوناهیش نیە لەسەر ئەو کەسەی سەرپەرشتی دەکات لێی بخوات یاخود لێی بدات بە هاوڕێکەی بەڵام بە ئەندازەی پێویست.**

**٣٦٠١-** «عَنِ ابْنِ عَوْنٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَصَابَ أَرْضاً بِخَيْبَرَ فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ يَسْتَأْمِرُهُ فِي ذَلِكَ، فَقَالَ: إِنْ شِئْتَ حَبَّسْتَ أَصْلَهَا وَتَصَدَّقْتَ بِهَا، فَحَبَّسَ أَصْلَهَا، أَنْ لَا تُبَاعَ، وَلَا تُوهَبَ، وَلَا تُورَثَ، فَتَصَدَّقَ بِهَا عَلَى الْفُقَرَاءِ وَالْقُرْبَى وَالرِّقَابِ، وَفِي الْمَسَاكِينِ، وَابْنِ السَّبِيلِ، وَالضَّيْفِ، لَا جُنَاحَ عَلَى مَنْ وَلِيَهَا أَنْ يَأْكُلَ مِنْهَا بِالْمَعْرُوفِ، أَوْ يُطْعِمَ صَدِيقَهُ غَيْرَ مُتَمَوِّلٍ فِيهِ»[٢].

**واتە: ئیبنو عەون دەگێڕێتەوە، لە نافیع، لە ئیبنو عومەرەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) عومەر زەویەکی لە خەیبەر بەرکەوت، هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ داوای کرد فەرمانی پێ بکات لە بارەویەوە، فەرمووی: ئەگەر ویستت زەویەکە دەیهێڵیتەوە بە وەقف و**

---

**(١) صحيح.**

**(٢) صحيح.**





بەرهەمەكەی دەكەی بە خێر، ئەویش وەقفی كرد نە بفرۆشرێ و نە ببەخشرێ، نە بكرێ بە میرات، بەرهەمەكەی كرد بە خێر بۆ هەژاران و خزم و كەسوكارەكان و كۆیلەكان و بێ نەواكان و ڕێبوارەكان و میوانەكان، گوناهیش نیە لەسەر ئەو كەسەی سەرپەرشتی دەكات لێی بخوات بە چاكی، یاخود لێی بدات بە هاوڕێكەی، بەڵام بە ئەندازەی پێویست.

**٣٦٠٢-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: ﴿لَن تَنَالُواْ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ ﴿٩٢﴾﴾آل عمران، قَالَ أَبُو طَلْحَةَ: إِنَّ رَبَّنَا لَيَسْأَلُنَا عَنْ أَمْوَالِنَا، فَأُشْهِدُكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنِّي قَدْ جَعَلْتُ أَرْضِي لِلَّهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اجْعَلْهَا فِي قَرَابَتِكَ فِي حَسَّانَ بْنِ ثَابِتٍ وَأُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ»[١].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: كاتێ ئەم ئایەتە دابەزیە خوارەوە: ﴿لَن تَنَالُواْ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ ﴿٩٢﴾﴾ (واتە: هەرگیز ناگەن بە چاكەكاریی تا ئەوەی خۆشتان دەوێ لە ماڵ و دارایی نەیبەخشن)، ئەبو طەڵحە وتی: پەروەردگارمان پرسیارمان لێ دەكات لەبارەی ماڵ و دارایمان، من تۆ دەكەم بە شایەت، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، زەویەكەم لە پێناو خوادا بەخشی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بیبەخشە بە كەسوكارت حەسانی كوڕی ثابت و ئوبەی كوڕی كەعب.

## بابەت: وەقف كردنی (الْمَشَاع)

## (واتە: پشكی خۆی لەو ماڵ و سامانانەی كە دابەش نەكراون)

**٣٦٠٣-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ عُمَرُ لِلنَّبِيِّ ﷺ: إِنَّ الْمِائَةَ سَهْمٍ الَّتِي لِي بِخَيْبَرَ لَمْ أُصِبْ مَالاً قَطُّ أَعْجَبَ إِلَيَّ مِنْهَا، قَدْ أَرَدْتُ أَنْ أَتَصَدَّقَ بِهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: احْبِسْ أَصْلَهَا، وَسَبِّلْ ثَمَرَتَهَا»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: عومەر بە پێغەمبەری ﷺ وت: ئەو سەد پارچە زەویەیەی كە پشكی منە لە خەیبەر هیچ ماڵێكم بەدەست نەهێناوە لەوە

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٦١ و ٢٣١٨ و ٢٧٥٢ و ٢٧٥٨ و ٢٧٦٩ و ٤٥٥٤ و ٥٦١١، ومسلم: ٤٢ و ٩٩٨/٤٣، وأبو داود: ١٦٩٨، والترمذي: ٢٩٩٧.

(٢) صحيح.




بە نرختر بێت بەلامەوە، دەمەوێ بیبەخشم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: زەویەكە بكە بە وەقف و بەرهەمەكەی لە پێناوی خوادا ببەخشە.

٣٦٠٤- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: جَاءَ عُمَرُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أَصَبْتُ مَالاً لَمْ أُصِبْ مِثْلَهُ قَطُّ، كَانَ لِي مِائَةُ رَأْسٍ فَاشْتَرَيْتُ بِهَا مِائَةَ سَهْمٍ مِنْ خَيْبَرَ مِنْ أَهْلِهَا، وَإِنِّي قَدْ أَرَدْتُ أَنْ أَتَقَرَّبَ بِهَا إِلَى اللَّهِ ﷻ، قَالَ: فَاحْبِسْ أَصْلَهَا، وَسَبِّلِ الثَّمَرَةَ»[1].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: عومەر هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من ماڵێكم دەستكەوتووە هەرگیز وێنەی ئەوەم دەست نەكەوتووە، سەد سەر (حەیوانم دەستكەوت) سەد پشكی خەیبەرم پێ كڕی لە خەڵكەكەی، وە من ویستم بەو هۆیەوە لە خوا نزیک ببمەوە، فەرمووی: زەویەكە بكە بە وەقف و بەرهەمەكەی لە پێناوی خوادا ببەخشە.

٣٦٠٥- «عَنْ عُمَرَ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ أَرْضٍ لِي بِثَمْغٍ، قَالَ: احْبِسْ أَصْلَهَا، وَسَبِّلْ ثَمَرَتَهَا»[2].

واتە: عومەر ﷺ دەڵێ: پرسیارم كرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ لە بارەی زەویەكمەوە لە (ثَمْغ) (زەویەک بوو لە مەدینە) فەرمووی: (زەویەكە بكە بە وەقف و بەرهەمەكەی لە پێناوی خوادا ببەخشە).

## بابەت: وەقفی مزگەوت

٣٦٠٦- «عَنْ عُمَرَ بْنِ جَاوَانَ، رَجُلٍ مِنْ بَنِي تَمِيمٍ «وَذَاكَ أَنِّي قُلْتُ لَهُ: أَرَأَيْتَ اعْتِزَالَ الْأَحْنَفِ بْنِ قَيْسٍ مَا كَانَ؟» قَالَ: سَمِعْتُ الْأَحْنَفَ، يَقُولُ: أَتَيْتُ الْمَدِينَةَ وَأَنَا حَاجٌّ، فَبَيْنَا نَحْنُ فِي مَنَازِلِنَا، نَضَعُ رِحَالَنَا إِذْ أَتَى آتٍ فَقَالَ: قَدِ اجْتَمَعَ النَّاسُ فِي الْمَسْجِدِ، فَاطَّلَعْتُ فَإِذَا «يَعْنِي» النَّاسَ مُجْتَمِعُونَ، وَإِذَا بَيْنَ أَظْهُرِهِمْ نَفَرٌ قُعُودٌ، فَإِذَا هُوَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ، وَالزُّبَيْرُ، وَطَلْحَةُ، وَسَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ رَحْمَةُ اللَّهِ عَلَيْهِمْ، فَلَمَّا قُمْتُ عَلَيْهِمْ قِيلَ: هَذَا عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ، قَدْ جَاءَ، قَالَ: فَجَاءَ وَعَلَيْهِ مُلَيَّةٌ صَفْرَاءُ، فَقُلْتُ لِصَاحِبِي: كَمَا أَنْتَ حَتَّى أَنْظُرَ مَا جَاءَ بِهِ؟ فَقَالَ عُثْمَانُ: أَهَاهُنَا عَلِيٌّ؟ أَهَاهُنَا الزُّبَيْرُ؟ أَهَاهُنَا طَلْحَةُ؟ أَهَاهُنَا سَعْدٌ؟ قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: فَأَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ الَّذِي لَا إِلَهَ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




إِلَّا هُوَ، أَتَعْلَمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ يَبْتَاعُ مِرْبَدَ بَنِي فُلَانٍ غَفَرَ اللَّهُ لَهُ؟ فَابْتَعْتُهُ، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقُلْتُ: إِنِّي ابْتَعْتُ مِرْبَدَ بَنِي فُلَانٍ، قَالَ: فَاجْعَلْهُ فِي مَسْجِدِنَا وَأَجْرُهُ لَكَ، قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: فَأَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ، هَلْ تَعْلَمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: مَنْ يَبْتَاعُ بِئْرَ رُومَةَ غَفَرَ اللَّهُ لَهُ؟ فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقُلْتُ: قَدْ ابْتَعْتُ بِئْرَ رُومَةَ، قَالَ: فَاجْعَلْهَا سِقَايَةً لِلْمُسْلِمِينَ وَأَجْرُهَا لَكَ، قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: فَأَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ، هَلْ تَعْلَمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ يُجَهِّزُ جَيْشَ الْعُسْرَةِ غَفَرَ اللَّهُ لَهُ؟ فَجَهَّزْتُهُمْ حَتَّى مَا يَفْقِدُونَ عِقَالاً وَلَا خِطَاماً، قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: اللَّهُمَّ اشْهَدْ، اللَّهُمَّ اشْهَدْ، اللَّهُمَّ اشْهَدْ»[1].

واتە: ئەحنەفی كوڕی قەیس دەڵێ: هاتم بۆ مەدینە بە مەبەستی حەج، لە كاتێكدا ئێمە لە ماڵی خۆماندا بووین بارەكانمان دادەنا، كەسێک هات وتی: خەڵكی لە مزگەوتدا كۆبوونەتەوە، كاتێ تەماشام كرد بینیم خەڵكی كۆبوونەتەوە، لە ناویاندا كەسانێک دانیشتبوون، بینیم عەلی و زوبەیرو طەڵحەو سەعدی كوڕی ئەبی وەقاصیان تێدا بوو ڕەحمەتی خوایان لێ بێ، كاتێ هەڵسام بۆ لایان، وترا: ئەوە عوسمانی كوڕی عەفانە هات، وتی: پاشان هات و عەبایەكی زەردی لە سەر شان بوو، بە هاوەڵەكەم وت: هەروەک خۆت بە تا بزانم بۆ چی هاتووە؟ عوسمان وتی: ئایا عەلی لێرەیە؟ ئایا زوبەیر لێرەیە؟ ئایا طەڵحە لێرەیە؟ ئایا سەعد لێرەیە؟ وتیان: بەڵێ، وتی: پرسیارتان لێ دەكەم و سوێندتان دەدەم بەو خوایەی كە هیچ پەرستراوێک نیە بە حەق جگە لەو، ئایا زانیوتانە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: كێ (مِرْبَدَ)ی لەوەڕگای وشترو مەڕومالاتی نەوەكانی فلانەكەس بكڕێ ئەوە خوا ﷻ لێی خۆش بووە؟ منیش كڕیم، جا هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتم: ئەوە من (مِرْبَدَ)ی نەوەكانی فلانە كەسم كڕی، فەرمووی: بیخە مزگەوتەكەمان و پاداشتەكەیشی بۆ تۆیە، وتیان: بەڵێ وایە، وتی: پرسیارتان لێ دەكەم و سوێندتان دەدەم بەو خوایەی كە هیچ پەرستراوێک نیە بە حەق جگە لەو، ئایا زانیوتانە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: كێ بیری (رُومَةَ) بكڕێ ئەوە خوا ﷻ لێی خۆش بووە؟ هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتم: ئەوە من بیری (رُومَةَ)م كڕی، فەرمووی: بیكە شوێنی ئاودانی مسوڵمانان و پاداشتەكەیشی بۆ تۆیە، وتیان: بەڵێ وایە، وتی: پرسیارتان لێ دەكەم و سوێندتان دەدەم بەو خوایەی كە هیچ پەرستراوێک نیە بە حەق جگە لەو، ئایا

---

(١) صحيح.




**زانیوتانە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس سوپای (الْعُسْرَةِ) ئامادە بکات ئەوە خوا ﷻ لێی خۆش بووە؟ منیش بە تەواوی ئامادەم کردن تەنانەت گورێسێک و ڕەشمەی وڵاخێکیشیان پێویست نەبوو، وتیان: بەڵێ وایە، وتی: خوایە تۆ شایەت بە، خوایە تۆ شایەت بە، خوایە تۆ شایەت بە.**

**٣٦٠٧-** «عَنِ الْأَحْنَفِ بْنِ قَيْسٍ قَالَ: خَرَجْنَا حُجَّاجاً فَقَدِمْنَا الْمَدِينَةَ وَنَحْنُ نُرِيدُ الْحَجَّ، فَبَيْنَا نَحْنُ فِي مَنَازِلِنَا نَضَعُ رِحَالَنَا إِذْ أَتَانَا آتٍ فَقَالَ: إِنَّ النَّاسَ قَدِ اجْتَمَعُوا فِي الْمَسْجِدِ وَفَزِعُوا، فَانْطَلَقْنَا فَإِذَا النَّاسُ مُجْتَمِعُونَ عَلَى نَفَرٍ فِي وَسَطِ الْمَسْجِدِ، وَإِذَا عَلِيٌّ، وَالزُّبَيْرُ، وَطَلْحَةُ، وَسَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ، فَإِنَّا لَكَذَلِكَ إِذْ جَاءَ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ، عَلَيْهِ مُلَاءَةٌ صَفْرَاءُ قَدْ قَنَّعَ بِهَا رَأْسَهُ، فَقَالَ: أَهَاهُنَا عَلِيٌّ؟ أَهَاهُنَا طَلْحَةُ؟ أَهَاهُنَا الزُّبَيْرُ؟ أَهَاهُنَا سَعْدٌ؟ قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: فَإِنِّي أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ، أَتَعْلَمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: مَنْ يَبْتَاعُ مِرْبَدَ بَنِي فُلَانٍ غَفَرَ اللَّهُ لَهُ فَابْتَعْتُهُ بِعِشْرِينَ أَلْفاً أَوْ بِخَمْسَةٍ وَعِشْرِينَ أَلْفاً، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَأَخْبَرْتُهُ فَقَالَ: اجْعَلْهَا فِي مَسْجِدِنَا وَأَجْرُهُ لَكَ، قَالُوا: اللَّهُمَّ نَعَمْ، قَالَ: فَأَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ، أَتَعْلَمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: مَنْ يَبْتَاعُ بِئْرَ رُومَةَ غَفَرَ اللَّهُ لَهُ؟ فَابْتَعْتُهُ بِكَذَا وَكَذَا، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقُلْتُ: قَدْ ابْتَعْتُهَا بِكَذَا وَكَذَا، قَالَ: اجْعَلْهَا سِقَايَةً لِلْمُسْلِمِينَ وَأَجْرُهَا لَكَ، قَالُوا: اللَّهُمَّ نَعَمْ، قَالَ: فَأَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ، أَتَعْلَمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَظَرَ فِي وُجُوهِ الْقَوْمِ فَقَالَ: مَنْ جَهَّزَ هَؤُلَاءِ غَفَرَ اللَّهُ لَهُ؟ «يَعْنِي جَيْشَ الْعُسْرَةِ» فَجَهَّزْتُهُمْ حَتَّى مَا يَفْقِدُونَ عِقَالاً وَلَا خِطَاماً، قَالُوا: اللَّهُمَّ نَعَمْ، قَالَ: اللَّهُمَّ اشْهَدْ، اللَّهُمَّ اشْهَدْ»[1].

**واتە: ئەحنەفی کوڕی قەیس دەڵێ: ئێمە دەرچووین بە مەبەستی حەج پاشان گەیشتینە مەدینە، لەکاتێکدا ئێمە لە ماڵی خۆماندا بووین بارەکانمان دادەنا، کەسێک هات وتی: خەڵکی لە مزگەوتدا کۆبوونەتەوە و پەشۆکاون، ئێمەیش دەرچووین بینیمان خەڵکەکە کۆبوونەتەوە لەسەر پیاوێک لە ناوەڕاستی مزگەوتدا، بینیم عەلی و زوبێر و طەڵحەو سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصیان تێدا بوو ڕەحمەتی خوایان لێ بێ، ئێمە بەو شێوە بووین لەناکاو عوسمانی کوڕی عەففان هات عەبایەکی زەردی لەسەر شان بوو، سەری پێ داپۆشیبوو، وتی: ئایا عەلی لێرەیە؟ ئایا طەڵحە لێرەیە؟ ئایا زوبێر لێرەیە؟ ئایا سەعد لێرەیە؟ وتیان: بەڵێ، وتی: پرسیارتان لێ دەکەم و سوێندتان دەدەم بەو خوایەی کە هیچ پەرستراوێک نیە بە حەق جگە لە ئەو، ئایا زانیوتانە پێغەمبەری**

---

**(١) صحیح.**




خوا ﷺ فەرموویەتی: کێ (مِرْبَدَ)ی لەوەڕگای وشترو مەڕومالاَتی نەوەکانی فلاَنە کەس بکڕێ ئەوە خوا ﷻ لێی خۆش بووە؟ ، منیش کڕیم بە بیست هەزار یان بیست و پێنج هەزار، پاشان هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و هەواڵم پێدا: فەرمووی: بیخە مزگەوتەکەمان و پاداشتەکەیشی بۆ تۆیە، وتیان: بەڵێ وایە، وتی: پرسیارتان لێ دەکەم و سوێندتان دەدەم بەو خوایەی کە هیچ پەرستراوێک نیە بە حەق جگە لەو، ئایا زانیوتانە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کێ بیری (رُومَةَ) بکڕێ ئەوە خوا ﷻ لێی خۆش بووە؟ منیش کڕیم بە ئەوەندەو ئەوەندە، هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتم: ئەوە من بیری (رُومَةَ)م کڕی بە ئەوەندەو ئەوەندە، فەرمووی: بیکە شوێنی ئاودانی مسوڵمانان و پاداشتەکەیشی بۆ تۆیە، وتیان: بەڵێ وایە، وتی: پرسیارتان لێ دەکەم و سوێندتان دەدەم بەو خوایەی کە هیچ پەرستراوێک نیە بە حەق جگە لەو، ئایا زانیوتانە پێغەمبەری خوا ﷺ تەماشای ڕوخساری خەڵکەکەی کردو فەرموویەتی: هەرکەس ئەوانەم بۆ ئامادە بکات ئەوە خوا ﷻ لێی خۆش بووە؟، واتە سوپای (الْعُسْرَةِ)، منیش بە تەواوی ئامادەم کردن تەنانەت گوریسێک و ڕەشمەی وڵاخێکیشیان پێویست نەبوو، وتیان: بەڵێ وایە، وتی: خوایە تۆ شایەت بە، خوایە تۆ شایەت بە، خوایە تۆ شایەت بە.

**٣٦٠٨-** «عَنْ ثُمَامَةَ بْنِ حَزْنٍ الْقُشَيْرِيِّ قَالَ: شَهِدْتُ الدَّارَ حِينَ أَشْرَفَ عَلَيْهِمْ عُثْمَانُ ﷺ، فَقَالَ: أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ وَبِالْإِسْلَامِ، هَلْ تَعْلَمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَدِمَ الْمَدِينَةَ وَلَيْسَ بِهَا مَاءٌ يُسْتَعْذَبُ غَيْرَ بِئْرِ رُومَةَ؟ فَقَالَ: مَنْ يَشْتَرِي بِئْرَ رُومَةَ فَيَجْعَلُ فِيهَا دَلْوَهُ مَعَ دِلَاءِ الْمُسْلِمِينَ بِخَيْرٍ لَهُ مِنْهَا فِي الْجَنَّةِ؟ فَاشْتَرَيْتُهَا مِنْ صُلْبِ مَالِي فَجَعَلْتُ دَلْوِي فِيهَا مَعَ دِلَاءِ الْمُسْلِمِينَ، وَأَنْتُمُ الْيَوْمَ تَمْنَعُونِي مِنَ الشُّرْبِ مِنْهَا حَتَّى أَشْرَبَ مِنْ مَاءِ الْبَحْرِ، قَالُوا: اللَّهُمَّ نَعَمْ، قَالَ: فَأَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ وَالْإِسْلَامِ، هَلْ تَعْلَمُونَ أَنِّي جَهَّزْتُ جَيْشَ الْعُسْرَةِ مِنْ مَالِي؟ قَالُوا: اللَّهُمَّ نَعَمْ، قَالَ: فَأَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ وَالْإِسْلَامِ، هَلْ تَعْلَمُونَ أَنَّ الْمَسْجِدَ ضَاقَ بِأَهْلِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ يَشْتَرِي بُقْعَةَ آلِ فُلَانٍ فَيَزِيدُهَا فِي الْمَسْجِدِ بِخَيْرٍ لَهُ مِنْهَا فِي الْجَنَّةِ؟ فَاشْتَرَيْتُهَا مِنْ صُلْبِ مَالِي فَزِدْتُهَا فِي الْمَسْجِدِ، وَأَنْتُمْ تَمْنَعُونِي أَنْ أُصَلِّيَ فِيهِ رَكْعَتَيْنِ، قَالُوا: اللَّهُمَّ نَعَمْ، قَالَ: أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ وَالْإِسْلَامِ، هَلْ تَعْلَمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، كَانَ عَلَى ثَبِيرٍ ثَبِيرِ مَكَّةَ، وَمَعَهُ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ وَأَنَا، فَتَحَرَّكَ الْجَبَلُ فَرَكَضَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِرِجْلِهِ وَقَالَ: اسْكُنْ ثَبِيرُ، فَإِنَّمَا عَلَيْكَ نَبِيٌّ وَصِدِّيقٌ وَشَهِيدَانِ، قَالُوا: اللَّهُمَّ نَعَمْ، قَالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ، شَهِدُوا لِي وَرَبِّ الْكَعْبَةِ- يَعْنِي أَنِّي شَهِيدٌ»[1].

---

(١) صحيح دون قصة «ثَبِيرٌ». أخرجه البخاري: معلقاً ٢٧٧٨، والترمذي: ٣٦٩٩ و ٣٧٠٣.

واتە: ثومامەی کوڕی حەزنی قوشەیری دەڵێ: ئامادە بووم لە ماڵی عوسمان ﷺ کاتێ گەمارۆ درا ڕووی تێکردن، وتی: پرسیارتان لێ دەکەم و سوێندتان دەدەم بە خواو بە ئیسلام ئایا زانیوتانە پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە مەدینە ئاوێکی شیرینی تێدا نەبوو جگە لە بیری (رُومَةَ)؟ فەرمووی: کێ دەیەوێ بیری (رُومَةَ) بکڕێ و سەتڵەکەی خۆی لەگەڵ سەتڵی بڕواداراندا بخاتە ناوی وەکو ئەوان ئاوی لێ بخواتەوە و ببێتە خێر بۆی لە بەهەشتدا؟، منیش لە ماڵ و دارایی خۆم کڕیم، سەتڵی خۆمیش لەگەڵ سەتڵی مسوڵماناندا دانا، ئێوەیش ئەمڕۆ ڕێگریم لێ دەکەن لەو ئاوە بخۆمەوە، تا ئاوی سوێری ڕووبار بخۆمەوە، وتیان: بەڵێ وایە، وتی: سوێندتان دەدەم بە خواو بە ئیسلام ئایا زانیوتانە من سوپای (الْعُسْرَةِ)م لە ماڵ و دارایی خۆم ئامادە کرد؟ وتیان: بەڵێ وایە، وتی: سوێندتان دەدەم بە خواو بە ئیسلام ئایا زانیوتانە مزگەوتەکە تەنگ بوو جێگای خەڵکەکەی تێدا نەدەبوویەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کێ ئەو پارچە زەویەی فڵانە کەس دەکڕێت و دەیخاتە سەر مزگەوتەکە ئەوە دەبێتە خێر بۆی لە بەهەشتدا؟، من لە ماڵ و دارایی خۆم کڕیم و خستمە سەر مزگەوتەکە، ئێوەش ڕێگریم لێ دەکەن دوو ڕکات نوێژی تێدا بکەم، وتیان: بەڵێ وایە، وتی: پرسیارتان لێ دەکەم و سوێندتان دەدەم بە خواو بە ئیسلام ئایا زانیوتانە پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەر کێوێک لە کێوەکانی مەککە بوو بە ناوی (ثَبير)، ئەبو بەکر و عومەرو منی لەگەڵدا بووم، کێوەکە جوڵایەوە بە پێی دایە سەر کێوەکەو فەرمووی: هێمن بە ئەی (ثَبير) بێگومان پێغەمبەرێک و ڕاستگۆیەک و دوو شەهیدت لە سەرە، وتیان: بەڵێ وایە، وتی: (اللَّهُ أَكْبَر) شایەتیان بۆمدا بە پەروەردگاری کەعبە، (واتە: من شەهیدم).

**٣٦٠٩-** «عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ: أَنَّ عُثْمَانَ، أَشْرَفَ عَلَيْهِمْ حِينَ حَصَرُوهُ فَقَالَ: أَنْشُدُ بِاللَّهِ رَجُلاً سَمِعَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ يَوْمَ الْجَبَلِ حِينَ اهْتَزَّ فَرَكَلَهُ بِرِجْلِهِ وَقَالَ: اسْكُنْ فَإِنَّهُ لَيْسَ عَلَيْكَ إِلَّا نَبِيٌّ أَوْ صِدِّيقٌ أَوْ شَهِيدَانِ وَأَنَا مَعَهُ، فَانْتَشَدَ لَهُ رِجَالٌ، ثُمَّ قَالَ: أَنْشُدُ بِاللَّهِ رَجُلاً شَهِدَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ بَيْعَةِ الرِّضْوَانِ يَقُولُ: هَذِهِ يَدُ اللَّهِ وَهَذِهِ يَدُ عُثْمَانَ، فَانْتَشَدَ لَهُ رِجَالٌ، ثُمَّ قَالَ: أَنْشُدُ بِاللَّهِ رَجُلاً سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ جَيْشِ الْعُسْرَةِ، يَقُولُ: مَنْ يُنْفِقُ نَفَقَةً مُتَقَبَّلَةً؟ فَجَهَّزْتُ نِصْفَ الْجَيْشِ مِنْ مَالِي، فَانْتَشَدَ لَهُ رِجَالٌ، ثُمَّ قَالَ: أَنْشُدُ بِاللَّهِ رَجُلاً سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ يَزِيدُ فِي هَذَا الْمَسْجِدِ بِبَيْتٍ فِي الْجَنَّةِ؟ فَاشْتَرَيْتُهُ مِنْ مَالِي، فَانْتَشَدَ لَهُ رِجَالٌ، ثُمَّ قَالَ: أَنْشُدُ بِاللَّهِ رَجُلاً شَهِدَ رُومَةَ تُبَاعُ فَاشْتَرَيْتُهَا مِنْ مَالِي فَأَبَحْتُهَا لِابْنِ السَّبِيلِ، فَانْتَشَدَ لَهُ رِجَالٌ»[1].

---

(١) صحيح لغيره.




واتە: ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمان ﷺ دەگێڕێتەوە، عوسمان کاتێ گەمارۆیاندا چووە سەر بەرزاییەک و وتی: هەرکەسێکتان سوێند دەدەم بە خوا بیستبێتی پێغەمبەری خوا ﷺ لەو ڕۆژەی لەسەر کێوەکە بوو، کاتێ هاتە لەرزین بە قاچەکانی دای بەسەریداو فەرمووی: هێمن بە کەست لەسەر نیە جگە لە پێغەمبەرێک و ڕاستگۆیەک و دوو شەهید، منیش لەگەڵیدا بووم، چەند پیاوێک شایەتیان بۆدا، پاشان وتی: کەسێکتان سوێند دەدەم بەخوا کە لەڕۆژی بەیعەتی (الرِّضْوَانِ)دا ئامادە بووبێ، فەرمووی: ئەمە دەستی خوایەو ئەمەش دەستی عوسمانە، کۆمەڵە پیاوێک شایەتیان بۆدا، پاشان وتی: کەسێکتان سوێند دەدەم بەخوا ﷺ کە لە ڕۆژی سوپای(الْعُسْرَةِ)دا بیستبێتی پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: کێ بەخشینێکی وەرگیراو دەبەخشێ، من نیوەی سوپاکەم ئامادە کرد لە ماڵ و دارایی خۆم، کۆمەڵە پیاوێک شایەتیان بۆدا، پاشان وتی: کەسێکتان سوێند دەدەم بەخوا بیستبێتی پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: کێ ئەم مزگەوتە فراوان دەکات بە ماڵێک لە بەهەشتدا، منیش لە ماڵ و دارایی خۆم کڕیم، کۆمەڵە پیاوێک شایەتیان بۆیدا، پاشان وتی: کەسێک لە ئێوە سوێند دەدەم ئامادەی فرۆشتنی بیری (رُومَةَ) بووبێ، کە من لە ماڵ و دارایی خۆم کڕیم و لە پێناوی خوادا بەخشیم بە ڕێبواران، کۆمەڵە پیاوێک شایەتیان بۆدا.

**٣٦١٠-** «عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ السَّلَمِيِّ ﷺ قَالَ: لَمَّا حُصِرَ عُثْمَانُ، فِي دَارِهِ، اجْتَمَعَ النَّاسُ حَوْلَ دَارِهِ، قَالَ: فَأَشْرَفَ عَلَيْهِمْ، وَسَاقَ الْحَدِيثَ»[1].

واتە: ئەبو عەبدوڕڕەحمانی سەلەمی ﷺ دەڵێ: کاتێ عوسمان گەمارۆ درا لە ماڵەکەی خۆیدا، خەڵکەکە لە دەوری ماڵەکەیدا کۆبوونەوە: وتی: عوسمانیش چووە سەر بەرزاییەک، پاشان فەرموودەکەی هێنا.

---

(١) صحيح لغيره.

## دواخستنی وەسیەت کەراهەتی هەیە

**٣٦١١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ، أَيُّ الصَّدَقَةِ أَعْظَمُ أَجْرًا؟ قَالَ: أَنْ تَصَدَّقَ وَأَنْتَ شَحِيحٌ تَخْشَى الْفَقْرَ وَتَأْمُلُ الْبَقَاءَ، وَلَا تُمْهِلْ حَتَّى إِذَا بَلَغَتِ الْحُلْقُومَ، قُلْتَ: لِفُلَانٍ كَذَا وَقَدْ كَانَ لِفُلَانٍ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەر ﷺ کام خێر کردن لای خوا پاداشتی مەزنی هەیە؟ فەرمووی: کاتێ خێر بکەی لەشت ساغ بێت و لە هەژاری بترسی و ئومێدی مانەوەت هەبێت، خاوە خاو نەکەی تا گیانت دەگاتە قوڕ قوڕاگەت، وتم: ئەوەندە بۆ فڵان و ئەوەندە بۆ فڵان، فڵانیش ئەوەندەی هەبوو.**

**٣٦١٢-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَيُّكُمْ مَالُ وَارِثِهِ أَحَبُّ إِلَيْهِ مِنْ مَالِهِ؟ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا مِنَّا مِنْ أَحَدٍ إِلَّا مَالُهُ أَحَبُّ إِلَيْهِ مِنْ مَالِ وَارِثِهِ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اعْلَمُوا أَنَّهُ لَيْسَ مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا مَالُ وَارِثِهِ أَحَبُّ إِلَيْهِ مِنْ مَالِهِ، مَالُكَ مَا قَدَّمْتَ، وَمَالُ وَارِثِكَ مَا أَخَّرْتَ»[٢].

**واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کێ لە ئێوە ماڵی میراتگرەکەی خۆشەویستترە لای لە ماڵەکەی خۆی؟ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کەسێک نیە لە ئێمە ئیللا ماڵەکەی خۆی خۆشەویستترە لای لە ماڵی میراتگرەکەی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بزانن کەسێک نیە لە ئێوە ئیللا ماڵی میراتگرەکەی خۆشەویستترە لای لە ماڵەکەی خۆی، ماڵی خۆت ئەوەیە پێشت خستووە، وە ماڵی میراتگرەکانت ئەوەیە بە جێی دێڵی.**

**٣٦١٣-** «عَنْ مُطَرِّفٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: ﴿أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ ۝١ حَتَّىٰ زُرْتُمُ ٱلْمَقَابِرَ ۝٢﴾ التكاثر، قَالَ: يَقُولُ ابْنُ آدَمَ: مَالِي مَالِي، وَإِنَّمَا مَالُكَ مَا أَكَلْتَ فَأَفْنَيْتَ، أَوْ لَبِسْتَ فَأَبْلَيْتَ، أَوْ تَصَدَّقْتَ فَأَمْضَيْتَ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٤٤٢.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٩٥٨، والترمذي: ٢٣٤٢ و ٣٣٥٤.




واتە: موطەریف دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ: لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: ﴿أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ ۝١ حَتَّىٰ زُرْتُمُ ٱلْمَقَابِرَ ۝٢﴾ (واتە: شانازیتان بە ماڵ و سامان ئێوەی بێئاگا کردوە ۝١ تا دەمرن و دەچن بۆ گۆڕستان. فەرمووی: نەوەی ئادەم دەڵێ: ماڵەکەم ماڵەکەم، ماڵەکەت ئەوەیە کە خواردوتە و لە ناوت داوە، یان لەبەرت کردوەو دڕاندوتە، یان کردوتە بەخێرو پێشت خستوە.

**٣٦١٤-** «عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَثَلُ الَّذِي يُعْتِقُ أَوْ يَتَصَدَّقُ عِنْدَ مَوْتِهِ مَثَلُ الَّذِي يُهْدِي بَعْدَمَا يَشْبَعُ»(١).

واتە: ئەبو دەرداء ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نموونەی ئەو کەسەی کۆیلە ئازاد دەکات یان ماڵ و دارایی دەبەخشێ لە کاتی مردنیدا، وەکو ئەو کەسە وایە، لە دوای تێر خواردن ببەخشێ.

**٣٦١٥-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَا حَقُّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ لَهُ شَيْءٌ يُوصَى فِيهِ أَنْ يَبِيتَ لَيْلَتَيْنِ، إِلَّا وَوَصِيَّتُهُ مَكْتُوبَةٌ عِنْدَهُ»(٢).

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کەسێکی مسوڵمان شتێکی هەبێت پێویست بێت وەسیەتی پێ بکات، حەق نیە دوو شەو لەسەر یەک بمێنێتەوە، وەسیەتنامەکەی بە نوسراوی لای نەبێت.

**٣٦١٦-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَا حَقُّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ لَهُ شَيْءٌ يُوصَى فِيهِ يَبِيتُ لَيْلَتَيْنِ، إِلَّا وَوَصِيَّتُهُ مَكْتُوبَةٌ عِنْدَهُ»(٣).

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کەسێکی مسوڵمان شتێکی هەبێت پێویست بێت وەسیەتی پێ بکات، حەق نیە دوو شەو لەسەر یەک بمێنێتەوە، وەسیەتنامەکەی بە نوسراوی لای نەبێت.

**٣٦١٧-** «عَنِ ابْنِ عَوْنٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَوْلَهُ»(٤).

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٩٦٨، والترمذي: ٢١٢٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧٣٨، ومسلم: ١٦٢٧، وأبو داود: ٢٨٦٢، والترمذي: ٩٧٤ و ٢١١٨، وإبن ماجه: ٢٦٩٩.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




واتە: ئیبنو عەون دەگێڕێتەوە، لە نافع، لە ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) هەمان فەرموودە.

**٣٦١٨-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: مَا حَقُّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ تَمُرُّ عَلَيْهِ ثَلَاثُ لَيَالٍ، إِلَّا وَعِنْدَهُ وَصِيَّتُهُ، قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ: مَا مَرَّتْ عَلَيَّ مُنْذُ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ ذَلِكَ، إِلَّا وَعِنْدِي وَصِيَّتِي»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: مافی هیچ مسوڵمانێک نیە سێ شەو بمێنێتەوە، وەسیەتنامەکەی بە نوسراوی لای نەبێت، ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: هیچ شەوێکم بەسەردا تێپەڕ نەبووە لەو کاتەوەی کە گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، ئەوەی فەرموو، ئیللا وەسیەتەکەم لەلا بووە.

**٣٦١٩-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَا حَقُّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ لَهُ شَيْءٌ يُوصَى فِيهِ فَيَبِيتُ ثَلَاثَ لَيَالٍ، إِلَّا وَوَصِيَّتُهُ عِنْدَهُ مَكْتُوبَةٌ»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کەسێکی مسوڵمان شتێکی هەبێت پێویست بێت وەسیەتی پێ بکات، حەق نیە سێ شەو لەسەر یەک بمێنێتەوە، وەسیەتنامەکەی بە نوسراوی لای نەبێت.

## ئایا پێغەمبەر ﷺ وەسیەتی کردوە؟

**٣٦٢٠-** «عَنْ طَلْحَةَ قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ أَبِي أَوْفَى ﷺ، أَوْصَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: لَا، قُلْتُ: كَيْفَ كَتَبَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ الْوَصِيَّةَ؟ قَالَ: أَوْصَى بِكِتَابِ اللَّهِ»[٣].

واتە: طەڵحە دەڵێ: پرسیارم لە ئیبنو ئەبی ئەوفا ﷺ کرد، ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ وەسیەتی کرد؟ وتی: نەخێر، وتم: چۆن نوسراوی وەسیەتی بۆ مسوڵمانان کرد؟ وتی: وسیەتی بۆ کردن بە (پابەندبوون بە) کتێبی خوا.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧٤٠ و ٤٤٦٠ و ٥٠٢٢، ومسلم: ١٦٣٤، والترمذي: ٢١١٩، وإبن ماجه: ٢٦٩٦.




**٣٦٢١-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: مَا تَرَكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ دِينَاراً وَلَا دِرْهَماً وَلَا شَاةً وَلَا بَعِيراً، وَلَا أَوْصَى بِشَيْءٍ»[1].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هیچی بەجێ نەهێشت، نە دینار و نە درهەم و نە مەڕو نە وشتر، وەسیەتیشی نەکرد بە هیچ.**

**٣٦٢٢-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: مَا تَرَكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ دِرْهَماً وَلَا دِينَاراً وَلَا شَاةً وَلَا بَعِيراً، وَمَا أَوْصَى»[2].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هیچی بەجێ نەهێشت، نە دینار و نە درهەم و نە مەڕو نە وشتر، وەسیەتیشی نەکرد.**

**٣٦٢٣-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: مَا تَرَكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ دِرْهَماً وَلَا دِينَاراً وَلَا شَاةً وَلَا بَعِيراً، وَلَا أَوْصَى»[3].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هیچی بەجێ نەهێشت، نە درهەم و نە دینار و نە مەڕو نە وشتر، وەسیەتیشی نەکرد بە هیچ.**

**٣٦٢٤-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: يَقُولُونَ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَوْصَى إِلَى عَلِيٍّ، لَقَدْ دَعَا بِالطَّسْتِ لِيَبُولَ فِيهَا، فَانْخَنَثَتْ نَفْسُهُ ﷺ وَمَا أَشْعُرُ، فَإِلَى مَنْ أَوْصَى»[4].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: دەڵێن پێغەمبەری خوا ﷺ عەلی ڕاسپاردو داوای هێنانی تەشتی کرد بۆ ئەوەی میزی تێ بکات پاڵی دایەوەو خاو بوویەوە، هەست ناکەم هیچ کەسێکی ڕاسپاردبێت (بۆ ئەم کارە).**

**٣٦٢٥-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَلَيْسَ عِنْدَهُ أَحَدٌ غَيْرِي، قَالَتْ: وَدَعَا بِالطَّسْتِ»[5].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٣٥، وأبو داود: ٢٨٦٣، وإبن ماجه: ٢٦٩٥.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧٤١ و ٤٤٥٩، ومسلم: ١٦٣٦، وإبن ماجه: ١٦٢٦.

(٥) صحيح.

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد کەسی لەلا نەبوو جگە لە من، وتی: داوای تەشتی کرد.

## بابەت: وەسیەت کردن بە سێ یەک

**٣٦٢٦-** «عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ رضي الله عنه قَالَ: مَرِضْتُ مَرَضاً أَشْفَيْتُ مِنْهُ، فَأَتَانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَعُودُنِي، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ لِي مَالاً كَثِيراً، وَلَيْسَ يَرِثُنِي إِلَّا ابْنَتِي، أَفَأَتَصَدَّقُ بِثُلُثَيْ مَالِي؟ قَالَ: لَا، قُلْتُ: فَالشَّطْرَ؟ قَالَ: لَا، قُلْتُ: فَالثُّلُثَ؟ قَالَ: الثُّلُثَ، وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ، إِنَّكَ أَنْ تَتْرُكَ وَرَثَتَكَ أَغْنِيَاءَ خَيْرٌ لَهُمْ مِنْ أَنْ تَتْرُكَهُمْ عَالَةً يَتَكَفَّفُونَ النَّاسَ»[١].

واتە: عامری کوڕی سەعد، لە باوکیەوە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە، دەڵێ: نەخۆش کەوتم بە نەخۆشیەک چاک بوومەوە لێی، پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لام سەردانی کردم، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من ماڵ و داراییەکی زۆرم هەیە، کەس نیە میراتم لێ ببات جگە لە کچێکم نەبێت، ئایا دەتوانم دوو لەسەر سێی ماڵەکەم بکەم بە خێر؟ (واتە: لە سێ بەش دوو بەشی بکەم بەخێر)، فەرمووی: نەخێر، وتم: ئەی نیوەی؟ فەرمووی: نەخێر، وتم: ئەی سێ یەک؟ (واتە: بیکەم بە سێ بەشەوەو یەک بەشیان بکەم بە خێر)، فەرمووی: سێ یەکیش زۆرە، تۆ ئەگەر منداڵەکانت بە دەوڵەمەندی بە جێبهێڵیت چاکترە لەوەی بە هەژاری بەجێیان بهێڵیت دەست لە خەڵک پان بکەنەوە.

**٣٦٢٧-** «عَنْ سَعْدٍ رضي الله عنه قَالَ: جَاءَنِي النَّبِيُّ ﷺ يَعُودُنِي وَأَنَا بِمَكَّةَ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أُوصِي بِمَالِي كُلِّهِ؟ قَالَ: لَا، قُلْتُ: فَالشَّطْرَ؟ قَالَ: لَا، قُلْتُ: فَالثُّلُثَ؟ قَالَ: الثُّلُثُ، وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ، إِنَّكَ أَنْ تَدَعَ وَرَثَتَكَ أَغْنِيَاءَ خَيْرٌ مِنْ أَنْ تَدَعَهُمْ عَالَةً يَتَكَفَّفُونَ النَّاسَ، يَتَكَفَّفُونَ فِي أَيْدِيهِمْ»[٢].

واتە: سەعد رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هات بۆ سەردانیم من لە مەککە بووم، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەسیەت دەکەم بە هەموو ماڵەکەم؟ فەرمووی: نەخێر، وتم: ئەی نیوەی؟ فەرمووی: نەخێر، وتم: ئەی سێ یەکی (واتە: بیکەم بە سێ بەشەوەو یەک بەشیان بکەم بە خێر)؟ فەرمووی: سێ یەک، سێ یەکیش زۆرە، تۆ ئەگەر

---

(١) صحیح.

(٢) صحیح.




**منداڵەکانت بە دەوڵەمەندی بە جێبێڵیت چاکترە لەوەی بە هەژاری بەجێیان بێڵیت دەست لە خەڵک پان بکەنەوە.**

**٣٦٢٨-** «عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ ﵁ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَعُودُهُ وَهُوَ بِمَكَّةَ، وَهُوَ يَكْرَهُ أَنْ يَمُوتَ بِالْأَرْضِ الَّذِي هَاجَرَ مِنْهَا، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: رَحِمَ اللَّهُ سَعْدَ ابْنَ عَفْرَاءَ أَوْ يَرْحَمُ اللَّهُ سَعْدَ ابْنَ عَفْرَاءَ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ إِلَّا ابْنَةٌ وَاحِدَةٌ، قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أُوصِي بِمَالِي كُلِّهِ؟ قَالَ: لَا، قُلْتُ: النِّصْفَ، قَالَ: لَا، قُلْتُ: فَالثُّلُثَ، قَالَ: الثُّلُثَ، وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ، إِنَّكَ أَنْ تَدَعَ وَرَثَتَكَ أَغْنِيَاءَ خَيْرٌ مِنْ أَنْ تَدَعَهُمْ عَالَةً يَتَكَفَّفُونَ النَّاسَ مَا فِي أَيْدِيهِمْ»[1].

**واتە: عامری کوڕی سەعد، لە باوکیەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە مەککە سەردانی کرد، حەزی نەدەکرد لەسەر ئەو زەوییە بمرێ کە هیجرەتی کردوە لێی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ڕەحمەتی خوا لە سەعدی کوڕی عەفراء منداڵی نەبوو جگە لە کچێک نەبێت، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەسیەت دەکەم بە هەموو ماڵەکەم؟ فەرمووی: نەخێر، وتم: ئەی نیوەی؟ فەرمووی: نەخێر، وتم: ئەی سێ یەکی (واتە: بیکەم بە سێ بەشەوەو یەک بەشیان بکەم بە خێر)؟ فەرمووی: سێ یەک، سێ یەکیش زۆرە، تۆ ئەگەر منداڵەکانت بە دەوڵەمەندی بە جێبهێڵیت چاکترە لەوەی بە هەژاری بەجێیان بهێڵیت دەست لە خەڵک پان بکەنەوە.**

**٣٦٢٩-** «عَنْ سَعْدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنِي بَعْضُ آلِ سَعْدٍ قَالَ: مَرِضَ سَعْدٌ ﵁، فَدَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أُوصِي بِمَالِي كُلِّهِ؟ قَالَ: لَا، وَسَاقَ الْحَدِيثَ»[2].

**واتە: سەعدی کوڕی ئیبڕاهیم دەڵێ: یەکێک لە کەسوکاری سەعد بۆی باسکردم وتی: سەعد ﵁ نەخۆش کەوت، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەوە بۆ لای، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، وەسیەت دەکەم بە هەموو ماڵەکەم؟ فەرمووی: نەخێر، فەرموودەکەی هێنا.**

**٣٦٣٠-** «عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ ﵁: أَنَّهُ اشْتَكَى بِمَكَّةَ فَجَاءَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَلَمَّا رَآهُ سَعْدٌ بَكَى وَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَمُوتُ بِالْأَرْضِ الَّتِي هَاجَرْتُ مِنْهَا، قَالَ: لَا إِنْ شَاءَ اللَّهُ، وَقَالَ: يَا رَسُولَ

---

**(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٦ و ١٢٩٥ و ٢٧٤٢ و ٣٩٣٦ و ٤٤٠٩ و ٥٣٥٤ و ٥٦٦٨ و ٦٣٧٣ و ٦٧٣٣، ومسلم: ٥ و ١٦٢٨/٩، وأبو داود: ٢٨٦٤، والترمذي: ٢١١٦، وإبن ماجه: ٢٧٠٨.**

**(٢) صحيح.**

اللَّهِ، أُوصِي بِمَالِي كُلِّهِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ؟ قَالَ: لَا، قَالَ: يَعْنِي بِثُلُثَيْهِ؟ قَالَ: لَا، قَالَ: فَنِصْفَهُ، قَالَ: لَا، قَالَ: فَثُلُثَهُ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الثُّلُثَ، وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ، إِنَّكَ أَنْ تَتْرُكَ بَنِيكَ أَغْنِيَاءَ خَيْرٌ مِنْ أَنْ تَتْرُكَهُمْ عَالَةً يَتَكَفَّفُونَ النَّاسَ»[١].

**واتە: عامری کوڕی سەعد، لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو لە مەککە نەخۆش کەوت، پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لای، کاتێ سەعد بینی گریا، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، لە زەویەکدا دەمرم کۆچم کردوە لێی، فەرمووی: نەخێر، ئەگەر خوا ویستی لەسەر بێت، وتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەسیەت دەکەم هەموو ماڵەکەم لە پێناو خوا ﷻ ببەخشم؟ فەرمووی: نەخێر،، وتی: دوو لەسەر سێی؟ فەرمووی: نەخێر، وتی: ئەی نیوەی؟ فەرمووی: نەخێر، وتی: ئەی سێیەکی؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (سێیەک، سێیەکیش زۆرە، تۆ ئەگەر منداڵەکانت بە دەوڵەمەندی بە جێبێڵیت چاکترە لەوەی بە هەژاری بەجێیان بێڵیت، دەست لە خەڵک پان بکەنەوە.**

**٣٦٣١-** «عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ قَالَ: عَادَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي مَرَضِي، فَقَالَ: أَوْصَيْتَ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: بِكَمْ؟ قُلْتُ: بِمَالِي كُلِّهِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، قَالَ: فَمَا تَرَكْتَ لِوَلَدِكَ؟ قُلْتُ: هُمْ أَغْنِيَاءُ، قَالَ: أَوْصِ بِالْعُشْرِ، فَمَا زَالَ يَقُولُ وَأَقُولُ حَتَّى قَالَ: أَوْصِ بِالثُّلُثِ، وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ أَوْ كَبِيرٌ»[٢].

**واتە: سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لام لە نەخۆشیەکەمدا، فەرمووی: وەسیەتت کردوە. وتم: بەڵێ، فەرمووی: بەچەند؟ وتم: بە هەموو ماڵەکەم لە پێناوی خوا، فەرمووی: چیت بۆ منداڵەکەت بەجێ هێشت؟ وتم: ئەوان دەوڵەمەندن، فەرمووی: وەسیەت بکە بە دە یەک، بەردەوام ئەو دەیفەرموو منیش دەموت، تا فەرمووی: وەسیەت بکە بە سێیەک، سێیەکیش زۆرە، یان (بڕێکی) گەورەیە.**

**٣٦٣٢-** «عَنْ سَعْدٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ عَادَهُ فِي مَرَضِهِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أُوصِي بِمَالِي كُلِّهِ؟ قَالَ: لَا، قَالَ: فَالشَّطْرَ؟ قَالَ: لَا، قَالَ: فَالثُّلُثَ؟ قَالَ: الثُّلُثَ، وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ أَوْ كَبِيرٌ»[٣].

**واتە: سەعد ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ هات سەردانی کرد کاتێ نەخۆش بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، وەسیەت دەکەم بە هەموو ماڵەکەم لە پێناو**

---

(١) صحيح.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح.




خوادا، فەرمووی: نەخێر، وتی: ئەی نیوەی؟ فەرمووی: نەخێر، وتی: ئەی سێیەکی؟ فەرمووی: سێیەک، سێیەکیش زۆرە، یان گەورەیە.

**٣٦٣٣-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَتَى سَعْداً يَعُودُهُ، فَقَالَ لَهُ سَعْدٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أُوصِي بِثُلُثَيْ مَالِي؟ قَالَ: لَا، قَالَ: فَأُوصِي بِالنِّصْفِ؟ قَالَ: لَا، قَالَ: فَأُوصِي بِالثُّلُثِ؟ قَالَ: نَعَمْ، الثُّلُثَ، وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ، أَوْ كَبِيرٌ، إِنَّكَ أَنْ تَدَعَ وَرَثَتَكَ أَغْنِيَاءَ خَيْرٌ مِنْ أَنْ تَدَعَهُمْ فُقَرَاءَ يَتَكَفَّفُونَ»[1].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لای سەعد سەردانی کرد، سەعد پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، وەسیەت دەکەم بە دوو لەسەر سێی ماڵەکەم؟ فەرمووی: نەخێر، وتی: وەسیەت دەکەم بە نیوەی؟ فەرمووی: نەخێر، وتی: وەسیەت دەکەم سێیەکی؟ فەرمووی: بەڵێ، سێیەک، سێیەکیش زۆرە، یان گەورەیە، تۆ ئەگەر منداڵەکانت بە دەوڵەمەندی بە جێبهێڵیت چاکترە لەوەی بە هەژاری بەجێیان بهێڵیت دەست لە خەڵک پان بکەنەوە.

**٣٦٣٤-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: لَوْ غَضَّ النَّاسُ إِلَى الرُّبُعِ لِأَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: الثُّلُثَ، وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ أَوْ كَبِيرٌ»[2].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: خۆزگە خەڵکی وەسیەتیان لە سێیەکەوە کەم بکردایەتەوە بۆ چوار یەک، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سێیەک، سێیەکیش زۆرە، یان گەورەیە.

**٣٦٣٥-** «عَنْ سَعْدِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ جَاءَهُ وَهُوَ مَرِيضٌ، فَقَالَ: إِنَّهُ لَيْسَ لِي وَلَدٌ إِلَّا ابْنَةٌ وَاحِدَةٌ، فَأُوصِي بِمَالِي كُلِّهِ؟ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: لَا، قَالَ: فَأُوصِي بِنِصْفِهِ؟ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: لَا، قَالَ: فَأُوصِي بِثُلُثِهِ؟ قَالَ: الثُّلُثَ، وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ»[3].

واتە: سەعدی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لای نەخۆش بوو، وتی: من تەنها یەک کچم هەیە، وەسیەت دەکەم بە هەموو ماڵەکەم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەخێر، وتی: وەسیەت دەکەم بە نیوەی؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەخێر، وتی: وەسیەت دەکەم بە سێیەکی؟ فەرمووی: سێیەک، سێیەکیش زۆرە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧٤٣، ومسلم: ١٦٢٩، وإبن ماجه: ٢٧١١.

(٣) صحيح.




**٣٦٣٦-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ أَبَاهُ اسْتُشْهِدَ يَوْمَ أُحُدٍ وَتَرَكَ سِتَّ بَنَاتٍ وَتَرَكَ عَلَيْهِ دَيْناً، فَلَمَّا حَضَرَ جِدَادُ النَّخْلِ أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقُلْتُ: قَدْ عَلِمْتَ أَنَّ وَالِدِي اسْتُشْهِدَ يَوْمَ أُحُدٍ وَتَرَكَ دَيْناً كَثِيراً، وَإِنِّي أُحِبُّ أَنْ يَرَاكَ الْغُرَمَاءُ. قَالَ: اذْهَبْ فَبَيْدِرْ كُلَّ تَمْرٍ عَلَى نَاحِيَةٍ، فَفَعَلْتُ ثُمَّ دَعَوْتُهُ، فَلَمَّا نَظَرُوا إِلَيْهِ كَأَنَّمَا أُغْرُوا بِي تِلْكَ السَّاعَةَ، فَلَمَّا رَأَى مَا يَصْنَعُونَ أَطَافَ حَوْلَ أَعْظَمِهَا بَيْدَراً ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ جَلَسَ عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: ادْعُ أَصْحَابَكَ، فَمَا زَالَ يَكِيلُ لَهُمْ حَتَّى أَدَّى اللَّهُ أَمَانَةَ وَالِدِي، وَأَنَا رَاضٍ أَنْ يُؤَدِّيَ اللَّهُ أَمَانَةَ وَالِدِي لَمْ تَنْقُصْ تَمْرَةً وَاحِدَةً»[1].

**واته: جابری کوڕی عەبدوڵلا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، باوکی شەهید کرا لە ڕۆژی ئوحود شەش کچی بەجێهێشت و قەرزاریش بوو، کاتێ خورما هاتە بەرهەم، هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، وتم: بێگومان زانیوتە باوکم لە جەنگی ئوحوددا شەهید بوو، قەرزێکی زۆریشی بەجێهێشت، من حەز دەکەم قەرزارەکان بتبینن (بەڵکو هاوکاریم بکەن)، فەرمووی: بڕۆ هەموو خورماکان لە جێگایەکدا کەڵەکە بکە، ئەوەم کرد پاشان بانگم کرد، کاتێ پێغەمبەریان بینی تەماشایان کرد پێداگریان کرد لێم، (گومانی ئەوەیان برد داوای چاوپۆشیان لێ دەکات) کاتێ بینی چی دەکەن بە دەوری خورماکاندا سێ جار سوڕایەوە، پاشان لەسەری دانیشت، پاشان فەرمووی: بانگی هاوەڵەکانت بکە، بەردەوام بۆیانی پێوانە دەکرد تا هەموو قەرزەکەی باوکمی دایەوە، زۆر ڕازی بووم خوا قەرزەکانی باوکمی لەسەرم لابرد، تەنانەت یەک خورماش کەمی نەکرد.**

## بابەت: دەرکردنی قەرز پێش میرات، هەروەها باسی جیاوازی وتەی ئەوانەی فەرموودەکەی جابریان گێڕاوەتەوە

**٣٦٣٧-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ: أَنَّ أَبَاهُ تُوُفِّيَ وَعَلَيْهِ دَيْنٌ، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أَبِي تُوُفِّيَ وَعَلَيْهِ دَيْنٌ، وَلَمْ يَتْرُكْ إِلَّا مَا يُخْرِجُ نَخْلُهُ، وَلَا يَبْلُغُ مَا يُخْرِجُ نَخْلُهُ مَا عَلَيْهِ مِنَ الدَّيْنِ دُونَ سِنِينَ، فَانْطَلِقْ مَعِي يَا رَسُولَ اللَّهِ لِكَيْ لَا يُفْحِشَ عَلَيَّ الْغُرَّامُ، فَأَتَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدُورُ بَيْدَراً بَيْدَراً فَسَلَّمَ حَوْلَهُ وَدَعَا لَهُ ثُمَّ جَلَسَ عَلَيْهِ، وَدَعَا الْغُرَّامَ فَأَوْفَاهُمْ، وَبَقِيَ مِثْلُ مَا أَخَذُوا»[2].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٢٧ و ٢٣٩٥ و ٢٣٩٦ و ٢٤٠٥ و ٢٦٠١ و ٢٧٠٩ و ٢٧٨١ و ٣٥٨٠، وأبو داود: ٢٨٨٤، وابن ماجه: ٢٤٣٤.

(٢) صحيح.




واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: باوکی کۆچی دوایی کرد و قەرزار بوو، ئینجا هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، باوکم کۆچی دوایی کرد و قەرزی لەسەر بوو، هیچی بەجێ نەهێشت بەرهەمی دارخورماکان نەبێ، بەرهەمی دارخورماکانیشی ئەوەندە نیە قەرزەکەی بۆ ببژێرێ، لەگەڵم بێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بەڵکو خاوەن قەرزەکان هەڵە نەکەن بەرانبەرم، پێغەمبەر ﷺ هات بە دەوری کەڵکە خورماکاندا دەسوڕایەوەو سڵاوی کرد لە دەوروبەری و نزای بۆی کرد، پاشان لەسەری دانیشت، ئینجا بانگی خاوەن قەرزەکانی کرد، مافی خۆیانی پێدان، چەندیان برد ئەوەندە مایەوە.

**٣٦٣٨-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: تُوُفِّيَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرِو بْنِ حَرَامٍ قَالَ: وَتَرَكَ دَيْناً فَاسْتَشْفَعْتُ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَلَى غُرَمَائِهِ أَنْ يَضَعُوا مِنْ دَيْنِهِ شَيْئاً، فَطَلَبَ إِلَيْهِمْ فَأَبَوْا، فَقَالَ لِي النَّبِيُّ ﷺ: اذْهَبْ فَصَنِّفْ تَمْرَكَ أَصْنَافاً، الْعَجْوَةَ عَلَى حِدَةٍ، وَعِذْقَ ابْنِ زَيْدٍ عَلَى حِدَةٍ، وَأَصْنَافَهُ ثُمَّ ابْعَثْ إِلَيَّ، قَالَ: فَفَعَلْتُ، فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَجَلَسَ فِي أَعْلَاهُ أَوْ فِي أَوْسَطِهِ، ثُمَّ قَالَ: كِلْ لِلْقَوْمِ، قَالَ: فَكِلْتُ لَهُمْ حَتَّى أَوْفَيْتُهُمْ، ثُمَّ بَقِيَ تَمْرِي كَأَنْ لَمْ يَنْقُصْ مِنْهُ شَيْءٌ»[1].

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی حەرام کۆچی دوایی کردو قەرزی لە دوای خۆی بەجێهێشت، منیش داوام کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ قسە لەگەڵ خاوەن قەرزەکاندا بکات لە بەشێک لە قەرزەکەیان خۆش بن، ئەویش داوای لێ کردن بەڵام ئەوان ملیان نەدا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: برۆ خورماکەت بکە بە چەند بەشێکەوە، خورمای (الْعَجْوَةَ) بە جیا دابنێ، وە خورمای (عِذْقَ ابْنِ زَيْدٍ) بە جیا دابنێ، وە جۆرەکانی دیکەیشی پاشان بانگم بکە، وتی: منیش ئەوەم کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ هات لە سەرووی یان لە نێوەڕاستی دانیشت، پاشان فەرمووی: پێوانە بکە بۆ خەڵکەکە، وتی: پێوانەم بۆ کردن تا هەمووم پێ دانەوە، پاشان خورماکەم وەکو خۆی مایەوە هیچ شتێکی لێ کەم نەبوویەوە.

**٣٦٣٩-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَ لِيَهُودِيٍّ عَلَى أَبِي تَمْرٌ، فَقُتِلَ يَوْمَ أُحُدٍ وَتَرَكَ حَدِيقَتَيْنِ، وَتَمْرُ الْيَهُودِيِّ يَسْتَوْعِبُ مَا فِي الْحَدِيقَتَيْنِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: هَلْ لَكَ أَنْ تَأْخُذَ الْعَامَ نِصْفَهُ وَتُؤَخِّرَ نِصْفَهُ؟ فَأَبَى الْيَهُودِيُّ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: هَلْ لَكَ أَنْ تَأْخُذَ الْجِدَادَ؟ فَآذِنِّي

---

(١) صحيح.




فَآذَنْتُهُ، فَجَاءَ هُوَ وَأَبُو بَكْرٍ فَجَعَلَ يُجَدُّ وَيُكَالُ مِنْ أَسْفَلِ النَّخْلِ، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدْعُو بِالْبَرَكَةِ حَتَّى وَفَيْنَاهُ جَمِيعَ حَقِّهِ مِنْ أَصْغَرِ الْحَدِيقَتَيْنِ «فِيمَا يَحْسِبُ عَمَّارٌ» ثُمَّ أَتَيْتُهُمْ بِرُطَبٍ وَمَاءٍ فَأَكَلُوا وَشَرِبُوا، ثُمَّ قَالَ: هَذَا مِنَ النَّعِيمِ الَّذِي تُسْأَلُونَ عَنْهُ»[1].

**واته: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: جولەکەکان خورمایان بە لای باوکمەوە بوو، جا لە جەنگی ئوحوددا کوژرا و دوو باخی لە دوای خۆی بەجێهێشت، خورمای جولەکەکانیش بە گوێرەی ئەو دوو باخە دەبوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا دەتوانی ئەمساڵ نیوەی ببەیت و ساڵێکی دیکەش نیوەی؟، جولەکەکان ڕازی نەبوون، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا دەتەوێ بەرووبوومەکەی بۆ خۆت ببەی؟ داوای مۆڵەتی لێ کردم منیش مۆڵەتم پێدا، پاشان خۆی و ئەبو بەکر هاتن لە خواری خورماکەوە دەیانپێوا، پێغەمبەری خواش ﷺ نزای بەرەکەتی بۆ کردن هەتا هەموو قەرزەکەمان پێ دایەوە لە بچوکترین ئەو دوو باخچەیە «لەوەی عەمار دەیژمارد»، پاشان خورمای تەڕو ئاوم بۆ هێنان لێیان خواردو خواردیانەوە، پاشان فەرمووی: ئەمە لەو نیعمەتانەیە کە لەسەری لێپرسینەوەتان لێ دەکرێ.**

**٣٦٤٠-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: تُوُفِّيَ أَبِي وَعَلَيْهِ دَيْنٌ، فَعَرَضْتُ عَلَى غُرَمَائِهِ أَنْ يَأْخُذُوا الثَّمَرَةَ بِمَا عَلَيْهِ فَأَبَوْا، وَلَمْ يَرَوْا فِيهِ وَفَاءً، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ، قَالَ: إِذَا جَدَدْتَهُ فَوَضَعْتَهُ فِي الْمِرْبَدِ فَآذِنِّي، فَلَمَّا جَدَدْتُهُ وَوَضَعْتُهُ فِي الْمِرْبَدِ أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَجَاءَ وَمَعَهُ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، فَجَلَسَ عَلَيْهِ وَدَعَا بِالْبَرَكَةِ، ثُمَّ قَالَ: ادْعُ غُرَمَاءَكَ فَأَوْفِهِمْ، قَالَ: فَمَا تَرَكْتُ أَحَداً لَهُ عَلَى أَبِي دَيْنٌ إِلَّا قَضَيْتُهُ، وَفَضَلَ لِي ثَلَاثَةَ عَشَرَ وَسْقاً، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ فَضَحِكَ وَقَالَ: ائْتِ أَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ، فَأَخْبِرْهُمَا ذَلِكَ، فَأَتَيْتُ أَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ فَأَخْبَرْتُهُمَا، فَقَالَا: قَدْ عَلِمْنَا إِذْ صَنَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَا صَنَعَ أَنَّهُ سَيَكُونُ ذَلِكَ»[2].

**واته: جابر کوڕی عوبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: باوکم کۆچی دوایی کرد قەرزی لەسەر بوو، بە خاوەن قەرزەکانم وت: هەرچی بەرهەمی ئەو باخە هەیە لە بڕی قەرزەکە ببەن، بەڵام ئەوان ڕازی نەبوون، پێیان وابوو ئەوە بە ئەندازەی قەرزەکەیان نابێت، هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەم بۆی باس کرد، فەرمووی:**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




**ئەگەر بەرهەمەکەت بڕی و لە شوێنی تایبەت کۆت کردەوە، ئاگادارم بکەرەوە، کاتێ بەرهەمەکەم بڕی و لە شوێنی تایبەت دامنا، هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، پاشان هات ئەبو بەکرو عومەریشی لەگەڵ بوو، لەسەری دانیشت و نزای بەرەکەتی بۆ کرد، پاشان فەرمووی: (بانگی قەرزارەکانت بکەو پێیان بدەرەوە، وتی: هەرکەس قەرزی لەسەر باوکم بوو پێمدایەوە، سیازدە بارم بۆ مایەوە، ئەوەم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس کرد پێکەنی، فەرمووی: بچۆ بۆ لای ئەبو بەکرو عومەر هەواڵی ئەوەیان پێبدە، منیش هاتم بۆ لای ئەبو بەکرو عومەر هەواڵم پێدان، وتیان: ئێمە زانیمان ئەوەی پێغەمبەر ﷺ کردی وا دەبێ.**

## بابەت: پووچکردنەوەی وەسیەت بۆ میراتگر

**٣٦٤١-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ خَارِجَةَ ﵁ قَالَ: خَطَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَعْطَى كُلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ، وَلَا وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ»[١].

**واتە: عەمرى كوڕى خارجە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەرى خوا ﷺ وتاريدا فەرمووى: خوا مافى هەموو خاوەن مافێكى داوە، وەسيەت نيە بۆ ميراتگر.**

**٣٦٤٢-** «عَنِ ابْنِ خَارِجَةَ ﵁، أَنَّهُ شَهِدَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ النَّاسَ عَلَى رَاحِلَتِهِ، وَإِنَّهَا لَتَقْصَعُ بِجَرَّتِهَا، وَإِنَّ لُعَابَهَا لَيَسِيلُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي خُطْبَتِهِ: إِنَّ اللَّهَ قَدْ قَسَّمَ لِكُلِّ إِنْسَانٍ قِسْمَهُ مِنَ الْمِيرَاثِ، فَلَا تَجُوزُ لِوَارِثٍ وَصِيَّةٌ»[٢].

**واتە: ئيبنو خاريجە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەرى خوا ﷺ لە سەر وشترەكەى وتارى بۆ خەڵكى دەدا، وشترەكەيشى كاوێژى دەكردو ليكى لێ دەچۆڕا، پێغەمبەرى خوا ﷺ لە وتارەكەيدا فەرمووى: بەڕاستى خوا ﷻ بۆ هەموو مرۆڤێك بەشێكى داناوە لە ميراتدا، بۆيە دروست نيە، ميراتگر وەسيەت بكات.**

**٣٦٤٣-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ خَارِجَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ اللَّهَ عَزَّ اسْمُهُ قَدْ أَعْطَى كُلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ، وَلَا وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢١٢١، وإبن ماجه: ٢٧١٢.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




واتە: عەمڕی کوڕی خارجە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا ناوی هەمیشە بەرزو بڵندە مافی هەموو خاوەن مافێکی داوە، وەسیەت نیە بۆ میراتگر.

## بابەت: ئەگەر وەسیەتی کرد بۆ خزم و کەسە نزیکەکانی

**٣٦٤٤-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ ﴾الشعراء، دَعَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قُرَيْشاً فَاجْتَمَعُوا، فَعَمَّ وَخَصَّ، فَقَالَ: يَا بَنِي كَعْبِ بْنِ لُؤَيٍّ، يَا بَنِي مُرَّةَ بْنِ كَعْبٍ، يَا بَنِي عَبْدِ شَمْسٍ، وَيَا بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ، وَيَا بَنِي هَاشِمٍ، وَيَا بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، أَنْقِذُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ النَّارِ، وَيَا فَاطِمَةُ أَنْقِذِي نَفْسَكِ مِنَ النَّارِ، إِنِّي لَا أَمْلِكُ لَكُمْ مِنَ اللَّهِ شَيْئاً غَيْرَ أَنَّ لَكُمْ رَحِماً سَأَبُلُّهَا بِبِلَالِهَا»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: کاتێ ئایەتی: ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ ﴾الشعراء (واتە: خزم و کەسە نزیکەکانت بترسێنە)، دابەزی، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی قورەیشی کرد کۆبوونەوە، گشتاندی و تایبەتی کرد، فەرمووی: ئەی نەوەی کەعبی کوڕی لوئەی، ئەی نەوەی موڕڕەی کوڕی کەعب، ئەی نەوەی عەبدوشەمس، ئەی نەوەی هاشم، ئەی نەوەی عەبدولموطەڵیب، گیانی خۆتان ڕزگار بکەن لە ئاگر، ئەی فاطیمە گیانی خۆت ڕزگار بکە لە ئاگر، من هیچ شتێکم بە دەست نیە لای خوا بۆتان ئەوە نەبێ پەیوەندیەکی خزمایەتی هەیە من لە دونیادا نایپچڕێنم.

**٣٦٤٥-** «عَنْ مُوسَى بْنِ طَلْحَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَا بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ، اشْتَرُوا أَنْفُسَكُمْ مِنْ رَبِّكُمْ، إِنِّي لَا أَمْلِكُ لَكُمْ مِنَ اللَّهِ شَيْئاً، يَا بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ اشْتَرُوا أَنْفُسَكُمْ مِنْ رَبِّكُمْ، إِنِّي لَا أَمْلِكُ لَكُمْ مِنَ اللَّهِ شَيْئاً، وَلَكِنْ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ رَحِمٌ أَنَا بَالُّهَا بِبِلَالِهَا»[٢].

واتە: موسای کوڕی طەڵحە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی نەوەی عەبدومەناف نەفس و گیانی خۆتان بکڕن لە پەروەردگارتان، من لای خوا هیچ شتێکم بە دەست نیە بۆتان، ئەی نەوەی عەبدولموطەڵیب، نەفس و گیانی خۆتان بکڕن لە پەروەردگارتان، من لای خوا هیچ شتێکم بە دەست نیە بۆتان، بەڵام لە نێوانی من و ئێوەدا خزمایەتیەک هەیە لە دونیادا من درێژەی پێ دەدەم.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧٥٣ بنحوه، ومسلم: ٢٠٤، والترمذي: ٣١٨٥.

(٢) صحيح لغيره.




**٣٦٤٦-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حِينَ أُنْزِلَ عَلَيْهِ: ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ ﴾الشعراء، قَالَ: يَا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ اشْتَرُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ اللَّهِ، لَا أُغْنِي عَنْكُمْ مِنَ اللَّهِ شَيْئاً، يَا بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، لَا أُغْنِي عَنْكُمْ مِنَ اللَّهِ شَيْئاً، يَا عَبَّاسُ بْنَ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، لَا أُغْنِي عَنْكَ مِنَ اللَّهِ شَيْئاً، يَا صَفِيَّةُ عَمَّةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، لَا أُغْنِي عَنْكِ مِنَ اللَّهِ شَيْئاً، يَا فَاطِمَةُ بِنْتَ مُحَمَّدٍ، سَلِينِي مَا شِئْتِ، لَا أُغْنِي عَنْكِ مِنَ اللَّهِ شَيْئاً»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: کاتێ: ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ ﴾ (واتە: خزم و کەسە نزیکەکانت بترسێنە)، دابەزی بۆ سەری، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی کۆمەڵی قورەیش، نەفسی خۆتان بکڕنەوە، چونکە من لای خوا هیچم بە دەست نیە بۆتان، ئەی نەوەی عەبدولموطەڵیب، من لای خوا هیچم بە دەست نیە بۆتان، ئەی عەبباسی کوڕی عەبدولموطەڵیب، من لای خوا هیچم بە دەست نیە بۆت، ئەی صەفیەی پوری پێغەمبەری خوا ﷺ، من لای خوا هیچم بەدەست نیە بۆت، ئەی فاطیمەی کچی موحەممەد داوای چیم لێ دەکەی بیکە، من لای خوا هیچم بەدەست نیە بۆت.**

**٣٦٤٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حِينَ أُنْزِلَ عَلَيْهِ: ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ ﴾الشعراء، فَقَالَ: يَا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ، اشْتَرُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ اللَّهِ، لَا أُغْنِي عَنْكُمْ مِنَ اللَّهِ شَيْئاً، يَا بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ، لَا أُغْنِي عَنْكُمْ مِنَ اللَّهِ شَيْئاً، يَا عَبَّاسُ بْنَ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، لَا أُغْنِي عَنْكَ مِنَ اللَّهِ شَيْئاً، يَا صَفِيَّةُ عَمَّةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، لَا أُغْنِي عَنْكِ مِنَ اللَّهِ شَيْئاً، يَا فَاطِمَةُ، سَلِينِي مَا شِئْتِ لَا أُغْنِي عَنْكِ مِنَ اللَّهِ شَيْئاً»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: کاتێ: ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ ﴾ (واتە: خزم و کەسە نزیکەکانت بترسێنە)، دابەزی بۆ سەری، پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسایەوە سەر پێ و، فەرمووی: ئەی کۆمەڵی قورەیش، نەفسی خۆتان بکڕنەوە لە خوا، چونکە من لای خوا هیچم بە دەست نیە بۆتان، ئەی نەوەی عەبدولمەناف نەفس و گیانی خۆتان بکڕنەوە لە پەروەردگارتان، من لای خوا هیچ شتێکم بە دەست نیە بۆتان، ئەی عەبباسی کوڕی عەبدولموطەڵیب، من لای خوا هیچم بە دەست نیە بۆت، ئەی**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧٥٣ و ٣٥٢٧ و ٤٧٧١، ومسلم: ٣٥١ و ٢٠٦/٣٥٢.

(٢) صحيح.



**صەفیەی پوری پێغەمبەری خوا ﷺ، من لای خوا هیچم بە دەست نیە بۆت، ئەی فاطیمەی کچی موحەممەد داوای چیم لێ دەکەی بیکە، من لای خوا هیچم بە دەست نیە بۆت.**

**٣٦٤٨-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ ﴾الشعراء، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَا فَاطِمَةُ ابْنَةَ مُحَمَّدٍ، يَا صَفِيَّةُ بِنْتَ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، يَا بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، لَا أُغْنِي عَنْكُمْ مِنَ اللَّهِ شَيْئاً، سَلُونِي مِنْ مَالِي مَا شِئْتُمْ»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: کاتێ ئایەتی: ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ ﴾ (واتە: خزم و کەسە نزیکەکانت بترسێنە)، دابەزی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی فاطیمەی کچی موحەممەد، ئەی صەفیەی کچی عەبدولموطەڵیب، ئەی نەوەکانی عەبدولموطەڵیب، من هیچ شتێکم بە دەست نیە لای خوا بۆتان، داوای چیم لێدەکەن لە ماڵ و سانم داوا بکەن.**

## ئەگەر لە ناکاو کۆچی دوایی کرد، ئایا دروستە بۆ کەسوکارەکەی لە جیاتی ئەو خێر بکەن

**٣٦٤٩-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّ رَجُلاً قَالَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ أُمِّي افْتُلِتَتْ نَفْسُهَا، وَإِنَّهَا لَوْ تَكَلَّمَتْ تَصَدَّقَتْ، أَفَأَتَصَدَّقُ عَنْهَا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: نَعَمْ، فَتَصَدَّقَ عَنْهَا»[٢].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پیاوێک بە پێغەمبەری خوا ﷺ وت: دایکم لە ناکاو گیانی لە دەستدا، ئەو ئەگەر قسەی بکردایە خێری دەکرد، ئایا خێری بۆ بکەم؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ، ئەویش لە جیاتی دایکی خێری کرد.**

**٣٦٥٠-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: خَرَجَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي بَعْضِ مَغَازِيهِ، وَحَضَرَتْ أُمَّهُ الْوَفَاةُ بِالْمَدِينَةِ، فَقِيلَ لَهَا: أَوْصِي، فَقَالَتْ: فِيمَ أُوصِي؟ الْمَالُ مَالُ سَعْدٍ، فَتُوُفِّيَتْ قَبْلَ أَنْ يَقْدَمَ سَعْدٌ، فَلَمَّا قَدِمَ سَعْدٌ ذُكِرَ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَلْ يَنْفَعُهَا أَنْ أَتَصَدَّقَ عَنْهَا؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: نَعَمْ، فَقَالَ سَعْدٌ: حَائِطُ كَذَا وَكَذَا صَدَقَةٌ عَنْهَا، لِحَائِطٍ سَمَّاهُ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٠٥، والترمذي: ٢٣١٠ و ٣١٨٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧٦٠، ومسلم: ١٠٠٤، وأبو داود: ٢٨٨١، وإبن ماجه: ٢٧١٧.

(٣) ضعيف.




**واتە: سەعیدی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادە دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: سەعدی کوڕی عوبادە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەرچوو لە هەندێ لە غەزاکاندا، دایکیشی لە مەدینە کەوتە سەرەمەرگەوە، پێی وترا: وەسیەت بکە، وتی: بە چی وەسیەت بکەم؟ ماڵەکە ماڵی سەعدە، کۆچی دوایی کرد پێش ئەوەی سەعد بگەڕێتەوە، کاتێ سەعد گەڕایەوە ئەوەی بۆ باس کرا، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئایا من خێری بۆ بکەم سوودی پێ دەگەیەنێ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ، سەعد وتی: فڵان باخچەو فڵانە باخچەم کردە خێر بۆ ئەو، بە باخچەیەک ناوی برد.**

## فەزڵ و گەورەیی بەخشین بۆ مردوو

**٣٦٥١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِذَا مَاتَ الْإِنْسَانُ انْقَطَعَ عَمَلُهُ إِلَّا مِنْ ثَلَاثَةٍ: مِنْ صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ، وَعِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ، وَوَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ»(١).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر مرۆڤ مرد کردەوەکانی دەپچڕێ جگە لە سێ کردەوە نەبێ: خێرێکی بەردەوام، زانستێ سوود بگەیەنێ، یان منداڵێکی چاک نزای بۆ بکات.**

**٣٦٥٢-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَجُلاً قَالَ لِلنَّبِيِّ ﷺ: إِنَّ أَبِي مَاتَ وَتَرَكَ مَالاً وَلَمْ يُوصِ، فَهَلْ يُكَفِّرُ عَنْهُ أَنْ أَتَصَدَّقَ عَنْهُ؟ قَالَ: نَعَمْ»(٢).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پیاوێک بە پێغەمبەری ﷺ وت: من باوکم مردو ماڵ و سامانیشی بەجێهێشت، هیچ وەسیەتی نەکرد، ئایا ئەگەر خێرو بەخشینی بۆ بکەم دەبێتە کەفارەتی؟ فەرمووی: بەڵێ.**

**٣٦٥٣-** «عَنِ الشَّرِيدِ بْنِ سُوَيْدٍ الثَّقَفِيِّ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقُلْتُ: إِنَّ أُمِّي أَوْصَتْ أَنْ تُعْتَقَ عَنْهَا رَقَبَةٌ، وَإِنَّ عِنْدِي جَارِيَةً نُوبِيَّةً أَفَيُجْزِئُ عَنِّي أَنْ أُعْتِقَهَا عَنْهَا؟ قَالَ: ائْتِنِي بِهَا، فَأَتَيْتُهُ بِهَا، فَقَالَ لَهَا النَّبِيُّ ﷺ: مَنْ رَبُّكِ؟ قَالَتْ: اللَّهُ، قَالَ: مَنْ أَنَا؟ قَالَتْ: أَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ، قَالَ: فَأَعْتِقْهَا فَإِنَّهَا مُؤْمِنَةٌ»(٣).

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٣١، وأبو داود: ٢٨٨٠، والترمذي: ١٣٧٦.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٣٠، وابن ماجه: ٢٧١٦.

(٣) حسن. أخرجه أبو داود: ٣٢٨٣.




واتە: شەریدی کوڕی سوەیدی ئەقەفی ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وتم: دایکم وەسیەتی کردوە کۆیلەیەکی لە جیاتی ئازاد بکرێ، منیش کەنیزەکێکی (نُوبِيَّة)م لەلایە، ئایا دروستە بۆم لە بری ئەودا ئازادی بکەم؟ فەرمووی: بۆمی بهێنە، منیش بۆم هێنا، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: کێ پەروەردگارتە؟ وتی: خوا، فەرمووی: من کێم؟ وتی: تۆ پێغەمبەری خوای ﷺ، فەرمووی: ئازادی بکە ئەوە بڕوادارە.

**٣٦٥٤-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ سَعْداً سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ: إِنَّ أُمِّي مَاتَتْ وَلَمْ تُوصِ، أَفَأَتَصَدَّقُ عَنْهَا؟ قَالَ: نَعَمْ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: سەعد پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ: دایکم کۆچی دوایی کرد و وەسیەتی نەکرد، ئایا خێرو صەدەقەی بۆ بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ

**٣٦٥٥-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أُمَّهُ تُوُفِّيَتْ أَفَيَنْفَعُهَا إِنْ تَصَدَّقْتُ عَنْهَا؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَإِنَّ لِي مَخْرَفاً فَأُشْهِدُكَ أَنِّي قَدْ تَصَدَّقْتُ بِهِ عَنْهَا»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پیاوێک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، دایکم کۆچی دوایی کردوە، ئایا سوودی پێدەگەیەنێ من خێری بۆ بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ، وتی: باخێکی دار خورمام هەیە تۆ دەکەم بە شایەت کردم بە خێرو صەدەقە بۆی.

**٣٦٥٦-** «عَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ ﷺ: أَنَّهُ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: إِنَّ أُمِّي مَاتَتْ وَعَلَيْهَا نَذْرٌ، أَفَيُجْزِئُ عَنْهَا أَنْ أُعْتِقَ عَنْهَا؟ قَالَ: أَعْتِقْ عَنْ أُمِّكَ»[٣].

واتە: سەعدی کوڕی عوبادە ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: دایکم کۆچی دوایی کردو نەزریشی لەسەر بوو، ئایا دروستە لە جیاتی ئەو کۆیلەیەک ئازاد بکەم؟ فەرمووی: ئازادی بکە لە جیاتی دایکت.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧٥٦ و ٢٧٦٢، وأبو داود: ٢٨٨٢، والترمذي: ٦٦٩.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح لغيره.

**٣٦٥٧-** «عَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ ﷺ: أَنَّهُ اسْتَفْتَى النَّبِيَّ ﷺ فِي نَذْرٍ كَانَ عَلَى أُمِّهِ، فَتُوُفِّيَتْ قَبْلَ أَنْ تَقْضِيَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اقْضِهِ عَنْهَا»(١).

**واتە: سەعدی کوڕی عوبادە ﷺ دەگێڕێتەوە: پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ لەبارەی نەزرێکەوە لەسەر دایکی پێویست بوو بوو، دایکی کۆچی کرد پێش ئەوەی نەزرەکە جێبەجێ بکات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە جیاتی جێبەجێی بکە.**

**٣٦٥٨-** «عَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ ﷺ: أَنَّهُ اسْتَفْتَى النَّبِيَّ ﷺ فِي نَذْرٍ كَانَ عَلَى أُمِّهِ، فَمَاتَتْ قَبْلَ أَنْ تَقْضِيَهُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اقْضِهِ عَنْهَا»(٢).

**واتە: سەعدی کوڕی عوبادە ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ لەبارەی نەزرێکەوە لەسەر دایکی پێویست بوو بوو، دایکی کۆچی کرد پێش ئەوەی نەزرەکە جێبەجێ بکات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لە جیاتی جێبەجێی بکە.**

**٣٦٥٩-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: اسْتَفْتَى سَعْدٌ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي نَذْرٍ كَانَ عَلَى أُمِّهِ، فَتُوُفِّيَتْ قَبْلَ أَنْ تَقْضِيَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اقْضِهِ عَنْهَا»(٣).

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: سەعد پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی نەزرێکەوە لەسەر دایکی پێویست بوو بوو، دایکی کۆچی کرد پێش ئەوەی نەزرەکە جێبەجێ بکات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لە جیاتی جێبەجێی بکە.**

## باسی جیاوازی لەسەر سوفیان (لە فەرموودەکەدا)

**٣٦٦٠-** «عَنِ سُفْيَانَ عن الزُّهْرِيِّ عن عُبَيْدِ اللَّهِ بن عبد اللَّهِ عن ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ اسْتَفْتَى النَّبِيَّ ﷺ فِي نَذْرٍ كَانَ عَلَى أُمِّهِ، فَتُوُفِّيَتْ قَبْلَ أَنْ تَقْضِيَهُ؟ فَقَالَ: اقْضِهِ عَنْهَا»(٤).

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




**واتە: سوفیان دەگێڕێتەوە لە زوهری، لە عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵا، لە ئیبنو عەبباسەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، سەعدی کوڕی عوبادە پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد لەبارەی نەزرێکەوە لەسەر دایکی پێویست بوو بوو، دایکی کۆچی کرد پێش ئەوەی نەزرەکە جێبەجێ بکات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە جیاتی جێبەجێی بکە.**

**٣٦٦١-** «عَنِ سُفْيَان عن الزُّهْرِيِّ عن عُبَيْدِ اللَّهِ بن عبد اللَّهِ عن ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: مَاتَتْ أُمِّي وَعَلَيْهَا نَذْرٌ، فَسَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ، فَأَمَرَنِي أَنْ أَقْضِيَهُ عَنْهَا»[١].

**واتە: سوفیان دەگێڕێتەوە: لە زوهری لە عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵا، لە ئیبنو عەبباسەوە (خوا لێیان ڕازی بێ)، سەعد ﷺ وتی: دایکم مرد نەزریشی لەسەر بوو، پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد، فەرمانی پێ کردم لە جیاتی ئەو جێبەجێی بکەم.**

**٣٦٦٢-** «عَنِ اللَّيْثِ عن الزُّهْرِيِّ عن عُبَيْدِ اللَّهِ بن عَبْد اللَّهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: اسْتَفْتَى سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ الْأَنْصَارِيُّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي نَذْرٍ كَانَ عَلَى أُمِّهِ، فَتُوُفِّيَتْ قَبْلَ أَنْ تَقْضِيَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اقْضِهِ عَنْهَا»[٢].

**واتە: لەیث دەگێڕێتەوە، لە زوهری لە عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵا، لە ئیبنو عەبباسەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: سەعدی کوڕی عوبادەی ئەنصاڕی پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد لەبارەی نەزرێکەوە لەسەر دایکی بوو، کۆچی دوایی کرد پێش ئەوەی نەزرەکەی بکات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لە جیاتی ئەو نەزرەکە جێبەجێ بکە.**

**٣٦٦٣-** «عَنِ بَكْرِ بن وَائِلٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنِ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْد اللَّهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: جَاءَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: إِنَّ أُمِّي مَاتَتْ وَعَلَيْهَا نَذْرٌ وَلَمْ تَقْضِهِ؟ قَالَ: اقْضِهِ عَنْهَا»[٣].

**واتە: بەکری کوڕی وائیل دەگێڕێتەوە، لە زوهری لە عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵا، لە ئیبنو عەبباسەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: سەعدی کوڕی عوبادە هات بۆ لای**

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




**پێغەمبەر ﷺ وتی: دایکم کۆچی دوایی کردووەو نەزری لەسەر بوو، جێبەجێی نەکرد؟ فەرمووی: لە جیاتی ئەو جێبەجێی بکە.**

**٣٦٦٤-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أُمِّي مَاتَتْ أَفَأَتَصَدَّقُ عَنْهَا؟ قَالَ: نَعَمْ، قُلْتُ: فَأَيُّ الصَّدَقَةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: سَقْيُ الْمَاءِ»[1].

**واتە: سەعیدی کوڕی موسەییب دەگێڕێتەوە، لە سەعدی کوڕی عوبادەوە ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، دایکم کۆچی دوایی کردوە ئایا دەتوانم خێری بۆ بکەم، فەرمووی: بەڵێ، وتم: چی خێرو بەخشینێ چاکترینە؟ فەرمووی: بەخشینەوەی ئاو.**

**٣٦٦٥-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُّ الصَّدَقَةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: سَقْيُ الْمَاءِ»[2].

**واتە: سەعیدی کوڕی موسەییب دەگێڕێتەوە، لە سەعدی کوڕی عوبادەوە ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، چی خێرو بەخشینێ چاکترینە؟ فەرمووی: بەخشینەوەی ئاو.**

**٣٦٦٦-** «عَنِ الحَسَنِ، عَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ ﷺ: أَنَّ أُمَّهُ مَاتَتْ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أُمِّي مَاتَتْ، أَفَأَتَصَدَّقُ عَنْهَا؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَأَيُّ الصَّدَقَةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: سَقْيُ الْمَاءِ فَتِلْكَ سِقَايَةُ سَعْدٍ بِالْمَدِينَةِ»[3].

**واتە: حەسەن دەگێڕێتەوە، لە سەعدی کوڕی عوبادەوە ﷺ دەڵێ: دایکی کۆچی دوایی کرد، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، دایکم مردوە، ئایا خێرو بەخشینی بۆ بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ، وتی: چی بەخشینێک چاکترینە، فەرمووی: بەخشینەوەی ئاو، ئەوە هۆی ئاوبەخشینەوەی سەعد بوو لە مەدینە.**

---

(١) حسن. أخرجه إبن ماجه: ٣٦٨٤.

(٢) حسن لغيره.

(٣) حسن لغيره.

## قەدەغەکردنی سەرپەرشتیاری لەسەر ماڵی هەتیو

**٣٦٦٧-** «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَا أَبَا ذَرٍّ، إِنِّي أَرَاكَ ضَعِيفاً، وَإِنِّي أُحِبُّ لَكَ مَا أُحِبُّ لِنَفْسِي، لَا تَأَمَّرَنَّ عَلَى اثْنَيْنِ، وَلَا تَوَلَّيَنَّ عَلَى مَالِ يَتِيمٍ»[١].

**واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: ئەی ئەبو زەر، من دەبینم لاوازی، من ئەوەی بۆ خۆم پێم خۆشە بەهەمان شێوە بۆ تۆش پێم خۆشە، لێپرسراوێتی دوو کەس مەکە، سەرپەرشتیاری ماڵی هەتیویش مەکە.**

## ئەو کەسەی بەخێوکەری هەتیوێکە چی بۆ هەیە لە ماڵی هەتیوەکە؟

**٣٦٦٨-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ: أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: إِنِّي فَقِيرٌ لَيْسَ لِي شَيْءٌ وَلِي يَتِيمٌ، قَالَ: كُلْ مِنْ مَالِ يَتِيمِكَ غَيْرَ مُسْرِفٍ وَلَا مُبَاذِرٍ وَلَا مُتَأَثِّلٍ»[٢].

**واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، لە باپیرەیەوە ﷺ: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: من هەژارم هیچم نیە و هەتیویشم لایە، فەرمووی: لە ماڵی هەتیوەکە بخۆ بەبێ زیادەڕەوی و دەست بڵاوی، وە بەبێ ئەوەی بۆخۆتی هەڵبگری.**

**٣٦٦٩-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: ﴿وَلَا تَقْرَبُوا۟ مَالَ ٱلْيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ﴿١٥٢﴾﴾ الأنعام، و: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلْيَتَـٰمَىٰ ظُلْمًا ﴿١٠﴾﴾ النساء، قَالَ: اجْتَنَبَ النَّاسُ مَالَ الْيَتِيمِ وَطَعَامَهُ، فَشَقَّ ذَلِكَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ، فَشَكَوْا ذَلِكَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْيَتَـٰمَىٰ ۖ قُلْ إِصْلَاحٌ لَّهُمْ خَيْرٌ ﴿٢٢٠﴾﴾ البقرة إِلَى قَوْلِهِ: ﴿لَأَعْنَتَكُمْ ﴿٢٢٠﴾﴾ البقرة»[٣].

**واتە: ئیبنو عەباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی:** ﴿وَلَا تَقْرَبُوا۟ مَالَ ٱلْيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ﴿١٥٢﴾﴾ **(واتە: نزیکی ماڵی هەتیوان مەکەونەوە**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٨٢٦، وأبو داود: ٢٨٦٨.

(٢) حسن صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٨٧٢، وإبن ماجه: ٢٧١٨.

(٣) حسن. أخرجه أبو داود: ٢٨٧١.




مەگەر بە جوانترین و چاکترین شێوە) وە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ أَمۡوَٰلَ ٱلۡيَتَٰمَىٰ ظُلۡمًا ۝١٠﴾ (واتە: بەڕاستی ئەوانەی ماڵ و سامانی هەتیوان دەخۆن بە ستەم)، وتی: خەڵک دورکەوتنەوە لە ماڵ و خواردنی هەتیوو، ئەوە قورس بوو لەسەر مسوڵمانان، سکاڵایان برد بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، پاشان خوا ﷻ ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡيَتَٰمَىٰۖ قُلۡ إِصۡلَاحٞ لَّهُمۡ خَيۡرٞ ۝٢٢٠﴾ (واتە: پرسیارت لێ دەکەن لەبارەی هەتیوان بڵێ: چاکسازی تێکەڵاوی کردن بۆ ئەوان چاکترە)، تا فەرمایشتی: ﴿لَأَعۡنَتَكُمۡ ۝٢٢٠﴾.

**٣٦٧٠-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: فِي قَوْلِهِ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ أَمۡوَٰلَ ٱلۡيَتَٰمَىٰ ظُلۡمًا ۝١٠﴾ النساء، قَالَ: كَانَ يَكُونُ فِي حَجْرِ الرَّجُلِ الْيَتِيمُ، فَيَعْزِلُ لَهُ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ وَآنِيَتَهُ، فَشَقَّ ذَلِكَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ: ﴿وَإِن تُخَالِطُوهُمۡ فَإِخۡوَٰنُكُمۡ ۝٢٢٠﴾البقرة، فِي الدِّينِ فَأَحَلَّ لَهُمْ خُلْطَتَهُمْ»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) لەبارەی فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ أَمۡوَٰلَ ٱلۡيَتَٰمَىٰ ظُلۡمًا ۝١٠﴾ دەڵێ: کەسێک هەتیوی لا بوایە خواردن و خواردنەوە و قاپ و قاچاغی لێ جیادەکردەوە، ئەوە لەسەر مسوڵمانان گران بوو، خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَإِن تُخَالِطُوهُمۡ فَإِخۡوَٰنُكُمۡ ۝٢٢٠﴾ (واتە: ئەگەر تێکەڵ ببن لەگەڵیاندا (قەیناکات ئەوانە) براتانن.

## دوورکەوتنەوە لە خواردنی ماڵ و سامانی هەتیو

**٣٦٧١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: اجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ، قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا هِيَ؟ قَالَ: الشِّرْكُ بِاللَّهِ، وَالشُّحُّ، وَقَتْلُ النَّفْسِ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ، وَأَكْلُ الرِّبَا، وَأَكْلُ مَالِ الْيَتِيمِ، وَالتَّوَلِّي يَوْمَ الزَّحْفِ، وَقَذْفُ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دور بکەونەوە لە حەوت ڕەنج بەزایە دەرەکە و خۆتان بپارێزن، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوە چیە، فەرمووی: هاوبەش دانان بۆ خوا، ڕەزیلی، کوشتنی ئەو گیانەی کە خوا قەدەغەی کردوە مەگەر بە حەقی خۆی، خواردنی ڕیبا، خواردنی ماڵی هەتیو، پشت کردن لە دوژمن لە جەنگدا، تۆمەتبار کردنی ئافرەتی داوێن پاکی ئیمانداری بێ ئاگا.

---

(١) حسن.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧٦٦ و ٥٧٦٤ و ٦٨٥٧، ومسلم: ٨٩، وأبو داود: ٢٨٧٤.




## باسی جیاوازی دەربڕینەکانی ئەوانەی فەرموودەکەی نوعمانی کوڕی بەشیریان گواستوەتەوە لە بارەی بەخشینەوە

**٣٦٧٢-** «عَنِ حُمَيْدِ بن عَبْد الرَّحْمَن، وَمُحَمَّد بْن النُّعْمَانِ، عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ: أَنَّ أَبَاهُ نَحَلَهُ غُلَاماً، فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ يُشْهِدُهُ، فَقَالَ: أَكُلَّ وَلَدِكَ نَحَلْتَ؟، قَالَ: لَا، قَالَ: فَارْدُدْهُ»[1].

**واتە: حومەیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمان و موحەممەدی کوڕی نوعمان دەگێڕنەوە، لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە ﷺ دەڵێ: باوکی خزمەتکارێکی پێ بەخشی، هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ کردی بە شایەت، فەرمووی: ئایا بە هەموو منداڵەکانت بەخشیوە؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: بیگەڕێنەوە (واتە: دادگەر بە لە نێوان منداڵەکانت).**

**٣٦٧٣-** «عَنِ حُمَيْدِ بن عَبْد الرَّحْمَن، وَمُحَمَّد بْن النُّعْمَانِ يُحَدِّثَانِهِ عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ: أَنَّ أَبَاهُ أَتَى بِهِ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: إِنِّي نَحَلْتُ ابْنِي غُلَاماً كَانَ لِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَكُلَّ وَلَدِكَ نَحَلْتَهُ؟، قَالَ: لَا، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: فَارْجِعْهُ»[2].

**واتە: حومەیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمان و موحەممەدی کوڕی نوعمان دەگێڕنەوە، لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، باوکی هێنای بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: من خزمەتکارێکی خۆمم بەخشیوە بە منداڵەکەم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا بە هەموو منداڵەکانت بەخشیوە؟ وتی: نەخێر، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بیگەڕێنەوە.**

**٣٦٧٤-** «عَنِ حُمَيْدِ بن عَبْد الرَّحْمَن، وَمُحَمَّد بْن النُّعْمَانِ عن النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ: أَنَّ أَبَاهُ بَشِيرَ بْنَ سَعْدٍ جَاءَ بِابْنِهِ النُّعْمَانِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي نَحَلْتُ ابْنِي هَذَا غُلَاماً كَانَ لِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَكُلَّ بَنِيكَ نَحَلْتَ؟ قَالَ: لَا، قَالَ: فَارْجِعْهُ»[3].

**واتە: حومەیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمان و موحەممەدی کوڕی نوعمان دەگێڕنەوە، لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، باوکی بەشیری کوڕی سەعد، نوعمانی کوڕی هێنا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من خزمەتکارێکم بەم منداڵەی خۆم**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٥٨٦، ومسلم: ٩ و ١٦٢٣/١١، والترمذي: ١٣٦٧، وإبن ماجه: ٢٣٧٦.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




**بەخشیوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا بە هەموو منداڵەکانت بەخشیوە؟ وتی: نەخێر، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بیگەڕێنەوە.**

**٣٦٧٥-** «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ النُّعْمَانِ وَحُمَيْدَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ بَشِيرِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ: أَنَّهُ جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ بِالنُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ فَقَالَ: إِنِّي نَحَلْتُ ابْنِي هَذَا غُلَاماً فَإِنْ رَأَيْتَ أَنْ تُنْفِذَهُ أَنْفَذْتُهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَكُلَّ بَنِيكَ نَحَلْتَهُ؟ قَالَ: لَا، قَالَ: فَارْدُدْهُ»[١].

**واتە: مەحەممەدی کوڕی نوعمان و حومەیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمان دەگێڕنەوە، لە بەشیری کوڕی سەعدەوە ﷺ، ئەو هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ نوعمانی کوڕی بەشیری لەگەڵ خۆی هێنا و وتی: ئەی پێغەمبەر ﷺ من خزمەتکارێکم بەم منداڵەی خۆم بەخشیوە، ئەگەر پێت وایە جێ بەجێی بکەم جێ بە جێی دەکەم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (ئایا بە هەموو منداڵەکانت بەخشیوە)؟ وتی: نەخێر، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بیگەڕێنەوە.**

**٣٦٧٦-** «عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ: أَنَّ أَبَاهُ نَحَلَهُ نُحْلاً، فَقَالَتْ لَهُ أُمُّهُ: أَشْهِدِ النَّبِيَّ ﷺ عَلَى مَا نَحَلْتَ ابْنِي، فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، فَكَرِهَ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يَشْهَدَ لَهُ»[٢].

**واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دەڵێ: باوکی دیاریەکی پێ بەخشی، دایکی پێی وت: پێغەمبەر ﷺ بکە بە شاهید لەسەر ئەو دیاریەی بەخشیوتە بە منداڵەکەم، ئەویش هات بۆ لای پێغەمبەرو بۆی باس کرد، پێغەمبەر ﷺ پێی ناخۆش بوو ئاگادار بکرێتەوە بۆ ئەو شتە.**

**٣٦٧٧-** «عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ بَشِيرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّهُ نَحَلَ ابْنَهُ غُلَاماً، فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ، فَأَرَادَ أَنْ يُشْهِدَ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: أَكُلَّ وَلَدِكَ نَحَلْتَهُ مِثْلَ ذَا؟ قَالَ: لَا، قَالَ: فَارْدُدْهُ»[٣].

**واتە: عوروە دەگێڕێتەوە، لە بەشیرەوە (خوا لێیان ڕازی بێ)، ئەو خزمەتکارێکی بەخشی بە منداڵەکەی، هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ویستی پێغەمبەر ﷺ بکاتە شایەت، فەرمووی: ئایا هاوشێوەی ئەوەت بە هەموو منداڵەکانت بەخشیوە؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: بیگەڕێنەوە.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٢٣/١٢، وأبو داود: ٣٥٤٣.

(٣) صحيح.





**٣٦٧٨-** «عَنْ عُرْوَةَ ﷺ، أَنَّ بَشِيراً، أَتَى النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، نَحَلْتُ النُّعْمَانَ نِحْلَةً، قَالَ: أَعْطَيْتَ لِإِخْوَتِهِ؟ قَالَ: لَا، قَالَ: فَارْدُدْهُ»[1].

**واتە: عوروە ﷺ دەگێڕێتەوە، بەشیر هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، دیاریەکم بەخشی بە نوعمان، فەرمووی: بەخشیت بە براکانیشی؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: بیگەڕێنەوە.**

**٣٦٧٩-** «عَنِ النُّعْمَانِ ﷺ قَالَ: انْطَلَقَ بِهِ أَبُوهُ يَحْمِلُهُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: اشْهَدْ أَنِّي قَدْ نَحَلْتُ النُّعْمَانَ مِنْ مَالِي كَذَا وَكَذَا، قَالَ: كُلَّ بَنِيكَ نَحَلْتَ مِثْلَ الَّذِي نَحَلْتَ النُّعْمَانَ؟»[2].

**واتە: نوعمان ﷺ دەڵێ: باوکی لەگەڵ خۆی بردی بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: شایەت بە من لە ماڵەکەی خۆم فلانە شت و فلانە شتم بە نوعمان بەخشی، فەرمووی: ئەوەی بە نوعمانت بەخشی بە هەموو منداڵەکانت بەخشی؟**

**٣٦٨٠-** «عَنِ النُّعْمَانِ ﷺ، أَنَّ أَبَاهُ أَتَى بِهِ النَّبِيَّ ﷺ يُشْهِدُ عَلَى نُحْلٍ نَحَلَهُ إِيَّاهُ، فَقَالَ: أَكُلَّ وَلَدِكَ نَحَلْتَ مِثْلَ مَا نَحَلْتَهُ؟ قَالَ: لَا، قَالَ: فَلَا أَشْهَدُ عَلَى شَيْءٍ، أَلَيْسَ يَسُرُّكَ أَنْ يَكُونُوا إِلَيْكَ فِي الْبِرِّ سَوَاءً؟ قَالَ: بَلَى، قَالَ: فَلَا إِذاً»[3].

**واتە: نوعمان ﷺ دەگێڕێتەوە، باوکی هێنای بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی بیکات بە شایەت لەسەر بەخشینێک پێی بەخشی بوو، فەرمووی: ئایا وەکو ئەوەت بەخشیوە بە هەموو منداڵەکانت؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: شایەتی نادەم لەسەر شتێکی وا، ئایا پێت خۆشە هەموویان وەکو یەکتر چاک بن لەگەڵتدا؟ وتی: بەڵێ پێم خۆشە وابن، فەرمووی: کەواتە نابێ یەکێکیان هەڵبژێری.**

**٣٦٨١-** «عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ: أَنَّ أُمَّهُ ابْنَةَ رَوَاحَةَ سَأَلَتْ أَبَاهُ بَعْضَ الْمَوْهِبَةِ مِنْ مَالِهِ لِابْنِهَا، فَالْتَوَى بِهَا سَنَةً، ثُمَّ بَدَا لَهُ فَوَهَبَهَا لَهُ، فَقَالَتْ: لَا أَرْضَى حَتَّى تُشْهِدَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أُمَّ هَذَا ابْنَةَ رَوَاحَةَ قَاتَلَتْنِي عَلَى الَّذِي وَهَبْتُ لَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَا بَشِيرُ، أَلَكَ وَلَدٌ سِوَى هَذَا؟ قَالَ: نَعَمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَفَكُلُّهُمْ وَهَبْتَ لَهُمْ مِثْلَ الَّذِي وَهَبْتَ لِابْنِكَ هَذَا؟ قَالَ: لَا، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: فَلَا تُشْهِدْنِي إِذاً، فَإِنِّي لَا أَشْهَدُ عَلَى جَوْرٍ»[4].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٥٨٧ و ٢٦٥٠، ومسلم: ١٣ و ١٦٢٣/١٨، وأبو داود: ٣٥٤٢، وإبن ماجه: ٢٣٧٥.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




واتە: نوعمانی کوڕی بەشیری ئەنصاڕی ﷺ دەگێڕێتەوە، دایکی کە کچەکەی ڕەواحە بوو، داوای لە باوکی کرد هەندێکی لە و ماڵ و سامانە بە کوڕەکەی ببەخشێ، یەک ساڵ دوای خست، پاشان پێی بەخشی؟ جا ژنەکەی وتی: ڕازی نابم تا پێغەمبەری خوا ﷺ نەکەی بە شایەت، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، دایکی ئەم کوڕەم کە کچی ڕەواحەیە بەشەڕهاتووە لەگەڵمدا لەسەر ئەوەی شتێکم بەخشیوە بە منداڵەکەم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی بەشیر، جگە لەمە منداڵی دیکەت هەیە؟ وتی: بەڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا وەکو ئەوت بە هەموویانت بەخشیوە؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: کەواتە من مەکە بە شایەت، چونکە من شایەتی لەسەر ستەم نادەم.

**٣٦٨٢-** «عَنِ النُّعْمَانِ ﷺ قَالَ: سَأَلَتْ أُمِّي أَبِي بَعْضَ الْمَوْهِبَةِ فَوَهَبَهَا لِي، فَقَالَتْ: لَا أَرْضَى حَتَّى أُشْهِدَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: فَأَخَذَ أَبِي بِيَدِي وَأَنَا غُلَامٌ، فَأَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أُمَّ هَذَا ابْنَةَ رَوَاحَةَ طَلَبَتْ مِنِّي بَعْضَ الْمَوْهِبَةِ، وَقَدْ أَعْجَبَهَا أَنْ أُشْهِدَكَ عَلَى ذَلِكَ، قَالَ: يَا بَشِيرُ، أَلَكَ ابْنٌ غَيْرُ هَذَا؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَوَهَبْتَ لَهُ مِثْلَ مَا وَهَبْتَ لِهَذَا؟ قَالَ: لَا، قَالَ: فَلَا تُشْهِدْنِي إِذاً، فَإِنِّي لَا أَشْهَدُ عَلَى جَوْرٍ»[١].

واتە: نوعمان ﷺ دەڵێ: دایکم داوای لە باوکم کرد هەندێ لە ماڵەکەی ببەخشێت بە من، ئەویش پێمی بەخشی، دایکم وتی: ڕازی نابم تا پێغەمبەری خوا ﷺ نەکەی بە شایەت، وتی: دەستی گرتم، من منداڵ بووم هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، دایکی ئەم منداڵە کچی ڕەواحەیە داوای هەندێ بەخشینی لێم کردوە بۆ ئەم منداڵە، حەز دەکات تۆ بکەم بە شایەت لەسەر ئەوە؟ فەرمووی: ئەی بەشیر ئایا جگە لەمە منداڵی ترت هەیە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: پێت بەخشیوە وەکو چۆن بە ئەمت بەخشی؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: من مەکە بە شایەت، چونکە من شایەتی بۆ ستەم نادەم.

**٣٦٨٣-** «عَنْ عَامِرٍ ﷺ قَالَ: أَنَّ بَشِيرَ بْنَ سَعْدٍ، أَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ امْرَأَتِي عَمْرَةَ بِنْتَ رَوَاحَةَ أَمَرَتْنِي أَنْ أَتَصَدَّقَ عَلَى ابْنِهَا نُعْمَانَ بِصَدَقَةٍ، وَأَمَرَتْنِي أَنْ أُشْهِدَكَ عَلَى ذَلِكَ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: هَلْ لَكَ بَنُونَ سِوَاهُ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَأَعْطَيْتَهُمْ مِثْلَ مَا أَعْطَيْتَ لِهَذَا؟ قَالَ: لَا، قَالَ: فَلَا تُشْهِدْنِي عَلَى جَوْرٍ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح لغيره.




واته: عامر ﷺ دەڵێ: بەشیری کوڕی سەعد هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ژنەکەم عەمرەی کچی ڕەواحە داوای لێم کردوە هەندێ لە ماڵ و سامانەکەم ببەخشم بە نوعمان، داواشی لێکردم تۆش بکەم بەشایەت لەسەر ئەوە، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ئایا جگە لەو منداڵی دیکەت هەیە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: وەکو ئەمەت پێیان بەخشیوە؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: من مەکە بە شایەت لەسەر ستەم.

**٣٦٨٤-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ: أَنَّ رَجُلاً جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَقَالَ مُحَمَّدٌ: أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: إِنِّي تَصَدَّقْتُ عَلَى ابْنِي بِصَدَقَةٍ، فَاشْهَدْ، فَقَالَ: هَلْ لَكَ وَلَدٌ غَيْرُهُ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: أَعْطَيْتَهُمْ كَمَا أَعْطَيْتَهُ؟ قَالَ: لَا، قَالَ: أَشْهَدُ عَلَى جَوْرٍ؟»[١].

واته: عەبدوڵڵای کوڕی عوتبەی کوڕی مەسعود ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: من دیاریەکم بەخشیوە بە کوڕەکەم، تۆ شایەت بە، فەرمووی: ئایا جگە لەمە منداڵی دیکەت هەیە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: پێیانت بەخشیوە وەکو ئەم؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: شایەتی لەسەر ستەم بدەم؟

**٣٦٨٥-** «عَنِ النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ ﷺ يَقُولُ: ذَهَبَ بِي أَبِي إِلَى النَّبِيِّ ﷺ يُشْهِدُهُ عَلَى شَيْءٍ أَعْطَانِيهِ، فَقَالَ: أَلَكَ وَلَدٌ غَيْرُهُ؟ قَالَ: نَعَمْ، وَصَفَّ بِيَدِهِ بِكَفِّهِ أَجْمَعَ كَذَا، أَلَا سَوَّيْتَ بَيْنَهُمْ؟»[٢].

واته: نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دەڵێ: باوکم منی برد بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی بیکات بە شایەت لەسەر شتێک پێی بەخشی بووم، فەرمووی: جگە لەم منداڵە، منداڵی دیکەت هەیە؟ وتی: بەڵێ، بەدەستی ئاماژەی کرد دروست نیە، مەگەر بە هەموویان ببەخشی.

**٣٦٨٦-** «مُسْلِمِ بْنِ صُبَيْحٍ قَالَ: سَمِعْتُ النُّعْمَانَ ﷺ يَقُولُ وَهُوَ يَخْطُبُ: انْطَلَقَ بِي أَبِي إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يُشْهِدُهُ عَلَى عَطِيَّةٍ أَعْطَانِيهَا، فَقَالَ: هَلْ لَكَ بَنُونَ سِوَاهُ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: سَوِّ بَيْنَهُمْ»[٣].

واته: موسلیمی کوڕی صوبەیح دەڵێ: گوێم لە نوعمان ﷺ بوو وتاری دەداو دەیوت: باوکم منی لەگەڵ خۆی برد بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی بیکات بە

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح الإسناد.




**شایەت لەسەر دیاریەک پێی بەخشی بووم، فەرمووی: جگە لەمە منداڵی دیکەت هەیە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: لەگەڵیاندا یەکسان بە.**

**٣٦٨٧-** «عَنِ الْمُفَضَّلِ بْنِ الْمُهَلَّبِ قَالَ: سَمِعْتُ النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ ﷺ، يَخْطُبُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اعْدِلُوا بَيْنَ أَبْنَائِكُمْ، اعْدِلُوا بَيْنَ أَبْنَائِكُمْ»[1].

**واتە: موفەزەلی کوڕی موهەلەب دەڵێ: گوێم لە نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ بوو وتاری دەداو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: دادپەروەر بن لە نێوان منداڵەکانتاندا، دادپەروەر بن لە نێوان منداڵەکانتاندا.**

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٥٤٤.

## بەخشینەوەی بەربڵاو
## (واتە: بەخشینی ماڵێک بە دوو کەس بەبێ دابەشکردن لە نێوانیاندا)

**٣٦٨٨-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِذْ أَتَتْهُ وَفْدُ هَوَازِنَ، فَقَالُوا: يَا مُحَمَّدُ، إِنَّا أَصْلٌ وَعَشِيرَةٌ، وَقَدْ نَزَلَ بِنَا مِنَ الْبَلَاءِ مَا لَا يَخْفَى عَلَيْكَ، فَامْنُنْ عَلَيْنَا مَنَّ اللَّهُ عَلَيْكَ، فَقَالَ: اخْتَارُوا مِنْ أَمْوَالِكُمْ أَوْ مِنْ نِسَائِكُمْ وَأَبْنَائِكُمْ، فَقَالُوا: قَدْ خَيَّرْتَنَا بَيْنَ أَحْسَابِنَا وَأَمْوَالِنَا بَلْ نَخْتَارُ نِسَاءَنَا وَأَبْنَاءَنَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَمَّا مَا كَانَ لِي وَلِبَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ فَهُوَ لَكُمْ، فَإِذَا صَلَّيْتُ الظُّهْرَ فَقُومُوا، فَقُولُوا: إِنَّا نَسْتَعِينُ بِرَسُولِ اللَّهِ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَوِ الْمُسْلِمِينَ فِي نِسَائِنَا وَأَبْنَائِنَا « فَلَمَّا صَلَّوْا الظُّهْرَ قَامُوا فَقَالُوا ذَلِكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: فَمَا كَانَ لِي وَلِبَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ فَهُوَ لَكُمْ، فَقَالَ الْمُهَاجِرُونَ: وَمَا كَانَ لَنَا فَهُوَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَقَالَتِ الْأَنْصَارُ: مَا كَانَ لَنَا فَهُوَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ الْأَقْرَعُ بْنُ حَابِسٍ: أَمَّا أَنَا وَبَنُو تَمِيمٍ فَلَا، وَقَالَ عُيَيْنَةُ بْنُ حِصْنٍ: أَمَّا أَنَا وَبَنُو فَزَارَةَ فَلَا، وَقَالَ الْعَبَّاسُ بْنُ مِرْدَاسٍ: أَمَّا أَنَا وَبَنُو سُلَيْمٍ فَلَا، فَقَامَتْ بَنُو سُلَيْمٍ فَقَالُوا: كَذَبْتَ، مَا كَانَ لَنَا فَهُوَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، رُدُّوا عَلَيْهِمْ نِسَاءَهُمْ وَأَبْنَاءَهُمْ، فَمَنْ تَمَسَّكَ مِنْ هَذَا الْفَيْءِ بِشَيْءٍ فَلَهُ سِتُّ فَرَائِضَ مِنْ أَوَّلِ شَيْءٍ يُفِيئُهُ اللَّهُ ﷻ عَلَيْنَا، وَرَكِبَ رَاحِلَتَهُ وَرَكِبَ النَّاسُ اقْسِمْ عَلَيْنَا فَيْئَنَا، فَأَلْجَئُوهُ إِلَى شَجَرَةٍ فَخَطِفَتْ رِدَاءَهُ، فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، رُدُّوا عَلَيَّ رِدَائِي، فَوَاللَّهِ لَوْ أَنَّ لَكُمْ شَجَرَ تِهَامَةَ نَعَماً قَسَمْتُهُ عَلَيْكُمْ ثُمَّ لَمْ تَلْقَوْنِي بَخِيلاً وَلَا جَبَاناً وَلَا كَذُوباً، ثُمَّ أَتَى بَعِيراً فَأَخَذَ مِنْ سَنَامِهِ وَبَرَةً بَيْنَ أُصْبُعَيْهِ ثُمَّ يَقُولُ: هَا إِنَّهُ لَيْسَ لِي مِنَ الْفَيْءِ شَيْءٌ وَلَا هَذِهِ إِلَّا خُمُسٌ، وَالْخُمُسُ مَرْدُودٌ فِيكُمْ فَقَامَ إِلَيْهِ رَجُلٌ بِكُبَّةٍ مِنْ شَعْرٍ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَخَذْتُ هَذِهِ لِأُصْلِحَ بِهَا بَرْدَعَةَ بَعِيرٍ لِي فَقَالَ: أَمَّا مَا كَانَ لِي وَلِبَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ فَهُوَ لَكَ، فَقَالَ: أَوَبَلَغَتْ هَذِهِ؟ فَلَا أَرَبَ لِي فِيهَا، فَنَبَذَهَا وَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، أَدُّوا الْخِيَاطَ وَالْمَخِيطَ، فَإِنَّ الْغُلُولَ يَكُونُ عَلَى أَهْلِهِ عَاراً وَشَنَاراً يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[1].

**واتە: عەمرِی کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکی، لە باپیرەیەوە ﷺ دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووین، ڕیش سپیانی هەوازن هاتن بۆ لای، وتیان: ئەی موحەممەد، ئێمە بنچینەو هۆزین، توشی بەڵاو ناڕەحەتیەک بووین وەک لات شاراوە نیە، منەت بکە بەسەرماندا خوا منەت دەکات بەسەرتدا، فەرمووی: یان ماڵ و سامانتان یان منداڵ و ژنەکانتان هەڵبژێرن، وتیان: ئێمەت سەرپشک کرد لە**

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٢٦٩٤.




نێوان و ڕەچەڵەک و ماڵ و سامانەکانمان، بەڵکو منداڵ و ژنەکانمان هەڵدەبژێرین، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوەی بەر من و نەوەکانی عەبدولموطەلیب کەوتوە بۆ ئێوەیە، کاتێ نوێژی نیوەڕۆم کرد، هەڵسنە سەر پێ و بڵێن: ئێمە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەینە یارمەتیدەر لەسەر بڕواداران یان مسوڵمانان لە ژن و منداڵەکانمان، کاتێ نوێژی نیوەڕۆیان کرد هەڵسان ئەوەیان وت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوەی بەر من و نەوەکانی عەبدولموطەلیب کەوتووە ئەوە بۆ ئێوەیە، کۆچکەران وتیان: ئەوەشی بەر ئێمە کەوتووە ئەوە هی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەنصارەکانیش وتیان: ئەوە بەر ئێمە کەوتووە ئەوە هی پێغەمبەرە ﷺ، ئەقرەعی کوڕی حابیس وتی: بەڵام من و بەنی تەمیم نەخێر، عویەینەی کوڕی حیصنیش وتی: بەڵام من و بەنی فەزارە نەخێر، هەروەها عەباسی کوڕی میرداس وتی: من و بەنی سولەیم نەخێر، بەنی سولەیم وتیان: درۆت کرد، ئەوەی بەر ئێمە کەوتووە ئەوە هی پێغەمبەری خوایە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی خەڵکینە ژن و منداڵەکانیان بۆ بگەڕێننەوە، هەرکەس کۆیلەیەک لەمانە ببەخشێ ئەوە ئێمە شەش وشتری دەدەینێ، لە یەکەم شتێک کە خوا پێی بەخشیوین، پاشان سواری وڵاخەکەی بوو، خەڵکەکەش دەوریاندا وتیان: دەستکەوتەکەمان بەسەردا دابەش بکە، لە دارێک گیریانداو عاباکەی تێوە ئاڵاو لەبەری داکەندرا، فەرمووی: ئەی خەڵکینە! عەباکەم بگەڕێننەوە، سوێند بە خوا ئەگەر بە قەد گەڵای داری (تِهَامَةَ)تان بەر بکەوێت، دابەشی دەکەم بەسەرتاندا، پاشان من بە ڕەزیلی و ترسنۆکی و درۆزن نابینن، پاشان هات بۆ لای وشترێک بە هەردوو پەنجەی بان کۆپانەی پشتی گرت، پاشان فەرمووی: من لەم دەستکەوتەدا هیچم نیە جگە لە پێنج یەک، پێنج یەکیش هەر بۆ ئێوە دەگەڕێتەوە، پیاوێک هەڵساو هات بۆ لای بە پارچە دەزوویەک، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەمەم برد بۆ ئەوەی جلی وشترەکەمی پێ ببەستمەوە، فەرمووی: ئەوەی بۆ من و بەنی عەبدولموطەلیبە ئەوە بۆ تۆ، کابرا وتی: ئایا ئەوەت گەیاند، هیچ پێویستیەکم پێ نیە، فڕەیدا، فەرمووی: ئەی خەڵکینە دەزوو قەیتانیش بدەنەوە، چونکە دزی کردن دەبێتە مایەی شەرمەزاری بۆ خاوەنەکەی لە ڕۆژی دوایی دا.




## پەشیمان بوونەوەی باوک و دایک لەوەی دەیبەخشێ بە منداڵەکەی، هەروەها باسی جیاوازی ئەوانەی فەرموودەکەیان لەو بوارە گواستۆتەوە

**٣٦٨٩-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا يَرْجِعُ أَحَدٌ فِي هِبَتِهِ إِلَّا وَالِدٌ مِنْ وَلَدِهِ، وَالْعَائِدُ فِي هِبَتِهِ كَالْعَائِدِ فِي قَيْئِهِ»[1].

**واتە:** عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، لە باپیرەیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ کەس نابێت پەشیمان ببێتەوە لە بەخشینەکەی مەگەر باوک بۆ کوڕەکەی، ئەو کەسەی لە بەخشینەکەی پەشیمان ببێتەوە، وەک ئەو کەسە وایە کە (بڕشێتەوە دوایی) بگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەکەی (و بیخواتەوە).

**٣٦٩٠-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، يَرْفَعَانِ الْحَدِيثَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَا يَحِلُّ لِرَجُلٍ يُعْطِي عَطِيَّةً ثُمَّ يَرْجِعُ فِيهَا إِلَّا الْوَالِدَ فِيمَا يُعْطِي وَلَدَهُ، وَمَثَلُ الَّذِي يُعْطِي عَطِيَّةً ثُمَّ يَرْجِعُ فِيهَاكَمَثَلِ الْكَلْبِ أَكَلَ حَتَّى إِذَا شَبِعَ قَاءَ ثُمَّ عَادَ فِي قَيْئِهِ»[2].

**واتە:** ئیبنو عومەرو ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕنەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: حەڵاڵ نیە بۆ هیچ پیاوێک شتێک ببەخشێ و پاشان پەشیمان ببێتەوە جگە لە باوک نەبێ ببەخشێ بە کوڕەکەی، وە نموونەی ئەو کەسەی شتێک دەبەخشێ پاشان پەشیمان دەبێتەوە وەکو سەگێک وایە دەخوا تا تێر دەبێ و دەڕشێتەوە، پاشان دەگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەکەی.

**٣٦٩١-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْعَائِدُ فِي هِبَتِهِ كَالْكَلْبِ يَقِيءُ ثُمَّ يَعُودُ فِي قَيْئِهِ»[3].

**واتە:** ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی لە بەخشینەکەی پەشیمان ببێتەوە وەک سەگێک وایە بڕشێتەوە، پاشان بگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەکەی.

---

(١) حسن صحيح. أخرجه إبن ماجه: ٢٣٧٨.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٥٣٩، والترمذي: ١٢٩٩ و ٢١٣١ و ٢١٣٢، وإبن ماجه: ٢٣٧٧.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٥٨٩ و ٢٦٢١، ومسلم: ٥ و ١٦٢٢/٨، وأبو داود: ٣٥٣٨، وإبن ماجه: ٢٣٨٥ و ٢٣٩١.




**٣٦٩٢-** «عَنْ طَاوُسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا يَحِلُّ لِأَحَدٍ أَنْ يَهَبَ هِبَةً ثُمَّ يَرْجِعَ فِيهَا، إِلَّا مِنْ وَلَدِهِ، قَالَ طَاوُسٌ: كُنْتُ أَسْمَعُ وَأَنَا صَغِيرٌ، عَائِدٌ فِي قَيْئِهِ فَلَمْ نَدْرِ أَنَّهُ ضَرَبَ لَهُ مَثَلاً، قَالَ: فَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ الْكَلْبِ يَأْكُلُ ثُمَّ يَقِيءُ ثُمَّ يَعُودُ فِي قَيْئِهِ»[1].

واتە: طاوس دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حەڵاڵ نیە بۆ هیچ کەسێک شتێک ببەخشێ و دواتر پەشیمان ببێتەوە، جگە لە باوک بۆ کوڕەکەی، طاوس دەڵێ: من ئەوەم بیست کاتێ کە منداڵ بووم، گەڕانەوە بۆ سەر ڕشانەوەکەی نەمانزانی ئەو نموونەی بۆ ئەو مەبەستە هێنایەوە، فەرمووی: هەرکەس ئەوە بکات ئەوە نموونەی وەکو نموونەی سەگێک وایە دەخوات پاشان دەڕشێتەوە، پاشان دەگەڕێتەوە بۆ سەر ڕشانەوەکەی.

## باسی جیاوازی لە فەرموودەکەی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس تیایدا

**٣٦٩٣-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَثَلُ الَّذِي يَرْجِعُ فِي صَدَقَتِهِ كَمَثَلِ الْكَلْبِ يَرْجِعُ فِي قَيْئِهِ فَيَأْكُلُهُ»[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نموونەی ئەو کەسەی لە بەخشینەکەی پەشیمان دەبێتەوە، وەکو سەگێک وایە بگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەکەی.

**٣٦٩٤-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: مَثَلُ الَّذِي يَتَصَدَّقُ بِالصَّدَقَةِ ثُمَّ يَرْجِعُ فِيهَا، كَمَثَلِ الْكَلْبِ قَاءَ ثُمَّ عَادَ فِي قَيْئِهِ فَأَكَلَهُ»[3].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نموونەی ئەو کەسەی بەخشینێک دەبەخشێ، پاشان پەشیمان دەبێتەوە، وەکو سەگێک وایە بڕشێتەوە، پاشان بگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەکەی.

**٣٦٩٥-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَثَلُ الَّذِي يَرْجِعُ فِي صَدَقَتِهِ كَمَثَلِ الْكَلْبِ يَقِيءُ ثُمَّ يَعُودُ فِي قَيْئِهِ، قَالَ الْأَوْزَاعِيُّ: سَمِعْتُهُ يُحَدِّثُ عَطَاءَ بْنَ أَبِي رَبَاحٍ، بِهَذَا الْحَدِيثِ»[4].

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نموونەی ئەو کەسەی لە بەخشینەکەی پەشیمان دەبێتەوە، وەکو سەگێک وایە بڕشێتەوە، پاشان بگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەکەی. ئەوزاعی دەڵێ: گوێم لە عەطائی کوڕی ئەبو ڕیباح بوو ئەم فەرموودەی باس دەکرد.

**٣٦٩٦-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْعَائِدُ فِي هِبَتِهِ كَالْعَائِدِ فِي قَيْئِهِ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی لە بەخشینەکەی پەشیمان ببێتەوە وەک ئەو کەسە وایە کە بگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەکەی.

**٣٦٩٧-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْعَائِدُ فِي هِبَتِهِ كَالْعَائِدِ فِي قَيْئِهِ»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی لە بەخشینەکەی پەشیمان ببێتەوە وەک ئەو کەسە وایە کە بگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەکەی.

**٣٦٩٨-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَيْسَ لَنَا مَثَلُ السَّوْءِ، الْعَائِدُ فِي هِبَتِهِ كَالْعَائِدِ فِي قَيْئِهِ»[٣].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نموونەی خراپ لە لای ئێمە نیە، ئەو کەسەی لە بەخشینەکەی پەشیمان ببێتەوە، وەک ئەو کەسە وایە کە بگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەکەی.

**٣٦٩٩-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَيْسَ لَنَا مَثَلُ السَّوْءِ، الْعَائِدُ فِي هِبَتِهِ كَالْكَلْبِ يَعُودُ فِي قَيْئِهِ»[٤].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٦٢٢ و ٦٩٧٥، والترمذي: ١٢٩٨.

(٤) صحيح.




واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نموونەی خراپ لە لای ئێمە نیە، ئەو کەسەی لە بەخشینەکەی پەشیمان ببێتەوە، وەک ئەو کەسە وایە کە بگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەکەی.

**٣٧٠٠-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَيْسَ لَنَا مَثَلُ السَّوْءِ، الرَّاجِعُ فِي هِبَتِهِ كَالْكَلْبِ فِي قَيْئِهِ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نموونەی خراپ لە لای ئێمە نیە، ئەو کەسەی پەشیمان دەبێتەوە لە بەخشینەکەی، وەکو سەگێک وایە بگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەکەی.

## باسی جیاوازی لەسەر طاوس لە بارەی ئەوکەسەی پەشیمان دەبێتەوە لە بەخشینەکەی

**٣٧٠١-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن طَاوُسٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: الْعَائِدُ فِي هِبَتِهِ كَالْكَلْبِ يَقِيءُ ثُمَّ يَعُودُ فِي قَيْئِهِ»[٢].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی طاوس دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە لە ئیبنو عەبباسەوە (خوا لێیان ڕازی بێ): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەوکەسەی لە بەخشینەکەی پەشیمان ببێتەوە، وەک سەگێک وایە بگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەکەی.

**٣٧٠٢-** «عَنْ أبي الزُّبَيْرِ عن طَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْعَائِدُ فِي هِبَتِهِ كَالْعَائِدِ فِي قَيْئِهِ»[٣].

واتە: ئەبو زوبەیر دەگێڕێتەوە، لە طاوس، لە ئیبنو عەبباسەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی لە بەخشینەکەی پەشیمان ببێتەوە، وەک ئەو کەسە وایە بگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەکەی.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




**٣٧٠٣-** «عَنْ عَمْرِو بن شُعَيْبٍ عن طَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ ﭭ قَالَا: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا يَحِلُّ لِأَحَدٍ أَنْ يُعْطِيَ الْعَطِيَّةَ فَيَرْجِعَ فِيهَا إِلَّا الْوَالِدَ فِيمَا يُعْطِي وَلَدَهُ، وَمَثَلُ الَّذِي يُعْطِي الْعَطِيَّةَ فَيَرْجِعُ فِيهَا، كَالْكَلْبِ يَأْكُلُ حَتَّى إِذَا شَبِعَ قَاءَ ثُمَّ عَادَ فَرَجَعَ فِي قَيْئِهِ»(١).

**واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە لە طاوس، لە ئیبنو عومەرو ئیبنو عەبباسەوە ﭭ، ئەوان وتویانە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حەڵاڵ نیە بۆ هیچ کەسێک شتێک ببەخشێ و، پاشان پەشیمان ببێتەوە جگە لە باوک نەبێ ببەخشێ بە کوڕەکەی، وە نموونەی ئەو کەسەی شتێک دەبەخشێ پاشان پەشیمان دەبێتەوە وەکو سەگێک وایە دەخوا هەتا تێر دەبێ، دەڕشێتەوە، پاشان دەگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەکەی.**

**٣٧٠٤-** «عَنِ الْحَسَنِ بن مُسْلِمٍ عن طَاوُسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا يَحِلُّ لِأَحَدٍ يَهَبُ هِبَةً ثُمَّ يَعُودُ فِيهَا إِلَّا الْوَالِدَ، قَالَ طَاوُسٌ: كُنْتُ أَسْمَعُ الصِّبْيَانَ يَقُولُونَ: يَا عَائِداً فِي قَيْئِهِ، وَلَمْ أَشْعُرْ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ضَرَبَ ذَلِكَ مَثَلاً، حَتَّى بَلَغَنَا أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ ، مَثَلُ الَّذِي يَهَبُ الْهِبَةَ ثُمَّ يَعُودُ فِيهَا «وَذَكَرَ كَلِمَةً مَعْنَاهَا» كَمَثَلِ الْكَلْبِ يَأْكُلُ قَيْئَهُ»(٢).

**واتە: حەسەنی کوڕی موسلیم دەگێڕێتەوە، لە طاوسەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حەڵاڵ نیە بۆ هیچ کەسێک شتێک ببەخشێ و پاشان پەشیمان ببێتەوە جگە لە باوک نەبێت، طاوس وتی: من گوێم لە منداڵەکان بوو دەیانووت: ئەی ئەو کەسەی دەگەڕێتەوە بۆ سەر ڕشانەوەکەی، نەمزانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی کرد بە نموونە، تا پێمان گەیشت ئەو دەیفەرموو: نموونەی ئەو کەسەی بەخشینێک دەبەخشێ، پاشان پەشیمان دەبێتەوە «باسی وشەیەکی کرد ماناکەی»، وەکو سەگێک وایە ڕشانەوەکەی خۆی بخوات.**

**٣٧٠٥-** «عَنْ حَنْظَلَةَ أَنَّهُ سَمِعَ طَاوُساً يَقُولُ: أَخْبَرَنَا بَعْضُ مَنْ أَدْرَكَ النَّبِيَّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: مَثَلُ الَّذِي يَهَبُ فَيَرْجِعُ فِي هِبَتِهِ كَمَثَلِ الْكَلْبِ يَأْكُلُ فَيَقِيءُ ثُمَّ يَأْكُلُ قَيْئَهُ»(٣).

---

**(١) صحيح.**

**(٢) صحيح لغيره.**

**(٣) صحيح الإسناد.**




واتە: حەنظلە دەگێڕێتەوە، ئەو گوێی لە طاوس بوو دەیوت: هەواڵی پێداین هەندێک لەوانەی گەیشتن بە پێغەمبەر ﷺ، ئەو فەرموویەتی: نموونەی ئەو کەسەی دەبەخشێ و، پاشان پەشیمان دەبێتەوە لە بەخشینەکەی، وەکو سەگێک وایە بخوات و پاشان بڕشێتەوە، دواتر ڕشانەوەکەی خۆی بخوات.




(الرُّقْبَى) (واتە: کەسێک بە کەسێک بڵێ: ئەم خانوەم پێشکەشە بە تۆ، ئەگەر من لە پێش تۆدا مردم هەر بۆ خۆتە، ئەگەر تۆش لە پێشدا مردی دەگەڕێتەوە بۆ خۆم، لە چاوەڕوانی وەرگیراوە، وەکو ئەوەی بڵێی هەردووکیان چاوەڕوانی مردنی یەکتر دەکەن.

## باسی جیاوازی لەسەر ئیبنو ئەبو نەجیح لە فەرموودەکەی زەیدی کوڕی ثابت تیایدا

٣٧٠٦- «عَنِ سُفيان عن ابْنِ أَبِي نَجِيحٍ، عن طَاوُسٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الرُّقْبَى جَائِزَةٌ»[١].

واتە: سوفیان دەگێڕێتەوە، لە ئیبنو ئەبی نەجیح، لە طاوس لە زەیدی کوڕی ثابتەوە ﵁، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ڕوقبا دروستە).

٣٧٠٧- «عَنِ سُفيان عن ابْنِ أَبِي نَجِيحٍ، عن طَاوُسٍ، عَنْ رَجلٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ جَعَلَ الرُّقْبَى لِلَّذِي أُرْقِبَهَا»[٢].

واتە: سوفیان دەگێڕێتەوە، لە ئیبنو ئەبی نەجیح، لە طاوس، لە پیاوێک، لە زەیدی کوڕی ثابتەوە ﵁ پێغەمبەر ﷺ ڕوقبای دانا بۆ ئەو کەسەی چاوەڕوانی دەکات.

٣٧٠٨- «عَنِ سُفيان عن ابْنِ أَبِي نَجِيحٍ، عن طَاوُسٍ، لعله عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: لَا رُقْبَى، فَمَنْ أُرْقِبَ شَيْئاً فَهُوَ سَبِيلُ الْمِيرَاثِ»[٣].

واتە: سوفیان دەگێڕێتەوە، لە ئیبنو ئەبی نەجیح، لە طاوس، پێدەچێ لە ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێویست ناکات (ماڵ و سامانیان) بکەن بە ڕوقبا، هەرکەس شتێکی کرد بە ڕوقبا، ئەگەر مرد ئەوە دەبێتە هی ئەو کەسەی پێی بەخشراوە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح.




## باسی جیاوازی لەسەر ئەبو زوبەیر

**٣٧٠٩-** «عَنْ زيد عن أبي الزُّبَيْرِ، عَنْ طَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا تُرْقِبُوا أَمْوَالَكُمْ، فَمَنْ أَرْقَبَ شَيْئاً فَهُوَ لِمَنْ أُرْقِبَهُ»[١].

**واتە: زەید دەگێڕێتەوە، لە ئەبو زوبەیر، لە طاوس، لە ئیبنو عەبباسەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ماڵەکانتان مەکەن بە ڕوقبا، هەرکەس شتێ بکات بە ڕوقبا ئەوە بۆ ئەو کەسەیە پێشکەشی کراوە.**

**٣٧١٠-** «عَنْ حجاج عن أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ طَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْعُمْرَى جَائِزَةٌ لِمَنْ أُعْمِرَهَا، وَالرُّقْبَى جَائِزَةٌ لِمَنْ أُرْقِبَهَا، وَالْعَائِدُ فِي هِبَتِهِ كَالْعَائِدِ فِي قَيْئِهِ»[٢].

**واتە: حەجاج دەگێڕێتەوە، لە ئەبو زوبەیر، لە طاوس، لە ئیبنو عەبباسەوە) خوا لێیان ڕازی بێ (دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: عومرا دروستە بۆ ئەو کەسەی پێی بەخشراوە تا لە ژیاندا ماوەو دوای مردنیشی (بۆ میراتگرەکانیەتی)، وە ڕوقباش دروستە بۆ ئەو کەسەی پێی بەخشراوە تا لە ژیاندا ماوەو دوای مردنیشی (بۆ میراتگرەکانیەتی)، وە ئەو کەسەشی لە بەخشینەکەی پەشیمان دەبێتەوە وەکو ئەو کەسە وایە بگەڕێتەوە بۆ سەر ڕشانەوەکەی و بیخوات.**

**٣٧١١-** «عَنْ سفيان عن أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ طَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: الْعُمْرَى وَالرُّقْبَى سَوَاءٌ»[٣].

**واتە: سوفیان دەگێڕێتەوە، لە ئەبو زوبەیر، لە طاوس، لە ئیبنو عەباسەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: عومراو ڕوقبا یەکسانن.**

**٣٧١٢-** «عَنْ سفيان عن أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ طَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: لَا تَحِلُّ الرُّقْبَى وَلَا الْعُمْرَى، فَمَنْ أُعْمِرَ شَيْئاً فَهُوَ لَهُ، وَمَنْ أُرْقِبَ شَيْئاً فَهُوَ لَهُ»[٤].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح مرفوعاً.

(٤) صحيح.




واتە: سوفیان دەگێڕێتەوە، لە ئەبو زوبەیر، لە طاوس، لە ئیبنو عەبباسەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ڕوقباو عومرا حەلاڵ نین، هەرکەس شتێکی کرد بە عومرا ئەوە بۆ ئەو کەسەیە پێی بەخشراوە، هەرکەس شتێکی کرد بە ڕوقبا ئەوە بۆ ئەو کەسەیە پێی بەخشراوە.

**٣٧١٣-** «عَنْ حجاج عن أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ طَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: لَا تَصْلُحُ الْعُمْرَى وَلَا الرُّقْبَى، فَمَنْ أَعْمَرَ شَيْئاً أَوْ أَرْقَبَهُ، فَإِنَّهُ لِمَنْ أُعْمِرَهُ وَأُرْقِبَهُ حَيَاتَهُ وَمَوْتَهُ»(١).

واتە: حەجاج سوفیان دەگێڕێتەوە، لە ئەبو زوبەیر، لە طاوس، لە ئیبنو عەبباسەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: عومراو ڕوقبا شتێکی شیاوو گونجاو نین، هەر کەس ماڵێک ببەخشی بە عومرا بێت یان بە ڕوقبا، ئەوە بۆ ئەو کەسەیە کە پێی بەخشیوە بە زیندوویی و بە مردوویش.

**٣٧١٤-** «عَنْ حَنْظَلَةَ، أَنَّهُ سَمِعَ طَاوُساً يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تَحِلُّ الرُّقْبَى، فَمَنْ أُرْقِبَ رُقْبَى فَهُوَ سَبِيلُ الْمِيرَاثِ»(٢).

واتە: حەنظەلە دەگێڕێتەوە، ئەو گوێی لە طاوس بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕوقبا حەلاڵ نیە، هەرکەس شتێکی بەخشی بە ڕوقبا، ئەگەر مرد ئەوە دەبێتە هی ئەوکەسەی پێی بەخشراوە.

**٣٧١٥-** «عَنِ بْنِ أبي نَجِيحٍ، عَنْ طَاوُسٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْعُمْرَى مِيرَاثٌ»(٣).

واتە: ئیبنو ئەبی نەجیح دەگێڕێتەوە، لە طاوس، لە زەیدی کوڕی ثابت ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: عومرا میراتە.( بەخشین بە درێژایی تەمەن میراتە).

**٣٧١٦-** «عَنْ سفيان عن طَاوُسٍ، عَنْ حُجْرٍ الْمَدَرِيِّ، عَنْ زَيْدٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْعُمْرَى لِلْوَارِثِ»(٤).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح الإسناد. أخرجه إبن ماجه: ٢٣٨١.





واتە: سوفیان دەگێڕێتەوە لە طاوس، لە حوجری مەدەری، لە زەیدەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: عومرا بۆ میراتگرە.

**٣٧١٧-** «عَنْ معمر عن بن طَاوُسٍ عن أبيه، عَنْ حُجْرٍ الْمَدَرِيِّ، عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْعُمْرَى جَائِزَةٌ»[١].

واتە: مەعمەر دەگێڕێتەوە، لە ئیبنو طاوس، لە باوکیەوە، لە حوجری مەدەری، لە زەیدی کوڕی ثابتەوە ﷺ، لە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: عومرا دروستە.

**٣٧١٨-** «عَنْ عَمرو بن دينار عن طاوسٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْعُمْرَى لِلْوَارِثِ»[٢].

واتە: عەمرِی کوڕی دینار دەگێڕێتەوە، لە طاوس، لە زەیدی کوڕی ثابتەوە ﷺ، لە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: عومرا بۆ میراتگرە.

**٣٧١٩-** « عَنْ عَمرو بن دينار عن طَاوُسٍ، عَنْ حُجْرٍ الْمَدَرِيِّ، عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: الْعُمْرَى لِلْوَارِثِ، وَاللَّهُ أَعْلَمُ»[٣].

واتە: عەمرِی کوڕی دینار دەگێڕێتەوە، لە طاوس، لە حوجری مەدەری، لە زەیدی کوڕی ثابتەوە ﷺ، بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: عومرا بۆ میراتگرە. خوا زاناترە.

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح الإسناد.

(سێ جۆرە: یەکەم: کەسێک بە کەسێک بڵێ: ئەم خانوەم پێشکەش کرد بە تۆ ئەگەر مردی ئەوە بۆ میراتگرەکانت، ئەمەش بەخشینە بەبێ جیاوازی، دووەم: دەڵێ: ئەم خانوەم پێشکەشت کرد بە هەمیشەیی، سێیەم: دەڵێ: ئەم خانوەم پێشکەشت کرد ئەگەر تۆ مردی بۆ من).

**٣٧٢٠-** «عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْعُمْرَى هِيَ لِلْوَارِثِ»[١].

**واتە: زەیدی کوڕی ثابت ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: عومرا بۆ میراتگرە.**

**٣٧٢١-** «عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: الْعُمْرَى لِلْوَارِثِ»[٢].

**واتە: زەیدی کوڕی ثابت ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: عومرا بۆ میراتگرە.**

**٣٧٢٢-** «عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَضَى بِالْعُمْرَى لِلْوَارِثِ»[٣].

**واتە: زەیدی کوڕی ثابت ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: عومرا بۆ میراتگرە.**

**٣٧٢٣-** «عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ أَعْمَرَ شَيْئاً فَهُوَ لِمُعْمَرِهِ مَحْيَاهُ وَمَمَاتَهُ، وَلَا تُرْقِبُوا، فَمَنْ أَرْقَبَ شَيْئاً فَهُوَ لِسَبِيلِهِ»[٤].

**واتە: زەیدی کوڕی پابت ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەسماڵێک ببەخشێت بە عومرا ئەوە بۆ ئەو کەسەیە کە پێی بەخشیوە بە زیندووی و مردوییش، ڕوقبا مەکەن، هەرکەس ڕوقبای کرد ئەو بۆ ئەو کەسەیە کە پێی بەخشراوە.**

**٣٧٢٤-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْعُمْرَى جَائِزَةٌ»[٥].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح الإسناد.

(٤) صحيح الإسناد. أخرجه أبو داود: ٣٥٥٩.

(٥) صحيح.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: عومرا دروستە.

**٣٧٢٥-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِنَّ الْعُمْرَى جَائِزَةٌ»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان عومرا دروستە.

**٣٧٢٦-** «عَنْ طَاوُسٍ، بَتَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْعُمْرَى وَالرُّقْبَى»[٢].

واتە: طاوس دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بەخشینی عومراو ڕوقبای کرد بەماڵێکی پێویست، (بۆ ئەو کەسەی پێی بەخشراوە).

## باسی جیاوازی دەستەواژەی ئەوانەی فەرموودەکەی جابریان گواستۆتەوە لەبارەی عومرا

**٣٧٢٧-** «عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَطَبَهُمْ فَقَالَ: الْعُمْرَى جَائِزَةٌ»[٣].

واتە: عەطاء دەگێڕێتەوە، لە جابرەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری بۆ دان فەرمووی: عومرا دروستە.

**٣٧٢٨-** «عَنْ عَطَاءٍ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْعُمْرَى وَالرُّقْبَى، قُلْتُ: وَمَا الرُّقْبَى؟ قَالَ: يَقُولُ الرَّجُلُ لِلرَّجُلِ: هِيَ لَكَ حَيَاتَكَ، فَإِنْ فَعَلْتُمْ فَهُوَ جَائِزَةٌ»[٤].

واتە: عەطاء دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ عومراو ڕوقبای قەدەغە کردوە، وتم: ڕوقبا چیە؟ وتی: پیاوێک بە پیاوێک دەڵێ: ئەوە بۆ تۆ هەتا لە ژیاندا ماوی، ئەگەر ئەوەتان کرد ئەوە دروستە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٦٢٦، ومسلم: ٣٠ و ١٦٢٥/٣١، وأبو داود: ٣٥٥٨، والترمذي: ١٣٥١، وإبن ماجه: ٢٣٨٣.

(٤) صحيح لغيره.




**٣٧٢٩-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْعُمْرَى جَائِزَةٌ»(١).

**واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: عومرا دروستە.**

**٣٧٣٠-** «عَنْ عَطَاءٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَنْ أُعْطِيَ شَيْئاً حَيَاتَهُ، فَهُوَ لَهُ حَيَاتَهُ وَمَوْتَهُ»(٢).

**واتە: عەطاء دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەر کەس شتێکی پێبەخشرا هەتا لە ژیاندا ماوە، ئەوە بۆ ئەوە بە زیندووی و بە مردوویش.**

**٣٧٣١-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا تُرْقِبُوا وَلَا تُعْمِرُوا، فَمَنْ أُرْقِبَ أَوْ أُعْمِرَ شَيْئاً فَهُوَ لِوَرَثَتِهِ»(٣).

**واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نە ڕوقبا بکەن نە عومرا، هەر کەس شتێک ببەخشێ بە ڕوقبا، یان عومرا ئەوە بۆ میراتگری ئەو کەسەیە کە پێی بەخشراوە.**

**٣٧٣٢-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا عُمْرَى وَلَا رُقْبَى، فَمَنْ أُعْمِرَ شَيْئاً أَوْ أُرْقِبَهُ فَهُوَ لَهُ حَيَاتَهُ وَمَمَاتَهُ»(٤).

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نە عومرا هەیە نە ڕوقبا، هەر کەس شتێک ببەخشێ بە عومرا یان ڕوقبا ئەوە بۆ ئەوکەسەیە لە ژیان و مردنی.**

**٣٧٣٣-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا عُمْرَى وَلَا رُقْبَى، فَمَنْ أُعْمِرَ شَيْئاً أَوْ أُرْقِبَهُ فَهُوَ لَهُ حَيَاتَهُ وَمَمَاتَهُ»(٥).

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نە عومرا هەیە نە ڕوقبا، هەر کەس شتێ ببەخشێ بە عومرا یان ڕوقبا ئەوە بۆ ئەو کەسەیە لە ژیان و مردنی.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٥٥٦.

(٤) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ٢٣٨٢.

(٥) صحيح.




**٣٧٣٤-** «عَنْ حَبِيبِ بْنِ أَبِي ثَابِتٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الرُّقْبَى، وَقَالَ: مَنْ أُرْقِبَ رُقْبَى فَهُوَ لَهُ»[1].

**واتە: حەبیبی کوڕی ئەبو ثابت دەڵێ: گوێم لە ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوقبای قەدەغە کردوە، هەرکەس ماڵێ ببەخشێ بە ڕوقبا ئەوە بۆ ئەو کەسەیە کە پێی بەخشراوە.**

**٣٧٣٥-** «عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، أَنَّهُ سَمِعَ جَابِراً ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ أُعْمِرَ شَيْئاً فَهُوَ لَهُ حَيَاتَهُ وَمَمَاتَهُ»[2].

**واتە: ئەبو زوبەیر دەگێڕێتەوە: ئەو گوێی لە جابر ﷺ بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس شتێ ببەخشێ بە عومرا ئەوە بۆ ئەو کەسەیە لە ژیان و مردنی.**

**٣٧٣٦-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ، أَمْسِكُوا عَلَيْكُمْ «يَعْنِي أَمْوَالَكُمْ» لَا تُعْمِرُوهَا، فَإِنَّهُ مَنْ أَعْمَرَ شَيْئاً فَإِنَّهُ لِمَنْ أُعْمِرَهُ حَيَاتَهُ وَمَمَاتَهُ»[3].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی کۆمەڵی ئەنصار دەستبگرن بە ماڵەکانتانەوە، بە عومرا مەیبەخشن، چونکە هەرکەس شتێ بە عومرا ببەخشێ ئەوە بۆ ئەو کەسەیە کە پێی بەخشیوە لە ژیان و مردنیدا.**

**٣٧٣٧-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَمْسِكُوا عَلَيْكُمْ أَمْوَالَكُمْ وَلَا تُعْمِرُوهَا، فَمَنْ أُعْمِرَ شَيْئاً حَيَاتَهُ، فَهُوَ لَهُ حَيَاتَهُ وَبَعْدَ مَوْتِهِ»[4].

**واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی کۆمەڵی ئەنصار دەستبگرن بە ماڵەکانتانەوە، بە عومرا مەیبەخشن، هەرکەس شتێ بە عومرا ببەخشێ ئەوە بۆ ئەو کەسەیە کە پێی بەخشیوە لە ژیان و مردنیدا.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٦ و ٢٧ و ١٦٢٥/٢٨.

(٤) صحيح.




**٣٧٣٨-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الرُّقْبَى لِمَنْ أُرْقِبَهَا»(١).

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەموویەتی: ڕوقبا بۆ ئەو کەسەیە پێی بەخشراوە.

**٣٧٣٩-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْعُمْرَى جَائِزَةٌ لِأَهْلِهَا، وَالرُّقْبَى جَائِزَةٌ لِأَهْلِهَا»(٢).

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: عومرا دروستە بۆ خاوەنەکەی، ڕوقباش دروستە بۆ خاوەنەکەی.

## باسی جیاوازی لەسەر زوهری (لە فەرموودەکەدا)

**٣٧٤٠-** «عَنْ الْأَوْزَاعِيِّ عن الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ أُعْمِرَ عُمْرَى فَهِيَ لَهُ وَلِعَقِبِهِ، يَرِثُهَا مَنْ يَرِثُهُ مِنْ عَقِبِهِ»(٣).

واتە: ئەوزاعی دەگێڕێتەوە، لە زوهری، لە عوروە، لە جابرەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس شتێک ببەخشێ بە عومرا، ئەوە بۆ ئەو کەسەیشە کە پێی بەخشراوە، وە بۆ دوای خۆیشێتی، ئەوەی لە دوای ئەو بمێنێتەوە دەبێتە میراتگر.

**٣٧٤١-** «عَنْ أَبِي عَمْرٍو، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْعُمْرَى لِمَنْ أُعْمِرَهَا هِيَ لَهُ وَلِعَقِبِهِ، يَرِثُهَا مَنْ يَرِثُهُ مِنْ عَقِبِهِ»(٤).

واتە: ئەبو عەمرٍ دەگێڕێتەوە، لە ئیبنو شیهاب، لە ئەبو سەلەمە، لە جابرەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس شتێ ببەخشێ بە عومرا، ئەوە بۆ ئەو و ئەو کەسەیشە کە پێی بەخشراوە، وە بۆ دوای خۆیشێتی، ئەوەی لە دوای ئەو بمێنێتەوە دەبێتە میراتگر.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح لغيره.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٦٢٥، ومسلم: ٢٠ و ١٦٢٥/٢٥، وأبو داود: ٣٥٥٠ و ٣٥٥٤، والترمذي: ١٣٥٠، وإبن ماجه: ٢٣٨٠.




**٣٧٤٢-** «عَنِ الْأَوْزَاعِيِّ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ وَأَبي سَلَمَةَ، عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْعُمْرَى لِمَنْ أُعْمِرَهَا هِيَ لَهُ وَلِعَقِبِهِ، يَرِثُهَا مَنْ يَرِثُهُ مِنْ عَقِبِهِ»[١].

**واتە: ئەوزاعی دەگێڕێتەوە، لە زوهری، لە عوروە و ئەبو سەلەمە، لە جابرەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس شتێک ببەخشێ بە عومرا، ئەوە بۆ ئەو و ئەو کەسەیشە کە پێی بەخشراوە، وە بۆ دوای خۆیشێتی، ئەوەی لە دوای ئەو بمێنێتەوە دەبێتە میرات.**

**٣٧٤٣-** «عَنْ أبي عُمَرَ الصَّنْعَانِيِّ عن هِشَامِ بن عُرْوَةَ عن أبيه عن عبد اللَّهِ بن الزُّبَيْرِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَيُّمَا رَجُلٍ أَعْمَرَ رَجُلاً عُمْرَى لَهُ وَلِعَقِبِهِ، فَهِيَ لَهُ وَلِمَنْ يَرِثُهُ مِنْ عَقِبِهِ مَوْرُوثَةٌ»[٢].

**واتە: ئەبو عەمری صەنعانی دەگێڕێتەوە، لە هیشامی کوڕی عوروە، لە باوکی، لە عەبدوڵڵای کوڕی زوبێرەوە (خوا لێیان ڕازی بێ)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر پیاوێک شتێک ببەخشێ بە پیاوێک بە عومرا، ئەوە بۆ ئەو و ئەو کەسەیشە کە لە دوای ئەو دەبێتە میراتگری.**

**٣٧٤٤-** «عَنِ اللَّيْثِ، عَنِ بْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَن، عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ أَعْمَرَ رَجُلاً عُمْرَى لَهُ وَلِعَقِبِهِ، فَقَدْ قَطَعَ قَوْلُهُ حَقَّهُ، وَهِيَ لِمَنْ أُعْمِرَ وَلِعَقِبِهِ»[٣].

**واتە: لەیث دەگێڕێتەوە، لە ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمان، لە جابرەوە ﷺ دەڵێ: بیستم پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: هەرکەس بە عومرا شتێ ببەخشێ بە کەسێک، وە بۆ دوای ئەویش، ئەوە قسەکەی مافەکەی بڕیوەتەوە، ئەوە بۆ ئەو کەسەیە پێی بەخشراوە، وە بۆ دوای ئەویشە.**

**٣٧٤٥-** «عَنْ مَالِكٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبي سَلَمَةَ، عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَيُّمَا رَجُلٍ أُعْمِرَ عُمْرَى لَهُ وَلِعَقِبِهِ، فَإِنَّهَا لِلَّذِي يُعْطَاهَا، لَا تَرْجِعُ إِلَى الَّذِي أَعْطَاهَا، لِأَنَّهُ أَعْطَى عَطَاءً وَقَعَتْ فِيهِ الْمَوَارِيثُ»[٤].

---

**(١) صحيح.**

**(٢) صحيح الإسناد.**

**(٣) صحيح.**

**(٤) صحيح.**




**واتە: مالیک دەگێڕێتەوە، لە زوهری، لە ئەبو سەلەمە، لە جابرەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس شتێ ببەخشێ بە عومرا بۆ ئەو و دوای ئەو، ئەوە بۆ ئەو کەسەیە پێی بەخشراوە، ناگەڕێتەوە بۆ ئەوکەسەی بەخشیویەتی، چونکە شتێکی بەخشیوە میراتگر کەوتۆتە ناویەوە.**

**٣٧٤٦-** «عَنْ عَن شُعيب عَن الزُّهْرِيِّ، عن أبي سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ جَابِراً ﷺ أَخْبَرَهُ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَضَى: أَنَهُ مَنْ أَعْمَرَ رَجُلاً عُمْرَى لَهُ وَلِعَقِبِهِ، فَإِنَّهَا لِلَّذِي أُعْمِرَهَا، يَرِثُهَا مِنْ صَاحِبِهَا الَّذِي أَعْطَاهَا مَا وَقَعَ مِنْ مَوَارِيثِ اللَّهِ وَحَقِّهِ»[1].

**واتە: شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە زوهری، لە ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمان، جابر ﷺ هەواڵی پێداوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد: هەر کەس شتێک ببەخشێ بە عومرا بۆ ئەو و دوای ئەوە، ئەوە بۆ ئەو کەسەیە پێی بەخشراوە، میرات دەبات لە خاوەنەکەی لەوەی پێی بەخشیوە، بەپێی ئەوەی خوا دیاری کردوە لە میرات و مافەکەشی.**

**٣٧٤٧-** «عَنِ ابْنِ أَبي ذِئْبٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبي سَلَمَةَ، عَنْ جَابِرٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَضَى فِيمَنْ أُعْمِرَ عُمْرَى لَهُ وَلِعَقِبِهِ فَهِيَ لَهُ بَتْلَةٌ، لَا يَجُوزُ لِلْمُعْطِي مِنْهَا شَرْطٌ وَلَا ثُنْيَا، قَالَ أَبُو سَلَمَةَ: لِأَنَّهُ أَعْطَى عَطَاءً وَقَعَتْ فِيهِ الْمَوَارِيثُ، فَقَطَعَتِ الْمَوَارِيثُ شَرْطَهُ»[2].

**واتە: ئیبنو ئەبی زیئب دەگێڕێتەوە، لە ئیبنو شیهاب، لە ئەبو سەلەمە، لە جابرەوە ﷺ هەواڵی پێداوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد: هەر کەس شتێک ببەخشێ بە عومرا بۆ ئەو و دوای ئەویش بە هەمیشەیی، دروست نیە ئەو کەسەی بەخشیویەتی هیچ مەرجێک دابنێت، ئەبو سەلەمە وتی: چونکە شتێکی بەخشیوە بووەتە میرات بۆ پێ بەخشراوەکە، میراتگەرەکان مەرجەکەیان بڕیوە.**

**٣٧٤٨-** «عَنْ صَالِحٍ، عَنِ بْنِ شِهَابٍ، أَنَّ أَبَا سَلَمَةَ أَخْبَرَهُ، عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَيُّمَا رَجُلٍ أَعْمَرَ رَجُلاً عُمْرَى لَهُ وَلِعَقِبِهِ، قَالَ: قَدْ أَعْطَيْتُكَهَا وَعَقِبَكَ مَا بَقِيَ مِنْكُمْ أَحَدٌ، فَإِنَّهَا لِمَنْ أُعْطِيَهَا، وَإِنَّهَا لَا تَرْجِعُ إِلَى صَاحِبِهَا مِنْ أَجْلِ أَنَّهُ أَعْطَاهَا عَطَاءً وَقَعَتْ فِيهِ الْمَوَارِيثُ»[3].

---

**(١) صحیح.**

**(٢) صحیح.**

**(٣) صحیح.**




واتە: صالەح دەگێڕێتەوە، لە ئیبنو شیهاب، ئەبو سەلەمە هەواڵی پێداوە، لە جابرەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس شتێک ببەخشێ بە عومرا بۆ ئەو و بۆ دوای ئەویشە، دەڵێ: ئەوەم پێ بەخشیوی وە بۆ دوای تۆش، هەر کەس لە ئێوە بمێنێ، ئەوە بێگومان بۆ ئەو کەسەیە کە پێی بەخشراوە، بە هیچ شێوەیەک ناگەڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی، چونکە ئەو بە جۆرێک بەخشیویەتی میراتی تێدا جێگیر بووە.

**٣٧٤٩-** «عَنْ يَزِيد بنِ أَبي حَبِيبٍ، عَنِ بْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبي سَلَمَةَ عن جَابِرٍ : أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَضَى بِالْعُمْرَى: أَنْ يَهَبَ الرَّجُلُ لِلرَّجُلِ وَلِعَقِبِهِ الْهِبَةَ وَيَسْتَثْنِيَ إِنْ حَدَثَ بِكَ حَدَثٌ وَبِعَقِبِكَ فَهُوَ إِلَيَّ وَإِلَى عَقِبِي، إِنَّهَا لِمَنْ أُعْطِيَهَا وَلِعَقِبِهِ»[١].

واتە: یەزیدی کوڕی ئەبو حەبیب دەگێڕێتەوە، لە ئیبنو شیهاب، لە ئەبو سەلەمە، لە جابرەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دادوەری کرد بە عومرا: پیاوێک شتێک ببەخشێ بە پیاوێکی تر بە عومرا، وە بۆ دوای ئەویش لە میراتگرەکانی، بەڵام ئەوە جیادەکاتەوە ئەگەر شتێکت بەسەرهات، یان بەسەر دوای تۆ، ئەوە بۆ من و میراتگرەکانمە، ئەو شتە بۆ ئەو کەسەیە کە بەخشیویەتی، وە بۆ دوای ئەویش لە میراتگرەکانی.

## باسی جیاوازی یەحیای کوڕی ئەبو کەسیر و موحەممەدی کوڕی عەمرو عەلی کوڕی ئەبو سەلەمە لە فەرموودەکەدا

**٣٧٥٠-** «عَنْ يَحْيى بْنِ أَبِي كَثِير، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ قَالَ: سَمِعْتُ جَابِراً  يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْعُمْرَى لِمَنْ وُهِبَتْ لَهُ»[٢].

واتە: یەحیای کوڕی ئەبو کەثیر دەگێڕێتەوە، لە ئەبو سەلەمەوە دەڵێ: گوێم لە جابر  بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: عومرا بۆ ئەو کەسەیە پێی بەخشراوە.

**٣٧٥١-** «عَنْ يَحْيى بْنِ أَبِي كثير، عَنْ أَبي سَلَمَةَ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنْ نَبِيِّ اللَّهِ ﷺ قَالَ: الْعُمْرَى لِمَنْ وُهِبَتْ لَهُ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




**واتە: یەحیای كوڕی ئەبو كەثیر دەگێڕێتەوە، لە ئەبو سەلەمەوە، لە جابری كوڕی عەبدوڵڵاوە (خوا لێیان ڕازی بێ)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: عومرا بۆ ئەو كەسەیە پێی بەخشراوە.**

**٣٧٥٢-** «عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا عُمْرَى، فَمَنْ أُعْمِرَ شَيْئاً فَهُوَ لَهُ»(١).

**واتە: موحەممەدی دەگێڕێتەوە، لە ئەبو سەلەمە، لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: عومرا نیە، هەر كەس شتێكی بە عومرا بەخشی ئەوە بۆ ئەوە.**

**٣٧٥٣-** «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمرٍو، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ أُعْمِرَ شَيْئاً فَهُوَ لَهُ»(٢).

**واتە: موحەممەدی كوڕی عەمرٍ دەگێڕێتەوە، لە ئەبو سەلەمە، لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەس شتێكی بە عومرا بەخشی ئەوە (واتە: بۆ ئەوكەسەیە كە پێی بەخشراوە).**

**٣٧٥٤-** «عَنِ النَّضْرِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ بَشِيرِ بْنِ نَهِيكٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْعُمْرَى جَائِزَةٌ»(٣).

**واتە: نەضری كوڕی ئەنەس دەگێڕێتەوە، لە بەشیری كوڕی نەهیك، لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: عومرا دروستە.**

**٣٧٥٥-** «عَنْ مُعَاذِ بْنِ هِشَامٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: سَأَلَنِي سُلَيْمَانُ بْنُ هِشَامٍ عَنِ الْعُمْرَى فَقُلْتُ: حَدَّثَ مُحَمَّدُ بْنُ سِيرِينَ، عَنْ شُرَيْحٍ ﷺ قَالَ: قَضَى نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ الْعُمْرَى جَائِزَةٌ. قَالَ قَتَادَةُ: قُلْتُ: حَدَّثَنِي النَّضْرُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ بَشِيرِ بْنِ نَهِيكٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ قَالَ: الْعُمْرَى جَائِزَةٌ، قَالَ قَتَادَةُ: وَقُلْتُ: كَانَ الْحَسَنُ، يَقُولُ: الْعُمْرَى جَائِزَةٌ، قَالَ قَتَادَةُ: فَقَالَ الزُّهْرِيُّ: إِنَّمَا الْعُمْرَى إِذَا أُعْمِرَ وَعَقِبُهُ مِنْ بَعْدِهِ، فَإِذَا لَمْ يَجْعَلْ عَقِبَهُ مِنْ بَعْدِهِ كَانَ لِلَّذِي يَجْعَلُ شَرْطَهُ، قَالَ قَتَادَةُ: فَسُئِلَ عَطَاءُ بْنُ أَبِي رَبَاحٍ، فَقَالَ: حَدَّثَنِي جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ رَسُولَ

---

(١) حسن صحيح. أخرجه إبن ماجه: ٢٣٩٧.

(٢) حسن صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٦٢٦، ومسلم: ١٦٢٦/٣٢، وأبو داود: ٣٥٤٨.

اللَّهِ ﷺ قَالَ: الْعُمْرَى جَائِزَةٌ، قَالَ قَتَادَةُ: فَقَالَ الزُّهْرِيُّ: كَانَ الْخُلَفَاءُ لَا يَقْضُونَ بِهَذَا، قَالَ عَطَاءٌ: قَضَى بِهَا عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ مَرْوَانَ»[١].

**واتە: موعازی کوڕی هیشام دەڵێ: باوکم بۆی باس کردم لە قەتادەوە دەڵێ: سولەیمانی کوڕی هیشام پرسیاری لێکردم لەبارەی عومرا، وتم: موحەممەدی کوڕی سیرین دەگێڕێتەوە لە شورەیحەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد کە بەڕاستی عومرا دروستە. قەتادە وتی: وتم: نەضری کوڕی ئەنەس بۆی گێڕامەوە لە بەشیری کوڕی نەهیک لە ئەبو هورەیرەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بێگومان عومرا دروستە، قەتادە وتی: وتم: حەسەن دەیوت: عومرا دروستە، قەتادە وتی: زوهری وتویەتی: عومرا بۆ هەتا هەتاییە، وە بۆ ئەوانەشە لە دوای ئەو دێن لە میرات گرەکانی، ئەگەر نەیهێشت بۆ دوای ئەو بێت، ئەوە بۆ ئەو کەسەیە کە مەرجی داناوە (واتە: ئەو کەسەی بەخشیویەتی) قەتادە دەڵێ: پرسیار کرا لە عەطائی کوڕی ئەبو ڕیباح وتی: جابر بۆی باس کردم پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: عومرا دروستە، قەتادە وتی: زوهری وتویەتی: جێنشینەکان دادوەریان نەدەکرد بەمە، عەطاء وتی: عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان کاری پێکرد.**

## بەخشینی ژن (لە ماڵی مێردەکەی) بەبێ مۆڵەتی مێردەکەی

**٣٧٥٦-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا يَجُوزُ لِامْرَأَةٍ هِبَةٌ فِي مَالِهَا إِذَا مَلَكَ زَوْجُهَا عِصْمَتَهَا»[٢].

**واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکی، لە باپیرەیەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دروست نیە بۆ هیچ ئافرەتێک لە ماڵەکەی ببەخشێ (کە هی مێردەکەیەتی و، بەڵام لە دەستی ئەو دایە، یان ماڵی خۆیەتی) ئەگەر هاوسەرگیری کردبوو.**

**٣٧٥٧-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ قَالَ: لَمَّا فَتَحَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَكَّةَ قَامَ خَطِيباً فَقَالَ فِي خُطْبَتِهِ: لَا يَجُوزُ لِامْرَأَةٍ عَطِيَّةٌ إِلَّا بِإِذْنِ زَوْجِهَا»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) حسن صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٥٤٦، وإبن ماجه: ٢٣٨٨.

(٣) حسن صحيح.

اللهِ ﷺ قَالَ: الْعُمْرَى جَائِزَةٌ، قَالَ قَتَادَةُ: فَقَالَ الزُّهْرِيُّ: كَانَ الْخُلَفَاءُ لَا يَقْضُونَ بِهَذا، قَالَ عَطَاءٌ: قَضَى بِهَا عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ مَرْوَانَ»[١].

واتە: موعازی کوڕی هیشام دەڵێ: باوکم بۆی باس کردم لە قەتادەوە دەڵێ: سولەیمانی کوڕی هیشام پرسیاری لێکردم لەبارەی عومرا، وتم: موحەممەدی کوڕی سیرین دەگێڕێتەوە لە شورەیحەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد کە بەڕاستی عومرا دروستە. قەتادە وتی: وتم: نەضری کوڕی ئەنەس بۆی گێڕامەوە لە بەشیری کوڕی نەهیک لە ئەبو هورەیرەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بێگومان عومرا دروستە، قەتادە وتی: وتم: حەسەن دەیوت: عومرا دروستە، قەتادە وتی: زوهری وتویەتی: عومرا بۆ هەتا هەتاییە، وە بۆ ئەوانەشە لە دوای ئەو دێن لە میرات گرەکانی، ئەگەر نەیهێشت بۆ دوای ئەو بێت، ئەوە بۆ ئەو کەسەیە کە مەرجی داناوە (واتە: ئەو کەسەی بەخشیویەتی) قەتادە دەڵێ: پرسیار کرا لە عەطائی کوڕی ئەبو ڕیباح وتی: جابر بۆی باس کردم پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: عومرا دروستە، قەتادە وتی: زوهری وتویەتی: جێنشینەکان دادوەریان نەدەکرد بەمە، عەطاء وتی: عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان کاری پێکرد.

## بەخشینی ژن (لە ماڵی مێردەکەی) بەبێ مۆڵەتی مێردەکەی

**٣٧٥٦-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا يَجُوزُ لِامْرَأَةٍ هِبَةٌ فِي مَالِهَا إِذَا مَلَكَ زَوْجُهَا عِصْمَتَهَا»[٢].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکی، لە باپیرەیەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دروست نیە بۆ هیچ ئافرەتێک لە ماڵەکەی ببەخشێ (کە هی مێردەکەیەتی و، بەڵام لە دەستی ئەو دایە، یان ماڵی خۆیەتی) ئەگەر هاوسەرگیری کردبوو.

**٣٧٥٧-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ قَالَ: لَمَّا فَتَحَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَكَّةَ قَامَ خَطِيباً فَقَالَ فِي خُطْبَتِهِ: لَا يَجُوزُ لِامْرَأَةٍ عَطِيَّةٌ إِلَّا بِإِذْنِ زَوْجِهَا»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) حسن صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٥٤٦، وابن ماجه: ٢٣٨٨.

(٣) حسن صحيح.

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکی، لە باپیرەیەوە ﷺ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ مەککەی ڕزگار کرد هەڵسا وتارێکیدا لە وتارەکەیدا فەرمووی: دروست نیە بۆ هیچ ئافرەتێک ببەخشێ تەنها بە مۆڵەتی مێردەکەی نەبێت.

**٣٧٥٨-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَلْقَمَةَ الثَّقَفِيِّ ﷺ قَالَ: قَدِمَ وَفْدُ ثَقِيفٍ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَمَعَهُمْ هَدِيَّةٌ، فَقَالَ: أَهَدِيَّةٌ أَمْ صَدَقَةٌ؟ فَإِنْ كَانَتْ هَدِيَّةٌ فَإِنَّمَا يُبْتَغَى بِهَا وَجْهُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَقَضَاءُ الْحَاجَةِ، وَإِنْ كَانَتْ صَدَقَةٌ فَإِنَّمَا يُبْتَغَى بِهَا وَجْهُ اللَّهِ ﷻ، قَالُوا: لَا بَلْ هَدِيَّةٌ، فَقَبِلَهَا مِنْهُمْ وَقَعَدَ مَعَهُمْ يُسَائِلُهُمْ وَيُسَائِلُونَهُ حَتَّى صَلَّى الظُّهْرَ مَعَ الْعَصْرِ»[١].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەلقەمەی ثەقەفی ﷺ دەڵێ: نێردراوی ثەقیف هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ دیاریەکیان لەگەڵ خۆیان هێنا بوو، فەرمووی: ئایا ئەمە دیاریە یان صەدەقەیە؟ جا ئەگەر دیاریە ئەوە مەبەست پێی پێغەمبەری خوایە ﷺو پڕکردنەوەی پێویستیە، وە ئەگەر بەخشینیش بێت ئەوە بۆ خوایە، وتیان: نەخێر، بەڵکو دیاریە، لێیانی وەرگرت و لەگەڵیان دانیشت، پرسیاری لێ دەکردن و ئەوانیش پرسیاریان لێ دەکرد، تا نوێژی نیوەڕۆی کرد.

**٣٧٥٩-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ لَا أَقْبَلَ هَدِيَّةً إِلَّا مِنْ قُرَشِيٍّ أَوْ أَنْصَارِيٍّ أَوْ ثَقَفِيٍّ أَوْ دَوْسِيٍّ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هات بە خەیاڵمدا دیاری وەرنەگرم مەگەر لە کەسێکی قورەیشی یان ئەنصاڕی یان ثەقەفی یان دەوسی نەبێت. (چونکە شوێنەواری بەخشندەییان پێوە دیار بوو).

**٣٧٦٠-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أُتِيَ بِلَحْمٍ فَقَالَ: مَا هَذَا؟ فَقِيلَ: تُصُدِّقَ بِهِ عَلَى بَرِيرَةَ، فَقَالَ: هُوَ لَهَا صَدَقَةٌ وَلَنَا هَدِيَّةٌ»[٣].

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە، گۆشتێکیان هێنا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ئەمە چیە؟ وترا: بەخشراوە بە بەریرە، فەرمووی: ئەوە بۆ ئەو بەخشینە و بۆ ئێمەش دیاریە.

---

(١) ضعيف الإسناد.

(٢) حسن صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٥٣٧، والترمذي: ٣٩٤٥ و ٣٩٤٦.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٩٥ و ٢٥٧٧، ومسلم: ١٠٧٤، وأبو داود: ١٦٥٥.




**٣٧٦١-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَتْ يَمِينٌ يَحْلِفُ عَلَيْهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا وَمُقَلِّبِ الْقُلُوبِ»[١].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سوێندی دەخواردو دەیفەرموو: نەخێر سوێند بەو زاتەی دڵەکان ئەم دیو و ئەودیو دەکات و وەریان دەچەرخێنێت.**

## سوێند خواردن بەو زاتەی دڵەکان دەگۆڕێ

**٣٧٦٢-** «عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: كَانَتْ يَمِينُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الَّتِي يَحْلِفُ بِهَا: لَا وَمُصَرِّفِ الْقُلُوبِ»[٢].

**واتە: سالم دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کە سوێندی پێ دەخوارد دەیفەرموو: نەخێر سوێند بەو زاتەی دڵەکان دەگۆڕێت.**

## سوێند خواردن بە عیزەتی خوا ﷻ

**٣٧٦٣-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَمَّا خَلَقَ اللَّهُ الْجَنَّةَ وَالنَّارَ أَرْسَلَ جِبْرِيلَ عَلَيْهِ السَّلَامُ إِلَى الْجَنَّةِ، فَقَالَ: انْظُرْ إِلَيْهَا وَإِلَى مَا أَعْدَدْتُ لِأَهْلِهَا فِيهَا. فَنَظَرَ إِلَيْهَا فَرَجَعَ، فَقَالَ: وَعِزَّتِكَ لَا يَسْمَعُ بِهَا أَحَدٌ إِلَّا دَخَلَهَا. فَأَمَرَ بِهَا فَحُفَّتْ بِالْمَكَارِهِ، فَقَالَ: اذْهَبْ إِلَيْهَا فَانْظُرْ إِلَيْهَا وَإِلَى مَا أَعْدَدْتُ لِأَهْلِهَا فِيهَا. فَنَظَرَ إِلَيْهَا، فَإِذَا هِيَ قَدْ حُفَّتْ بِالْمَكَارِهِ، فَقَالَ: وَعِزَّتِكَ لَقَدْ خَشِيتُ أَنْ لَا يَدْخُلَهَا أَحَدٌ. قَالَ: اذْهَبْ فَانْظُرْ إِلَى النَّارِ وَإِلَى مَا أَعْدَدْتُ لِأَهْلِهَا فِيهَا. فَنَظَرَ إِلَيْهَا فَإِذَا هِيَ يَرْكَبُ بَعْضُهَا بَعْضاً، فَرَجَعَ فَقَالَ: وَعِزَّتِكَ لَا يَدْخُلُهَا أَحَدٌ. فَأَمَرَ بِهَا فَحُفَّتْ بِالشَّهَوَاتِ، فَقَالَ: ارْجِعْ فَانْظُرْ إِلَيْهَا. فَنَظَرَ إِلَيْهَا فَإِذَا هِيَ قَدْ حُفَّتْ بِالشَّهَوَاتِ، فَرَجَعَ وَقَالَ: وَعِزَّتِكَ لَقَدْ خَشِيتُ أَنْ لَا يَنْجُوَ مِنْهَا أَحَدٌ إِلَّا دَخَلَهَا»[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ خوا ﷻ بەهەشت و ئاگری دروست کرد، جبریلی نارد بۆ لای بەهەشت فەرمووی: تەماشای بکە، وە ئەوەش**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٦١٧ و ٦٦٢٨، والترمذي: ١٥٤٠، وإبن ماجه: ٢٠٩٢ و ٣٢٦٣.

(٢) حسن.

(٣) حسن صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٧٤٤، والترمذي: ٢٥٦٠.




کە ئامادەم کردوە بۆ خەڵکەکە تیایدا، تەماشای کردو گەڕایەوە، وتی: هیچ کەسێک نایبیستێ ئیللا دەچێتە ناویەوە، فەرمانی پێکرد دەوردرا بە ناڕەحەتی، فەرمووی: بڕۆ تەماشای بکە، وە ئەوەشی کە ئامادەم کردوە بۆ خەڵکەکەی، تەماشای کرد دەور درابوو بە ناڕەحەتی، وتی: سوێند بە عیزەتت ترسام لەوەی کەس نەچێتە ناویەوە. فەرمووی: بڕۆ تەماشای ئاگر بکە، وە ئەوەش کە ئامادەم کردوە بۆ خەڵکەی تیایدا، تەماشای کرد بینی هەندێکی دەکەوێ بەسەر هەندێکی دیکەدا، گەڕایەوەو وتی: سوێند بە عیزەتت کەس ناچێتە ناویەوە، فەرمانی پێکرد دەوردرا بە ئارەزوەکان، فەرمووی: بڕۆ تەماشای بکە، گەڕایەوەو وتی: سوێند بە عیزەتت ترسام لەوەی کەس ڕزگاری نەبێ لێی.

## هەڕەشەکردن لەسەر سوێند خواردن بە غەیری خوا ﷻ

٣٧٦٤- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ كَانَ حَالِفاً فَلَا يَحْلِفْ إِلَّا بِاللَّهِ، وَكَانَتْ قُرَيْشٌ تَحْلِفُ بِآبَائِهَا، فَقَالَ: لَا تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ»[١].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس سوێند دەخوا با سوێند نە خوا تەنها بە خوا نەبێ، قورەیش سوێندیان بە باپیرانیان دەخوارد، فەرمووی: سوێند بە باوک و باپیرانتان مەخۆن.**

**٣٧٦٥-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ اللَّهَ يَنْهَاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ»[٢].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوا قەدەغەی کردوە سوێند بە باوک و باپیرانتان بخۆن.**

## سوێند خواردن بە باوک و باپیران

**٣٧٦٦-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيُّ ﷺ عُمَرَ مَرَّةً وَهُوَ يَقُولُ: وَأَبِي وَأَبِي، فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ يَنْهَاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ، فَوَاللَّهِ مَا حَلَفْتُ بِهَا بَعْدُ ذَاكِراً وَلَا آثِراً»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٨٣٦ و ٦٦٤٨ و ٧٤٠١، ومسلم: ١٦٤٦.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٤٦/٢، والترمذي: ١٥٣٣.

(٣) صحيح.




واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ جارێک بیستی عومەر دەیوت: سوێند بە باوکم سوێند بە باوکم، فەرمووی: خوا ﷻ قەدەغەی کردوە سوێند بە باوکتان بخۆن، سوێند بە خوا دوای ئەوە نەسوێندم بە باوکم خوارد نە بە هیچ کەسێکی تر.

**٣٧٦٧-** «عَنْ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ يَنْهَاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ، قَالَ عُمَرُ: فَوَاللَّهِ مَا حَلَفْتُ بِهَا بَعْدُ ذَاكِراً وَلَا آثِراً»(١).

واتە: عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوا قەدەغەی کردوە سوێند بە باوکتان بخۆن، عومەر وتی: سوێند بە خوا دوای ئەوە نە سوێندم بە باوکم خوارد نە بە هیچ کەسێکی تر.

**٣٧٦٨-** «عَنْ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ يَنْهَاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ، قَالَ عُمَرُ: فَوَاللَّهِ مَا حَلَفْتُ بِهَا بَعْدُ ذَاكِراً وَلَا آثِراً»(٢).

واتە: عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا قەدەغەی کردوە سوێند بە باوکتان بخۆن، عومەر وتی: سوێند بەخوا دوای ئەوە نە سوێندم بە باوکم خوارد نە بە هیچ کەسێکی تر.

## سوێند خواردن بە دایکان

**٣٧٦٩-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ وَلَا بِأُمَّهَاتِكُمْ وَلَا بِالْأَنْدَادِ، وَلَا تَحْلِفُوا إِلَّا بِاللَّهِ، وَلَا تَحْلِفُوا إِلَّا وَأَنْتُمْ صَادِقُونَ»(٣).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوێند مەخۆن نە بە باوکانتان و نە بە دایکانتان و نە بە بتەکان، وە سوێند مەخۆن تەنها بەخوا نەبێت، وە سوێند مەخۆن لەکاتێکدا نەبێت ڕاستگۆ بن لە سوێندەکەتان.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٦٤٧، ومسلم: ١٦٤٦، وأبو داود: ٣٢٤٩ و ٣٢٥٠، وإبن ماجه: ٢٠٩٤.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٢٤٨.

## سوێند خواردن بە دین و شەریعەتێكی تر جگە لە ئیسلام

**٣٧٧٠-** «عَنْ ثَابِتِ بْنِ الضَّحَّاكِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ حَلَفَ بِمِلَّةٍ سِوَى الْإِسْلَامِ كَاذِباً فَهُوَ كَمَا قَالَ «قَالَ قُتَيْبَةُ، فِي حَدِيثِهِ»: مُتَعَمِّداً، وَقَالَ يَزِيدُ: كَاذِباً فَهُوَ كَمَا قَالَ، وَمَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِشَيْءٍ عَذَّبَهُ اللَّهُ بِهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ»(١).

**واتە: ثابتی كوڕی ضەحاك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەركەس سوێند بە درۆ بخوات بە دین و شەریعەتێكی تر جگە لە ئیسلام ئەوە پێی بێ بڕوا دەبێ وەك چۆن وتویەتی، «قوتەیبە لە فەرموودەكەیدا دەڵێ:» بە ئەنقەست، وە یەزیدیش دەڵێ: بە درۆ، ئەوە پێی بێبڕوا دەبێ وەك چۆن وتویەتی، هەركەسیش خۆی بە شتێك بكوژێ خوا بەو شتە لە ناو ئاگری دۆزەخدا سزای دەدات.**

**٣٧٧١-** «عَنْ ثَابِتِ بْنِ الضَّحَّاكِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ حَلَفَ بِمِلَّةٍ سِوَى الْإِسْلَامِ كَاذِباً فَهُوَ كَمَا قَالَ، وَمَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِشَيْءٍ عُذِّبَ بِهِ فِي الْآخِرَةِ»(٢).

**واتە: ثابتی كوڕی ضەحاك ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەس سوێند بە درۆ بخوات بە میللەتێك جگە لە ئیسلام ئەوە پێی بێبڕوا دەبێ وەك چۆن وتویەتی، هەركەسیش خۆی بە شتێك بكوژێ، خوا بەو شتە لە ڕۆژی دوایی دا سزای دەدات.**

## سوێند خواردن بە بەری بوون لە ئیسلام

**٣٧٧٢-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ قَالَ: إِنِّي بَرِيءٌ مِنَ الْإِسْلَامِ، فَإِنْ كَانَ كَاذِباً فَهُوَ كَمَا قَالَ، وَإِنْ كَانَ صَادِقاً لَمْ يَعُدْ إِلَى الْإِسْلَامِ سَالِماً»(٣).

**واتە: عەبدوڵڵای كوڕی بورەیدە دەگێڕێتەوە، لە باوكیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەس بڵێ: من بەریم لە ئیسلام، ئەگەر بە درۆ بڵێ ئەوە**

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٦٣ و ٤١٧١ و ٤٨٤٣ و ٦٠٤٧ و ٦١٠٥ و ٦٦٥٢، ومسلم: ١٧٦ و ١٧٧/١١٠، وأبو داود: ٣٢٥٧، والترمذي: ١٥٢٧ و ١٥٤٣ و ٢٦٣٦، وإبن ماجه: ٢٠٩٨.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٢٥٨، وإبن ماجه: ٢١٠٠.




پێی بێبڕوا دەبێ وەک چۆن وتویەتی، وە ئەگەر بە ڕاستیش بڵێ ئەوە بە سەلامەتی ناگەڕێتەوە بۆ ناو ئیسلام.

## سوێند خواردن بە کەعبە

**٣٧٧٣-** «عَنْ قُتَيْلَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، امْرَأَةٍ مِنْ جُهَيْنَةَ: أَنَّ يَهُودِيًّا أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: إِنَّكُمْ تُنَدِّدُونَ، وَإِنَّكُمْ تُشْرِكُونَ تَقُولُونَ: مَا شَاءَ اللَّهُ وَشِئْتَ، وَتَقُولُونَ: وَالْكَعْبَةِ، فَأَمَرَهُمُ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا أَرَادُوا أَنْ يَحْلِفُوا أَنْ يَقُولُوا: وَرَبِّ الْكَعْبَةِ، وَيَقُولُونَ: مَا شَاءَ اللَّهُ، ثُمَّ شِئْتَ»[١].

**واتە:** قوتەیلە ﵂، کە ئافرەتێک بوو لە جوهەینە دەگێڕێتەوە، جولەکەیەک هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: ئێوە هاوبەش بۆ خوا دادەنێن و دەڵێن: ئەوەی خوا ویستی و تۆش ویستت، (مەبەست پێی پێغەمبەرە ﷺ) وە دەڵێن: سوێند بە کەعبە، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردن کاتێ ویستیان سوێند بخۆن بڵێن: بە پەروەردگاری کەعبە، وە بڵێن: خوا ویستی و، پاشان تۆ.

## سوێند خواردن بە تاغوتەکان

**٣٧٧٤-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَمُرَةَ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَا تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ وَلَا بِالطَّوَاغِيتِ»[٢].

**واتە:** عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەموڕە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نە سوێند بە باوو باپیرانتان بخۆن، نە بە بتەکان.

## سوێند خواردن بە لات

**٣٧٧٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ حَلَفَ مِنْكُمْ فَقَالَ: بِاللَّاتِ، فَلْيَقُلْ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَمَنْ قَالَ لِصَاحِبِهِ: تَعَالَ أُقَامِرْكَ، فَلْيَتَصَدَّقْ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٤٨، وابن ماجه: ٢٠٩٥.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٨٦٠ و ٦١٠٧ و ٦٣٠١ و ٦٦٥٠، ومسلم: ١٦٤٧، وأبو داود: ٣٢٤٧، والترمذي: ١٥٤٥، وابن ماجه: ٢٠٩٦.




**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس لە ئێوە سوێندی خوارد، وتی: بە لات، ئەوە با بڵێ: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)، هەرکەسیش بە هاوەڵەکەی بڵێ: بێ با قومارت لەگەڵ بکەم، ئەوە با شتێک ببەخشێ بە ئەندازەی ئەوەی بۆ قومارەکە داینیاوە.**

## سوێند خواردن بە لات و عوزا

**٣٧٧٦-** «عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: كُنَّا نَذْكُرُ بَعْضَ الْأَمْرِ وَأَنَا حَدِيثُ عَهْدٍ بِالْجَاهِلِيَّةِ فَحَلَفْتُ بِاللَّاتِ وَالْعُزَّى، فَقَالَ لِي أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: بِئْسَ مَا قُلْتَ: ائْتِ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَأَخْبِرْهُ، فَإِنَّا لَا نَرَاكَ إِلَّا قَدْ كَفَرْتَ، فَأَتَيْتُهُ فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ لِي: قُلْ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، وَتَعَوَّذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، وَاتْفُلْ عَنْ يَسَارِكَ، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، وَلَا تَعُدْ لَهُ»[١].

**واتە: موصعەبی کوڕی سەعد دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: ئێمە باسی هەندێ کاروبارمان کرد، منیش نزیک بووم لە سەردەمی نەفامیەوە بۆیە سوێندم بە لات و عوزا خوارد، هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ پێیان وتم: بەڕاستی قسەیەکی خراپت کرد، برۆ بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وهەواڵی پێ بدە، ئێمە وا دەبینین تۆ کوفرت کردوە، منیش هاتم بۆ لای پێغەمبەرو هەواڵم پێدا، پێمی فەرموو: سێ جار بڵێ: هیچ پەرستراوێک بە حەق نیە جگە لە خوای تاک و تەنهای بێ هاوبەش، وە سێ جار پەنا بگرە بە خوا لە شەیتان، سێ جاریش تف بە لای چەپتدا بکە، جارێکی تر مەگەڕێرەوە بۆ سەر ئەوە.**

**٣٧٧٧-** «عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: حَلَفْتُ بِاللَّاتِ وَالْعُزَّى، فَقَالَ لِي أَصْحَابِي: بِئْسَ مَا قُلْتَ: قُلْتَ هُجْراً، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: قُلْ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، وَانْفُثْ عَنْ يَسَارِكَ، ثَلَاثاً، وَتَعَوَّذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ، ثُمَّ لَا تَعُدْ»[٢].

---

(١) ضعيف. أخرجه إبن ماجه: ٢٠٩٧.

(٢) ضعيف.




واتە: موصعەبی کوڕی سەعد دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: من سوێندم بە لات و عوزا خوارد، هاوەڵانم پێیان وتم: بەڕاستی قسەیەکی خراپ و ناشرینت کرد، هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەوەم بۆی باسکرد، فەرمووی بڵێ: هیچ پەرستراوێک بە حەق نیە جگە لە خوای تاک و تەنهای بێ هاوبەش، موڵک و ستایش هەر بۆ ئەوە، وە ئەو بە دەسەڵاتە بەسەر هەموو شتێکدا، سێ جاریش تف بە لای چەپتدا بکە، وە پەنا بگرە بە خوا لە شەیتان، پاشان جارێکی تر مەگەڕێرەوە بۆ سەر ئەوە.

## سوێند بردنە سەر

**٣٧٧٨-** «عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِسَبْعٍ: أَمَرَنَا بِاتِّبَاعِ الْجَنَائِزِ، وَعِيَادَةِ الْمَرِيضِ، وَتَشْمِيتِ الْعَاطِسِ، وَإِجَابَةِ الدَّاعِي، وَنَصْرِ الْمَظْلُومِ، وَإِبْرَارِ الْقَسَمِ، وَرَدِّ السَّلَامِ»[١].

واتە: بەڕائی کوڕی عازب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردین بە حەوت شت: فەرمانی پێکردین بە شوێنکەوتنی جەنازەو سەردانی نەخۆش و نزاکردن بۆ ئەو کەسەی دەپژمێت، وە چوون بۆ سەر دەعوەتی و سەرخستنی ستەم لێکراوو سوێند بردنە سەروو بڵاوکردنەوەی سەلام کردن.

## هەر کەس سوێند لەسەر شتێک بخوات دواتر ببینێ غەیری ئەوە بۆی چاکترە

**٣٧٨٩-** «عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَا عَلَى الْأَرْضِ يَمِينٌ أَحْلِفُ عَلَيْهَا فَأَرَى غَيْرَهَا خَيْراً مِنْهَا إِلَّا أَتَيْتُهُ»[٢].

واتە: ئەبو موسا ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر شتێک لەسەر زەویدا سوێندی لەسەر بخۆم، بەڵام غەیری ئەوە بە چاکتر بزانم ئیللا ئەوە هەڵدەبژێرم کە خێری تێدایە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣١٣٣ و ٤٣٨٥ و ٥٥١٧ و ٥٥١٨ و ٦٦٤٩ و ٦٧٢١ و ٧٥٥٥، ومسلم: ٩ و ١٦٤٩/١٠، والترمذي: ١٨٢٦ و ١٨٢٧.




## کەفارەت پێش سوێند شکاندنە

**٣٧٨٠-** «عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي رَهْطٍ مِنَ الْأَشْعَرِيِّينَ نَسْتَحْمِلُهُ، فَقَالَ: وَاللَّهِ لَا أَحْمِلُكُمْ، وَمَا عِنْدِي مَا أَحْمِلُكُمْ، ثُمَّ لَبِثْنَا مَا شَاءَ اللَّهُ، فَأُتِيَ بِإِبِلٍ فَأَمَرَ لَنَا بِثَلَاثِ ذَوْدٍ، فَلَمَّا انْطَلَقْنَا قَالَ بَعْضُنَا لِبَعْضٍ: لَا يُبَارِكُ اللَّهُ لَنَا، أَتَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَسْتَحْمِلُهُ فَحَلَفَ أَنْ لَا يَحْمِلَنَا، قَالَ أَبُو مُوسَى: فَأَتَيْنَا النَّبِيَّ ﷺ فَذَكَرْنَا ذَلِكَ لَهُ فَقَالَ: مَا أَنَا حَمَلْتُكُمْ بَلِ اللَّهُ حَمَلَكُمْ، إِنِّي وَاللَّهِ لَا أَحْلِفُ عَلَى يَمِينٍ فَأَرَى غَيْرَهَا خَيْراً مِنْهَا، إِلَّا كَفَّرْتُ عَنْ يَمِينِي وَأَتَيْتُ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ»[١].

**واتە: ئەبو موسای ئەشعری ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ کۆمەڵێک لە ئەشعەریەکان داوامان کرد وشترمان پێبدات سواری بین (لە غەزای تەبووک) فەرمووی: سوێند بە خوا من وشترتان پێنادەم سواری بن، هیچیشم لا نیە بتاندەمێ، پاشان ماینەوە ئەوەندەی خوا ویستی لەسەر بوو، کۆمەڵە وشترێکیان بۆ هێنا سێ دانەی لێدا بە ئێمە، کاتێ دەرچووین هەندێکمان بە هەندێکی تری وت: خوا قڕی تێ بخات، هاتین بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وشترمان پێبدات سواری ببین، سوێندی خوارد نەماندارتێ، ئەبو موسا وتی: هاتین بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئەوەمان بۆی باس کرد، فەرمووی: من وشترم پێنەدان خوا پێی دان، سوێند بە خوا من سوێندێ بخۆم ئەگەر بزانم غەیری ئەوە خێری تێدایە، کەفارەتی سوێندەکەم دەدەم و ئەوە ئەنجام دەدەم کە خێری تێدایە.**

**٣٧٨١-** «عَنْ عَمْرُو بْنُ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ فَرَأَى غَيْرَهَا خَيْراً مِنْهَا فَلْيُكَفِّرْ عَنْ يَمِينِهِ وَلْيَأْتِ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ»[٢].

**واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، لە باپیرەیەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس سوێند بخوا لەسەر شتێک، دواتر ببینێ غەیری ئەوە لەو کارە چاکترە کە سوێندی لەسەر خواردوە، ئەوا با کەفارەتی سوێندەکەی بدات و ئەو کارە بکات کە لەوە چاکترە.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٤١٥ و ٦٦٢٣ و ٦٧١٨ و ٦٧١٩، ومسلم: ٧ و ١٦٤٩/٨، وأبو داود: ٣٢٧٦، وإبن ماجه: ٢١٠٧.

(٢) حسن صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٢٧٤.




**٣٧٨٢-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِذَا حَلَفَ أَحَدُكُمْ عَلَى يَمِينٍ فَرَأَى غَيْرَهَا خَيْراً مِنْهَا فَلْيُكَفِّرْ عَنْ يَمِينِهِ، وَلْيَنْظُرِ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ فَلْيَأْتِهِ»[1].

**واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەموڕە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێک لە ئێوە سوێندی خوارد لەسەر شتێ، دواتر ببینێ غەیری ئەوە لەو کارە چاکترە کە سوێندی لەسەر خواردوە، ئەوە با کەفارەتی سوێندەکەی بدات و تەماشای ئەو کارە بکات کە لەوە چاکترەو ئەنجامی بدات.**

**٣٧٨٣-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا حَلَفْتَ عَلَى يَمِينٍ فَكَفِّرْ عَنْ يَمِينِكَ، ثُمَّ ائْتِ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ»[2].

**واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەموڕە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر سوێندت خوارد لەسەر شتێک، کەفارەتی سوێندەکەت بدە، پاشان ئەو کارە بکە کە چاکترە.**

**٣٧٨٤-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: إِذَا حَلَفْتَ عَلَى يَمِينٍ، فَرَأَيْتَ غَيْرَهَا خَيْراً مِنْهَا فَكَفِّرْ عَنْ يَمِينِكَ، وَأْتِ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ»[3].

**واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەموڕە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر سوێندت خوارد، بینیت غەیری ئەوە لەو کارە چاکترە کە سوێندت لەسەر خواردوە، ئەوە کەفارەتی سوێندەکەت بدە، پاشان ئەو کارە بکە کە چاکترە.**

## کەفارەت دان لە دوای شکاندنی سوێندە

**٣٧٨٥-** «عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ فَرَأَى غَيْرَهَا خَيْراً مِنْهَا فَلْيَأْتِ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ، وَلْيُكَفِّرْ عَنْ يَمِينِهِ»[4].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٦٢٢ و ٦٧٢٢ و ٧١٤٦ و ٧١٤٧، ومسلم: ١٦٥٢، وأبو داود: ٣٢٧٧ و ٣٢٧٨ و ٢٩٢٩، والترمذي: ١٥٢٩.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




**واتە: عەدی كوڕی حاتەم ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەركەس سوێندی خوارد لەسەر شتێ، دواتر ببینێ غەیری ئەوە لەو كارە چاكترە كە سوێندی لەسەر خواردوە، ئەوە با ئەو كارە بكات كە لەوە چاكترە، وە كەفارەتی سوێندەكەی بدات.**

**٣٧٨٦-** «عَنْ عَدِيٍّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ فَرَأَى غَيْرَهَا خَيْراً مِنْهَا فَلْيَدَعْ يَمِينَهُ وَلْيَأْتِ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ، وَلْيُكَفِّرْهَا»[١].

**واتە: عەدی كوڕی حاتەم ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەس سوێندی خوارد لەسەر شتێک، دواتر ببینێ غەیری ئەوە لەو كارە چاكترە كە سوێندی لەسەر خواردوە، ئەوا با واز لە سوێندەكەی بێنێ، ئەو كارە بكات كە لەوە چاكترە، وە با كەفارەتی سوێندەكەی بدات.**

**٣٧٨٧-** «عَنْ عَدِيٍّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ فَرَأَى خَيْراً مِنْهَا فَلْيَأْتِ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ، وَلْيَتْرُكْ يَمِينَهُ»[٢].

**واتە: عەدی كوڕی حاتەم ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەركەس سوێندی خوارد لەسەر شتێ، دواتر ببینێ غەیری ئەوە لەو كارە چاكترە كە سوێندی لەسەر خواردوە، ئەوە با ئەو كارە بكات كە چاكترە، وە با واز لە سوێندەكەی بێنێ.**

**٣٧٨٨-** «عَنْ أَبِي الْأَحْوَصِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ ابْنَ عَمٍّ لِي أَتَيْتُهُ أَسْأَلُهُ فَلَا يُعْطِينِي وَلَا يَصِلُنِي، ثُمَّ يَحْتَاجُ إِلَيَّ فَيَأْتِينِي فَيَسْأَلُنِي، وَقَدْ حَلَفْتُ أَنْ لَا أُعْطِيَهُ وَلَا أَصِلَهُ، فَأَمَرَنِي أَنْ آتِيَ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ، وَأُكَفِّرَ عَنْ يَمِينِي»[٣].

**واتە: ئەبولئەحوەص دەگێڕێتەوە، لە باوكیەوە ﷺ دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من ئامۆزایەكم هەیە، كاتێ پێویستیم پێی هەبێ دەچم بۆ لای داوای لێ دەكەم نە یارمەتیم دەدات و نە سەردانیشم دەكات، پاشان كاتێ پێویستی پێم دەبێ دێ بۆ لام داوام لێ دەكات، منیش سوێندم خواردوە نە یارمەتی بدەم و نە سەردانیشی بكەم، فەرمانی پێكردم ئەو كارە بكەم كە چاكترە، كەفارەتی سوێندەكەشم بدەم.**

---

(١) صحیح. أخرجه مسلم: ١٥ و ١٦٥١/١٨، وإبن ماجه: ٢١٠٨.

(٢) صحیح.

(٣) صحیح. أخرجه إبن ماجه: ٢١٠٩.




**٣٧٨٩-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ لِي النَّبِيُّ ﷺ: إِذَا آلَيْتَ عَلَى يَمِينٍ فَرَأَيْتَ غَيْرَهَا خَيْراً مِنْهَا فَأْتِ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ، وَكَفِّرْ عَنْ يَمِينِكَ»[١].

**واته: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەمورە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر سوێندت خوارد لەسەر شتێک، بینیت غەیری ئەوە لەو کارە چاکترە کە سوێندت لەسەر خواردوە، ئەوە ئەو کارە بکە کە چاکترە، وە کەفارەتی سوێندەکەشت بدە.**

**٣٧٩٠-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: إِذَا حَلَفْتَ عَلَى يَمِينٍ فَرَأَيْتَ غَيْرَهَا خَيْراً مِنْهَا فَأْتِ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ مِنْهَا، وَكَفِّرْ عَنْ يَمِينِكَ»[٢].

**واته: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەمورە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر سوێندت خوارد لەسەر شتێ، بینیت غەیری ئەوە لەو کارە چاکترە کە سوێندت لەسەری خواردوە، ئەوە ئەو کارە بکە کە چاکترە، وە کەفارەتی سوێندەکەشت بدە.**

**٣٧٩١-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا حَلَفْتَ عَلَى يَمِينٍ فَرَأَيْتَ غَيْرَهَا خَيْراً مِنْهَا فَأْتِ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ، وَكَفِّرْ عَنْ يَمِينِكَ»[٣].

**واته: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەمورە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو: ئەگەر سوێندت خوارد لەسەر شتێ، بینیت غەیری ئەوە لەو کارە چاکترە کە سوێندت لەسەر خواردوە، ئەوە ئەو کارە بکە کە چاکترە، وە کەفارەتی سوێندەکەشت بدە.**

## سوێند خواردن دانامەزرێت لەوەی لە توانایدا نەبێت

**٣٧٩٢-** «عَنْ عَمْرِو بْنُ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا نَذْرَ وَلَا يَمِينَ فِيمَا لَا تَمْلِكُ، وَلَا فِي مَعْصِيَةٍ وَلَا قَطِيعَةِ رَحِمٍ»[٤].

**واته: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکی، لە باپیرەیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هیچ نەزرو سوێندێک دانامەزرێت لەوەی موڵکی تۆ نەبێت، هەروەها لەسەرپێچی کردن و پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتیش.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




## هەر کەس سوێند بخواو شتێک لە سوێندەکەی جیای بکاتەوە

**٣٧٩٣-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ حَلَفَ فَاسْتَثْنَى فَإِنْ شَاءَ مَضَى، وَإِنْ شَاءَ تَرَكَ غَيْرَ حَنِثٍ»[١].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس سوێند بخوات جیای بکاتەوە (بڵێ: إِنْ شَاءَ اللَّهُ) ئەگەر ویستی سوێندەکەی جێبەجێی دەکات، وە ئەگەر ویستی وازی لێ دێنێ سوێندەکەی نەشکاوە.**

## نیەت لە سوێند خواردندا

**٣٧٩٤-** «عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّةِ، وَإِنَّمَا لِامْرِئٍ مَا نَوَى، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ، فَهِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ، وَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ لِدُنْيَا يُصِيبُهَا، أَوِ امْرَأَةٍ يَتَزَوَّجُهَا، فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ»[٢].

**واتە: عومەری کوڕی خەطاب ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی کردەوەکان بە نیەت و نیازن، بێگومان هەموو کەسێکیش بە پێی نیەتی خۆیەتی، هەرکەس کۆچ کردنی بۆ لای خواو پێغەمبەرەکەی بێت، ئەوە کۆچ کردنی بۆ لای خواو پێغەمبەرەکەیەتی، هەرکەسیش کۆچکردنی بۆ بەدەستهێنانی دونیا بێت، یان بۆ ئەوەی ئافرەتێ بە دەست بێنێ، ئەوە کۆچ کردنی بۆ لای ئەوەیە کە کۆچی بۆ کردوە.**

## قەدەغەکردنی ئەوەی خوا ﷻ حەڵاڵی کردوە

**٣٧٩٥-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، تَزْعُمُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَمْكُثُ عِنْدَ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ فَيَشْرَبُ عِنْدَهَا عَسَلاً، فَتَوَاصَيْتُ أَنَا وَحَفْصَةُ أَنَّ أَيَّتُنَا دَخَلَ عَلَيْهَا النَّبِيُّ ﷺ، فَلْتَقُلْ: إِنِّي أَجِدُ مِنْكَ رِيحَ مَغَافِيرَ، أَكَلْتَ مَغَافِيرَ؟ فَدَخَلَ عَلَى إِحْدَاهُمَا فَقَالَتْ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: لَا، بَلْ شَرِبْتُ عَسَلاً عِنْدَ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ وَلَنْ أَعُودَ لَهُ، فَنَزَلَتْ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَ ﴿١﴾ ﴾

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٢٦١ و ٣٢٦٢، والترمذي: ١٥٣١، وابن ماجه: ٢١٠٥ و ٢١٠٦.

(٢) صحيح.




التحريم، إِلَى: ﴿إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ ﴿٤﴾﴾التحريم، عَائِشَةُ وَحَفْصَةُ: ﴿وَإِذْ أَسَرَّ ٱلنَّبِيُّ إِلَىٰ بَعْضِ أَزْوَٰجِهِۦ حَدِيثًا ﴿٣﴾﴾ التحريم، لِقَوْلِهِ: بَلْ شَرِبْتُ عَسَلاً»[١].

واتە: عائیشەی ﷺ، دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ لای زینەب دەمایەوە هەنگوینی لەلا دەخواردەوە، من و حەفصە بەڵێنمان بەیەکتریدا پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لای هەر کامەمان بڵێ: من بۆنی (مَغَافِيرَ) لە تۆ دەکەم، (کە شتێکی خۆشە بەڵام بۆنی هەیە) ئایا (مَغَافِيرَ) خواردوە؟ جا هات بۆ لای یەکێکیان ئەویش ئەوەی پێ وت، فەرمووی: نەخێر، بەڵکو هەنگوینم خوارد لای زەینەبی کچی جەحش، جارێکی تر هەرگیز نایخۆمەوە، پاشان ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَ ﴿١﴾﴾، ﴿إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ ﴿٤﴾﴾ (واتە: ئەگەر ئەو دووانە داوای لێخۆشبوون بکەن لای خوا)، عائیشەو حەفصە: ﴿وَإِذْ أَسَرَّ ٱلنَّبِيُّ إِلَىٰ بَعْضِ أَزْوَٰجِهِۦ حَدِيثًا ﴿٣﴾﴾ (واتە: کاتێک کە پێغەمبەر ﷺ بە نهێنی لای هەندێ لە ژنەکانی قسەیەکی درکاند)، لەبەر وتەکەی بەڵکو هەنگوینم خوارد.

## ئەگەر سوێندی خوارد نان وشک بە تەنها نەخوات، بەڵام نانی بە سرکەوە خوارد

**٣٧٩٦-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: دَخَلْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ بَيْتَهُ فَإِذَا فِلَقٌ وَخَلٌّ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كُلْ، فَنِعْمَ الْإِدَامُ الْخَلُّ»[٢].

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ هاتمە ماڵەکەیەوە، لەتە نان و سرکەم بینی، فەرمووی: بخۆ، بەڕاستی چاکترین پێخۆر سرکەیە. (بۆ تێر بوون).

## لەبارەی سوێند خواردن و درۆ کردن بۆ کەسێک بە دڵ سوێند نەخوات

**٣٧٩٧-** «عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي غَرَزَةَ ﷺ قَالَ: كُنَّا نُسَمَّى السَّمَاسِرَةَ، فَأَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَنَحْنُ نَبِيعُ، فَسَمَّانَا بِاسْمٍ هُوَ خَيْرٌ مِنَ اسْمِنَا فَقَالَ: يَا مَعْشَرَ التُّجَّارِ، إِنَّ هَذَا الْبَيْعَ يَحْضُرُهُ الْحَلِفُ وَالْكَذِبُ، فَشُوبُوا بَيْعَكُمْ بِالصَّدَقَةِ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٩١٢ و ٥٢٦٧ و ٦٦٩١، ومسلم: ١٤٧٤، وأبو داود: ٣٧١٤.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٠٥٢، وأبو داود: ٣٨٢٠ و ٣٨٢١، والترمذي: ١٨٣٩ و ١٨٤٢، وإبن ماجه: ٣٣١٧.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٣٢٦ و ٣٣٢٧، والترمذي: ١٢٠٨، وإبن ماجه: ٢١٤٥.




واتە: قەیسی کوڕی غەرەزە ﷺ دەڵێ: ئێمە پێمان دەوترا (السَّمَاسِرَةَ) (واتە: دەلاڵ یاخود ڕێکخەر)، پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لامان ئێمەش شتمان دەفرۆشت، ناوێکی لێ نایین زۆر لەوەی خۆمان چاکتر بوو، فەرمووی: ئەی کۆمەڵی (التُّجَّار) بازرگانەکان، ئەم کڕین و فرۆشتنە سوێند و درۆی تێدەکەوێ، کڕین و فرۆشتنەکەتان تێکەڵ بکەن بە بەخشین.

**٣٧٩٨-** «عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي غَرَزَةَ ﷺ قَالَ: كُنَّا نَبِيعُ بِالْبَقِيعِ فَأَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَكُنَّا نُسَمَّى السَّمَاسِرَةَ، فَقَالَ: يَا مَعْشَرَ التُّجَّارِ، فَسَمَّانَا بِاسْمٍ هُوَ خَيْرٌ مِنَ اسْمِنَا، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ هَذَا الْبَيْعَ يَحْضُرُهُ الْحَلِفُ وَالْكَذِبُ، فَشُوبُوهُ بِالصَّدَقَةِ»[١].

واتە: قەیسی کوڕی ئەبو غەزارە ﷺ دەڵێ: ئێمە لە بەقیع شتمان دەفرۆشت پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لامان، ئێمە پێمان دەوترا (السَّمَاسِرَةَ) (واتە: دەلاڵ یاخود ڕێکخەر)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی کۆمەڵی بازرگانەکان، بە شتێ ناوی نایین لەوە چاکتر بوو، پاشان فەرمووی: بەڕاستی ئەم کڕین و فرۆشتنە سوێند و درۆی تێدەکەوێ، تێکەڵی بکەن بە بەخشین. (بێگومان سوێندی درۆ بەرەکەی ماڵ و سامان ناهێڵێ، بەخشینیش خەشم و تووڕەیی خوا دادەمرکێنێ، چاکەکانیش گوناهەکان لادەبەن).

## لەبارەی قسەی پڕو پووچ و درۆ کردن

**٣٧٩٩-** «عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي غَرَزَةَ ﷺ قَالَ: أَتَانَا النَّبِيُّ ﷺ، وَنَحْنُ فِي السُّوقِ، فَقَالَ: إِنَّ هَذِهِ السُّوقَ يُخَالِطُهَا اللَّغْوُ وَالْكَذِبُ، فَشُوبُوهَا بِالصَّدَقَةِ»[٢].

واتە: قەیسی کوڕی ئەبو غەزارە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لامان ئێمەش لە بازاڕدا بووین، فەرمووی: بەڕاستی ئەم بازاڕە قسەی پڕو پووچ و درۆی تێکەڵ دەبێ، تێکەڵی بکەن بە بەخشین. (بێگومان سوێندی درۆ بەرەکەی ماڵ و سامان ناهێڵێ، بەخشینیش خەشم و تووڕەیی خوا دادەمرکێنێ، چاکەکانیش گوناهەکان لادەبەن).

---

(١) صحیح.

(٢) صحیح.




**٣٨٠٠-** «عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي غَرَزَةَ ﷺ قَالَ: كُنَّا بِالْمَدِينَةِ نَبِيعُ الْأَوْسَاقَ وَنَبْتَاعُهَا، وَكُنَّا نُسَمِّي أَنْفُسَنَا السَّمَاسِرَةَ وَيُسَمِّينَا النَّاسُ، فَخَرَجَ إِلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ، فَسَمَّانَا بِاسْمٍ هُوَ خَيْرٌ مِنَ الَّذِي سَمَّيْنَا أَنْفُسَنَا وَسَمَّانَا النَّاسُ، فَقَالَ: يَا مَعْشَرَ التُّجَّارِ، إِنَّهُ يَشْهَدُ بَيْعَكُمُ الْحَلِفُ وَالْكَذِبُ، فَشُوبُوهُ بِالصَّدَقَةِ»[١].

**واتە: قەیسی کوڕی ئەبو فەزارە ﷺ دەڵێ: ئێمە لە مەدینە بووین بارمان دەکڕی و دەمان فرۆشت، ناوی خۆمانمان نابوو بە (السَّمَاسِرَةَ)، (ئەو کەسەیە شت دەکڕێ و دەفرۆشێ)، خەڵکیش هەر وای پێی دەوتین، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێک هات بۆ ناومان، ناوی ناین بە ناوێک لەوە چاکتر بوو کە خۆمان ناومان لێنابوو، وە خەڵکیش بانگی دەکردین، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی کۆمەڵی بازرگانەکان، کڕین و فرۆشتنەکەتان سوێندو درۆی تێدەکەوێ، تێکەڵی بکەن بە بەخشین.**

## قەدەغە کردن لە نەزر

**٣٨٠١-** «عَنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ النَّذْرِ، وَقَالَ: إِنَّهُ لَا يَأْتِي بِخَيْرٍ، إِنَّمَا يُسْتَخْرَجُ بِهِ مِنَ الْبَخِيلِ»[٢].

**واتە: عەبدوڵلای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە نەزر کردن، فەرموویەتی: هەرگیز دەرەنجامی باش نابێت (چونکە هەندێ جار خاوەنەکەی ناتوانێت پێی هەستێت) یان هیچ شتێک لە قەزاو قەدەر ناگەڕێنێتەوە، تەنها لە کەسی ڕەزیلەوە دەردەچێ.**

**٣٨٠٢-** «عَنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ النَّذْرِ وَقَالَ: إِنَّهُ لَا يَرُدُّ شَيْئاً، إِنَّمَا يُسْتَخْرَجُ بِهِ مِنَ الشَّحِيحِ»[٣].

**واتە: عەبدوڵلای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە نەزرکردن، فەرموویەتی: هیچ شتێک ڕەت ناکاتەوە، (لە قەزاو قەدەر) تەنها لە کەسی ڕەزیلەوە دەردەچێ.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٦٠٨ و ٦٦٩٣، ومسلم: ٢ و ١٦٣٩/٤، وأبو داود: ٣٢٨٧، وإبن ماجه: ٢١٢٢.

(٣) صحيح.




## نەزر هیچ پێش ناخات هیچ دوا ناخات

**٣٨٠٣-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: النَّذْرُ لَا يُقَدِّمُ شَيْئاً وَلَا يُؤَخِّرُهُ، إِنَّمَا هُوَ شَيْءٌ يُسْتَخْرَجُ بِهِ مِنَ الشَّحِيحِ»[(١)].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نەزر هیچ پێش ناخات و هیچ دوا ناخات، (لە قەزاو قەدەر) بەڵکو ئەوە شتێکە لە ڕەزیلەوە دەردەچێ.**

**٣٨٠٤-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا يَأْتِي النَّذْرُ عَلَى ابْنِ آدَمَ شَيْئاً لَمْ أُقَدِّرْهُ عَلَيْهِ، وَلَكِنَّهُ شَيْءٌ اسْتُخْرِجَ بِهِ مِنَ الْبَخِيلِ»[(٢)].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نەوەی ئادەم بە نەزرکردن ناتوانێ شتێک لەسەر خۆی لا ببات کە لەسەری بە قەزاو قەدەر دانراوە، بەڵکو ئەوە شتێکە لەلایەن ڕزیلەوە دەردەچێ.**

## نەزر لە لایەن کەسی ڕەزیلەوە دەردەچێ

**٣٨٠٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: لَا تَنْذِرُوا فَإِنَّ النَّذْرَ لَا يُغْنِي مِنَ الْقَدَرِ شَيْئاً، وَإِنَّمَا يُسْتَخْرَجُ بِهِ مِنَ الْبَخِيلِ»[(٣)].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نەزر مەکەن، چونکە بەڕاستی نەزر هیچ لە قەزاو قەدەر کەم ناکاتەوە، بەڵکو ئەوە لەلایەن ڕەزیلەوە دەردەچێ.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٦٠٩ و ٦٦٩٤، ومسلم: ١٦٤٠/٧، وأبو داود: ٣٢٨٨، والترمذي: ١٥٣٨، وابن ماجه: ٢١٢٣.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٥ و ١٦٤٠/٦، والترمذي: ١٥٣٨.




## نەزرکردن لە گوێڕایەڵی و پاڕانەوەدا

**٣٨٠٦-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ نَذَرَ أَنْ يُطِيعَ اللَّهَ فَلْيُطِعْهُ، وَمَنْ نَذَرَ أَنْ يَعْصِيَ اللَّهَ فَلَا يَعْصِهِ»(١).

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەوەی نەزری کرد لەسەر خۆی کە گوێڕایەڵی خوا بکات (یان کارێکی خێر ئەنجام بدات) با گوێڕایەڵی بکات، ئەوەیشی نەزری کرد لەسەر خۆی کە سەرپێچی خوا بکات با سەرپێچی نەکات.**

## نەزرکردن لە سەرپێچی خوادا

**٣٨٠٧-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ نَذَرَ أَنْ يُطِيعَ اللَّهَ فَلْيُطِعْهُ، وَمَنْ نَذَرَ أَنْ يَعْصِيَ اللَّهَ فَلَا يَعْصِهِ»(٢).

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەوەی نەزری کرد لەسەر خۆی کە گوێڕایەڵی خوا بکات (یان کارێکی خێر ئەنجام بدات) با گوێڕایەڵی بیکات، ئەوەی نەزری کرد لەسەر خۆی کە سەرپێچی خوا بکات با سەرپێچی نەکات.**

**٣٨٠٨-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ نَذَرَ أَنْ يُطِيعَ اللَّهَ فَلْيُطِعْهُ، وَمَنْ نَذَرَ أَنْ يَعْصِيَ اللَّهَ فَلَا يَعْصِهِ»(٣).

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەوەی نەزری کرد لەسەر خۆی کە گوێڕایەڵی خوا بکات (کارێکی خێر ئەنجام بدات) با گوێڕایەڵی بیکات، ئەوەی نەزری کرد لەسەر خۆی کە سەرپێچی خوا بکات با سەرپێچی نەکات.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٦٩٦ و ٦٧٠٠، وأبو داود: ٣٢٨٩، والترمذي: ١٥٢٦، وإبن ماجه: ٢١٢٦.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## وەفاکردن بە نەزر

**٣٨٠٩-** «عَنْ عِمْرَانِ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ قَالَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: خَيْرُكُمْ قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، فَلَا أَدْرِي أَذَكَرَ مَرَّتَيْنِ بَعْدَهُ أَوْ ثَلَاثاً، ثُمَّ ذَكَرَ قَوْماً يَخُونُونَ وَلَا يُؤْتَمَنُونَ، وَيَشْهَدُونَ وَلَا يُسْتَشْهَدُونَ، وَيُنْذِرُونَ وَلَا يُوفُونَ، وَيَظْهَرُ فِيهِمُ السِّمَنُ»[١].

**واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چاکترین چەرخ ئەم چەرخەی منە، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن، نازانم دووجار لە دوای ئەوەوە وتی، یان سێ جار، پاشان باسی خەڵکێکی کرد خیانەت دەکەن و جێگای متمانە نین، شایەتی دەدەن و داوای شایەتیان لێ ناکرێ، نەزر دەکەن و جێبە جێی ناکەن، وە قەڵەوییان تێدا دەردەکەوێ.**

## نەزرکردنێک مەبەست پێی ڕەزامەندی خوا ﷻ نەبێ

**٣٨١٠-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: مَرَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِرَجُلٍ يَقُودُ رَجُلاً فِي قَرَنٍ، فَتَنَاوَلَهُ النَّبِيُّ ﷺ فَقَطَعَهُ، قَالَ: إِنَّهُ نَذْرٌ»[٢].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ تێپەڕی بە لای پیاوێکدا پیاوێکی ڕادەکێشا بە گوریسێکەوە، پێغەمبەر ﷺ پەلاماریداو گوریسەکەی بڕی، ئەویش وتی: ئەو نەزری کردوە.**

**٣٨١١-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ مَرَّ بِرَجُلٍ وَهُوَ يَطُوفُ بِالْكَعْبَةِ يَقُودُهُ إِنْسَانٌ بِخِزَامَةٍ فِي أَنْفِهِ، فَقَطَعَهُ النَّبِيُّ ﷺ بِيَدِهِ، ثُمَّ أَمَرَهُ أَنْ يَقُودَهُ بِيَدِهِ. قَالَ ابْنُ جُرَيْجٍ: وَأَخْبَرَنِي سُلَيْمَانُ، أَنَّ طَاوُساً، أَخْبَرَهُ، عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ مَرَّ بِهِ وَهُوَ يَطُوفُ بِالْكَعْبَةِ وَإِنْسَانٌ قَدْ رَبَطَ يَدَهُ بِإِنْسَانٍ آخَرَ بِسَيْرٍ، أَوْ خَيْطٍ، أَوْ بِشَيْءٍ غَيْرِ ذَلِكَ، فَقَطَعَهُ النَّبِيُّ ﷺ بِيَدِهِ، ثُمَّ قَالَ: قُدْهُ بِيَدِكَ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٦٥٠ و ٢٦٥١ و ٦٤٢٨ و ٦٦٩٥، ومسلم: ٢١٤ و ٢٥٣٥/٢١٥، وأبو داود: ٤٦٥٧، والترمذي: ٢٢٢١ و ٢٢٢ و ٢٣٠٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٢٠ و ١٦٢١ و ٦٧٠٢ و ٦٧٠٣، وأبو داود: ٣٣٠٢.

(٣) صحيح.




واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ تێپەڕی بە لای پیاوێکدا تەوافی کەعبەی دەکرد کەسێکی تریش گوریسێکی کردبووە ملی وەکو ڕەشمە ڕایدەکێشا، پێغەمبەر ﷺ بە دەستی خۆی بڕی، پاشان فەرمانی پێ کرد بیکاتە دەستی و ڕایبکێشێ.

ئیبنو جورەیج دەڵێ: سولەیمان هەواڵی پێدام کە طاوس هەواڵی پێداوە، لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ تێپەڕی بەلایداو ئەویش تەوافی کەعبەی دەکرد، پیاوێک دەستی بەستبوویەوە بە دەستی پیاوێکی ترەوە بە پارچە پێستێک، یان دەزوویەک، یان بە شتێک جگە لەوە، پێغەمبەر ﷺ بە دەستی خۆی بڕیەوە، پاشان فەرمووی: بیکەرە دەستی خۆت.

## نەزرکردن لەوەی لە توانایدا نیە

**٣٨١٢-** «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: لَا نَذْرَ فِي مَعْصِيَةِ اللَّهِ، وَلَا فِيمَا لَا يَمْلِكُ ابْنُ آدَمَ»[١].

واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: جێبەجێ کردنی نەزر لە سەرپێچی کردنی خوادا نیە، وە (جێبەجێ کردنی نەزر) لەوەیشدا نیە کە مرۆڤ خاوەنی نیە. (بۆ نموونە: بڵێ: ئەگەر خوا نەخۆشەکەمی چاک کردەوە ئەوە ڕەشەوڵاخی فڵان کەس دەکەم بەخێر).

**٣٨١٣-** «عَنْ ثَابِتِ بْنِ الضَّحَّاكِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ حَلَفَ بِمِلَّةٍ سِوَى مِلَّةِ الْإِسْلَامِ كَاذِباً فَهُوَ كَمَا قَالَ، وَمَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِشَيْءٍ فِي الدُّنْيَا عُذِّبَ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَلَيْسَ عَلَى رَجُلٍ نَذْرٌ فِيمَا لَا يَمْلِكُ»[٢].

واتە: ثابتی کوڕی ضەحاک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس سوێند بە درۆ بخوات بە هەر ئاین و شەریعەتێک جگە لە ئیسلام ئەوە لەسەر ئەو ئاین و شەریعەتەیە وەک چۆن وتویەتی، هەرکەسیش خۆی بە شتێک بکوژێ خوا بەو شتە لە ڕۆژی دواییدا سزای دەدات، وە لەسەر هیچ پیاوێک نەزر نیە لەو شتەی کە خۆی خاوەنی نەبێت.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٤١، وأبو داود: ٣٣١٦، والترمذي: ١٥٦٨، وإبن ماجه: ٢١٢٤.

(٢) صحيح.

## ئەو کەسەی نەزری کردوە بە پێ بچێت بۆ ماڵی خوا ﷻ

**٣٨١٤-** «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ قَالَ: نَذَرَتْ أُخْتِي أَنْ تَمْشِيَ إِلَى بَيْتِ اللَّهِ فَأَمَرَتْنِي أَنْ أَسْتَفْتِيَ لَهَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَاسْتَفْتَيْتُ لَهَا النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: لِتَمْشِ وَلْتَرْكَبْ»[1].

**واتە:** عوقبەی کوڕی عامر ﷺ دەڵێ: خوشکەکەم نەزری کرد بە پێ بچێت بۆ ماڵی خوا، فەرمانی پێ کردم لەو بارەیەوە پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکەم، منیش پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد لەو بارەیەوە، ئەویش فەرمووی: با بە پێ بڕواو سواری وڵاخیش ببێ.

## ئەگەر ئافرەت سوێندی خوارد بە پێ خاوسی و بێ سەرپۆش ڕێ بکات

**٣٨١٥-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ ﷺ، أَخْبَرَهُ أَنَّهُ سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ عَنْ أُخْتٍ لَهُ نَذَرَتْ أَنْ تَمْشِيَ حَافِيَةً غَيْرَ مُخْتَمِرَةٍ؟ فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: مُرْهَا فَلْتَخْتَمِرْ، وَلْتَرْكَبْ، وَلْتَصُمْ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ»[2].

**واتە:** عەبدوڵڵای کوڕی مالیک دەگێڕێتەوە، عوقبەی کوڕی عامر ﷺ هەواڵی پێدا، ئەو پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ لەبارەی خوشکێکیەوە کە نەزری کردبوو بە پێ خاوسی و بێ سەرپۆشەوە ڕێ بکات؟ پێغەمبەر ﷺ پێی فەموو: فەرمانی پێ بکە با سەری داپۆشێ، وە با سواری وڵاخیش ببێت و با سێ ڕۆژیش بەڕۆژوو بێت.

## ئەو کەسەی نەزری کردوە بە ڕۆژوو ببێت، پاشان دەمرێ پێش ئەوەی بەڕۆژوو ببێت

**٣٨١٦-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: رَكِبَتِ امْرَأَةٌ الْبَحْرَ فَنَذَرَتْ أَنْ تَصُومَ شَهْراً فَمَاتَتْ قَبْلَ أَنْ تَصُومَ، فَأَتَتْ أُخْتُهَا النَّبِيَّ ﷺ وَذَكَرَتْ ذَلِكَ لَهُ، فَأَمَرَهَا أَنْ تَصُومَ عَنْهَا»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨٦٦، ومسلم: ١١ و ١٦٤٤/١٢، وأبو داود: ٣٢٩٩.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٢٩٣ و ٣٢٩٤ و ٣٣٠٤، والترمذي: ١٥٤٤، وإبن ماجه: ٢١٣٤.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٥٣، ومسلم: ١٥٤ و ١١٤٨/١٥٥، وأبو داود: ٣٣٠٨ و ٣٣١٠، والترمذي: ٧١٦ و ٧١٧، وإبن ماجه: ١٧٥٨.




واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ئافرەتێک (بە کەشتی) چووە ناو دەریا نەزری کرد مانگێک بەڕۆژوو ببێت، پێش ئەوەی بەڕۆژوو ببێت مرد، خوشکەکەی هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و ئەوەی بۆی باس کرد، ئەویش فەرمانی پێکرد لە بری ئەوە بەڕۆژوو ببێت.

## هەر کەس بمرێ و نەزریشی لەسەر بووبێ

**٣٨١٧-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ اسْتَفْتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي نَذْرٍ كَانَ عَلَى أُمِّهِ تُوُفِّيَتْ قَبْلَ أَنْ تَقْضِيَهُ، فَقَالَ: اقْضِهِ عَنْهَا»[١].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، سەعدی کوڕی عوبادە پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی نەزەرێکەوە کە لەسەر دایکی بوو، پێش ئەوەی بەجێی بێنێ کۆچی دوایی کرد، فەرمووی: لە جیاتی ئەو نەزرەکە بکە.**

**٣٨١٨-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: اسْتَفْتَى سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي نَذْرٍ كَانَ عَلَى أُمِّهِ فَتُوُفِّيَتْ قَبْلَ أَنْ تَقْضِيَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اقْضِهِ عَنْهَا»[٢].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: سەعدی کوڕی عوبادە پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ کە دایکی نەزری کردوە، بەڵام پێش ئەوە نەزرەکە بەجێی بهێنێ کۆچی دوایی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لە جیاتی ئەو نەزرەکە بکە.**

**٣٨١٩-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: جَاءَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: إِنَّ أُمِّي مَاتَتْ وَعَلَيْهَا نَذْرٌ فَلَمْ تَقْضِهِ، قَالَ: اقْضِهِ عَنْهَا»[٣].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: سەعدی کوڕی عوبادە هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: دایکم کۆچی دوایی کردوەو نەزری لەسەرەو بەجێی نەهێناوە؟ فەرمووی: لە جیاتی ئەو نەزرەکە بکە.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧٦١ و ٦٦٩٨، ومسلم: ١٦٣٨، وأبو داود: ٣٣٠٧، والترمذي: ١٥٤٦، وإبن ماجه: ٢١٣٢.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.



## ئەگەر (کافرێک) نەزری کرد، پاشان مسوڵمان بوو پێش ئەوەی نەزرەکە ئەنجام بدات

**٣٨٢٠-** «عَنْ عُمَرَ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ عَلَيْهِ لَيْلَةٌ نَذَرَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ يَعْتَكِفُهَا، فَسَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَأَمَرَهُ أَنْ يَعْتَكِفَ»[١].

**واتە: عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، ئەو لە سەردەمی نەفامیدا نەزری کرد شەوێک ئیعتیکاف بکات، پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمانی پێکرد ئیعتیکاف بکات.**

**٣٨٢١-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَ عَلَى عُمَرَ نَذْرٌ فِي اعْتِكَافِ لَيْلَةٍ فِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ، فَسَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ ذَلِكَ، فَأَمَرَهُ أَنْ يَعْتَكِفَ»[٢].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: عومەر شەوێک نەزری لەسەر بوو لە مزگەوتی حەرام ئیعتیکاف بکات، پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ لەو بارەیەوە، فەرمانی پێکرد ئیعتیکاف بکات.**

**٣٨٢٢-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ عُمَرَ كَانَ جَعَلَ عَلَيْهِ يَوْماً يَعْتَكِفُهُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَسَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ ذَلِكَ، فَأَمَرَهُ أَنْ يَعْتَكِفَهُ»[٣].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە عومەر لەسەردەمی نەفامیدا ڕۆژێک ئیعتیکافی لەسەر خۆی پێویست کردبوو، لەوبارەیەوە پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، ئەویش فەرمانی پێکرد ئیعتیکاف بکات.**

**٣٨٢٣-** «عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ حِينَ تِيبَ عَلَيْهِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أَنْخَلِعُ مِنْ مَالِي صَدَقَةً إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَمْسِكْ عَلَيْكَ بَعْضَ مَالِكَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠٤٢، ومسلم: ١٦٥٦، وأبو داود: ٣٣٢٥، والترمذي: ١٥٣٩، وإبن ماجه: ١٧٧٢ و ٢١٢٩.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠٣٢ و ٢٠٤٣ و ٤٣٢٠ و ٦٦٩٧، ومسلم: ٢٧ و ١٦٥٦/٢٨.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




واتە: کەعبی کوڕی مالیک ﷛ دەگێڕێتەوە: کاتێ خوا لێی خۆش بوو (لە دوای خۆ دواخستنی بۆ جەنگ) بە پێغەمبەری خوا ﷺ وت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من دەست هەڵدەگرم لە ماڵم و دەیبەخشم بە خواو پێغەمبەرەکەی، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: دەست بگرە بە هەندێ لە ماڵەکەت چاکترە بۆت.

## ئەگەر ماڵەکەی بەخشی بە شێوەی نەزر

**٣٨٢٤-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن كَعْبٍ قَالَ: سَمِعْتُ كَعْبَ بْنِ مَالِكٍ ﷛، يُحَدِّثُ حَدِيثَهُ حِينَ تَخَلَّفَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ، قَالَ: فَلَمَّا جَلَسْتُ بَيْنَ يَدَيْهِ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ مِنْ تَوْبَتِي أَنْ أَنْخَلِعَ مِنْ مَالِي صَدَقَةً إِلَى اللَّهِ وَإِلَى رَسُولِهِ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَمْسِكْ عَلَيْكَ بَعْضَ مَالِكَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ، فَقُلْتُ: فَإِنِّي أُمْسِكُ سَهْمِي الَّذِي بِخَيْبَرَ»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی کەعب دەڵێ: گوێم لە کەعبی کوڕی مالیک ﷛ بوو باسی بەسەرهاتەکەی خۆی کرد کاتێ لە پێغەمبەری خوا ﷺ کە دواکەوت لە جەنگی تەبووک، دەیگوت: کاتێ لە بەردەستیدا دانیشتم وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، تەوبەی من ئەوەیە خۆم دابڕنم لە ماڵەکەم و بیبەخشم بۆ ئەوەی لە خواو لە پێغەمبەرەکەی نزیک بیمەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دەست بگرە بە هەندێ لە ماڵ و سامانەکەت، ئەوە بۆ تۆ چاکترە، وتم: دەست دەگرم بەو پشکەم کە لە خەیبەر بوو.

**٣٨٢٥-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن كَعْبٍ قَالَ: سَمِعْتُ كَعْبَ بْنِ مَالِكٍ ﷛، يُحَدِّثُ حَدِيثَهُ حِينَ تَخَلَّفَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ مِنْ تَوْبَتِي أَنْ أَنْخَلِعَ مِنْ مَالِي صَدَقَةً إِلَى اللَّهِ وَإِلَى رَسُولِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَمْسِكْ عَلَيْكَ مَالَكَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ، قُلْتُ: فَإِنِّي أُمْسِكُ عَلَيَّ سَهْمِي الَّذِي بِخَيْبَرَ»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی کەعب دەڵێ: گوێم لە کەعبی کوڕی مالیک ﷛ بوو باسی بەسەرهاتەکەی خۆی کرد کاتێ لە پێغەمبەری خوا ﷺ دواکەوت لە جەنگی تەبووک، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، تەوبەی من ئەوەیە خۆم دابڕنم لە ماڵەکەم و

---

(١) صحیح.

(٢) صحیح.

بیبەخشم بۆ ئەوەی لە خواو لە پێغەمبەرەکەی نزیک ببمەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دەست بگرە بە هەندێ لە ماڵ و سامانەکەت، ئەوە بۆ تۆ چاکترە، وتم: دەست دەگرم بەو پشکەم کە لە خەیبەر بوو.

**٣٨٢٦-** «عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ اللَّهَ ﷻ إِنَّمَا نَجَّانِي بِالصِّدْقِ، وَإِنَّ مِنْ تَوْبَتِي أَنْ أَنْخَلِعَ مِنْ مَالِي صَدَقَةً إِلَى اللَّهِ وَإِلَى رَسُولِهِ، فَقَالَ: أَمْسِكْ عَلَيْكَ بَعْضَ مَالِكَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ، قُلْتُ: فَإِنِّي أُمْسِكُ سَهْمِي الَّذِي بِخَيْبَرَ»(١).

**واتە:** کەعبی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بەڕاستی خوا بەهۆی ڕاستیەوە ڕزگاری کردم، تەوبەی منیش ئەوەیە خۆم دابڕنم لە ماڵەکەم و بیبەخشم بۆ ئەوەی لە خواو لە پێغەمبەرەکەی نزیک ببمەوە، فەرمووی: دەست بگرە بە هەندێ لە ماڵ و سامانەکەت، ئەوە بۆ تۆ چاکترە، وتم: دەست دەگرم بەو پشکەم کە لە خەیبەر بوو.

## ئایا زەویەکان دەچنە چوارچێوەی ماڵەوە ئەگەر (خاوەن زەوی) نەزری کرد

**٣٨٢٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَامَ خَيْبَرَ فَلَمْ نَغْنَمْ إِلَّا الْأَمْوَالَ وَالْمَتَاعَ وَالثِّيَابَ، فَأَهْدَى رَجُلٌ مِنْ بَنِي الضُّبَيْبِ، يُقَالُ لَهُ: رِفَاعَةُ بْنُ زَيْدٍ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ غُلَاماً أَسْوَدَ يُقَالُ لَهُ: مِدْعَمٌ، فَوُجِّهَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى وَادِي الْقُرَى حَتَّى إِذَا كُنَّا بِوَادِي الْقُرَى، بَيْنَا مِدْعَمٌ يَحُطُّ رَحْلَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَجَاءَهُ سَهْمٌ فَأَصَابَهُ فَقَتَلَهُ، فَقَالَ النَّاسُ: هَنِيئاً لَكَ الْجَنَّةُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كَلَّا وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، إِنَّ الشَّمْلَةَ الَّتِي أَخَذَهَا يَوْمَ خَيْبَرَ مِنَ الْمَغَانِمِ لَتَشْتَعِلُ عَلَيْهِ نَاراً، فَلَمَّا سَمِعَ النَّاسُ بِذَلِكَ جَاءَ رَجُلٌ بِشِرَاكٍ، أَوْ بِشِرَاكَيْنِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: شِرَاكٌ، أَوْ شِرَاكَانِ مِنْ نَارٍ»(٢).

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بووین ﷺ لە ساڵی خەیبەر دەستکەوتمان نەبوو، جگە لە ماڵ بژێوی و جل وبەرگ، پیاوێک لە بەنی ضوبەیب پێی دەوترا: ڕیفاعەی کوڕی زەید منداڵێکی ڕەشی بە دیاری دا بە پێغەمبەری

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٢٣٤ و ٦٧٠٧، ومسلم: ١١٥، وأبو داود: ٢٧١١.

خوا ﷺ، پێی دەوترا: میدعەم، پێغەمبەری خوا ﷺ ئاڕاستەکرا بۆ (وَادِي الْقُرَى) تا گەیشتین بە (وَادِي الْقُرَى) لە کاتێکدا میدعەم کاروانیەکەی پێغەمبەری دادەگرت تیرێک هات و پێکای، دەستبەجێ کوشتی، خەڵکەکە وتیان: خۆشی بۆ تۆ لە بەهەشتدا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: وانیە سوێند بەو خوایەی نەفسی منی بەدەستە، ئەو پارچە قوماشەی کە لە ڕۆژی خەیبەر بردی لە دەستکەوتەکان دەبێتە ئاگر بۆی و دەیسوتێنێ، کاتێ خەڵکەکە ئەوەیان بیست، پیاوێک هات قەیتانێک یان دوو قەیتانی هێنا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش فەرمووی: قەیتانێک یان دوو قەیتان لە ئاگردایە.

## جیاکردنەوە لە سوێند خواردن بە وتنی: (إِنْ شَاءَ اللَّهُ).

**٣٨٢٨-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ حَلَفَ فَقَالَ: إِنْ شَاءَ اللَّهُ، فَقَدْ اسْتَثْنَى»[١].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس سوێند بخواو بڵێ: (إِنْ شَاءَ اللَّهُ) واتە: ئەگەر خوا ویستی لەسەر بوو، ئەوە بێگومان جیای کردۆتەوە، (واتە: بڵێ سوێند بە خوا ئەو کارە دەکەم هیچ شتێ ڕێگریم لێ ناکات مەگەر ویستی خوا نەبێ، حوکمەکەی ئەوەیە: ئەگەر ویستی جێبەجێ دەکات، ئەگەر نەیکرد کەفارەتی لەسەر نیە).**

**٣٨٢٩-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ حَلَفَ فَقَالَ: إِنْ شَاءَ اللَّهُ، فَقَدْ اسْتَثْنَى»[٢].

**واتە: عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس سوێند بخواو بڵێ: (إِنْ شَاءَ اللَّهُ) واتە: ئەگەر خوا ویستی لەسەر بوو، ئەوە بێگومان جیای کردوەتەوە.**

**٣٨٣٠-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ فَقَالَ: إِنْ شَاءَ اللَّهُ فَهُوَ بِالْخِيَارِ، إِنْ شَاءَ أَمْضَى، وَإِنْ شَاءَ تَرَكَ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس سوێند بخوا لەسەر شتێ، بڵێ: (إِنْ شَاءَ اللَّهُ) ئەوە بە ویستی خۆیەتی ئەگەر ویستی بەجێی دێنێ، وە ئەگەر ویستی وازی لێ دێنێ.

## ئەگەر کەسێک سوێند بخوا پیاوێک لە بری ئەو وتی: (إِنْ شَاءَ اللَّهُ) ئایا ئەوە بۆی دەبێتە جیاکردنەوە؟

**٣٨٣١** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: قَالَ سُلَيْمَانُ بْنُ دَاوُدَ: لَأَطُوفَنَّ اللَّيْلَةَ عَلَى تِسْعِينَ امْرَأَةً، كُلُّهُنَّ يَأْتِي بِفَارِسٍ يُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﷻ، فَقَالَ لَهُ صَاحِبُهُ: إِنْ شَاءَ اللَّهُ، فَلَمْ يَقُلْ: إِنْ شَاءَ اللَّهُ، فَطَافَ عَلَيْهِنَّ جَمِيعاً، فَلَمْ تَحْمِلْ مِنْهُنَّ إِلَّا امْرَأَةٌ وَاحِدَةٌ جَاءَتْ بِشِقِّ رَجُلٍ، وَأَيْمُ الَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَوْ قَالَ: إِنْ شَاءَ اللَّهُ، لَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فُرْسَاناً أَجْمَعِينَ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سولەیمانی کوڕی داود وتویەتی: ئەمشەو دەچمە لای نەوەد ژنەوە، هەر یەکەیان جەنگاوەرێکیان ببێ لە پێناوی خوادا بجەنگن، هاوەڵەکەی وتی: (إِنْ شَاءَ اللَّهُ) بەڵام ئەو نەیووت: (إِنْ شَاءَ اللَّهُ) چووە لای هەموویانەوە، لە هیچیان منداڵی نەبوو جگە لە یەک ژنیان نەبێ، ئەویش منداڵێکی ناتەواوی بوو، دەی سوێند بەو خوایەی گیانی موحەممەدی بەدەستە، ئەگەر بیوتایە: (إِنْ شَاءَ اللَّهُ) ئەوە هەموویان لە پێناوی خوادا دەجەنگان.

## کەفارەتی نەزر

**٣٨٣٢-** «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: كَفَّارَةُ النَّذْرِ كَفَّارَةُ الْيَمِينِ»[٢].

واتە: عوقبەی کوڕی عامر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کەفارەتی نەزر کەفارەتی سوێند خواردنە.

**٣٨٣٣-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا نَذْرَ فِي مَعْصِيَةٍ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٤٢٤ و ٥٢٤٢ و ٦٦٣٩ و ٧٤٦٩، ومسلم: ٢٢ و ١٦٥٤/٢٥.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٤٥، وأبو داود: ٣٣٢٣ و ٣٣٢٤، والترمذي: ١٥٢٨.

(٣) صحيح لغيره.

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (جێبەجێ کردن) بۆ نەزرێک نیە لە سەرپێچیدا، (بۆ نموونە: کەسێک نەزر بکات منداڵەکەی سەر ببڕێت)

**٣٨٣٤-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا نَذْرَ فِي مَعْصِيَةٍ، وَكَفَّارَتُهُ كَفَّارَةُ الْيَمِينِ»[١].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (جێبەجێ کردن) بۆ نەزرێک نیە لە سەرپێچی دا، کەفارەتەکەیشی کەفارەتی سوێند خواردنێکە.

**٣٨٣٥-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا نَذْرَ فِي مَعْصِيَةٍ، وَكَفَّارَتُهُ كَفَّارَةُ يَمِينٍ»[٢].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (جێبەجێ کردن) بۆ نەزرێک نیە لە سەرپێچی دا، کەفارەتەکەیشی کەفارەتی سوێند خواردنێکە.

**٣٨٣٦-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا نَذْرَ فِي مَعْصِيَةٍ، وَكَفَّارَتُهُ كَفَّارَةُ يَمِينٍ»[٣].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (جێبەجێ کردن) بۆ نەزرێک نیە لە سەرپێچیدا، کەفارەتەکەیشی کەفارەتی سوێند خواردنێکە.

**٣٨٣٧-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا نَذْرَ فِي مَعْصِيَةٍ، وَكَفَّارَتُهُ كَفَّارَةُ الْيَمِينِ»[٤].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (جێبەجێ کردن) بۆ نەزرێک نیە لە سەرپێچیدا، کەفارەتەکەیشی کەفارەتی سوێند خواردنێکە.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٢٩٠ و ٣٢٩٢، والترمذي: ١٥٢٥ و ٢٥٢٤، وإبن ماجه: ٢١٢٥.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




**٣٨٣٨-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا نَذْرَ فِي مَعْصِيَةٍ، وَكَفَّارَتُهَا كَفَّارَةُ الْيَمِينِ»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (جێبەجێ کردن) بۆ نەزرێک نیە لە سەرپێچیدا، کەفارەتەکەیشی کەفارەتی سوێند خواردنێکە.**

**٣٨٣٩-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا نَذْرَ فِي مَعْصِيَةٍ، وَكَفَّارَتُهَا كَفَّارَةُ يَمِينٍ» [٢].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (جێبەجێ کردن) بۆ نەزرێک نیە لە سەرپێچی دا، کەفارەتەکەیشی کەفارەتی سوێند خواردنێکە.**

**٣٨٤٠-** «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا نَذْرَ فِي مَعْصِيَةٍ، وَكَفَّارَتُهُ كَفَّارَةُ يَمِينٍ»[٣].

**واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (جێبەجێ کردن) بۆ نەزرێک نیە لە سەرپێچیدا، کەفارەتەکەیشی کەفارەتی سوێند خواردنێکە.**

**٣٨٤١-** «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا نَذْرَ فِي مَعْصِيَةٍ، وَكَفَّارَتُهَا كَفَّارَةُ يَمِينٍ»[٤].

**واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (جێبەجێ کردن) بۆ نەزرێک نیە لە سەرپێچیدا، کەفارەتەکەیشی کەفارەتی سوێند خواردنێکە.**

**٣٨٤٢-** «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا نَذْرَ فِي غَضَبٍ، وَكَفَّارَتُهُ كَفَّارَةُ الْيَمِينِ»[٥].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح لغيره.

(٤) صحيح.

(٥) ضعيف.




**واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (جێبەجێ کردن) بۆ نەزرێک نیە لە توڕەییدا، کەفارەتەکەیشی کەفارەتی سوێند خواردنێکە.**

**٣٨٤٣-** «عَنْ عِمْرَانَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا نَذْرَ فِي غَضَبٍ، وَكَفَّارَتُهُ كَفَّارَةُ الْيَمِينِ»[١].

**واتە: عیمران ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (جێبەجێ کردن) بۆ نەزرێک نیە لە توڕەییدا، کەفارەتەکەیشی کەفارەتی سوێند خواردنێکە.**

**٣٨٤٤-** «عَنْ عِمْرَانَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: لَا نَذْرَ فِي غَضَبٍ، وَكَفَّارَتُهُ كَفَّارَةُ الْيَمِينِ»[٢].

**واتە: عیمران ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (جێبەجێ کردن) بۆ نەزرێک نیە لە توڕەییدا، کەفارەتەکەیشی کەفارەتی سوێند خواردنێکە.**

**٣٨٤٥-** «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: النَّذْرُ نَذْرَانِ: فَمَا كَانَ مِنْ نَذْرٍ فِي طَاعَةِ اللَّهِ فَذَلِكَ لِلَّهِ وَفِيهِ الْوَفَاءُ، وَمَا كَانَ مِنْ نَذْرٍ فِي مَعْصِيَةِ اللَّهِ فَذَلِكَ لِلشَّيْطَانِ وَلَا وَفَاءَ فِيهِ، وَيُكَفِّرُهُ مَا يُكَفِّرُ الْيَمِينَ»[٣].

**واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: لە گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو فەرمووی: نەزر دوو نەزرە: هەر نەزرێک لە گوێڕایەڵی خوادا بێت ئەوە بۆ خوایە و دەبێ جێبەجێی بکات، هەر نەزرێکیش لە سەرپێچی خوادا بێت ئەوە بۆ شەیتانە و نابێ جێبەجێی بکات، کەفارەتەکەیشی کەفارەتی سوێند خواردنێکە.**

**٣٨٤٦-** «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ، عَنْ رَجُلٍ نَذَرَ نَذْراً لَا يَشْهَدُ الصَّلَاةَ فِي مَسْجِدِ قَوْمِهِ، فَقَالَ عِمْرَانُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَا نَذْرَ فِي غَضَبٍ، وَكَفَّارَتُهُ كَفَّارَةُ يَمِينٍ»[٤].

**واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەگێڕێتەوە: لە پیاوێکەوە نەزرێکی کرد کە ئامادەی نوێژ نەبێت لە مزگەوتی قەومەکەیدا، عیمران وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو فەرمووی: (جێبەجێ کردن) بۆ نەزرێک نیە لە توڕەیی دا، کەفارەتەکەیشی کەفارەتی سوێند خواردنێکە.**

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح.

(٤) ضعيف.




**٣٨٤٧-** «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا نَذْرَ فِي مَعْصِيَةٍ وَلَا غَضَبٍ، وَكَفَّارَتُهُ كَفَّارَةُ يَمِينٍ»[١].

**واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (جێبەجێ کردن) بۆ نەزرێک نیە لە سەرپێچیدا و لە توڕەیی دا، کەفارەتەکەیشی کەفارەتی سوێند خواردنێکە.**

**٣٨٤٨-** «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا نَذْرَ فِي الْمَعْصِيَةِ، وَكَفَّارَتُهُ كَفَّارَةُ الْيَمِينِ»[٢].

**واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (جێبەجێ کردن) بۆ نەزرێک نیە لە سەرپێچیدا، کەفارەتەکەیشی کەفارەتی سوێند خواردنێکە.**

**٣٨٤٩-** «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: لَا نَذْرَ لِابْنِ آدَمَ فِيمَا لَا يَمْلِكُ، وَلَا فِي مَعْصِيَةِ اللَّهِ ﷻ»[٣].

**واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (جێبەجێ کردنی) نەزر نیە لەوەی کە مرۆڤ خاوەنی نیە، (بۆ نموونە: بڵێ: ئەگەر خوا نەخۆشەکەمی چاک کردەوە ئەوە ڕەشەوڵاخی فڵان کەس دەکەم بەخێر) هەروەها لە سەرپێچی خوای گەورەدا. (بۆ نموونە: کەسێک نەزر بکات منداڵەکەی سەر ببڕێت).**

**٣٨٥٠-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَا نَذْرَ فِي مَعْصِيَةٍ، وَلَا فِيمَا لَا يَمْلِكُ ابْنُ آدَمَ»[٤].

**واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەمورە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (جێبەجێ کردنی) نەزر لە سەرپێچی کردنی خوادا نیە، وە لەوەیشدا نیە کە**

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح لغيره.




مرۆڤ خاوەنی نیە (بۆ نموونە: بڵێ: ئەگەر خوا نەخۆشەکەمی چاک کردەوە ئەوە ڕەشەوڵاخی فڵان کەس دەکەم بەخێر).

**٣٨٥١-** «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا نَذْرَ فِي مَعْصِيَةٍ، وَلَا فِيمَا لَا يَمْلِكُ ابْنُ آدَمَ»[1].

واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (جێبەجێ کردنی) نەزر لە سەرپێچی کردنی خوادا نیە، وە لەوەیشدا نیە کە مرۆڤ خاوەنی نیە (بۆ نموونە: بڵێ: ئەگەر خوا نەخۆشەکەمی چاک کردەوە ئەوە ڕەشەوڵاخی فڵان کەس دەکەم بەخێر).

## چی لەسەر ئەوکەسە واجب دەبێت کە شتێ لەسەر خۆی واجب دەکات بە نەزر و ناتوانێت ئەنجامی بدات؟

**٣٨٥٢-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: رَأَى النَّبِيُّ ﷺ رَجُلاً يُهَادَى بَيْنَ رَجُلَيْنِ، فَقَالَ: مَا هَذَا؟ قَالُوا: نَذَرَ أَنْ يَمْشِيَ إِلَى بَيْتِ اللَّهِ، قَالَ: إِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنْ تَعْذِيبِ هَذَا نَفْسَهُ، مُرْهُ فَلْيَرْكَبْ»[2].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی بینی خۆی دابوو بەسەر دووکەسدا ڕێی دەکرد، فەرمووی: ئەمە چیە؟ وتیان: نەزری کردوە بە پێی بچێت بۆ ماڵی خوا فەرمووی: خوا ﷻ بێ نیازە لەوەی ئەم پیاوە سزای نەفسی خۆی بدات، فەرمانی پێ بکە با سواری وڵاخ بێت.

**٣٨٥٣-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: مَرَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِشَيْخٍ يُهَادَى بَيْنَ اثْنَيْنِ، فَقَالَ: مَا بَالُ هَذَا؟ قَالُوا: نَذَرَ أَنْ يَمْشِيَ، قَالَ: إِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنْ تَعْذِيبِ هَذَا نَفْسَهُ، مُرْهُ فَلْيَرْكَبْ، فَأَمَرَهُ أَنْ يَرْكَبَ»[3].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ تێپەڕی بەلای پیاوێکی پیردا خۆیدا بوو بەسەر دوو کەسدا ڕێی دەکرد، فەرمووی: ئەمە چیەتی؟ وتیان: نەزری کردوە بە پێی بچێت بۆ کەعبە، فەرمووی: خوا ﷻ بێ نیازە لەوەی ئەم پیاوە سزای نەفسی

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٤١، وأبو داود: ٣٣١٦، وإبن ماجه: ٢١٢٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨٦٥ و ٦٧٠١، ومسلم: ١٦٤٢، وأبو داود: ٣٣٠١، والترمذي: ١٥٣٧.

(٣) صحيح.




**خۆی بدات، فەرمانی پێ بکە با سواری وڵاخ بێت، ئەویش فەرمانی پێ کرد سوار بێت.**

**٣٨٥٤-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: أَتَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى رَجُلٍ يُهَادَى بَيْنَ ابْنَيْهِ، فَقَالَ: مَا شَأْنُ هَذَا؟ فَقِيلَ: نَذَرَ أَنْ يَمْشِيَ إِلَى الْكَعْبَةِ، فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ لَا يَصْنَعُ بِتَعْذِيبِ هَذَا نَفْسَهُ شَيْئاً، فَأَمَرَهُ أَنْ يَرْكَبَ»[١].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ تێپەڕی بە لای پیاوێکدا خۆیدا بوو بەسەر هەردوو منداڵەکەیدا و ڕێی دەکرد، فەرمووی: ئەمە چیەتی؟ وترا: نەزری کردوە بەپێی بچێت بۆ کەعبە، فەرمووی: خوا ﷻ نایەوێ ئەم پیاوە سزای نەفسی خۆی بدات، فەرمانی پێ کرد سواری وڵاخ بێت.**

## جیاکردنەوە لە سوێند خواردندا بە وتنی: (إِنْ شَاءَ اللَّه)

**٣٨٥٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ فَقَالَ: إِنْ شَاءَ اللَّهُ، فَقَدْ اسْتَثْنَى»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس سوێند بخواو بڵێ: (إِنْ شَاءَ اللَّه) واتە: ئەگەر خوا ویستی لەسەر بوو، ئەوە بێگومان جیای کردوەتەوە. (واتە: بڵێ: سوێند بە خوا ئەو کارە دەکەم هیچ شتێ ڕێگریم لێ ناکات، مەگەر ویستی خوا نەبێ، حوکمەکەی ئەوەیە: ئەگەر ویستی جێبەجێ دەکات، ئەگەر نەیکرد کەفارەتی لەسەر نیە).**

**٣٨٥٦-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، رَفَعَهُ: قَالَ سُلَيْمَانُ: لَأَطُوفَنَّ اللَّيْلَةَ عَلَى تِسْعِينَ امْرَأَةً تَلِدُ كُلُّ امْرَأَةٍ مِنْهُنَّ غُلَاماً يُقَاتِلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، فَقِيلَ لَهُ: قُلْ: إِنْ شَاءَ اللَّهُ، فَلَمْ يَقُلْ، فَطَافَ بِهِنَّ، فَلَمْ تَلِدْ مِنْهُنَّ إِلَّا امْرَأَةٌ وَاحِدَةٌ نِصْفَ إِنْسَانٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَوْ قَالَ: إِنْ شَاءَ اللَّهُ لَمْ يَحْنَثْ وَكَانَ دَرَكاً لِحَاجَتِهِ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٥٣٢، وإبن ماجه: ٢١٠٤.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٤٢٤، ومسلم: ١٦٥٤.





واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ ڕەفعی کردوە: سولەیمان (علیه السلام) وتویەتی: ئەمشەو دەچمە لای نەوەد ژنەوە، هەر یەکەیان جەنگاوەرێکیان ببێ لە پێناوی خوادا بجەنگن، پێی وترا: بڵێ: (إِنْ شَاءَ اللَّهُ) بەڵام ئەو نەیووت: (إِنْ شَاءَ اللَّه) چووە لای هەموویانەوە، لە هیچیان منداڵی نەبوو جگە لە یەک ژنیان نەبێ، ئەویش منداڵێکی ناتەواوی بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دەی سوێند بەو خوایەی گیانی موحەممەدی بە دەستە، ئەگەر بیوتایە: (إِنْ شَاءَ اللَّهُ) سوێندەکەی نەدەشکاو پێویستیەکەی جێبەجێ دەبوو.




## سێیەم دانە لەو مەرجانەی لە کشتوکاڵ و بەڵێندەرایەتیەکاندا هەیە ( هەریەکە لە بەشی سوێند و نەزری لەو مەرجانە داناوە).

**٣٨٥٧-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ قَالَ: إِذَا اسْتَأْجَرْتَ أَجِيراً فَأَعْلِمْهُ أَجْرَهُ» [١].

**واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: ئەگەر کرێکارێکت گرت ئاگاداری بکەرەوە لە کرێیەکەی.**

**٣٨٥٨-** «عَنِ يُونس عن الْحَسَنِ، أَنَّهُ كَرِهَ أَنْ يَسْتَأْجِرَ الرَّجُلَ حَتَّى يُعْلِمَهُ أَجْرَهُ»[٢].

**واتە: یونس دەگێڕێتەوە، لە حەسەنەوە، ئەو بە باشی نەزانیوە پیاوێک بە کرێکار بگیرێ، تا کرێیەکەی پێڕانەگەیەنرێ.**

**٣٨٥٩-** «عَنْ حَمَّادٍ هُوَ ابْنُ أَبِي سُلَيْمَانَ، أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ رَجُلٍ اسْتَأْجَرَ أَجِيراً عَلَى طَعَامِهِ؟ قَالَ: لَا حَتَّى تُعْلِمَهُ»[٣].

**واتە: حمادی کوڕی سولەیمان، پرسیاری لێکرا لەبارەی پیاوێکەوە کەسێکی گرتووە بەکرێ بۆ خواردن دروست کردن؟ وتی: نابێ، تا کرێیەکەی پێڕانەگەیەنێ.**

**٣٨٦٠-** «عَنْ حَمَّادٍ، وَقَتَادَةَ، فِي رَجُلٍ قَالَ لِرَجُلٍ: أَسْتَكْرِي مِنْكَ إِلَى مَكَّةَ بِكَذَا وَكَذَا، فَإِنْ سِرْتُ شَهْراً أَوْ كَذَا وَكَذَا شَيْئاً سَمَّاهُ فَلَكَ زِيَادَةُ كَذَا وَكَذَا، فَلَمْ يَرَيَا بِهِ بَأْساً، وَكَرِهَا أَنْ يَقُولَ: أَسْتَكْرِي مِنْكَ بِكَذَا وَكَذَا، فَإِنْ سِرْتُ أَكْثَرَ مِنْ شَهْرٍ، نَقَصْتُ مِنْ كِرَائِكَ كَذَا وَكَذَا»[٤].

**واتە: حەماد و قەتادە دەگێڕنەوە، لەبارەی پیاوێکەوە بە پیاوێکی وت: کرێت لێ وەردەگرم تا مەککە بە ئەوەندەو ئەوەندە، ئەگەر بە مانگێک بڕیم یان بە ئەوەندەو ئەوەندە ڕۆژ بڕیم، ڕۆژەکەی ناونا، ئەوە ئەوەندە و ئەوەندە زیاتر بۆ تۆ، (بۆ کرێکارەکە) ئەو مامەڵەیان بەلاوە ئاسایی بوو، بەڵام پێیان باش نەبوو بڵێ: کرێت لێ وەردەگرم بە ئەوەندەو ئەوەندە، ئەگەر بە مانگێک زیاتر بڕیم، ئەوەندە و ئەوەندە**

---

(١) موقوف.

(٢) ضعيف موقوف.

(٣) صحيح مقطوع.

(٤) صحيح الإسناد مقطوع.



لە کرێیەکەت کەم دەکەمەوە. (مەبەستی ئەوەیە کرێی زیادە لە بەرانبەر پەلە کردن لە ڕێکردن دروستە، بەڵام کەمکردنەوە لە بەرانبەر لەسەرخۆیی باش نیە، یەکەم لە بەخشین دەچێ، دووەمیش لە ستەم و کەم کردنەوەی ماف دەچێ، خوا ﷻ زاناترە).

**٣٨٦١-** «عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ قِراءة قَالَ: قُلْتُ لِعَطَاءٍ: عَبْدٌ أُؤَاجِرُهُ سَنَةً بِطَعَامِهِ، وَسَنَةً أُخْرَى بِكَذَا وَكَذَا، قَالَ: لَا بَأْسَ بِهِ، وَيُجْزِئُهُ اشْتِرَاطُكَ حِينَ تُؤَاجِرُهُ أَيَّاماً، أَوْ آجَرْتَهُ وَقَدْ مَضَى بَعْضُ السَّنَةِ قَالَ: إِنَّكَ لَا تُحَاسِبُنِي لِمَا مَضَى»[١].

واتە: ئیبنو جورەیج دەیخوێندەوە دەڵێ: بە عەطائم وت: کەسێک گرێبەستی لەگەڵدا دەکەم ساڵێک بە خواردن و خواردنەوە، ساڵێکی تریش بە ئەوەندەو ئەوەندە، وتی: هیچ گرفتێکی تێدا نیە، وە مەرجەکەت بەسە بۆ ئەو کاتێ چەند ڕۆژێک گرێبەستی لەگەڵ دەکەی، یان گرێبەستت لەگەڵدا کردوە هەندێ لە ساڵەکەش ڕۆیشتووە، وتی: تۆ لێپرسینەوەم لەگەڵ مەکە لەوەی ڕۆیشتووە.

## باسی فەرموودە جیاوازەکان لەبارەی قەدەغەکردنی بە کرێدانی زەوی بە سێیەک و بە چواریەک، وە جیاوازی دەستەواژەی ئەوانەی فەرموودەکەیان گواستۆتەوە

**٣٨٦٢-** «عَنْ أُسَيْدِ بْنِ ظُهَيْرٍ: أَنَّهُ خَرَجَ إِلَى قَوْمِهِ إِلَى بَنِي حَارِثَةَ فَقَالَ: يَا بَنِي حَارِثَةَ، لَقَدْ دَخَلَتْ عَلَيْكُمْ مُصِيبَةٌ، قَالُوا: مَا هِيَ؟ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ كِرَاءِ الْأَرْضِ، قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِذاً نُكْرِيهَا بِشَيْءٍ مِنَ الْحَبِّ؟ قَالَ: لَا، قَالَ: وَكُنَّا نُكْرِيهَا بِالتِّبْنِ، فَقَالَ: لَا، وَكُنَّا نُكْرِيهَا بِمَا عَلَى الرَّبِيعِ السَّاقِي، قَالَ: لَا، ازْرَعْهَا أَوِ امْنَحْهَا أَخَاكَ» خَالَفَهُ مُجَاهِدٌ»[٢].

واتە: ئوسەیدی کوڕی ظوهەیر دەگێڕێتەوە: ئەو دەرچوو بۆ ناو قەومەکەی بۆ ناو بەنی حارثە، وتی: ئەی بەنی حارثە، بەڕاستی بەڵایەکتان تووش بووە، وتیان: بەڵای چی؟ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بە کرێدانی زەوی قەدەغە کردوە، وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، کەواتە: بە شتێک لە دانەوێڵە دەیدەین بە کرێ؟ فەرمووی: نەخێر، وتی: ئێمە بە کا و پووش دەماندا، فەرمووی: نەخێر، وتی: ئێمە دەماندا بە چواریەک، فەرمووی: نەخێر، خۆت بیکە بە کشتوکاڵ، یان بیدە بە براکەت.

---

(١) صحيح الإسناد مقطوع.

(٢) ضعيف الإسناد.




**٣٨٦٣-** «عَنْ أُسَيْدِ بْنِ ظُهَيْرٍ قَالَ: جَاءَنَا رَافِعُ بْنُ خَدِيجٍ ﷺ فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، نَهَاكُمْ عَنِ الْحَقْلِ، وَالْحَقْلُ الثُّلُثُ وَالرُّبُعُ، وَعَنِ الْمُزَابَنَةِ، وَالْمُزَابَنَةُ شِرَاءُ مَا فِي رُءُوسِ النَّخْلِ بِكَذَا وَكَذَا وَسْقاً مِنْ تَمْرٍ»[١].

**واتە: ئوسەیدی کوڕی ظوهەیر دەڵێ: ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ هات بۆ ناومان و وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری لێ کردوون لەوەی کێڵگە بدرێ بە کرێ بە سێیەک و چواریەک، وە لە (الْمُزَابَنَة)ـەش، کە بریتیە لە کڕینی ئەو خورمای بەسەر دارخورماکەوەیە بە ئەوەندە و ئەوەندە باری خورما. (واتە: ئەگەر بەرووبوومی باخەکەی خورما بوو بیفرۆشێت بە خورمای وشکی پێوراو، وە ئەگەر باخەکەی ترێ بوو بیفرۆشێت بە مێوژی پێوراو، یاخود کشتووکاڵ بێت بیفرۆشێت بە خۆراکی پێوراو).**

**٣٨٦٤-** «عَنْ أُسَيْدِ بْنِ ظُهَيْرٍ قَالَ: أَتَانَا رَافِعُ بْنُ خَدِيجٍ ﷺ فَقَالَ: نَهَانَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ أَمْرٍ كَانَ لَنَا نَافِعاً، وَطَاعَةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ خَيْرٌ لَكُمْ، نَهَاكُمْ عَنِ الْحَقْلِ وَقَالَ: مَنْ كَانَتْ لَهُ أَرْضٌ فَلْيَمْنَحْهَا أَوْ لِيَدَعْهَا، وَنَهَى عَنِ الْمُزَابَنَةِ، وَالْمُزَابَنَةُ: الرَّجُلُ يَكُونُ لَهُ الْمَالُ الْعَظِيمُ مِنَ النَّخْلِ فَيَجِيءُ الرَّجُلُ فَيَأْخُذُهَا بِكَذَا وَكَذَا وَسْقاً مِنْ تَمْرٍ»[٢].

**واتە: ئوسەیدی کوڕی ظوهەیر دەڵێ: ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ هات بۆ ناومان و وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ شتێکی لێ قەدەغە کردووین سوودی هەیە بۆمان، بەڵام گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ چاکترە بۆتان، ڕێگری لێکردوون کێڵگە بدەن بە کرێ، وە فەرموویەتی: هەرکەس زەویەکی هەیە یان بیبەخشێ یان وازی لێبێنێ، وە قەدەغەی کردوە لە (الْمُزَابَنَة)، (الْمُزَابَنَة)ـەش ئەوەیە پیاوێک خورمایەکی زۆری هەبێت بە دارخورماوە، پیاوێکی تر بێت بە ئەوەندەو ئەوەندە بار لە خورما بیبات.**

**٣٨٦٥-** «عَنْ أُسَيْدِ بْنِ ظُهَيْرٍ قَالَ: أَتَى عَلَيْنَا رَافِعُ بْنُ خَدِيجٍ ﷺ فَقَالَ، وَلَمْ أَفْهَمْ فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَاكُمْ عَنْ أَمْرٍ كَانَ يَنْفَعُكُمْ، وَطَاعَةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ خَيْرٌ لَكُمْ مِمَّا يَنْفَعُكُمْ، نَهَاكُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْحَقْلِ، وَالْحَقْلُ: الْمُزَارَعَةُ بِالثُّلُثِ وَالرُّبُعِ، فَمَنْ كَانَ لَهُ أَرْضٌ فَاسْتَغْنَى عَنْهَا فَلْيَمْنَحْهَا أَخَاهُ أَوْ لِيَدَعْ، وَنَهَاكُمْ عَنِ الْمُزَابَنَةِ، وَالْمُزَابَنَةُ: الرَّجُلُ يَجِيءُ إِلَى النَّخْلِ الْكَثِيرِ بِالْمَالِ الْعَظِيمِ فَيَقُولُ: خُذْهُ بِكَذَا وَكَذَا وَسْقاً مِنْ تَمْرِ ذَلِكَ الْعَامِ»[٣].

---

(١) صحيح الإسناد. أخرجه أبو داود: ٣٣٩٨، وإبن ماجه: ٢٤٦٠.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




**واتە: ئوسەیدی کوڕی ظوهەیر دەڵێ: ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ هات بۆ ناومان شتێکی وت لێی تێ تێنەگەیشتم، وتی: پێغەمبەر ﷺ شتێکی لێ قەدەغە کردون سوودی هەبوو بۆتان، بەڵام گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ چاکترە لەوەی سوودی هەیە بۆتان، قەدەغەی لێکردوون کێڵگە بدەن بە کرێ بە سێیەک و چواریەک، هەر کەس زەویەکی هەیەو پێویستی پێ نیە با ببەخشێ بە براکەی یان وازی لێبێنێ، وە قەدەغەی لێکردوون لە (الْمُزَابَنَة)، (الْمُزَابَنَة)ـەش ئەوەیە پیاوێک دێت بۆ لای باخە خورمایەکی زۆر بە ماڵ و سامانێکی زۆرەوە، ئەویش بڵێ: بە ئەوەندەو ئەوەندە بار خورمای ئەو ساڵە بیبە.**

**٣٨٦٦-** «عَنْ أُسَيْدِ بْنِ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَافِعُ بْنُ خَدِيجٍ: نَهَاكُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ أَمْرٍ كَانَ لَنَا نَافِعاً، وَطَاعَةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنْفَعُ لَنَا، قَالَ: مَنْ كَانَتْ لَهُ أَرْضٌ فَلْيَزْرَعْهَا، فَإِنْ عَجَزَ عَنْهَا فَلْيُزْرِعْهَا أَخَاهُ»[١].

**واتە: ئوسەیدی کوڕی ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: ڕافعی کوڕی خەدیج دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری لێکردن لە کارێک سوودی هەبوو بۆمان، بەڵام گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ چاکترە لەوەی بە سوودترە بۆمان، دەڵێ: هەرکەس زەویەکی هەیە با بیکات بە کشتوکاڵ، ئەگەر خۆی نەیتوانی با براکەی بیکات بە کشتوکاڵ.**

**٣٨٦٧-** «عَنْ مُجَاهِدٍ قَالَ: أَخَذْتُ بِيَدِ طَاوُسٍ حَتَّى أَدْخَلْتُهُ عَلَى ابْنِ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ، فَحَدَّثَهُ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ نَهَى عَنْ كِرَاءِ الْأَرْضِ، فَأَبَى طَاوُسٌ، فَقَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ: لَا يَرَى بِذَلِكَ بَأْسَاً»[٢].

**واتە: موجاهید دەڵێ: دەستی طاوسم گرت تا بردم بۆ لای کوڕەکەی ڕافعی کوڕی خەدیج، بۆم باس کرد، لە باوکیەوە ﷺ، لە پێغەمبەری خواوە ﷺ، ئەو قەدەغەی کردوە لە بەکرێدانی زەوی، طاوس نکوڵی کرد، وتی: گوێم لێ بوو ئیبنو عەبباس، هیچ گرفتی تێدا نەدەبینی.**

**٣٨٦٨-** «عَنْ مُجَاهِدٍ قَالَ: قَالَ رَافِعُ بْنُ خَدِيجٍ ﷺ: نَهَانَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ أَمْرٍ كَانَ لَنَا نَافِعاً، وَأَمْرُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَلَى الرَّأْسِ وَالْعَيْنِ، نَهَانَا أَنْ نَتَقَبَّلَ الْأَرْضَ بِبَعْضِ خَرْجِهَا»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥٥٠.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٣٨٤.




**واتە: موجاهید دەڵێ: ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری لێکردین لە کارێ سوودی هەبوو بۆمان، فەرمانی پێغەمبەری خواش ﷺ لەسەر سەرو چاو، ڕێگری لێ کردین زەوی وەربگرین بە هەندێ لە بەرهەمەکەی.**

**٣٨٦٩-** «عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى أَرْضِ رَجُلٍ مِنَ الْأَنْصَارِ قَدْ عَرَفَ أَنَّهُ مُحْتَاجٌ، فَقَالَ: لِمَنْ هَذِهِ الْأَرْضُ؟ قَالَ: لِفُلَانٍ، أَعْطَانِيهَا بِالْأَجْرِ، فَقَالَ: لَوْ مَنَحَهَا أَخَاهُ فَأَتَى رَافِعٌ الْأَنْصَارَ، فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، نَهَاكُمْ عَنْ أَمْرٍ كَانَ لَكُمْ نَافِعاً، وَطَاعَةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنْفَعُ لَكُمْ»[1].

**واتە: ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە لای زەوی کابرایەکی ئەنصاڕیدا تێپەڕی دەیزانی ئەو پیاوە هەژارە، فەرمووی: ئەم زەویە هی کێ یە؟ وتی: هی فڵانە کەسە، بە کرێ پێی داوم، فەرمووی: خوزگە دەیدا بە براکەی، ڕافع هات بۆ ناو ئەنصارەکان وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری لێکردوون لە کارێ ئەوە بۆ ئێوە بە سوود بوو، بەڵام گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ بە سوود ترە بۆتان.**

**٣٨٧٠-** «عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْحَقْلِ»[2].

**واتە: ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە کرێدانی کێڵگەی قەدەغە کردوە.**

**٣٨٧١-** «عَنْ مُجَاهِدٍ قَالَ: رَافِعُ بْنُ خَدِيجٍ ﷺ قَالَ: خَرَجَ إِلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَنَهَانَا عَنْ أَمْرٍ كَانَ لَنَا نَافِعاً، فَقَالَ: مَنْ كَانَ لَهُ أَرْضٌ فَلْيَزْرَعْهَا، أَوْ يَمْنَحْهَا، أَوْ يَذَرْهَا»[3].

**واتە: موجاهید دەڵێ: ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە بۆ لامان ڕێگری لێ کردین لە کارێک کە سوودی هەبوو بۆمان، فەرمووی: هەرکەس زەویەکی هەیە با بیچێنێ یان بیبەخشێ یان وازی لێبێنێ.**

**٣٨٧٢-** «عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ قَالَ: خَرَجَ إِلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَنَهَانَا عَنْ أَمْرٍ كَانَ لَنَا نَافِعاً وَأَمْرُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ خَيْرٌ لَنَا، قَالَ: مَنْ كَانَ لَهُ أَرْضٌ فَلْيَزْرَعْهَا، أَوْ لِيَذَرْهَا، أَوْ لِيَمْنَحْهَا»[4].

---

(١) ضعيف الإسناد.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح لغيره.

(٤) صحيح لغيره.




واتە: ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە بۆ لامان ڕێگری لێکردین لە کارێک کە سوودی هەبوو بۆمان، فەرمانی پێغەمبەر ﷺ سوودی هەیە بۆمان، فەرمووی: هەرکەس زەویەکی هەیە با بیچێنێ، یان وازی لێبهێنێ، یان ببەخشێ.

**٣٨٧٣-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ قَالَ: كَانَ طَاوُسٌ، يَكْرَهُ أَنْ يُؤَاجِرَ أَرْضَهُ بِالذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ، وَلَا يَرَى بِالثُّلُثِ وَالرُّبُعِ بَأْساً، فَقَالَ لَهُ مُجَاهِدٌ: اذْهَبْ إِلَى ابْنِ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ فَاسْمَعْ مِنْهُ حَدِيثَهُ، فَقَالَ: إِنِّي وَاللَّهِ لَوْ أَعْلَمُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْهُ مَا فَعَلْتُهُ، وَلَكِنْ حَدَّثَنِي مَنْ هُوَ أَعْلَمُ مِنْهُ ابْنُ عَبَّاسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ إِنَّمَا قَالَ: لَأَنْ يَمْنَحَ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ أَرْضَهُ خَيْرٌ مِنْ أَنْ يَأْخُذَ عَلَيْهَا خَرَاجاً مَعْلُوماً»(١).

واتە: عەمرى کوڕی دینار دەڵێ: طاوس بە باشی نەدەزانی زەویەکەی بە زێڕو زیو بدات بەکرێ، سێیەک و چواریەکی بە گرفت نەدەزانی، موجاهید پێی وت: بڕۆ بۆ لای کوڕەکەی ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ فەرموودەکەی لێوە ببیستە، وتی: سوێند بە خوا من ئەگەر بمزانیایە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری لێکردوە منیش نەمدەکرد، بەڵام پێم بڵێ کێ لە ئیبنو عەبباس شارەزاترە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێک لە ئێوە زەویەکەی ببەخشێ بە براکەی باشترە لەوەی لەبری بەرووبومێکی تایبەت وەربگرێ.

**٣٨٧٤-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ كَانَ لَهُ أَرْضٌ فَلْيَزْرَعْهَا، فَإِنْ عَجَزَ أَنْ يَزْرَعَهَا فَلْيَمْنَحْهَا أَخَاهُ الْمُسْلِمَ، وَلَا يُزْرِعْهَا إِيَّاهُ»(٢).

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس زەوی هەیە با بیکات بە کشتوکاڵ، ئەگەر نەیتوانی بیکات بە کشتوکاڵ ئەوە با ببەخشێ بە برا مسوڵمانەکەی، بەڵام با پێی نەدات بۆی بکات بە کشتوکاڵ.

**٣٨٧٥-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ كَانَتْ لَهُ أَرْضٌ فَلْيَزْرَعْهَا، أَوْ لِيَمْنَحْهَا أَخَاهُ وَلَا يُكْرِيهَا»(٣).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٤٣ و ٢٦٣٤، ومسلم: ١٢٠ و ١٥٥٠/١٢٣، وأبو داود: ٣٣٨٩، والترمذي: ١٣٨٥، وإبن ماجه: ٢٤٥٧ و ٢٤٦٣ و ٢٤٦٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٤٠ و ٢٦٣٢، ومسلم: ٩١ و ١٥٣٦/٩٨، وإبن ماجه: ٢٤٥١ و ٢٤٥٤.

(٣) صحيح.




واته: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس زەوی هەیە با بیکات بە کشتوکاڵ، یان بیبەخشێ بە براکەی و نەیدات بە کرێ.

**٣٨٧٦-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: كَانَ لِأُنَاسٍ فُضُولُ أَرَضِينَ يُكْرُونَهَا بِالنِّصْفِ وَالثُّلُثِ وَالرُّبُعِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ كَانَتْ لَهُ أَرْضٌ فَلْيَزْرَعْهَا، أَوْ يُزْرِعْهَا، أَوْ يُمْسِكْهَا»[١].

واته: جابر ﷺ دەڵێ: خەڵکانێک زەوی زیادەیان هەبوو دەیاندا بە کرێ بە نیوەو بە سێیەک و بە چواریەک، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەرکەس زەوی هەیە با خۆی بیکات بە کشتوکاڵ، یاخود بیدات بە یەکێکی تر بیکات بە کشتوکاڵ یان بیگرێتەوە.

**٣٨٧٧-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: مَنْ كَانَتْ لَهُ أَرْضٌ فَلْيَزْرَعْهَا، أَوْ لِيُزْرِعْهَا وَلَا يُؤَاجِرْهَا»[٢].

واته: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری بۆ داین فەرمووی: هەرکەس زەوی هەیە با خۆی بیکات بە کشتوکاڵ، یاخود بیدات بە یەکێکی تر بیکات بە کشتوکاڵ، وە با نەیدات بە کرێ.

**٣٨٧٨-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، رَفَعَهُ نَهَى عَنْ كِرَاءِ الْأَرْضِ»[٣].

واته: جابر ﷺ ڕەفعی کردوە (پێغەمبەر ﷺ) ڕێگری کردوە لە بەکرێدانی زەوی.

**٣٨٧٩-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنِ الْمُخَابَرَةِ، وَالْمُزَابَنَةِ، وَالْمُحَاقَلَةِ، وَبَيْعِ الثَّمَرِ حَتَّى يُطْعَمَ، إِلَّا الْعَرَايَا»[٤].

واته: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە لە (الْمُخَابَرَة) وە (وَالْمُزَابَنَة) وە لە (وَالْمُحَاقَلَة) وە لە فرۆشتنی ڕەفعی بەرووبووم تا پێ دەگات جگە لە عەرایا.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح لغيره. أخرجه مسلم: ٨٦ و ٨٧ و ١٥٣٦/٩٩.

(٤) صحيح.




تێبینی: (الْمُخَابَرَة): واتە: کەسێک زەویەکی هەبێت بەکەسێکی تر بڵێت: بیکێڵەو تۆوی بکە، دوای بەشێکت دەدەمێ، ئەمە دروست نیە، لەوانەیە ئەو بەرهەمە نەبێت، بەڵام لە سەرەتاوە لە کێڵان و تۆ و کردن و هەموو شتێکدا هاوبەش بن ئەوە دروستە).

(الْمُزَابَنَة): بریتیە لە فرۆشتنی ئەو خورما تەڕەی بەسەر دارخورماکەوەیە بە ئەوەندەو ئەوەندە باری خورمای وشک، ئەگەر زیاتر بوو بۆ من، وە ئەگەر کەمتر بوو ئەوە لەسەر خۆمە.

(وَالْمُحَاقَلَة): واتە: بریتیە لە فرۆشتنی گەنم بە گوڵەوە بە گەنمی ساغ و پاککراو، ئەمەش دروست نیە، لەوانەیە گەنمی ناو ئەو گوڵە پوکاوەو خراپ بێت.

(العرايا): واتە: کڕینی خورمای تەڕ بە خورمای وشک بە خەمڵاندن.

**٣٨٨٠-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنِ الْمُحَاقَلَةِ، وَالْمُزَابَنَةِ، وَالْمُخَابَرَةِ»[١].

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە لە (الْمُحَاقَلَة) و (الْمُزَابَنَة) و (الْمُخَابَرَة).

**٣٨٨١-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ كَانَتْ لَهُ أَرْضٌ فَلْيَزْرَعْهَا، أَوْ لِيُزْرِعْهَا أَخَاهُ، وَلَا يُكْرِيهَا أَخَاهُ»[٢].

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس زەویەکی هەیە با خۆی بیکات بە کشتوکاڵ، یان براکەی بیکات بە کشتووکاڵ، با بە کرێ نەیداتە براکەی.

**٣٨٨٢-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، نَهَى عَنِ الْحَقْلِ، وَهِيَ الْمُزَابَنَةُ»[٣].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەو:، پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە لەوەی کێڵگە بدرێ بە کرێ، کە ئەویش (الْمُزَابَنَة)یە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

**٣٨٨٣-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، نَهَى عَنِ الْمُزَابَنَةِ، وَالْمُخَاضَرَةِ، وَقَالَ: الْمُخَاضَرَةُ: بَيْعُ الثَّمَرِ قَبْلَ أَنْ يَزْهُوَ، وَالْمُخَابَرَةُ: بَيْعُ الْكَرْمِ بِكَذَا وَكَذَا صَاعٍ»(١).

**واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە لە (الْمُزَابَنَة) و (الْمُخَاضَرَة) وە (الْمُخَاضَرَة): بریتیە لە فرۆشتنی بەرووبووم پێش ئەوەی پێبگات، (الْمُخَابَرَةُ): فرۆشتنی ترێیە بە ئەوەندەو ئەوەندە صاع.**

**٣٨٨٤-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، عَنِ الْمُحَاقَلَةِ وَالْمُزَابَنَةِ»(٢).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە (الْمُحَاقَلَة) و (الْمُزَابَنَة).**

**٣٨٨٥-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، عَنِ الْمُحَاقَلَةِ وَالْمُزَابَنَةِ»(٣).

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە (الْمُحَاقَلَة) و (الْمُزَابَنَة).**

**٣٨٨٦-** «عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، نَهَى عَنِ الْمُحَاقَلَةِ وَالْمُزَابَنَةِ»(٤).

**واتە: ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە (الْمُحَاقَلَة)و (الْمُزَابَنَة).**

**٣٨٨٧-** «عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، نَهَى عَنِ الْمُحَاقَلَةِ وَالْمُزَابَنَةِ»(٥).

**واتە: ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە (الْمُحَاقَلَة)و (الْمُزَابَنَة).**

**٣٨٨٨-** «عَنْ عُثْمَانَ بْنِ مُرَّةَ قَالَ: سَأَلْتُ الْقَاسِمَ، عَنْ كِرَاءِ الْأَرْضِ؟ فَقَالَ: قَالَ رَافِعُ بْنُ خَدِيجٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، نَهَى عَنْ كِرَاءِ الْأَرْضِ»(٦).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) حسن صحيح الإسناد. أخرجه البخاري: ٢١٨٩، ومسلم: ١٥٤٦، وإبن ماجه: ٢٤٥٥.

(٤) صحيح.

(٥) صحيح الإسناد.

(٦) صحيح الإسناد.




**واتە: عوسمانی كوڕی مورە دەڵێ: پرسیارم لە قاسم كرد دەربارەی بە كرێدانی زەوی؟ وتی: ڕافعی كوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی كردوە لە بەكرێدانی زەوی.**

**٣٨٨٩-** «عَنْ عُمَيْرِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: أَرْسَلَنِي عَمِّي وَغُلَاماً لَهُ إِلَى سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيِّبِ، أَسْأَلُهُ عَنِ الْمُزَارَعَةِ؟ فَقَالَ: كَانَ ابْنُ عُمَرَ، لَا يَرَى بِهَا بَأْساً، حَتَّى بَلَغَهُ عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ حَدِيثٌ فَلَقِيَهُ، فَقَالَ رَافِعٌ: أَتَى النَّبِيُّ ﷺ بَنِي حَارِثَةَ فَرَأَى زَرْعاً، فَقَالَ: مَا أَحْسَنَ زَرْعَ ظُهَيْرٍ؟ فَقَالُوا: لَيْسَ لِظُهَيْرٍ، فَقَالَ: أَلَيْسَ أَرْضُ ظُهَيْرٍ؟ قَالُوا: بَلَى، وَلَكِنَّهُ أَزْرَعَهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: خُذُوا زَرْعَكُمْ وَرُدُّوا إِلَيْهِ نَفَقَتَهُ، قَالَ: فَأَخَذْنَا زَرْعَنَا، وَرَدَدْنَا إِلَيْهِ نَفَقَتَهُ»[١].

**واتە: عومەیری كوڕی یەزید دەڵێ: مامم من و خزمەتكارێكی خۆی نارد بۆ لای سەعیدی كوڕی موسەیب پرسیاری لێ بكەم لەبارەی كشتوكاڵ كردنەوە؟ وتی: ئیبنو عومەر بە گرفتی نەدەزانی، تا وتەكەی ڕافعی كوڕی خەدیجی ﷺ پێ ڕاگەیەنرا، پاشان پێی گەیشت، ڕافع وتی: پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لای بەنی حارثە كشتوكاڵێكی بینی، فەرمووی: ئای چەندە چاكە كشتوكاڵی ظوهەیر؟ وتیان: ئەوە هی ظوهەیر نیە، فەرمووی: ئایا ئەوە زەوی ظوهەیر نیە؟ وتیان: بەڵێ: بەڵام داویەتی بە خەڵك بۆی بكەن بە كشتوكاڵ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: كشتوكاڵەكەتان وەربگرن و خەرجیەكەشی بۆ بگێڕنەوە، وتی: كشتوكاڵەكەمان وەرگرتەوەو خەرجیەكەشمان بۆی گەڕاندەوە.**

**٣٨٩٠-** «عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ قَالَ، نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْمُحَاقَلَةِ وَالْمُزَابَنَةِ، وَقَالَ: إِنَّمَا يَزْرَعُ ثَلَاثَةٌ: رَجُلٌ لَهُ أَرْضٌ فَهُوَ يَزْرَعُهَا، أَوْ رَجُلٌ مُنِحَ أَرْضاً فَهُوَ يَزْرَعُ مَا مُنِحَ، أَوْ رَجُلٌ اسْتَكْرَى أَرْضاً بِذَهَبٍ أَوْ فِضَّةٍ»[٢].

**واتە: ڕافعی كوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ (الْمُحَاقَلَة) و (الْمُزَابَنَة) ی قەدەغە كردوە، وە فەرموویەتی: بەڵكو سێ شت دەكرێ بە كشتوكاڵ: پیاوێك زەویەكی هەبێت خۆی بیكات بە كشتووكاڵ، یان پیاوێك زەویەكی پێ بەخشرا بێ ئەویش ئەو زەویە بچێنێ كە پێی بەخشراوە، یان پیاوێك زەویەكی بە كرێ گرتووە بە زێڕ یان بە زیو.**

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٣٩٩.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٤٠٠، وإبن ماجه: ٢٢٦٧ و ٢٤٤٩.




**٣٨٩١-** «عَنْ سَعِيدٍ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْمُحَاقَلَةِ»[١].

**واتە: سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ (الْمُحَاقَلَةِ)ی قەدەغە کردوە.**

**٣٨٩٢-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيِّبِ يَقُولُ: لَا يُصْلِحُ الزَّرْعَ غَيْرُ ثَلَاثٍ: أَرْضٍ يَمْلِكُ رَقَبَتَهَا، أَوْ مِنْحَةٍ، أَوْ أَرْضٍ بَيْضَاءَ يَسْتَأْجِرُهَا بِذَهَبٍ أَوْ فِضَّةٍ»[٢].

**واتە: سەعیدی کوڕی موسەیب دەڵێ: کشتووکاڵ کردن دروست نیە جگە لەم سیانە: زەویەک موڵکی خۆی بێ، یان پێی بەخشرابێ، یان زەویەک بێ بە کرێ گرتبێتی بە زێڕ بێ یان بە زیو (پارەی ئەو کات زێڕو زیو بوو).**

**٣٨٩٣-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيِّبِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الْمُحَاقَلَةِ، وَالْمُزَابَنَةِ»[٣].

**واتە: سەعیدی کوڕی موسەیب دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ (الْمُحَاقَلَةِ) و (الْمُزَابَنَةِ)ی قەدەغە کردوە.**

**٣٨٩٤-** «عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ قَالَ: كَانَ أَصْحَابُ الْمَزَارِعِ يُكْرُونَ فِي زَمَانِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مَزَارِعَهُمْ بِمَا يَكُونُ عَلَى السَّاقِي، مِنَ الزَّرْعِ، فَجَاءُوا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَاخْتَصَمُوا فِي بَعْضِ ذَلِكَ، فَنَهَاهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُكْرُوا بِذَلِكَ، وَقَالَ: أَكْرُوا بِالذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ»[٤].

**واتە: سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص ﷺ دەڵێ: خاوەن زەویە کشتووکاڵەکان لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ زەویەکانیان دەدا بە کرێ بەوەی کە لە قەراغی ڕوبار سەوز دەبوو لە کشتوکاڵ (واتە: بە بەشێک لە بەرهەمە چاکەکەی قەراغی دەریا)، جا هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ناکۆکیان بوو لەو بارەیەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێ کردن بەو شێوەیە زەوی بدەن بە کرێ، فەرمووی: بە زێڕو بە زیو بیدەن بە کرێ.**

**٣٨٩٥** «عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا نُحَاقِلُ بِالْأَرْضِ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَنُكْرِيهَا بِالثُّلُثِ، وَالرُّبُعِ، وَالطَّعَامِ الْمُسَمَّى، فَجَاءَ ذَاتَ يَوْمٍ رَجُلٌ مِنْ عُمُومَتِي، فَقَالَ: نَهَانِي رَسُولُ اللَّهِ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح مقطوع.

(٣) صحيح لغيره.

(٤) حسن صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٣٩١.

ﷺ عَنْ أَمْرٍ كَانَ لَنَا نَافِعاً، وَطَوَاعِيَةُ اللَّهِ وَرَسُولِهِ أَنْفَعُ لَنَا، نَهَانَا أَنْ نُحَاقِلَ بِالْأَرْضِ، وَنُكْرِيَهَا بِالثُّلُثِ، وَالرُّبُعِ، وَالطَّعَامِ الْمُسَمَّى، وَأَمَرَ رَبَّ الْأَرْضِ أَنْ يَزْرَعَهَا، أَوْ يُزْرِعَهَا، وَكَرِهَ كِرَاءَهَا وَمَا سِوَى ذَلِكَ»[1].

**واتە: ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ زەویمان دەدا بە کرێ بە شێوەی (الْمُحَاقَلَة) بە سێیەک و چواریەک، وە بە خواردنێکی دیاریکراو، جا ڕۆژێک پیاوێک لە مامەکانم هات وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێکردووین لە شتێک سوودی هەبووە بۆمان، بەڵام گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر لەوە بەسودترە بۆمان، قەدەغەی لێ کردوین زەوی بدەین بە (الْمُحَاقَلَة)، وە بیدەین بە سێیەک و چواریەک و خواردەمەنی دیاری کراو، فەرمانیشی کرد بە خاوەن زەوی خۆی بیچێنێ یان بیدات بە کەسێکی تر بیچێنێ، پێی باش نەبووە بدرێ بە کرێ، بەو شێوە نەبێت.**

**٣٨٩٦-** «عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا نُحَاقِلُ الْأَرْضَ نُكْرِيهَا بِالثُّلُثِ، وَالرُّبُعِ، وَالطَّعَامِ الْمُسَمَّى»[2].

**واتە: ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: ئێمە زەویمان دەدا بە کرێ بە شێوەی (الْمُحَاقَلَة) بە سێیەک، و چواریەک و خواردنی دیاریکراو.**

**٣٨٩٧-** «عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا نُحَاقِلُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَزَعَمَ أَنَّ بَعْضَ عُمُومَتِهِ أَتَاهُ، فَقَالَ: نَهَانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ أَمْرٍ كَانَ لَنَا نَافِعاً وَطَوَاعِيَةُ اللَّهِ وَرَسُولِهِ أَنْفَعُ لَنَا، قُلْنَا: وَمَا ذَاكَ؟ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ كَانَتْ لَهُ أَرْضٌ، فَلْيَزْرَعْهَا، أَوْ لِيُزْرِعْهَا أَخَاهُ، وَلَا يُكَارِيهَا بِثُلُثٍ، وَلَا رُبُعٍ، وَلَا طَعَامٍ مُسَمًّى»[3].

**واتە: ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ زەویمان دەدا بە کرێ، پێی وابوو هەندێ لە مامەکانی هات بۆ لای وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێکردوین لە شتێ سوودی هەبووە بۆمان، بەڵام گوێڕایەڵی خواو**

---

(1) )صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٤٦ و ٢٣٤٧ و ٤٠١٣، ومسلم: ١١١ و ١٥٤٧/١١٢ و ١٥٤٨، وأبو داود: ٣٣٩٤ و ٣٣٩٥ و ٣٣٩٦، وإبن ماجه: ٢٤٦٥.

(2) صحيح.

(3) صحيح.




پێغەمبەر لەوە بە سوود ترە بۆمان، وتمان: ئەوە چیە؟ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس زەویەکی هەیە با خۆی بیکات بە کشتوکاڵ، یان براکەی بیکات بە کشتوکاڵ، با نەیدات بە کرێ، نە بە سێیەک، نە بە چواریەک و نە بە خواردنی دیاریکراو.

**٣٨٩٨-** «عَنْ حَنْظَلَةَ بن قَيْسٍ، عَن رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ قَالَ: حَدَّثَنِي عَمِّي، أَنَّهُمْ كَانُوا يُكْرُونَ الْأَرْضَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِمَا يَنْبُتُ عَلَى الْأَرْبِعَاءِ، وَشَيْءٍ مِنَ الزَّرْعِ يَسْتَثْنِي صَاحِبُ الْأَرْضِ، فَنَهَانَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ ذَلِكَ، فَقُلْتُ لِرَافِعٍ: فَكَيْفَ كِرَاؤُهَا بِالدِّينَارِ وَالدِّرْهَمِ؟ فَقَالَ رَافِعٌ: لَيْسَ بِهَا بَأْسٌ بِالدِّينَارِ وَالدِّرْهَمِ»[١].

واتە: حەنظلەی کوڕی قەیس، لە ڕافعی کوڕی خەدیجەوە ﷺ دەڵێ: مامم بۆی باسکردم، ئەوان زەویان دەدا بە کرێ لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ بەو بەشەی کە لە قەراغی ڕووبار سەوز دەبێ (واتە: بە بەشێک لە بەرهەمە چاکەکەی قەڕاغی دەریا)، وە شتێکیش لە کشتوکاڵەکە، کە خاوەن زەویەکە جیای دەکردەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کارەی لێ قەدەغە کردین، بە ڕافعم وت: ئەی ئەگەر بە دینارو درهەم بدرێ بە کرێ چۆنە؟ ڕافع وتی: هیچ گرفتێک لەوەدا نیە بە دینارو درهەم بدرێ.

**٣٨٩٩-** «عَنْ حَنْظَلَةَ بْنِ قَيْسٍ الْأَنْصَارِيِّ قَالَ: سَأَلْتُ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ ﷺ، عَنْ كِرَاءِ الْأَرْضِ بِالدِّينَارِ وَالْوَرِقِ؟ فَقَالَ: لَا بَأْسَ بِذَلِكَ، إِنَّمَا كَانَ النَّاسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، يُؤَاجِرُونَ عَلَى الْمَاذِيَانَاتِ، وَأَقْبَالِ الْجَدَاوِلِ، فَيَسْلَمُ هَذَا، وَيَهْلِكُ هَذَا، وَيَسْلَمُ هَذَا، وَيَهْلِكُ هَذَا، فَلَمْ يَكُنْ لِلنَّاسِ كِرَاءٌ إِلَّا هَذَا، فَلِذَلِكَ زُجِرَ عَنْهُ، فَأَمَّا شَيْءٌ مَعْلُومٌ مَضْمُونٌ، فَلَا بَأْسَ بِهِ»[٢].

واتە: حەنظلەی کوڕی قەیسی ئەنصاڕی دەڵێ: پرسیارم لە ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ کرد لە بارەی بە کرێدانی زەوی بە دینارو زیو؟ وتی: هیچ گرفتێک لەوەدا نیە، چونکە خەڵکی لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ ئەو زەویانەیان دەدا بە کرێ کە لە سەر ڕووباری گەورە بوون، وە ئەو زەویانەیشی لە سەر ڕووباری بچوک بوون،

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٢٧ و ٢٣٣٢ و ٢٧٢٢، ومسلم: ١١٥ و ١٥٤٧/١١٧، وأبو داود: ٣٣٩٢ و ٣٣٩٣، وإبن ماجه: ٢٤٨.




جا هەندێ جار ئەم بەشە لە کشتوکاڵەکە چاک دەبوو، بەشەکەی دیکەیش لە ناو دەچوو، وە هەندێ جار ئەو بەشەی دیکە چاک دەبوو، ئەم بەشەیش لە ناو دەچوو، خەڵکی نەیاندەدا بە کرێ تەنها بەمە نەبێ، ئا لەبەر ئەمەیە ڕێگری لێکرد، بەڵام بە شتێکی دیاری کراوی گرنتی کراو هیچ گرفتێکی تێدانیە.

**٣٩٠٠-** «عَنْ حَنْظَلَةَ بْنِ قَيْسٍ قَالَ: سَأَلْتُ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ ﷺ، عَنْ كِرَاءِ الْأَرْضِ، فَقَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ كِرَاءِ الْأَرْضِ، قُلْتُ: بِالذَّهَبِ وَالْوَرِقِ؟ قَالَ: لَا، إِنَّمَا نَهَى عَنْهَا بِمَا يَخْرُجُ مِنْهَا، فَأَمَّا الذَّهَبُ وَالْفِضَّةُ، فَلَا بَأْسَ»(١).

واتە: حەنظلەی کوڕی قەیس دەڵێ: پرسیارم لە ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ کرد سەبارەت بە بەکرێدانی زەوی، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەکرێدانی زەوی قەدەغە کردوە، وتم: بە زێڕو بە زیویش؟ وتی: نەخێر، بەڵکو قەدەغەی کردوە بەوەی لێی دەردەچێ (واتە: بە بەروبوومەکەی)، بەڵام زێڕو زیو هیچ گرفتێکی تێدانیە.

**٣٩٠١-** «عَنْ حَنْظَلَةَ بْنِ قَيْسٍ قَالَ: سَأَلْتُ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ ﷺ، عَنْ كِرَاءِ الْأَرْضِ الْبَيْضَاءِ بِالذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ؟ فَقَالَ: حَلَالٌ، لَا بَأْسَ بِهِ ذَلِكَ، فَرْضُ الْأَرْضِ»(٢).

واتە: حەنظلەی کوڕی قەیس دەڵێ: پرسیارم لە ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ کرد سەبارەت بە بەکرێدانی زەوی ڕووتی بە درەخت بە زێڕو بە زیو؟ وتی: حەڵاڵە، هیچ کێشەیەکی تێدانیە بەشی زەویەکەیە.

**٣٩٠٢-** «عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ قَالَ: نَهَانَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ كِرَاءِ أَرْضِنَا، وَلَمْ يَكُنْ يَوْمَئِذٍ ذَهَبٌ وَلَا فِضَّةٌ، فَكَانَ الرَّجُلُ يُكْرِي أَرْضَهُ، بِمَا عَلَى الرَّبِيعِ وَالْأَقْبَالِ، وَأَشْيَاءَ مَعْلُومَةٍ»(٣).

واتە: ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێکردین زەویەکانمان بدەین بە کرێ، لەو ڕۆژەدا زێڕ و زیو نەبوو، کەسێک زەویەکەی دەدا بە کرێ بەو بەشەی کە لە قەراغی ڕوبارەو ئەوەیشی کە ڕووبار ئاوی دەدات، وە هەندێ شتی دیاریکراوی تریش.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح الإسنا.




**٣٩٠٣-** «عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَنَّ سَالِمَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ وَذَكَرَ نَحْوَهُ»[١].

**واتە: زوهری دەگێڕێتەوە، لە سالمی کوڕی عەبدوڵڵاوە ﷺ هەروەکو ئەوەی باس کرد.**

**٣٩٠٤-** «عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ كَانَ يُكْرِي أَرْضَهُ، حَتَّى بَلَغَهُ أَنَّ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ كَانَ يَنْهَى عَنْ كِرَاءِ الْأَرْضِ، فَلَقِيَهُ عَبْدُ اللَّهِ، فَقَالَ: يَا ابْنَ خَدِيجٍ، مَاذَا تُحَدِّثُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي كِرَاءِ الْأَرْضِ؟ فَقَالَ رَافِعٌ لِعَبْدِ اللَّهِ: سَمِعْتُ عَمَّيَّ وَكَانَا قَدْ شَهِدَا بَدْراً يُحَدِّثَانِ أَهْلَ الدَّارِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ كِرَاءِ الْأَرْضِ، قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: فَلَقَدْ كُنْتُ أَعْلَمُ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّ الْأَرْضَ تُكْرَى، ثُمَّ خَشِيَ عَبْدُ اللَّهِ أَنْ يَكُونَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَحْدَثَ فِي ذَلِكَ شَيْئاً لَمْ يَكُنْ يَعْلَمُهُ، فَتَرَكَ كِرَاءَ الْأَرْضِ»[٢].

**واتە: سالمی کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر زەویەکەی دەدا بە کرێ، تا هەواڵی پێ گەیشت کە ڕافعی کوڕی خەدیج بە کرێدانی زەوی قەدەغە دەکات، جا عەبدوڵڵا پێی گەیشت وتی: ئەی کوڕی خەدیج چی باس دەکەی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ لە بارەی بە کرێدانی زەوی؟ ڕافع بە عەبدوڵڵای وت: گوێم لە هەردوو مامم بوو کە بەشداری بەدریان کردبوو باسیان دەکرد کە بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ بە کرێدانی زەوی قەدەغە کردوە، عەبدوڵڵایش وتی: بە دڵنیایی من دەزانم لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ زەوی دەدرا بە کرێ، پاشان عەبدوڵڵا ترسا لەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەو بارەیەوە شتێکی وتبێ و ئەو نەیزانیبێ، بۆیە وازی هێنا لە بە کرێدانی زەوی.**

**٣٩٠٥-** «عَنْ الزُّهْرِيِّ قَالَ: بَلَغَنَا أَنَّ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ ﷺ، كَانَ يُحَدِّثُ أَنَّ عَمَّيْهِ وَكَانَا يَزْعُمُ شَهِدَا بَدْراً، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ كِرَاءِ الْأَرْضِ»[٣].

**واتە: زوهری دەڵێ: پێمان ڕاگەیەندراوە ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ دەگێڕێتەوە: لە مامیەوە کە بەشداری بەدری کردبوو دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە کرێدانی زەوی قەدەغە کرد.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح لغيره.




**٣٩٠٦-** «عَنْ الزُّهْرِيِّ قال: كَانَ ابْنُ الْمُسَيِّبِ يَقُولُ: لَيْسَ بِاسْتِكْرَاءِ الْأَرْضِ بِالذَّهَبِ وَالْوَرِقِ بَأْسٌ، وَكَانَ رَافِعُ بْنُ خَدِيجٍ ﷺ يُحَدِّثُ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ ذَلِكَ»[١].

**واتە: زوهری دەڵێ: ئیبنو موسەیب دەڵێ: بە کرێدانی زەوی بە زێڕو زیو هیچ گرفتێکی تێدانیە، وە ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ باسی دەکرد پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی قەدەغە کرد.**

**٣٩٠٧-** «عَنِ بْنِ شِهَابٍ، عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ كِرَاءِ الْأَرْضِ، قَالَ ابْنُ شِهَابٍ فَسُئِلَ رَافِعٌ بَعْدَ ذَلِكَ: كَيْفَ كَانُوا يُكْرُونَ الْأَرْضَ؟ قَالَ: بِشَيْءٍ مِنَ الطَّعَامِ مُسَمًّى، وَيُشْتَرَطُ أَنَّ لَنَا مَا تُنْبِتُ مَاذِيَانَاتُ الْأَرْضِ، وَأَقْبَالُ الْجَدَاوِلِ»[٢].

**واتە: ئیبنو شیهاب دەگێڕێتەوە، ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە کرێدانی زەوی قەدەغە کردوە، دوای ئەوە پرسیارکرا لە ڕافع: چۆن زەویان بە کرێ دەدا؟ وتی: بە بەشێک لە خواردنی دیاری کراو، هەروەها مەرجیان دادەنا ئەوەی ڕووبارە گەورەکان و بچووکەکان سەوزی دەکەن بۆ ئێمەیە.**

**٣٩٠٨-** «عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ، أنَّه أَخْبَرَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ، أَنَّ عُمُومَتَهُ جَاءُوا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ رَجَعُوا فَأَخْبَرُوا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ كِرَاءِ الْمَزَارِعِ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: قَدْ عَلِمْنَا أَنَّهُ كَانَ صَاحِبَ مَزْرَعَةٍ يُكْرِيهَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَلَى أَنَّ لَهُ مَا عَلَى الرَّبِيعِ السَّاقِي، الَّذِي يَتَفَجَّرُ مِنْهُ الْمَاءُ، وَطَائِفَةٌ مِنَ التِّبْنِ لَا أَدْرِي كَمْ هِيَ»[٣].

**واتە: ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ، هەواڵیدا بە عەبدوڵلای کوڕی عومەر، مامەکانی هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، پاشان گەڕانەوەو ڕایانگەیاند پێغەمبەری خوا ﷺ بە کرێدانی زەوی کشتوکاڵی قەدەغە کرد، عەبدوڵلا وتی: ئێمە زانیومانە ئەو خاوەن باخچەیەک بوو لە سەردەمی پێغەمبەردا بە کرێی دەدا، لە سەر ئەوەی بەشێکی دیاریکراوی بداتێ لە قەراغی ڕووبار کە ئاوەکەی لێوە هەڵدەقوڵێ، وە بەشێک لە کاو پوشەکەی، نەمدەزانی ئەو بەشە چەندە.**

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح الإسناد.




**٣٩٠٩-** «عَنْ نَافِعٍ، كَانَ ابْنُ عُمَرَ يَأْخُذُ كِرَاءَ الْأَرْضِ، فَبَلَغَهُ، عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ شَيْءٌ، فَأَخَذَ بِيَدِي فَمَشَى إِلَى رَافِعٍ وَأَنَا مَعَهُ، فَحَدَّثَهُ رَافِعٌ، عَنْ بَعْضِ عُمُومَتِهِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ كِرَاءِ الْأَرْضِ، فَتَرَكَ عَبْدُ اللَّهِ بَعْدُ»[١].

**واتە: نافع دەگێڕێتەوە، ئیبنو عومەر كرێی زەوی وەردەگرت، شتێكی لە لایەن ڕافعی كوڕی خەدیجەوە ﷺ پێ گەیشت، دەستمی گرت و بردمی بۆ لای ڕافع منیش لە گەڵیدا بووم، ڕافع لە مامەكانیەوە هەندێ شتی بۆی باسكرد كە بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ بە كرێدانی زەوی قەدەغە كردوە، دوای ئەوە عەبدوڵڵا وازی لێ هێنا.**

**٣٩١٠-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ كَانَ يَأْخُذُ كِرَاءَ الْأَرْضِ، حَتَّى حَدَّثَهُ رَافِعٌ، عَنْ بَعْضِ عُمُومَتِهِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ كِرَاءِ الْأَرْضِ، فَتَرَكَهَا بَعْدُ»[٢].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: كە ئەو كرێی زەوی وەردەگرت، تا ڕافع هەندێ شتی لە مامەكانیەوە بۆی باسكرد، كە بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ بە كرێدانی زەوی قەدەغە كردوە، دوای ئەوە عەبدوڵڵا وازی لێ هێنا.**

**٣٩١١-** «عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا كَانَ يُكْرِي مَزَارِعَهُ حَتَّى بَلَغَهُ فِي آخِرِ خِلَافَةِ مُعَاوِيَةَ، أَنَّ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ يُخْبِرُ فِيهَا بِنَهْيِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَتَاهُ، وَأَنَا مَعَهُ، فَسَأَلَهُ، فَقَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَنْهَى عَنْ كِرَاءِ الْمَزَارِعِ، فَتَرَكَهَا ابْنُ عُمَرَ بَعْدُ، فَكَانَ إِذَا سُئِلَ عَنْهَا، قَالَ: زَعَمَ رَافِعُ بْنُ خَدِيجٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنْهَا»[٣].

**واتە: نافع دەگێڕێتەوە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) باخچەكەی دەدا بە كرێ تا لە كۆتایی خیلافەتی موعاویەدا هەواڵی پێگەیشت، كە ڕافعی كوڕی خەدیج هەواڵی دابوو بەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی كردوە، ئەویش هات بۆ لای و منیش لەگەڵیدا بووم، پرسیاری لێكرد ئەویش وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی كردوە لە بە كرێدانی باخچە، ئیبنو عومەریش دوای ئەوە وازی لێ هێنا، جا ئەگەر لەو بارەوە پرسیاری لێ بكرایە دەیوت: ڕافعی كوڕی خەدیج پێی وا بووە پێغەمبەر ﷺ ئەوەی قەدەغە كردوە.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٨٦ و ٢٣٤٣ و ٢٣٤٤، ومسلم: ١٠٩ و ١٥٤٧/١١٠، وإبن ماجه: ٢٤٥٣.




**٣٩١٢-** «عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا كَانَ يُكْرِي الْمَزَارِعَ، فَحُدِّثَ أَنَّ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ، يَأْثُرُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ نَهَى عَنْ ذَلِكَ، قَالَ نَافِعٌ فَخَرَجَ إِلَيْهِ عَلَى الْبَلَاطِ وَأَنَا مَعَهُ فَسَأَلَهُ، فَقَالَ: نَعَمْ، نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، عَنْ كِرَاءِ الْمَزَارِعِ»[1].

**واتە: نافع دەگێڕێتەوە، کە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) باخچەکانی دەدا بە کرێ، بۆی باسکرا کە ڕافعی کوڕی خەدیج گێڕاویەتیەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە بە کرێدانی باخچەی قەدەغە کردوە، نافع دەڵێ: عەبدوڵڵا دەرچوو بۆلای لە (الْبَلَاطِ) (کە شوێنێکە نزیک مەدینە خەڵکی نوێژیان تێدا دەکرد) منیش لەگەڵیدا بووم، پرسیاری لێکرد ئەویش وتی: بەڵێ وایە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە کرێدانی باخچەی قەدەغە کردوە.**

**٣٩١٣-** «عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ رَجُلاً أَخْبَرَ ابْنَ عُمَرَ أَنَّ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ ﷺ، يَأْثُرُ فِي كِرَاءِ الْأَرْضِ حَدِيثاً، فَانْطَلَقْتُ مَعَهُ أَنَا وَالرَّجُلُ الَّذِي أَخْبَرَهُ، حَتَّى أَتَى رَافِعاً فَأَخْبَرَهُ رَافِعٌ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ كِرَاءِ الْأَرْضِ، فَتَرَكَ عَبْدُ اللَّهِ كِرَاءَ الْأَرْضِ»[2].

**واتە: نافع دەگێڕێتەوە: پیاوێک هەواڵیدا بە ئیبنو عومەر کە ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ، لە بارەی بە کرێدانی زەویەوە فەرموودەیەکی لە لایە، من لەگەڵیدا ڕۆیشتم لەگەڵ ئەو پیاوەی هەواڵی پێدابوو، تا هات بۆ لای ڕافع، ڕافع هەواڵی پێدا پێغەمبەری خوا ﷺ بە کرێدانی زەوی قەدەغە کردوە، دوای ئەوە عەبدوڵڵا وازی هێنا لە بە کرێدانی زەوی.**

**٣٩١٤-** «عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ حَدَّثَ، عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، نَهَى عَنْ كِرَاءِ الْمَزَارِعِ»[3].

**واتە: نافع دەگێڕێتەوە: ڕافعی کوڕی خەدیج بۆ عەبدوڵڵای کوڕی عومەری ﷺ، باس کرد پێغەمبەری خوا ﷺ بە کرێدانی باخچەی قەدەغە کردوە.**

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح الإسناد.





**٣٩١٥-** «عَنْ نَافِعٍ قَالَ: كَانَ ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يُكْرِي أَرْضَهُ بِبَعْضِ مَا يَخْرُجُ مِنْهَا، فَبَلَغَهُ أَنَّ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ يَزْجُرُ عَنْ ذَلِكَ وَقَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ ذَلِكَ، قَالَ: كُنَّا نُكْرِي الْأَرْضَ قَبْلَ أَنْ نَعْرِفَ رَافِعاً، ثُمَّ وَجَدَ فِي نَفْسِهِ فَوَضَعَ يَدَهُ عَلَى مَنْكِبِي حَتَّى دُفِعْنَا إِلَى رَافِعٍ، فَقَالَ لَهُ عَبْدُ اللَّهِ: أَسَمِعْتَ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنْ كِرَاءِ الْأَرْضِ؟ فَقَالَ رَافِعٌ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: لَا تُكْرُوا الْأَرْضَ بِشَيْءٍ»[١].

**واتە: نافع دەڵێ: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) زەویەکەی دەدا بە کرێ بە هەندێ لە بەروبوومەکەی، هەواڵی پێگەیشت ڕافیعی کوڕی خەدیج سەرزەنشتی ئەو کارە دەکات، وە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی قەدەغە کردوە، وتی: ئێمە زەویمان دەدا بە کرێ پێش ئەوەی ڕافیع بناسین، پاشان شتێ لە دەرونیدا دروست بوو دەستی خستە سەر شانم تا هاتین بۆ لای ڕافع، عەبدوڵلا پێی وت: ئایا بیستوتە پێغەمبەر ﷺ ڕێگری بکات لە بەکرێدانی زەوی؟ ڕافع وتی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: زەوی بە کرێ مەدەن بە هیچ شتێک.**

**٣٩١٦-** «عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ كِرَاءِ الْأَرْضِ»[٢].

**واتە: ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە بە کرێدانی زەوی.**

**٣٩١٧-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: كُنَّا نُخَابِرُ وَلَا نَرَى بِذَلِكَ بَأْساً، حَتَّى زَعَمَ رَافِعُ بْنُ خَدِيجٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الْمُخَابَرَةِ»[٣].

**واتە: عەمری کوڕی دینار دەڵێ: گوێم لە ئیبنو عومەر بوو (خوا لێیان ڕازی بێ) دەیوت: ئێمە (الْمُخَابَرَة)مان دەکرد هیچمان لەوەدا نەدەبینی، تا ڕافعی کوڕی خەدیج پێی وابوو، پێغەمبەری خوا ﷺ (الْمُخَابَرَة)ی قەدەغە کردوە.**

**٣٩١٨-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ يَقُولُ: أَشْهَدُ لَسَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا وَهُوَ يَسْأَلُ عَنِ الْخِبْرِ فَيَقُولُ: مَا كُنَّا نَرَى بِذَلِكَ بَأْساً حَتَّى أَخْبَرَنَا عَامَ الْأَوَّلِ ابْنُ خَدِيجٍ أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنِ الْخِبْرِ»[٤].

---

(١) شاذ.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٠٦ و ١٥٤٧/١٠٧، وأبو داود: ٣٣٨٩، وإبن ماجه: ٢٤٥٠.

(٤) صحيح.




**واتە: عەمری کوڕی دینار دەڵێ: شایەتی دەدەم من گوێم لە ئیبنو عومەر بوو (خوا لێیان ڕازی بێ) پرسیاری دەکرد لە بارەی (الْمُخَابَرَةِ)ـەوە، دەیوت: ئێمە ئەوەمان بە تاوان نەدەزانی تا لە ساڵی یەکەمدا ئیبنو خەدیج هەواڵی پێداین، کە ئەو بیستوویەتی پێغەمبەر ﷺ (الْمُخَابَرَة)ـەی قەدەغە کردوە.**

**٣٩١٩-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: كُنَّا لَا نَرَى بِالْخِبْرِ بَأْساً حَتَّى كَانَ عَامَ الْأَوَّلِ فَزَعَمَ رَافِعٌ، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْهُ»[١].

**واتە: عەمری کوڕی دینار دەڵێ: گوێم لە ئیبنو عومەر بوو (خوا لێیان ڕازی بێ) دەیوت: ئێمە (الْمُخَابَرَة)مان بە تاوان نەدەزانی تا ساڵی یەکەم، ڕافع پێی وابوو پێغەمبەری خوا ﷺ (الْمُخَابَرَة)ـەی قەدەغە کردوە.**

**٣٩١٩-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ كِرَاءِ الْأَرْضِ»[٢].

**واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کرد لە بەکرێدانی زەوی.**

**٣٩٢٠-** «عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه قَالَ: نَهَانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْمُخَابَرَةِ، وَالْمُحَاقَلَةِ، وَالْمُزَابَنَةِ»[٣].

**واتە: جابر رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە (الْمُخَابَرَة)، وە لە (وَالْمُحَاقَلَة) وە لە (وَالْمُزَابَنَة).**

**٣٩٢١-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَجَابِرٍ رضي الله عنهم، نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ بَيْعِ الثَّمَرِ حَتَّى يَبْدُوَ، صَلَاحُهُ، وَنَهَى عَنِ الْمُخَابَرَةِ: كِرَاءِ الْأَرْضِ بِالثُّلُثِ وَالرُّبُعِ»[٤].

**واتە: ئیبنو عومەرو جابر رضي الله عنهم دەگێڕنەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە فرۆشتنی بەرووبووم تا پێدەگات (لە خەم دەڕدەچێت)، وە قەدەغەی کردوە لە (الْمُخَابَرَة): بە کرێدانی زەوی بە سێیەک و چواریەک.**

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح لغيره.

(٤) صحيح لغيره.




**٣٩٢٢-** «عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ لِرَافِعٍ: أَتُؤَاجِرُونَ مَحَاقِلَكُمْ؟ قُلْتُ: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ، نُؤَاجِرُهَا عَلَى الرُّبُعِ، وَعَلَى الْأَوْسَاقِ مِنَ الشَّعِيرِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تَفْعَلُوا، ازْرَعُوهَا أَوْ أَعِيرُوهَا، أَوِ امْسِكُوهَا»[١].

**واتە: ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ بە ڕافعی فەرمووی: ئایا کێڵگەکانتان دەدەن بە کرێ؟ وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بە چواریەک دەیدەین، وە بە چەند بارێک لە گەنم، فەرمووی: کاری وا مەکەن، خۆتان بیچێنن یان بیدەنە خەڵکی با بیچێنن، یان بیهێڵنەوە.**

**٣٩٢٣-** «عَنْ رَافِعٍ ﷺ قَالَ: أَتَانَا ظُهَيْرُ بْنُ رَافِعٍ فَقَالَ: نَهَانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، عَنْ أَمْرٍ كَانَ لَنَا رَافِقاً، قُلْتُ: وَمَا ذَاكَ؟ قَالَ: أَمْرُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَهُوَ حَقٌّ، سَأَلَنِي، كَيْفَ تَصْنَعُونَ فِي مَحَاقِلِكُمْ؟ قُلْتُ: نُؤَاجِرُهَا عَلَى الرُّبُعِ، وَالْأَوْسَاقِ مِنَ التَّمْرِ، أَوِ الشَّعِيرِ، قَالَ: فَلَا تَفْعَلُوا، ازْرَعُوهَا، أَوْ أَزْرِعُوهَا، أَوِ امْسِكُوهَا»[٢].

**واتە: ڕافع ﷺ دەڵێ: ظوهەیری کوڕی ڕافع هات بۆ لامان وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری لێکردین لە کارێک بە سوود بوو بۆمان، وتم: ئەو کارە چیە؟ وتی: فەرمانی پێغەمبەرە ﷺو حەقیشە، پرسیاری لێکردم، چۆن مامەڵە بە کێڵگەکانتانەوە دەکەن؟ وتم: دەیدەین بە چواریەک و وە بە چەند بارێک لە خورما یان جۆ، فەرمووی: کاری وا مەکەن، بیچێنن، یان بیدەن بە کەسێکی تر با بیچێنێ، یان بیگرنەوە.**

**٣٩٢٤-** «عَنْ أُسَيْدِ بْنِ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ، أَنَّ أَخَا رَافِعٍ قَالَ لِقَوْمِهِ: قَدْ نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْيَوْمَ عَنْ شَيْءٍ كَانَ لَكُمْ رَافِقاً، وَأَمْرُهُ طَاعَةٌ وَخَيْرٌ نَهَى عَنِ الْحَقْلِ»[٣].

**واتە: ئوسەیدی کوڕی ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ دەگێڕێتەوە: براکەی ڕافع بە قەومەکەی وتووە: ئەمڕۆ پێغەمبەری خوا ﷺ شتێکی قەدەغە کرد بۆ ئێوە بە سوود بوو، فەرمانی ئەویش گوێڕایەڵیەو خێری تیدایە، ڕێگری کرد لە بە کرێدانی کیڵگە.**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥٤٨/١١٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٣٩، ومسلم: ١٥٤٨/١١٤، وإبن ماجه: ٢٤٥٩.

(٣) صحيح الإسناد.





**٣٩٢٥-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ هُرْمُزَ قَالَ: سَمِعْتُ أُسَيْدَ بْنَ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ الْأَنْصَارِيَّ ﷺ، يَذْكُرُ أَنَّهُمْ مَنَعُوا الْمُحَاقَلَةَ، وَهِيَ أَرْضٌ تُزْرَعُ عَلَى بَعْضِ مَا فِيهَا»[1].

**واتە: عەبدوڕڕەحمانی كوڕی هورموز دەڵێ: گوێم لە ئوسەیدی كوڕی ڕافعی كوڕی خەدیجی ئەنصاڕی ﷺ بوو باسی ئەوەی دەكرد كە ئەوان (الْمُحَاقَلَة)یان قەدەغە كرد، كە بریتیە لە زەویەک بكرێت بە كشتوكاڵ لە بەرانبەر بەشێک لە بەروبوومەكەی.**

**٣٩٢٦-** «عَنْ عِيسَى بْنِ سَهْلِ بْنِ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ قَالَ: إِنِّي لَيَتِيمٌ فِي حَجْرِ جَدِّي رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ، وَبَلَغْتُ رَجُلاً، وَحَجَجْتُ مَعَهُ، فَجَاءَ أَخِي عِمْرَانُ بْنُ سَهْلِ بْنِ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ فَقَالَ: يَا أَبَتَاهُ، إِنَّهُ قَدْ أَكْرَيْنَا أَرْضَنَا فُلَانَةَ بِمِائَتَيْ دِرْهَمٍ، فَقَالَ: يَا بُنَيَّ، دَعْ ذَاكَ، فَإِنَّ اللَّهَ ﷻ سَيَجْعَلُ لَكُمْ رِزْقاً غَيْرَهُ، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَدْ نَهَى عَنْ كِرَاءِ الْأَرْضِ»[2].

**واتە: عیسای كوڕی سەهلی كوڕی ڕافعی كوڕی خەدیج دەڵێ: من هەتیو بووم لای باپیرەم ڕافعی كوڕی خەدیج ﷺ، گەیشتم بە پیاوێک لەگەڵیدا حەجم كرد، براكەم هات عیمرانی كوڕی سەهلی كوڕی ڕافعی كوڕی خەدیج وتی: ئەی باوكە، زەویەكەمان لە فلانە شوێن دا بە سەد درهەم ئەویش وتی: ئەی كوڕەكەم، واز لەوە بێنە، بێگومان خوا ﷻ جگە لەوە ڕزق و ڕۆزیتان بۆ دابین دەكات، پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی كردوە زەوی بدرێ بە كرێ.**

**٣٩٢٧-** «عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ قَالَ: يَغْفِرُ اللَّهُ لِرَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ أَنَا وَاللَّهِ أَعْلَمُ بِالْحَدِيثِ مِنْهُ، إِنَّمَا كَانَا رَجُلَيْنِ اقْتَتَلَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنْ كَانَ هَذَا شَأْنُكُمْ فَلَا تُكْرُوا الْمَزَارِعَ، فَسَمِعَ قَوْلَهُ: لَا تُكْرُوا الْمَزَارِعَ، قال أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: كِتَابَةُ مُزَارَعَةٍ عَلَى أَنَّ الْبَذْرَ وَالنَّفَقَةَ عَلَى صَاحِبِ الْأَرْضِ، وَلِلْمُزَارِعِ رُبُعُ مَا يُخْرِجُ اللَّهُ ﷻ مِنْهَا، هَذَا كِتَابٌ كَتَبَهُ فُلَانُ بْنُ فُلَانِ بْنِ فُلَانٍ فِي صِحَّةٍ مِنْهُ وَجَوَازِ، أَمْرٍ لِفُلَانِ بْنِ فُلَانٍ، إِنَّكَ دَفَعْتَ إِلَيَّ جَمِيعَ أَرْضِكَ الَّتِي بِمَوْضِعِ كَذَا فِي مَدِينَةِ كَذَا، مُزَارَعَةً، وَهِيَ الْأَرْضُ الَّتِي تُعْرَفُ بِكَذَا، وَتَجْمَعُهَا حُدُودٌ أَرْبَعَةٌ يُحِيطُ بِهَا كُلِّهَا وَأَحَدُ تِلْكَ الْحُدُودِ بِأَسْرِهِ لَزِيقُ كَذَا، وَالثَّانِي، وَالثَّالِثُ، وَالرَّابِعُ، دَفَعْتَ إِلَيَّ جَمِيعَ أَرْضِكَ هَذِهِ الْمَحْدُودَةِ فِي هَذَا الْكِتَابِ بِحُدُودِهَا الْمُحِيطَةِ بِهَا، وَجَمِيعِ حُقُوقِهَا وَشِرْبِهَا، وَأَنْهَارِهَا، وَسَوَاقِيهَا أَرْضاً بَيْضَاءَ، فَارِغَةً

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) شاذ. أخرجه أبو داود: ٤٥٤٥٦.




لَا شَيْءَ فِيهَا مِنْ غَرْسٍ، وَلَا زَرْعٍ، سَنَةً تَامَّةً، أَوَّلُهَا مُسْتَهَلَّ شَهْرِ كَذَا، مِنْ سَنَةِ كَذَا، وَآخِرُهَا انْسِلَاخُ شَهْرِ كَذَا، مِنْ سَنَةِ كَذَا، عَلَى أَنْ أَزْرَعَ جَمِيعَ هَذِهِ الْأَرْضِ الْمَحْدُودَةِ فِي هَذَا الْكِتَابِ الْمَوْصُوفُ مَوْضِعُهَا فِيهِ هَذِهِ السَّنَةَ الْمُؤَقَّتَةَ فِيهَا مِنْ أَوَّلِهَا إِلَى آخِرِهَا كُلَّ مَا أَرَدْتُ وَبَدَا لِي أَنْ أَزْرَعَ فِيهَا مِنْ حِنْطَةٍ، وَشَعِيرٍ، وَسَمَاسِمَ وَأُرْزٍ، وَأَقْطَانٍ، وَرِطَابٍ، وَبَاقِلًّا، وَحِمَّصٍ، وَلُوبْيَا، وَعَدَسٍ، وَمَقَاثِي، وَمَبَاطِيخَ، وَجَزَرٍ، وَشَلْجَمٍ، وَفُجْلٍ وَبَصَلٍ، وَثُومٍ، وَبُقُولٍ، وَرَيَاحِينَ، وَغَيْرِ ذَلِكَ مِنْ جَمِيعِ الْغَلَّاتِ شِتَاءً وَصَيْفاً بِبُزُورِكَ، وَبَذْرِكَ، وَجَمِيعُهُ عَلَيْكَ دُونِي عَلَى أَنْ أَتَوَلَّى ذَلِكَ بِيَدِي، وَبِمَنْ أَرَدْتُ مِنْ أَعْوَانِي، وَأُجَرَائِي، وَبَقَرِي، وَأَدَوَاتِي، وَإِلَى زِرَاعَةِ ذَلِكَ، وَعِمَارَتِهِ، وَالْعَمَلِ بِمَا فِيهِ نَمَاؤُهُ، وَمَصْلَحَتُهُ، وَكِرَابُ أَرْضِهِ، وَتَنْقِيَةُ حَشِيشِهَا، وَسَقْيِ مَا يُحْتَاجُ إِلَى سَقْيِهِ مِمَّا زُرِعَ، وَتَسْمِيدِ مَا يُحْتَاجُ إِلَى تَسْمِيدِهِ، وَحَفْرِ سَوَاقِيهِ، وَأَنْهَارِهِ وَاجْتِنَاءِ، مَا يُجْتَنَى مِنْهُ، وَالْقِيَامِ بِحَصَادِ مَا يُحْصَدُ مِنْهُ، وَجَمْعِهِ وَدِيَاسَةِ، مَا يُدَاسُ مِنْهُ، وَتَذْرِيَتِهِ بِنَفَقَتِكَ عَلَى ذَلِكَ كُلِّهِ دُونِي، وَأَعْمَلَ فِيهِ كُلِّهِ بِيَدِي، وَأَعْوَانِي دُونَكَ عَلَى أَنَّ لَكَ مِنْ جَمِيعِ مَا يُخْرِجُ اللَّهُ ﷻ مِنْ ذَلِكَ كُلِّهِ، فِي هَذِهِ الْمُدَّةِ الْمَوْصُوفَةِ فِي هَذَا الْكِتَابِ، مِنْ أَوَّلِهَا إِلَى آخِرِهَا، فَلَكَ ثَلَاثَةُ، أَرْبَاعِهِ بِحَظِّ أَرْضِكَ، وَشِرْبِكَ، وَبَذْرِكَ، وَنَفَقَاتِكَ، وَلِي الرُّبُعُ الْبَاقِي، مِنْ جَمِيعِ ذَلِكَ بِزِرَاعَتِي، وَعَمَلِي وَقِيَامِي، عَلَى ذَلِكَ بِيَدِي، وَأَعْوَانِي، وَدَفَعْتَ إِلَيَّ جَمِيعَ أَرْضِكَ، هَذِهِ الْمَحْدُودَةِ فِي هَذَا الْكِتَابِ بِجَمِيعِ حُقُوقِهَا، وَمَرَافِقِهَا، وَقَبَضْتُ ذَلِكَ كُلَّهُ مِنْكَ يَوْمَ كَذَا مِنْ شَهْرِ كَذَا مِنْ سَنَةِ كَذَا، فَصَارَ جَمِيعُ ذَلِكَ فِي يَدِي لَكَ، لَا مِلْكَ لِي فِي شَيْءٍ مِنْهُ، وَلَا دَعْوَى، وَلَا طَلِبَةَ، إِلَّا هَذِهِ الْمُزَارَعَةَ الْمَوْصُوفَةَ فِي هَذَا الْكِتَابِ، فِي هَذِهِ السَّنَةِ الْمُسَمَّاةِ فِيهِ، فَإِذَا انْقَضَتْ فَذَلِكَ كُلُّهُ مَرْدُودٌ إِلَيْكَ، وَإِلَى يَدِكَ، وَلَكَ أَنْ تُخْرِجَنِي بَعْدَ انْقِضَائِهَا مِنْهَا، وَتُخْرِجَهَا مِنْ يَدِي، وَيَدِ كُلِّ مَنْ صَارَتْ لَهُ فِيهَا يَدٌ بِسَبَبِي، أَقَرَّ فُلَانٌ وَفُلَانٌ، وَكُتِبَ هَذَا الْكِتَابُ نُسْخَتَيْنِ»[1].

**واتە: زەیدی كوڕی ثابت ﷺ دەڵێ: خوا لە ڕافعی كوڕی خەدیج خۆش بێت، خوا زاناترە لە ئەوە لەو بارەیەوە، بەڵكو ئەوە سەبارەت بە دوو پیاو بوو لەگەڵ یەكتری شەڕیان كرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر ئەمە حاڵتانە زەوی مەدەن بەكرێ، ئەو ئەوەی بیست كە فەرمووی: زەوی مەدەن بە كرێ، ئەبو عەبدوڕڕەحمان وتی: نووسراوی زەوی دان بە كشتوكاڵ تۆم و خەرجی لەسەر خاوەن زەوی بێت، بۆ ئەو كەسەش كە ئیشی تێدا دەكات چواریەكی پێ بدرێ لەو بەرهەمەی خوا دەریدێنی لە زەویەكە، ئەمە نوسراوێكە فڵانی كوڕی فڵان نوسیویەتی بە**

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٣٩٠، وابن ماجه: ٢٤٦١.




ویستی خۆی، تۆ هەموو زەویەکەتدا بە من کە لە فڵانە شوێنی مەدینەیە بۆ کشتوکاڵ، ئەویش ئەو زەویەیە کە بە فڵانە ناو دەناسرێ، چوار سنوور کۆی دەکاتەوە یەکێک لەو سنورانە جیاکراوەتەوە شتێک جیای دەکاتەوە، دووەم و سێیەم و چوارەمیش، هەموو زەویەکەت دا بە من ئەمەی کە دیاریکراوە لەم نووسراوەدا بەو سنورانەی دەور دراون، وە هەموو مافەکانی و ئاوی خواردنەوەکانی جۆگەو دەریاکانی زەویەکە سپی و بەتاڵن هیچ شتێکیان تێدا ناچێنرێ بۆ ماوەی یەک ساڵ، یەکەمینیان لە فڵانە مانگ و لە فڵانە ساڵ تا کۆتای مانگی ئەوەندە لە ساڵی ئەوەندە، بەو مەرجەی هەموو ئەم زەویانەی دیاریکراوە لەم کتێبەدا بیکەم بە کشتوکاڵ بۆ ماوەی ئەم ساڵەی کە دیاریمان کردوە، هەرچۆن بمەوێ بیچێنم بە ویستی خۆم، گەنم بێت یان جۆ یان کونجی یان برنج یان لۆکە یان پاقلە یان نۆک یان لۆبیا یان نیسک یان خەیار یان گێزەر یان شەلەم یان ترپ یان پیاز یان سیر، وە جگە لەوانەش هەموو ئەوانەی لە زستان و هاویندا دەکرێ بە تۆ و هەمووی لەسەر تۆیە، ئەوە نەبێ من تەنها کاری تێدا دەکەم، وە بەوەی هەیمە لەو کەرستانەی یارمەتیم دەدەن مانگاش هەر لەسەر خۆمە لەگەڵ هەموو کەرەستەکاندا، هەروەها چاندن و تووکردن و کارکردن تیایدا تا دێتە بەرهەم، وە بژار کردنی گژ وگیاکانی و ئاودانی ئەگەر پێویستی کرد، وە کیماوی کردنی و پەینکردنی ئەگەر پێویست بکات، وە پاکردنەوەو حەفرکردنی جۆگە و بنەوانەی ئاوەکە و سەرچاوەکەی خۆم کاری تێدا دەکەم، وە چنینەوە و کۆکردنەوەی و درەوکردنی لەسەر تۆیە، هەموو ئەوانە بە دەستی خۆم دەیکەم، هەموو ئەو بەرهەمانەی کە دێنە بەرهەم لە سەرەتاوە تا کۆتایی سێ لەسەر چواری بۆ تۆیە، بەهۆی زەویەکەتەوە، لەبەر زەوی و ئاوو تۆم و خەرجیەکانت، چواریەکی ئەوەشی ماوەتەوە بۆ منە، لە هەموو ئەوانەی بە دەست و بازوی خۆم چاندومە، تۆش هەموو زەویەکەت پێمداوە بە هەموو ئەو مافانەی تێدایە، هەموو ئەوانەم لێت وەرگرت لە فڵانە مانگ و فڵانە ساڵ، هەموو ئەوانە لە دەستی مندا دەبێ، هیچ شتێ لەوانە نابێتە موڵکی من، تەنها من کشتوکاڵی تێدا دەکەم وەکو چۆن لەم نوسراوەدا ئاماژەی پێکراوە لەم ساڵەدا، ئەگەر ساڵەکە تەواو بوو هەموو ئەوانە دەگەڕێتەوە بۆ موڵکی خۆت، دەتوانی دوای تەواوبوونی گرێبەستەکە من دەربێنی، وە هەموو ئەو کەسانەش بە هۆی منەوە لەو زەویەدا کاریان کردوە، فڵانی کوڕی فڵان دانی پێدا نا، پاشان دوو نوسخەی لێدەر دەکرێ.

## باسی جیاوازی ئەو دەستەواژانەی هاتوون لەبارەی کشتوکاڵەوە

**٣٩٢٨-** «عَنِ ابْنِ عَوْنٍ قَالَ: كَانَ مُحَمَّدٌ يَقُولُ: الْأَرْضُ عِنْدِي مِثْلُ مَالِ الْمُضَارَبَةِ فَمَا صَلُحَ فِي مَالِ الْمُضَارَبَةِ صَلُحَ فِي الْأَرْضِ، وَمَا لَمْ يَصْلُحْ فِي مَالِ الْمُضَارَبَةِ لَمْ يَصْلُحْ فِي الْأَرْضِ، قَالَ: وَكَانَ لَا يَرَى بَأْساً أَنْ يَدْفَعَ أَرْضَهُ إِلَى الْأَكَّارِ عَلَى أَنْ يَعْمَلَ فِيهَا بِنَفْسِهِ وَوَلَدِهِ، وَأَعْوَانِهِ، وَبَقَرِهِ، وَلَا يُنْفِقَ شَيْئاً، وَتَكُونَ النَّفَقَةُ كُلُّهَا مِنْ رَبِّ الْأَرْضِ»[1].

**واتە: ئیبنو عەون دەڵێ: موحەممەد وتویەتی: زەوی لای من وەكو ماڵی (الْمُضَارَبَة)یە، ئەوەی بۆ ماڵی (الْمُضَارَبَة) بشێ ئەوە بۆ زەویش دەشێ، ئەوەشی بۆ ماڵی (الْمُضَارَبَة) نەشێ، بۆ زەویش ناشێ، وتی: بە گرفتی نەدەزانی زەویەكەی بدات بە كرێ كە خۆی و ماڵ و منداڵ و كەسوكاری مانگاكانی تێدا كار بكەن، هیچ خەرج نەكات، هەموو خەرجیەكانیش لەسەر خاوەن زەوی بێت.**

**(الْمُضَارَبَة): بریتیە لەوەی كەسێك پارە دەدات بە كەسێكی تر، ئەویش ئیش بەو پارە دەكات، قەزانجەكەی بۆ هەردوولا دەبێت.**

**٣٩٢٩-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَفَعَ إِلَى يَهُودِ خَيْبَرَ نَخْلَ خَيْبَرَ، وَأَرْضَهَا، عَلَى أَنْ يَعْمَلُوهَا مِنْ أَمْوَالِهِمْ، وَأَنَّ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ شَطْرَ مَا يَخْرُجُ مِنْهَا»[2].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ باخی خورمای خەیبەریدا بە جولەكەی خەیبەر، وە زەویەكەش تا كاری تێدا بكەن بە ماڵ و سامانەكانیان، وە نیوەی بەرهەمەكەیشی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بێت.**

**٣٩٣٠-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَفَعَ إِلَى يَهُودِ خَيْبَرَ نَخْلَ خَيْبَرَ، وَأَرْضَهَا عَلَى أَنْ يَعْمَلُوهَا بِأَمْوَالِهِمْ، وَأَنَّ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ شَطْرَ ثَمَرَتِهَا»[3].

---

**(١) صحيح الإسناد مقطوع.**

**(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٨٥ و ٢٣٢٨ و ٢٣٢٩ و ٢٣٣١ و ٢٣٣٨ و ٢٤٩٩ و ٢٧٢٠ و ٣١٥٢ و ٤٢٤٨، ومسلم: ١ و ١٥٥١/٦، وأبو داود: ٣٠٠٨ و ٣٤٠٨ و ٣٤٠٩، والترمذي: ١٣٨٢، وإبن ماجه: ٢٤٦٧.**

**(٣) صحيح.**




**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ باخی خورمای خەیبەریدا بە جولەکەی خەیبەر، وە زەویەکەش تا کاری تێدا بکەن بە ماڵ و سامانەکانیان، وە نیوەشی بۆ پێغەمبەری خواش ﷺ بێت.**

**٣٩٣١-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: كَانَتِ الْمَزَارِعُ تُكْرَى عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، عَلَى أَنَّ لِرَبِّ الْأَرْضِ، مَا عَلَى رَبِيعِ السَّاقِي مِنَ الزَّرْعِ، وَطَائِفَةً مِنَ التِّبْنِ، لَا أَدْرِي كَمْ هُوَ»[١].

**واتە: عەبدوڵلای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: کشتوکاڵەکان دەدران بە کرێ لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ، لە بەرانبەر ئەوەی بەشێک لەو کشت و کاڵەی لە قەراغ دەریایە بۆ خاوەن زەویەکە بێت لەگەڵ بەشێک لە کاو پووش نەمزانی ئەوە چەند بوو.**

**٣٩٣٢-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْأَسْوَدِ قَالَ: كَانَ عَمَّايَ يَزْرَعَانِ بِالثُّلُثِ وَالرُّبُعِ وَأَبِي شَرِيكَهُمَا وَعَلْقَمَةُ وَالْأَسْوَدُ يَعْلَمَانِ، فَلَا يُغَيِّرَانِ»[٢].

**واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەسوەد دەڵێ: هەردوو مامم زەوی کشتوکاڵیان دەدا بە سێیەک و چواریەک، باوکم هاوبەشیان بوو، عەلقەمەو ئەسوەد دەیانزانی و نەیاندەگۆڕی.**

**٣٩٣٣-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قال: إِنَّ خَيْرَ مَا أَنْتُمْ صَانِعُونَ، أَنْ يُؤَاجِرَ أَحَدُكُمْ أَرْضَهُ بِالذَّهَبِ، وَالْوَرِقِ»[٣].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: بەڕاستی چاکترین شتێک ئەنجامی دەدەن ئەوەیە کەسێک لە ئێوە زەویەکەی بدات بە کرێ بە ئاڵتون و بە زیو.**

**٣٩٣٤-** «عَنْ منصور إِبْرَاهِيمَ، وَسَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، أَنَّهُمَا كَانَا لَا يَرَيَانِ بَأْساً بِاسْتِئْجَارِ الْأَرْضِ الْبَيْضَاءِ»[٤].

**واتە: مەنصور دەگێڕێتەوە: لە ئیبراهیم و سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە، ئەوان پێیان وابوو بە کرێدانی زەوی بێ دارو درەخت هیچ گرفتێکی تێدا نیە.**

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) ضعيف الإسناد.

(٣) صحيح الإسناد موقوف.

(٤) صحيح الإسناد مقطوع.




**٣٩٣٥-** «عَنْ مُحَمَّدٍ قَالَ: لَمْ أَعْلَمْ شُرَيْحاً كَانَ يَقْضِي فِي الْمُضَارِبِ إِلَّا بِقَضَاءَيْنِ كَانَ، رُبَّمَا قَالَ: لِلْمُضَارِبِ بَيِّنَتَكَ عَلَى مُصِيبَةٍ تُعْذَرُ بِهَا، وَرُبَّمَا قَالَ لِصَاحِبِ الْمَالِ: بَيِّنَتَكَ أَنَّ أَمِينَكَ خَائِنٌ، وَإِلَّا فَيَمِينُهُ بِاللَّهِ مَا خَانَكَ»(١).

**واتە: موحەممەد دەڵێ: نەمزانیوە شورەیح دادگایی ئەو کەسەی کردبێت کە ماڵ دەدات بە قازانج بە شەراکەت مەگەر دوو دادگایی نەبێت، بە ئەو کەسەی وت کە ماڵەکەی پێدراوە بە قازانج بە شەراکەت، بەڵگەت هەیە لەسەر ئەو بەڵایەی بەسەر بەروو بوومەکەدا هاتووە کە ببێتە بیانوو بۆت، وە بە خاوەن ماڵیشی وت: بەڵگەت هەیە ئەوەی متمانەت پێکردوە خیانەتی کردبێ، ئەگەرنا سوێند خواردنی بە خوا ئەوە دەگەیەنێ خیانەتی لێ نەکردووی.**

**٣٩٣٦-** «عَنْ سَعِيدِ بن الْمُسَيَّبِ قال: لَا بَأْسَ بِإِجَارَةِ الأرض الْبَيْضَاءِ بِالذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وقال إذا دَفَعَ رَجُلٌ إلى رَجُلٍ مَالاً قِرَاضاً فَأَرَادَ أَنْ يَكْتُبَ عليه بِذَلِكَ كِتَاباً كَتَبَ هذا كِتَابٌ كَتَبَهُ فُلَانُ بن فُلَانٍ طَوْعاً منه في صِحَّةٍ منه وَجَوَازِ أَمْرِهِ لِفُلَانِ بن فُلَانٍ أَنَّكَ دَفَعْتَ إلي مُسْتَهَلَّ شَهْرِ كَذَا من سَنَةِ كَذَا عَشَرَةَ آلَافِ دِرْهَمٍ وُضْحاً جِيَاداً وَزْنَ سَبْعَةٍ قِرَاضاً على تَقْوَى اللَّهِ في السِّرِّ وَالْعَلَانِيَةِ وَأَدَاءِ الْأَمَانَةِ على أَنْ أَشْتَرِيَ بها ما شِئْتُ منها كُلَّ ما أَرَى أَنْ أَشْتَرِيَهُ وَأَنْ أُصَرِّفَهَا وما شِئْتُ منها فِيمَا أَرَى أَنْ أُصَرِّفَهَا فيه من صُنُوفِ التِّجَارَاتِ وَأَخْرُجَ بِمَا شِئْتُ منها حَيْثُ شِئْتُ وَأَبِيعَ ما أَرَى أَنْ أَبِيعَهُ مِمَّا أَشْتَرِيهِ بِنَقْدٍ رأيت أَمْ بِنَسِيئَةٍ وَبِعَيْنٍ رأيت أَمْ بِعَرْضٍ على أَنْ أَعْمَلَ في جَمِيعِ ذلك كُلِّهِ بِرَأْيِي وَأُوَكِّلَ في ذلك من رأيت وَكُلُّ ما رَزَقَ الله في ذلك من فَضْلٍ وَرِبْحٍ بَعْدَ رَأْسِ الْمَالِ الذي دَفَعْتَهُ الْمَذْكُورِ إلي الْمُسَمَّى مَبْلَغُهُ في هذا الْكِتَابِ فَهُوَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ نِصْفَيْنِ لك منه النِّصْفُ بِحَظِّ رَأْسِ مَالِكَ وَلِي فيه النِّصْفُ تَامّاً بِعَمَلِي فيه وما كان فيه من وَضِيعَةٍ فَعَلَى رَأْسِ الْمَالِ فَقَبَضْتُ مِنْكَ هذه الْعَشَرَةَ آلَافِ دِرْهَمٍ الْوُضْحَ الْجِيَادَ مُسْتَهَلَّ شَهْرِ كَذَا في سَنَةِ كَذَا وَصَارَتْ لك في يَدِي قِرَاضاً على الشُّرُوطِ الْمُشْتَرَطَةِ في هذا الْكِتَابِ أَقَرَّ فُلَانٌ وَفُلَانٌ وإذا أَرَادَ أَنْ يُطْلِقَ له أَنْ يَشْتَرِيَ وَيَبِيعَ بِالنَّسِيئَةِ كَتَبَ وقد نَهَيْتَنِي أَنْ أَشْتَرِيَ وَأَبِيعَ بِالنَّسِيئَةِ»(٢).

**واتە: سەعیدی کوڕی موسەیب دەڵێ: بە کرێدانی زەوی بێ دراو درەخت هیچ گرفتێکی تێدا نیە بە زێڕو بە زیو، وە دەڵێ: ئەگەر پیاوێک ماڵێکی دا بە کەسێکی تر**

---

(١) صحيح الإسناد مقطوع.

(٢) ضعيف الإسناد مقطوع.




بە قازانج بە شەراکەت (القِرَاض) ویستی نوسراوێک لە نێوانیاندا بنووسرێ، دەڵێ: ئەم نوسراوە فڵانی کوڕی فڵان نوسیویەتی بە ویستی خۆی لە کاتی لەشساغی بە فڵانی کوڕی فڵان، تۆ دە هەزار درهەمی تەواو بە کێشی حەوت (القِرَاض)تدا بە من لە فڵانە مانگ و فڵانە ساڵدا، لەسەر بنەمای ترسان لە خواو لە نهێنی و ئاشکرادا، وە لەسەر بەجێهێنانی ئەمانەت، بەوەی من بە ویست و ئارەزووی خۆم هەرشتێکم ویست بیکڕم، یان بەکاری بهێنم لە هەموو بوارەکانی بازرگانیدا، وە بە ویستی خۆم لێی دەربهێنم و ئەوەی پێم باشە بیفرۆشم، لەوەی کە کڕیومە بە حازر بێت یان بە قەرز، وە بە خود بێت یان بە خستنەڕوو، هەموو ئەمانە بە بۆچوونی خۆم بێت، هەرکەسیشم پێ باش بوو بیکەم بە وەکیل، هەرچی ئەوەی خوا دەیبەخشێ لە قازانجدا لە نێوانی من و تۆدا دەکرێت بە دوو بەشەوە، بەشێکی بۆ تۆ لەبەر سەرمایەکەو، بەشێکی بۆ من لەبەر بازرگانی پێکردنەکە، هەر زەرەرێکیش هەبوو ئەوە لەسەر سەرمایەکە دەردەکرێ، جا من دە هەزار درهەمم لێت وەرگرت لە مانگی ئەوەندەو لە ساڵی ئەوەندە، لە دەستی مندا دەبێ بە قازانج بە شەراکەت لەسەر ئەو مەرجانەی بە مەرج گیراون لەم نووسراوەدا، فڵانە کەس و فڵانە کەس ڕێککەوتن لەسەر ئەمە، وە ئەگەر ویستی کڕین و فرۆشتنی قەرزی تێدا دەربکات، دەنووسی قەدەغەت لێکردم بە قەرز شت بکڕم و بە قەرز بیفرۆشم.

## شەریکی لە نێوان سێ کەسدا وەکو یەکتر

«هَذَا مَا اشْتَرَكَ عَلَيْهِ فُلَانٌ وَفُلَانٌ، وَفُلَانٌ فِي صِحَّةِ عُقُولِهِمْ، وَجَوَازِ أَمْرِهِمْ، اشْتَرَكُوا شَرِكَةَ عَنَانٍ لَا شَرِكَةَ مُفَاوَضَةٍ بَيْنَهُمْ فِي ثَلَاثِينَ أَلْفَ دِرْهَمٍ وُضْحاً جِياداً، وَزْنَ سَبْعَةٍ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمْ عَشَرَةَ آلَافِ دِرْهَمٍ خَلَطُوهَا جَمِيعاً، فَصَارَتْ هَذِهِ الثَّلَاثِينَ أَلْفَ دِرْهَمٍ فِي أَيْدِيهِمْ مَخْلُوطَةً بِشَرِكَةٍ بَيْنَهُمْ أَثْلَاثاً عَلَى أَنْ يَعْمَلُوا فِيهِ بِتَقْوَى اللَّهِ، وَأَدَاءِ الْأَمَانَةِ، مِنْ كُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمْ إِلَى كُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمْ، وَيَشْتَرُونَ جَمِيعاً بِذَلِكَ، وَبِمَا رَأَوْا مِنْهُ اشْتِرَاءَهُ بِالنَّقْدِ، وَيَشْتَرُونَ بِالنَّسِيئَةِ عَلَيْهِ مَا رَأَوْا أَنْ يَشْتَرُوا مِنْ أَنْوَاعِ التِّجَارَاتِ، وَأَنْ يَشْتَرِيَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمْ عَلَى حِدَتِهِ دُونَ صَاحِبِهِ بِذَلِكَ، وَبِمَا رَأَى مِنْهُ مَا رَأَى اشْتِرَاءَهُ مِنْهُ بِالنَّقْدِ، وَبِمَا رَأَى اشْتِرَاءَهُ عَلَيْهِ بِالنَّسِيئَةِ يَعْمَلُونَ فِي ذَلِكَ كُلِّهِ مُجْتَمِعِينَ بِمَا رَأَوْا، وَيَعْمَلُ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمْ مُنْفَرِداً بِهِ دُونَ صَاحِبِهِ بِمَا رَأَى جَائِزاً لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمْ فِي ذَلِكَ كُلِّهِ عَلَى نَفْسِهِ، وَعَلَى كُلِّ وَاحِدٍ مِنْ صَاحِبَيْهِ فِيمَا اجْتَمَعُوا عَلَيْهِ، وَفِيمَا انْفَرَدُوا




بِهِ مِنْ ذَلِكَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمْ دُونَ الآخَرَيْنِ فَمَا لَزِمَ كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمْ فِي ذَلِكَ مِنْ قَلِيلٍ، وَمِنْ كَثِيرٍ فَهُوَ لَازِمٌ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْ صَاحِبَيْهِ وَهُوَ وَاجِبٌ عَلَيْهِمْ جَمِيعاً وَمَا رَزَقَ اللَّهُ فِي ذَلِكَ مِنْ فَضْلٍ وَرِبْحٍ عَلَى رَأْسِ مَالِهِمُ الْمُسَمَّى مَبْلَغُهُ فِي هَذَا الْكِتَابِ، فَهُوَ بَيْنَهُمْ أَثْلَاثاً، وَمَا كَانَ فِي ذَلِكَ مِنْ وَضِيعَةٍ وَتَبِعَةٍ فَهُوَ عَلَيْهِمْ أَثْلَاثاً عَلَى قَدْرِ رَأْسِ مَالِهِمْ، وَقَدْ كُتِبَ هَذَا الْكِتَابُ ثَلَاثَ نُسَخٍ مُتَسَاوِيَاتٍ بِأَلْفَاظٍ: وَاحِدَةٌ فِي يَدِ كُلِّ وَاحِدٍ مِنْ فُلَانٍ وَفُلَانٍ وَفُلَانٍ، وَاحِدَةٌ وَثِيقَةٌ لَهُ أَقَرَّ فُلَانٌ وَفُلَانٌ وَفُلَانٌ».

**واتە:** ئەمە ئەوەیە کە فڵان و فڵان فڵانکەس تیادا بوون بە شەریک بە ویست و ئارەزووی تەواوی خۆیان، شەریک بوون وەکو یەکتر نەک یەکێکیان بە زیاتر بەشدار بێت لەوی تر، کۆی گشتی سی هەزار درهەمە بە کێشی حەوت، بۆ هەر یەکەیان دە هەزار درهەم بەشدار دەبێ، تێکەڵی دەکەن بە سێیەک بە مەرجێک پێکەوە کاری تێدا بکەن بە تەقوای خوا و بەجێهێنانی ئەسپاردە، لە هەرکەسەیان بەو پارانە دەکڕن، وە بەوەی دەیبینن بە نەختینە دەیکڕن، وە بە قەرزیش دەیکڕن بۆ ماوە، لەوەی کە دەیبینن، لە جۆرەها بازرگانی، وە دەکرێ هەریەکیان بە جیا بیکڕێ، جا بە نەختینە بێت، یان بە بۆ ماوە، بەو جۆرەی خۆی دەیبینێ، هەموویان لەو بوارەدا پێکەوە کار دەکەن بەوەی دەیبینن، هەروەها هەر یەکیان بە تەنها بەبێ هاوەڵەکەی کار دەکات بەوەی پێی وایە دروستە، لە قازانج و زەرەردا هەردوو هاوەڵەکەی بەشدارن، ئەگەر چەندە کەمیش بێت، هەروەها با زۆریش بێت، هەر قازانجێک هەبوو هەرسێکەیان سەرمایەکە جیادەکەنەوەو قازانجەکە دەکەن بە سێ پشکەوە هەریەکەو پشکێک بۆ خۆی دەبات لەو ڕزق ڕۆزیەی خوا پێی بەخشیون، وە ئەگەر زەرەیش ڕوویدا ئەوە لە نێوانیاندا دەکرێت بە سێ بەشەوە بە ئەندازەی سەرمایەکەیان، ئەم نووسراوە سێ لەبەر گیراوەی لەبەر دەگیرێ لای هەرسێکەیان دادەنرێ، فڵانە کەس و فڵانە کەس و فڵانە کەس، هەمووشیان دەبێ ڕازی بووبن بەو نوسراوە.




## ئەو شەریکیەی کە لە نێوان چوار کەسدایە هەموویان لە پارەو لە مامەڵەکردندا تیایدا بەشدارن وەکو یەکتر لەسەر بۆچوونی ئەوانەی بە دروستی دەزانن

«قَالَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَوۡفُواْ بِٱلۡعُقُودِ ۝١﴾ المائدة، هَذَا مَا اشْتَرَكَ عَلَيْهِ فُلَانٌ وَفُلَانٌ وَفُلَانٌ وَفُلَانٌ بَيْنَهُمْ شَرِكَةَ مُفَاوَضَةٍ فِي رَأْسِ مَالٍ جَمَعُوهُ بَيْنَهُمْ مِنْ صِنْفٍ وَاحِدٍ وَنَقْدٍ وَاحِدٍ، وَخَلَطُوهُ وَصَارَ فِي أَيْدِيهِمْ مُمْتَزِجاً لَا يُعْرَفُ بَعْضُهُ مِنْ بَعْضٍ، وَمَالُ كُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمْ فِي ذَلِكَ وَحَقُّهُ سَوَاءٌ، عَلَى أَنْ يَعْمَلُوا فِي ذَلِكَ كُلِّهِ وَفِي كُلِّ قَلِيلٍ وَكَثِيرٍ، سَوَاءً مِنَ الْمُبَايَعَاتِ وَالْمُتَاجَرَاتِ نَقْداً وَنَسِيئَةً بَيْعاً وَشِرَاءً فِي جَمِيعِ الْمُعَامَلَاتِ وَفِي كُلِّ مَا يَتَعَاطَاهُ النَّاسُ بَيْنَهُمْ مُجْتَمِعِينَ بِمَا رَأَوْا، وَيَعْمَلَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمْ عَلَى انْفِرَادِهِ بِكُلِّ مَا رَأَى وَكُلِّ مَا بَدَا لَهُ جَائِزٌ أَمْرُهُ فِي ذَلِكَ عَلَى كُلِّ وَاحِدٍ مِنْ أَصْحَابِهِ، وَعَلَى أَنَّهُ كُلُّ مَا لَزِمَ كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمْ عَلَى هَذِهِ الشَّرِكَةِ الْمَوْصُوفَةِ فِي هَذَا الْكِتَابِ مِنْ حَقٍّ وَمِنْ دَيْنٍ، فَهُوَ لَازِمٌ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمْ مِنْ أَصْحَابِهِ الْمُسَمَّيْنَ مَعَهُ فِي هَذَا الْكِتَابِ، وَعَلَى أَنَّ جَمِيعَ مَا رَزَقَهُمُ اللَّهُ فِي هَذِهِ الشَّرِكَةِ الْمُسَمَّاةِ فِيهِ، وَمَا رَزَقَ اللَّهُ كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمْ فِيهَا عَلَى حِدَتِهِ مِنْ فَضْلٍ وَرِبْحٍ، فَهُوَ بَيْنَهُمْ جَمِيعاً بِالسَّوِيَّةِ، وَمَا كَانَ فِيهَا مِنْ نَقِيصَةٍ فَهُوَ عَلَيْهِمْ جَمِيعاً بِالسَّوِيَّةِ بَيْنَهُمْ، وَقَدْ جَعَلَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْ فُلَانٍ وَفُلَانٍ وَفُلَانٍ وَفُلَانٍ كُلَّ وَاحِدٍ مِنْ أَصْحَابِهِ الْمُسَمَّيْنَ فِي هَذَا الْكِتَابِ مَعَهُ وَكِيلَهُ فِي الْمُطَالَبَةِ بِكُلِّ حَقٍّ هُوَ لَهُ وَالْمُخَاصَمَةِ فِيهِ وَقَبْضِهِ، وَفِي خُصُومَةِ كُلِّ مَنِ اعْتَرَضَهُ بِخُصُومَةٍ وَكُلِّ مَنْ يُطَالِبُهُ بِحَقٍّ وَجَعَلَهُ وَصِيَّهُ فِي شَرِكَتِهِ مِنْ بَعْدِ وَفَاتِهِ وَفِي قَضَاءِ دُيُونِهِ وَإِنْفَاذِ وَصَايَاهُ، وَقَبِلَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمْ مِنْ كُلِّ وَاحِدٍ مِنْ أَصْحَابِهِ مَا جَعَلَ إِلَيْهِ مِنْ ذَلِكَ كُلِّهِ، أَقَرَّ فُلَانٌ وَفُلَانٌ وَفُلَانٌ وَفُلَانٌ».

**واته: خوا (تَبَارَكَ وَتَعَالَى) فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَوۡفُواْ بِٱلۡعُقُودِ ۝١﴾، (واتە: ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە بەوەفا بن بەرانبەر گرێبەستەکانتان). ئەمە ئەو گرێبەستەیە کە فڵان و فڵان و فڵان و فڵان لە نێوان یەکتردا بڕیاری شەریکیان داوە کە لە پارەو مامەڵە کردندا وەکو یەک یەکسان بن، بە یەک جۆر پارە لە نێوانیاندا، وە تێکەڵی بکەن بە جۆرێ هیچ کام لە سامانەکان نەناسرێنەوە، ماڵ و سامان و مافی هەریەکەیان لەوەدا یەکسانە، بە جۆرێ هەموویان لەو پارەدا کار بکەن بە کەم و بە زۆر، جا یەکسانە بە کڕین و فرۆشتن بێ یان بازرگانی، بە حازر بێ یان بە قەرز لە هەموو مامەڵەکاندا، وە لە هەموو ئەوانەی لە خەڵکی وەریدەگرن و دەیدەن بە**

خەڵکی یەکدەنگن، وە دروستە هەریەکەیان بە تەنها کار بکات بەوەی کە دەیزانێ چاکە، وە هەموو ئەوەی بە لایەوە دروستە بۆ هاوەڵەکانی، ئەوەی لەم نوسراوەدا ئاماژەی پێکراوە لە ماف و لە قەرز ئەوە لە سەر هەموویانە، وە ئەوەیش خوا پێی بەخشیون بە قازانج کردن پێکەوە، وە ئەوەیش خوا بەخشیویەتی بە هەریەکە لەوان بە قازانج کردن، ئەوە بە یەکسانی لە نێوانیاندا دابەش دەکرێ، وە ئەوەیشی زەرەرو زیانە بە هەمان شێوە لە نێوانیاندا دابەش دەکرێ، هەریەک لە فڵان و فڵان و فڵان و فڵان بۆ هەریەکەیان بریکاری تایبەت بە خۆی هەیە لە داواکردنی مافەکەی و وەرگرتنی، وە لە هەموو ناکۆکی و ناڕەزایەتیەکدا، وە هەر یەکێک داوای مافی خۆی بکات و کەسێک بکاتە جێگرەوە لە شەریکیداو لە دوای مردنی، وە لە دانەوەی قەرزەکانی و جێبەجێ کردنی وەسیەتەکانی، هەر یەک لەو شەریکانە ئەو مافەیان هەیە، فڵان و فڵان و فڵان فڵان دانیان نا بە مەداو لەسەری ڕێککەوتن.

## بابەت: شەریکایەتی بە ڕەنج و جەستە

**٣٩٣٧-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: اشْتَرَكْتُ أَنَا وَعَمَّارٌ وَسَعْدٌ يَوْمَ بَدْرٍ فَجَاءَ سَعْدٌ بِأَسِيرَيْنِ، وَلَمْ أَجِئْ أَنَا وَلَا عَمَّارٌ بِشَيْءٍ»(١).

**واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: من و عەمارو سەعد لە ڕۆژی بەدر شەریک بووین، سەعد دوو دیلی هێنا، من و عەمار هیچمان نەهێنا.**

**٣٩٣٨-** «عَنْ يُونُس عَنِ الزُّهْرِيِّ، فِي عَبْدَيْنِ مُتَفَاوِضَيْنِ كَاتَبَ أَحَدُهُمَا قَالَ: جَائِزٌ إِذَا كَانَا مُتَفَاوِضَيْنِ يَقْضِي أَحَدُهُمَا عَنِ الْآخَرِ»(٢).

**واتە: یونس دەگێڕێتەوە، لە زوهریەوە، لەبارەی دوو کۆیلەوە ڕێککەوتوون (لەسەر هاوکاری یەکتر)، یەکێکیان نوسراوی ئازادبوونی کردوە بۆ ڕزگاربوونی، وتی: ئەگەر هەردووکیان ڕێک بکەون لەسەر ئەوەی یەکێکیان یارمەتی ئەوی تر بدات دروستە.**

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٣٨٨، وإبن ماجه: ٢٢٨٨.

(٢) صحيح الإسناد مقطوع.

## جیابوونەوەی شەریكەكان لە شەریكایەتیان

«هَذَا كِتَابٌ كَتَبَهُ فُلَانٌ وَفُلَانٌ وَفُلَانٌ وَفُلَانٌ بَيْنَهُمْ، وَأَقَرَّ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمْ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْ أَصْحَابِهِ الْمُسَمَّيْنَ مَعَهُ فِي هَذَا الْكِتَابِ، بِجَمِيعِ مَا فِيهِ فِي صِحَّةٍ مِنْهُ وَجَوَازِ أَمْرٍ، أَنَّهُ جَرَتْ بَيْنَنَا مُعَامَلَاتٌ وَمُتَاجَرَاتٌ وَأَشْرِيَةٌ وَبُيُوعٌ وَخُلْطَةٌ وَشَرِكَةٌ فِي أَمْوَالٍ وَفِي أَنْوَاعٍ مِنَ الْمُعَامَلَاتِ، وَقُرُوضٌ وَمُصَارَفَاتٌ وَوَدَائِعُ وَأَمَانَاتٌ وَسَفَاتِجُ وَمُضَارَبَاتٌ وَعَوَارِي وَدُيُونٌ وَمُؤَاجَرَاتٌ وَمُزَارَعَاتٌ وَمُؤَاكَرَاتٌ، وَإِنَّا تَنَاقَضْنَا عَلَى التَّرَاضِي مِنَّا جَمِيعاً بِمَا فَعَلْنَا، جَمِيعَ مَا كَانَ بَيْنَنَا مِنْ كُلِّ شَرِكَةٍ وَمِنْ كُلِّ مُخَالَطَةٍ كَانَتْ جَرَتْ بَيْنَنَا فِي نَوْعٍ مِنَ الْأَمْوَالِ وَالْمُعَامَلَاتِ، وَفَسَخْنَا ذَلِكَ كُلَّهُ فِي جَمِيعِ مَا جَرَى بَيْنَنَا فِي جَمِيعِ الْأَنْوَاعِ وَالْأَصْنَافِ، وَبَيَّنَّا ذَلِكَ كُلَّهُ نَوْعاً نَوْعاً، وَعَلِمْنَا مَبْلَغَهُ وَمُنْتَهَاهُ، وَعَرَفْنَاهُ عَلَى حَقِّهِ وَصِدْقِهِ، فَاسْتَوْفَى كُلُّ وَاحِدٍ مِنَّا جَمِيعَ حَقِّهِ مِنْ ذَلِكَ أَجْمَعَ وَصَارَ فِي يَدِهِ، فَلَمْ يَبْقَ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنَّا قِبَلَ كُلِّ وَاحِدٍ مِنْ أَصْحَابِهِ الْمُسَمَّيْنَ مَعَهُ فِي هَذَا الْكِتَابِ، وَلَا قِبَلَ أَحَدٍ بِسَبَبِهِ، وَلَا بِاسْمِهِ حَقٌّ وَلَا دَعْوَى وَلَا طَلِبَةٌ، لِأَنَّ كُلَّ وَاحِدٍ مِنَّا قَدِ اسْتَوْفَى جَمِيعَ حَقِّهِ وَجَمِيعَ مَا كَانَ لَهُ مِنْ جَمِيعِ ذَلِكَ كُلِّهِ، وَصَارَ فِي يَدِهِ مُوَفَّراً أَقَرَّ فُلَانٌ وَفُلَانٌ وَفُلَانٌ وَفُلَانٌ».

**واتە: ئەمە نوسراوێكە كە فڵان و فڵان و فڵان و فڵانكەس نووسیویانە لە نێوان خۆیاندا، هەریەكەیان لەم نووسراوەدا دانیان پێداناوە بەوەی تیایدایە بەڕاستی و دروستی ویستی خۆی، كە بێگومان لە نێوانیاندا مامەڵە و بازرگانی و كڕین و فرۆشتن و تێكەڵبوونی ماڵ و سامان ڕویداوە لە جۆرەها مامەڵەو قازانج بە شەراكەت و خەرجی و خستنە لاو ئەسپاردەو نوسراوی خاوەن ماڵ و عاریەو قەرزو بە كرێدان و كشتوكاڵەكان، ئێمە ڕەزامەندیمان هەڵوەشاندەوە بە هەموو ئەوانەی كردمان، وە لە هەموو ئەوانەی لە نێوانیاندا بوو لە شەریكی و تێكەڵبوونی سەروەت و سامان، لە هەر جۆرێک لە ماڵ و مامەڵەكان، هەموو ئەوانەمان لە نێوان خۆماندا هەڵوەشاندەوە بە هەموو جۆرەكانیانەوە، سەرەتا و كۆتاییان دەزانین بە شێوەیەكی ڕاست و دروست، هەریەكەیان تەواوی مافی خۆی وەرگرتووە لەوەداو لە دەستیدایە، هەریەكەمان نوسخەیەک لەم كتێبەمان لە لایە، هیچ كەسێكیشمان مافی ئەوەی نیە پەشیمان ببێتەوەو داوا بكات، چونكە هەریەكەمان هەموو مافەكانی خۆی وەرگرتووەو لە دەستیدایە، هەریەكە لە فڵان و فڵان و فڵان دانیان نا بەوەدا.**




## جیابوونەوەی دوو ژن و مێرد لە هاوسەرێتیاندا

«قَالَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: ﴿ وَلَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُوا۟ مِمَّآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ شَيْـًٔا إِلَّآ أَن يَخَافَآ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ ۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا ٱفْتَدَتْ بِهِۦ ﴿٢٢٩﴾ ﴾البقرة، هَذَا كِتَابٌ كَتَبَتْهُ فُلَانَةُ بِنْتُ فُلَانِ بْنِ فُلَانٍ فِي صِحَّةٍ مِنْهَا وَجَوَازِ أَمْرٍ، لِفُلَانِ بْنِ فُلَانِ بْنِ فُلَانٍ، إِنِّي كُنْتُ زَوْجَةً لَكَ وَكُنْتَ دَخَلْتَ بِي فَأَفْضَيْتَ إِلَيَّ ثُمَّ إِنِّي كَرِهْتُ صُحْبَتَكَ وَأَحْبَبْتُ مُفَارَقَتَكَ عَنْ غَيْرِ إِضْرَارٍ مِنْكَ بِي، وَلَا مَنْعِي لِحَقٍّ وَاجِبٍ لِي عَلَيْكَ، وَإِنِّي سَأَلْتُكَ عِنْدَ مَا خِفْنَا أَنْ لَا نُقِيمَ حُدُودَ اللَّهِ، أَنْ تَخْلَعَنِي فَتُبِينَنِي مِنْكَ بِتَطْلِيقَةٍ بِجَمِيعِ مَالِي عَلَيْكَ مِنْ صَدَاقٍ، وَهُوَ كَذَا وَكَذَا دِينَاراً جِيَاداً مَثَاقِيلَ وَبِكَذَا وَكَذَا دِينَاراً جِيَاداً مَثَاقِيلَ أَعْطَيْتُكَهَا عَلَى ذَلِكَ سِوَى مَا فِي صَدَاقِي، فَفَعَلْتَ الَّذِي سَأَلْتُكَ مِنْهُ فَطَلَّقْتَنِي تَطْلِيقَةً بَائِنَةً بِجَمِيعِ مَا كَانَ بَقِيَ لِي عَلَيْكَ مِنْ صَدَاقِي الْمُسَمَّى، مَبْلَغُهُ فِي هَذَا الْكِتَابِ وَبِالدَّنَانِيرِ الْمُسَمَّاةِ فِيهِ سِوَى ذَلِكَ فَقَبِلْتُ ذَلِكَ مِنْكَ مُشَافَهَةً لَكَ عِنْدَ مُخَاطَبَتِكَ إِيَّايَ بِهِ وَمُجَاوَبَةً عَلَى قَوْلِكَ مِنْ قَبْلِ تَصَادُرِنَا عَنْ مَنْطِقِنَا ذَلِكَ، وَدَفَعْتُ إِلَيْكَ جَمِيعَ هَذِهِ الدَّنَانِيرِ الْمُسَمَّى مَبْلَغُهَا فِي هَذَا الْكِتَابِ، الَّذِي خَالَعْتَنِي عَلَيْهَا وَافِيَةً سِوَى مَا فِي صَدَاقِي، فَصِرْتُ بَائِنَةً مِنْكَ مَالِكَةً لِأَمْرِي بِهَذَا الْخُلْعِ الْمَوْصُوفِ أَمْرُهُ فِي هَذَا الْكِتَابِ فَلَا سَبِيلَ لَكَ عَلَيَّ، وَلَا مُطَالَبَةَ وَلَا رَجْعَةَ وَقَدْ قَبَضْتُ مِنْكَ جَمِيعَ مَا يَجِبُ لِمِثْلِي مَا دُمْتُ فِي عِدَّةٍ مِنْكَ وَجَمِيعَ مَا أَحْتَاجُ إِلَيْهِ بِتَمَامِ مَا يَجِبُ لِلْمُطَلَّقَةِ الَّتِي تَكُونُ فِي مِثْلِ حَالِي عَلَى زَوْجِهَا الَّذِي يَكُونُ فِي مِثْلِ حَالِكَ، فَلَمْ يَبْقَ لِوَاحِدٍ مِنَّا قِبَلَ صَاحِبِهِ حَقٌّ، وَلَا دَعْوَى، وَلَا طَلِبَةٌ فَكُلُّ مَا ادَّعَى وَاحِدٌ مِنَّا قِبَلَ صَاحِبِهِ مِنْ حَقٍّ وَمِنْ دَعْوَى وَمِنْ طَلِبَةٍ بِوَجْهٍ مِنَ الْوُجُوهِ فَهُوَ فِي جَمِيعِ دَعْوَاهُ مُبْطِلٌ، وَصَاحِبُهُ مِنْ ذَلِكَ أَجْمَعَ بَرِيءٌ وَقَدْ قَبِلَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنَّا كُلَّ مَا أَقَرَّ لَهُ بِهِ صَاحِبُهُ وَكُلَّ مَا أَبْرَأَهُ مِنْهُ مِمَّا وُصِفَ فِي هَذَا الْكِتَابِ، مُشَافَهَةً عِنْدَ مُخَاطَبَتِهِ إِيَّاهُ قَبْلَ تَصَادُرِنَا عَنْ مَنْطِقِنَا، وَافْتِرَاقِنَا عَنْ مَجْلِسِنَا الَّذِي جَرَى بَيْنَنَا فِيهِ أَقَرَّتْ فُلَانَةُ وَفُلَانٌ».

واتە: خوا (تَبَارَكَ وَتَعَالَى) فەرموویەتی: ﴿ وَلَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُوا۟ مِمَّآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ شَيْـًٔا إِلَّآ أَن يَخَافَآ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ ۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا ٱفْتَدَتْ بِهِۦ ﴿٢٢٩﴾ ﴾ (واتە: دروست نیە بۆ ئێوە کە لێی بسێننەوە هیچ یەک لەو شتانەی کە داوتانێ مەگەر هەردوولا بترسن لەوەی سنوری خوا ڕانەگرن، جا ئەگەر ترسان لەوەی سنوری خوا ڕانەگرن ئەوە پیاوو ئافرەتەکە گوناهیان ناگات بەوە کە ژنەکە لە بریتی خۆی بیدات). ئەمە نوسراوێکە فلان ئافرەت کچی فلانە کەسی کوڕی فلان




لە کاتی لەش ساغی و سەلامەتیدا نوسیویەتی بۆ فلانی کوڕی فلانی مێردی، من خێزانی تۆ بووم وە تۆش هاتیتە لامەوە، پاشان من حەزم نەکرد لەگەڵتدا بژیم و پێم خۆش بوو لێت جیاببمەوە، بەبێ ئەوەی لە لایەن تۆوە زیانم پێ گەیشتبێ، وە بەبێ ئەوەی مافی تۆش پێشێل بکەم، من داوام لێکردی کاتێ کە ترساین لەوەی سنوری خوا ڕانەگری، خولعم بکە و بە ئاشکرا یەک تەڵاقم بدە بە هەموو ماڵەکەم کە لە لاتە لە مارەیی، ئەویش ئەوەندەو ئەوەندە دیناری ئاڵتون دەکات، وە هەروەها ئەو دینارەیش کە پێم داوی لە سەر خولع کردنەکە جگە لە مارەییەکەم، تۆش ئەوەت کرد کە داوام لێکردی، تەڵاقمت دا سێ بە سێ، بە هەموو ئەو ماڵ و سامانەی کە لە لامە لە مارەیی دیاریکراو، ئەویش لەم کتێبەدا نوسراوە، وە بەو دینارانەی کە دیاری کراوە تیایدا، منیش ئەوەم لێ قبووڵ کردی بە زمان لە کاتی دواندنمان پێکەوە، وە هەموو ئەو دینارە دیاریکراوانەم پێ دایتەوە کە لەم نوسراوەدا ئاماژەی پێکراوە، ئەوەی کە خولعت لەسەر کردم بە تەواوی جگە لە مارەییەکەم، جا من پەیوەندیم بە تۆوە نەماوەو خاوەنی بڕیاری خۆمم بەم خولعە وەسفکراوە کە لەم نوسراوەدا ئاماژەی پێکراوە، هیچ ڕێگایەکت نیە بۆ ئەوەی من بگەڕێنیتەوە بۆ لای خۆت، نە دەتوانی داوام بکەی، نە ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ لات، بێگومان هەموو ئەو نەفەقانەم لێ وەرگرتی کە لە ماوەی عیدەدا وەردەگیرێ لە هەموو پیاوێک، هیچ یەکێکمان مافی بەسەر ئەویترەوە نەماوە، نە داواکردن و نە هیچی تر، جا هەریەکە لە ئێمە داوای هەر مافێک لەوی دیکە بکات ئەوە داوایەکی پووچ و بێ بنەمایە، وە هاوەڵەکەیشی لەوە بەریە، چونکە هەریەکە لە ئێمە دانمان بە مافی یەکتردا ناوە، کە لەم نوسراوەدا ئاماژەی پێکراوە، وە بە زمانیش قسەی پێکراوە، پێش ئەوەی مەجلیسەکەمان بەجێ بهێڵین کە گفتووگۆمان لەم بارەیەوە کردوە، کە من و تۆ دانمان پێدا ناوە.

## نوسراو کردن (بۆ ئازد کردنی کۆیلە یان کەنیزەک)

«قَالَ اللَّهُ ﷻ: ﴿وَٱلَّذِينَ يَبۡتَغُونَ ٱلۡكِتَٰبَ مِمَّا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ فَكَاتِبُوهُمۡ إِنۡ عَلِمۡتُمۡ فِيهِمۡ خَيۡرٗاۖ ٣٣﴾ النور،هَذَا كِتَابٌ كَتَبَهُ فُلَانُ بْنُ فُلَانٍ فِي صِحَّةٍ مِنْهُ وَجَوَازِ أَمْرٍ لِفَتَاهُ النُّوبِيِّ الَّذِي يُسَمَّى فُلَاناً وَهُوَ يَوْمَئِذٍ فِي مِلْكِهِ وَيَدِهِ إِنِّي كَاتَبْتُكَ عَلَى ثَلَاثَةِ آلَافِ دِرْهَمٍ وُضحٍ جِيَادٍ وَزْنِ




سَبْعَةٍ مُنَجَّمَةً عَلَيْكَ سِتُّ سِنِينَ مُتَوَالِيَاتٍ أَوَّلُهَا مُسْتَهَلَّ شَهْرِ كَذَا مِنْ سَنَةِ كَذَا عَلَى أَنْ تَدْفَعَ إِلَيَّ هَذَا الْمَالَ الْمُسَمَّى مَبْلَغُهُ فِي هَذَا الْكِتَابِ فِي نُجُومِهَا فَأَنْتَ حُرٌّ بِهَا لَكَ مَا لِلْأَحْرَارِ وَعَلَيْكَ مَا عَلَيْهِمْ فَإِنْ أَخْلَلْتَ شَيْئاً مِنْهُ عَنْ مَحِلِّهِ بَطَلَتِ الْكِتَابَةُ وَكُنْتَ رَقِيقاً لَا كِتَابَةَ لَكَ وَقَدْ قَبِلْتُ مُكَاتَبَتَكَ عَلَيْهِ عَلَى الشُّرُوطِ الْمَوْصُوفَةِ فِي هَذَا الْكِتَابِ قَبْلَ تَصَادُرِنَا عَنْ مَنْطِقِنَا وَافْتِرَاقِنَا عَنْ مَجْلِسِنَا الَّذِي جَرَى بَيْنَنَا ذَلِكَ فِيهِ أَقَرَّ فُلَانٌ وَفُلَانٌ».

**واتە: خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ يَبۡتَغُونَ ٱلۡكِتَٰبَ مِمَّا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ فَكَاتِبُوهُمۡ إِنۡ عَلِمۡتُمۡ فِيهِمۡ خَيۡرٗاۖ ﴿٣٣﴾﴾ (واتە: وە ئەوانەی داوای نوسراو دەکەن بۆ کڕینەوەی خۆیان لە بەندەو کەنیزەکەکانتان ئەوە نوسراویان لەگەڵدا بنووسن، ئەگەر خێرتان لەوانەدا بەدیدەکرد)، ئەمە نوسراوێکە فلانی کوڕی فلان نوسیویەتی لە کاتی لەشساغی و بە ویست و ئارەزووی خۆی بۆ کۆیلەیەکی (النُّوبِيِّ) کە فلانە کەسی پێ دەوترا، ئەو کات لە ژێر موڵک و دەسەلاتی ئەودا بوو: من نوسراوم لەگەڵتدا کرد بە سێ هەزار درهەم بە کێشی حەوت دانەی دیاریکراو لەسەرت لە ماوەی شەش ساڵ بە دوای یەکتردا، یەکەمین ساڵی لە فلانە مانگ و فلانە ساڵدا بە مەرجێک ئەو ماڵ و داراییەم پێ بدەیت، کە بڕەکەی لەم نوسراوەدا ئاماژەی پێکراوە لە کاتی خۆیدا، ئەوە تۆ ئازادی، ئەوەی بۆ کەسی ئازاد هەیە بۆ تۆیش هەیە، بەڵام ئەگەر کەم و کورتیت لە شتێک لەوانەدا کرد ئەوە نوسراوەکە بەتاڵ دەبێتەوەو تۆش بە کۆیلەیی دەمێنیتەوە، وە بۆتیش نیە نوسراو بکەیت، منیش ئەم نوسراوەم قبوڵ کرد کە ئەم مەرجانەی تێدا نوسراوە پێش ئەوەی لە یەکتر جیاببینەوە لە کۆڕو مەجلیسەکەماندا، کە ئەو بڕیارەمانداوە تیایدا پێکەوە، فلانە کەس و فلانە کەس دانیان پێیدا نا.**

## تەدبیر کردن، (واتە: ئەگەر پیاوێک بە کۆیلەکەی بڵێ: ئەگەر مردم تۆ ئازادی)

«هَذَا كِتَابٌ كَتَبَهُ فُلَانُ بْنُ فُلَانِ بْنِ فُلَانٍ لِفَتَاهُ الصَّقَلِّيِّ الْخَبَّازِ الطَّبَّاخِ الَّذِي يُسَمَّى فُلَاناً وَهُوَ يَوْمَئِذٍ فِي مِلْكِهِ وَيَدِهِ إِنِّي دَبَّرْتُكَ لِوَجْهِ اللَّهِ ﷻ وَرَجَاءَ ثَوَابِهِ فَأَنْتَ حُرٌّ بَعْدَ مَوْتِي لَا سَبِيلَ لِأَحَدٍ عَلَيْكَ بَعْدَ وَفَاتِي إِلَّا سَبِيلَ الْوَلَاءِ فَإِنَّهُ لِي وَلِعَقِبِي مِنْ بَعْدِي أَقَرَّ فُلَانُ بْنُ فُلَانٍ بِجَمِيعِ مَا فِي هَذَا الْكِتَابِ طَوْعاً فِي صِحَّةٍ مِنْهُ وَجَوَازِ أَمْرٍ مِنْهُ بَعْدَ أَنْ قُرِئَ ذَلِكَ كُلُّهُ عَلَيْهِ بِمَحْضَرٍ مِنَ الشُّهُودِ الْمُسَمَّيْنَ فِيهِ فَأَقَرَّ عِنْدَهُمْ أَنَّهُ قَدْ سَمِعَهُ وَفَهِمَهُ وَعَرَفَهُ وَأَشْهَدَ اللَّهَ عَلَيْهِ وَكَفَى بِاللَّهِ




شَهِيداً ثُمَّ مَنْ حَضَرَهُ مِنَ الشُّهُودِ عَلَيْهِ أَقَرَّ فُلَانٌ الصَّقَلِّيُّ الطَّبَّاخُ فِي صِحَّةٍ مِنْ عَقْلِهِ وَبَدَنِهِ أَنَّ جَمِيعَ مَا فِي هَذَا الْكِتَابِ حَقٌّ عَلَى مَا سُمِّيَ وَوُصِفَ فِيهِ».

واتە: ئەمە نوسراوێکە فڵانی کوڕی فڵان کوڕی فڵان نوسیویەتی بۆ کۆیلە (الصَّقَلِّيّ)ـەکەی، کە نانەواو چێشت لێنەرە ناویشی فڵانە کەسە، جا ئەو لەو ڕۆژەدا لە ژێر دەسەڵات و موڵکی ئەودا بوو: من لە پێناوی خواو وەرگرتنەوەی پاداشت تۆم ئازادکرد لە دوای مردنم، هیچ کەسێک ناتوانێ دەست بهێنێتە ڕێگەت پاش مردنم، جگە لە ڕێگەی (الْوَلَاءِ) نەبێ، چونکە ئەوە بۆ من و نەوەکانمە لە دوای خۆم، فڵانی کوڕی فڵان دانی بە هەموو ئەوانەدا نا کە لەم نوسراوەدا هاتووە، لە کاتی لەشساغی و بە ویست و ئارەزووی خۆی، بە ئامادەبوونی دوو شایەتی دیاریکراو، کە ئەو بیستوویەتی و تێگەیشتووەو زانیویەتی، وە خوایشی کردۆتە شایەت لە سەر ئەوە، بێگومان تەنها خوا ﷻ بەسە بۆ شایەتی، پاشان ئەوانەیش کە ئامادە بوون لە شایەتەکان لە سەری، فڵانی (الصَّقَلِّيّ) چێشت لێنەر بە عەقڵ و ژیری تەواوەوە دانی بە هەموو ئەوانەدا نا کە لەو کتێبەدا هاتووەو وەسف کراوە.

## ئازادکردنی کۆیلەو کەنیزەک

«هَذَا كِتَابٌ كَتَبَهُ فُلَانُ بْنُ فُلَانٍ طَوْعاً فِي صِحَّةٍ مِنْهُ وَجَوَازِ أَمْرٍ وَذَلِكَ فِي شَهْرِ كَذَا مِنْ سَنَةِ كَذَا لِفَتَاهُ الرُّومِيِّ الَّذِي يُسَمَّى فُلَاناً، وَهُوَ يَوْمَئِذٍ فِي مِلْكِهِ وَيَدِهِ إِنِّي أَعْتَقْتُكَ تَقَرُّباً إِلَى اللَّهِ ﷻ وَابْتِغَاءَ لِجَزِيلِ ثَوَابِهِ عِتْقاً بَتّاً لَا مَثْنَوِيَّةَ فِيهِ، وَلَا رَجْعَةَ لِي عَلَيْكَ فَأَنْتَ حُرٌّ لِوَجْهِ اللَّهِ وَالدَّارِ الْآخِرَةِ لَا سَبِيلَ لِي وَلَا لِأَحَدٍ عَلَيْكَ إِلَّا الْوَلَاءَ فَإِنَّهُ لِي وَلِعَصَبَتِي مِنْ بَعْدِي».

واتە: ئەمە نوسراوێکە فڵانی کوڕی فڵان بە ویست و ئارەزووی خۆی لە کاتی لەشساغیدا نوسیویەتی لە مانگی ئەوەندەو لە ساڵی ئەوەندە بۆ کۆیلەیەکی ڕوومی کە فڵانە کەسی پێ دەوترا، ئەو لەو کاتەدا لە موڵکایەتی و لە ژێر دەستی ئەودا بوو: من ئازادم کردی لە پێناوی خواداو بەدەستهێنانی پاداشتی، ئازادم کرد بە هەمیشەیی، ناشمەوێ بگەڕێیتەوە تۆ ئازادی لەبەر خواو ڕۆژی دوایی، نەمن و نە جگە لە منیش مافی گەڕاندنەوەتی نیە مەگەر بە (الْوَلَاءَ) چونکە ئەوە بۆ من و نەوەکانمە لە دوای من.




## بابەت: خۆشەویستی بۆ ئافرەتان

**٣٩٣٩-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: حُبِّبَ إِلَيَّ مِنَ الدُّنْيَا النِّسَاءُ وَالطِّيبُ، وَجُعِلَ قُرَّةُ عَيْنِي فِي الصَّلَاةِ»[١].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لەم دونیایەدا ئافرەت و بۆنی خۆش لەلام خۆشەویست کراوە، وە نوێژیش کراوە بە بیلبیلەی چاوەکانم.**

**٣٩٤٠-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: حُبِّبَ إِلَيَّ النِّسَاءُ وَالطِّيبُ، وَجُعِلَتْ قُرَّةُ عَيْنِي فِي الصَّلَاةِ»[٢].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئافرەت و بۆنی خۆش لەلام خۆشەویست کراوە، وە نوێژ کراوە بە بیلبیلەی چاوەکانم.**

**٣٩٤١-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: لَمْ يَكُنْ شَيْءٌ أَحَبَّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بَعْدَ النِّسَاءِ مِنَ الْخَيْلِ»[٣].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: هیچ شتێک لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوای ئافرەت ئەوەندەی ئەسپ خۆشەویستتر نەبووە.**

## گرنگیدانی پیاو بە هەندێک لە ژنەکانی جیا لە ئەوانی دی (بە کردەوە، نەک تەنها بە دڵ)

**٣٩٤٢-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ كَانَ لَهُ امْرَأَتَانِ يَمِيلُ لِإِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَحَدُ شِقَّيْهِ مَائِلٌ»[٤].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس دوو ژنی هەبێت لە ڕەفتاریدا گرنگی بدات بە یەکێکیان بەسەر ئەویتردا، ئەوە لە ڕۆژی دوایی دا دێت یەکێک لە شانەکانی نزمە (واتە: بە لارو خواری دەڕوات).**

---

(١) حسن صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) ضعيف.

(٤) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢١٣٣، والترمذي: ١١٤١، وإبن ماجه: ١٩٦٩.




**٣٩٤٣-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْسِمُ بَيْنَ نِسَائِهِ ثُمَّ يَعْدِلُ، ثُمَّ يَقُولُ: اللَّهُمَّ هَذَا فِعْلِي فِيمَا أَمْلِكُ، فَلَا تَلُمْنِي فِيمَا تَمْلِكُ، وَلَا أَمْلِكُ»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ شەوەکانی دابەش دەکرد بەسەر ژنەکانیدا، پاشان دادپەروەر دەبوو، دواتریش دەیفەرموو: خوایە ئەوە کاری منە لەوەی لە توانمادایە، سەرزەنشت و سەرکۆنەم مەکە لەوەی لە توانامدا نیە.**

## خۆشویستنی پیاو بۆ هەندێ لە ژنەکانی جگە لە هەندێکی تر

**٣٩٤٤-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: أَرْسَلَ أَزْوَاجُ النَّبِيِّ ﷺ فَاطِمَةَ بِنْتَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَاسْتَأْذَنَتْ عَلَيْهِ وَهُوَ مُضْطَجِعٌ مَعِي فِي مِرْطِي، فَأَذِنَ لَهَا، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أَزْوَاجَكَ أَرْسَلْنَنِي إِلَيْكَ يَسْأَلْنَكَ الْعَدْلَ فِي ابْنَةِ أَبِي قُحَافَةَ، وَأَنَا سَاكِتَةٌ، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَيْ بُنَيَّةُ، أَلَسْتِ تُحِبِّينَ مَنْ أُحِبُّ؟ قَالَتْ: بَلَى، قَالَ: فَأَحِبِّي هَذِهِ. فَقَامَتْ فَاطِمَةُ حِينَ سَمِعَتْ ذَلِكَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَرَجَعَتْ إِلَى أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ، فَأَخْبَرَتْهُنَّ بِالَّذِي قَالَتْ، وَالَّذِي قَالَ لَهَا، فَقُلْنَ لَهَا: مَا نَرَاكِ أَغْنَيْتِ عَنَّا مِنْ شَيْءٍ، فَارْجِعِي إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقُولِي لَهُ: إِنَّ أَزْوَاجَكَ يَنْشُدْنَكَ الْعَدْلَ فِي ابْنَةِ أَبِي قُحَافَةَ، قَالَتْ فَاطِمَةُ: لَا وَاللَّهِ لَا أُكَلِّمُهُ فِيهَا أَبَداً، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَأَرْسَلَ أَزْوَاجُ النَّبِيِّ ﷺ زَيْنَبَ بِنْتَ جَحْشٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَهِيَ الَّتِي كَانَتْ تُسَامِينِي مِنْ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ فِي الْمَنْزِلَةِ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ، وَلَمْ أَرَ امْرَأَةً قَطُّ خَيْراً فِي الدِّينِ مِنْ زَيْنَبَ، وَأَتْقَى لِلَّهِ ﷻ، وَأَصْدَقَ حَدِيثاً، وَأَوْصَلَ لِلرَّحِمِ، وَأَعْظَمَ صَدَقَةً، وَأَشَدَّ ابْتِذَالاً لِنَفْسِهَا فِي الْعَمَلِ الَّذِي تَصَدَّقُ بِهِ، وَتَقَرَّبُ بِهِ مَا عَدَا سَوْرَةً مِنْ حِدَّةٍ كَانَتْ فِيهَا، تُسْرِعُ مِنْهَا الْفَيْئَةَ، فَاسْتَأْذَنَتْ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَعَ عَائِشَةَ فِي مِرْطِهَا عَلَى الْحَالِ الَّتِي كَانَتْ دَخَلَتْ فَاطِمَةُ عَلَيْهَا، فَأَذِنَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أَزْوَاجَكَ أَرْسَلْنَنِي يَسْأَلْنَكَ الْعَدْلَ فِي ابْنَةِ أَبِي قُحَافَةَ، وَوَقَعَتْ بِي فَاسْتَطَالَتْ، وَأَنَا أَرْقُبُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَأَرْقُبُ طَرْفَهُ، هَلْ أَذِنَ لِي فِيهَا، فَلَمْ تَبْرَحْ زَيْنَبُ حَتَّى عَرَفْتُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَا يَكْرَهُ أَنْ أَنْتَصِرَ، فَلَمَّا وَقَعْتُ بِهَا لَمْ أَنْشَبْهَا بِشَيْءٍ، حَتَّى أَنْحَيْتُ عَلَيْهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّهَا ابْنَةُ أَبِي بَكْرٍ»[٢].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ فاطیمەی کچی پێغەمبەریان نارد بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، داوای مۆڵەتی لێی کرد ئەویش**

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢١٣٤، والترمذي: ١١٤٠، وإبن ماجه: ١٩٧١.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٤٤٢.




لەگەڵمدا ڕاکشابوو لە ژێر لێفەیەک، مۆڵەتی پێدا، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، خێزانەکانت منیان ناردوە داوای دادپەروەریت لێ دەکەن لە بارەی کچەکەی ئەبو قوحافەوە، منیش بێدەنگم، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئەی کچەکەم، ئایا ئەوەت خۆش ناوێ کە من خۆشم دەوێ؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: ئەمەت خۆش بوێ، فاطیمە کاتێ ئەمەی بیست لە پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵساو ڕۆیشت، گەڕایەوە بۆ لای خێزانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ، هەواڵی پێدان بەوەی وتی: وە بەوەشی پێی ڕاگەیاند، ئەوانیش پێیان وت: وا نابینین بێ نیازت کردبین لە هیچ شتێک، بگەڕێرەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ پێی بڵێ: خێزانەکانت داوای دادپەروەریت لێ دەکەن لەبارەی کچەکەی ئەبو قوحافەوە، فاطیمەش وتی: نا، سوێند بە خوا هەرگیز لەوبارەوە قسەی لەگەڵ ناکەم، عائیشە وتی: خێزانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ زەینەبی کچی جەحشیان نارد بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەو لە ئاستی مندا بوو لەناو خێزانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕووی پلەو پایەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، ئافرەتێکم نەبینیوە لە خواناسیدا وەکو زەینەب بووبێت، وە لەبەر خواش بترسێ و قسەی ڕاست بێت و پەیوەندی خزمایەتی جێبەجێ بکات و خێرو بەخشینیش ئەنجام بدات، وە خۆیشی زۆر بە کەم دەزانی لەو خێرەی کە دەیکردو خۆی پێ نزیک دەکردەوە جگە لەوە نەبێ تۆزێ زوو هەڵدەچوو بە هۆی ئەو پەلە کردنەی تێیدا بوو، وە زۆر بە زووی پەشیمان دەبوویەوە لە توڕەبوونەکەی، داوای مۆڵەتی لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ عائیشەدا بوو لە ژێر لێفەیەک بەو شێوەی کە فاطیمە هاتە ژوورەوە بۆ لای، پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی پێدا، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، خێزانەکانت منیان ناردوە داوای دادپەروەریت لێدەکەن لەبارەی کچەکەی ئەبو قوحافەوە، قسە و جنێوی پێدام درێژەی خایاند، منیش تەماشای پێغەمبەرم ﷺ دەکرد، وە تەماشای ئەوەم دەکرد بزانم ئایا لەبارەیەوە ڕێگەم پێدەدا، زەینەب شوێنەکەی بەجێ نەهێشت تا زانیم پێغەمبەری خوا ﷺ پێی ناخۆش نیە (بەرگری لە خۆم بکەم و) سەر بکەوم، کاتێ ڕووبەڕووی بوومەوە مۆڵەتم پێ نەدا تا سەرکوتم کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە کچی ئەبو بەکرە.

**٣٩٤٥-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: فَذَكَرَتْ نَحْوَهُ، وَقَالَتْ: أَرْسَلَ أَزْوَاجُ النَّبِيِّ ﷺ زَيْنَبَ، فَاسْتَأْذَنَتْ، فَأَذِنَ لَهَا فَدَخَلَتْ، فَقَالَتْ: نَحْوَهُ»[1].

---

(١) صحيح الإسناد.




**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: هەروەکو ئەو فەرموودەی پێشەوەی باسکرد، وە وتی: خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ زەینەبیان نارد، ئەویش داوای مۆڵەتی کرد، پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی پێدا پاشان هاتە ژوورەوەو وتی: هەروەکو ئەو فەرموودەی پێشەوە.**

**٣٩٤٦-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: اجْتَمَعْنَ أَزْوَاجُ النَّبِيِّ ﷺ فَأَرْسَلْنَ فَاطِمَةَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقُلْنَ لَهَا: إِنَّ نِسَاءَكَ «وَذَكَرَ كَلِمَةً مَعْنَاهَا» يَنْشُدْنَكَ الْعَدْلَ فِي ابْنَةِ أَبِي قُحَافَةَ قَالَتْ: فَدَخَلَتْ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ مَعَ عَائِشَةَ فِي مِرْطِهَا، فَقَالَتْ لَهُ: إِنَّ نِسَاءَكَ أَرْسَلْنَنِي، وَهُنَّ يَنْشُدْنَكَ الْعَدْلَ فِي ابْنَةِ أَبِي قُحَافَةَ، فَقَالَ لَهَا النَّبِيُّ ﷺ: أَتُحِبِّينِي؟ قَالَتْ: نَعَمْ قَالَ: فَأَحِبِّيهَا. قَالَتْ: فَرَجَعَتْ إِلَيْهِنَّ، فَأَخْبَرَتْهُنَّ مَا قَالَ، فَقُلْنَ لَهَا: إِنَّكِ لَمْ تَصْنَعِي شَيْئاً، فَارْجِعِي إِلَيْهِ، فَقَالَتْ: وَاللَّهِ لَا أَرْجِعُ إِلَيْهِ فِيهَا أَبَداً، وَكَانَتِ ابْنَةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَقّاً، فَأَرْسَلْنَ زَيْنَبَ بِنْتَ جَحْشٍ، قَالَتْ عَائِشَةُ: وَهِيَ الَّتِي كَانَتْ تُسَامِينِي مِنْ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَتْ: أَزْوَاجُكَ أَرْسَلْنَنِي، وَهُنَّ يَنْشُدْنَكَ الْعَدْلَ فِي ابْنَةِ أَبِي قُحَافَةَ، ثُمَّ أَقْبَلَتْ عَلَيَّ تَشْتِمُنِي، فَجَعَلْتُ أُرَاقِبُ النَّبِيَّ ﷺ وَأَنْظُرُ طَرْفَهُ، هَلْ يَأْذَنُ لِي مِنْ أَنْ أَنْتَصِرَ مِنْهَا، قَالَتْ: فَشَتَمَتْنِي حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ لَا يَكْرَهُ أَنْ أَنْتَصِرَ مِنْهَا، فَاسْتَقْبَلْتُهَا، فَلَمْ أَلْبَثْ أَنْ أَفْحَمْتُهَا، فَقَالَ لَهَا النَّبِيُّ ﷺ: إِنَّهَا ابْنَةُ أَبِي بَكْرٍ، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَلَمْ أَرَ امْرَأَةً خَيْراً، وَلَا أَكْثَرَ صَدَقَةً، وَلَا أَوْصَلَ لِلرَّحِمِ، وَأَبْذَلَ لِنَفْسِهَا فِي كُلِّ شَيْءٍ يُتَقَرَّبُ بِهِ إِلَى اللَّهِ تَعَالَى مِنْ زَيْنَبَ، مَا عَدَا سَوْرَةً مِنْ حِدَّةٍ كَانَتْ فِيهَا تُوشِكُ مِنْهَا الْفَيْئَةَ»[1].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ کۆبوونەوە فاطیمەیان نارد بۆ لای پێغەمبەر ﷺ پێیان وت: بەڕاستی خێزانەکانت «باسی وشەیەکی کرد ماناکەی»، داوای دادپەروەریت لێدەکەن لە بارەی کچەکەی ئەبو قوحافەوە، وتی: فاطیمە چوو بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئەو لەگەڵ عائیشە لە ژێر لێفەیەکدا بوون، پێی وت: بەڕاستی خێزانەکانت منیان ناردوە داوای دادپەروەریت لێدەکەن لە بارەی کچەکەی ئەبو قوحافە، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ئایا منت خۆش دەوێ؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: دەی عائیشەشت خۆش بوێ، وتی: منیش گەڕامەوەو هەواڵم پێدان بەوەی پێمی فەرموو، ئەوانیش پێیان وت: تۆ هیچت نەکردوە بگەڕێرەوە بۆ لای، وتی: سوێند بە خوا هەرگیز ناگەڕێمەوە بۆ لای، جا کچەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر حەق بوو، ئەوانیش زەینەبی کچی جەحشیان نارد بۆ لای، عائیشە وتی: ئەویش لە ئاستی مندا بوو لە ناو خێزانەکانی پێغەمبەردا، وتی: خێزانەکانت**

---

(١) صحيح الإسناد.




منیان ناردووە، داوای دادپەروەریت لێ دەکەن لە بارەی کچەکەی ئەبو قوحافەوە، پاشان ڕووی تێکردن قسەو جنێوی پێ وتم، منیش چاودێری پێغەمبەرم ﷺ دەکردو تەماشای چاویم دەکرد، بزانم مۆڵەتم پێ دەدا منیش بەرگری لە خۆم بکەم، وتی: ئەوەندە جنێوی پێ دام هەتا گومانم برد کە پێغەمبەر ﷺ پێی ناخۆش نیە بەرگری لە خۆم بکەم، کاتێ ڕووبەڕووی بوومەوە کتووپڕ سەرکوتم کرد، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ئەوە کچەکەی ئەبو بەکرە. عائیشە وتی: هیچ ئافرەتێکم نەبینیوە چاکتر بێ و بەخشندەتر بێ و پەیوەندی خزمایەتی جێبەجێ کردبێ، وە نەفسی خۆی بەخت کردبێ بۆ هەموو شتێک نزیکی بکاتەوە لە خوا لە زەینەب، جگە لەوە نەبێ کە هەڵچوونێکە هەبوو دوای ئەوەش ئاسایی دەبوویەوە.

**٣٩٤٧-** «عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: فَضْلُ عَائِشَةَ عَلَى النِّسَاءِ كَفَضْلِ الثَّرِيدِ عَلَى سَائِرِ الطَّعَامِ»[١].

واتە: ئەبو موسا ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: چاکەی عائیشە بەسەر ئافرەتانەوە وەکو چاکەی نان تێکوشە وایە بەسەر هەموو خواردنەکانەوە.

**٣٩٤٨-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: فَضْلُ عَائِشَةَ عَلَى النِّسَاءِ كَفَضْلِ الثَّرِيدِ عَلَى سَائِرِ الطَّعَامِ»[٢].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: چاکەی عائیشە بەسەر ئافرەتانەوە وەکو چاکەی نان تێکوشە وایە بەسەر هەموو خواردنەکانەوە.

**٣٩٤٩-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَا أُمَّ سَلَمَةَ لَا تُؤْذِينِي فِي عَائِشَةَ، فَإِنَّهُ وَاللَّهِ مَا أَتَانِي الْوَحْيُ فِي لِحَافِ امْرَأَةٍ مِنْكُنَّ إِلَّا هِيَ»[٣].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی ئوممو سەلەمە ئازارم مەدە بە هۆی عائیشەوە، سوێند بە خوا وەحیم بۆ نەهاتووە لە ناو لێفەی هیچ ژنێک لە ئێوەدا جگە لەمە نەبێت.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٤١١ و ٣٤٣٣ و ٣٧٦٩ و ٥٤١٨، ومسلم: ٢٤٣١، والترمذي: ١٨٣٤، وإبن ماجه: ٣٢٨٠.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٧٧٥، والترمذي: ٣٨٧٩.




**٣٩٥٠-** «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ نِسَاءَ النَّبِيِّ ﷺ كَلَّمْنَهَا، أَنْ تُكَلِّمَ النَّبِيَّ ﷺ، أَنَّ النَّاسَ كَانُوا يَتَحَرَّوْنَ بِهَدَايَاهُمْ يَوْمَ عَائِشَةَ، وَتَقُولُ لَهُ: إِنَّا نُحِبُّ الْخَيْرَ كَمَا تُحِبُّ عَائِشَةَ، فَكَلَّمَتْهُ، فَلَمْ يُجِبْهَا، فَلَمَّا دَارَ عَلَيْهَا كَلَّمَتْهُ أَيْضاً، فَلَمْ يُجِبْهَا، وَقُلْنَ: مَا رَدَّ عَلَيْكِ؟ قَالَتْ: لَمْ يُجِبْنِي. قُلْنَ: لَا تَدَعِيهِ حَتَّى يَرُدَّ عَلَيْكِ، أَوْ تَنْظُرِينَ مَا يَقُولُ، فَلَمَّا دَارَ عَلَيْهَا كَلَّمَتْهُ فَقَالَ: لَا تُؤْذِينِي فِي عَائِشَةَ، فَإِنَّهُ لَمْ يَنْزِلْ عَلَيَّ الْوَحْيُ، وَأَنَا فِي لِحَافِ امْرَأَةٍ مِنْكُنَّ، إِلَّا فِي لِحَافِ عَائِشَةَ»[١].

واتە: ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ قسەیان لەگەڵدا کرد، لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ قسە بکات، خەڵکی لەو ڕۆژانەی نۆرەی عائیشەیە دیاریەکانیان دێنن (چونکە دەزانن عائیشەی لە هەموویان زیاتر خۆش دەوێ)، وە پێی بڵێ: ئێمەش حەزمان لە خێرو سامانە وەکو چۆن عائیشە حەزی لێیەتی، ئەویش قسەی لەگەڵدا کرد، وەڵامی نەدایەوە، کاتێ هاتەوە بۆ لای جارێکی تر قسەی لەگەڵ کرد، دیسان وەڵامی نەدایەوە، وتیان: وەڵامی چی بوو بۆت؟ وتی: وەڵامی نەدامەوە، وتیان: وازی لێ مەهێنە هەتا وەڵامت دەداتەوە، یان وەڵامی لێ وەردەگری، کاتێ هاتەوە بۆ لای دیسان قسەی لەگەڵدا کرد، ئەویش فەرمووی: ئازارم مەدە بە هۆی عائیشەوە، بێگومان وەحیم بۆ دانەبەزیوە لە ناو لێفەی هیچ یەکێک لە ئێوە جگە لە ناو لێفەی عائیشە نەبێت.

**٣٩٥١-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ النَّاسُ يَتَحَرَّوْنَ بِهَدَايَاهُمْ يَوْمَ عَائِشَةَ يَبْتَغُونَ بِذَلِكَ مَرْضَاةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[٢].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: خەڵکی لە نۆرەی عائیشەدا دیاریان دەهێنا، مەبەستیان بەو دیاریە ڕەزامەندی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو.

**٣٩٥٢-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: أَوْحَى اللَّهُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَأَنَا مَعَهُ، فَقُمْتُ، فَأَجَفْتُ الْبَابَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ، فَلَمَّا رُفِّهَ عَنْهُ، قَالَ لِي: يَا عَائِشَةُ إِنَّ جِبْرِيلَ يُقْرِئُكِ السَّلَامَ»[٣].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: خوا نیگای کرد بۆ پێغەمبەر ﷺ منیش لەگەڵی بووم، دەرگاکەم لە نێوانماندا داخست، کاتێ نیگاکەی لەسەر نەما، پێمی وت: ئەی عائیشە جبریل سڵاوت لێدەکات.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٥٧٤، ومسلم: ٢٤٤١.

(٣) صحيح لغيره.




**٣٩٥٣-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لَهَا: إِنَّ جِبْرِيلَ يَقْرَأُ عَلَيْكِ السَّلَامَ، قَالَتْ: وَعَلَيْهِ السَّلَامُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، تَرَى مَا لَا نَرَى»(١).

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: جبریل سڵاوت لێ دەکات، ئەویش) وتی: وە سڵاو و ڕەحمەت و بەرەکەتی خوای لەسەر بێت، ئەوەی ئێمە نایبینین تۆ دەیبینی.**

**٣٩٥٤-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَا عَائِشَةُ هَذَا جِبْرِيلُ، وَهُوَ يَقْرَأُ عَلَيْكِ السَّلَامَ. مِثْلَهُ سَوَاءٌ»(٢).

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی عائیشە ئەمە جبریلە، سڵاوت لێ دەکات، هەر وەکو ئەو.**

## بابەت: غیرە بردن

**٣٩٥٥-** «عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ عِنْدَ إِحْدَى أُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ، فَأَرْسَلَتْ أُخْرَى بِقَصْعَةٍ فِيهَا طَعَامٌ، فَضَرَبَتْ يَدَ الرَّسُولِ، فَسَقَطَتِ الْقَصْعَةُ، فَانْكَسَرَتْ، فَأَخَذَ النَّبِيُّ ﷺ الْكِسْرَتَيْنِ فَضَمَّ إِحْدَاهُمَا إِلَى الْأُخْرَى، فَجَعَلَ يَجْمَعُ فِيهَا الطَّعَامَ، وَيَقُولُ: غَارَتْ أُمُّكُمْ كُلُوا، فَأَكَلُوا، فَأَمْسَكَ حَتَّى جَاءَتْ بِقَصْعَتِهَا الَّتِي فِي بَيْتِهَا، فَدَفَعَ الْقَصْعَةَ الحسنةَ إِلَى الرَّسُولِ، وَتَرَكَ الْمَكْسُورَةَ فِي بَيْتِ الَّتِي كَسَرَتْهَا»(٣).

**واتە: ئەنەس رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە لای یەکێک لە دایکانی بڕواداران بوو، یەکێکی تر لە خێزانەکانی قاپێ خواردنی بۆی نارد، ئەویش دای لە دەستی پێغەمبەر ﷺ، قاپەکە لە دەستی بەربوویە خوارەوەو شکا، پێغەمبەر ﷺ هەردوو بەشە شکاوەکەی هەڵگرت لکاندیانی بە یەکترەوە خواردنەکەیشی تێ دەکرد، وە فەرمووی: دایکتان غیرەی کرد، لێی بخۆن، ئەوانیش لێیان خوارد، قاپەکەی دانا تا هات بۆ قاپەکەی خۆی، ئەویش قاپە چاکەکەی دا بە نێردراوەکەو شکاوەکەیشی لەو ماڵە جێهێڵێ کە تیایدا شکا.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٢١٧ و ٣٧٦٨ و ٣٢٠١ و ٦٢٤٩ و ٦٢٥٣، ومسلم: ٩٠ و ٢٤٤٧/٩١، وأبو داود: ٥٢٣٢، والترمذي: ٢٦٩٣ و ٣٨٨١ و ٣٨٨٢، وإبن ماجه: ٣٦٩٦.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤٨١ و ٥٢٢٥، وأبو داود: ٣٥٦٧، والترمذي: ١٣٥٩، وإبن ماجه: ٢٣٣٤.




**٣٩٥٦-** «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّهَا يَعْنِي أَتَتْ بِطَعَامٍ فِي صَحْفَةٍ لَهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأَصْحَابِهِ، فَجَاءَتْ عَائِشَةُ مُتَّزِرَةً بِكِسَاءٍ، وَمَعَهَا فِهْرٌ، فَفَلَقَتْ بِهِ الصَّحْفَةَ، فَجَمَعَ النَّبِيُّ ﷺ بَيْنَ فِلْقَتَيْ الصَّحْفَةِ، وَيَقُولُ: كُلُوا غَارَتْ أُمُّكُمْ، مَرَّتَيْنِ، ثُمَّ أَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَحْفَةَ عَائِشَةَ، فَبَعَثَ بِهَا إِلَى أُمِّ سَلَمَةَ، وَأَعْطَى صَحْفَةَ أُمِّ سَلَمَةَ عَائِشَةَ»[(١)].

**واتە: ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، ئەو خواردنی هێنا لەناو قاپێکدا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ وهاوەڵانی، عائیشە هات و بە بەرگێک خۆی داپۆشیبوو بەردێکیشی بە دەستەوە بوو، قاپەکەی پێ لەت کرد، پێغەمبەریش ﷺ خواردنەکەی کۆکردەوەو خستیە ناو قاپە لەت کراوەکە، وە دووجار فەرمووی: بخۆن دایکتان غیرەی بردوە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ قاپەکەی عائیشەی برد بۆ ئوممو سەلەمە، قاپەکەی ئوممو سەلەمەیشی دا بە عائیشە.**

**٣٩٥٧-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ صَانِعَةَ طَعَامٍ مِثْلَ صَفِيَّةَ، أَهْدَتْ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ إِنَاءً فِيهِ طَعَامٌ، فَمَا مَلَكْتُ نَفْسِي أَنْ كَسَرْتُهُ، فَسَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ عَنْ كَفَّارَتِهِ فَقَالَ: إِنَاءٌ كَإِنَاءٍ، وَطَعَامٌ كَطَعَامٍ»[(٢)].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: هیچ چێشت لێنەرێکم نەبینیوە وەکو صەفیە، قاپێک خواردنی بە دیاری هێنا بۆ پێغەمبەر ﷺ، منیش خۆم پێ نەگیراو شکاندم، پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد لە بارەی (کەفارەتی ڕەفتارەکەم)، فەرمووی: قاپێ بە قاپێ و خواردنێ بە خواردنێ.**

**٣٩٥٨-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قالت: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَمْكُثُ عِنْدَ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ فَيَشْرَبُ عِنْدَهَا عَسَلاً، فَتَوَاصَيْتُ أَنَا وَحَفْصَةُ أَنَّ أَيَّتُنَا دَخَلَ عَلَيْهَا النَّبِيُّ ﷺ، فَلْتَقُلْ: إِنِّي أَجِدُ مِنْكَ رِيحَ مَغَافِيرَ أَكَلْتَ مَغَافِيرَ، فَدَخَلَ عَلَى إِحْدَاهُمَا، فَقَالَتْ: ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: لَا، بَلْ شَرِبْتُ عَسَلاً عِنْدَ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ، وَلَنْ أَعُودَ لَهُ فَنَزَلَتْ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَ ﴿١﴾﴾التحريم، ﴿إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ ﴿٤﴾﴾التحريم، لِعَائِشَةَ وَحَفْصَةَ وَ: ﴿وَإِذْ أَسَرَّ ٱلنَّبِيُّ إِلَىٰ بَعْضِ أَزْوَٰجِهِۦ حَدِيثًا ﴿٣﴾﴾التحريم، لِقَوْلِهِ: بَلْ شَرِبْتُ عَسَلاً»[(٣)].

---

(١) صحيح.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٦٨.

(٣) صحيح.




واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لای زینەبی کچی جەحش دەمایەوەو هەنگوینی لەلا دەخوارد، من و حەفصە بەڵێنمان بە یەکتریدا پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لای هەرکامەمان بلێ: من هەست دەکەم بۆنی (مَغَافِيرَ)ت لێ دێت، (کە شتێکی خۆشە، بەڵام بۆنی هەیە) (مَغَافِيرَ)ت خواردوە، جا هات بۆ لای یەکێکیان ئەویش ئەوەی پێ وت، فەرمووی: بەڵکو هەنگوینم خوارد لای زەینەبی کچی جەحش، وە فەرمووشی: (ئیتر هەرگیز نایخۆم)، پاشان ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَ ﴿١﴾ ﴾ (واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ بۆچی ئەوە حەرام دەکەی کە خوا حەڵاڵی کردوە بۆت)، ﴿ إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ ﴿٤﴾ ﴾ (واتە: ئەگەر ئەو دوانە داوای لێخۆشبوون بکەن لای خوا)، بۆ عائیشە و حەفصە: ﴿ وَإِذْ أَسَرَّ ٱلنَّبِيُّ إِلَىٰ بَعْضِ أَزْوَٰجِهِۦ حَدِيثًا ﴿٣﴾ ﴾ (واتە: کاتێک کە پێغەمبەر ﷺ بە نهێنی لای هەندێ لە ژنەکانی قسەیەکی درکاند)، لەبەر ئەوەی کە وتی: هەنگوینم خوارد.

**٣٩٥٩-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَتْ لَهُ أَمَةٌ يَطَؤُهَا فَلَمْ تَزَلْ بِهِ عَائِشَةُ وَحَفْصَةُ حَتَّى حَرَّمَهَا عَلَى نَفْسِهِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَ ﴿١﴾ ﴾التحريم، إِلَى آخِرِ الْآيَةِ»[1].

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ کەنیزەکێکی هەبوو هەر دەچووە لایەوە، عائیشەو حەفصە کۆڵیان نەدا تا لەسەر نەفسی خۆی قەدەغەی کرد، پاشان خوا ﷻئەم ئایەتەی دابەزاندە خوارەوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَ ﴿١﴾ ﴾ (واتە: ئەی پێغەمبەر بۆچی ئەوە حەرام دەکەی کە خوا حەڵاڵی کردوە بۆت، تا کۆتایی ئایەتەکە.

**٣٩٦٠-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: الْتَمَسْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَأَدْخَلْتُ يَدِي فِي شَعْرِهِ، فَقَالَ: قَدْ جَاءَكِ شَيْطَانُكِ، فَقُلْتُ: أَمَا لَكَ شَيْطَانٌ؟ فَقَالَ: بَلَى، وَلَكِنَّ اللَّهَ أَعَانَنِي عَلَيْهِ فَأَسْلَمَ»[2].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لام، دەستم خستە ناو قژی (تا بزانێ نەچوەتە لای خێزانەکانی تری)، فەرمووی: بەڕاستی شەیتانەکەت هاتەوە، وتم: ئەی تۆ شەیتانت نیە؟ فەرمووی: بەڵێ، هەیمە، بەڵکو خوا زاڵی کردم بەسەریداو مسوڵمان بوو.

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح الإسناد.




**٣٩٦١-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: فَقَدْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ لَيْلَةٍ، فَظَنَنْتُ أَنَّهُ ذَهَبَ إِلَى بَعْضِ نِسَائِهِ، فَتَجَسَّسْتُهُ، فَإِذَا هُوَ رَاكِعٌ أَوْ سَاجِدٌ، يَقُولُ: سُبْحَانَكَ وَبِحَمْدِكَ، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، فَقُلْتُ: بِأَبِي وَأُمِّي، إِنَّكَ لَفِي شَأْنٍ، وَإِنِّي لَفِي شَأْنٍ آخَرَ»(١).

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: شەوێک پێغەمبەری خوا ﷺ لێم بزر بوو، گومانم برد چوویێ بۆ لای یەکێک لە خێزانەکانی، منیش چاودێریم کرد، کاتێ بینیم لە ڕکوع یان لە سوژدەدا بوو، دەیفەرموو: پاک و بێگەردی و ستایش بۆ تۆ، هیچ پەرستراوێک بە حەق نیە جگە لە تۆ، وتم: دایک و باوکم بە قوربانت بێ تۆ بە شتێکەوە سەرقاڵی و منیش بە شتێکی ترە.**

**٣٩٦٢-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: افْتَقَدْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ لَيْلَةٍ، فَظَنَنْتُ أَنَّهُ ذَهَبَ إِلَى بَعْضِ نِسَائِهِ، فَتَجَسَّسْتُ، ثُمَّ رَجَعْتُ، فَإِذَا هُوَ رَاكِعٌ أَوْ سَاجِدٌ، يَقُولُ: سُبْحَانَكَ وَبِحَمْدِكَ، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، فَقُلْتُ: بِأَبِي وَأُمِّي إِنَّكَ لَفِي شَأْنٍ، وَإِنِّي لَفِي آخَرَ»(٢).

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: شەوێک پێغەمبەری خوا ﷺ لێم بزر بوو، گومانم برد چوویێ بۆ لای یەکێک لە خێزانەکانی، منیش چاودێریم کرد، کاتێ بینیم لە ڕکوع یان لە سوژدەدا بوو، دەیفەرموو: پاک و بێگەردی و ستایش بۆ تۆ، هیچ پەرستراوێک بە حەق نیە جگە لە تۆ، وتم: دایک و باوکم بە قوربانت بێ تۆ بە شتێکەوە سەرقاڵی و منیش بە شتێکی تر.**

**٣٩٦٣-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا تَقُولُ: أَلَا أُحَدِّثُكُمْ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ وَعَنِّي؟ قُلْنَا: بَلَى، قَالَتْ: لَمَّا كَانَتْ لَيْلَتِي انْقَلَبَ، فَوَضَعَ نَعْلَيْهِ عِنْدَ رِجْلَيْهِ، وَوَضَعَ رِدَاءَهُ، وَبَسَطَ إِزَارَهُ عَلَى فِرَاشِهِ، وَلَمْ يَلْبَثْ إِلَّا رَيْثَمَا ظَنَّ أَنِّي قَدْ رَقَدْتُ، ثُمَّ انْتَعَلَ رُوَيْداً، وَأَخَذَ رِدَاءَهُ رُوَيْداً، ثُمَّ فَتَحَ الْبَابَ رُوَيْداً وَخَرَجَ وَأَجَافَهُ رُوَيْداً، وَجَعَلْتُ دِرْعِي فِي رَأْسِي فَاخْتَمَرْتُ، وَتَقَنَّعْتُ إِزَارِي، وَانْطَلَقْتُ فِي إِثْرِهِ حَتَّى جَاءَ الْبَقِيعَ، فَرَفَعَ يَدَيْهِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، وَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثُمَّ انْحَرَفَ، وَانْحَرَفْتُ، فَأَسْرَعَ فَأَسْرَعْتُ، فَهَرْوَلَ فَهَرْوَلْتُ، فَأَحْضَرَ فَأَحْضَرْتُ، وَسَبَقْتُهُ فَدَخَلْتُ، وَلَيْسَ إِلَّا أَنْ اضْطَجَعْتُ فَدَخَلَ، فَقَالَ: مَا لَكِ يَا عَائِشُ رَابِيَةً؟ قَالَ: سُلَيْمَانُ حَسِبْتُهُ قَالَ: حَشْيَا قَالَ: لَتُخْبِرِنِّي أَوْ لَيُخْبِرَنِّي اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ؟ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي، فَأَخْبَرْتُهُ الْخَبَرَ، قَالَ: أَنْتِ السَّوَادُ الَّذِي رَأَيْتُ أَمَامِي؟ قُلْتُ:

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




نَعَمْ، قَالَتْ: فَلَهَدَنِي لَهْدَةً فِي صَدْرِي أَوْجَعَتْنِي، قَالَ: أَظَنَنْتِ أَنْ يَحِيفَ اللَّهُ عَلَيْكِ وَرَسُولُهُ، قَالَتْ: مَهْمَا يَكْتُمُ النَّاسُ فَقَدْ عَلِمَهُ اللَّهُ ﷺ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَإِنَّ جِبْرِيلَ عَلَيْهِ السَّلَامُ أَتَانِي حِينَ رَأَيْتِ، وَلَمْ يَكُنْ يَدْخُلُ عَلَيْكِ، وَقَدْ وَضَعْتِ ثِيَابَكِ فَنَادَانِي، فَأَخْفَى مِنْكِ فَأَجَبْتُهُ، وَأَخْفَيْتُهُ مِنْكِ، وَظَنَنْتُ أَنَّكِ قَدْ رَقَدْتِ، فَكَرِهْتُ أَنْ أُوقِظَكِ، وَخَشِيتُ أَنْ تَسْتَوْحِشِي، فَأَمَرَنِي أَنْ آتِيَ أَهْلَ الْبَقِيعِ، فَأَسْتَغْفِرَ لَهُمْ»[1].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: ئایا باسێکتان بۆ بکەم سەبارەت بە من و پێغەمبەر ﷺ؟ وتمان: بەڵێ، باسی بکە، وتی: کاتێ ئەو شەوەی نۆرەی من بوو لە لام بێت، (مەبەستی پێغەمبەر ﷺ بوو گەڕایەوە لە نوێژی عیشا) نەعلەکانی لە لای پێی دانا، هەروەها عەباکەی لەسەر شوێنی خەوەکەی ڕاخست، نەمایەوە بە ئەندازەی ئەوە نەبێت گومانی برد من خەوم لێکەوتووە، پاشان لەسەرخۆ نەعلەکانی لەپێ کرد، وە لەسەرخۆ عەباکەی هەڵگرت، پاشان لەسەرخۆ دەرگاکەی کردەوە و لەسەرخۆ دەرچووە دەرەوە، سەرپۆشەکەم لەسەر کردبوو پشتەماڵەکەشم دا بەخۆمدا، بە شوێنیدا ڕۆیشتم هەتا هاتە بەقیع، سێجار دەستی بەرزکردەوە، بە پێوە ئەندازەیەکی زۆر وەستا، پاشان گەڕایەوە منیش گەڕامەوە، پەلەی کردو منیش پەلەم کرد، لەسەرخۆ ڕایکرد منیش ڕامکرد، ئەو گەیشت و منیش گەیشتم پێشی کەوتم چوومە ژوورەوە ڕاستەوخۆ پاڵکەوتم، ئەویش هاتە ژوورەوە فەرمووی: ئەوە چیە ئەی عائیشە هەناسەت سوار بووە؟ فەرمووی: خوای بەبەزەیی و کاربەجێ هەواڵی پێدام، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، دایک و باوکم بە قوربانت بن، هەواڵەکەم پێیدا، ئەویش فەرمووی: ئەو ڕەشاییە تۆ بووی لەپێش خۆم بینیم؟ وتم: بەڵێ، وتی: دای بەسەر سنگمدا بە لێدانێک ئازاری پێگەیاندم، فەرمووی: ئایا گومانت برد خواو پێغەمبەرەکەی ستەمیان لێکردووی؟ وتی: خەڵکی هەرچۆنێ بیشارنەوە خوا دەیزانێ؟ فەرمووی: بەڵێ، بێگومان جبریل هات بۆ لام کاتێ تۆ بینیت، بەڵام نەهاتە ژوورەوە بۆ لات، کاتێ تۆ جلەکانت دانا بانگی کردم زۆر بە ئەسپایی لە تۆی شاردەوە، منیش وەڵامم دایەوەو لە تۆم شاردەوە، گومانم برد خەوتبی، حەزم نەکرد بە خەبەرت بهێنمەوە، لەوەش ترسام بترسی، فەرمانی پێکردم بچم بۆ بەقیع و داوای لێخۆشبونیان بۆ بکەم.

---

(١) صحيح.




**٣٩٦٤-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: أَلَا أُحَدِّثُكُمْ عَنِّي، وَعَنِ النَّبِيِّ ﷺ؟ قُلْنَا: بَلَى، قَالَتْ: لَمَّا كَانَتْ لَيْلَتِي الَّتِي هُوَ عِنْدِي «تَعْنِي النَّبِيَّ ﷺ انْقَلَبَ، فَوَضَعَ نَعْلَيْهِ عِنْدَ رِجْلَيْهِ، وَوَضَعَ رِدَاءَهُ، وَبَسَطَ طَرَفَ إِزَارِهِ عَلَى فِرَاشِهِ، فَلَمْ يَلْبَثْ إِلَّا رَيْثَمَا ظَنَّ أَنِّي قَدْ رَقَدْتُ، ثُمَّ انْتَعَلَ رُوَيْداً، وَأَخَذَ رِدَاءَهُ رُوَيْداً، ثُمَّ فَتَحَ الْبَابَ رُوَيْداً، وَخَرَجَ وَأَجَافَهُ رُوَيْداً، وَجَعَلْتُ دِرْعِي فِي رَأْسِي، وَاخْتَمَرْتُ، وَتَقَنَّعْتُ إِزَارِي، فَانْطَلَقْتُ فِي إِثْرِهِ حَتَّى جَاءَ الْبَقِيعَ، فَرَفَعَ يَدَيْهِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ وَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثُمَّ انْحَرَفَ فَانْحَرَفْتُ، فَأَسْرَعَ فَأَسْرَعْتُ، فَهَرْوَلَ فَهَرْوَلْتُ، فَأَحْضَرَ فَأَحْضَرْتُ، وَسَبَقْتُهُ فَدَخَلْتُ، فَلَيْسَ إِلَّا أَنْ اضْطَجَعْتُ، فَدَخَلَ فَقَالَ: مَا لَكِ يَا عَائِشَةُ حَشْيَا رَابِيَةً؟ قَالَتْ: لَا، قَالَ: لَتُخْبِرِنِّي أَوْ لَيُخْبِرَنِّي اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ؟ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي، فَأَخْبَرْتُهُ الْخَبَرَ، قَالَ: فَأَنْتِ السَّوَادُ الَّذِي رَأَيْتُهُ أَمَامِي؟ قَالَتْ: نَعَمْ، قَالَتْ: فَلَهَدَنِي فِي صَدْرِي لَهْدَةً أَوْجَعَتْنِي، ثُمَّ قَالَ: أَظَنَنْتِ أَنْ يَحِيفَ اللَّهُ عَلَيْكِ وَرَسُولُهُ، قَالَتْ: مَهْمَا يَكْتُمُ النَّاسُ فَقَدْ عَلِمَهُ اللَّهُ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: فَإِنَّ جِبْرِيلَ عَلَيْهِ السَّلَامُ أَتَانِي حِينَ رَأَيْتِ، وَلَمْ يَكُنْ يَدْخُلُ عَلَيْكِ، وَقَدْ وَضَعْتِ ثِيَابَكِ فَنَادَانِي، فَأَخْفَى مِنْكِ، فَأَجَبْتُهُ فَأَخْفَيْتُ مِنْكِ، فَظَنَنْتُ أَنْ قَدْ رَقَدْتِ، وَخَشِيتُ أَنْ تَسْتَوْحِشِي، فَأَمَرَنِي أَنْ آتِيَ أَهْلَ الْبَقِيعِ، فَأَسْتَغْفِرَ لَهُمْ»[1].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ئایا باسێکتان بۆ بکەم سەبارەت بە من و پێغەمبەر ﷺ؟ وتمان: بەڵێ، باسی بکە، وتی: کاتێ ئەو شەوەی نۆرەی من بوو لە لام بێت، (مەبەستی پێغەمبەر ﷺ بوو گەڕایەوە لە نوێژی عیشا) نەعلەکانی لە لای پێی دانا، هەروەها عەباکەی لەسەر شوێنی خەوەکەی ڕاخست، نەمایەوە بە ئەندازەی ئەوە نەبێت گومانی برد من خەوم لێکەوتووە، پاشان لەسەرخۆ نەعلەکانی لەپێ کرد، وە لەسەرخۆ عەباکەی هەڵگرت، پاشان لەسەرخۆ دەرگاکەی کردەوەو لەسەرخۆ دەرچووە دەرەوە، سەرپۆشەکەم لەسەر کردبوو پشتەماڵەکەشم دا بەخۆمدا، بە شوێنیدا ڕۆیشتم هەتا هاتە بەقیع، سێ جار دەستی بەرز کردەوە، بە پێیەوە ئەندازەیەکی زۆر وەستا، پاشان گەڕایەوە منیش گەڕامەوە، پەلەی کردو منیش پەلەم کرد، لەسەرخۆ ڕای کرد منیش رامکرد، ئەو گەیشت و منیش گەیشتم پێشی کەوتم چوومە ژوورەوە ڕاستەوخۆ پاڵکەوتم، ئەویش هاتە ژوورەوە فەرمووی: ئەوە چیە ئەی عائیشە هەناسەت سوار بووە؟ فەرمووی: خوای بەبەزەیی و کاربەجێ هەواڵی پێدام، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، دایک و باوکم بە قوربانت بن،**

---

**(١) صحيح.**

هەواڵەکەم پێیدا، فەرمووی: ئەو ڕەشاییە تۆ بووی لە پێش خۆم بینیم؟ وتم: بەڵێ، وتی: دای بەسەر سنگمدا بە لێدانێک ئازاری پێگەیاندم، فەرمووی: ئایا گومانت برد خواو پێغەمبەرەکەی ستەمیان لێکردووی؟ وتی: خەڵکی هەرچۆنێ بیشارنەوە خوا دەیزانێ؟، فەرمووی: بەڵێ، بێگومان جبریل هات بۆ لام کاتێ تۆ بینیت، بەڵام نەهاتە ژورەوە بۆ لات، کاتێ تۆ جلەکانت دانا بانگی کردم زۆر بە ئەسپایی لە تۆی شاردەوە، منیش وەڵامم دایەوەو لە تۆم شاردەوە، گومانم برد خەوتبی، حەزم نەکرد بە خەبەرت بهێنمەوە، لەوەش ترسام بترسی، فەرمانی پێکردم بچم بۆ بەقیع و داوای لێخۆشبونیان بۆ بکەم.

**٣٩٦٥-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: فَقَدْتُهُ مِنَ اللَّيْلِ وَسَاقَ الْحَدِيثَ»[١].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ شەوێک (بە هۆی تاریکی) لە پێش چاوم دیار نەما، ئینجا فەرموودەکەی هێنا.

---

(١) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ١٥٤٦.




**٣٩٦٦-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ الْمُشْرِكِينَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، فَإِذَا شَهِدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، وَصَلَّوْا صَلَاتَنَا، وَاسْتَقْبَلُوا قِبْلَتَنَا، وَأَكَلُوا ذَبَائِحَنَا، فَقَدْ حَرُمَتْ عَلَيْنَا دِمَاؤُهُمْ وَأَمْوَالُهُمْ، إِلَّا بِحَقِّهَا»[1].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: فەرمانم پێکراوە لەگەڵ هاوبەشدانەران بجەنگم تا شایەتی دەدەن بەوەی هیچ پەرستراوێک بە حەق نیە جگە لە خوا، وە موحەحەممەدیش بەندەو پێغەمبەری خوایە، جا ئەگەر شایەتیاندا بەوەی هیچ پەرستراوێک بە حەق نیە جگە لە خوا، وە موحەممەدیش بەندەو پێغەمبەری خوایە، وەکو ئێمە نوێژیان کردو ڕوویان کردە قیبلەکەمان و سەربڕاوەکانمانیان خوارد، ئەوە خوێن و ماڵیان لەسەر من قەدەغە بووە مەگەر بە حەقی ئیسلام (چونکە هاوبەشدانەران بڕیاری جەنگیان دابوو).**

**٣٩٦٧-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللَّهِ، فَإِذَا شَهِدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللَّهِ، وَاسْتَقْبَلُوا قِبْلَتَنَا، وَأَكَلُوا ذَبِيحَتَنَا، وَصَلَّوْا صَلَاتَنَا، فَقَدْ حَرُمَتْ عَلَيْنَا دِمَاؤُهُمْ، وَأَمْوَالُهُمْ، إِلَّا بِحَقِّهَا لَهُمْ مَا لِلْمُسْلِمِينَ وَعَلَيْهِمْ مَا عَلَيْهِمْ»[2].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فەرمانم پێکراوە لەگەڵ هاوبەشدانەران بجەنگم هەتا شایەتی دەدەن بەوەی هیچ پەرستراوێک بە حەق نیە جگە لە خوا، وە موحەحەممەدیش بەندەو پێغەمبەری خوایە، جا ئەگەر شایەتیاندا بەوەی هیچ پەرستراوێک بە حەق نیە جگە لە خوا، وە موحەممەدیش بەندەو پێغەمبەری خوایە، ڕویان کردە قیبلەکەمان و سەربڕاوەکانمانیان خواردو هەروەکو ئێمەش نوێژیان کرد، ئەوە خوێن و ماڵیان لەسەر ئێمە قەدەغە بووە، مەگەر بە حەقی ئیسلام، ئەوەی بۆ مسوڵمانان بێت بۆ ئەوانیشە، ئەوەشی لەسەر مسوڵمانان بێت لەسەر ئەوانیشە.**

---

**(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٩٢ و ٣٩٣، وأبو داود: ٢٦١٤، وإبن ماجه: ٢٦٠٨.**

**(٢) صحيح.**




**٣٩٦٨-** «عَنْ مَيْمُون بْنُ سِيَاهٍ، أنه سَأَلَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: يَا أَبَا حَمْزَةَ، مَا يُحَرِّمُ دَمَ الْمُسْلِمِ وَمَالَهُ؟ فَقَالَ: مَنْ شَهِدَ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللَّهِ، وَاسْتَقْبَلَ قِبْلَتَنَا، وَصَلَّى صَلَاتَنَا، وَأَكَلَ ذَبِيحَتَنَا فَهُوَ مُسْلِمٌ لَهُ مَا لِلْمُسْلِمِينَ وَعَلَيْهِ مَا عَلَى الْمُسْلِمِينَ»(١).

**واتە: مەیمونی کوڕی سیاه دەگێڕێتەوە: ئەو پرسیاری کرد لە ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ وتی: ئەی باوکی حەمزە، چی خوێن و ماڵی مسوڵمان قەدەغە دەکات؟ فەرمووی: هەرکەس شایەتی بدات هیچ پەرستراوێک بە حەق نیە جگە لە خوا، وە موحەممەدیش بەندەو پێغەمبەری خوایە، وە ڕوو بکاتە قیبلەی ئێمە و وەکو ئێمە نوێژ بکات و سەربڕاوەکانمان بخوات ئەوە مسوڵمانە، ئەوەی بۆ مسوڵمانان بێت بۆ ئەویشە، ئەوەشی لەسەر مسوڵمانان بێت لەسەر ئەویشە.**

**٣٩٦٩-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ارْتَدَّتِ الْعَرَبُ، فَقَالَ عُمَرُ: يَا أَبَا بَكْرٍ كَيْفَ تُقَاتِلُ الْعَرَبَ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: إِنَّمَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ، وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ، وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ، وَاللَّهِ لَوْ مَنَعُونِي عَنَاقاً مِمَّا كَانُوا يُعْطُونَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَقَاتَلْتُهُمْ عَلَيْهِ، قَالَ عُمَرُ: فَلَمَّا رَأَيْتُ رَأْيَ أَبِي بَكْرٍ قَدْ شُرِحَ عَلِمْتُ أَنَّهُ الْحَقُّ»(٢).

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد عەرەبەکان هەڵگەڕانەوە، عومەر وتی: ئەی ئەبو بەکر چۆن کوشتاری عەرەب دەکەی، ئەبو بەکر وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فەرمانم پێکراوە لەگەڵ خەڵک بجەنگم تا دەڵێن: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) هیچ پەرستراوێک بە حەق نیە جگە لە خوا، وە منیش پێغەمبەری خوام، وە نوێژ دەکەن و زەکاتیش دەدەن، سوێند بەخوا ئەگەر ڕێگری بکەن گوریسێکم نەدەنێ کە پێشتر دابێتیان بە پێغەمبەری خوا ﷺ جەنگیان لەگەڵ دەکەم لەسەر نەدانی، عومەر وتی: کاتێ بۆچوونی ئەبو بەکرم بینی دڵی کراوەتەوە بۆم دەرکەوت ئەو لەسەر حەقە.**

**٣٩٧٠-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: لَمَّا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَاسْتُخْلِفَ أَبُو بَكْرٍ، وَكَفَرَ مَنْ كَفَرَ مِنَ الْعَرَبِ، قَالَ عُمَرُ لِأَبِي بَكْرٍ: كَيْفَ تُقَاتِلُ النَّاسَ، وَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ

---

**(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٩١ و ٣٩٢ و ٣٩٣.**

**(٢) حسن صحيح.**

النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ فَمَنْ قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، عَصَمَ مِنِّي مَالَهُ وَنَفْسَهُ، إِلَّا بِحَقِّهِ وَحِسَابُهُ عَلَى اللَّهِ « قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَاللَّهِ لَأُقَاتِلَنَّ مَنْ فَرَّقَ بَيْنَ الصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ، فَإِنَّ الزَّكَاةَ حَقُّ الْمَالِ، وَاللَّهِ لَوْ مَنَعُونِي عِقَالاً كَانُوا يُؤَدُّونَهُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَقَاتَلْتُهُمْ عَلَى مَنْعِهِ، قَالَ عُمَرُ: فَوَاللَّهِ مَا هُوَ إِلَّا أَنِّي رَأَيْتُ اللَّهَ شَرَحَ صَدْرَ أَبِي بَكْرٍ لِلْقِتَالِ فَعَرَفْتُ أَنَّهُ الْحَقُّ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد و ئەبو بەکر بوو بە جێنشینی، ئەوەیشی هەڵگەڕایەوە لە عەرەب هەڵگەڕایەوە، عومەر بە ئەبو بەکری وت: چۆن لەگەڵ ئەو خەڵکەدا دەجەنگی لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فەرمانم پێکراوە لەگەڵ خەڵک بجەنگم هەتا دەڵێن: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) هیچ پەرستراوێک بە حەق نیە جگە لە خوا، هەر کەس وتی: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) ئەوە ماڵ و نەفسی لە من پارێزراو دەبێ، مەگەر بە حەقی ئیسلام، لێپرسینەوەیشی لە لای خوا دەبێ، ئەبو بەکر وتی: سوێند بەخوا دەجەنگم لەگەڵ ئەوەی نوێژو زەکات لە یەکتر جیابکاتەوە، چونکە زەکات حەقی سەروەت و سامانە، سوێند بە خوا دەجەنگم لەگەڵ ئەوەی جیاوازی بخاتە نێوان نوێژ و زەکات، چونکە زەکات مافی ماڵ و سامانە، سوێند بەخوا ئەگەر ڕێگری بکەن گوریسێکم نەدەنێ کە پێشتر دابێتیان بە پێغەمبەری خوا ﷺ جەنگیان لەگەڵ دەکەم لەسەر نەدانی، عومەر وتی: سوێند بەخوا تەنها خوا دڵی ئەبو بەکری خستە سەر بڕیاردانی جەنگ، منیش بۆم دەرکەوت کە ئەو لەسەر حەقە.

**٣٩٧١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَإِذَا قَالُوهَا فَقَدْ عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ، إِلَّا بِحَقِّهَا وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللَّهِ، فَلَمَّا كَانَتِ الرِّدَّةُ، قَالَ عُمَرُ لِأَبِي بَكْرٍ: أَتُقَاتِلُهُمْ وَقَدْ سَمِعْتَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: كَذَا، وَكَذَا، فَقَالَ: وَاللَّهِ لَا أُفَرِّقُ بَيْنَ الصَّلَاةِ، وَالزَّكَاةِ، وَلَأُقَاتِلَنَّ مَنْ فَرَّقَ بَيْنَهُمَا، فَقَاتَلْنَا مَعَهُ فَرَأَيْنَا ذَلِكَ رُشْداً»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: فەرمانم پێکراوە بجەنگم لەگەڵ خەڵکیدا تا دەڵێن: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) هیچ کەس شیاوی پەرستش نیە جگە لە خوا، جا ئەگەر وتیان ئەوە خوێن و ماڵیان لەسەر من پارێزراو دەبێ مەگەر

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.



بە حەقی ئیسلام، لێپرسینەوەشیان لای خوایە، کاتێ کە عەرەبەکان هەڵگەڕانەوە عومەر بە ئەبو بەکری وت: ئایا جەنگیان لەگەڵا دەکەی لە کاتێکدا بیستووتە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاواو ئاوای دەفەرموو، ئەویش وتی: سوێند بە خوا نوێژو زەکات لە یەکتر جیاناکەمەوە، هەرکەسیش جیایان بکاتەوە جەنگی لەگەڵ دەکەم، ئێمەیش لەگەڵیدا جەنگاین و بۆمان دەرکەوت کە ئەوە سەر ڕاستییە.

**٣٩٧٢-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَمَنْ قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، عَصَمَ مِنِّي مَالَهُ وَنَفْسَهُ، إِلَّا بِحَقِّهِ وَحِسَابُهُ عَلَى اللَّهِ ﷻ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: فەرمانم پێکراوە بجەنگم لەگەڵ خەڵکیدا هەتا دەڵێن: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) هیچ کەس شیاوی پەرستش نیە جگە لە خوا، هەرکەس وتی: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) ئەوە ماڵ و نەفسی لە من پارێزراو دەبێ مەگەر بە حەقی ئیسلام، لێپرسینەوەشی لای خوایە ﷻ.

**٣٩٧٣-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: لَمَّا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ بَعْدَهُ، وَكَفَرَ مَنْ كَفَرَ مِنَ الْعَرَبِ، قَالَ عُمَرُ: يَا أَبَا بَكْرٍ، كَيْفَ تُقَاتِلُ النَّاسَ وَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ فَمَنْ قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَقَدْ عَصَمَ مِنِّي مَالَهُ وَنَفْسَهُ، إِلَّا بِحَقِّهِ وَحِسَابُهُ عَلَى اللَّهِ ﷻ « قَالَ أَبُو بَكْرٍ: لَأُقَاتِلَنَّ مَنْ فَرَّقَ بَيْنَ الصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ، فَإِنَّ الزَّكَاةَ حَقُّ الْمَالِ فَوَاللَّهِ لَوْ مَنَعُونِي عَنَاقاً، كَانُوا يُؤَدُّونَهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَقَاتَلْتُهُمْ عَلَى مَنْعِهَا، قَالَ عُمَرُ: فَوَاللَّهِ مَا هُوَ إِلَّا أَنْ رَأَيْتُ اللَّهَ شَرَحَ صَدْرَ أَبِي بَكْرٍ لِلْقِتَالِ فَعَرَفْتُ أَنَّهُ الْحَقُّ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد و ئەبو بەکر بووبە جێنشینی، ئەوەیشی هەڵگەڕایەوە لە عەرەب هەڵگەڕایەوە، عومەر وتی: ئەی ئەبو بەکر چۆن لەگەڵ ئەو خەڵکەدا دەجەنگی لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فەرمانم پێکراوە لەگەڵ خەڵک بجەنگم هەتا دەڵێن: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) هیچ پەرستراوێک بە حەق نیە جگە لە خوا، هەرکەس وتی: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) ئەوە ماڵ و نەفسی لە من پارێزراوە مەگەر بە حەقی ئیسلام، لێپرسینەوەیشی لە لای

---

(١) صحيح متواتر. أخرجه البخاري: ٢٩٤٦، ومسلم: ٢١.

(٢) صحيح.




خوایە، ئەبو بەکر وتی: سوێند بە خوا دەجەنگم لەگەڵ ئەوەی نوێژو زەکات لە یەکتر جیا بکاتەوە، چونکە زەکات حەقی سەروەت و سامانە، بێگومان دەجەنگم لەگەڵ ئەوەی جیاوازی بخاتە نێوان نوێژ و زەکات، چونکە زەکات مافی ماڵ و سامانە، سوێند بە خوا ئەگەر ڕێگری بکەن گوریسێکم نەدەنێ کە پێشتر دابێتیان بە پێغەمبەری خوا ﷺ جەنگیان لەگەڵ دەکەم لەسەر نەدانی، عومەر وتی: سوێند بە خوا تەنها خوا دڵی ئەبو بەکری خستە سەر بڕیاردانی جەنگ، منیش بۆم دەرکەوت کە ئەو لە سەر حەقە.

**٣٩٧٤-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيِّبِ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ، أَخْبَرَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَمَنْ قَالَهَا فَقَدْ عَصَمَ مِنِّي نَفْسَهُ وَمَالَهُ، إِلَّا بِحَقِّهِ وَحِسَابُهُ عَلَى اللَّهِ»[١].

**واتە: سەعیدی کوڕی موسەیب دەگێڕێتەوە: ئەبو هورەیرە ﷺ هەواڵی پێداوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: فەرمانم پێکراوە بجەنگم لەگەڵ خەڵکیدا تا دەڵێن: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) هیچ کەس شیاوی پەرستش نیە جگە لە خوا، هەرکەس وتی ئەوە ماڵ و نەفسی لە من پارێزراو دەبێ مەگەر بە حەقی ئیسلام، لێپرسینەوەشی لای خوایە.**

**٣٩٧٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: فَأَجْمَعَ أَبُو بَكْرٍ لِقِتَالِهِمْ، فَقَالَ عُمَرُ: يَا أَبَا بَكْرٍ، كَيْفَ تُقَاتِلُ النَّاسَ وَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَإِذَا قَالُوهَا عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ، إِلَّا بِحَقِّهَا، قَالَ أَبُو بَكْرٍ: لَأُقَاتِلَنَّ مَنْ فَرَّقَ بَيْنَ الصَّلَاةِ، وَالزَّكَاةِ وَاللَّهِ لَوْ مَنَعُونِي عَنَاقاً كَانُوا يُؤَدُّونَهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَقَاتَلْتُهُمْ عَلَى مَنْعِهَا، قَالَ عُمَرُ: فَوَاللَّهِ مَا هُوَ إِلَّا أَنْ رَأَيْتُ اللَّهَ قَدْ شَرَحَ صَدْرَ أَبِي بَكْرٍ لِقِتَالِهِمْ فَعَرَفْتُ أَنَّهُ الْحَقُّ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: ئەبو بەکر کۆی کردنەوە بۆ جەنگ کردن لەگەڵ هەڵگەڕاوەکان، عومەر وتی: ئەی ئەبو بەکر چۆن لەگەڵ ئەو خەڵکەدا دەجەنگی لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فەرمانم پێکراوە لەگەڵ خەڵک بجەنگم هەتا دەڵێن: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) هیچ پەرستراوێک بە حەق نیە جگە لە خوا، ئەگەر وتیان خوێن و ماڵیان لەسەر من قەدەغە دەبێ مەگەر بە حەقی ئیسلام، ئەبو بەکر وتی:

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




**سوێند بە خوا دەجەنگم لەگەڵ ئەوەی نوێژو زەکات لە یەکتر جیا بکاتەوە، سوێند بەخوا ئەگەر ڕێگری بکەن گوریسێکم نەدەنێ کە پێشتر دابێتیان بە پێغەمبەری خوا ﷺ جەنگیان لەگەڵ دەکەم لەسەر نەدانی، عومەر وتی: سوێند بەخوا تەنها خوا دڵی ئەبو بەکری خستە سەر بڕیاردانی جەنگ، منیش بۆم دەرکەوت کە ئەو لەسەر حەقە.**

**٣٩٧٦-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَإِذَا قَالُوهَا مَنَعُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ، وَأَمْوَالَهُمْ إِلَّا بِحَقِّهَا، وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللَّهِ ﷻ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فەرمانم پێکراوە لەگەڵ خەڵک بجەنگم تا دەڵێن: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) هیچ پەرستراوێک بە حەق نیە جگە لە خوا، ئەگەر وتیان خوێن و ماڵیان لەسەر من قەدەغە دەبێ مەگەر بە حەقی ئیسلام، لێپرسینەوەشیان لای خوایە ﷻ.**

**٣٩٧٧-** «عَنْ جَابِرٍ وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَا: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَإِذَا قَالُوهَا، مَنَعُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ، إِلَّا بِحَقِّهَا وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللَّهِ»[٢].

**واتە: جابرو ئەبو هورەیرە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فەرمانم پێکراوە لەگەڵ خەڵک بجەنگم تا دەڵێن: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) هیچ پەرستراوێک بە حەق نیە جگە لە خوا، ئەگەر وتیان، خوێن و ماڵیان لەسەر من قەدەغە دەبێ مەگەر بە حەقی ئیسلام، لێپرسینەوەشیان لای خوایە ﷻ.**

**٣٩٧٨-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: نُقَاتِلُ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَإِذَا قَالُوا لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، حَرُمَتْ عَلَيْنَا دِمَاؤُهُمْ وَأَمْوَالُهُمْ، إِلَّا بِحَقِّهَا وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللَّهِ»[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لەگەڵ خەڵک دەجەنگین هەتا دەڵێن: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) هیچ پەرستراوێک بە حەق نیە جگە**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) حسن صحيح.

**لە خوا، ئەگەر وتیان، خوێن و ماڵیان لەسەر ئێمە قەدەغە دەبێ مەگەر بە حەقی ئیسلام، لێپرسینەوەشیان لای خوایە ﷻ.**

**٣٩٧٩-** «عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، فَجَاءَ رَجُلٌ فَسَارَّهُ، فَقَالَ: اقْتُلُوهُ، ثُمَّ قَالَ: أَيَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ؟ قَالَ: نَعَمْ، وَلَكِنَّمَا يَقُولُهَا تَعَوُّذاً، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تَقْتُلُوهُ، فَإِنَّمَا أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَإِذَا قَالُوهَا عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ، إِلَّا بِحَقِّهَا وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللَّهِ»[١].

**واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووین، پیاوێک هات چپانی بە گوێیدا، (دەربارەی ئەوەی مۆڵەتی بدات پیاوێک لە دووڕووەکان هەیە بیکوژێت)، فەرمووی: بیکوژن، پاشان فەرمووی: ئایا شایەتی دەدا بە (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) وتی: بەڵێ، بەڵام لەبەر ئەوەی شایەتی دەدا بیێتە پەناگە بۆ ئەوەی نەکوژێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: مەیکوژن، چونکە فەرمانم پێکراوە لەگەڵ خەڵک بجەنگم تا دەڵێن: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) هیچ پەرستراوێک بە حەق نیە جگە لە خوا، ئەگەر وتیان خوێن و ماڵیان لەسەر من قەدەغە دەبێ مەگەر بە حەقی ئیسلام، لێپرسینەوەشیان لەسەر خوایە.**

**٣٩٨٠-** «عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ سَالِمٍ ﷺ قَالَ: دَخَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَنَحْنُ فِي قُبَّةٍ فِي مَسْجِدِ الْمَدِينَةِ، وَقَالَ فِيهِ: إِنَّهُ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ»[٢].

**واتە: نوعمانی کوڕی سالم ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەوە بۆ ناومان ئێمەش لە ناو دەوارێک بووین لە ناو مزگەوتی مەدینە، فەرمووی: وەحی و نیگام بۆ هاتووە لەگەڵ خەڵک بجەنگم تا دەڵێن: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) هیچ پەرستراوێک بە حەق نیە جگە لە خوا ﷻ.**

**٣٩٨١-** «عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ سَالِمٍ ﷺ قَالَ سَمِعْتُ أَوْساً يَقُولُ: دَخَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَنَحْنُ فِي قُبَّةٍ وَسَاقَ الْحَدِيثَ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




**واتە: نوعمانی کوڕی سالم ﷺ دەڵێ: گوێم لە ئەوس بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ ناومان ئێمەش لەناو دەوارێک بووین فەرموودەکەی باس کرد.**

**٣٩٨٢-** «عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ سَالِمٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ أَوْساً يَقُولُ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي وَفْدِ ثَقِيفٍ، فَكُنْتُ مَعَهُ فِي قُبَّةٍ، فَنَامَ مَنْ كَانَ فِي الْقُبَّةِ غَيْرِي وَغَيْرُهُ، فَجَاءَ رَجُلٌ، فَسَارَّهُ، فَقَالَ: اذْهَبْ فَاقْتُلْهُ، فَقَالَ: أَلَيْسَ يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ؟ قَالَ: يَشْهَدُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: ذَرْهُ، ثُمَّ قَالَ: أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَإِذَا قَالُوهَا حَرُمَتْ دِمَاؤُهُمْ وَأَمْوَالُهُمْ، إِلَّا بِحَقِّهَا « قَالَ مُحَمَّدٌ: فَقُلْتُ لِشُعْبَةَ: أَلَيْسَ فِي الْحَدِيثِ أَلَيْسَ يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ؟ قَالَ: أَظُنُّهَا مَعَهَا، وَلَا أَدْرِي»[1].

**واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دەڵێ: گوێم لە ئەوس بوو دەیوت: هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ نوێنەری سەقیف، من لە دەوارێکدا بووم لەگەڵی، ئەوەی لە ناو دەوارەکە بوو خەوت جگە لە پێغەمبەری خوا ﷺ، پیاوێک هات بە پەنهان قسەی بۆ کرد (دەربارەی پیاوێک لە دووڕووەکان) فەرمووی: بڕۆ بیکوژە، پاشان فەرمووی: ئایا شایەتی دەدا بە (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) هیچ پەرستراوێک بە حەق نیە جگە لە خوا، وە بەوەی من پێغەمبەری خوام؟ وتی: شایەتی دەدا، فەرمووی: وازی لێ بێنە، پاشان فەرمووی: فەرمانم پێکراوە لەگەڵ خەڵک بجەنگم تا دەڵێن: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) هیچ پەرستراوێک بە حەق نیە جگە لە خوا، ئەگەر وتیان، خوێن وماڵیان قەدەغە دەبێ، مەگەر بە حەقی ئیسلام موحەممەد وتی: بە شوعبەم وت: ئایا فەرموودەکە (أَلَيْسَ يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ) تێدانیە؟ وتی: گومان دەبەم لەگەڵیدا بووبێ، وە ناشزانم.**

**٣٩٨٣-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ أَوْسٍ، أَنَّ أَبَاهُ أَوْساً ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، ثُمَّ تَحْرُمُ دِمَاؤُهُمْ وَأَمْوَالُهُمْ، إِلَّا بِحَقِّهَا»[2].

**واتە: عەمری کوڕی ئەوس دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فەرمانم پێکراوە لەگەڵ خەڵک بجەنگم تا شایەتی دەدەن بە (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) هیچ پەرستراوێک بە حەق نیە جگە لە خوا، پاشان خوێن و ماڵیان قەدەغە دەبێ، مەگەر بە حەقی ئیسلام.**

---

(١) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ٣٩٢٩.

(٢) صحيح.

**٣٩٨٤-** «عَنْ أَبِي إِدْرِيسَ قَالَ: سَمِعْتُ مُعَاوِيَةَ ﷺ يَخْطُبُ «وَكَانَ قَلِيلَ الْحَدِيثِ»، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُهُ يَخْطُبُ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: كُلُّ ذَنْبٍ عَسَى اللَّهُ أَنْ يَغْفِرَهُ، إِلَّا الرَّجُلُ يَقْتُلُ الْمُؤْمِنَ مُتَعَمِّداً، أَوِ الرَّجُلُ يَمُوتُ كَافِراً»[١].

**واتە: ئەبو ئیدریس دەڵێ: گوێم لە موعاویە ﷺ بوو وتاری دەدا «جا زۆر کەم لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموودەی باس دەکرد» وتی: گوێم لێ بوو دەیوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەموو گوناهێک ئومێدی لێخۆشبوونی لێدەکرێ مەگەر ئەو پیاوەی ئیماندارێک بە ئەنقەست بکوژێ، یان پیاوێک بە بێبڕوای بمرێ.**

**٣٩٨٥-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَا تُقْتَلُ نَفْسٌ ظُلْماً إِلَّا كَانَ عَلَى ابْنِ آدَمَ الْأَوَّلِ كِفْلٌ مِنْ دَمِهَا، وَذَلِكَ أَنَّهُ أَوَّلُ مَنْ سَنَّ الْقَتْلَ»[٢].

**واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر نەفسێک بە ناحەق بکوژرێ ئیللا یەکەم کەس لە نەوەی ئادەم بەشێکی هەیە لە کوشتنەکەیدا، چونکە ئەو یەکەم کەس بوو کوشتنی داهێنا.**

## گەورەیی تاوانی خوێن ڕشتن و مرۆڤ کوشتن

**٣٩٨٦-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَقَتْلُ مُؤْمِنٍ أَعْظَمُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ زَوَالِ الدُّنْيَا» [٣].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوێند بەو خوایەی نەفسی منی بەدەستە، کوشتنی بڕوادارێک گەورەترە لای خوا لە نەمانی هەموو دونیا.**

**٣٩٨٧-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَزَوَالُ الدُّنْيَا أَهْوَنُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ قَتْلِ رَجُلٍ مُسْلِمٍ»[٤].

---

**(١) صحيح لغيره.**

**(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٣٣٥ و ٦٨٦٧ و ٢٣٢١، ومسلم: ١٦٧٧، والترمذي: ٢٦٧٣، وإبن ماجه: ٢٦١٦.**

**(٣) صحيح.**

**(٤) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٣٩٥.**





**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: تێکچوون و نەمانی دونیا لای خوا ئاسانترە لە کوشتنی پیاوێکی مسوڵمان.**

**٣٩٨٨-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَتْلُ الْمُؤْمِنِ أَعْظَمُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ زَوَالِ الدُّنْيَا»(١).

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: کوشتنی بڕوادارێک مەزنترە لای خوا لە نەمانی دونیا.**

**٣٩٨٩-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَتْلُ الْمُؤْمِنِ أَعْظَمُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ زَوَالِ الدُّنْيَا»(٢).

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: کوشتنی بڕوادارێک مەزنترە لای خوا لە نەمانی دونیا.**

**٣٩٩٠-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: قَتْلُ الْمُؤْمِنِ أَعْظَمُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ زَوَالِ الدُّنْيَا»(٣)

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی بورەیدە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کوشتنی بڕوادارێک مەزنترە لای خوا لە نەمانی دونیا.**

**٣٩٩١-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَوَّلُ مَا يُحَاسَبُ بِهِ الْعَبْدُ الصَّلَاةُ، وَأَوَّلُ مَا يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ فِي الدِّمَاءِ»(٤).

**واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەکەم شت بەندە لێپرسینەوەی لەسەر دەکرێ نوێژە، یەکەم شت دادوەری لەسەر دەکرێ لە ناو خەڵکیدا لەبارەی خوێن ڕشتنەکانەوەیە.**

---

(١) صحيح موقوف.

(٢) صحيح موقوف.

(٣) حسن.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٥٣٣ و ٦٨٦٤، ومسلم: ١٦٧٨، والترمذي: ١٣٩٦ و ١٣٩٧، وإبن ماجه: ٢٦١٥ و ٢٦١٧.




**٣٩٩٢-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَوَّلُ مَا يُحْكَمُ بَيْنَ النَّاسِ فِي الدِّمَاءِ»[١].

**واته: عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەکەم شتێک دادوەری لەسەر دەکرێ لەناو خەڵکیدا لە بارەی خوێن ڕشتنەکانەوەیە.**

**٣٩٩٣-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَوَّلُ مَا يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِي الدِّمَاءِ»[٢].

**واته: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: یەکەم شتێک دادوەری لەسەر دەکرێ لەناو خەڵکیدا لە ڕۆژی دوایی لەبارەی خوێن ڕشتنەکانەوەیە.**

**٣٩٩٤-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَوَّلُ مَا يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِي الدِّمَاءِ»[٣].

**واته: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: یەکەم شتێک دادوەری لەسەر دەکرێ لەناو خەڵکیدا لە ڕۆژی دوایی لە بارەی خوێن ڕشتنەکانەوەیە.**

**٣٩٩٥-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُرَحْبِيلَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَوَّلُ مَا يُقْضَى فِيهِ بَيْنَ النَّاسِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِي الدِّمَاءِ»[٤].

**واته: عەمری کوڕی شورەحبیل ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەکەم شتێک دادوەری لەسەر دەکرێ لە ناو خەڵکیدا لە ڕۆژی دوایی لە بارەی خوێن ڕشتنەکانەوەیە.**

**٣٩٩٦-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَوَّلُ مَا يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ فِي الدِّمَاءِ»[٥].

**واته: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: یەکەم شتێک دادوەری لەسەر دەکرێ لەناو خەڵکیدا لە بارەی خوێن ڕشتنەکانەوەیە.**

**٣٩٩٧-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: يَجِيءُ الرَّجُلُ آخِذاً بِيَدِ الرَّجُلِ فَيَقُولُ: يَا رَبِّ، هَذَا قَتَلَنِي، فَيَقُولُ اللَّهُ لَهُ: لِمَ قَتَلْتَهُ؟ فَيَقُولُ: قَتَلْتُهُ لِتَكُونَ الْعِزَّةُ لَكَ، فَيَقُولُ: فَإِنَّهَا لِي.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح موقوف.

(٣) صحيح موقوف.

(٤) صحيح لغيره.

(٥) صحيح موقوف.




وَيَجِيءُ الرَّجُلُ آخِذاً بِيَدِ الرَّجُلِ فَيَقُولُ: إِنَّ هَذَا قَتَلَنِي، فَيَقُولُ اللَّهُ لَهُ: لِمَ قَتَلْتَهُ؟ فَيَقُولُ: لِتَكُونَ الْعِزَّةُ لِفُلَانٍ، فَيَقُولُ: إِنَّهَا لَيْسَتْ لِفُلَانٍ فَيَبُوءُ بِإِثْمِهِ»[١].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پیاوێک دێت دەستی پیاوێکی تری گرتووە دەڵێ: ئەی پەروەردگارم، ئەمە منی کوشت، خواش پێی دەفەرموێ: بۆچی کوشتت؟ ئەویش ئەڵێ: لەبەر ئەوە عیزەت و دەسەڵات تەنها بۆ تۆ بێت، دەفەرموێ: ئەوە بێگومان بۆ منە، وە پیاوێکی تر دێت دەستی پیاوێکی تری گرتووە، دەڵێ: ئەمە منی کوشت، خوا پێی دەفەرموێ: بۆچی کوشتت؟ دەڵێ: لەبەر ئەوە عیزەت و دەسەڵات تەنها بۆ فڵانە کەس بێت، دەفەرموێ: ئەوە بۆ فڵانە کەس نەبوو، پاشان بکوژەکە بە تاوانەکەیەوە دەگەڕێتەوە.**

**٣٩٩٨-** «عَنْ جُنْدَبٍ ﷺ قال: حَدَّثَنِي فُلَانٌ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: يَجِيءُ الْمَقْتُولُ بِقَاتِلِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيَقُولُ: سَلْ هَذَا فِيمَ قَتَلَنِي، فَيَقُولُ: قَتَلْتُهُ عَلَى مُلْكِ فُلَانٍ، قَالَ جُنْدَبٌ: فَاتَّقِهَا»[٢].

**واتە: جوندوب ﷺ دەڵێ: فڵانە کەس بۆی باس کردم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کوژراو بکوژ دەهێنێ لە ڕۆژی دواییدا دەڵێ: پرسیار لەمە بکە بۆچی منی کوشت، ئەویش دەڵی: لەبەر دەسەڵات، جوندوب دەڵێ: خۆت بپارێزە. (واتە: خۆت بپارێزە لەو تاوانە قیزەونەی کە دەتبات بۆ لای ئەو وەڵامە).**

**٣٩٩٩-** «عَنِ سَالِمِ بن أبي الْجَعْدِ أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا سُئِلَ عَمَّنْ قَتَلَ مُؤْمِناً مُتَعَمِّداً، ثُمَّ تَابَ وَآمَنَ، وَعَمِلَ صَالِحاً، ثُمَّ اهْتَدَى، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: وَأَنَّى لَهُ التَّوْبَةُ، سَمِعْتُ نَبِيَّكُمْ ﷺ يَقُولُ: يَجِيءُ مُتَعَلِّقاً بِالْقَاتِلِ تَشْخَبُ أَوْدَاجُهُ دَماً، فَيَقُولُ: أَيْ رَبِّ، سَلْ هَذَا فِيمَ قَتَلَنِي، ثُمَّ قَالَ: وَاللَّهِ لَقَدْ أَنْزَلَهَا اللَّهُ، ثُمَّ مَا نَسَخَهَا»[٣].

**واتە: سالمی کوڕی ئەبولجەعد دەگێڕێتەوە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) پرسیاری لێکرا لە بارەی کەسێکەوە مسوڵمانێک بکوژێ بە ناحەق و پاشان تەوبە بکات و کردەوەی چاک ئەنجام بدات، پاشان ڕێنماییش وەربگرێ، ئیبنو عەبباس وتی: چۆن تەوبەی لێوەردەگیرێ، گوێم لە پێغەمبەرەکەتان ﷺ بوو دەیفەرموو:**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ٢٦٢١.




كوژراو لە ڕۆژی دواییدا دێت خۆی هەڵواسیوە بە بكوژدا دەمارەكانی گەردنی خوێنی لێ دەچۆڕێ، دەڵێ: ئەی پەروەردگارم، پرسیار لەمە بكە بۆچی منی كوشت، پاشان وتی: سوێند بە خوا خوا ئایەتی: (﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا ﴿٩٣﴾ ﴾ النساء) دابەزاند) پاشان نەسخی كردەوە.

**٤٠٠٠-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: اخْتَلَفَ أَهْلُ الْكُوفَةِ فِي هَذِهِ الْآيَةِ: ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا ﴿٩٣﴾ ﴾النساء، فَرَحَلْتُ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ: لَقَدْ أُنْزِلَتْ فِي آخِرِ مَا أُنْزِلَ ثُمَّ مَا نَسَخَهَا شَيْءٌ»[1].

واتە: سەعیدی كوڕی جوبەیر دەڵێ: خەڵكی كوفە جیاوازیان هەبوو لە (تەفسیری) ئەم ئایەتەدا: ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا ﴿٩٣﴾ ﴾ (واتە: هەر كەس بڕوادارێك بكوژێ بە ئەنقەست)، ڕۆیشتم بۆ لای ئیبنو عەبباس پرسیارم لێكرد، وتی: بێگومان ئەم ئایەتە لە كۆتاییدا دابەزی پاشان شتێك نەسخی كردەوە.

**٤٠٠١-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ: هَلْ لِمَنْ قَتَلَ مُؤْمِناً مُتَعَمِّداً مِنْ تَوْبَةٍ؟ قَالَ: لَا، وَقَرَأْتُ عَلَيْهِ الْآيَةَ الَّتِي فِي الْفُرْقَانِ: ﴿وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ ﴿٦٨﴾ ﴾الفرقان، قَالَ: هَذِهِ آيَةٌ مَكِّيَّةٌ، نَسَخَتْهَا آيَةٌ مَدَنِيَّةٌ، ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ ﴿٩٣﴾ ﴾النساء»[2].

واتە: سەعیدی كوڕی جوبەیر دەڵێ: بە ئیبنو عەبباسم وت: ئایا كەسێك بڕوادارێك بە ئەنقەست بكوژێ تەوبەی بۆ هەیە؟ وتی: نەخێر، وە ئەو ئایەتەم بۆی خوێندەوە كە لە قورئاندا هاتوە: ﴿وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ ﴿٦٨﴾ ﴾ (واتە: وە كەسانێكن لەگەڵ خوادا ناپەرستن هیچ پەرستراوێكی دیكەو، ناكوژن هیچ كەسێك كە خوا كوشتنی ئەوی قەدەغە كردوە بە حەق نەبێت)، وتی: ئەم ئایەتە مەككیە، ئایەتێكی مەدینە نەسخی كردۆتەوە: ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ ﴿٩٣﴾ ﴾ (واتە: هەركەس بڕوادارێ بكوژێ بە ئەنقەست ئەوە تۆڵەی ئەو كەسە دۆزەخە).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٨٥٥ و ٤٥٩٠ و ٤٧٦٣ و ٤٧٦٤ و ٤٧٦٥ و ٤٧٦٦، ومسلم: ١٧ و ٣٠٢٣/٢٠، وأبو داود: ٤٢٧٣ و ٤٢٧٥، والترمذي: ٣٠٢٩.




**٤٠٠٢-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: أَمَرَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي لَيْلَى أَنْ أَسْأَلَ ابْنَ عَبَّاسٍ عَنْ هَاتَيْنِ الْآيَتَيْنِ: ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ ﴿٩٣﴾ ﴾النساء، فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ: لَمْ يَنْسَخْهَا شَيْءٌ، وَعَنْ هَذِهِ الْآيَةِ: ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ﴿٦٨﴾ ﴾الفرقان، قَالَ: نَزَلَتْ فِي أَهْلِ الشِّرْكِ»[1].

**واتە: سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو لەیلا فەرمانی پێکردم پرسیار بکەم لە ئیبنو عەبباس لەبارەی ئەم دوو ئایەتەوە: ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ ﴿٩٣﴾ ﴾ (واتە: هەرکەس بڕوادارێک بکوژێ بە ئەنقەست ئەوە تۆڵەی ئەو کەسە دۆزەخە)، پرسیارم لێکرد، وتی: هیچ شتێک نەسخی نەکردۆتەوە، وە پرسیارم لێکرد لەبارەی ئەم ئایەتەوە: ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ﴿٦٨﴾ ﴾ (واتە: وە کەسانێکن لەگەڵ خوادا هیچ پەرستراوێکی تر ناپەرستن و هیچ کەسێیش ناکوژن کە خوا کوشتنی ئەوی قەدەغە کردوە بە حەق نەبێت)، وتی: ئەوە لەبارەی هاوبەشدانەرانەوە دابەزیوە.**

**٤٠٠٣-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ قَوْماً كَانُوا قَتَلُوا، فَأَكْثَرُوا وَزَنَوْا، فَأَكْثَرُوا وَانْتَهَكُوا، فَأَتَوْا النَّبِيَّ ﷺ قَالُوا: يَا مُحَمَّدُ، إِنَّ الَّذِي تَقُولُ وَتَدْعُو إِلَيْهِ لَحَسَنٌ، لَوْ تُخْبِرُنَا أَنَّ لِمَا عَمِلْنَا كَفَّارَةً، فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ: ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ ﴿٦٨﴾ ﴾الفرقان، إِلَى: ﴿ فَأُوْلَـٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَـٰتٍ ﴿٧٠﴾ ﴾الفرقان، قَالَ: يُبَدِّلُ اللَّهُ شِرْكَهُمْ إِيمَاناً وَزِنَاهُمْ إِحْصَاناً وَنَزَلَتْ: ﴿ قُلْ يَـٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ ﴿٥٣﴾ ﴾الزمر»[2].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: خەڵکانێک هەبوون لە هاوبەشدانەران زۆریان کوشتبوو و زینای زۆریشیان کردبوو، سنووریان زۆر بەزاندبوو، هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتیان: ئەی موحەممەد بەڕاستی ئەوەی تۆ دەیڵێی و بانگەشەی بۆ دەکەیت چاکە، ئەگەر هەواڵمان بە شتێک پێ بدەی لەوەی کردوومانە ببێتە کەفارەت بۆمان، خوا ﷻ ئەم ئایەتەی دابەزاندە خوارەوە: ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ ﴿٦٨﴾ ﴾ (واتە: وە کەسانێکن لەگەڵ خوادا هیچ پەرستراوێکی تر ناپەرستن)، تا دەگاتە: ﴿ فَأُوْلَـٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَـٰتٍ ﴿٧٠﴾ ﴾ (واتە: ئەوانە خوا ﷻ خراپەکانیان بۆ دەگۆڕێت بە چاکە)، وتی: خوا هاوبەش**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٧٦٢، ومسلم: ١٢٢، وأبو داود: ٤٢٧٤.





**دانانەکەیان بۆ دەکات بە ئیمان، زینایشیان بۆ دەکات بە داوێن پاکی، وە ئەم ئایەتەیش دابەزیە خوارەوە: ﴿ قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ ﴿٥٣﴾ ﴾ (واتە: بڵێ: ئەی بەندەکانم ئەی ئەوانەی کە خۆتان زۆر گوناهبار کردوە).**

**٤٠٠٤-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ نَاساً مِنْ أَهْلِ الشِّرْكِ أَتَوْا مُحَمَّداً، فَقَالُوا: إِنَّ الَّذِي تَقُولُ وَتَدْعُو إِلَيْهِ لَحَسَنٌ، لَوْ تُخْبِرُنَا أَنَّ لِمَا عَمِلْنَا كَفَّارَةً، فَنَزَلَتْ: ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ ﴿٦٨﴾ ﴾الفرقان، وَنَزَلَتْ: ﴿ قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ ﴿٥٣﴾ ﴾الزمر»[1].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: خەڵکانێک لە هاوبەشدانەران هاتن بۆ لای موحەممەد ﷺ وتیان: ئەوەی بانگەشەی بۆ دەکەیت و دەیڵێی کارێکی چاکە، ئەگەر هەواڵمان بەشتێک پێ بدەی لەوەی کردوومانە ببێتە کەفارەت بۆمان ئەم ئایەتە دابەزیە خوارەوە: ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ ﴿٦٨﴾ ﴾ (واتە: وە کەسانێکن لەگەڵ خوادا هیچ پەرستراوێکی تر ناپەرستن)، وە ئەم ئایەتەش دابەزی: ﴿ قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ ﴿٥٣﴾ ﴾ (واتە: بڵێ: ئەی بەندەکانم ئەی ئەوانەی کە خۆتان زۆر گوناهبار کردوە).**

**٤٠٠٥-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: « يَجِيءُ الْمَقْتُولُ بِالْقَاتِلِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ نَاصِيَتُهُ وَرَأْسُهُ فِي يَدِهِ، وَأَوْدَاجُهُ تَشْخَبُ دَماً يَقُولُ: يَا رَبِّ، قَتَلَنِي، حَتَّى يُدْنِيَهُ مِنَ الْعَرْشِ، قَالَ: فَذَكَرُوا لِابْنِ عَبَّاسٍ التَّوْبَةَ، فَتَلَا هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا ﴿٩٣﴾ ﴾النساء، قَالَ: مَا نُسِخَتْ مُنْذُ نَزَلَتْ: وَأَنَّى لَهُ التَّوْبَةُ»[2].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لە ڕۆژی دواییدا کوژراو بکوژ دەهێنێ ناوچەوان و سەری بە دەستیەوەیەتی، گەردنی خوێنی لێ دەچۆڕێ، دەڵێ: ئەی پەروەردگارم کوشتمی، تا نزیکی دەکاتەوە لە عەرشی خوا، وتی: باسی تەوبەیان کرد بۆ ئیبنو عەبباس، ئەویش ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا ﴿٩٣﴾ ﴾ (واتە: هەرکەس بڕواداری بکوژێ بە ئەنقەست. وتی: لەو کاتەی دابەزی نەسخ نەکرایەوە، ئیتر تەوبەی لە کوێ بۆ هەیە.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




٤٠٠٦- «عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ قَالَ: نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدًا فِيهَا ﴿٩٣﴾ ﴾النساء، الْآيَةُ كُلُّهَا بَعْدَ الْآيَةِ الَّتِي نَزَلَتْ فِي الْفُرْقَانِ بِسِتَّةِ أَشْهُرٍ»[1].

واتە: زەیدی کوڕی ثابت ﷺ دەڵێ: ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدًا فِيهَا ﴿٩٣﴾ ﴾ (واتە: هەرکەس بڕواداری بکوژێ بە ئەنقەست ئەوە تۆڵەی ئەو کەسە دۆزەخە بە هەمیشەیی تیایدایە)، ئەم ئایەتە هەمووی شەش مانگ دوای ئەو ئایەتە دابەزی کە لە سووڕەتی فورقاندا هاتووە.

٤٠٠٧- «عَنْ زَيْدٍ ﷺ فِي قَوْلِهِ: ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدًا فِيهَا ﴿٩٣﴾ ﴾النساء، قَالَ: نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ بَعْدَ الَّتِي فِي تَبَارَكَ الْفُرْقَانِ بِثَمَانِيَةِ أَشْهُرٍ، ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ﴿٦٨﴾ ﴾الفرقان»[2].

واتە: زەید ﷺ دەگێڕێتەوە، لە بارەی فەرمایشتی خوا: ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدًا فِيهَا ﴿٩٣﴾ ﴾ (واتە: هەرکەس بڕواداری بکوژێ بە ئەنقەست ئەوە تۆڵەی ئەو کەسە دۆزەخە بە هەمیشەیی تیایدا دەمێنێتەوە)، وتی: ئەم ئایەتە هەشت مانگ دوای ئایەتەکەی فورقان دابەزی: ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ﴿٦٨﴾ ﴾ (واتە: وە کەسانێکن لەگەڵ خوادا هیچ پەرستراوێکی تر ناپەرستن و هیچ کەسێک ناکوژن کە خوا کوشتنی ئەوی قەدەغە کردوە بە حەق نەبێت).

٤٠٠٨- «عَنْ مُجَالِدِ بْنِ عَوْفٍ قَالَ: سَمِعْتُ خَارِجَةَ بْنَ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ يُحَدِّثُ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: نَزَلَتْ: ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدًا فِيهَا ﴿٩٣﴾ ﴾النساء، أَشْفَقْنَا مِنْهَا، فَنَزَلَتِ الْآيَةُ الَّتِي فِي الْفُرْقَانِ: ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ﴿٦٨﴾ ﴾الفرقان»[3].

---

(١) حسن صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٢٧٢.

(٢) حسن صحيح.

(٣) منكر.




واتە: موجالیدی کوڕی عەوف دەڵێ: گوێم لە خاریجەی کوڕی زەیدی کوڕی ثابت بوو لە باوکیەوە ﷺ دەیگێڕایەوە، ئەو وتی: ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدًا فِيهَا ﴿٩٣﴾ ﴾ (واتە: هەرکەس بڕوادارێک بکوژێ بە ئەنقەست ئەوە تۆڵەی ئەو کەسە دۆزەخە بە هەمیشەیی تیایدا دەمێنێتەوە)، بەزەییمان پێیدا هاتەوە، پاشان ئەم ئایەتەی سوورەتی فورقان دابەزی: ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ﴿٦٨﴾ ﴾ (واتە: وە کەسانێکن لەگەڵ خوادا هیچ پەرستراوێکی تر ناپەرستن و هیچ کەسێک ناکوژن کە خوا کوشتنی ئەوی قەدەغە کردوە بە حەق نەبێت).

## باسی تاوانە گەورەکان

**٤٠٠٩-** «عَنْ أَبِي أَيُّوبِ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ قَالَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ جَاءَ يَعْبُدُ اللَّهَ، وَلَا يُشْرِكُ بِهِ شَيْئاً، وَيُقِيمُ الصَّلَاةَ، وَيُؤْتِي الزَّكَاةَ، وَيَجْتَنِبُ الْكَبَائِرَ كَانَ لَهُ الْجَنَّةُ، فَسَأَلُوهُ عَنِ الْكَبَائِرِ، فَقَالَ: الْإِشْرَاكُ بِاللَّهِ، وَقَتْلُ النَّفْسِ الْمُسْلِمَةِ، وَالْفِرَارُ يَوْمَ الزَّحْفِ»[1].

واتە: ئەبو ئەیوبی ئەنصاڕی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس خوا بپەرستێ و هیچ هاوبەشی بۆ دانەنێت و نوێژ بکات و زەکات بدات و دوور بکەوێتەوە لە تاوانە گەورەکان، ئەوە بەهەشتی بۆ هەیە، پرسیاریان لێکرد لە بارەی تاوانە گەورەکانەوە، فەرمووی: هاوبەش دانان بۆ خوا، وە کوشتنی نەفسی مسوڵمان و پشت هەڵکردن لە کاتی جەنگدا.

**٤٠١٠-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْكَبَائِرُ الشِّرْكُ بِاللَّهِ، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ، وَقَتْلُ النَّفْسِ، وَقَوْلُ الزُّورِ»[2].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: تاوانە گەورەکان: هاوبەش دانان بۆ خوا، ئازاردان و سەرپێچی کردنی دایک و باوک و کوشتنی نەفس و شایەتیدانی درۆ.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٦٥٣ و ٥٩٧٧ و ٦٨٧١، ومسلم: ٨٨، والترمذي: ١٢٠٧ و ٣٠١٨.




**٤٠١١-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْكَبَائِرُ: الْإِشْرَاكُ بِاللَّهِ، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ، وَقَتْلُ النَّفْسِ، وَالْيَمِينُ الْغَمُوسُ»[1].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: تاوانە گەورەکان: هاوبەش دانان بۆ خوا، ئازاردان و سەرپێچی کردنی دایک و باوک و کوشتنی نەفس و سوێندی درۆ. (لەبەر ئەوە ناونراوە بە (الْغَمُوس) چونکە خاوەنەکەی دەخاتە ئاگرەوە).**

**٤٠١٢-** «عَنْ عُبَيْدِ بْنِ عُمَيْرٍ، أَنَّهُ حَدَّثَهُ أَبُوهُ ﷺ، وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا الْكَبَائِرُ؟ قَالَ: هُنَّ سَبْعٌ، أَعْظَمُهُنَّ إِشْرَاكٌ بِاللَّهِ، وَقَتْلُ النَّفْسِ بِغَيْرِ حَقٍّ، وَفِرَارٌ يَوْمَ الزَّحْفِ»[2].

**واتە: عوبەیدی کوڕی عومەیر دەگێڕێتەوە، کە باوکی (خوا لێی ڕازی بێ) یەکێک بووە لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ بۆی باس کردوە، پیاوێک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تاوانە گەورەکان چین؟ فەرمووی: تاوانە گەورەکان حەوتن گەورەترینیان: هاوبەش دانانە بۆ خوا، وە کوشتنی نەفسە بە ناحەق و پشت هەڵکردنە لە کاتی جەنگدا.**

## باسی گەورەترین تاوان، وە جیاوازی یەحیاو عەبدوڕڕەحمان لەسەر سوفیان لە فەرموودەکەی واصل، لە ئەبو وائیلەوە، لە عەبدوڵلاوە تیایدا

**٤٠١٣-** «عَنْ عبد الرحمن قال: حدثنا سُفْيَانُ، عن وَاصِلٍ، عن أبي وَائِلٍ، عن عَمْرِو بن شُرَحْبِيلَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُّ الذَّنْبِ أَعْظَمُ؟ قَالَ: أَنْ تَجْعَلَ لِلَّهِ نِدّاً، وَهُوَ خَلَقَكَ، قُلْتُ: ثُمَّ مَاذَا؟ قَالَ: أَنْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ خَشْيَةَ أَنْ يَطْعَمَ مَعَكَ، قُلْتُ: ثُمَّ مَاذَا؟ قَالَ: أَنْ تُزَانِيَ بِحَلِيلَةِ جَارِكَ»[3].

**واتە: عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: سوفیان بۆی باس کردین لە واصل لە ئەبو وائیل، لە عەمرِی کوڕی شورەحبیل، لە عەبدوڵلاوە ﷺ وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چ**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٦٧٥ و ٦٨٧٠ و ٦٩٢٠، والترمذي: ٣٠٢١.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٢٨٧٥.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٤٧٧ و ٤٧٦١ و ٦٠٠١ و ٦٨١١ و ٦٨٦١ و ٧٥٢٠ و ٧٥٣٢، ومسلم: ١٤١ و ٨٦/١٤٢، وأبو داود: ٢٣١٠، والترمذي: ٣١٨٢ و ٣١٨٣.




تاوانێ گەورەترینە؟ فەرمووی: هاوبەشێک بۆ خوا دابنێی، لە کاتێکدا ئەو دروستی کردووی، وتم: پاشان چی؟ فەرمووی: منداڵەکەت بکوژیت لە ترسی ئەوەی نانت لەگەڵ بخوات، وتم: پاشان چی؟ فەرمووی: زینا لەگەڵ دراوسێکەتدا بکەیت.

**٤٠١٤-** «عَنْ يَحْيَى قَالَ: حدثنا سُفْيَانُ قَالَ: حدثني وَاصِلٌ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُّ الذَّنْبِ أَعْظَمُ؟ قَالَ: أَنْ تَجْعَلَ لِلَّهِ نِدّاً، وَهُوَ خَلَقَكَ، قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: أَنْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ مِنْ أَجْلِ أَنْ يَطْعَمَ مَعَكَ، قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: ثُمَّ أَنْ تُزَانِيَ بِحَلِيلَةِ جَارِكَ»[١].

واتە: یەحیا دەڵێ: سوفیان بۆی باسکردین، لە واصل لە ئەبو وائیل، عەبدوڵلا ﷺ وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چ تاوانێ گەورەترینە؟ فەرمووی: هاوبەشێک بۆ خوا دابنێی، لە کاتێکدا ئەو دروستی کردووی، وتم: پاشان چی؟ فەرمووی: منداڵەکەت بکوژیت لە پێناوی ئەوەی نانت لەگەڵ بخوات، وتم: پاشان چی؟ فەرمووی: پاشان زینا لەگەڵ دراوسێکەتدا بکەیت.

**٤٠١٥-** «عَنْ يَزِيدَ قال: أَنْبَأَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَاصِمٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: أَيُّ الذَّنْبِ أَعْظَمُ؟ قَالَ: الشِّرْكُ أَنْ تَجْعَلَ لِلَّهِ نِدّاً، وَأَنْ تُزَانِيَ بِحَلِيلَةِ جَارِكَ، وَأَنْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ مَخَافَةَ الْفَقْرِ أَنْ يَأْكُلَ مَعَكَ، ثُمَّ قَرَأَ عَبْدُ اللَّهِ: ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ ﴿٦٨﴾﴾الفرقان»[٢].

واتە: یەزید دەڵێ: شوعبە بۆی باس کردین، لە عاصم، لە ئەبو وائیل، لە عەبدوڵلاوە ﷺ وتی: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ چ تاوانێ گەورەترینە؟ فەرمووی: هاوبەشدانان شتێک بکەیتە هاوبەش بۆ خوا، وە زینا لەگەڵ دراوسێکەتدا بکەیت و منداڵەکەت بکوژی لە ترسی هەژاری کە لەگەڵتدا نان بخوات، پاشان عەبدوڵلا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ ﴿٦٨﴾﴾ (واتە: وە کەسانێکن لەگەڵ خوادا هیچ پەرستراوێکی تر ناپەرستن).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح لغيره.




## باسی ئەو حاڵەتەی خوێنی مسوڵمانی پێ حەڵاڵ دەبێ

**٤٠١٦-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: وَالَّذِي لَا إِلَهَ غَيْرُهُ، لَا يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَّا ثَلَاثَةُ نَفَرٍ: التَّارِكُ لِلْإِسْلَامِ، مُفَارِقُ الْجَمَاعَةِ، وَالثَّيِّبُ الزَّانِي، وَالنَّفْسُ بِالنَّفْسِ»[١].

**واتە:** عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوێند بەو خوایەی هیچ پەرستراوێک نیە بە حەق جگە لەو، حەڵاڵ نیە خوێنی مسوڵمانێک شایەتی بدات بە (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ) هیچ پەرستراوێک نیە بە حەق جگە لە خوا، وە منیش پێغەمبەری خوام، مەگەر سێ کەس: کەسێک واز لە ئیسلام بهێنێ، لە کۆمەڵی مسوڵمانان جیابێتەوە، بێوەژنێکی زیناکەریش، کەسێکیش کەسێکی تر بکوژێت.

**٤٠١٧-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ غَالِبٍ قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ: أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ إِلَّا رَجُلٌ زَنَى بَعْدَ إِحْصَانِهِ، أَوْ كَفَرَ بَعْدَ إِسْلَامِهِ، أَوِ النَّفْسُ بِالنَّفْسِ»[٢].

**واتە:** عەمری کوڕی غالب دەڵێ: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) وتی: ئایا نەتزانیوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: خوێنی هیچ مسوڵمانێک حەڵاڵ نابێت، مەگەر کەسێک زینا بکات دوای ئەوەی ژنی هێناوە یان شوی کردوە، یان بێبڕوا بووە دوای مسوڵمان بوونی، یان کەسێکی کوشتبێ.

**٤٠١٨-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ غَالِبٍ قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ: يَا عَمَّارُ، أَمَا إِنَّكَ تَعْلَمُ أَنَّهُ لَا يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ إِلَّا ثَلَاثَةٌ: النَّفْسُ بِالنَّفْسِ، أَوْ رَجُلٌ زَنَى بَعْدَ مَا أُحْصِنَ، وَسَاقَ الْحَدِيثَ»[٣].

**واتە:** عەمری کوڕی غالب دەڵێ: عائیشە وتی: ئەی عەممار ئایا تۆ دەزانی حەڵاڵ نیە خوێنی مسوڵمان مەگەر بە سێ شت: کەسێک کەسێک بکوژێ، یان پیاوێک زینا بکات دوای ئەوەی ژنی هێناوە، فەرموودەکەی هێنا.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٨٧٨، ومسلم: ٢٥ و ١٦٧٦/٢٦، وأبو داود: ٤٣٢٥، والترمذي: ١٤٠٢، وإبن ماجه: ٢٥٣٤.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه مسلم: ١٦٧٦/٢٦.

(٣) ضعيف الإسناد موقوف.




**٤٠١٩-** «عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهْلٍ وَعَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ قَالَا: كُنَّا مَعَ عُثْمَانَ وَهُوَ مَحْصُورٌ، وَكُنَّا إِذَا دَخَلْنَا مَدْخَلاً نَسْمَعُ كَلَامَ مَنْ بِالْبَلَاطِ، فَدَخَلَ عُثْمَانُ يَوْماً، ثُمَّ خَرَجَ، فَقَالَ: إِنَّهُمْ لَيَتَوَاعَدُونِّي بِالْقَتْلِ، قُلْنَا: يَكْفِيكَهُمُ اللَّهُ، قَالَ: فَلِمَ يَقْتُلُونِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَا يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ إِلَّا بِإِحْدَى ثَلَاثٍ: رَجُلٌ كَفَرَ بَعْدَ إِسْلَامِهِ، أَوْ زَنَى بَعْدَ إِحْصَانِهِ، أَوْ قَتَلَ نَفْساً بِغَيْرِ نَفْسٍ، فَوَاللَّهِ مَا زَنَيْتُ فِي جَاهِلِيَّةٍ، وَلَا إِسْلَامٍ، وَلَا تَمَنَّيْتُ أَنَّ لِي بِدِينِي بَدَلاً مُنْذُ هَدَانِيَ اللَّهُ، وَلَا قَتَلْتُ نَفْساً فَلِمَ يَقْتُلُونَنِي»[١].

**واتە: ئەبو ئومامەی کوڕی سەهل و عەبدوڵڵای کوڕی عامری کوڕی ڕەبیعە وتیان: ئێمە لەگەڵ عوسماندا بووین ئەو گەمارۆ درابوو، ئێمە لە هەر شوێنێکەوە بچووینایە گوێمان لە وتەی ئەوانە دەبوو لە (الْبَلَاطِ) (کە شوێنێکە نزیک مەدینە خەڵکی نوێژیان تێدا دەکرد)، ڕۆژێک عوسمان هاتە ژورەوە پاشان دەرچوو، وتی: ئەوان دەیانەوێت بمکوژن، وتمان: خوا دەتپارێزێ لێیان، وتی: بۆچی دەمکوژن گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: حەڵاڵ نیە خوێنی مسوڵمان مەگەر بە سێ شت: پیاوێک دوای مسوڵمان بوونی بێبڕوا بوو بێتەوە، یان زینای کردبێت دوای ژنهێنانی، یان کەسێکی بە ناحەق کوشتبێ، سوێند بە خوا نە لەسەردەمی نەفامیدا زینام کردوە نە لە ئیسلامەتیدا، وە لەو کاتەی خوا هیدایەتی داوم ئاواتی ئەوەم نەخواستوە ئاینکەم بگۆڕم، هیچ کەسێکیشم نەکوشتووە.**

## کوشتنی ئەو کەسەی لە کۆمەڵی مسوڵمانان جیادەبێتەوە، باسی جیاوازی لەسەر زیادی کوڕی عیلاقە، لە عەرفەجەوە (لە فەرموودەکەدا)

**٤٠٢٠-** «عَنْ يَزِيدُ بن مَرْدَانِبَةَ عن زِيَادِ بن عِلَاقَةَ، عَنْ عَرْفَجَةَ بْنِ شُرَيْحٍ الْأَشْجَعِيِّ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ عَلَى الْمِنْبَرِ يَخْطُبُ النَّاسَ، فَقَالَ: إِنَّهُ سَيَكُونُ بَعْدِي هَنَاتٌ وَهَنَاتٌ، فَمَنْ رَأَيْتُمُوهُ فَارَقَ الْجَمَاعَةَ، أَوْ يُرِيدُ يُفَرِّقُ أَمْرَ أُمَّةِ مُحَمَّدٍ ﷺ كَائِناً مَنْ كَانَ فَاقْتُلُوهُ، فَإِنَّ يَدَ اللَّهِ عَلَى الْجَمَاعَةِ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ مَعَ مَنْ فَارَقَ الْجَمَاعَةَ يَرْكُضُ»[٢].

**واتە: یەزیدی کوڕی مەڕدانیبە دەگێڕێتەوە، زیادی کوڕی عیلاقە، لە عەرفەجەی کوڕی شورەیحی ئەشجەعی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی لەسەر مینبەر وتاری دەدا،**

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢١٥٨، وإبن ماجه: ٢٥٣٣.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٥٩ و ١٨٥٢/٦٠، وأبو داود: ٤٧٦٢.




فەرمووی: بێگومان کەمێک دوای من شەڕو خراپە ڕوودەدات، هەرکەستان بینی لە کۆمەڵی مسوڵمان جیابوویەوە، یان ویستی ئوممەتی موحەممەد لەت لەت بکات هەرکەس بوو بیکوژن (واتە: دەسەڵاتی شەرعی بەم کارە هەڵبستێ، نەک تاک تاکی مسوڵمانان)، چونکە بەڕاستی دەستی خوا لەگەڵ کۆمەڵ دایە، شەیتانیش لەگەڵ ئەو کەسەدایە لە کۆمەڵی مسوڵمانان جیادەبێتەوە.

**خوێنەری خۆشەویست!!**

مامەڵە لەگەڵ هاوشێوەی ئەم فەرموودەدا زۆر هەستیارە تەنها خوێندنەوە بەس نیە، بەڵکو پێویستە بۆ هەر بابەتێک لە بابەتەکان پرسیاری خەڵکی پسپۆڕ بکەیت لەم بوارەدا).

**٤٠٢١-** «عَنْ أبي حَمْزَةَ عن زِيَادِ بْنِ عِلَاقَةَ، عَنْ عَرْفَجَةَ بْنِ شُرَيْحٍ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِنَّهَا سَتَكُونُ بَعْدِي هَنَاتٌ وَهَنَاتٌ وَهَنَاتٌ «وَرَفَعَ يَدَيْهِ» فَمَنْ رَأَيْتُمُوهُ يُرِيدُ تَفْرِيقَ أَمْرِ أُمَّةِ مُحَمَّدٍ ﷺ وَهُمْ جَمِيعٌ، فَاقْتُلُوهُ كَائِناً مَنْ كَانَ مِنَ النَّاسِ»[1].

واتە: ئەبو حەمزە دەگێڕێتەوە، لە زیادی کوڕی عیلاقە، لە عەرفەجەی کوڕی شورەیحی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بێگومان کەمێک دوای من شەڕو خراپە ڕوودەدات «دەستەکانی بەرز کردەوە» هەرکەستان بینی ویستی ئوممەتی موحەممەد لەت لەت بکات لە کاتێکدا ئەوان یەک بوون، بیکوژن هەر کەس بوو (واتە: دەسەڵاتی شەرعی نابێ ڕەچاوی کەسایەتی و پێگەی ئەم کەسە بکات، مادام فیتنەو ئاشووب دەنێتەوە، دەبێ سزای بدات).

**٤٠٢٢-** «عَنْ شُعْبَةَ قال حدثنا زِيَادُ بن عِلَاقَةَ، عَنْ عَرْفَجَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: سَتَكُونُ بَعْدِي هَنَاتٌ، وَهَنَاتٌ، فَمَنْ أَرَادَ أَنْ يُفَرِّقَ أَمْرَ أُمَّةِ مُحَمَّدٍ ﷺ، وَهُمْ جَمْعٌ فَاضْرِبُوهُ بِالسَّيْفِ»[2].

واتە: شوعبە دەڵێ: زیادی کوڕی عیلاقە بۆی باس کردین، لە عەرفەجەی کوڕی شورەیحی ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: کەمێک دوای من

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




**شەڕو خراپە ڕوو دەدات هەرکەس ویستی ئوممەتی موحەممەد ﷺ لەت لەت بکات لە کاتێکدا ئەوان یەک بوون، بە شمشێر بیکوژن.**

**٤٠٢٣-** «عن زَيْدِ بن عَطَاءِ بن السَّائِبِ عن زِيَادِ بْنِ عِلَاقَةَ، عَنْ أُسَامَةَ بْنِ شَرِيكٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَيُّمَا رَجُلٍ خَرَجَ يُفَرِّقُ بَيْنَ أُمَّتِي، فَاضْرِبُوا عُنُقَهُ»[١].

**واتە: یەزیدی کوڕی عەطائی کوڕی سائیب دەگێڕێتەوە، زیادی کوڕی عیلاقە دەگێڕێتەوە، لە ئوسامەی کوڕی شەریک دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس بە مەبەستی ئەوەی جیاوازی بخاتە نێوان ئوممەتەکەم، بدەن لە گەردنی.**

## تەفسیری فەرمایشتی خوا: ﴿إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ ﴿٣٣﴾﴾[٢].

**٤٠٢٤-** «عَنْ أبو قِلَابَةَ قال: حدثني أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ رضي الله عنه، أَنَّ نَفَراً مِنْ عُكْلٍ ثَمَانِيَةً قَدِمُوا عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَاسْتَوْخَمُوا الْمَدِينَةَ، وَسَقِمَتْ أَجْسَامُهُمْ، فَشَكَوْا ذَلِكَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: أَلَا تَخْرُجُونَ مَعَ رَاعِينَا فِي إِبِلِهِ، فَتُصِيبُوا مِنْ أَلْبَانِهَا وَأَبْوَالِهَا؟ قَالُوا: بَلَى، فَخَرَجُوا فَشَرِبُوا مِنْ أَلْبَانِهَا وَأَبْوَالِهَا، فَصَحُّوا، فَقَتَلُوا رَاعِيَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَبَعَثَ، فَأَخَذُوهُمْ، فَأُتِيَ بِهِمْ، فَقَطَّعَ أَيْدِيَهُمْ وَأَرْجُلَهُمْ وَسَمَّرَ أَعْيُنَهُمْ، وَنَبَذَهُمْ فِي الشَّمْسِ حَتَّى مَاتُوا»[٣].

**واتە: ئەبو قیلابە دەڵێ: ئەنەسی کوڕی مالیک رضي الله عنه بۆی باس کردم هەشت کەس لە هۆزی عوکەل هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە ئاوو هەوای ئەو ناوچەیان لێ نەکەوت، جەستەیان نەخۆش کەوت، سکاڵایان برد بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی بۆ دەرناچن لەگەڵ شوانەکەماندا شیرو میزی وشترەکانی بخۆنەوە**

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) واتە: بەڕاستی تۆڵەی ئەوانەی کە جەنگ دوژمنایەتی ئەکەن لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەیدا وە هەوڵ ئەدەن لە زەوییدا خراپە بڵاوبکەنەوە ئەوە تۆڵەیان ئەوەیە بکوژرێن یا هەڵبواسرێ بە دارا یان دەست و قاچیان ببڕدرێت بە پێچەوانەوە (ڕاست و چەپ) یان دوور بخرێنەوە لە وڵات، وە باس کردنی ئەوکەسەش کە ئایەتەکەی بارە دابەزیوە، وە باسی جیاوازی ئەوانەی فەرموودەکەی ئەنەسی کوڕی مالکیان گواستوەتەوە تیایدا.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٣، ومسلم: ١٠ و ١١ و ١٦٧١/١٢، وأبو داود: ٤٣٦٤ و ٤٣٦٥ و ٤٣٦٦.




(بۆ ئەوەی چاک ببنەوە) وتیان: بەڵێ، دەردەچین، دەرچوون لە شیرو میزەکەیان خواردەوە، ساغ بوونەوە، ئینجا شوانەکەی پێغەمبەریان کوشت، پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بە دوایاندا هێنایانیان، پاشان دەست و قاچەکانیانی بڕیەوەو چاویانی هەڵکۆڵی و لەبەر خۆر فڕێی دان هەتا مردن (چونکە ئاوایان کردبوو لە شوانەکە).

**٤٠٢٥-** «عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ نَفَراً مِنْ عُكْلٍ قَدِمُوا عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَاجْتَوَوْا الْمَدِينَةَ، فَأَمَرَهُمُ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يَأْتُوا إِبِلَ الصَّدَقَةِ، فَيَشْرَبُوا مِنْ أَبْوَالِهَا وَأَلْبَانِهَا، فَفَعَلُوا فَقَتَلُوا رَاعِيَهَا وَاسْتَاقُوهَا، فَبَعَثَ النَّبِيُّ ﷺ فِي طَلَبِهِمْ، قَالَ: فَأُتِيَ بِهِمْ، فَقَطَّعَ أَيْدِيَهُمْ وَأَرْجُلَهُمْ، وَسَمَّرَ أَعْيُنَهُمْ، وَلَمْ يَحْسِمْهُمْ وَتَرَكَهُمْ حَتَّى مَاتُوا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ: ﴿ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ﴿٣٣﴾ ﴾المائدة»[1].

واتە: ئەبو قیلابە دەگێڕێتەوە، لە ئەنەسەوە ﷺ چەند کەسێک لە هۆزی عوکەل هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ حەزیان نەکرد لە مەدینە بمێننەوە (چونکە ئاوو هەوای ئەو ناوچەیان لێ نەدەکەوت)، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردن بچن بۆ لای ئەو وشترانە کە هی زەکاتن (لای شوانێک دانرابوون بەخێوی دەکردن) لە میزو شیرەکانیان بخۆنەوە، ئەوانیش ئەوەیان کردو، پاشان شوانی وشترەکانیان کوشت و دەستیان گرت بەسەریانداو بە تاڵان بردیان، پێغەمبەر ﷺ ناردی بەدوایاندا بگەڕێن، وتی: پاشان هێنایانیان، پاشان دەست و قاچەکانیانی بڕیەوەو چاویانی هەڵکۆڵی و لەبەر خۆر فڕێی دان، چارەسەری نەکردن تا مردن، خوا ﷻ ئەم ئایەتەی دابەزاندە خوارەوە: ﴿ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ﴿٣٣﴾ ﴾ (واتە: بەڕاستی تۆڵەی ئەوانەی کە جەنگ و دوژمنایەتی ئەکەن لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەیدا).

**٤٠٢٦-** «عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَدِمَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ثَمَانِيَةُ نَفَرٍ مِنْ عُكْلٍ، فَذَكَرَ نَحْوَهُ إِلَى قَوْلِهِ: لَمْ يَحْسِمْهُمْ وَقَالَ: قَتَلُوا الرَّاعِيَ»[2].

واتە: ئەبو قیلابە دەگێڕێتەوە، لە ئەنەسەوە ﷺ دەڵێ: هەشت کەس لە هۆزی عوکەل هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ هەر وەکو فەرموودەکەی پێشووی باس کرد تا (لَمْ يَحْسِمْهُمْ)، وە وتی: شوانەکەیان کوشت.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




**٤٠٢٧-** «عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ ﷺ نَفَرٌ مِنْ عُكْلٍ أَوْ عُرَيْنَةَ، فَأَمَرَ لَهُمْ- وَاجْتَوَوْا الْمَدِينَةَ- بِذَوْدٍ أَوْ لِقَاحٍ يَشْرَبُونَ أَلْبَانَهَا وَأَبْوَالَهَا، فَقَتَلُوا الرَّاعِيَ، وَاسْتَاقُوا الْإِبِلَ، فَبَعَثَ فِي طَلَبِهِمْ فَقَطَّعَ أَيْدِيَهُمْ وَأَرْجُلَهُمْ، وَسَمَّرَ أَعْيُنَهُمْ»(١).

**واتە: ئەبو قیلابە دەگێڕێتەوە، لە ئەنەسەوە ﵁ دەڵێ: چەند کەسێک لە هۆزی عوکەل یان عورەینە هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، حەزیان نەکرد لە مەدینە بمێننەوە، فەرمانی پێکردن لە شیرو میزی وشترەکان بخۆنەوە، ئەوانیش شوانەکەیان کوشت و دەستیان گرت بەسەر وشترەکانیشدا، ناردی بە دوایاندا دەست و قاچەکانیانی بڕییەوەو چاوی هەڵکۆڵین.**

## باسی جیاوازی ئەوانەی فەرموودەکەی حومەیدیان گواستۆتەوە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە تیایدا

**٤٠٢٨-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ وَغَيْرُهُ، عَنْ حُمَيْدٍ الطَّوِيلِ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁، أَنَّ نَاساً مِنْ عُرَيْنَةَ قَدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَاجْتَوَوْا الْمَدِينَةَ، فَبَعَثَهُمُ النَّبِيُّ ﷺ إِلَى ذَوْدٍ لَهُ، فَشَرِبُوا مِنْ أَلْبَانِهَا وَأَبْوَالِهَا، فَلَمَّا صَحُّوا، ارْتَدُّوا عَنِ الْإِسْلَامِ، وَقَتَلُوا رَاعِيَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مُؤْمِناً، وَاسْتَاقُوا الْإِبِلَ، فَبَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي آثَارِهِمْ، فَأُخِذُوا، فَقَطَّعَ أَيْدِيَهُمْ وَأَرْجُلَهُمْ، وَسَمَلَ أَعْيُنَهُمْ، وَصَلَبَهُمْ»(٢).

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەگێڕێتەوە هەروەها جگە لە ئەویش، لە حومەیدی درێژەوە، لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﵁، چەند کەسێک لە هۆزی عورەینە هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ حەزیان نەکرد لە مەدینە بمێننەوە (چونکە ئاوو هەوای ئەو ناوچەیان لێ نەدەکەوت و نەخۆش کەوتن)، پێغەمبەری خوا ﷺ ناردنی بۆ لای ئەو وشترانە کە هی زەکاتن (لای شوانێک دانرابوون بەخێوی دەکردن) لە میزو شیرەکانیان بخۆنەوە (بۆ ئەوەی شیفایان بۆ بێ و چاک ببنەوە)، کاتێ چاک بوونەوە هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام، شوانە مسوڵمانەکەی پێغەمبەریان شەهید کرد و دەستیان گرت بەسەر وشترەکاندا، پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بەدوایاندا، پاشان هێنران، ئینجا دەست و قاچەکانیانی بڕییەوەو چاویانی هەڵکۆڵی و هەڵیواسین.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح دون قوله: «وَصَلَبَهُمْ». أخرجه مسلم: ١٦٧١، وأبو داود: ٤٣٦٧، والترمذي: ٧٢ و ١٨٤٥ و ٢٠٤٢، وإبن ماجه: ٢٥٧٨ و ٣٥٠٣.




**٤٠٢٩-** «عَنْ إِسمَاعِيلَ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَدِمَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أُنَاسٌ مِنْ عُرَيْنَةَ، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَوْ خَرَجْتُمْ إِلَى ذَوْدِنَا فَكُنْتُمْ فِيهَا، فَشَرِبْتُمْ مِنْ أَلْبَانِهَا وَأَبْوَالِهَا، فَفَعَلُوا، فَلَمَّا صَحُّوا، قَامُوا إِلَى رَاعِي رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَتَلُوهُ، وَرَجَعُوا كُفَّاراً، وَاسْتَاقُوا ذَوْدَ النَّبِيِّ ﷺ ، فَأَرْسَلَ فِي طَلَبِهِمْ، فَأُتِيَ بِهِمْ فَقَطَعَ أَيْدِيَهُمْ وَأَرْجُلَهُمْ، وَسَمَلَ أَعْيُنَهُمْ»[١].

**واتە: ئیسماعیل دەگێڕێتەوە، لە حومەید، لە ئەنەسەوە ﷺ دەڵێ: چەند کەسێک لە هۆزی عورەینە هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون: ئەگەر بڕۆن بۆ لای وشترەکانمان و لەوێ بمێننەوەو لە شیرو میزیان بخۆنەوە (چاک دەبنەوە، چونکە نەخۆش کەوتبوون) ئەوانیش ئەو کارەیان کرد، کاتێ چاک بوونەوە، هەڵسان شوانەکەی پێغەمبەریان ﷺ کوشت، بە بێبڕوایی گەڕانەوەو وشترەکانی پێغەمبەریشیان ﷺ برد، پاشان ناردی بە دوایاندا، هێنران بۆ خزمەتی، پاشان دەست و قاچیانی بڕیەوەو چاویانی هەڵکۆڵی.**

**٤٠٣٠-** «عَنْ خالد قالَ: حدثنا حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَدِمَ نَاسٌ مِنْ عُرَيْنَةَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَاجْتَوَوْا الْمَدِينَةَ، فَقَالَ لَهُمُ النَّبِيُّ ﷺ: لَوْ خَرَجْتُمْ إِلَى ذَوْدِنَا، فَشَرِبْتُمْ مِنْ أَلْبَانِهَا، قَالَ: وَقَالَ قَتَادَةُ: وَأَبْوَالِهَا، فَخَرَجُوا إِلَى ذَوْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَلَمَّا صَحُّوا، كَفَرُوا بَعْدَ إِسْلَامِهِمْ، وَقَتَلُوا رَاعِيَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مُؤْمِناً، وَاسْتَاقُوا ذَوْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَانْطَلَقُوا مُحَارِبِينَ، فَأَرْسَلَ فِي طَلَبِهِمْ، فَأُخِذُوا، فَقَطَّعَ أَيْدِيَهُمْ وَأَرْجُلَهُمْ، وَسَمَّرَ أَعْيُنَهُمْ»[٢].

**واتە: خالد دەڵێ: حومەید بۆی باس کردین، لە ئەنەسەوە ﷺ دەڵێ: چەند کەسێک لە هۆزی عورەینە هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون: ئەگەر بڕۆن بۆ لای وشترەکانمان و لە شیرەکانیان بخۆنەوە، وتی: قەتادە وتی: میزەکانیشیان، ئەوانیش چوون بۆ لای کۆمەڵە وشترێکی پێغەمبەری خوا ﷺ، کاتێ چاکبوونەوە، بێبڕوابوونەوە دوای مسوڵمانبوونیان، شوانە بڕوادارەکەی پێغەمبەریشیان کوشت و دەستیان گرت بەسەر وشترەکاندا، دواتر وەکو دوژمن دەرکەوتن، پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بە دوایاندا، پاشان هێنران، دەست و قاچەکانیانی بڕیەوە و چاویانی هەڵکۆڵی.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




**٤٠٣١-** «عَنْ مُحَمَدِ بْنِ أَبِي عَدِيٍّ قال: حدثنا حُمَيْدٌ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: أَسْلَمَ أُنَاسٌ مِنْ عُرَيْنَةَ، فَاجْتَوَوْا الْمَدِينَةَ فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَوْ خَرَجْتُمْ إِلَى ذَوْدٍ لَنَا، فَشَرِبْتُمْ مِنْ أَلْبَانِهَا، قَالَ حُمَيْدٌ وَقَالَ قَتَادَةُ، عَنْ أَنَسٍ: وَأَبْوَالِهَا، فَفَعَلُوا، فَلَمَّا صَحُّوا، كَفَرُوا بَعْدَ إِسْلَامِهِمْ، وَقَتَلُوا رَاعِيَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مُؤْمِناً، وَاسْتَاقُوا ذَوْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَهَرَبُوا مُحَارِبِينَ، فَأَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَنْ أَتَى بِهِمْ، فَأُخِذُوا، فَقَطَّعَ أَيْدِيَهُمْ وَأَرْجُلَهُمْ، وَسَمَّرَ أَعْيُنَهُمْ، وَتَرَكَهُمْ فِي الْحَرَّةِ حَتَّى مَاتُوا»[١].

**واتە: موحەممەدی کوڕی عەدی دەڵێ: حومەید بۆی باس کردین، لە ئەنەسەوە ﷺ وتی: چەند کەسێک لە هۆزی عورەینە هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، ئاووهەوای مەدینەیان لێ نەدەکەوت پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون: ئەگەر بڕۆن بۆ لای وشترەکانمان و لە شیرەکانیان بخۆنەوە (چاک دەبنەوە) حومەید وتی: قەتادە لە ئەنەسەوە وتویەتی: میزەکانیشیان، ئەوانیش ئەوەیان کرد، کاتێ چاکبوونەوە، بێبڕوابوونەوە دوای مسوڵمانبوونیان، شوانە بڕوادارەکەی پێغەمبەریشیان کوشت و دەستیان گرت بەسەر وشترەکاندا، دواتر ڕایان کرد وەک دوژمن دەرکەوتن، پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بە دوایاندا کێ دەیانهێنێ، دەست و قاچەکانیانی بڕیەوەو چاویانی هەڵکۆڵی و لە گەرمادا فڕێیدان هەتا مردن.**

**٤٠٣٢-** «عَنْ شُعْبَةَ قال: حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، أَنَّ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ حَدَّثَهُمْ، أَنَّ نَاساً أَوْ رِجَالاً مِنْ عُكْلٍ أَوْ عُرَيْنَةَ قَدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا أَهْلُ ضَرْعٍ، وَلَمْ نَكُنْ أَهْلَ رِيفٍ، فَاسْتَوْخَمُوا الْمَدِينَةَ، فَأَمَرَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِذَوْدٍ وَرَاعٍ، وَأَمَرَهُمْ أَنْ يَخْرُجُوا فِيهَا، فَيَشْرَبُوا مِنْ لَبَنِهَا وَأَبْوَالِهَا فَلَمَّا صَحُّوا، وَكَانُوا بِنَاحِيَةِ الْحَرَّةِ كَفَرُوا بَعْدَ إِسْلَامِهِمْ، وَقَتَلُوا رَاعِيَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَاسْتَاقُوا الذَّوْدَ، فَبَعَثَ الطَّلَبَ فِي آثَارِهِمْ، فَأُتِيَ بِهِمْ، فَسَمَّرَ أَعْيُنَهُمْ، وَقَطَّعَ أَيْدِيَهُمْ وَأَرْجُلَهُمْ، ثُمَّ تَرَكَهُمْ فِي الْحَرَّةِ عَلَى حَالِهِمْ حَتَّى مَاتُوا»[٢].

**واتە: شوعبە دەڵێ: قەتادە بۆی باس کردین، لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ، خەڵکانێک یان پیاوانێک لە هۆزی عوکەل یان عورەینە هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئێمە خەڵکی دەشتین لە شار نەژیاوین، ژیانی مەدینە زۆر گران بوو بەلایانەوە و نەخۆش کەتن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردن بچن بۆ لای ئەو وشترانە کە شوانێک بەخێویان دەکات، فەرمانیشی پێکردن**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




لە شیرو میزەکانیان بخۆنەوە، کاتێ چاکبوونەوە، لە نزیک شوێنێک بوون بەناو (الْحَرَّةِ) بێبڕوابوونەوە دوای مسوڵمانبوونیان، پاشان شوانەکەی پێغەمبەریان ﷺ کوشت و دەستیان گرت بەسەر وشترەکاندا، پاشان خەڵکی نارد بگەڕێن بە دوایاندا، ئینجا (چاوەکانیان بە داخ کردن هەڵکۆڵی و) دەست و قاچەکانیانی بڕیەوە، پاشان وازی لێهێنان لە گەرمادا مانەوە هەتا مردن.

**٤٠٣٣-** «أخبرنا محمد بن الْمُثَنَّى عن عبد الأعلى نَحْوَهُ»[١].

**واتە: موحەممەدی کوڕی موسەنا هەواڵی پێداوین لە عەبدولئەعلاوە وەکو ئەوە.**

**٤٠٣٤-** «عَنْ قَتَادَةُ وَثَابِتٌ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ نَفَراً مِنْ عُرَيْنَةَ نَزَلُوا فِي الْحَرَّةِ، فَأَتَوْا النَّبِيَّ ﷺ، فَاجْتَوَوْا الْمَدِينَةَ، فَأَمَرَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَكُونُوا فِي إِبِلِ الصَّدَقَةِ، وَأَنْ يَشْرَبُوا مِنْ أَلْبَانِهَا وَأَبْوَالِهَا، فَقَتَلُوا الرَّاعِيَ، وَارْتَدُّوا عَنِ الْإِسْلَامِ، وَاسْتَاقُوا الْإِبِلَ، فَبَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي آثَارِهِمْ، فَجِيءَ بِهِمْ، فَقَطَّعَ أَيْدِيَهُمْ وَأَرْجُلَهُمْ، وَسَمَّرَ أَعْيُنَهُمْ، وَأَلْقَاهُمْ فِي الْحَرَّةِ، قَالَ أَنَسٌ: فَلَقَدْ رَأَيْتُ أَحَدَهُمْ يَكْدُمُ الْأَرْضَ بِفِيهِ عَطَشاً حَتَّى مَاتُوا»[٢].

واتە: قەتادە و ثابت دەگێڕنەوە، لە ئەنەسەوە ﷺ، خەڵکانێک لە هۆزی عورەینە دابەزینە (الْحَرَّةِ) پاشان هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ژیانی مەدینە قورس بوو بەلایانەوە نەخۆش کەتن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردن لەناو وشتری زەکاتدا بمێننەوەو لە شیرو میزەکەی بخۆنەوە، ئەوانیش شوانەکەیان کوشت و لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە و وشترەکانیان برد، پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بە دوایاندا، پاشان هێنران، دەست و قاچیانی بڕیەوەو چاویانی هەڵکۆڵی و لە گەرمادا فڕێدان، ئەنەس وتی: هی وایانم بینی لە تینوێتیدا خۆڵی زەوی دەخوارد هەتا مردن.

## باسی جیاوازی تەڵحەی کوڕی موصریف و موعاویەی کوڕی صالەح لەسەر یەحیای کوڕی سەعید لەم فەرموودەدا

**٤٠٣٥-** «عَنْ طَلْحَةَ بن مُصَرِّفٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَدِمَ أَعْرَابٌ مِنْ عُرَيْنَةَ إِلَى نَبِيِّ اللَّهِ ﷺ فَأَسْلَمُوا، فَاجْتَوَوْا الْمَدِينَةَ حَتَّى اصْفَرَّتْ أَلْوَانُهُمْ، وَعَظُمَتْ بُطُونُهُمْ،

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.





فَبَعَثَ بِهِمْ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ إِلَى لِقَاحٍ لَهُ، فَأَمَرَهُمْ أَنْ يَشْرَبُوا مِنْ أَلْبَانِهَا وَأَبْوَالِهَا حَتَّى صَحُّوا، فَقَتَلُوا رُعَاتَهَا، وَاسْتَاقُوا الْإِبِلَ، فَبَعَثَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ فِي طَلَبِهِمْ، فَأُتِيَ بِهِمْ، فَقَطَّعَ أَيْدِيَهُمْ وَأَرْجُلَهُمْ، وَسَمَّرَ أَعْيُنَهُمْ، قَالَ أَمِيرُ الْمُؤْمِنِينَ عَبْدُ الْمَلِكِ لِأَنَسٍ: وَهُوَ يُحَدِّثُهُ هَذَا الْحَدِيثَ، بِكُفْرٍ أَوْ بِذَنْبٍ؟ قَالَ: بِكُفْرٍ»[١].

**واتە: طەڵحەی کوڕی موصەڕڕیف دەگێڕێتەوە، لە یەحیای کوڕی سەعید، لە ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: کومەڵە دەشتەکیەک لە عورەینە هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ مسوڵمان بوون حەزیان نەکرد لە مەدینە بمێننەوە (نەخۆش کەوتن)، چونکە بە پێی حەزو ئارەزووی ئەوان نەبوو تا ڕەنگیان زەردبوویەوەو ورگیان ئاوسا، پێغەمبەری خوا ﷺ ناردنی بۆ لای کۆمەڵە وشترێکی شیردەردا (کە هی خەزێنەی بوو). وە فەرمانی پێکردن لە شیرو میزەکەی بخۆنەوە تا ساغ دەبنەوە، (دوای ساغ بوونەوەیان) شوانی وشترەکانیان کوشت و وشترەکانیان برد، پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکی نارد بۆ سۆراغیان و هێنانیان بۆ لای، دەست و قاچیانی بڕیەوەو چاویانی دەرهێنا، ئەمیری بڕواداران عەبدولمەلیک بە ئەنەسی وت: کاتێ ئەم فەرموودەی بۆ باس کرد: بە هۆی بێبڕوابوون وای لێکردن یان بە هۆی گوناهو تاوان؟ وتی: بە هۆی بێبڕوابوون.**

**٤٠٣٦-** «عَنْ مُعَاوِيَةَ بن صَالِحٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ قَالَ: قَدِمَ نَاسٌ مِنَ الْعَرَبِ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأَسْلَمُوا، ثُمَّ مَرِضُوا، فَبَعَثَ بِهِمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى لِقَاحٍ لِيَشْرَبُوا مِنْ أَلْبَانِهَا، فَكَانُوا فِيهَا، ثُمَّ عَمَدُوا إِلَى الرَّاعِي غُلَامِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَتَلُوهُ، وَاسْتَاقُوا اللِّقَاحَ، فَزَعَمُوا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: اللَّهُمَّ عَطِّشْ مَنْ عَطَّشَ آلَ مُحَمَّدٍ اللَّيْلَةَ، فَبَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي طَلَبِهِمْ، فَأُخِذُوا، فَقَطَّعَ أَيْدِيَهُمْ وَأَرْجُلَهُمْ، وَسَمَلَ أَعْيُنَهُمْ، وَبَعْضُهُمْ يَزِيدُ عَلَى بَعْضٍ، إِلَّا أَنَّ مُعَاوِيَةَ قَالَ فِي هَذَا الْحَدِيثِ: اسْتَاقُوا إِلَى أَرْضِ الشِّرْكِ»[٢].

**واتە: موعاویەی کوڕی صاڵح دەگێڕێتەوە، لە یەحیا، لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ دەڵێ: خەڵکانێکی عەرەب هاتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ مسوڵمان بوون، پاشان نەخۆش کەوتن، پێغەمبەری خوا ﷺ ناردنی بۆ لای کۆمەڵە وشترێکی**

---

**(١) صحيح الإسناد.**

**(٢) ضعيف الإسناد.**




شیردار (كە هی خەزێنەی بوو) تا لە شیرەكانیان بخۆنەوە، ئەوان لە ناویاندا بوون، پاشان دەستدرێژیان كردە سەر شوانەكەی پێغەمبەرو كوشتیان و دەستیان گرت بەسەر وشترەكاندا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوایە ئەوەی ئەم شەو خانەوادەی موحەممەدی تینوو كرد تینووی بكەی، پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵكی نارد بۆ سۆراغیان و هێنانیان بۆ لای، دەست و قاچیانی بڕیەوەو چاویانی دەرهێنا. هەندێ لە فەرمووده ناسەكان زیادیكردوە ئەوە نەبی موعاویە لە فەرموودەدا وتویەتی: (ڕۆیشتن بۆ زەوی هاوبەشدانان).

**٤٠٣٧-** «عَنْ هِشَامِ بن عُرْوَةَ، عَنْ أبيه، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: أَغَارَ قَوْمٌ عَلَى لِقَاحِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأَخَذَهُمْ فقَطَّعَ أَيْدِيَهُمْ، وَأَرْجُلَهُمْ، وَسَمَلَ أَعْيُنَهُمْ»[١].

واتە: هیشامی كوڕی عوروە دەگێڕیتەوە، لە باوكیەوە، لە عائیشەوە دەڵێ: خەڵكانێک هێرشیان بردە سەر وشترەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش گرتنی دەست و قاچەكانیانی بڕیەوە و چاویانی هەڵكۆڵی.

**٤٠٣٨-** «عَنْ هِشَامِ بن عُرْوَةَ، عَنْ أبيه، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ قَوْماً أَغَارُوا عَلَى لِقَاحِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأُتِيَ بِهِمُ النَّبِيُّ ﷺ، فَقَطَّعَ النَّبِيُّ ﷺ أَيْدِيَهُمْ وَأَرْجُلَهُمْ، وَسَمَلَ أَعْيُنَهُمْ»[٢].

واتە: هیشامی كوڕی عوروە دەگێڕیتەوە، لە باوكیەوە، لە عائیشەوە، خەڵكانێک هێرشیان بردە سەر وشترەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش گرتنی دەست و قاچەكانیانی بڕیەوە و چاویانی هەڵكۆڵی.

**٤٠٣٩-** «عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ قَوْماً أَغَارُوا عَلَى إِبِلِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَطَّعَ أَيْدِيَهُمْ وَأَرْجُلَهُمْ، وَسَمَلَ أَعْيُنَهُمْ»[٣].

واتە: هیشام دەگێڕیتەوە، لە باوكیەوە، لە عائیشەوە، خەڵكانێک هێرشیان بردە سەر وشترەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش گرتنی دەست و قاچەكانیانی بڕیەوە و چاویانی هەڵكۆڵی.

---

(١) صحيح الإسناد. أخرجه إبن ماجه: ٢٥٧٩.

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح لغيره.




**٤٠٤٠-** «عَنْ هِشَامٍ بن عُرْوَةَ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، أَنَّهُ قَالَ: أَغَارَ نَاسٌ مِنْ عُرَيْنَةَ عَلَى لِقَاحِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَاسْتَاقُوهَا وَقَتَلُوا غُلَاماً لَهُ، فَبَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي آثَارِهِمْ، فَأُخِذُوا، فَقَطَّعَ أَيْدِيَهُمْ وَأَرْجُلَهُمْ، وَسَمَلَ أَعْيُنَهُمْ»[١].

**واتە: هیشامی کوڕی عوروە دەگێڕێتەوە، لە عوروەی کوڕی زوبەیرەوە وتی: خەڵکانێک لە عورەینە هێرشیان بردە سەر وشترەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ، دەستیان بەسەریاندا گرت و شوانەکەیان کوشت، پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بە دوایاندا، بە دیلی هێنرانەوە، دەست و قاچەکانیانی بڕیەوە و چاویانی هەڵکۆڵی (چونکە ئاوایان لە شوانەکە کردبوو)**

**٤٠٤١-** «عَنْ عبد اللَّهِ بن عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَنَزَلَتْ فِيهِمْ آيَةُ الْمُحَارَبَةِ»[٢].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عوبەیدوڵڵا دەگێڕێتەوە، لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە، لە پێغەمبەری خواوە ﷺ ئایەتی جەنگ و دژایەتی لە بارەی ئەوانەوە دابەزی (کە شوانەکەیان کوشت).**

**٤٠٤٢-** «عَنْ أَبِي الزِّنَادِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمَّا قَطَّعَ الَّذِينَ سَرَقُوا لِقَاحَهُ، وَسَمَلَ أَعْيُنَهُمْ بِالنَّارِ، عَاتَبَهُ اللَّهُ فِي ذَلِكَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ﴿٣٣﴾ ﴾المائدة، الْآيَةَ كُلَّهَا»[٣].

**واتە: ئەبو زیناد ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ دەستی ئەوانەی بڕیەوە کە وشترەکانیان دزی، وە چاوی هەڵکۆڵین بە ئاسنی سورەوەکراو، خوا ﷻ سەرزەنشتی کرد لە سەر ئەوە، پاشان خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ﴿٣٣﴾ ﴾ (واتە: بەڕاستی تۆڵەی ئەوانەی کە جەنگ و دوژمنایەتی ئەکەن لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەیدا)، هەموو ئایەتەکە بە گشتی.**

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٣٦٩ و ٤٣٧٠.

(٣) ضعيف الإسناد.




**٤٠٤٣-** «عَنْ سُلَيْمَانَ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: إِنَّمَا سَمَلَ النَّبِيُّ ﷺ أَعْيُنَ أُولَئِكَ، لِأَنَّهُمْ سَمَلُوا أَعْيُنَ الرُّعَاةِ»[1].

**واته: سولەیمانی تەیمی دەگێڕێتەوە، لە ئەنەسەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەبەر ئەوە چاوی ئەوانەی هەڵکۆڵی، چونکە ئەوان چاوی شوانەکەیان هەڵکۆڵی.**

**٤٠٤٤-** «عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أبي قِلَابَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً مِنَ الْيَهُودِ قَتَلَ جَارِيَةً مِنَ الْأَنْصَارِ عَلَى حُلِيٍّ لَهَا، وَأَلْقَاهَا فِي قَلِيبٍ، وَرَضَخَ رَأْسَهَا بِالْحِجَارَةِ، فَأُخِذَ فَأَمَرَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُرْجَمَ حَتَّى يَمُوتَ»[2].

**واته: ئەیوب دەگێڕێتەوە، لە ئەبو قیلابە، لە ئەنەسەوە ﷺ، پیاوێک لە جولەکەکان کەنیزەکێکی لە ئەنصارەکان کوشت لەبەر پارچە خشڵێک (تا لێی ببات و کەس پێی نەزانێ)، پاشان فڕێی دایە ناو بیرێکەوەو بە بەرد سەری پان کردەوە، هێنرا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش فەرمانی کرد بەردباران بکرێت تا دەمرێ.**

**٤٠٤٥-** «عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أبي قِلَابَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً قَتَلَ جَارِيَةً مِنَ الْأَنْصَارِ عَلَى حُلِيٍّ لَهَا، ثُمَّ أَلْقَاهَا فِي قَلِيبٍ، وَرَضَخَ رَأْسَهَا بِالْحِجَارَةِ فَأَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يُرْجَمَ حَتَّى يَمُوتَ»[3].

**واته: ئەیوب دەگێڕێتەوە، لە ئەبو قیلابە، لە ئەنەسەوە ﷺ، پیاوێک لە جولەکەکان کەنیزەکێکی لە ئەنصارەکان کوشت لەبەر پارچە خشڵێک، پاشان فڕێی دایە ناو بیرێکەوەو بە بەرد سەری پان کردەوە، هێنرا بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، ئەویش فەرمانی کرد بەردباران بکرێت تا دەمرێ.**

**٤٠٤٦-** «عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ﴿٣٣﴾﴾ المائدة، قَالَ: نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ فِي الْمُشْرِكِينَ، فَمَنْ تَابَ مِنْهُمْ قَبْلَ أَنْ يُقْدَرَ عَلَيْهِ، لَمْ يَكُنْ عَلَيْهِ سَبِيلٌ، وَلَيْسَتْ هَذِهِ الْآيَةُ لِلرَّجُلِ الْمُسْلِمِ فَمَنْ قَتَلَ، وَأَفْسَدَ فِي الْأَرْضِ، وَحَارَبَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ، ثُمَّ لَحِقَ بِالْكُفَّارِ قَبْلَ أَنْ يُقْدَرَ عَلَيْهِ لَمْ يَمْنَعْهُ ذَلِكَ أَنْ يُقَامَ فِيهِ الْحَدُّ الَّذِي أَصَابَ»[4].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٧١، والترمذي: ٧٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤١٣، ومسلم: ١٦٧٢/١٦، وأبو داود: ٤٥٢٨، والترمذي: ١٣٩٤، وابن ماجه: ٢٦٦٥.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح الإسناد. أخرجه أبو داود: ٤٣٥٨.




واتە: عیکریمە دەگێڕێتەوە، لە ئیبنو عەبباسەوە، لە بارەی فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ﴿٣٣﴾﴾ (واتە: بەڕاستی تۆڵەی ئەوانەی کە جەنگ و دوژمنایەتی ئەکەن لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەیدا، وتی: ئەم ئایەتە لە بارەی هاوبەشدانەرانەوە دابەزیوە، هەرکەس لە ئەوان پێش ئەوەی دەسەڵات بە سەریدا هەبێ تەوبە بکات، ئەوە هیچ ڕێگایەک نیە لەسەری، ئەم ئایەتەیش بۆ پیاوی مسوڵمان نیە، جا هەرکەس بکوژێ و خراپەکاری لەسەر زەویدا دروست بکات و دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەیشی بکات، پاشان پەیوەندی بکات بە بێبڕوایانەوە پێش ئەوەی دەسەڵات هەبێ بە سەریدا، ئەوە نابێتە بەربەست کە تۆڵەی بە سەردا جێبەجێ نەکرێ.

## قەدەغەکردنی شێواندنی جەستە (پێش کوشتن، یان دوای کوشتن)

**٤٠٤٧-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَحُثُّ فِي خُطْبَتِهِ عَلَى الصَّدَقَةِ، وَيَنْهَى عَنِ الْمُثْلَةِ»[١].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە وتارەکەیدا هاوەڵانی هاندەدا لە سەر خێر و بەخشین، وە قەدەغەی دەکردن لە شێواندنی لاشەی مردوو.

## لە خـــاچـدان

**٤٠٤٨-** «عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ إِلَّا بِإِحْدَى ثَلَاثِ خِصَالٍ: زَانٍ مُحْصَنٌ يُرْجَمُ، أَوْ رَجُلٌ قَتَلَ رَجُلاً مُتَعَمِّداً فَيُقْتَلُ، أَوْ رَجُلٌ يَخْرُجُ مِنَ الْإِسْلَامِ يُحَارِبُ اللَّهَ ﷻ وَرَسُولَهُ فَيُقْتَلُ أَوْ يُصْلَبُ أَوْ يُنْفَى مِنَ الْأَرْضِ»[٢].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حەڵاڵ نیە خوێنی هیچ مسوڵمانێک مەگەر بە سێ سیفەت نەبێ: زیناکەرێکی ژن یان پیاو بەرد باران دەکرێ، یان پیاوێک بە ئەنقەست پیاوێکی تر بکوژێ ئەوە دەکوژرێتەوە، یان پیاوێک لە ئیسلام دەربچێ و دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەی بکات، جا یان دەکوژرێ، یان لە خاچ دەدرێت، یان لەو خاکە دووردەخرێتەوە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٣٥٣.




## یاخی بوونی کۆیلە بۆ ژێر دەسەڵاتی هاوبەشدانەران، وە باسی جیاوازی دەستەواژەی ئەوانەی فەرموودەکەی جەریریان گێڕاوەتەوە لەو جیاوازیە لەسەر شەعبی

**٤٠٤٩-** «عَنِ مَنْصور عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ جَرِيرٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا أَبَقَ الْعَبْدُ لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلَاةٌ حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى مَوَالِيهِ»[1].

**واتە: مەنصور دەگێڕێتەوە، لە شەعبی، لە جەریرەوە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر کۆیلە یاخی بوو لە خاوەنەکەی ئەوە نوێژی دروست نیە تا دەگەڕێتەوە بۆ لای.**

**٤٠٥٠-** «عَنِ مُغيرة، عَنِ الشَّعْبِيِّ قَالَ: كَانَ جَرِيرٌ ﵁ يُحَدِّثُ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ إِذَا أَبَقَ الْعَبْدُ لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلَاةٌ، وَإِنْ مَاتَ مَاتَ كَافِراً، وَأَبَقَ غُلَامٌ لِجَرِيرٍ فَأَخَذَهُ فَضَرَبَ عُنُقَهُ»[2].

**واتە: موغیبرە دەگێڕێتەوە، لە شەعبیەوە دەڵێ: جەریر ﵁ دەیگێڕایەوە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ: ئەگەر کۆیلە یاخی بوو لە خاوەنەکەی ئەوە نوێژی دروست نیە تا دەگەڕێتەوە بۆ لای، وە ئەگەر مرد بە بێبڕوایی مردوە، کۆیلەیەکی جەریر یاخی بوو ئەویش گرتی و دای لە گەردنی.**

**٤٠٥١-** «عَنِ المُغيرة، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵁ قَالَ: إِذَا أَبَقَ الْعَبْدُ إِلَى أَرْضِ الشِّرْكِ، فَلَا ذِمَّةَ لَهُ»[3].

**واتە: موغیبرە دەگێڕێتەوە، لە شەعبی، لە جەریری کوڕی عەبدوڵلاوە ﵁ وتی: ئەگەر کۆیلە یاخی بوو چوو بۆ ناو زەوی هاوبەشدانەران، ئەوە هیچ پارێزگاریەکی بۆ نیە.**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٦٧/١٢٢ و ٦٩/١٢٣ و ٧٠/١٢٤، وأبو داود: ٤٣٦٠.

(٢) شاذ.

(٣) صحيح.




## جیاوازی لەسەر ئەبو ئیسحاق

**٤٠٥٢-** «عَنْ حُمَيْدِ بن عبد الرحمن، عن أبيه، عن أَبِي إِسحَاقَ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ جَرِيرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا أَبَقَ الْعَبْدُ إِلَى أَرْضِ الشِّرْكِ فَقَدْ حَلَّ دَمُهُ»[1].

**واتە: حومەیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمان دەگێڕێتەوە، لە باوکی، لە ئەبو ئیسحاقەوە، لە شەعبی، لە جەریر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر کۆیلە یاخی بێت و بچێت بۆ زەوی هاوبەشدانەران ئەوە خوێنی حەڵاڵ دەبێت.**

**٤٠٥٣-** «عَنْ إسرائيل عن أبي إِسحَاقَ، عَنْ جَرِيرٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِذَا أَبَقَ الْعَبْدُ إِلَى أَرْضِ الشِّرْكِ فَقَدْ حَلَّ دَمُهُ»[2].

**واتە: ئیسرائیل دەگێڕێتەوە، لە ئەبو ئیسحاق، لە جەریرەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر کۆیلە یاخی بێت و بچێت بۆ زەوی هاوبەشدانەران ئەوە خوێنی حەڵاڵ دەبێت.**

**٤٠٥٤-** «عَنْ خَالِدِ عن عبد الرحمن عن أَبِي إِسحَاقَ، عَنْ الشَّعْبِيِّ، عَنْ جَرِيرٍ ﷺ قَالَ: أَيُّمَا عَبْدٍ أَبَقَ إِلَى أَرْضِ الشِّرْكِ فَقَدْ حَلَّ دَمُهُ»[3].

**واتە: خالدی کوڕی عەبدوڕڕەحمان دەگێڕێتەوە، لە ئەبو ئیسحاق، لە شەعبی، لە جەریرەوە ﷺ دەڵێ: هەر کۆیلەیەک یاخی بێت و بچێت بۆ زەوی هاوبەشدانەران ئەوا خوێنی حەڵاڵ دەبێت.**

**٤٠٥٥-** «عَنْ إسرائيل عن أَبِي إِسحَاقَ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ جَرِيرٍ ﷺ قَالَ: أَيُّمَا عَبْدٍ أَبَقَ إِلَى أَرْضِ الشِّرْكِ فَقَدْ حَلَّ دَمُهُ»[4].

**واتە: ئیسرائیل دەگێڕێتەوە، لە ئەبو ئیسحاق، لە شەعبی، لە جەریرەوە ﷺ دەڵێ: هەر کۆیلەیەک یاخی بێت و بچێت بۆ زەوی هاوبەشدانەران ئەوە خوێنی حەڵاڵ دەبێت.**

---

(١) ضعيف الإسناد.

(٢) ضعيف الإسناد.

(٣) ضعيف الإسناد.

(٤) ضعيف الإسناد.




**٤٠٥٦-** «عَنْ شريك عن أَبِي إِسحَاقَ، عَنْ عَامِرٍ، عَنْ جَرِيرٍ ﷺ قَالَ: أَيُّمَا عَبْدٍ أَبَقَ مِنْ مَوَالِيهِ وَلَحِقَ بِالْعَدُوِّ فَقَدْ أَحَلَّ بِنَفْسِهِ»[١].

**واتە: شەریک دەگێڕێتەوە، لە ئەبو ئیسحاق، لە عامرەوە، لە جەریر ﷺ دەڵێ: هەر کۆیلەیەک یاخی بێت لە خاوەنەکەی و پەیوەندی بکات بە دوژمنەوە، ئەوە خۆی خوێنی خۆی حەڵاڵ کردوە.**

## حوکم و بڕیار لە بارەی هەڵگەڕاوە لە دین

**٤٠٥٧-** «عَنْ عُثْمَانَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَا يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ إِلَّا بِإِحْدَى ثَلَاثٍ: رَجُلٌ زَنَى بَعْدَ إِحْصَانِهِ فَعَلَيْهِ الرَّجْمُ، أَوْ قَتَلَ عَمْداً فَعَلَيْهِ الْقَوَدُ، أَوِ ارْتَدَّ بَعْدَ إِسْلَامِهِ فَعَلَيْهِ الْقَتْلُ»[٢].

**واتە: عوسمان ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: حەڵاڵ نیە خوێنی مسوڵمان مەگەر بە یەکێک لەم سیانە: پیاوێک زینا بکات دوای ژن هێنانی، ئەوە دەبێ بەردباران بکرێ، یان کەسێک بکوژێ بە ئەنقەست، ئەوە پێویستە تۆڵەی لێ بکرێتەوە (واتە: بکوژرێت)، یان هەڵبگەڕێتەوە دوای مسوڵمانبوونی ئەوە دەبێ بکوژرێت.**

**٤٠٥٨-** «عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَا يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ إِلَّا بِثَلَاثٍ: أَنْ يَزْنِيَ بَعْدَ مَا أُحْصِنَ، أَوْ يَقْتُلَ إِنْسَاناً فَيُقْتَلَ، أَوْ يَكْفُرَ بَعْدَ إِسْلَامِهِ فَيُقْتَلَ»[٣].

**واتە: عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: حەڵاڵ نیە خوێنی مسوڵمان مەگەر بە یەکێک لەم سیانە: لە دوای ژن هێنانی زینا بکات، یان کەسێک بکوژێ، دەکوژرێتەوە، یان لە دوای مسوڵمانبوونی بێبڕوا ببێتەوە، ئەوە دەکوژرێت.**

---

(١) ضعيف الإسناد.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




**٤٠٥٩-** «عَنْ عِكْرِمَةَ قَالَ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ فَاقْتُلُوهُ»[١].

**واتە: عیکریمە دەڵێ: ئیبنو عەبباس وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس ئاینەکەی خۆی گۆڕیەوە (کە ئیسلامە بە ئاینێکی دیکە)، ئەوە بیکوژن.**

**٤٠٦٠-** «عَنْ عِكْرِمَةَ، أَنَّ نَاساً ارْتَدُّوا عَنِ الْإِسْلَامِ، فَحَرَّقَهُمْ عَلِيٌّ بِالنَّارِ، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: لَوْ كُنْتُ أَنَا لَمْ أُحَرِّقْهُمْ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تُعَذِّبُوا بِعَذَابِ اللَّهِ أَحَداً، وَلَوْ كُنْتُ أَنَا لَقَتَلْتُهُمْ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ فَاقْتُلُوهُ»[٢].

**واتە: عیکریمە دەگێڕێتەوە، خەڵکانێک هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام، عەلی بە ئاگر سوتاندنی، ئیبنو عەبباس وتی: ئەگەر من بوومایە نەمدەسووتاندن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ کەسێک سزا مەدەن بەوەی خوا ﷻ سزای پێ دەدات، ئەگەر من بوومایە دەمکوشتن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس ئاینەکەی خۆی گۆڕیەوە (کە ئیسلامە بە ئاینێکی تر)، ئەوە بیکوژن.**

**٤٠٦١-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ فَاقْتُلُوهُ»[٣].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس ئاینەکەی خۆی گۆڕیەوە(کە ئیسلامە بە ئاینێکی تر)، ئەوە بیکوژن.**

**٤٠٦٢-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ فَاقْتُلُوهُ»[٤].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس ئاینەکەی خۆی گۆڕیەوە(کە ئیسلامە بە ئاینێکی تر)، ئەوە بیکوژن.**

**٤٠٦٣-** «عَنِ الْحَسَنِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ فَاقْتُلُوهُ»[٥].

**واتە: حەسەن ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس ئاینەکەی خۆی گۆڕیەوە(کە ئیسلامە بە ئاینێکی تر)، ئەوە بیکوژن.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠١٧ و ٦٩٢٢، وأبو داود: ٤٣٥١، والترمذي: ١٤٥٨، وإبن ماجه: ٢٥٣٥.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.

(٥) صحيح لغيره.




٤٠٦٤- «عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ فَاقْتُلُوهُ»(١).

واتە: ئەنەس دەگێڕێتەوە، ئیبنو عەبباس گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس ئاینەکەی خۆی گۆڕیەوە (کە ئیسلامە بە ئاینێکی تر)، ئەوە بیکوژن.

٤٠٦٥- «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ عَلِيّاً أُتِيَ بِنَاسٍ مِنَ الزُّطِّ يَعْبُدُونَ وَثَناً فَأَحْرَقَهُمْ، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: إِنَّمَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ فَاقْتُلُوهُ»(٢).

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: کۆمەڵە خەڵکێکیان هێنا بۆ لای عەلی دوای مسوڵمان بوونیان، بتێکیان دەپەرست لە ناوچەیەک بە ناوی (الزُّطِّ)، ئەویش سووتاندنی، ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس ئاینەکەی خۆی گۆڕیەوە (کە ئیسلامە بە ئاینێکی تر)، ئەوە بیکوژن.

٤٠٦٦- «عَنْ أَبِي بُرْدَةَ بْنِ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ بَعَثَهُ إِلَى الْيَمَنِ، ثُمَّ أَرْسَلَ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ بَعْدَ ذَلِكَ، فَلَمَّا قَدِمَ قَالَ: أَيُّهَا النَّاسُ، إِنِّي رَسُولُ رَسُولِ اللَّهِ إِلَيْكُمْ، فَأَلْقَى لَهُ أَبُو مُوسَى وِسَادَةً لِيَجْلِسَ عَلَيْهَا، فَأُتِيَ بِرَجُلٍ كَانَ يَهُودِيّاً فَأَسْلَمَ، ثُمَّ كَفَرَ، فَقَالَ مُعَاذٌ: لَا أَجْلِسُ حَتَّى يُقْتَلَ قَضَاءُ اللَّهِ وَرَسُولِهِ، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، فَلَمَّا قُتِلَ قَعَدَ»(٣).

واتە: ئەبو بوردەی کوڕی ئەبو موسای ئەشعەری دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ ناردی بۆ یەمەن، پاشان دوای ئەو موعازی کوڕی جەبەلی نارد، کاتێ کە گەیشت وتی: ئەی خەڵکینە، من نێردراوی پێغەمبەری خوام بۆ لاتان، ئەبو موسا سەرینێکی بۆ دانا بۆ ئەوەی لە سەری دابنیشێ، لەو کاتەدا پیاوێکی جولەکەیان هێنا مسوڵمان بوو بوو، پاشان کافر بووەوە، موعاز وتی: دانانیشم تا ئەم پیاوە نەکوژرێ بە بڕیاری خواو پێغەمبەرەکەی، سێ جار دووبارەی کردەوە، کاتێ کوژرا دانیشت.

٤٠٦٧- «عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ فَتْحِ مَكَّةَ أَمَّنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ النَّاسَ، إِلَّا أَرْبَعَةَ نَفَرٍ وَامْرَأَتَيْنِ وَقَالَ: اقْتُلُوهُمْ، وَإِنْ وَجَدْتُمُوهُمْ مُتَعَلِّقِينَ بِأَسْتَارِ الْكَعْبَةِ، عِكْرِمَةُ بْنُ أَبِي جَهْلٍ وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ خَطَلٍ وَمَقِيسُ بْنُ صُبَابَةَ وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَعْدِ بْنِ أَبِي السَّرْحِ، فَأَمَّا

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

عَبْدُ اللَّهِ بْنُ خَطَلٍ فَأُدْرِكَ وَهُوَ مُتَعَلِّقٌ بِأَسْتَارِ الْكَعْبَةِ فَاسْتَبَقَ إِلَيْهِ سَعِيدُ بْنُ حُرَيْثٍ وَعَمَّارُ بْنُ يَاسِرٍ فَسَبَقَ سَعِيدٌ عَمَّاراً، وَكَانَ أَشَبَّ الرَّجُلَيْنِ فَقَتَلَهُ، وَأَمَّا مَقِيسُ بْنُ صُبَابَةَ فَأَدْرَكَهُ النَّاسُ فِي السُّوقِ فَقَتَلُوهُ، وَأَمَّا عِكْرِمَةُ فَرَكِبَ الْبَحْرَ، فَأَصَابَتْهُمْ عَاصِفٌ، فَقَالَ أَصْحَابُ السَّفِينَةِ: أَخْلِصُوا، فَإِنَّ آلِهَتَكُمْ لَا تُغْنِي عَنْكُمْ شَيْئاً هَاهُنَا. فَقَالَ عِكْرِمَةُ: وَاللَّهِ لَئِنْ لَمْ يُنَجِّنِي مِنَ الْبَحْرِ إِلَّا الْإِخْلَاصُ، لَا يُنَجِّينِي فِي الْبَرِّ غَيْرُهُ، اللَّهُمَّ إِنَّ لَكَ عَلَيَّ عَهْداً، إِنْ أَنْتَ عَافَيْتَنِي مِمَّا أَنَا فِيهِ أَنْ آتِيَ مُحَمَّداً ﷺ حَتَّى أَضَعَ يَدِي فِي يَدِهِ، فَلَأَجِدَنَّهُ عَفُوّاً كَرِيماً، فَجَاءَ فَأَسْلَمَ، وَأَمَّا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَعْدِ بْنِ أَبِي السَّرْحِ، فَإِنَّهُ اخْتَبَأَ عِنْدَ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ، فَلَمَّا دَعَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ النَّاسَ إِلَى الْبَيْعَةِ، جَاءَ بِهِ حَتَّى أَوْقَفَهُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، بَايِعْ عَبْدَ اللَّهِ، قَالَ: فَرَفَعَ رَأْسَهُ، فَنَظَرَ إِلَيْهِ، ثَلَاثاً كُلَّ ذَلِكَ يَأْبَى، فَبَايَعَهُ بَعْدَ ثَلَاثٍ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى أَصْحَابِهِ فَقَالَ: أَمَا كَانَ فِيكُمْ رَجُلٌ رَشِيدٌ يَقُومُ إِلَى هَذَا حَيْثُ رَآنِي كَفَفْتُ يَدِي عَنْ بَيْعَتِهِ فَيَقْتُلُهُ، فَقَالُوا: وَمَا يُدْرِينَا يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا فِي نَفْسِكَ، هَلَّا أَوْمَأْتَ إِلَيْنَا بِعَيْنِكَ؟ قَالَ: إِنَّهُ لَا يَنْبَغِي لِنَبِيٍّ أَنْ يَكُونَ لَهُ خَائِنَةُ أَعْيُنٍ»[1].

**واتە: موصعەبی کوڕی سەعد دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: ئەو ڕۆژەی فەتحی مەککە کرا پێغەمبەری خوا ﷺ ئاسایش (گرەنتی نەکوژران)ی دا بە هەموو خەڵکی جگە لە چوار پیاو و دوو ژن، وە فەرمووی: بیانکوژن، ئەگەر بینیتان خۆیان هەڵواسیبوو بە دیواری کەعبەشدا، عیکریمەی کوڕی ئەبو جەهل و عەبدوڵڵای کوڕی خەطەل و مەقیسی کوڕی صوبابەو عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو سەرح، جا عەبدوڵڵای کوڕی خەطەل خۆی هەڵواسیبوو بە دیواری کەعبەدا، سەعیدی کوڕی حورەیث و عەمماری کوڕی یاسر پێش بڕکێیان کرد بیکوژن، سەعید پێش عەمار کەوت و کوشتی، چونکە ئەو گەنجتر بوو، بەڵام قەیسی کوڕی صوبابە، خەڵکەکە لە بازاڕدا بینیانەوەو کوشتیان، بەڵام عیکریمە ڕایکرد بۆ ناو دەریا تووشی گەردەلوول بوون، ئەوانەی لەناو کەشتیەکە بوون وتیان: نیەتتان پاک بکەنەوە بەڕاستی پەرستراوەکانتان هیچ سودێکتان پێ ناگەیەنێ لێرەدا، عیکریمە وتی: سوێند بە خوا ئەگەر ڕزگارم نەکات لە دەریا جگە نیەت پاکی، ئەوە لە دەشتیش ڕزگارم ناکات جگە لەوە نەبێ، خوایە پەیمان بێت ئەگەر تۆ بمپارێزی لەوەی تێدام بچم بۆ لای موحەممەد ﷺ دەستەکانم بخەمە ناو دەستی بێگومان وا دەبینم بەبەزەیی و بەخشندەیە، پاشان هات و مسوڵمان بوو، بەڵام عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی کوڕی**

---

(١) صحيح. أخرجه وأبو داود: ٢٦٨٣ و ٤٣٥٩.




ئەبو سەرح، خۆی لای عوسمان شاردبویەوە، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکەکەی بانگ کرد بەیعەتی پێ بدەن، عوسمان هێنای لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ وەستاندی، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ عەبدوڵڵا بەیعەتی داوە، سەری بەرزکردەوە تەماشای کرد سێجار هەر سێجارەکە ناڕازی بوو، لە دوای سێ جارەکە بەیعەتی لێوەرگرت، پاشان ڕووی کردە هاوەڵەکانی فەرمووی: ئایا پیاوێکی ژیرتان تێدا نەبوو کاتێ بینیمی دەستم درێژ نەکرد بۆی بەیعەتی لێوەربگرم، هەڵسایەتە گیانی بیکوشتایە، وتیان: ئێمە چۆن بزانین ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چی لە دەرونی تۆدا هەیە، خۆزگە بە چاوت ئاماژەت بکردایە بۆمان؟ فەرمووی: بۆ هیچ پێغەمبەرێک نیە بە چاوەکانی خیانەت بکات.

## پەشیمان بوونەوەی ئەو کەسەی ئاینی گۆڕیوەو هەڵگەڕاوەتەوە

**٤٠٦٨-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ أَسْلَمَ ثُمَّ ارْتَدَّ وَلَحِقَ بِالشِّرْكِ، ثُمَّ تَنَدَّمَ فَأَرْسَلَ إِلَى قَوْمِهِ، سَلُوا لِي رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: هَلْ لِي مِنْ تَوْبَةٍ؟ فَجَاءَ قَوْمُهُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالُوا: إِنَّ فُلَاناً قَدْ نَدِمَ وَإِنَّهُ أَمَرَنَا أَنْ نَسْأَلَكَ: هَلْ لَهُ مِنْ تَوْبَةٍ؟ فَنَزَلَتْ: ﴿ كَيْفَ يَهْدِي اللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا بَعْدَ إِيمَانِهِمْ ﴿٨٦﴾ ﴾ آل عمران، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴿٨٩﴾ ﴾آل عمران، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ فَأَسْلَمَ»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێک لە ئەنصارەکان مسوڵمان بوو، پاشان هەڵگەڕایەوەو پەیوەندی کرد بە هاوبەشدانانەوە، پاشان پەشیمان بوویەوە نامەی نارد بۆ لای قەومەکەی خۆی، پرسیارم بۆ بکەن لە پێغەمبەری خوا ﷺ: بزانن ئایا من تەوبەم بۆ هەیە؟ قەومەکەیشی هاتن بۆ لای پێغەمبەرو وتیان: فڵانە کەس پەشیمان بۆتەوە پێی ڕاگەیاندووین پرسیارت لێ بکەین: ئایا تەوبەی بۆ هەیە؟ پاشان ئەم ئایەتە دابەزیە خوارەوە: ﴿ كَيْفَ يَهْدِي اللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا بَعْدَ إِيمَانِهِمْ ﴿٨٦﴾ ﴾ (واتە: چۆن خوا ﷻ ڕێنمایی گەلێک دەکات بێبڕوابوون دوای بڕواهێنانیان)، تا فەرمایشتی: ﴿ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴿١٧٣﴾ ﴾ (واتە: لێخۆشبوو میهرەبانە)، پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بەدوایدا، ئەویش مسوڵمان بوو.

---

(١) صحيح الإسناد.




**٤٠٦٩-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: فِي سُورَةِ النَّحْلِ: ﴿ مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ ﴿١٠٦﴾ ﴾ النحل، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿١٠٦﴾ ﴾ النحل، فَنُسِخَ، وَاسْتَثْنَى مِنْ ذَلِكَ فَقَالَ: ﴿ ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُواْ مِنۢ بَعۡدِ مَا فُتِنُواْ ثُمَّ جَٰهَدُواْ وَصَبَرُوٓاْ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١١٠﴾ ﴾النحل، وَهُوَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَعْدِ بْنِ أَبِي سَرْحٍ الَّذِي كَانَ عَلَى مِصْرَ كَانَ يَكْتُبُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَزَلَّهُ الشَّيْطَانُ، فَلَحِقَ بِالْكُفَّارِ، فَأَمَرَ بِهِ أَنْ يُقْتَلَ يَوْمَ الْفَتْحِ، فَاسْتَجَارَ لَهُ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ، فَأَجَارَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ»[(١)].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: لە سوورەتی نەحلدا: ﴿ مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ ﴿١٠٦﴾ ﴾ (واتە: ئەو کەسەی بێبڕوابێ بەخوا لە پاش بڕواهێنانی مەگەر کەسێک زۆری لێکرابێت)، هەتا فەرمایشتی: ﴿ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿١٠٦﴾ ﴾ (واتە: وە سزای مەزنیان بۆ دەبێن)، جا نەسخ کراوەتەوە، ئەوەی جیاکردۆتەوەو فەرموویەتی: ﴿ ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُواْ مِنۢ بَعۡدِ مَا فُتِنُواْ ثُمَّ جَٰهَدُواْ وَصَبَرُوٓاْ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١١٠﴾ ﴾ (واتە: پاشان بەڕاستی پەروەردگارت بۆ ئەوانەی کۆچیان کردوە لە پاش ئەوەی سزا دران پاشان جیهادو تێکۆشانیان کردو بە ئارامبوون، بێگومان پەروەردگارت لە دوای ئەوە لێبووردەی میهرەبانە)، ئەویش عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو سەرح بوو، ئەو پیاوە لە میصر بوو نامەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەنووسی، شەیتان هەڵیخەڵەتاند، پەیوەندی کرد بە بێبڕوایانەوە، پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی ڕزگارکردنی مەککەدا فەرمانی کرد بکوژرێ، بەڵام عوسمانی کوڕی عەففان پەنایدا، پێغەمبەریش پەنادانەکەی قبووڵ کرد.**

## حوکم و بڕیار لە بارەی ئەو کەسەی جنێو بە پێغەمبەر ﷺ دەدات

**٤٠٧٠-** «عَنْ عُثْمَانَ الشَّحَّامِ قَالَ: كُنْتُ أَقُودُ رَجُلاً أَعْمَى فَانْتَهَيْتُ إِلَى عِكْرِمَةَ، فَأَنْشَأَ يُحَدِّثُنَا قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ عَبَّاسٍ، أَنَّ أَعْمَى كَانَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَكَانَتْ لَهُ أُمُّ وَلَدٍ، وَكَانَ لَهُ مِنْهَا ابْنَانِ، وَكَانَتْ تُكْثِرُ الْوَقِيعَةَ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَتَسُبُّهُ، فَيَزْجُرُهَا فَلَا تَنْزَجِرُ، وَيَنْهَاهَا فَلَا تَنْتَهِي، فَلَمَّا كَانَ ذَاتَ لَيْلَةٍ ذَكَرْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَوَقَعَتْ فِيهِ، فَلَمْ أَصْبِرْ أَنْ قُمْتُ إِلَى الْمِغْوَلِ، فَوَضَعْتُهُ فِي

---

**(١) صحيح الإسناد.**




بَطْنِهَا، فَاتَّكَأْتُ عَلَيْهِ فَقَتَلْتُهَا، فَأَصْبَحَتْ قَتِيلاً، فَذُكِرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ ، فَجَمَعَ النَّاسَ وَقَالَ: أَنْشُدُ اللَّهَ رَجُلاً لِي عَلَيْهِ حَقٌّ، فَعَلَ مَا فَعَلَ إِلَّا قَامَ، فَأَقْبَلَ الْأَعْمَى يَتَدَلْدَلُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنَا صَاحِبُهَا كَانَتْ أُمَّ وَلَدِي، وَكَانَتْ بِي لَطِيفَةً رَفِيقَةً، وَلِي مِنْهَا ابْنَانِ مِثْلُ اللُّؤْلُؤَتَيْنِ، وَلَكِنَّهَا كَانَتْ تُكْثِرُ الْوَقِيعَةَ فِيكَ وَتَشْتُمُكَ، فَأَنْهَاهَا فَلَا تَنْتَهِي، وَأَزْجُرُهَا فَلَا تَنْزَجِرُ، فَلَمَّا كَانَتِ الْبَارِحَةُ ذَكَرَتْكَ فَوَقَعَتْ فِيكَ، فَقُمْتُ إِلَى الْمِغْوَلِ فَوَضَعْتُهُ فِي بَطْنِهَا، فَاتَّكَأْتُ عَلَيْهَا حَتَّى قَتَلْتُهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَلَا اشْهَدُوا أَنَّ دَمَهَا هَدَرٌ»[1].

**واتە: عوسمانی شەحام دەڵێ: من دەستی پیاوێکی کوێرم گرتبوو تا گەیشتم بە عیکریمە، ئەویش بۆی باسکردین و وتی: ئیبنو عەبباس بۆی باس کردم، کە پیاوێکی نابینا لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ ژنێکی هەبوو دوو منداڵی لێ بوو بوو، ئەو ژنە قسەی ناشرینی زۆری بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەوت، مێردەکەی سەرزەنشتی دەکرد، بەڵام هەر وازی نەدەهێنا، ڕێگریشی لێدەکرد، بەڵام ئەو هەر بەردەوام بوو، (پیاوە پیرەکە گوتی:) شەوێکیان باسی پێغەمبەرم ﷺ کرد، ئەویش جنێوی پێدا، خۆم ڕانەگرت تا هەڵسام بۆ حەربەکەم و کردم بە سکیدا، خۆمم دا بە سەریدا تا کوشتم، ئافرەتەکەیش مرد، ئەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ باسکرا، ئەویش خەڵکەکەی کۆکردەوەو فەرمووی: پیاوێک سوێند دەدەم بە خوا کە حەقی من لە سەری هەیە، ئەوەی کردی کردی، پاشان هەڵساو ڕوویکردە پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من مێردی ئەو ژنەم دایکی منداڵەکانمە، ئافرەتێکی زۆر لە سەرخۆو نەرم و نیان بوو، دوو منداڵیشم لێی هەیە وەکو مرواری وان، بەڵام ئەو زۆر قسەی ناشرین و جنێوی بە تۆ دەدا، منیش ڕێگریم لێدەکرد، وازی نەدەهێنا، سەرزەنشتیشم دەکرد، بەڵام کەڵکی نەبوو، تا ڕۆژێک باسی تۆم کرد ئەویش قسەی پێ کردی و جنێوی پێ گوتی، منیش دەستم برد بۆ حەربەکەو کردم بە سکیدا، خۆمدا بە سەریدا هەتا کوشتم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئێوە ئاگادار بن خوێنی بەفیڕۆ چوو.**

**٤٠٧١-** «عَنْ أَبِي بَرْزَةَ الْأَسْلَمِيِّ ﷺ قَالَ: أَغْلَظَ رَجُلٌ لِأَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﷺ، فَقُلْتُ: أَقْتُلُهُ، فَانْتَهَرَنِي وَقَالَ: لَيْسَ هَذَا لِأَحَدٍ بَعْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[2].

---

(١) صحيح الإسناد. أخرجه أبو داود: ٤٣٦١.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٣٦٣.

واتە: ئەبو بەرزەی ئەسلەمی ﷺ دەڵێ: پیاوێک تووڕە بوو لە ئەبو بەکر ﷺ، وتم: دەیکوژم، لێم تووڕە بوو وتی: ئەوە بۆ هیچ کەسێک نیە لە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ.

## باسی جیاوازی لە سەر ئەعمەش لەم فەرموودەیەدا

**٤٠٧٢-** «عَنْ أَبِي مُعَاوِيَةَ عَنِ الْأَعْمَشِ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ، عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي الْجَعْدِ، عَنْ أَبِي بَرْزَةَ قَالَ: تَغَيَّظَ أَبُو بَكْرٍ عَلَى رَجُلٍ، فَقُلْتُ: مَنْ هُوَ يَا خَلِيفَةَ رَسُولِ اللَّهِ؟ قَالَ: لِمَ؟ قُلْتُ: لِأَضْرِبَ عُنُقَهُ، إِنْ أَمَرْتَنِي بِذَلِكَ، قَالَ: أَفَكُنْتَ فَاعِلاً؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: فَوَاللَّهِ لَأَذْهَبَ عِظَمُ كَلِمَتِيَ الَّتِي قُلْتُ غَضَبَهُ ثُمَّ قَالَ: مَا كَانَ لِأَحَدٍ بَعْدَ مُحَمَّدٍ ﷺ»(١).

واتە: ئەبو موعاویە دەگێڕێتەوە، ئەعمەش دەگێڕێتەوە، لە عەمڕی کوڕی مورە، لە سالمی کوڕی ئەبو جەعد، لە ئەبو بەرزەوە دەڵێ: ئەبو بەکر تووڕە بوو لە پیاوێک، وتم: ئەو پیاوە کێیە ئەی جێنشینی پێغەمبەری خوا؟ وتی: بۆ؟ وتم: بۆ ئەوەی بدەم لە گەردنی، ئەگەر تۆ فەرمانم پێ بکەی، وتی: ئایا تۆ دەیکەی؟ وتم بەڵێ، وتی: سوێند بە خوا وتەکەی من لە لای ئەبو بەکر ئەوەندە گەورە بوو هەتا توڕەییەکەی لابرا، پاشان وتی: ئەوە بۆ هیچ کەسێک نیە لە دوای پێغەمبەر ﷺ.

**٤٠٧٣-** «عَنِ يَعْلَى قَالَ: حَدَّثَنَا الْأَعْمَشُ عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ، عَنْ أَبِي الْبَخْتَرِيِّ، عَنْ أَبِي بَرْزَةَ قَالَ: مَرَرْتُ عَلَى أَبِي بَكْرٍ وَهُوَ مُتَغَيِّظٌ عَلَى رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِهِ فَقُلْتُ: يَا خَلِيفَةَ رَسُولِ اللَّهِ، مَنْ هَذَا الَّذِي تَغَيَّظُ عَلَيْهِ؟ قَالَ: وَلِمَ تَسْأَلُ؟ قُلْتُ: أَضْرِبُ عُنُقَهُ، قَالَ: فَوَاللَّهِ لَأَذْهَبَ عِظَمُ كَلِمَتِي غَضَبَهُ ثُمَّ قَالَ: مَا كَانَتْ لِأَحَدٍ بَعْدَ مُحَمَّدٍ ﷺ»(٢).

واتە: یەعلا دەڵێ: ئەعمەش بۆی باس کردین، لە عەمڕی کوڕی مورە، لە ئەبو بوختەری، لە ئەبو بەرزەوە دەڵێ: تێپەڕیم بە لای ئەبو بەکردا تووڕە بوو لە یەکێک لە هاوەڵەکانی، وتم: ئەی جێنشینی پێغەمبەری خوا ئەو کەسە کێیە کە لێی تووڕە بووی؟ وتی: بۆ دەپرسی؟ وتم: دەدەم لە گەردنی، وتی: سوێند بە خوا وتەکەی من لە لای ئەبو بەکر ئەوەندە گەورە بوو هەتا توڕەییەکەی لابرا، پاشان وتی: ئەوە بۆ هیچ کەسێک نیە لە دوای پێغەمبەر ﷺ.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




**٤٠٧٤-** «عَنْ سُلَيْمَانَ، عَنْ عَمْرِو بن مُرَّةَ، عَنْ أَبِي الْبَخْتَرِيِّ، عَنْ أَبِي بَرْزَةَ قَالَ: تَغَيَّظَ أَبُو بَكْرٍ عَلَى رَجُلٍ، فَقَالَ: لَوْ أَمَرْتَنِي لَفَعَلْتُ؟ قَالَ: أَمَا وَاللَّهِ مَا كَانَتْ لِبَشَرٍ بَعْدَ مُحَمَّدٍ ﷺ»(١).

**واتە: سولەیمان دەگێڕێتەوە، لە عەمڕی کوڕی موڕە، لە ئەبو بەختەری، لە ئەبو بەرزەوە دەڵێ: ئەبو بەکر تووڕە بوو لە پیاوێک، ئەبو بەرەزەڕیش وتی: ئەگەر فەرمانم پێ بکەی ئەنجامی دەدەم (واتە: دەیکوژم) وتی: سوێند بە خوا ئەوە بۆ هیچ کەسێک نیە لە دوای پێغەمبەر ﷺ.**

**٤٠٧٥-** «عَنْ زَيْدٍ، عَنْ عَمْرِو بن مُرَّةَ، عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، عَنْ أَبِي بَرْزَةَ قَالَ: غَضِبَ أَبُو بَكْرٍ عَلَى رَجُلٍ غَضَباً شَدِيداً حَتَّى تَغَيَّرَ لَوْنُهُ، قُلْتُ: يَا خَلِيفَةَ رَسُولِ اللَّهِ، وَاللَّهِ لَئِنْ أَمَرْتَنِي لَأَضْرِبَنَّ عُنُقَهُ، فَكَأَنَّمَا صُبَّ عَلَيْهِ مَاءٌ بَارِدٌ، فَذَهَبَ غَضَبُهُ عَنِ الرَّجُلِ، قَالَ: ثَكِلَتْكَ أُمُّكَ أَبَا بَرْزَةَ وَإِنَّهَا لَمْ تَكُنْ لِأَحَدٍ بَعْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»(٢).

**واتە: زەید دەگێڕێتەوە، لە عەمڕی کوڕی موڕە، لە ئەبو نەضرە، لە ئەبو بەرزەوە دەڵێ: ئەبو بەکر ئەوەندە تووڕە بوو لە پیاوێک تا ڕەنگی ڕوخساری گۆڕا، وتم: ئەی جێنشینی پێغەمبەری خوا سوێند بە خوا ئەگەر فەرمانم پێ بکەی دەدەم لە گەردنی، هەر وەکو ئەوەی ئاوێکی سارد بکەی بە سەریدا، تووڕەییەکەی لەسەر ئەو پیاوە نەما، وتی: لەبار دایکت بچی ئەی ئەبو بەرزە ئەوە بۆ هیچ کەسێک نیە لە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ.**

**٤٠٧٦-** «عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ عَمْرِو بن مُرَّةَ قال: سمعت أَبَا نَصْرٍ يحدث، عَنْ أَبِي بَرْزَةَ قَالَ: أَتَيْتُ عَلَى أَبِي بَكْرٍ وَقَدْ أَغْلَظَ لِرَجُلٍ، فَرَدَّ عَلَيْهِ، فَقُلْتُ: أَلَا أَضْرِبُ عُنُقَهُ؟ فَانْتَهَرَنِي، فَقَالَ: إِنَّهَا لَيْسَتْ لِأَحَدٍ بَعْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»(٣).

**واتە: شوعبە دەگێڕێتەوە، لە عەمڕی کوڕی موڕەوە دەڵێ: گوێم لە ئەبو نەصر بوو باسی کرد لە ئەبو بەرزەوە دەڵێ: هاتم بۆ لای ئەبو بەکر لە پیاوێک تووڕە بوو، ئەویش وەڵامی دایەوە، وتم: ئایا نەدەم لە گەردنی؟ لێم تووڕە بوو، وتی: ئەوە بۆ هیچ کەسێک نیە لە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




**٤٠٧٧-** «عَنْ يُونُسِ بن عُبَيْدٍ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ هِلَالٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُطَرِّفِ بْنِ الشِّخِّيرِ عَنْ أَبِي بَرْزَةَ الْأَسْلَمِيِّ أَنَّهُ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ فَغَضِبَ عَلَى رَجُلٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، فَاشْتَدَّ غَضَبُهُ عَلَيْهِ جِدّاً، فَلَمَّا رَأَيْتُ ذَلِكَ، قُلْتُ: يَا خَلِيفَةَ رَسُولِ اللَّهِ، أَضْرِبُ عُنُقَهُ؟ فَلَمَّا ذَكَرْتُ الْقَتْلَ، أَضْرَبَ عَنْ ذَلِكَ الْحَدِيثِ، أَجْمَعَ إِلَى غَيْرِ ذَلِكَ مِنَ النَّحْوِ، فَلَمَّا تَفَرَّقْنَا أَرْسَلَ إِلَيَّ، فَقَالَ: يَا أَبَا بَرْزَةَ، مَا قُلْتَ؟ وَنَسِيتُ الَّذِي قُلْتُ، قُلْتُ: ذَكِّرْنِيهِ قَالَ: أَمَا تَذْكُرُ مَا قُلْتَ؟ قُلْتُ: لَا وَاللَّهِ، قَالَ: أَرَأَيْتَ حِينَ رَأَيْتَنِي غَضِبْتُ عَلَى رَجُلٍ فَقُلْتَ: أَضْرِبُ عُنُقَهُ يَا خَلِيفَةَ رَسُولِ اللَّهِ، أَمَا تَذْكُرُ ذَلِكَ أَوَ كُنْتَ فَاعِلاً ذَلِكَ، قُلْتُ: نَعَمْ، وَاللَّهِ وَالْآنَ إِنْ أَمَرْتَنِي فَعَلْتُ، قَالَ: وَاللَّهِ مَا هِيَ لِأَحَدٍ بَعْدَ مُحَمَّدٍ ﷺ»[١].

**واته: یونسی کوڕی عوبەید دەگێڕێتەوە، لە حومەیدی کوڕی هیلال، لە عەبدوڵڵای کوڕی موتەڕفی کوڕی شخیر، لە ئەبو بەرزەی ئەسلەمی دەڵێ: ئێمە لە لای ئەبو بەکر بووین لە پیاوێکی مسوڵمان تووڕەبوو، زۆر لێی تووڕە بوو، کاتێ ئەوەم بینی، وتم: ئەی جێنشینی پێغەمبەری خوا ﷺ بدەم لە گەردنی؟ کاتێ باسی کوشتنم کرد، خۆی گرتەوە لەو باسە، باسەکەی گۆڕی بە باسێکی تر، کاتێ مەجلیسەکەمان چۆڵ کرد ناردی بە دوامدا، وتی: ئەی ئەبو بەرزە چیت وت؟ منیش بیرم چوو بوو ئەوەی کە وتم، بیرم بخەرەوە، وتی: ئایا بیرت نایەتەوە چیت وت؟ وتم: نا سوێند بە خوا، وتی: ئایا بیرت دێ کاتێ بینیت تووڕە بووم لە پیاوێک وتت: بدەم لە گەردنی ئەی جێنشینی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئایا ئەوەت بیر نایەتەوە، یان ئایا ئەو کارەت دەکرد, وتم: بەڵێ: سوێند بە خوا ئەگەر ئێستایش فەرمانم پێ بکەی دەیکەم، وتی: سوێند بەخوا ئەوە بۆ هیچ کەسێک نیە لە دوای پێغەمبەر ﷺ.**

## جـــادووکردن

**٤٠٧٨-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلَمَةَ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ عَسَّالٍ ﷺ قَالَ: قَالَ يَهُودِيٌّ لِصَاحِبِهِ: اذْهَبْ بِنَا إِلَى هَذَا النَّبِيِّ، قَالَ لَهُ صَاحِبُهُ: لَا تَقُلْ نَبِيٌّ، لَوْ سَمِعَكَ كَانَ لَهُ أَرْبَعَةُ أَعْيُنٍ، فَأَتَيَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَسَأَلَاهُ عَنْ تِسْعِ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ، فَقَالَ لَهُمْ: لَا تُشْرِكُوا بِاللَّهِ شَيْئاً، وَلَا تَسْرِقُوا، وَلَا تَزْنُوا، وَلَا تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ، وَلَا تَمْشُوا بِبَرِيءٍ إِلَى ذِي سُلْطَانٍ، وَلَا تَسْحَرُوا، وَلَا تَأْكُلُوا الرِّبَا، وَلَا تَقْذِفُوا الْمُحْصَنَةَ، وَلَا تَوَلَّوْا يَوْمَ الزَّحْفِ، وَعَلَيْكُمْ خَاصَّةً يَهُودُ أَنْ لَا تَعْدُوا فِي السَّبْتِ، فَقَبَّلُوا

---

**(١) صحيح.**

يَدَيْهِ وَرِجْلَيْهِ، وَقَالُوا: نَشْهَدُ أَنَّكَ نَبِيٌّ، قَالَ: فَمَا يَمْنَعُكُمْ أَنْ تَتَّبِعُونِي؟ قَالُوا: إِنَّ دَاوُدَ دَعَا بِأَنْ لَا يَزَالَ مِنْ ذُرِّيَّتِهِ نَبِيٌّ، وَإِنَّا نَخَافُ إِنِ اتَّبَعْنَاكَ أَنْ تَقْتُلَنَا يَهُودُ»[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی سەلەمە دەگێڕێتەوە، صەفوانی کوڕی عەسال ﷛ دەڵێ: جولەکەیەک بە هاوەڵەکەی وت: بڕۆ بابچین بۆ لای پێغەمبەر ﷺ هاوڕێیەکەی وتی: مەڵێ پێغەمبەر ﷺ، ئەگەر گوێی لێت بێ ئەوە لە خۆشیدا چاوی دەبێ بە چوار، هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و پرسیاریان لێ کرد لە بارەی نۆ ئایەتی ڕوونەوە، پێی فەرموون: هاوبەش بۆ خوا دامەنێن، دزی مەکەن، زینا مەکەن، ئەو نەفسەیش مەکوژن کە خوا ﷻ قەدەغەی کردوە مەگەر بە حەق، کەسی بێتاوان مەبەن بۆ لای خاوەن دەسەڵات، جادوو مەکەن، ماڵی ڕیبایش مەخۆن، ئافرەتی داوێن پاکیش تۆمەتبار مەکەن، پشت هەڵمەکەن لە جەنگدا، پێویستە لە سەرتان بە تایبەت ئێوە ئەی جولەکە لە ڕۆژی شەممەاندا ستەم نەکەن، ئەوانیش دەست و قاچیان ماچ کردو وتیان: شایەتی دەدەین بەڕاستی تۆ پێغەمبەری، فەرمووی: چی ڕێگریتان دەکات شوێنم نەکەون؟ وتیان: داود نزای کردوە بەوەی بەردەوام لە نەوەکانیدا پێغەمبەر ﷺ هەبێت، ئێمەیش دەترسین لەوەی ئەگەر شوێنت بکەوین جولەکە بمانکوژێ.

## حوکم و بڕیار لە بارەی جادووگەر

**٤٠٧٩-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷛ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَنْ عَقَدَ عُقْدَةً، ثُمَّ نَفَثَ فِيهَا فَقَدْ سَحَرَ، وَمَنْ سَحَرَ فَقَدْ أَشْرَكَ، وَمَنْ تَعَلَّقَ شَيْئاً وُكِلَ إِلَيْهِ»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷛ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس شتێک گرێ بدات، پاشان فووی پێدا بکات ئەوە بێگومان جادووی کردوە، هەرکەسیش جادوو بکات ئەوە هاوبەشی بۆ خوا داناوە، هەرکەسیش شتێک هەڵبواسێ بە خۆیەوە (لە نوشتە و جادوو بە مەبەستی چارەسەری نەخۆشی) بە جۆرێک پشتی پێ ببەستێ و ئومێدی پێ بکات خوا ﷻ دەیداتە دەستی ئەو شتەو هەرگیز مەرامەکەی نایەتە جێ.

---

(١) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٢٧٣٣ و ٣١٤٤، وإبن ماجه: ٣٧٠٥.

(٢) ضعيف.




## جادووی خاوەن کتێبەکانی پێشوو

**٤٠٨٠-** «عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ ﷺ قَالَ: سَحَرَ النَّبِيَّ ﷺ رَجُلٌ مِنَ الْيَهُودِ، فَاشْتَكَى لِذَلِكَ أَيَّاماً، فَأَتَاهُ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ فَقَالَ: إِنَّ رَجُلاً مِنَ الْيَهُودِ سَحَرَكَ، عَقَدَ لَكَ عُقَداً فِي بِئْرِ كَذَا وَكَذَا، فَأَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَاسْتَخْرَجُوهَا، فَجِيءَ بِهَا، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ كَأَنَّمَا نُشِطَ مِنْ عِقَالٍ، فَمَا ذَكَرَ ذَلِكَ لِذَلِكَ الْيَهُودِيِّ، وَلَا رَآهُ فِي وَجْهِهِ قَطُّ»[١].

**واتە: زەیدی کوڕی ئەرقەم ﷺ دەڵێ: پیاوێکی جولەکە جادووی لە پێغەمبەر ﷺ کرد، بەو هۆیەوە چەند ڕۆژێک نەخۆش کەوت، جبیریل هات سەلامی خوای لیبێت بۆ لای پێی وت: پیاوێک لە جولەکە جادووی لێکردووی، گرێیەکی بۆت گرێداوە لە فلان بیرو فلانە شوێندا دایناوە، پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێ لە هاوەڵەکانی نارد دەریانهێنا، پاشان بۆی هێنرا، پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسایەوەو هەرچی ئەو نەخۆشیە هەیە لە سەری نەما، ئەوەی باس نەکرد بۆ ئەو جولەکەیەو ڕوخساریشی نەبینی.**

## ئەو کەسەی دەستدرێژی دەکرێتە سەر ماڵ و سامانەکەی چی بکات؟

**٤٠٨١-** «عَنْ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: الرَّجُلُ يَأْتِينِي فَيُرِيدُ مَالِي، قَالَ: ذَكِّرْهُ بِاللَّهِ، قَالَ: فَإِنْ لَمْ يَذَّكَّرْ؟ قَالَ: فَاسْتَعِنْ عَلَيْهِ مَنْ حَوْلَكَ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، قَالَ: فَإِنْ لَمْ يَكُنْ حَوْلِي أَحَدٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ؟ قَالَ: فَاسْتَعِنْ عَلَيْهِ بِالسُّلْطَانِ، قَالَ: فَإِنْ نَأَى السُّلْطَانُ عَنِّي؟ قَالَ: قَاتِلْ دُونَ مَالِكَ حَتَّى تَكُونَ مِنْ شُهَدَاءِ الْآخِرَةِ، أَوْ تَمْنَعَ مَالَكَ»[٢].

**واتە: سوفیانی ثەوری دەڵێ: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: پیاوێک ڕووبەڕووم دەبێتەوەو دەیەوێ ماڵەکەم ببات، فەرمووی: خوا بخەرەوە یادی، وتی: ئەی ئەگەر کەڵکی نەبوو؟ فەرمووی: داوای کۆمەک بکە لە مسوڵمانانی دەورووبەرت، وتی: ئەی ئەگەر لە دەورووبەرم هیچ کەسێکی مسوڵمان نەبوو؟ فەرمووی: داوای یارمەتی لە دەسەڵاتدار بکە، وتی: ئەگەر دەسەڵاتداریش لێم دوور بوو؟ فەرمووی: لە پێناوی ماڵەکەتدا بجەنگە، تا دەبیتە یەکێک لە شەهیدەکانی ڕۆژی دوایی، یان بەرگری لە ماڵەکەت دەکەیت.**

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) حسن صحيح.




**٤٠٨٢-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ إِنْ عُدِيَ عَلَى مَالِي، قَالَ: فَانْشُدْ بِاللَّهِ. قَالَ: فَإِنْ أَبَوْا عَلَيَّ؟ قَالَ: فَانْشُدْ بِاللَّهِ. قَالَ: فَإِنْ أَبَوْا عَلَيَّ؟ قَالَ: فَانْشُدْ بِاللَّهِ. قَالَ: فَإِنْ أَبَوْا عَلَيَّ؟ قَالَ: فَقَاتِلْ، فَإِنْ قُتِلْتَ فَفِي الْجَنَّةِ، وَإِنْ قَتَلْتَ فَفِي النَّارِ»(١).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ئەگەر دەستدرێژی کرایە سەر ماڵ و سامانم چی بکەم؟فەرمووی: داوای لێ بکە لە بەرخوا وازبهێنێ، وتی: ئەگەر وازی نەهێنا؟ فەرمووی: داوای لێ بکە لە بەرخوا وازبهێنێ، وتی: ئەگەر وازی نەهێنا؟ فەرمووی: داوای لێ بکە لە بەرخوا وازبهێنێ، وتی: ئەگەر وازی نەهێنا؟ فەرمووی: بجەنگە، ئەگەر کوژرای تۆ لە بەهەشتی، ئەگەر ئەویشت کوشت ئەوە ئەو لە ئاگردایە.**

**٤٠٨٣-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً جَاءَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ إِنْ عُدِيَ عَلَى مَالِي؟ قَالَ: فَانْشُدْ بِاللَّهِ. قَالَ: فَإِنْ أَبَوْا عَلَيَّ؟ قَالَ: فَانْشُدْ بِاللَّهِ. قَالَ: فَإِنْ أَبَوْا عَلَيَّ؟ قَالَ: فَانْشُدْ بِاللَّهِ. قَالَ: فَإِنْ أَبَوْا عَلَيَّ؟ قَالَ: فَقَاتِلْ، فَإِنْ قُتِلْتَ فَفِي الْجَنَّةِ، وَإِنْ قَتَلْتَ فَفِي النَّارِ»(٢).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ئەگەر دەستدرێژی کرایە سەر ماڵ و سامانم چی بکەم؟ فەرمووی: داوای لێ بکە لە بەرخوا وازبهێنێ، وتی: ئەگەر وازی نەهێنا؟ فەرمووی: داوای لێ بکە لە بەرخوا وازبهێنێ، وتی: ئەگەر وازی نەهێنا؟ فەرمووی: داوای لێ بکە لە بەرخوا وازبهێنێ، وتی: ئەگەر وازی نەهێنا؟ فەرمووی: بجەنگە، ئەگەر کوژرای تۆ لە بەهەشتی، ئەگەر ئەویشت کوشت ئەوە ئەو لە ئاگردایە.**

## هەر کەس لە پێناو ماڵ و سامانیدا کوژرا

**٤٠٨٤-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ قَاتَلَ دُونَ مَالِهِ فَقُتِلَ فَهُوَ شَهِيدٌ»(٣).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




**واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەمرٍ (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەركەس لە پێناو ماڵ و سامانیدا كوژرا ئەوە شەهیدە.**

**٤٠٨٥-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ قَاتَلَ دُونَ مَالِهِ فَقُتِلَ فَهُوَ شَهِيدٌ»[١].

**واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەمرٍ (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەركەس لە پێناو ماڵ و سامانیدا كوژرا ئەوە شەهیدە.**

**٤٠٨٦-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ مَظْلُوماً فَلَهُ الْجَنَّةُ»[٢].

**واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەمرِی كوڕی عاص (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەس لە پێناو ماڵ و سامانیدا بە ستەملێكراوی كوژرا، ئەوە بەهەشتی بۆ هەیە.**

**٤٠٨٧-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ»[٣].

**واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەمرٍ (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەس لە پێناو ماڵ و سامانیدا كوژرا ئەوە شەهیدە.**

**٤٠٨٨-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ يُحدثُ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ أُرِيدَ مَالُهُ بِغَيْرِ حَقٍّ فَقَاتَلَ فَقُتِلَ فَهُوَ شَهِيدٌ»[٤].

**واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەمرٍ (خوا لێیان ڕازی بێ) باسی دەكرد، لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: هەر كەس داوای ماڵ و سامانەكەی بكرێ بە ناحەق، ئەویش جەنگاو پاشان كوژرا ئەوە شەهیدە.**

---

**(١) صحيح.**

**(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤٨٠، ومسلم: ١٤١، وأبو داود: ٤٧٧١، والترمذي: ١٤١٩ و ١٤٢٠.**

**(٣) صحيح.**

**(٤) صحيح لغيره.**

**٤٠٨٩-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ»[١].

**واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەمرٍ (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەس لە پێناو ماڵ و سامانیدا كوژرا ئەوە شەهیدە.**

**٤٠٩٠-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ»[٢].

**واتە: سەعیدی كوڕی زەید ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر كەس لە پێناو ماڵ و سامانیدا كوژرا ئەوە شەهیدە.**

**٤٠٩١-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ قَاتَلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ»[٣].

**واتە: سەعیدی كوڕی زەید ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر كەس جەنگا لە پێناو ماڵ و سامانیدا ئەوە شەهیدە.**

**٤٠٩٢-** «عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ»[٤].

**واتە: سولەیمانی كوڕی بورەیدە دەگێڕێتەوە، لە باوكیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەركەس لە پێناو ماڵ و سامانیدا كوژرا ئەوە شەهیدە.**

**٤٠٩٣-** «عَنْ أَبِي جَعْفَرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ قُتِلَ دُونَ مَظْلَمَتِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ»[٥].

**واتە: ئەبو جەعفەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەس كوژرا بە ستەم لێكراوی لە پێناو ماڵ و سامانەكەیدا ئەوە شەهیدە.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح لغيره.

(٥) صحيح.

## ئەوەی دەجەنگێ لە پێناو ماڵ و منداڵیدا

٤٠٩٤- «عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ قَاتَلَ دُونَ مَالِهِ فَقُتِلَ فَهُوَ شَهِيدٌ، وَمَنْ قَاتَلَ دُونَ دَمِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ، وَمَنْ قَاتَلَ دُونَ أَهْلِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ»[١].

واتە: سەعیدی کوڕی زەید ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس جەنگا لەپێناو ماڵ و سامانەکەیدا و کوژرا ئەوە شەهیدە، هەرکەسیش جەنگا لە پێناو خوێنیدا ئەوە شەهیدە، هەر کەسیش جەنگا لە پێناو ماڵ و منداڵیدا ئەوە شەهیدە.

## ئەوەی بجەنگێ لە پێناو ئاینەکەیدا

٤٠٩٥- «عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ، وَمَنْ قُتِلَ دُونَ أَهْلِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ، وَمَنْ قُتِلَ دُونَ دِينِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ، وَمَنْ قُتِلَ دُونَ دَمِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ»[٢].

واتە: سەعیدی کوڕی زەید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس لە پێناو ماڵ و سامانیدا کوژرا ئەوە شەهیدە، هەرکەسیش جەنگا لە پێناو ماڵ و منداڵیدا ئەوە شەهیدە، هەر کەسیش جەنگا لە پێناو ئاینەکەیدا ئەوە شەهیدە، هەرکەسیش جەنگا لە پێناو خوێنیدا ئەوە شەهیدە.

## ئەوەی دەجەنگێ لەپێناو ماڵ و سامانەکەیدا کە ستەمی لێکرابێت

٤٠٩٦- «عَنْ أَبِي جَعْفَرٍ قَالَ: كُنْتُ جَالِسًا عِنْدَ سُوَيْدِ بْنِ مُقَرِّنٍ فَقَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ قُتِلَ دُونَ مَظْلَمَتِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ»[٣].

واتە: ئەبو جەعفەر دەڵێ: من دانیشتبووم لای سوەیدی کوڕی موقەڕڕین ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس کوژرا بە ستەم لێکراوی لە پێناو ماڵ و سامانەکەیدا ئەوە شەهیدە.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٧٧٢، والترمذي: ١٤٢١، وابن ماجه: ٢٥٨٠.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح لغيره.

## هەر کەس شمشێری لە کێلان دەرکرد، پاشان پێی دای لە خەڵکی

**٤٠٩٧-** «عَنِ ابْنِ الزُّبَيْرِ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ شَهَرَ سَيْفَهُ ثُمَّ وَضَعَهُ فَدَمُهُ هَدَرٌ»(١).

**واتە: ئیبنو زوبەیر ﷺ دەگێڕێتەوە: لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس شمشێری هەڵیکێشا پاشان دای لە خەڵکی ئەوە خوێنی بە فیڕۆ چووە. (واتە: ئەگەر کوژرا خوێنبایی نیە).**

**٤٠٩٨-** «عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: أَنْبَأَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ بِهَذَا الْإِسْنَادِ مِثْلَهُ، وَلَمْ يَرْفَعْهُ»(٢).

**واتە: ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم دەڵێ: عەبدوڕڕەزاق بەم سەنەدە بۆی باسکردین هەروەکو ئەوە، بەڵام ڕەفعی نەکرد (واتە: نەیدابووە پاڵ پێغەمبەر ﷺ).**

**٤٠٩٩-** «عَنِ ابْنِ الزُّبَيْرِ ﷺ قَالَ: مَنْ رَفَعَ السِّلَاحَ ثُمَّ وَضَعَهُ فَدَمُهُ هَدَرٌ»(٣).

**واتە: ئیبنو زوبەیر ﷺ دەڵێ: هەرکەس شمشێری بەرز کردەوە، پاشان دای لە خەڵکی، ئەوە خوێنی بە فیڕۆ چووە.**

**٤١٠٠-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: مَنْ حَمَلَ عَلَيْنَا السِّلَاحَ فَلَيْسَ مِنَّا»(٤).

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس چەکمان لە بەرانبەر هەڵبگرێ لە ئێمە نیە.**

**٤١٠١-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: بَعَثَ عَلِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ بِالْيَمَنِ بِذُهَيْبَةٍ فِي تُرْبَتِهَا، فَقَسَمَهَا بَيْنَ الْأَقْرَعِ بْنِ حَابِسٍ الْحَنْظَلِيِّ، ثُمَّ أَحَدِ بَنِي مُجَاشِعٍ، وَبَيْنَ عُيَيْنَةَ بْنِ بَدْرٍ الْفَزَارِيِّ، وَبَيْنَ عَلْقَمَةَ بْنِ عُلَاثَةَ الْعَامِرِيِّ، ثُمَّ أَحَدِ بَنِي كِلَابٍ، وَبَيْنَ زَيْدِ الْخَيْلِ الطَّائِيِّ، ثُمَّ أَحَدِ بَنِي نَبْهَانَ قَالَ: فَغَضِبَتْ قُرَيْشٌ وَالْأَنْصَارُ وَقَالُوا: يُعْطِي صَنَادِيدَ أَهْلِ نَجْدٍ، وَيَدَعُنَا، فَقَالَ: إِنَّمَا أَتَأَلَّفُهُمْ، فَأَقْبَلَ رَجُلٌ غَائِرُ الْعَيْنَيْنِ، نَاتِئُ الْوَجْنَتَيْنِ، كَثُّ اللِّحْيَةِ، مَحْلُوقُ الرَّأْسِ، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ،

---

(١) شاذ.

(٢) صحيح موقوف.

(٣) صحيح موقوف لغيره.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٨٧٤ و ٧٠٧٠، ومسلم: ٩٨، وإبن ماجه: ٢٥٧٦.




اتَّقِ اللَّهَ، قَالَ: مَنْ يُطِعِ اللَّهَ إِذَا عَصَيْتُهُ، أَيَأْمَنُنِي عَلَى أَهْلِ الْأَرْضِ، وَلَا تَأْمَنُونِي، فَسَأَلَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ، قَتْلَهُ فَمَنَعَهُ، فَلَمَّا وَلَّى، قَالَ: إِنَّ مِنْ ضِئْضِئِ هَذَا قَوْماً يَخْرُجُونَ يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لَا يُجَاوِزُ حَنَاجِرَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ مُرُوقَ السَّهْمِ مِنَ الرَّمِيَّةِ، يَقْتُلُونَ أَهْلَ الْإِسْلَامِ، وَيَدَعُونَ أَهْلَ الْأَوْثَانِ، لَئِنْ أَنَا أَدْرَكْتُهُمْ لَأَقْتُلَنَّهُمْ قَتْلَ عَادٍ»[(١)].

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: عەلی لە یەمەنەوە بەشێک لە زێڕی بە خۆڵەوە نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش دابەشی کرد بە سەر چوار کەسدا: ئەقرەعی کوڕی حابیسی حەنظەلی، پاشان پیاوێک لە بەنی موجاشیع، وە لە نێوان عویەینەی کوڕی بەدری فەزاری و عەلقەمەی کوڕی عولاثەی عامری، هەروەها پیاوێکیش لە بەنی کیلاب، وە زەیدی خەیلی طائیش، هەروەها پیاوێک لە بەنی نەهبان، وتی: قورەیش و ئەنصارەکان توڕە بوون، وتیان: بەشی پیاوماقوڵانی نەجد دەدەی و ئێمە بێبەش دەکەی، فەرمووی: بەڵکو لەبەر ئەوە پێیان دەدەم دڵیان ڕازی بکەم بۆ ئیسلام، پیاوێکی چاو بچووک و ناوچاو بەرزی ڕیشپڕی سەرتاشراو وتی: لە خوا بترسە ئەی موحەممەد، فەرمووی: ئەگەر من سەرپێچی خوا بکەم ئیتر کێ گوێڕایەڵی دەکات، ئایا خوا منی کردوە بە ئەمینی سەر زەوی ئێوە نامکەن بە ئەمین، پیاوێک لەناو خەڵکەکە داوای کرد پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی بدات بیکوژێ، ڕێی پێی نەدا، کاتێ پیاوەکە پشتی هەڵکرد و ڕۆیشت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە پشتی ئەم پیاوە خەڵکێک دێنە دونیاوە قورئان دەخوێنن لە قوڕگیان تێپەڕ ناکات، لە ئیسلام دەردەچن وەکو چۆن تیر (لە کەوان دەردەچێ و) نێچیر دەبڕێ، ئەهلی ئیسلام دەکوژن و واز لە ئەهلی بتپەرستی دێنن، ئەگەر بگەم پێیان وەکو عاد دەیانکوژم.**

**٤١٠٢-** «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: يَخْرُجُ قَوْمٌ فِي آخِرِ الزَّمَانِ، أَحْدَاثُ الْأَسْنَانِ، سُفَهَاءُ الْأَحْلَامِ، يَقُولُونَ مِنْ خَيْرِ قَوْلِ الْبَرِيَّةِ لَا يُجَاوِزُ إِيمَانُهُمْ حَنَاجِرَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ، فَإِذَا لَقِيتُمُوهُمْ فَاقْتُلُوهُمْ، فَإِنَّ قَتْلَهُمْ أَجْرٌ لِمَنْ قَتَلَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[(٢)].

**واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: خەڵکانێک پێش هاتنی ڕۆژی دوایی بە ماوەیەکی کەم، دەردەچن، تەمەنیان بچوکەو عەقڵیشیان**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٦١١ و ٥٠٥٧ و ٦٩٣٠، ومسلم: ١٠٦٦، وأبو داود: ٤٧٦٧.





لاوازە (واتە: کەم عەقڵن)، هەندێ قسە دەکەن لە چاکترین قسەکانی ئادەمی (کە فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ)، ئیمانیان لە قوڕگیان تێناپەڕێ، لە دین دەردەچن وەکو چۆن تیر (لە کەوان دەردەچێ و) نێچیر دەبڕێ، ئەگەر پێیان گەیشتن بیانکوژن، چونکە بەڕاستی کوشتنیان پاداشتە بۆ ئەو کەسەی دەیانکوژێ لە ڕۆژی دواییدا.

**٤١٠٣-** «عَنْ شَرِيكِ بْنِ شِهَابٍ قَالَ: كُنْتُ أَتَمَنَّى أَنْ أَلْقَى رَجُلاً مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، أَسْأَلُهُ عَنِ الْخَوَارِجِ، فَلَقِيتُ أَبَا بَرْزَةَ فِي يَوْمِ عِيدٍ فِي نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِهِ، فَقُلْتُ لَهُ: هَلْ سَمِعْتَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَذْكُرُ الْخَوَارِجَ؟ فَقَالَ: نَعَمْ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بِأُذُنِي، وَرَأَيْتُهُ بِعَيْنِي، أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِمَالٍ فَقَسَمَهُ، فَأَعْطَى مَنْ عَنْ يَمِينِهِ، وَمَنْ عَنْ شِمَالِهِ، وَلَمْ يُعْطِ مَنْ وَرَاءَهُ شَيْئاً، فَقَامَ رَجُلٌ مِنْ وَرَائِهِ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، مَا عَدَلْتَ فِي الْقِسْمَةِ رَجُلٌ أَسْوَدُ مَطْمُومُ الشَّعْرِ عَلَيْهِ ثَوْبَانِ أَبْيَضَانِ، فَغَضِبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ غَضَباً شَدِيداً وَقَالَ: وَاللَّهِ لَا تَجِدُونَ بَعْدِي رَجُلاً هُوَ أَعْدَلُ مِنِّي، ثُمَّ قَالَ: يَخْرُجُ فِي آخِرِ الزَّمَانِ قَوْمٌ كَأَنَّ هَذَا مِنْهُمْ، يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لَا يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الْإِسْلَامِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ، سِيمَاهُمُ التَّحْلِيقُ، لَا يَزَالُونَ يَخْرُجُونَ حَتَّى يَخْرُجَ آخِرُهُمْ مَعَ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، فَإِذَا لَقِيتُمُوهُمْ فَاقْتُلُوهُمْ، هُمْ شَرُّ الْخَلْقِ، وَالْخَلِيقَةِ»[1].

واتە: شەریکی کوڕی شیهاب دەڵێ: من بە ئاواتەوە بووم بگەم بە یەکێک لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێ بکەم لە بارەی خەواریجەوە، لە ڕۆژی جەژندا گەیشتم بە ئەبو بەرزە لەگەڵ هەندێ لە هاوەڵەکانی، وتم: ئایا بیستووتە پێغەمبەری خوا ﷺ باسی خەواریجی کردبێ، وتی: بەڵێ، بە گوێی خۆم بیستم، بە چاوی خۆیشم بینیم ماڵ و سامان هێنرا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دابەشی کرد، ئەوەی لە لای ڕاستی بوو پێی بەخشی، ئەوەیشی لە لای چەپی بوو پێی بەخشی، بەڵام ئەوەی لە پشتیەوە بوو پێی نەبەخشی، پیاوێک لە پشتیەوە هەڵساو وتی: ئەی موحەممەد ﷺ، دادپەروەریت نەکردوە لە دابەشکردنەکەدا، پیاوێکی ڕەش پێستی قژ لوول بوو، دوو جلی سپی لە بەردا بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر تووڕە بوو، فەرمووی: سوێند بەخوا لە دوای من کەسێک نابیننەوە لە من دادپەروەرتر بێت، پاشان فەرمووی: لە کۆتایی دونیادا خەڵکانێک دەردەچن، هەروەکو ئەوە وایە ئەمە لە ئەوان بێت، قورئان دەخوێنن لە قوڕگیان تێناپەڕێ، لە ئیسلام دەردەچن وەکو چۆن تیر (لە کەوان دەردەچێ و) نێچیر دەبڕێ، بەوە دەناسرێنەوە سەریان تاشیوە، بەردەوام دەردەچن

---

(١) ضعيف.



تا كۆتا دانەیان لەگەڵ مەسیحی دەجالدا دەردەچێ، ئەگەر پێیان گەیشتن بیانكوژن، ئەوانە خراپترینی دروستكراوەكانن.

## جەنگان لەگەڵ مسوڵمان

**٤١٠٤-** «عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قِتَالُ الْمُسْلِمِ كُفْرٌ، وَسِبَابُهُ فُسُوقٌ»[١].

**واتە: سەعدی كوڕی ئەبو وەقاص ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جەنگ لەگەڵ مسوڵمان كوفرە (واتە: لە كردەوەی بێبڕوایەكانە)، جنێو پێدانیشی تاوانە.**

**٤١٠٥-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ، وَقِتَالُهُ كُفْرٌ»[٢].

**واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: جنێودان بە مسوڵمان تاوانە، جەنگانیش لە گەڵی كوفرە.**

**٤١٠٦-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: سِبَابُ الْمُسْلِمِ فِسْقٌ، وَقِتَالُهُ كُفْرٌ»[٣].

**واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: جنێودان بە مسوڵمان تاوانە، جەنگانیش لە گەڵی كوفرە.**

**٤١٠٧-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ، وَقِتَالُهُ كُفْرٌ»[٤].

**واتە: عەبدوڵا دەڵێ: جنێودان بە مسوڵمان تاوانە، جەنگانیش لە گەڵی كوفرە.**

**٤١٠٨-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ، وَقِتَالُهُ كُفْرٌ»[٥].

---

(١) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ٣٩٤١.

(٢) صحيح الإسناد موقوف.

(٣) صحيح الإسناد موقوف.

(٤) صحيح الإسناد موقوف.

(٥) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٨، ومسلم: ١١٦ و ٦٤/١١٧، والترمذي: ١٩٨٣ و ٢٦٣٤ و ٢٦٣٥، وإبن ماجه: ٦٩.




واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەبدوڵڵا دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جنێودان بە مسوڵمان تاوانە، جەنگانیش لە گەڵی کوفرە.

**٤١٠٩-** «عَنْ شُعْبَةَ قال: قلت: لِحَمَّادٍ سمعت مَنْصُوراً وَسُلَيْمَانَ وَزُبَيْداً يُحَدِّثُونَ، عن أبي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ، وَقِتَالُهُ كُفْرٌ»[١].

واتە: شوعبە دەڵێ: بە حەمادم وت: گوێم لێ بوو مەنصورو سولەیمان و زوبەیدەوە، لە ئەبو وائیلەوە دەیانگێڕایەوە، لە عەبدوڵڵا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جنێودان بە مسوڵمان تاوانە، جەنگان لە دژی کوفرە.

**٤١١٠-** «عَنْ زُبَيْدٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ، وَقِتَالُهُ كُفْرٌ، قُلْتُ لِأَبِي وَائِلٍ سَمِعْتَهُ مِنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: نَعَمْ»[٢].

واتە: زوبەید دەگێڕێتەوە، لە ئەبو وائیلەوە، لە عەبدوڵڵاوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جنێودان بە مسوڵمان تاوانە، جەنگان لە دژی کوفرە، بە ئەبو وائیلم وت: لە عەبدوڵڵاوە بیستوتە؟ وتی: بەڵێ.

**٤١١١-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ، وَقِتَالُهُ كُفْرٌ»[٣].

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جنێودان بە مسوڵمان تاوانە، جەنگانیش لە گەڵی کوفرە.

**٤١١٢-** «عَنْ أَبِي وَائِلٍ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ ﷺ: سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ، وَقِتَالُهُ كُفْرٌ»[٤].

واتە: ئەبو وائیل دەڵێ: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: جنێودان بە مسوڵمان تاوانە، جەنگانیش لە گەڵی کوفرە.

**٤١١٣-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قِتَالُ الْمُؤْمِنِ كُفْرٌ، وَسِبَابُهُ فُسُوقٌ»[٥].

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: جنێودان بە مسوڵمان تاوانە، جەنگانیش لە گەڵی کوفرە.

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح موقوف.

(٥) صحيح موقوف.




## هەڕەشە کردن لەو کەسەی لە ژێر بەیداخێک بجەنگی کە حەقیقەتی نادیار بێ

**٤١١٤-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ خَرَجَ مِنَ الطَّاعَةِ، وَفَارَقَ الْجَمَاعَةَ فَمَاتَ مَاتَ مِيتَةً جَاهِلِيَّةً، وَمَنْ خَرَجَ عَلَى أُمَّتِي يَضْرِبُ بَرَّهَا، وَفَاجِرَهَا لَا يَتَحَاشَى مِنْ مُؤْمِنِهَا، وَلَا يَفِي لِذِي عَهْدِهَا فَلَيْسَ مِنِّي، وَمَنْ قَاتَلَ تَحْتَ رَايَةٍ عُمِّيَّةٍ، يَدْعُو إِلَى عَصَبِيَّةٍ، أَوْ يَغْضَبُ لِعَصَبِيَّةٍ فَقُتِلَ فَقِتْلَةٌ جَاهِلِيَّةٌ»[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس لە گوێڕایەڵی دەربچێت و لە کۆمەڵی مسوڵمانان جیا ببێتەوە دەمرێ بە مردنی نەفامی، هەرکەسیش دەربچێ بۆ گیان ئوممەتەکەم پەلاماری چاک و خراپیان بدات و خۆی نەپارێزی لە بڕوادارەکان و بە وەفا نەبێ بەرانبەر ئەوانەی پەیمانی لەگەڵ بەستوون ئەوە لە من نیە، هەرکەسیش لەژێر ئاڵایەکی نادیار بجەنگێ و بانگەواز بۆ دەمارگیری بکات، یان لەو پێناوەدا تورە ببێت، ئەوە دەکوژرێ بە کوشتێکی نەفامی.**

**٤١١٥-** «عَنْ جُنْدُبِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ قَاتَلَ تَحْتَ رَايَةٍ عُمِّيَّةٍ يُقَاتِلُ عَصَبِيَّةً، وَيَغْضَبُ لِعَصَبِيَّةٍ فَقِتْلَتُهُ جَاهِلِيَّةٌ»[2].

**واتە: جوندوبی کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس لە ژێر بەیداخێکی نادیاردا بجەنگێ، لە پێناو دەمارگیری بجەنگێ و لەبەر دەمارگیری تورە ببێت، ئەوە جەنگەکەی جەنگێکی نەفامانەیە.**

## قەدەغەکردنی کوشتن

**٤١١٦-** «عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا أَشَارَ الْمُسْلِمُ عَلَى أَخِيهِ الْمُسْلِمِ بِالسِّلَاحِ فَهُمَا عَلَى جُرُفِ جَهَنَّمَ، فَإِذَا قَتَلَهُ خَرَّا جَمِيعاً فِيهَا»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٥٣ و ١٨٤٨/٥٤، وابن ماجه: ٣٩٤٨.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٨٥٠.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٨٨٨/١٦، وابن ماجه: ٣٩٦٥.




**واتە: ئەبو بەكرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر دوو مسوڵمان چەک بەرانبەر یەكتر هەڵبگرن، ئەوە هەردووكیان لە قەراغی دۆزەخن، جا ئەگەر كوشتی هەردووكیان دەخلسكێنە ناویەوە.**

**٤١١٧-** «عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ قَالَ: إِذَا حَمَلَ الرَّجُلَانِ الْمُسْلِمَانِ السِّلَاحَ أَحَدُهُمَا عَلَى الْآخَرِ، فَهُمَا عَلَى جُرُفِ جَهَنَّمَ، فَإِذَا قَتَلَ أَحَدُهُمَا الْآخَرَ فَهُمَا فِي النَّارِ»[١].

**واتە: ئەبو بەكرە ﷺ دەڵێ: ئەگەر دوو مسوڵمان چەكیان بەرانبەر یەكتر هەڵگرت، ئەوە هەردووكیان لە قەراغی دۆزەخن، ئەگەر یەكێكیان ئەوی تری كوشت ئەوە هەردووكیان لە ئاگردان.**

**٤١١٨-** «عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِذَا تَوَاجَهَ الْمُسْلِمَانِ بِسَيْفَيْهِمَا، فَقَتَلَ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ فَهُمَا فِي النَّارِ، قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَذَا الْقَاتِلُ، فَمَا بَالُ الْمَقْتُولِ؟ قَالَ: أَرَادَ قَتْلَ صَاحِبِهِ»[٢].

**واتە: ئەبو موسا ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر دوو مسوڵمان بە شمشێرەكانیان ڕووبەڕووی یەكتربوونەوە، یەكێكیان ئەوی تری كوشت ئەوە هەردووكیان لە ئاگردان، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەمە بكوژە، ئەی كوژراو بۆ چی؟ فەرمووی: ویستی هاوەڵەكەی بكوژێ.**

**٤١١٩-** «عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِذَا تَوَاجَهَ الْمُسْلِمَانِ بِسَيْفَيْهِمَا، فَقَتَلَ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ، فَهُمَا فِي النَّارِ مِثْلَهُ سَوَاءً»[٣].

**واتە: ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر دوو مسوڵمان بە شمشێرەكانیان ڕوبەڕووی یەكتربوونەوە، یەكێكیان ئەوی تری كوشت ئەوە هەردووكیان لە ئاگردان (وەكو یەكتری).**

**٤١٢٠-** «عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِذَا تَوَاجَهَ الْمُسْلِمَانِ بِسَيْفَيْهِمَا كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا يُرِيدُ قَتْلَ صَاحِبِهِ، فَهُمَا فِي النَّارِ، قِيلَ لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَذَا الْقَاتِلُ، فَمَا بَالُ الْمَقْتُولِ؟ قَالَ: إِنَّهُ كَانَ حَرِيصاً عَلَى قَتْلِ صَاحِبِهِ»[٤].

---

(١) صحيح موقوف.

(٢) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ٣٩٦٤.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




واتە: ئەبو بەکرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر دوو مسوڵمان بە شمشێرەکانیان ڕووبەڕووی یەکتربوونەوە، هەریەکەیان ویستی ئەوی تر بکوژێ، ئەوە هەردووکیان لە ئاگردان، پێی وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەمە بکوژە، ئەی کوژراو بۆچی؟ فەرمووی: بێگومان ئەویش سوربوو لەسەر کوشتنی هاوەڵەکەی.

**٤١٢١-** «عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا الْتَقَى الْمُسْلِمَانِ بِسَيْفَيْهِمَا، فَقَتَلَ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ، فَالْقَاتِلُ وَالْمَقْتُولُ فِي النَّارِ»[1].

واتە: ئەبو بەکرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر دوو مسوڵمان بە شمشێرەکانیان ڕووبەڕووی یەکتربوونەوە، یەکێکیان ئەوی تری کوشت، ئەوە بکوژو کوژراو لە ئاگردایە.

**٤١٢٢-** «عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: إِذَا تَوَاجَهَ الْمُسْلِمَانِ بِسَيْفَيْهِمَا، فَقَتَلَ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ، فَالْقَاتِلُ وَالْمَقْتُولُ فِي النَّارِ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَذَا الْقَاتِلُ، فَمَا بَالُ الْمَقْتُولِ؟ قَالَ: إِنَّهُ أَرَادَ قَتْلَ صَاحِبِهِ»[2].

واتە: ئەبو بەکرە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەگەر دوو مسوڵمان بە شمشێرەکانیان ڕووبەڕووی یەکتربوونەوە، یەکێکیان ئەوی تری کوشت، ئەوە بکوژو کوژراو لە ئاگردایە، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەمە بکوژە، ئەی کوژراو بۆ چی؟ فەرمووی: بێگومان ئەویش ویستی هاوەڵەکەی بکوژێ.

**٤١٢٣-** «عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا الْتَقَى الْمُسْلِمَانِ بِسَيْفَيْهِمَا، فَقَتَلَ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ، فَالْقَاتِلُ وَالْمَقْتُولُ فِي النَّارِ»[3].

واتە: ئەبو بەکرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر دوو مسوڵمان بە شمشێرەکانیان ڕووبەڕووی یەکتربوونەوە، یەکێکیان ئەوی تری کوشت، ئەوە بکوژو کوژراو لە ئاگردایە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣١ و ٧٨٧٥ و ٧٠٨٣، ومسلم: ١٤ و ٢٨٨٨/١٥، وأبو داود: ٤٢٦٨ و ٤٢٦٩.

(٣) صحيح.




**٤١٢٤-** «عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِذَا تَوَاجَهَ الْمُسْلِمَانِ بِسَيْفَيْهِمَا، فَقَتَلَ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ، فَالْقَاتِلُ وَالْمَقْتُولُ فِي النَّارِ. قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَذَا الْقَاتِلُ فَمَا بَالُ الْمَقْتُولِ؟ قَالَ: إِنَّهُ أَرَادَ قَتْلَ صَاحِبِهِ»[١].

**واتە: ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر دوو مسوڵمان بە شمشێرەکانیان ڕووبەڕووی یەکتربوونەوە، یەکێکیان ئەوی تری کوشت، ئەوە بکوژو کوژراو لە ئاگردایە، پیاوێک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەمە بکوژە، ئەی کوژراو بۆچی؟ فەرمووی: بێگومان ئەویش ویستی هاوەڵەکەی بکوژێ.**

**٤١٢٥-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَا تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّاراً، يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ»[٢].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لە دوای من مەگەڕێنەوە بۆ بێبڕوای، هەندێکتان لە گەردنی هەندێکی دیکەتان بدات.**

**٤١٢٦-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّاراً، يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ، لَا يُؤْخَذُ الرَّجُلُ بِجِنَايَةِ أَبِيهِ، وَلَا جِنَايَةِ أَخِيهِ»[٣].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە دوای من مەگەڕێنەوە بۆ بێبڕوای، هەندێکتان بدات لە گەردنی هەندێکی دیکەتان، وە کەسیش بەهۆی تاوانی باوکی یان براکەی تۆڵەی لێ نەکرێتەوە.**

**٤١٢٧-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّاراً، يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ، وَلَا يُؤْخَذُ الرَّجُلُ بِجَرِيرَةِ أَبِيهِ، وَلَا بِجَرِيرَةِ أَخِيهِ»[٤].

**واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە دوای من مەگەڕێنەوە بۆ بێبڕوای، هەندێکتان بدات لە گەردنی هەندێکی دیکەتان، وە کەسیش بە هۆی تاوانی باوکی یان براکەی تۆڵەی لێ نەکرێتەوە.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٧٤٢ و ٤٤٠٣ و ٦٠٤٣ و ٦١٦٦ و ٦٧٨٥ و ٦٨٦٨ و ٧٠٧٧، ومسلم: ١١٩ و ٦٦/١٢٠، وأبو داود: ٤٦٨٦، وإبن ماجه: ٣٩٤٣.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




**٤١٢٨-** «عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا أُلْفِيَنَّكُمْ تَرْجِعُونَ بَعْدِي كُفَّاراً، يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ، لَا يُؤْخَذُ الرَّجُلُ بِجَرِيرَةِ أَبِيهِ، وَلَا بِجَرِيرَةِ أَخِيهِ»(١).

**واتە: مەسروق دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با نەتانبینم لە دوای من هەڵبگەڕێنەوە بۆ بێبڕوایی، هەندێکتان بدات لە گەردنی هەندێکی دیکەتان، وە کەسیش بەهۆی تاوانی باوکی یان براکەی تۆڵەی لێ کرێتەوە.**

**٤١٢٩-** «عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّاراً»(٢).

**واتە: مەسروق دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە دوای من مەگەڕێنەوە بۆ بێبڕوایی.**

**٤١٣٠-** «عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَا تَرْجِعُوا بَعْدِي ضُلَّالاً، يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ»(٣).

**واتە: ئەبو بەکرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لە دوای من مەگەڕێنەوە بۆ گومڕایی، هەندێکتان بدات لە گەردنی هەندێکی دیکەتان.**

**٤١٣١-** «عَنْ جَرِيرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ اسْتَنْصَتَ النَّاسَ قَالَ: لَا تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّاراً، يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ»(٤).

**واتە: جەریر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەجیماڵئاواییدا خەڵکی بێدەنگ کرد، فەرمووی: لە دوای من مەگەڕێنەوە بۆ بێبڕوایی هەندێکتان بدات لە گەردنی هەندێکی دیکەتان.**

**٤١٣٢-** «عَنْ قَيْسٍ قَالَ: بَلَغَنِي أَنَّ جَرِيرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اسْتَنْصِتِ النَّاسَ، ثُمَّ قَالَ: لَا أُلْفِيَنَّكُمْ بَعْدَ مَا أَرَى تَرْجِعُونَ بَعْدِي كُفَّاراً، يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ»(٥).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤١٢٥.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢١ و ٤٤٠٥ و ٦٨٦٩ و ٧٠٨٠، ومسلم: ٦٥، وإبن ماجه: ٣٩٤٢.

(٥) صحيح.




واتە: قەیس دەڵێ: پێم هەواڵم پێ گەیشتووە جەریری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکی بێدەنگ کرد، پاشان فەرمووی: با نەتانبینم لە دوای من بگەڕێنەوە بۆ بێبڕوایی، هەندێکتان بدات لە گەردنی هەندێکی دیکەتان.




**(الْفَيْء): بريتيه لەو ماڵ و سامانانەی بێبڕوایان، كە دەستی مسوڵمانان دەكەوێ بەبێ جەنگ كردن.**

**٤١٣٣-** «عَنْ يَزِيدَ بْنِ هُرْمُزَ، أَنَّ نَجْدَةَ الْحَرُورِيَّ حِينَ خَرَجَ فِي فِتْنَةِ ابْنِ الزُّبَيْرِ أَرْسَلَ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ يَسْأَلُهُ عَنْ سَهْمِ ذِي الْقُرْبَى لِمَنْ تُرَاهُ؟ قَالَ: هُوَ لَنَا لِقُرْبَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَسَمَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَهُمْ، وَقَدْ كَانَ عُمَرُ عَرَضَ عَلَيْنَا شَيْئاً رَأَيْنَاهُ دُونَ حَقِّنَا، فَأَبَيْنَا أَنْ نَقْبَلَهُ، وَكَانَ الَّذِي عَرَضَ عَلَيْهِمْ أَنْ يُعِينَ نَاكِحَهُمْ، وَيَقْضِيَ عَنْ غَارِمِهِمْ، وَيُعْطِيَ فَقِيرَهُمْ وَأَبَى أَنْ يَزِيدَهُمْ عَلَى ذَلِكَ»[1].

**واتە: یەزیدی كوڕی هورموز دەگێڕێتەوە، نەجدەی حەروری (گەورەی خەواریجەكان بوو) كاتێ دەرچوو (بۆ حەج) لە كاتی جەنگی ئیبنو زوبەیر، نامەی نارد بۆ ئیبنو عەبباس پرسیاری لێكرد لەبارەی پشكی (ذِي الْقُرْبَى) واتە: خزمانی نزیكی پێغەمبەر ﷺ لە نەوەی هاشم و نەوەی موطەلیب، پێت وایە بۆ كێیە؟ وتی: ئەوە بۆ ئێمەیە بۆ نزیكەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆیانی دیاری كردوە، عومەر شتێكی پێشنیار كرد بۆمان، پێمان وابوو ئەوە كەمترە لە مافی خۆمان، بۆیە ڕازی نەبووین وەری بگرین، ئەوەیشی پێشنیاری كردبوو بۆیان، ئەوە بوو یارمەتی ئەوەیان بدات كە ژن دەهێنێ و قەرزی قەرزارەكانیان ببژێرێ و ببەخشێ بە هەژارەكانیان، عومەر ڕازی نەبوو لەوە زیاتر بۆیان زیاد بكات.**

**٤١٣٤-** «عَنْ يَزِيدَ بْنِ هُرْمُزَ قَالَ: كَتَبَ نَجْدَةُ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ يَسْأَلُهُ عَنْ سَهْمِ ذِي الْقُرْبَى، لِمَنْ هُوَ؟ قَالَ يَزِيدُ بْنُ هُرْمُزَ: وَأَنَا كَتَبْتُ كِتَابَ ابْنِ عَبَّاسٍ إِلَى نَجْدَةَ، كَتَبْتُ إِلَيْهِ، كَتَبْتَ تَسْأَلُنِي عَنْ سَهْمِ ذِي الْقُرْبَى لِمَنْ هُوَ، وَهُوَ لَنَا أَهْلَ الْبَيْتِ، وَقَدْ كَانَ عُمَرُ دَعَانَا إِلَى أَنْ يُنْكِحَ مِنْهُ أَيِّمَنَا، وَيُحْذِيَ مِنْهُ عَائِلَنَا، وَيَقْضِيَ مِنْهُ عَنْ غَارِمِنَا، فَأَبَيْنَا إِلَّا أَنْ يُسَلِّمَهُ لَنَا وَأَبَى ذَلِكَ فَتَرَكْنَاهُ عَلَيْهِ»[2].

**واتە: یەزیدی كوڕی هورموز دەڵێ: نەجدە (كوڕی عامیر كە گەورەی خەواریجەكان بوو) نوسراوی نووسی و بۆ ئیبنو عەبباسی نارد پرسیاری لێكرد لە بارەی پشكی خزمانی پێغەمبەر ﷺ، بۆ كێیە؟ یەزیدی كوڕی هورموز وتی: من نوسراوەكەی ئیبنو عەبباسم نوسی بۆ نەجدە، نوسیم بۆی، نوسراوت كردوە بۆم پرسیارم لێ دەكەی لە بارەی پشكی خزم و كەسەكانی پێغەمبەر ﷺ بۆ كێیە؟ ئەوە بۆ**

---

**(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٣٧ و ١٨١٢/١٣٩، وأبو داود: ٢٧٢٧ و ٢٧٢٨ و ٢٩٨٢، والترمذي: ١٥٥٦.**

**(٢) صحيح لغيره.**




**ئێمەی کەسوکاری پێغەمبەرە ﷺ، عومەر بانگی کردین لەو پشکە ژن بۆ گەنجەکانمان بهێنێ و بێوەژنەکانمان بدات بە شوو، هاوکاری هەژارەکانیشمان بکات و قەرزی قەرزارەکانیشمان ببژێرێ، ئێمەش ناڕازی بووین وتمان: دەبێ بیدەی بە خۆمان، ئەویش ئەوەی نەکردو ئێمەش وازمان لێهێنا.**

**٤١٣٥-** «عَنْ الْأَوْزَاعِيِّ قَالَ: كَتَبَ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ إِلَى عُمَرَ بْنِ الْوَلِيدِ كِتَاباً فِيهِ: وَقَسْمُ أَبِيكَ لَكَ الْخُمُسُ كُلُّهُ، وَإِنَّمَا سَهْمُ أَبِيكَ كَسَهْمِ رَجُلٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، وَفِيهِ حَقُّ اللَّهِ، وَحَقُّ الرَّسُولِ، وَذِي الْقُرْبَى، وَالْيَتَامَى، وَالْمَسَاكِينِ، وَابْنِ السَّبِيلِ، فَمَا أَكْثَرَ خُصَمَاءَ أَبِيكَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَكَيْفَ يَنْجُو مَنْ كَثُرَتْ خُصَمَاؤُهُ، وَإِظْهَارُكَ الْمَعَازِفَ، وَالْمِزْمَارَ بِدْعَةٌ فِي الْإِسْلَامِ، وَلَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ أَبْعَثَ إِلَيْكَ مَنْ يَجُزُّ جُمَّتَكَ جُمَّةَ السُّوءِ»[1].

**واتە: ئەوزاعی دەڵێ: عومەری کوڕی عەبدولعەزیز نوسراوی نارد بۆ عومەری کوڕی وەلید تێیدا نوسرا بوو: بەشی باوکت پێنج یەکە هەمووی بۆ تۆ، بەڵکو بەشی باوکت وەکو بەشی پیاوێکە لە مسوڵمانان، مافی خوای تێدایە، هەروەها مافی پێغەمبەر و خزم و کەسوکارەکەی و هەژاران و ڕێبواران، ئای چەندە زۆرە نەیارەکانی باوکت لە ڕۆژی دواییدا، کەسێک نەیاری زۆر بێت چۆن ڕزگاری دەبێت، هەروەها بە ئاشکرا موسیقاو زوڕنا لێدانت بیدعەیە لە ئیسلامدا، بەڕاستی هات بە خەیاڵمدا کەسێک بنێرم ئەو ناوچاوانە خراپەت بگرێ.**

**٤١٣٦-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيِّبِ، أَنَّ جُبَيْرَ بْنَ مُطْعِمٍ ﷺ حَدَّثَهُ، أَنَّهُ جَاءَ هُوَ وَعُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُكَلِّمَانِهِ فِيمَا قَسَمَ مِنْ خُمُسِ حُنَيْنٍ، بَيْنَ بَنِي هَاشِمٍ، وَبَنِي الْمُطَّلِبِ بْنِ عَبْدِ مَنَافٍ فَقَالَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَسَمْتَ لِإِخْوَانِنَا بَنِي الْمُطَّلِبِ بْنِ عَبْدِ مَنَافٍ، وَلَمْ تُعْطِنَا شَيْئاً، وَقَرَابَتُنَا مِثْلُ قَرَابَتِهِمْ، فَقَالَ لَهُمَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّمَا أَرَى هَاشِماً وَالْمُطَّلِبَ شَيْئاً وَاحِداً، قَالَ جُبَيْرُ بْنُ مُطْعِمٍ: وَلَمْ يَقْسِمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِبَنِي عَبْدِ شَمْسٍ، وَلَا لِبَنِي نَوْفَلٍ مِنْ ذَلِكَ الْخُمُسِ شَيْئاً، كَمَا قَسَمَ لِبَنِي هَاشِمٍ، وَبَنِي الْمُطَّلِبِ»[2].

**واتە: سەعیدی کوڕی موسەییب دەگێڕێتەوە: جوبەیری کوڕی موطعیم ﷺ بۆی باس کرد، کە ئەوو عوسمانی کوڕی عەففان هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ**

---

(١) صحيح الإسناد مقطوع.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣١٤٠ و ٣٥٠٢ و ٤٢٢٩، وأبو داود: ٢٩٨٧ و ٢٩٧٩ و ٢٩٨٠، وإبن ماجه: ٢٨٨١.

قسەیان لەگەڵ كرد لە بارەی ئەوەی دابەشی كرد لە پێنجیەكی حونەین لە نێوان نەوەكانی هاشم و نەوەكانی عەبدولموطەلیبی كوڕی عەبدومەناف، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، دابەشت كردوە بەسەر براكانماندا لە نەوەكانی موطەلیبی كوڕی عەبدومەناف، هیچت بە ئێمە نەبەخشی، خزمایەتی ئێمەش وەكو خزمایەتی ئەوان وایە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێیانی فەرموو: من وا دەبینم هاشم و موطەڵیب یەكێكن، جوبەیری كوڕی موطعیم وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەشی نەوەكانی عەبدوشەمس و نەوەكانی نەوفەلی نەدا لەو پێنجیەكە، وەكو چۆن بەشی نەوەكانی هاشم و نەوەكانی موطەلیبیدا.

**٤١٣٧**- «عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا قَسَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ سَهْمَ ذِي الْقُرْبَى بَيْنَ بَنِي هَاشِمٍ، وَبَنِي الْمُطَّلِبِ أَتَيْتُهُ أَنَا وَعُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَؤُلَاءِ بَنُو هَاشِمٍ لَا نُنْكِرُ فَضْلَهُمْ لِمَكَانِكَ الَّذِي جَعَلَكَ اللَّهُ بِهِ مِنْهُمْ، أَرَأَيْتَ بَنِي الْمُطَّلِبِ أَعْطَيْتَهُمْ، وَمَنَعْتَنَا، فَإِنَّمَا نَحْنُ وَهُمْ مِنْكَ بِمَنْزِلَةٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّهُمْ لَمْ يُفَارِقُونِي فِي جَاهِلِيَّةٍ وَلَا إِسْلَامٍ، إِنَّمَا بَنُو هَاشِمٍ، وَبَنُو الْمُطَّلِبِ شَيْءٌ وَاحِدٌ، وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ»[١].

واتە: جوبەیری كوڕی موطعیم ﷺ دەڵێ: كاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ بەشی خزمە نزیكەكانی دابەشكرد لە نێوان نەوەكانی هاشم و نەوەكانی موطەلیبدا، من و عوسمانی كوڕی عەففان هاتین بۆ لای، وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوانە نەوەكانی هاشمن نكوڵی فەزڵ و چاكە و پلە و پایەیان ناكەین كە خوا بۆی دیاریكردوون، بەڵام بەنەوەكانی عەبدولموطەلیبت بەخشی و ئێمەت بێبەش كرد، ئێمە و ئەوان لای تۆ یەک پلە و پایەمان هەیە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوان نە لە ئیسلام و نە لە نەفامی لێم جیانەبوونەتەوە، بەڵكو نەوەكانی هاشم و نەوەكانی موطەلیب یەک شتن، دەستەكانی خستە ناو یەكتر.

**٤١٣٨**- «عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ قَالَ: أَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ حُنَيْنٍ وَبَرَةً مِنْ جَنْبِ بَعِيرٍ، فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّهُ لَا يَحِلُّ لِي مِمَّا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ قَدْرُ هَذِهِ إِلَّا الْخُمُسُ، وَالْخُمُسُ مَرْدُودٌ عَلَيْكُمْ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) حسن. أخرجه الترمذي: ١٥٦١، وإبن ماجه: ٢٨٥٢.




**واتە: عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی حونەیندا تاڵێ مووی کردەوە لە تەنیشتی وشترێک، فەرمووی: ئەی خەڵکینە، بەڕاستی حەڵاڵ نیە بۆ من لەوەی خوا دەستی خستووم بەبێ جەنگ بە ئەندازەی پێنجیەک نەبێ، پێنجیەکیش دەگەڕێتەوە بۆ خۆتان.**

**٤١٣٩-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَتَى بَعِيراً فَأَخَذَ مِنْ سَنَامِهِ وَبَرَةً بَيْنَ إِصْبَعَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّهُ لَيْسَ لِي مِنَ الْفَيْءِ شَيْءٌ وَلَا هَذِهِ إِلَّا الْخُمُسُ، وَالْخُمُسُ مَرْدُودٌ فِيكُمْ»[1].

**واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، لە باپیرەیەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لای وشترێک تاڵێ مووی لە کۆپانەی پشتی کردەوە لە نێوان هەردوو پەنجەیدا، پاشان فەرمووی: هیچ لەم فەیئەی کە بەبێ جەنگ دەستمان کەوتووە بۆ من نیە، نە ئەمەش جگە لە پێنجیەک، پێنج یەکەکەش دەگەڕێتەوە بۆ خۆتان.**

**٤١٤٠-** «عَنْ عُمَرَ ﷺ قَالَ: كَانَتْ أَمْوَالُ بَنِي النَّضِيرِ مِمَّا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِمَّا لَمْ يُوجِفِ الْمُسْلِمُونَ عَلَيْهِ بِخَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ، فَكَانَ، يُنْفِقُ عَلَى نَفْسِهِ مِنْهَا قُوتَ سَنَةٍ، وَمَا بَقِيَ جَعَلَهُ فِي الْكُرَاعِ وَالسِّلَاحِ عُدَّةً فِي سَبِيلِ اللَّهِ»[2].

**واتە: عومەر ﷺ دەڵێ: ماڵ و سامانی بەنی نەضیر لەوانە بوو کە خوا دەستی پێغەمبەرەکەی ﷺ خست بەبێ جەنگ، مسوڵمانان بۆ بەدەستهێنانی ئەو دەستکەوتانە هیچ ئەسپ و وشترێکیان تاو نەداوە، خواردنی ساڵێکی بۆ خۆی لێ جیاکردەوە، ئەوەشی مایەوە داینا بۆ کڕینی وشترو ئەسپ و چەک، بۆ خۆ ئامادەکردن لە پێناوی خوا.**

**٤١٤١-** «عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ فَاطِمَةَ أَرْسَلَتْ إِلَى أَبِي بَكْرٍ تَسْأَلُهُ مِيرَاثَهَا مِنَ النَّبِيِّ ﷺ مِنْ صَدَقَتِهِ، وَمِمَّا تَرَكَ مِنْ خُمُسِ خَيْبَرَ، قَالَ أَبُو بَكْرٍ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا نُورَثُ»[3].

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٢٦٩٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٩٠٤ و ٤٨٨٥، ومسلم: ١٧٥٧، وأبو داود: ٢٩٦٥، والترمذي: ١٧١٩.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٧١١ و ٣٧١٢ و ٤٠٣٥ و ٤٠٣٦ و ٣٢٣٠ و ٤٢٤١ و ٦٧٢٥ و ٦٧٢٦، ومسلم: ٥٢ و ١٧٥٩/٥٤، وأبو داود: ٢٩٦٧ و ٢٩٦٩ و ٢٩٧٠، والترمذي: ١٦٠٨ و ١٦٠٩.

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: فاطیمە ناردی بۆ لای ئەبو بەكر داوای پشكی میراتی خۆی كرد لە پێغەمبەرەوە ﷺ لە بەخشینەكانی و لەوەشی بەجێماوە لە پێنج یەكی خەیبەر، ئەبو بەكر وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئێمە میراتمان لێ نابرێ.

**٤١٤٢-** «عَنْ عَطَاءٍ، فِي قَوْلِهِ ﷻ: ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمۡتُم مِّن شَيۡءٖ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ ﴿٤١﴾﴾الأنفال، قَالَ: خُمُسُ اللَّهِ وَخُمُسُ رَسُولِهِ وَاحِدٌ، كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَحْمِلُ مِنْهُ، وَيُعْطِي مِنْهُ، وَيَضَعُهُ حَيْثُ شَاءَ، وَيَصْنَعُ بِهِ مَا شَاءَ»[١].

واتە: عەطاء دەگێڕێتەوە: لەبارەی فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمۡتُم مِّن شَيۡءٖ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ ﴿٤١﴾﴾ (واتە: وە بزانن بێگومان هەرچیەكتان لە غەنیمەت دەستكەوت ئەوە بەڕاستی پێنجیەكی ئەو دەستكەوتە بۆ خوا و بۆ پێغەمبەرو بۆ خزمانی پێغەمبەرە ﷺ). وتی: پێنجیەكی خواو پێنجیەكی پێغەمبەرەكەی ﷺ یەكێكە، پێغەمبەری خوا ﷺ لێی هەڵدەگرت و لێی دەبەخشی، هەرچۆنێ بیویستایە بەكاری دەهێنا، هەرچۆنێكیشی بویستایە كاری پێدەكرد.

**٤١٤٣-** «عَنْ قَيْسِ بْنِ مُسْلِمٍ قَالَ: سَأَلْتُ الْحَسَنَ بْنَ مُحَمَّدٍ، عَنْ قَوْلِهِ ﷻ: ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمۡتُم مِّن شَيۡءٖ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ ﴿٤١﴾﴾الأنفال، قَالَ: هَذَا مَفَاتِحُ كَلَامِ اللَّهِ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةُ لِلَّهِ، قَالَ: اخْتَلَفُوا فِي هَذَيْنِ السَّهْمَيْنِ بَعْدَ وَفَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، سَهْمِ الرَّسُولِ وَسَهْمِ ذِي الْقُرْبَى، فَقَالَ قَائِلٌ: سَهْمُ الرَّسُولِ ﷺ لِلْخَلِيفَةِ مِنْ بَعْدِهِ، وَقَالَ قَائِلٌ: سَهْمُ ذِي الْقُرْبَى لِقَرَابَةِ الرَّسُولِ ﷺ، وَقَالَ قَائِلٌ: سَهْمُ ذِي الْقُرْبَى لِقَرَابَةِ الْخَلِيفَةِ، فَاجْتَمَعَ رَأْيُهُمْ عَلَى أَنْ جَعَلُوا هَذَيْنِ السَّهْمَيْنِ فِي الْخَيْلِ وَالْعُدَّةِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، فَكَانَا فِي ذَلِكَ خِلَافَةَ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ»[٢].

واتە: قەیسی كوڕی موسلیم دەڵێ: پرسیارم كرد لە حەسەنی كوڕی موحەممەد، لە بارەی فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمۡتُم مِّن شَيۡءٖ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ ﴿٤١﴾﴾ (واتە: وە بزانن بێگومان هەر چیەكتان لە غەنیمەت دەستكەوت ئەوە بەڕاستی پێنجیەكی ئەو دەستكەوتە بۆ خواو بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ و بۆ خزمانی پێغەمبەرە ﷺ). وتی: ئەمە دەستپێكی فەرمایشتی خوایە، دونیاو دواڕۆژ هەر بۆ ئەوە، وتی: لە دوای كۆچی

---

(١) صحيح الإسناد مرسل.

(٢) صحيح الإسناد مرسل.




**دوایی پێغەمبەر ﷺ بۆچوونی جیاوازیان هەبوو دەربارەی ئەم دوو بەشە: بەشی پێغەمبەرو بەشی خزمە نزیکەکانی، هەندێکیان وتیان: بەشی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خەلیفەی دوای ئەو دەبێ، هەندێکیشیان وتیان: بەشی خزمە نزیکەکان بۆ کەس و کاری پێغەمبەر ﷺ دەبێ، هەندێکیشیان وتیان: بەشی خزمە نزیکەکان بۆ خزم و کەس و کاری خەلیفە دەبێ، هەموویان لەسەر ئەوە کۆبوونەوە کە ئەم دوو بەشە دیاری بکەن بۆ ئەسپ و خۆئامادەکردن لە پێناوی خوادا، ئەمەش لە خیلافەتی ئەبو بەکر و عومەردا بوو.**

**٤١٤٤-** «عَنْ مُوسَى بْنِ أَبِي عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَ: سَأَلْتُ يَحْيَى بْنَ الْجَزَّارِ، عَنْ هَذِهِ الْآيَةِ: ﴿وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَىْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ ﴿٤١﴾﴾الأنفال، قَالَ: قُلْتُ: كَمْ كَانَ لِلنَّبِيِّ ﷺ مِنَ الْخُمُسِ؟ قَالَ: خُمُسُ الْخُمُسِ»[1].

**واتە: موسای کوڕی ئەبو عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پرسیارم لە یەحیای جەزار کرد لە بارەی ئەم ئایەتەوە: ﴿وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَىْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ ﴿٤١﴾﴾ (واتە: وە بزانن بێگومان هەر چیەکتان لە غەنیمەت دەستکەوت ئەوە بەڕاستی پێنج یەکی ئەو دەستکەوتە بۆ خوا و بۆ پێغەمبەرو بۆ خزمانی پێغەمبەرە)، وتی: وتم: پێغەمبەر ﷺ پشکی چەند بوو لەم پێنجیەکەدا؟ وتی: پێنجیەکی پێنجیەک.**

**٤١٤٥-** «عَنْ مُطَرِّفٍ قَالَ: سُئِلَ الشَّعْبِيُّ، عَنْ سَهْمِ النَّبِيِّ ﷺ وَصَفِيِّهِ، فَقَالَ: أَمَّا سَهْمُ النَّبِيِّ ﷺ فَكَسَهْمِ رَجُلٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، وَأَمَّا سَهْمُ الصَّفِيِّ فَغُرَّةٌ تُخْتَارُ مِنْ أَيِّ شَيْءٍ شَاءَ»[2].

**واتە: موتەڕڕیف دەڵێ: پرسیارکرا لە شەعبی، دەربارەی بەشی پێغەمبەر ﷺ و ئەوەشی تایبەتە بە ئەو، وتی: بەشی پێغەمبەر ﷺ وەکو بەشی کەسێکی ئاسایی بوو لە مسوڵمانان، بەڵام بەشی تایبەتی چاکترین شتێک هەڵدەبژێردرا لە هەر شتێکدا ویستی لەسەر بووایە.**

**٤١٤٦-** «عَنْ يَزِيدَ بْنِ الشِّخِّيرِ قَالَ: بَيْنَا أَنَا مَعَ مُطَرِّفٍ بِالْمِرْبَدِ إِذْ دَخَلَ رَجُلٌ، مَعَهُ قِطْعَةُ أَدَمٍ قَالَ: كَتَبَ لِي هَذِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَهَلْ أَحَدٌ مِنْكُمْ يَقْرَأُ؟ قَالَ: قُلْتُ: أَنَا أَقْرَأُ، فَإِذَا فِيهَا: مِنْ مُحَمَّدٍ النَّبِيِّ ﷺ لِبَنِي زُهَيْرِ بْنِ أُقَيْشٍ، أَنَّهُمْ إِنْ شَهِدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللَّهِ،

---

(١) صحيح الإسناد مرسل.

(٢) صحيح الإسناد مرسل. أخرجه أبو داود: ٢٩٩١.




وَفَارَقُوا الْمُشْرِكِينَ، وَأَقَرُّوا بِالْخُمُسِ فِي غَنَائِمِهِمْ، وَسَهْمِ النَّبِيِّ ﷺ وَصَفِيِّهِ، فَإِنَّهُمْ آمِنُونَ بِأَمَانِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ»[1].

واتە: یەزیدی کوڕی شیخیر دەڵێ: کاتێ من لەگەڵ موتەڕڕیف بووم لە میربەد پیاوێک هاتە ژوورەوە، پارچەک خواردەمەنی پێ بوو وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمەی بۆم نوسیوە ئایا کەسێکتان دەیخوێنێتەوە؟ وتی: وتم: من دەیخوێنمەوە، ئەوەی تێدا بوو: لە موحەممەدەوە پێغەمبەری خوا بۆ نەوەکانی زوهەیری کوڕی ئەقیەش، ئەوان ئەگەر شایەتی بدەن بەوەی هیچ پەرستراوێک نیە بە حەق جگە لە خوا، وە موحەممەدیش پێغەمبەری خوایە ﷺ، لە هاوبەشدانەران جیا ببنەوەو دان بە پێنجیەکدا بنێن لە دەستکەوتەکان، وە بەشی پێغەمبەر ﷺ و ئەوەیشی تایبەت بە ئەو هەڵیدەبژێرێ، ئەوە ئەوان بڕوایان بە خواو بە پێغەمبەرەکەی هێناوە.

**٤١٤٧-** «عَنْ مُجَاهِدٍ قَالَ: الْخُمُسُ الَّذِي لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ كَانَ لِلنَّبِيِّ ﷺ وَقَرَابَتِهِ، لَا يَأْكُلُونَ مِنَ الصَّدَقَةِ شَيْئاً، فَكَانَ لِلنَّبِيِّ ﷺ خُمُسُ الْخُمُسِ، وَلِذِي قَرَابَتِهِ خُمُسُ الْخُمُسِ، وَلِلْيَتَامَى مِثْلُ ذَلِكَ، وَلِلْمَسَاكِينِ مِثْلُ ذَلِكَ، وَلِابْنِ السَّبِيلِ مِثْلُ ذَلِكَ، قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: قَالَ اللَّهُ جَلَّ ثَنَاؤُهُ: ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَىٰ وَالْيَتَامَىٰ وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ ﴿٤١﴾﴾ الأنفال، قَوْلُهُ ﷻ ﴿لِلَّهِ ﴿٤١﴾﴾ الأنفال، ابْتِدَاءُ كَلَامٍ لِأَنَّ الْأَشْيَاءَ كُلَّهَا لِلَّهِ ﷻ، وَلَعَلَّهُ إِنَّمَا اسْتَفْتَحَ الْكَلَامَ فِي الْفَيْءِ وَالْخُمُسِ بِذِكْرِ نَفْسِهِ لِأَنَّهَا أَشْرَفُ الْكَسْبِ، وَلَمْ يَنْسِبِ الصَّدَقَةَ إِلَى نَفْسِهِ ﷻ لِأَنَّهَا أَوْسَاخُ النَّاسِ وَاللَّهُ تَعَالَى أَعْلَمُ، وَقَدْ قِيلَ يُؤْخَذُ مِنَ الْغَنِيمَةِ شَيْءٌ فَيُجْعَلُ فِي الْكَعْبَةِ وَهُوَ السَّهْمُ الَّذِي لِلَّهِ ﷻ، وَسَهْمُ النَّبِيِّ ﷺ إِلَى الْإِمَامِ يَشْتَرِي الْكُرَاعَ مِنْهُ وَالسِّلَاحَ، وَيُعْطِي مِنْهُ مَنْ رَأَى مِمَّنْ رَأَى فِيهِ غَنَاءً وَمَنْفَعَةً لِأَهْلِ الْإِسْلَامِ، وَمِنْ أَهْلِ الْحَدِيثِ وَالْعِلْمِ وَالْفِقْهِ وَالْقُرْآنِ، وَسَهْمٌ لِذِي الْقُرْبَى وَهُمْ بَنُو هَاشِمٍ وَبَنُو الْمُطَّلِبِ بَيْنَهُمُ الْغَنِيُّ مِنْهُمْ وَالْفَقِيرُ، وَقَدْ قِيلَ إِنَّهُ لِلْفَقِيرِ مِنْهُمْ دُونَ الْغَنِيِّ كَالْيَتَامَى وَابْنِ السَّبِيلِ وَهُوَ أَشْبَهُ الْقَوْلَيْنِ بِالصَّوَابِ عِنْدِي وَاللَّهُ تَعَالَى أَعْلَمُ، وَالصَّغِيرُ وَالْكَبِيرُ وَالذَّكَرُ وَالْأُنْثَى سَوَاءٌ، لِأَنَّ اللَّهَ ﷻ جَعَلَ ذَلِكَ لَهُمْ، وَقَسَّمَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِيهِمْ، وَلَيْسَ فِي الْحَدِيثِ أَنَّهُ فَضَّلَ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ، وَلَا خِلَافَ نَعْلَمُهُ بَيْنَ الْعُلَمَاءِ فِي رَجُلٍ لَوْ أَوْصَى بِثُلُثِهِ لِبَنِي فُلَانٍ أَنَّهُ بَيْنَهُمْ وَأَنَّ الذَّكَرَ وَالْأُنْثَى فِيهِ سَوَاءٌ إِذَا كَانُوا يُحْصَوْنَ، فَهَكَذَا كُلُّ شَيْءٍ صُيِّرَ لِبَنِي فُلَانٍ أَنَّهُ بَيْنَهُمْ بِالسَّوِيَّةِ إِلَّا أَنْ يُبَيِّنَ ذَلِكَ الْآمِرُ بِهِ وَاللَّهُ وَلِيُّ التَّوْفِيقِ، وَسَهْمٌ لِلْيَتَامَى مِنَ الْمُسْلِمِينَ، وَسَهْمٌ لِلْمَسَاكِينِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، وَسَهْمٌ لِابْنِ السَّبِيلِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، وَلَا يُعْطَى أَحَدٌ مِنْهُمْ سَهْمُ مِسْكِينٍ

---

(١) صحيح الإسناد. أخرجه أبو داود: ٢٩٩٩.

دوایی پێغەمبەر ﷺ بۆچوونی جیاوازیان هەبوو دەربارەی ئەم دوو بەشە: بەشی پێغەمبەرو بەشی خزمە نزیکەکانی، هەندێکیان وتیان: بەشی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خەلیفەی دوای ئەو دەبێ، هەندێکیشیان وتیان: بەشی خزمە نزیکەکان بۆ کەس و کاری پێغەمبەر ﷺ دەبێ، هەندێکیشیان وتیان: بەشی خزمە نزیکەکان بۆ خزم و کەس و کاری خەلیفە دەبێ، هەموویان لەسەر ئەوە کۆبوونەوە کە ئەم دوو بەشە دیاری بکەن بۆ ئەسپ و خۆئامادەکردن لە پێناوی خوادا، ئەمەش لە خیلافەتی ئەبو بەکر و عومەردا بوو.

**٤١٤٤-** «عَنْ مُوسَى بْنِ أَبِي عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَ: سَأَلْتُ يَحْيَى بْنَ الْجَزَّارِ، عَنْ هَذِهِ الْآيَةِ: ﴿وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ ﴿٤١﴾﴾الأنفال، قَالَ: قُلْتُ: كَمْ كَانَ لِلنَّبِيِّ ﷺ مِنَ الْخُمُسِ؟ قَالَ: خُمُسُ الْخُمُسِ»[1].

**واتە: موسای کوڕی ئەبو عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پرسیارم لە یەحیای جەزار کرد لە بارەی ئەم ئایەتەوە: ﴿وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ ﴿٤١﴾﴾ (واتە: وە بزانن بێگومان هەر چیەکتان لە غەنیمەت دەستکەوت ئەوە بەڕاستی پێنج یەکی ئەو دەستکەوتە بۆ خوا و بۆ پێغەمبەرو بۆ خزمانی پێغەمبەرە)، وتی: وتم: پێغەمبەر ﷺ پشکی چەند بوو لەم پێنجیەکەدا؟ وتی: پێنجیەکی پێنجیەک.**

**٤١٤٥-** «عَنْ مُطَرِّفٍ قَالَ: سُئِلَ الشَّعْبِيُّ، عَنْ سَهْمِ النَّبِيِّ ﷺ وَصَفِيِّهِ، فَقَالَ: أَمَّا سَهْمُ النَّبِيِّ ﷺ فَكَسَهْمِ رَجُلٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، وَأَمَّا سَهْمُ الصَّفِيِّ فَغُرَّةٌ تُخْتَارُ مِنْ أَيِّ شَيْءٍ شَاءَ»[2].

**واتە: موتەڕڕیف دەڵێ: پرسیارکرا لە شەعبی، دەربارەی بەشی پێغەمبەر ﷺو ئەوەشی تایبەتە بە ئەو، وتی: بەشی پێغەمبەر ﷺ وەکو بەشی کەسێکی ئاسایی بوو لە مسوڵمانان، بەڵام بەشی تایبەتی چاکترین شتێک هەڵدەبژێردرا لە هەر شتێکدا ویستی لەسەر بووایە.**

**٤١٤٦-** «عَنْ يَزِيدَ بْنِ الشِّخِّيرِ قَالَ: بَيْنَا أَنَا مَعَ مُطَرِّفٍ بِالْمِرْبَدِ إِذْ دَخَلَ رَجُلٌ، مَعَهُ قِطْعَةُ أَدَمٍ قَالَ: كَتَبَ لِي هَذِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَهَلْ أَحَدٌ مِنْكُمْ يَقْرَأُ؟ قَالَ: قُلْتُ: أَنَا أَقْرَأُ، فَإِذَا فِيهَا: مِنْ مُحَمَّدٍ النَّبِيِّ ﷺ لِبَنِي زُهَيْرِ بْنِ أُقَيْشٍ، أَنَّهُمْ إِنْ شَهِدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللَّهِ،

---

(١) صحيح الإسناد مرسل.

(٢) صحيح الإسناد مرسل. أخرجه أبو داود: ٢٩٩١.

وَفَارَقُوا الْمُشْرِكِينَ، وَأَقَرُّوا بِالْخُمُسِ فِي غَنَائِمِهِمْ، وَسَهْمِ النَّبِيِّ ﷺ وَصَفِيِّهِ، فَإِنَّهُمْ آمِنُونَ بِأَمَانِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ»[١].

واتە: یەزیدی کوڕی شیخیر دەڵێ: کاتێ من لەگەڵ موتەڕڕیف بووم لە میربەد پیاوێک هاتە ژوورەوە، پارچەک خواردەمەنی پێ بوو وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمەی بۆم نوسیوە ئایا کەسێکتان دەیخوێنێتەوە؟ وتی: وتم: من دەیخوێنمەوە، ئەوەی تێدا بوو: لە موحەممەدەوە پێغەمبەری خوا بۆ نەوەکانی زوهەیری کوڕی ئەقیەش، ئەوان ئەگەر شایەتی بدەن بەوەی هیچ پەرستراوێک نیە بە حەق جگە لە خوا، وە موحەممەدیش پێغەمبەری خوایە ﷺ، لە هاوبەشدانەران جیا ببنەوەو دان بە پێنجیەکدا بنێن لە دەستکەوتەکان، وە بەشی پێغەمبەر ﷺ و ئەوەیشی تایبەت بە ئەو هەڵیدەبژێرێ، ئەوە ئەوان بڕوایان بە خواو بە پێغەمبەرەکەی هێناوە.

**٤١٤٧**- «عَنْ مُجَاهِدٍ قَالَ: الْخُمُسُ الَّذِي لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ كَانَ لِلنَّبِيِّ ﷺ وَقَرَابَتِهِ، لَا يَأْكُلُونَ مِنَ الصَّدَقَةِ شَيْئاً، فَكَانَ لِلنَّبِيِّ ﷺ خُمُسُ الْخُمُسِ، وَلِذِي قَرَابَتِهِ خُمُسُ الْخُمُسِ، وَلِلْيَتَامَى مِثْلُ ذَلِكَ، وَلِلْمَسَاكِينِ مِثْلُ ذَلِكَ، وَلِابْنِ السَّبِيلِ مِثْلُ ذَلِكَ، قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: قَالَ اللَّهُ جَلَّ ثَنَاؤُهُ: ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمۡتُم مِّن شَيۡءٖ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٤١﴾﴾ الأنفال، قَوْلُهُ ﷻ: ﴿لِلَّهِ ﴿٤١﴾﴾ الأنفال، ابْتِدَاءُ كَلَامٍ لِأَنَّ الْأَشْيَاءَ كُلَّهَا لِلَّهِ ﷻ، وَلَعَلَّهُ إِنَّمَا اسْتَفْتَحَ الْكَلَامَ فِي الْفَيْءِ وَالْخُمُسِ بِذِكْرِ نَفْسِهِ لِأَنَّهَا أَشْرَفُ الْكَسْبِ، وَلَمْ يَنْسِبِ الصَّدَقَةَ إِلَى نَفْسِهِ ﷻ لِأَنَّهَا أَوْسَاخُ النَّاسِ وَاللَّهُ تَعَالَى أَعْلَمُ، وَقَدْ قِيلَ يُؤْخَذُ مِنَ الْغَنِيمَةِ شَيْءٌ فَيُجْعَلُ فِي الْكَعْبَةِ وَهُوَ السَّهْمُ الَّذِي لِلَّهِ ﷻ، وَسَهْمُ النَّبِيِّ ﷺ إِلَى الْإِمَامِ يَشْتَرِي الْكُرَاعَ مِنْهُ وَالسِّلَاحَ، وَيُعْطِي مِنْهُ مَنْ رَأَى مِمَّنْ رَأَى فِيهِ غَنَاءً وَمَنْفَعَةً لِأَهْلِ الْإِسْلَامِ، وَمِنْ أَهْلِ الْحَدِيثِ وَالْعِلْمِ وَالْفِقْهِ وَالْقُرْآنِ، وَسَهْمٌ لِذِي الْقُرْبَى وَهُمْ بَنُو هَاشِمٍ وَبَنُو الْمُطَّلِبِ بَيْنَهُمُ الْغَنِيُّ مِنْهُمْ وَالْفَقِيرُ، وَقَدْ قِيلَ إِنَّهُ لِلْفَقِيرِ مِنْهُمْ دُونَ الْغَنِيِّ كَالْيَتَامَى وَابْنِ السَّبِيلِ وَهُوَ أَشْبَهُ الْقَوْلَيْنِ بِالصَّوَابِ عِنْدِي وَاللَّهُ تَعَالَى أَعْلَمُ، وَالصَّغِيرُ وَالْكَبِيرُ وَالذَّكَرُ وَالْأُنْثَى سَوَاءٌ، لِأَنَّ اللَّهَ ﷻ جَعَلَ ذَلِكَ لَهُمْ، وَقَسَّمَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِيهِمْ، وَلَيْسَ فِي الْحَدِيثِ أَنَّهُ فَضَّلَ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ، وَلَا خِلَافَ نَعْلَمُهُ بَيْنَ الْعُلَمَاءِ فِي رَجُلٍ لَوْ أَوْصَى بِثُلُثِهِ لِبَنِي فُلَانٍ أَنَّهُ بَيْنَهُمْ وَأَنَّ الذَّكَرَ وَالْأُنْثَى فِيهِ سَوَاءٌ إِذَا كَانُوا يُحْصَوْنَ، فَهَكَذَا كُلُّ شَيْءٍ صُيِّرَ لِبَنِي فُلَانٍ أَنَّهُ بَيْنَهُمْ بِالسَّوِيَّةِ إِلَّا أَنْ يُبَيِّنَ ذَلِكَ الْآمِرُ بِهِ وَاللَّهُ وَلِيُّ التَّوْفِيقِ، وَسَهْمٌ لِلْيَتَامَى مِنَ الْمُسْلِمِينَ، وَسَهْمٌ لِلْمَسَاكِينِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، وَسَهْمٌ لِابْنِ السَّبِيلِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، وَلَا يُعْطَى أَحَدٌ مِنْهُمْ سَهْمُ مِسْكِينٍ

(١) صحيح الإسناد. أخرجه أبو داود: ٢٩٩٩.





وَسَهْمُ ابْنِ السَّبِيلِ، وَقِيلَ لَهُ: خُذْ أَيَّهُمَا شِئْتَ، وَالْأَرْبَعَةُ أَخْمَاسٍ يَقْسِمُهَا الْإِمَامُ بَيْنَ مَنْ حَضَرَ الْقِتَالَ مِنَ الْمُسْلِمِينَ الْبَالِغِينَ»[١].

واتە: موجاهید دەڵێ: ئەو یەک لەسەر پێنجەی کە بۆ خواو بۆ پێغەمبەرەکەیەتی بۆ پێغەمبەرو ﷺ خزمە نزیکەکانیەتی، چونکە ئەوان هیچ لە زەکات وەرناگرن، جا بەشی پێغەمبەر ﷺ پێنجیەکی پێنجیەکە، خزم و کەس و کارەکەیشی پێنجیەکی پێنجیەکە، بۆ هەتیویش بەو شێوەیە، بە هەمان شێوە بۆ هەژارو ڕێبواریش، ئەبو عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٤١﴾ ﴾، (واتە: وە بزانن بێگومان هەرچیەکتان لە دەستکەوت گرت ئەوە بەڕاستی پێنجیەکی ئەو دەستکەوتە بۆ خواو بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ و بۆ خزمانی پێغەمبەرو ﷺ بۆ هەتیوان و بۆ هەژاران و بۆ ڕێبوارانە)، فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿لِلَّهِ ﴿٤١﴾﴾ (واتە: بۆ خوا ﷻ). سەرەتا بەوە دەستی پێکردوە، چونکە شتەکان هەموویان بۆ خوان، وە پێدەچێ لەبەر ئەوە دەستی بە باسکردنی (فيء) پێنجیەک کردبێ بە باسکردنی خۆی، چونکە بەڕێزترین بە دەستهێنانە، زەکاتی نەداوەتە پاڵ خۆی، چونکە پیسی خەڵکیە، خوا زاناترە، وتراوە: شتێک لە دەستکەوت وەردەگیرێ و دەخرێتە ناو کەعبە، ئەوەش بەشی خوایە، بەشی پێغەمبەریش ﷺ دەگەڕێتەوە بۆ ئیمام و دەسەڵاتدار، ئاژەڵ و کەل و پەلی جەنگی پێ دەکرێ، وە لێی دەبەخشێ لەوەی پێی وایە سودی هەیە بۆ ئەهلی ئیسلام، لە فەرموودەناسان لەوانەی بەدوای فەرموودەدا دەگەڕێن و زانست و فیقهو قورئان دەخوێنن، وە بەشێکیش بۆ خزمە نزیکەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەوانیش نەوەکانی هاشم و نەوەکانی موطەڵیبە، بە دەوڵەمەندو هەژاریانەوە، وتراوە: ئەوە تەنها بۆ هەژارەکانیانە جگە لە دەوڵەمەندەکان، وەک هەتیوو ڕێبوارو وێنەی ئەوانە، ئەوەش تەواوترینی ئەو دوو قسەیە، خوا زاناترە، وە بچوک و گەورە وەکو یەک یەکسانن، چونکە خوا ﷻ ئەو بەشەی بۆ ئەوان داناوە، پێغەمبەریش ﷺ دابەشی کردوە بە سەریاندا، لە فەرمودەکەشدا نەهاتووە ئەو فەزلی هەندێکیانی دابێت بەسەر هەندێکی دیکەدا، وە هیچ جیاوازیەک نیە لەنێوان زانایاندا ئێمە بزانین لەبارەی پیاوێکەوە ئەگەر وەسیەت بکات بە سێیەکی ماڵەکەی بۆ نەوەکانی فلانە

---

(١) ضعيف الإسناد مرسل.




کەس، ئەوەش لە نێوانیاندا دابەش دەکرێ نێر و مێ بە یەکسانی، ئەگەر ئەوان ژمێردران ئەمە هەموو شتێکە دانراوە بۆ نەوەکانی فڵان کەس، ئەوە لە نێوانیاندایە بە یەکسانی، مەگەر ئەوە ڕوون بکاتەوە، خوا ﷻ یارمەتیدەر بێت، وە بەشێکیش بۆ هەتیوی مسوڵمانان، وە بەشێکیش بۆ هەژارانی مسوڵمانان، بەشێکیش بۆ ڕێبوارانی مسوڵمانان، هیچ یەکێک لەوانە بەشی هەژارو بەشی ڕێبواری پێ نادرێت و پێی بوترێ کامەیانت پێ باشە وەریبگرە، چوار بەشەکەی تریشی ئیمام دابەشی دەکات بۆ ئەوانەی بەژداری جەنگیان کردووەو باڵغ بوون.

**٤١٤٨-** «عَنْ مَالِكِ بْنِ أَوْسِ بْنِ الْحَدَثَانِ قَالَ: جَاءَ الْعَبَّاسُ وَعَلِيٌّ إِلَى عُمَرَ يَخْتَصِمَانِ فَقَالَ الْعَبَّاسُ: اقْضِ بَيْنِي وَبَيْنَ هَذَا، فَقَالَ النَّاسُ: افْصِلْ بَيْنَهُمَا، فَقَالَ عُمَرُ: لَا أَفْصِلُ بَيْنَهُمَا، قَدْ عَلِمَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا نُورَثُ مَا تَرَكْنَا صَدَقَةٌ، قَالَ: فَقَالَ الزُّهْرِيُّ: « وَلِيَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَأَخَذَ مِنْهَا قُوتَ أَهْلِهِ، وَجَعَلَ سَائِرَهُ سَبِيلَهُ سَبِيلَ الْمَالِ، ثُمَّ وَلِيَهَا أَبُو بَكْرٍ بَعْدَهُ، ثُمَّ وُلِّيتُهَا بَعْدَ أَبِي بَكْرٍ فَصَنَعْتُ فِيهَا الَّذِي كَانَ يَصْنَعُ، ثُمَّ أَتَيَانِي فَسَأَلَانِي أَنْ أَدْفَعَهَا إِلَيْهِمَا عَلَى أَنْ يَلِيَاهَا بِالَّذِي وَلِيَهَا بِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَالَّذِي وَلِيَهَا بِهِ أَبُو بَكْرٍ، وَالَّذِي وُلِّيتُهَا بِهِ، فَدَفَعْتُهَا إِلَيْهِمَا وَأَخَذْتُ عَلَى ذَلِكَ عُهُودَهُمَا، ثُمَّ أَتَيَانِي يَقُولُ هَذَا: اقْسِمْ لِي بِنَصِيبِي مِنَ ابْنِ أَخِي، وَيَقُولُ هَذَا: اقْسِمْ لِي بِنَصِيبِي مِنَ امْرَأَتِي، وَإِنْ شَاءَا أَنْ أَدْفَعَهَا إِلَيْهِمَا عَلَى أَنْ يَلِيَاهَا بِالَّذِي وَلِيَهَا بِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَالَّذِي وَلِيَهَا بِهِ أَبُو بَكْرٍ، وَالَّذِي وُلِّيتُهَا بِهِ دَفَعْتُهَا إِلَيْهِمَا، وَإِنْ أَبَيَا كُفِيَا ذَلِكَ، ثُمَّ قَالَ: ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمۡتُم مِّن شَيۡءٖ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٤١﴾﴾الأنفال، هَذَا لِهَؤُلَاءِ: ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡعَٰمِلِينَ عَلَيۡهَا وَٱلۡمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمۡ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَٱلۡغَٰرِمِينَ وَفِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴿٦٠﴾﴾التوبة، هَذِهِ لِهَؤُلَاءِ، ﴿وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنۡهُمۡ فَمَآ أَوۡجَفۡتُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ خَيۡلٖ وَلَا رِكَابٖ ﴿٦﴾﴾الحشر، قَالَ الزُّهْرِيُّ: هَذِهِ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ خَاصَّةً قُرًى عَرَبِيَّةً فَدَكُ كَذَا وَكَذَا، فَ: ﴿مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٧﴾﴾الحشر، وَ: ﴿لِلۡفُقَرَآءِ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ وَأَمۡوَٰلِهِمۡ ﴿٨﴾﴾الحشر، ﴿وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ﴿٩﴾﴾الحشر، الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِنْ قَبْلِهِمْ: ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ ﴿١٠﴾﴾الحشر، فَاسْتَوْعَبَتْ هَذِهِ الْآيَةُ النَّاسَ، فَلَمْ يَبْقَ أَحَدٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ إِلَّا لَهُ فِي هَذَا الْمَالِ حَقٌّ، أَوْ قَالَ: حَظٌّ، إِلَّا بَعْضَ مَنْ تَمْلِكُونَ مِنْ أَرِقَّائِكُمْ، وَلَئِنْ عِشْتُ إِنْ شَاءَ اللَّهُ لَيَأْتِيَنَّ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ حَقُّهُ، أَوْ قَالَ: حَظُّهُ»[1].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٠٩٤ و ٤٠٣٣ و ٥٣٥٨ و ٦٧٢٨ و ٧٣٠٥، ومسلم: ١٧٥٧/٤٩، وأبو داود: ٢٩٦٣ و ٢٩٢٤، والترمذي: ١٦١٠.




واتە: مالیکی کوڕی ئەوسی کوڕی حەدەثان دەڵێ: عەبباس و عەلی هاتن بۆ لای عومەر کێشەیان هەبوو، عەبباس وتی: دادوەری بکە لە نێوان من و ئەمەدا، خەڵکەکە وتیان: لە یەکیان جیابکەرەوە، عومەر وتی: لە یەکتریان جیاناکەمەوە، هەردووکیان دەزانن پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئێمە میراتمان لێ نابرێ ئەوەی بە جێمان هێشتووە صەدەقەو بەخشینە، وتی: زوهری وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەشی خانەوادەی خۆی لێ جیاکردۆتەوەو دواتر هەمووی بەخشیوە، پاشان ئەبو بەکر دوای ئەو سەرپەرشتی کرد، پاشان منیش دوای ئەبو بەکر سەرپەرشتی دەکەم، ئەوەی ئەو کردی منیش دەیکەم، پاشان هاتن بۆ لام داوایان لێ کردم پێیان بدەم لە سەر ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی داون، لە سەر ئەوەیشی کە ئەبو بەکر سەرپەرشتی کردوە، لەسەر ئەوەیشی من سەرپەرشتی دەکەم، منیش پێیانمداو پەیمانم لەسەر ئەوە لێیان وەرگرت، پاشان هاتن بۆ لام یەکێکیان وتی: بەشی من لە برازاکەم جیابکەرەوە، ئەوی تریان وتی: بەشی من لە ژنەکەم جیابکەرەوە، ئەگەر دەیانەوێ پێیان دەدەم ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی داون، ئەوەیشی کە ئەبو بەکر بەجێنشینی پێیداون و ئەوەیشی من بە جێنشینی پێمداون، ئەگەر ناڕازیش بوون ئەوەیان بەسە، پاشان دەڵێ: ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمۡتُم مِّن شَيۡءٖ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٤١﴾﴾الأنفال. (واتە: وە بزانن بێگومان هەرچیەکتان لە دەستکەوت گرت ئەوە بەڕاستی پێنجیەکی ئەو دەستکەوتە بۆ خواو بۆ پێغەمبەرەکەی و بۆ خزمانی پێغەمبەرو ﷺ بۆ هەتیوان و بۆ هەژاران و بۆ ڕێبوارانە)، ئەمەش بۆ ئەوانە: ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡعَٰمِلِينَ عَلَيۡهَا وَٱلۡمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمۡ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَٱلۡغَٰرِمِينَ وَفِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴿٦٠﴾﴾التوبة، (واتە: بەڕاستی خێرەکان تەنها بۆ بێ نەوایان و هەژاران و کرێکارانێک کە بەسەریەوەن، وە ئەوانەی دڵیان دائەهێنرێ بۆ خۆشەویستی ئیسلام، وە بۆ ئازادکردنی بەندەو کۆیلەکان و بۆ قەرزاران و بۆ جەنگاوەرانی ڕێگای خوا)، ئەمەش بۆ ئەو کەسانەیە: ﴿وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنۡهُمۡ فَمَآ أَوۡجَفۡتُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ خَيۡلٖ وَلَا رِكَابٖ ﴿٦﴾﴾الحشر، (واتە: ئەو دەستکەوتانەی کە خوا سەندیەوە بەبێ جەنگ بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ لە ماڵی ئێوە بۆ بەدەستهێنانی هیچ ئەسپ و وشترێکیان تاو نەداوە، زوهری وتی: ئەمە بۆ پێغەمبەری خوایە ﷺ بە تایبەت دێهاتە عەرەبیەکان فلان و فلان: ﴿مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٧﴾﴾الحشر،




(واتە: ئەوەی خوا دەست پێغەمبەری خست بەبێ جەنگ لە سەروەت و سامانی دێهاتیەکات ئەوە بۆ خواو بۆ پێغەمبەرە، وە بۆ خزمان و هەتیوان، وە بۆ هەژاران و ڕێبوارانی کەمدەست)، ﴿لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَـٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَـٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ ﴿٨﴾﴾، (واتە: ئەو دەستکەوتەی لە بەنی نەضیر گیرا بۆ نەدارانی کۆچکەرانە ئەوانەی کە دەرکران لە ماڵ و سامانیان)، ﴿وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَـٰنَ مِن قَبْلِهِمْ ﴿٩﴾﴾الحشر، (واتە: وە بۆ ئەو هەژارانەی کە لە پێش کۆچکەراندا نیشتەجێ بوون لە مەدینەو کردیان بە بارەگای بڕوا)، ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعْدِهِمْ ﴿١٠﴾﴾الحشر، (واتە: ئەوانەش لە پاش ئەمانەوە هاتوون) ئەم ئایەتە هەموو خەڵکی دەگرێتەوە، هیچ یەکێک لە مسوڵمانان نیە ئیلا مافی خۆی هەیە لەو ماڵ و سامانەدا، مەگەر هەندێ لە کۆیلەکان نەبێ، ئەگەر بژیم بە ویستی خوا، ئەوە هەموو مسوڵمانێک مافی خۆی یان بەشی خۆی وەردەگرێ.

## بەیعەتدان لە سەر گوێڕایەڵی و ملکەچی

٤١٤٩- «عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ قَالَ: بَايَعْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ فِي الْيُسْرِ وَالْعُسْرِ، وَالْمَنْشَطِ وَالْمَكْرَهِ، وَأَنْ لَا نُنَازِعَ الْأَمْرَ أَهْلَهُ، وَأَنْ نَقُومَ بِالْحَقِّ حَيْثُ كُنَّا لَا نَخَافُ لَوْمَةَ لَائِمٍ»[١].

**واتە: عوبادەی کوڕی صامت ﷺ دەڵێ: بەیعەتماندا بە پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەر گوێڕایەڵی و ملکەچی لە خۆشی و دەوڵەمەندی و تەنگانەو هەژاریداو لە خۆشی و ناخۆشیدا، ناکۆکی دروست نەکەین لەگەڵ ئەو کەسەی شیاوە بە دەسەڵات و بەڕێوەبردن، هەروەها وتەی حەق بڵێین، یان پێی هەڵسین لە هەر شوێنێک بووین، لە لۆمەی لۆمەکار نەترسین.**

٤١٥٠- «عَنْ عُبَادَةَ بْنَ الصَّامِتِ ﷺ قَالَ: بَايَعْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ فِي الْعُسْرِ وَالْيُسْرِ، وَذَكَرَ مِثْلَهُ»[٢].

**واتە: عوبادەی کوڕی صامت ﷺ دەڵێ: بەیعەتماندا بە پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەر گوێڕایەڵی و ملکەچی لە خۆشی و ناخۆشیدا، هەروەکو ئەوەی پێشوەی باس کرد.**

## بابەت: بەیعەتدان لەسەر ئەوەی ململانێ نەکەین لەگەڵ ئەو کەسەی شیاوە بە دەسەڵات و بەڕێوەردن

٤١٥١- «عَنْ عُبَادَةَ ﷺ قَالَ: بَايَعْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ فِي الْيُسْرِ وَالْعُسْرِ، وَالْمَنْشَطِ وَالْمَكْرَهِ، وَأَنْ لَا نُنَازِعَ الْأَمْرَ أَهْلَهُ، وَأَنْ نَقُولَ أَوْ نَقُومَ بِالْحَقِّ حَيْثُمَا كُنَّا، لَا نَخَافُ لَوْمَةَ لَائِمٍ»[٣].

**واتە: عوبادەی کوڕی صامت ﷺ دەڵێ: بەیعەتماندا بە پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەر گوێڕایەڵی و ملکەچی کردن لە تەنگانە و هەژاری و خۆشی و دەوڵەمەندیدا**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٧١٩٩ و ٧٢٠٠، ومسلم: ١٧٠٩ بعد ١٨٤٠، وإبن ماجه: ٢٨٦٦.

(٣) صحيح.




و لە خۆشی و ناخۆشیشدا، ناکۆکی دروست نەکەین لەگەڵ ئەو کەسەی شیاوە بە دەسەڵات و بەڕێوەبردن، هەروەها وتەی حەق بڵێین یان پێی هەستین لە هەر شوێنێک بووین، لە لۆمەی لۆمەکار نەترسین.

## بابەت: بەیعەتدان لەسەر وتنی وتەی حەق

**٤١٥٢-** «عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ قَالَ: بَايَعْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ فِي الْعُسْرِ وَالْيُسْرِ، وَالْمَنْشَطِ وَالْمَكْرَهِ، وَأَنْ لَا نُنَازِعَ الْأَمْرَ أَهْلَهُ، وَعَلَى أَنْ نَقُولَ بِالْحَقِّ حَيْثُ كُنَّا»(١).

واتە: عوبادەی کوڕی صامت ﷺ دەڵێ: بەیعەتماندا بە پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەر گوێڕایەڵی و ملکەچی کردن لە تەنگانە و هەژاری و خۆشی و دەوڵەمەندیداو لە خۆشی و ناخۆشیشدا، ناکۆکی دروست نەکەین لەگەڵ ئەو کەسەی شیاوە بە دەسەڵات و بەڕێوەبردن، هەروەها لەسەر ئەوەی لە هەر شوێنێک بووین حەق و ڕاستی بڵێین.

## بەیعەتدان لەسەر وتەی دادپەروەرانە

**٤١٥٣-** «عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ قَالَ: بَايَعْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ فِي عُسْرِنَا وَيُسْرِنَا، وَمَنْشَطِنَا وَمَكَارِهِنَا، وَعَلَى أَنْ لَا نُنَازِعَ الْأَمْرَ أَهْلَهُ وَعَلَى أَنْ نَقُولَ بِالْعَدْلِ أَيْنَ كُنَّا، لَا نَخَافُ فِي اللَّهِ لَوْمَةَ لَائِمٍ»(٢).

واتە: عوبادەی کوڕی صامت ﷺ دەڵێ: بەیعەتماندا بە پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەر گوێڕایەڵی و ملکەچی کردن لە تەنگانە و هەژاری و خۆشی و دەوڵەمەندیماندا و لە خۆشی و ناخۆشیماندا، وە لەسەر ئەوەی ناکۆکی دروست نەکەین لەگەڵ ئەو کەسەی شیاوە بە دەسەڵات و بەڕێوەبردن، هەروەها لەسەر ئەوەی قسەی دادپەروەرانە بکەین لە هەر شوێنێک بووین، لە لۆمەی لۆمەکاریش نەترسین.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بەیعەتدان لەسەر شوێنکەوتنی کاربەدەستان (ئەگەر سنورەکانی خوا جێبەجێ بکەن)

**٤١٥٤-** «عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ قَالَ: بَايَعْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ فِي عُسْرِنَا وَيُسْرِنَا، وَمَنْشَطِنَا وَمَكْرَهِنَا، وَأَثَرَةٍ عَلَيْنَا، وَأَنْ لَا نُنَازِعَ الْأَمْرَ أَهْلَهُ، وَأَنْ نَقُومَ بِالْحَقِّ حَيْثُمَا كَانَ، لَا نَخَافُ فِي اللَّهِ لَوْمَةَ لَائِمٍ»[١].

واتە: عوبادەی کوڕی صامت ﷺ دەڵێ: بەیعەتماندا بە پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەر گوێڕایەڵی و ملکەچی کردن لە تەنگانە و هەژاری و خۆشی و دەوڵەمەندیمانداو لە خۆشی و ناخۆشیماندا، وە لەسەر ئەوەی ئارام بگرین فەزڵی کەسێک بدرێ بەسەرماندا لە بەخشین و هاوشێوەی، وە لەسەر ئەوەی ناکۆکی دروست نەکەین لەگەڵ ئەو کەسەی شیاوە بە دەسەڵات و بەڕێوەبردن، هەروەها لەسەر ئەوەی بە حەق هەستین لە هەر شوێنێک بووین، لە لۆمەی لۆمەکاریش نەترسین.

**٤١٥٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: عَلَيْكَ بِالطَّاعَةِ فِي مَنْشَطِكَ وَمَكْرَهِكَ، وَعُسْرِكَ وَيُسْرِكَ، وَأَثَرَةٍ عَلَيْكَ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێویستە گویڕایەڵی (بەرپرسانی مسوڵمانان) بکەیت لە خۆشی و ناخۆشیتداو لە تەنگانەو هەژاری و خۆشی و دەوڵەمەندیتدا، وە ئەگەرچی کەسێکی تریان پێش خست بەسەرتدا.

## بەیعەت دان لەسەر ئامۆژگاری بۆ هەموو مسوڵمانێک

**٤١٥٦-** «عَنْ جَرِيرٍ ﷺ قَالَ: بَايَعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَى النُّصْحِ لِكُلِّ مُسْلِمٍ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٨٣٦.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٧ و ٢٧١٤، ومسلم: ٥٦.




واتە: جەریر ﷺ دەڵێ: بەیعەتمدا بە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ئامۆژگاری بۆ هەموو مسوڵمانێک.

**٤١٥٧-** «عَنْ جَرِيرٍ ﷺ قَالَ: بَايَعْتُ النَّبِيَّ ﷺ عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ، وَأَنْ أَنْصَحَ لِكُلِّ مُسْلِمٍ»[١].

واتە: جەریر ﷺ دەڵێ: بەیعەتمدا بە پێغەمبەر ﷺ لەسەر گوێڕایەڵی و ملکەچی، وە ئامۆژگاری هەموو مسوڵمانێک بکەم.

## بەیعەتدان لەسەر ئەوەی هەڵنەیەین لە کاتی جەنگدا

**٤١٥٨-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ يَقُولُ: لَمْ نُبَايِعْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَى الْمَوْتِ، إِنَّمَا بَايَعْنَاهُ عَلَى أَنْ لَا نَفِرَّ»[٢].

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: بەیعەتمان نەدا بە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مردن (لە جەنگ)، بەڵکو بەیعەتماندا لەسەر ئەوەی هەڵنەیەن (ڕانەکەین بۆ دواوەو پشت لە دوژمنان نەکەین).

## بەیعەتدان لەسەر مردن

**٤١٥٩-** «عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي عُبَيْدٍ قَالَ: قُلْتُ لِسَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ ﷺ، عَلَى أَيِّ شَيْءٍ بَايَعْتُمُ النَّبِيَّ ﷺ يَوْمَ الْحُدَيْبِيَةِ؟ قَالَ: عَلَى الْمَوْتِ»[٣].

واتە: یەزیدی کوڕی عوبەید دەڵێ: بە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعم ﷺ وت، لەسەر چی بەیعەتتاندا بە پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی حودەیبیە؟ وتی: لەسەر مردن (چونکە کۆمەڵێک بەیعەتیاندا لەسەر مردن، کۆمەڵێکیش بەیعەتی شتی تریاندا).

## بەیعەتدان لەسەر جیهادکردن

**٤١٦٠-** «عَنْ يَعْلَى بْنَ أُمَيَّةَ ﷺ قَالَ: جِئْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بِأَبِي أُمَيَّةَ يَوْمَ الْفَتْحِ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، بَايِعْ أَبِي عَلَى الْهِجْرَةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أُبَايِعُهُ عَلَى الْجِهَادِ، وَقَدِ انْقَطَعَتِ الْهِجْرَةُ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٩٤٥.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٨٥٦/٦٨، والترمذي: ١٥٩٤.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٩٦٠ و ٤١٦٩ و ٧٢٠٦ و ٧٢٠٨، ومسلم: ١٨٦٠، والترمذي: ١٥٩٢.

(٤) ضعيف.




**واتە: یەعلای کوڕی ئومەییە ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی فەتحی مەککە ئەبو ئومەیەم لەگەڵ خۆم هێنا بوو، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بەیعەت لە باوکم وەربگرە لەسەر هیجرەت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەیعەتی لێوەردەگرم لەسەر جیهادکردن، بێگومان هیجرەت کۆتایی پێهات.**

**٤١٦١-** «عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ وَحَوْلَهُ عِصَابَةٌ مِنْ أَصْحَابِهِ: تُبَايِعُونِي عَلَى أَنْ لَا تُشْرِكُوا بِاللَّهِ شَيْئاً، وَلَا تَسْرِقُوا، وَلَا تَزْنُوا، وَلَا تَقْتُلُوا أَوْلَادَكُمْ، وَلَا تَأْتُوا بِبُهْتَانٍ تَفْتَرُونَهُ بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَأَرْجُلِكُمْ، وَلَا تَعْصُونِي فِي مَعْرُوفٍ، فَمَنْ وَفَّى فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ، وَمَنْ أَصَابَ مِنْكُمْ شَيْئاً فَعُوقِبَ بِهِ، فَهُوَ لَهُ كَفَّارَةٌ، وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئاً، ثُمَّ سَتَرَهُ اللَّهُ فَأَمْرُهُ إِلَى اللَّهِ، إِنْ شَاءَ عَفَا عَنْهُ، وَإِنْ شَاءَ عَاقَبَهُ»(١).

**واتە: عوبادەی کوڕی صامت ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کۆمەڵێ لە هاوەڵانی لەگەڵیدا بوو فەرمووی: بەیعەتم پێ دەدەن لەسەر ئەوەی هاوبەش بۆ خوا پەیدا نەکەن و دزی و زینا نەکەن، وە منداڵەکانیشتان نەکوژن، وە بوختان هەڵنەبەستن بە نێوانی دەست و قاچەکانتان (واتە: بوختانی ناموس بە یەکتری مەکەن)، سەرپێچیشم نەکەن لە چاکەدا، هەرکەس لە ئێوە پەیمانی خۆی بە چاکی بەجێهێنا پاداشتی لای خوایە،، هەرکەسیش لە ئێوە کارێ لەو جۆرەی کردو بەهۆیەوە سزا درا، ئەوە دەبێتە کەفارەت بۆی، هەرکەسیش تووشی شتێک لەوانە بوو پاشان خوا بۆی پۆشی ئەوە کاروباری لای خوایە، ئەگەر ویستی لێی خۆش دەبێ، وە ئەگەر ویستی سزای دەدا.**

**٤١٦٢-** «عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَلَا تُبَايِعُونِي عَلَى مَا بَايَعَ عَلَيْهِ النِّسَاءُ، أَنْ لَا تُشْرِكُوا بِاللَّهِ شَيْئاً، وَلَا تَسْرِقُوا، وَلَا تَزْنُوا، وَلَا تَقْتُلُوا أَوْلَادَكُمْ، وَلَا تَأْتُوا بِبُهْتَانٍ تَفْتَرُونَهُ بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَأَرْجُلِكُمْ، وَلَا تَعْصُونِي فِي مَعْرُوفٍ؟ قُلْنَا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَبَايَعْنَاهُ عَلَى ذَلِكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: فَمَنْ أَصَابَ بَعْدَ ذَلِكَ شَيْئاً فَنَالَتْهُ عُقُوبَةٌ فَهُوَ كَفَّارَةٌ، وَمَنْ لَمْ تَنَلْهُ عُقُوبَةٌ فَأَمْرُهُ إِلَى اللَّهِ، إِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُ وَإِنْ شَاءَ عَاقَبَهُ»(٢).

**واتە: عوبادەی کوڕی صامت ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا بەیعەتم نادەنێ لەسەر ئەوەی ئافرەتان بەیعەتیان پێداوە، هاوبەش بۆ خوا پەیدا**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح لغيره.

نەکەن و دزی و زینا نەکەن، وە منداڵەکانیشتان نەکوژن، وە بوختان هەڵنەبەستن بە نێوانی دەست و قاچەکانتان (واتە: بوختانی ناموس بە یەکتری مەکەن)، سەرپێچیشم نەکەن لە چاکەدا؟ وتمان بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بەیعەتمان پێدا لەسەر ئەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەرکەس لە دوای ئەوە تووشی شتێ لەمانە بوو سزای چەشت لەسەری ئەوە کەفارەتە بۆی، هەرکەسیش سزا نەدرا لەسەری ئەوە کاری لای خوایە، ئەگەر ویستی لێی خۆش دەبێ، وە ئەگەر ویستی سزای دەدا.

## بەیعەتدان لەسەر هیجرەت و کۆچ کردن

**٤١٦٣-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: إِنِّي جِئْتُ أُبَايِعُكَ عَلَى الْهِجْرَةِ، وَلَقَدْ تَرَكْتُ أَبَوَيَّ يَبْكِيَانِ قَالَ: ارْجِعْ إِلَيْهِمَا فَأَضْحِكْهُمَا كَمَا أَبْكَيْتَهُمَا»(١).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: من هاتووم بەیعەتت پێ بدەم لەسەر هیجرەت کردن، دایک و باوکم بەجێهێشت دەگریان فەرمووی: بگەڕێرەوە بۆ لایان و بیانخە پێکەنینەوە وەکو چۆن خستیانتە گریانەوە.

## گرنگی و شکۆو پێگەی هیجرەت

**٤١٦٤-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ أَعْرَابِيّاً سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْهِجْرَةِ، فَقَالَ: وَيْحَكَ إِنَّ شَأْنَ الْهِجْرَةِ شَدِيدٌ، فَهَلْ لَكَ مِنْ إِبِلٍ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: فَهَلْ تُؤَدِّي صَدَقَتَهَا؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: فَاعْمَلْ مِنْ وَرَاءِ الْبِحَارِ، فَإِنَّ اللَّهَ ﷻ لَنْ يَتِرَكَ مِنْ عَمَلِكَ شَيْئاً»(٢).

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە: دەشتەکیەک پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی هیجرەت کردنەوە، فەرمووی: هاوار بۆ تۆ هیجرەت کردن سەخت و گرانە، ئایا وشترت هەیە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: زەکاتیان دەدەی؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: زەکاتیان بدە هەرچەندە لە مەدینەوە دوور بیت، چونکە خوا هیچ لە کردەوەکانت کەم ناکات.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٥٢٨، وإبن ماجه: ٢٧٨٢.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٥٢ و ٢٦٣٣ و ٣٩٢٣، ومسلم: ١٨٦٥، وأبو داود: ٢٤٧٧.

## هیجرەت کردنی دەشتەکی یان دەشتنشین

**٤١٦٥-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُّ الْهِجْرَةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: أَنْ تَهْجُرَ مَا كَرِهَ رَبُّكَ ﷻ، وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْهِجْرَةُ هِجْرَتَانِ: هِجْرَةُ الْحَاضِرِ، وَهِجْرَةُ الْبَادِي، فَأَمَّا الْبَادِي، فَيُجِيبُ إِذَا دُعِيَ وَيُطِيعُ إِذَا أُمِرَ، وَأَمَّا الْحَاضِرُ، فَهُوَ أَعْظَمُهُمَا بَلِيَّةً، وَأَعْظَمُهُمَا أَجْراً»[١].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، چ هیجرەتێک چاکترینە؟ فەرمووی: هیجرەت لەو تاوانە بکەی کە پەروەردگارت ڕقی لێیەتی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هیجرەت دوو هیجرەتە: هیجرەتی خەڵکی شار، هیجرەتی خەڵکی دەشت، بەڵام هیجرەتی خەڵکی دەشت، ئەگەر بانگ کرا وەڵام دەداتەوە (پێویست ناکات شوێنی خۆی جێبهێڵێ)، ئەگەر فەرمانیشی پێکرا جێبەجێی دەکات، بەڵام هیجرەتی خەڵکی شار ئەوە بەڵاکەی گەورەترەو پاداشتەکەی زیاترە.**

## ڕاڤە کردنی هیجرەت

**٤١٦٦-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَأَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ كَانُوا مِنَ الْمُهَاجِرِينَ لِأَنَّهُمْ هَجَرُوا الْمُشْرِكِينَ، وَكَانَ مِنَ الْأَنْصَارِ مُهَاجِرُونَ لِأَنَّ الْمَدِينَةَ كَانَتْ دَارَ شِرْكٍ، فَجَاءُوا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَيْلَةَ الْعَقَبَةِ»[٢].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺو ئەبو بەکرو عومەر لە کۆچکەران بوون، چونکە هاوبەشدانەرانیان بەجێهێشتبوو، لە نێو ئەنصارەکانیشدا هەبوو هیجرەتیان کردبوو، چونکە مەدینە پێشتر جێگای هاوبەشدانان بوو، هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەوی عەقەبەدا.**

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٦٩٨.

(٢) صحيح الإسناد.



## هاندان لەسەر هیجرەت کردن

**٤١٦٧-** «عَنْ كَثِيرِ بْنِ مُرَّةَ، أَنَّ أَبَا فَاطِمَةَ حَدَّثَهُ، أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، حَدِّثْنِي بِعَمَلٍ أَسْتَقِيمُ عَلَيْهِ وَأَعْمَلُهُ، قَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: عَلَيْكَ بِالْهِجْرَةِ، فَإِنَّهُ لَا مِثْلَ لَهَا»(١).

**واتە:** کەثیری کوڕی مورە دەگێڕێتەوە، باوکی فاطیمە (خوا لێیان ڕازی بێ) بۆی باس کرد، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، باسی شتێکم بۆ بکە بەردەوام بم لەسەری و کاری پێبکەم، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: لەسەرتە هیجرەت بکەی، هیچ شتێک وەکو ئەو نیە.

## باسی جیاوازی لە نەمانی هیجرەت

**٤١٦٨-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أُمَيَّةَ، أَنَّ يَعْلَى ﷺ قَالَ: جِئْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِأَبِي يَوْمَ الْفَتْحِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، بَايِعْ أَبِي عَلَى الْهِجْرَةِ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أُبَايِعُهُ عَلَى الْجِهَادِ، وَقَدِ انْقَطَعَتِ الْهِجْرَةُ»(٢).

**واتە:** عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئومەیە دەگێڕێتەوە: یەعلا ﷺ وتی: هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ باوکم لەگەڵ خۆم هێنا، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەیعەت لە باوکم وەربگرە لەسەر هیجرەت کردن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەیعەتی لێ وەردەگرم لەسەر جیهاد کردن، بێگومان هیجرەت بڕایەوە.

**٤١٦٩-** «عَنْ صَفْوَانَ بْنِ أُمَيَّةَ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهُمْ يَقُولُونَ: إِنَّ الْجَنَّةَ لَا يَدْخُلُهَا إِلَّا مُهَاجِرٌ، قَالَ: لَا هِجْرَةَ بَعْدَ فَتْحِ مَكَّةَ، وَلَكِنْ جِهَادٌ وَنِيَّةٌ، فَإِذَا اسْتُنْفِرْتُمْ فَانْفِرُوا»(٣).

**واتە:** صەفوانی کوڕی ئومەیە ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوان دەڵێن: کەس ناچێتە بەهەشتەوە جگە لەو کەسەی کە هیجرەتی کردوە، فەرمووی: هیجرەت نیە لە دوای ئازادکرنی مەککە، بەڵام جیهادو نیەت هەیە، ئەگەر داوای دەرچونتان لێکرا بۆ جیهادکردن دەربچن.

---

(١) حسن صحيح. أخرجه إبن ماجه: ١٤٢٢.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح.




**٤١٧٠-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ الْفَتْحِ: لَا هِجْرَةَ، وَلَكِنْ جِهَادٌ وَنِيَّةٌ، فَإِذَا اسْتُنْفِرْتُمْ فَانْفِرُوا»[١].

**واته: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی ئازادکردنی مەککە فەرمووی: هیجرەت نیە، بەڵام جیهادو نیەت هەیە، ئەگەر داوای دەرچوونتان لێکرا بۆ جیهاد کردن دەربچن.**

**٤١٧١-** «عَنْ نُعَيْمِ بْنِ دَجَاجَةَ قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ يَقُولُ: لَا هِجْرَةَ بَعْدَ وَفَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[٢].

**واته: نەعیمی کوڕی دەجاجە دەڵێ: گوێم لە عومەری کوڕی خەطاب ﷺ بوو دەیوت: لە دوای مردنی پێغەمبەری خوا ﷺ هیجرەت نیە.**

**٤١٧٢-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ وَقْدَانَ السَّعْدِيِّ ﷺ قَالَ: وَفَدْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي وَفْدٍ كُلُّنَا يَطْلُبُ حَاجَةً، وَكُنْتُ آخِرَهُمْ دُخُولاً عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي تَرَكْتُ مَنْ خَلْفِي وَهُمْ يَزْعُمُونَ أَنَّ الْهِجْرَةَ قَدِ انْقَطَعَتْ، قَالَ: لَا تَنْقَطِعُ الْهِجْرَةُ مَا قُوتِلَ الْكُفَّارُ» [٣].

**واته: عەبدوڵڵای کوڕی واقیدی سەعدی ﷺ دەڵێ: بە نوێنەر لەگەڵ کۆمەڵێدا ڕۆیشتین بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ هەریەکەو داواکاری خۆی هەبوو، منیش کۆتا کەسیان بووم چووم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من خەڵکانێکم بەجێهێشتوە لە دوای خۆمەوە پێیان وایە هیجرەت کۆتایی پێهاتوەو نەماوە، فەرمووی: تا جەنگ لەگەڵ بێبڕوایان بکرێ هیجرەت کۆتایی پێنایەت.**

**٤١٧٣-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ السَّعْدِيِّ ﷺ قَالَ: وَفَدْنَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَدَخَلَ أَصْحَابِي فَقَضَى حَاجَتَهُمْ، وَكُنْتُ آخِرَهُمْ دُخُولاً، فَقَالَ: حَاجَتُكَ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَتَى تَنْقَطِعُ الْهِجْرَةُ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تَنْقَطِعُ الْهِجْرَةُ مَا قُوتِلَ الْكُفَّارُ»[٤].

**واته: عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی ﷺ دەڵێ: بە نوێنەرایەتی ڕۆیشتین بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵەکانم چوونە ژورەوە وەڵامی داواکاریەکانی دانەوە، منیش**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




کۆتا کەس بووم چوومە ژوورەوە، فەرمووی: داواکاریت چیە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، کەی هیجرەت کۆتایی پێ دێت؟ فەرمووی: تا جەنگ لەگەڵ بێبڕوایان بکرێ هیجرەت کۆتایی پێنایەت.

## بەیعەتدانی (مسوڵمان) لەسەر ئەوەی پێی خۆشەو لەسەر ئەوەی پێی ناخۆشە

**٤١٧٤-** «عَنْ جَرِيرٍ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَقُلْتُ لَهُ: أُبَايِعُكَ عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ فِيمَا أَحْبَبْتُ وَفِيمَا كَرِهْتُ، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: أَوَ تَسْتَطِيعُ ذَلِكَ يَا جَرِيرُ، أَوَ تُطِيقُ ذَلِكَ؟ قَالَ: قُلْ: فِيمَا اسْتَطَعْتُ، فَبَايَعَنِي، وَالنُّصْحِ لِكُلِّ مُسْلِمٍ»(١).

واتە: جەریر ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ پێم وت: بەیعەتت پێدەدەم لەسەر گوێڕایەڵی و ملکەچی لەوەی پێم خۆشە و لەوەشی پێم ناخۆشە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایە دەتوانی ئەوە بکەی ئەی جەریر؟ فەرمووی: بڵێ: لەوەی لە توانامدایە، پاشان بەیعەتی لێوەرگرتم، وە ئامۆژگاریش بۆ هەموو مسوڵمانێک.

## بەیعەتدان لەسەر جیابوونەوەی هاوبەشدانەر

**٤١٧٥-** «عَنْ جَرِيرٍ ﷺ قَالَ: بَايَعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَى إِقَامِ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَالنُّصْحِ لِكُلِّ مُسْلِمٍ، وَعَلَى فِرَاقِ الْمُشْرِكِ»(٢).

واتە: جەریر ﷺ دەڵێ: بەیعەتمدا بە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر بەجێهێنانی نوێژ و پێدانی زەکات و ئامۆژگاری بۆ هەموو مسوڵمانێک، وە لەسەر جیابوونەوەی هاوبەشدانەر.

**٤١٧٦-** «عَنْ جَرِيرٍ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَذَكَرَ نَحْوَهُ»(٣).

واتە: جەریر ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ هەروەکو فەرموودەکەی پێشوی باس کرد.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٢٠٤، ومسلم: ٥٦/٩٩.

(٣) صحيح.




٤١٧٧- «عَنْ جَرِيرٍ ﵁ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَهُوَ يُبَايِعُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، ابْسُطْ يَدَكَ حَتَّى أُبَايِعَكَ، وَاشْتَرِطْ عَلَيَّ، فَأَنْتَ أَعْلَمُ، قَالَ: أُبَايِعُكَ عَلَى أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ، وَتُقِيمَ الصَّلَاةَ، وَتُؤْتِيَ الزَّكَاةَ، وَتُنَاصِحَ الْمُسْلِمِينَ، وَتُفَارِقَ الْمُشْرِكِينَ»[١].

**واته: جەرير ﵁ وتى: هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ بەيعەتى دەدا، وتم: ئەى پێغەمبەرى خوا ﷺ، دەستت درێژ بكە تا بەيعەتت پێ بدەم، مەرجيشم لەسەر دانێ تۆ دەزانى، فەرمووى: بەيعەتت پێ ئەدەم لەسەر ئەوەى خوا بپەرستى و نوێژ بكەيت و زەكات بدەيت و ئامۆژگارى مسوڵمانان بكەيت و لە هاوبەشدانەران جيا ببيتەوە.**

٤١٧٨- «عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﵁ قَالَ: بَايَعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي رَهْطٍ، فَقَالَ: أُبَايِعُكُمْ عَلَى أَنْ لَا تُشْرِكُوا بِاللَّهِ شَيْئاً، وَلَا تَسْرِقُوا، وَلَا تَزْنُوا، وَلَا تَقْتُلُوا أَوْلَادَكُمْ، وَلَا تَأْتُوا بِبُهْتَانٍ تَفْتَرُونَهُ بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَأَرْجُلِكُمْ، وَلَا تَعْصُونِي فِي مَعْرُوفٍ، فَمَنْ وَفَّى مِنْكُمْ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ، وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئاً فَعُوقِبَ فِيهِ فَهُوَ طَهُورُهُ، وَمَنْ سَتَرَهُ اللَّهُ، فَذَاكَ إِلَى اللَّهِ إِنْ شَاءَ عَذَّبَهُ، وَإِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُ»[٢].

**واته: عوبادەى كوڕى صامت ﵁ دەڵێ: بەيعەتمدا بە پێغەمبەرى خوا ﷺ لەگەڵ كۆمەڵێكدا، فەرمووى: بەيعەتم پێ بدەن لەسەر ئەوەى هاوبەش بۆ خوا پەيدا نەكەن و دزى و زينا نەكەن، وە منداڵەكانيشتان نەكوژن، وە بوختان هەڵنەبەستن بە نێوانى دەست و قاچەكانتان (واتە: بوختانى ناموس بە يەكترى مەكەن)، سەرپێچيشم نەكەن لە چاكەدا، هەركەس لە ئێوە پەيمانى خۆى بە چاكى بەجێهێنا پاداشتى لاى خوايە، هەركەس لە ئێوە كارێكى لەو جۆرەى كردو (توشى يەكێك لەو تاوانانە بوو) بەهۆيەوە سزا درا، ئەوە دەبێتە كەفارەت بۆى، هەركەسيش خوا بۆى بپۆشێ ئەوە دەمێنێتەوە لاى خوا، ئەگەر ويستى سزاى دەدا، وە ئەگەر ويستى لێى خۆش دەبێ.**

## بەيعەتدانى ئافرەتان

٤١٧٩- «عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: لَمَّا أَرَدْتُ أَنْ أُبَايِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ امْرَأَةً أَسْعَدَتْنِي فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَأَذْهَبُ فَأُسْعِدُهَا ثُمَّ أَجِيئُكَ فَأُبَايِعُكَ؟ قَالَ: اذْهَبِي فَأَسْعِدِيهَا، قَالَتْ: فَذَهَبْتُ فَسَاعَدْتُهَا، ثُمَّ جِئْتُ فَبَايَعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح الإسناد.




واته: ئوممو عەطیه (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: کاتێ ویستم بەیعەت بدەم بە پێغەمبەری خوا ﷺ (یەکێک لە شتەکان وازهێنان بێت لە شیوەن کردن)، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئافرەتێک لە سەردەمی نەفامیدا شیوەنی بۆ کردووم (قەرزایم)، دەچم شیوەنی بۆ دەکەم پاشان دەگەڕێمەوە بەیعەتت پێ ئەدەم (بەیەکجاری واز لە شیوەن دەهێنم)؟ فەرمووی: بڕۆ شیونی بۆ بکە، وتی: ڕۆیشتم شیوەنم بۆی کرد، پاشان هاتمەوە بەیعەتمدا بە پێغەمبەری خوا ﷺ.

**٤١٨٠-** «عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا،قَالَتْ: أَخَذَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْبَيْعَةَ عَلَى أَنْ لَا نَنُوحَ»[١].

واته: ئوممو عەطیه (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەیعەتی لێوەرگرتین لەسەر ئەوەی هاوارو شیوەن نەکەین بەسەر مردودا.

**٤١٨١-** «عَنْ أُمَيْمَةَ بِنْتِ رُقَيْقَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّهَا قَالَتْ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فِي نِسْوَةٍ مِنَ الْأَنْصَارِ نُبَايِعُهُ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، نُبَايِعُكَ عَلَى أَنْ لَا نُشْرِكَ بِاللَّهِ شَيْئاً، وَلَا نَسْرِقَ، وَلَا نَزْنِيَ، وَلَا نَأْتِيَ بِبُهْتَانٍ نَفْتَرِيهِ بَيْنَ أَيْدِينَا وَأَرْجُلِنَا، وَلَا نَعْصِيكَ فِي مَعْرُوفٍ، قَالَ: فِيمَا اسْتَطَعْتُنَّ، وَأَطَقْتُنَّ. قَالَتْ: قُلْنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَرْحَمُ بِنَا، هَلُمَّ نُبَايِعْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنِّي لَا أُصَافِحُ النِّسَاءَ، إِنَّمَا قَوْلِي لِمِائَةِ امْرَأَةٍ كَقَوْلِي لِامْرَأَةٍ وَاحِدَةٍ، أَوْ مِثْلُ قَوْلِي لِامْرَأَةٍ وَاحِدَةٍ»[٢].

واته: ئومەیەی کوڕی ڕوقەیقە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: لەگەڵ کۆمەڵە ئافرەتێکی ئەنصاریدا هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بەیعەتی پێ بدەین، وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەیعەتت پێ دەدەین لەسەر ئەوەی هاوبەش بۆ خوا دانەنێین و دزی نەکەین و زینا نەکەین و بوختانی ناموس بە یەکتری نەکەین، لە کاری چاکدا سەرپێچیت نەکەین، فەرمووی: لەوەی لە تواناتاندایە. وتی: وتمان: خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بە بەزەیی ترن بۆمان، دەستت بێنە با یەک بە یەک بەیعەتت پێ بدەین ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: من دەست ناخەمە ناو دەستی ئافرەتان، بەڵکو قسەم بۆ سەد ئافرەت وەکو قسەکردنم وایە بۆ یەک ئافرەت.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٠٦، ومسلم: ٩٣٦، وأبو داود: ١١٣٩.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٥٩٧، وإبن ماجه: ٢٨٧٤.




## بەیعەتدانی کەسێک کە نەخۆشی (گوێزراوەی) هەبێت

**٤١٨٢-** «عَنْ يَعْلَى بْنِ عَطَاءٍ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ آلِ الشَّرِيدِ يُقَالُ لَهُ عَمْرٌو، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: كَانَ فِي وَفْدِ ثَقِيفٍ رَجُلٌ مَجْذُومٌ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ ﷺ: ارْجِعْ فَقَدْ بَايَعْتُكَ»[1].

واتە: یەعلای کوڕی عەطاء دەگێڕێتەوە: لە پیاوێک لە خانەوادەی شەرید پێی دەوترا عەمر، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: لە ناو نوێنەری ثەقیفدا پیاوێکی گەڕ هەبوو، پێغەمبەر ﷺ ناردی بە دوایدا (تا پێی بڵێن) بگەڕێرەوە بەیعەتم لێ وەرگرتی.

## بەیعەتدانی منداڵ

**٤١٨٣-** «عَنِ الْهِرْمَاسِ بْنِ زِيَادٍ ﷺ قَالَ: مَدَدْتُ يَدِي إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَأَنَا غُلَامٌ لِيُبَايِعَنِي: فَلَمْ يُبَايِعْنِي»[2].

واتە: هیرماسی کوڕی زیاد ﷺ دەڵێ: من منداڵ بووم دەستم درێژکرد بۆ پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی بەیعەتی لێوەربگرم، بەیعەتی لێوەرنەگرتم.

## بەیعەتدانی کۆیلەکان

**٤١٨٤-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: جَاءَ عَبْدٌ فَبَايَعَ النَّبِيَّ ﷺ عَلَى الْهِجْرَةِ، وَلَا يَشْعُرُ النَّبِيُّ ﷺ أَنَّهُ عَبْدٌ، فَجَاءَ سَيِّدُهُ يُرِيدُهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: بِعْنِيهِ فَاشْتَرَاهُ بِعَبْدَيْنِ أَسْوَدَيْنِ، ثُمَّ لَمْ يُبَايِعْ أَحَداً حَتَّى يَسْأَلَهُ: أَعَبْدٌ هُوَ»[3].

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: کۆیلەیەک هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بەیعەتی پێدا لەسەر هیجرەت، پێغەمبەر ﷺ نەیزانی ئەوە کۆیلەیە، گەورەکەی هات دەیویستەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: پێم بفرۆشە، بە دوو کۆیلەی ڕەش کڕی، پاشان بەیعەتی وەرنەدەگرت لە هیچ کەسێک تا پرسیاری دەکرد: ئایا ئەوە کۆیلەیە، یان نا.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٢٣١، وإبن ماجه: ٣٥٤٤.

(٢) حسن الإسناد.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٠٢، وأبو داود: ٣٣٥٨، والترمذي: ١٢٣٩ و ١٥٩٦، وإبن ماجه: ٢٨٦٩.




## پەشیمان بوونەوە لە بەیعەت

**٤١٨٥-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ أَعْرَابِيًّا بَايَعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَى الْإِسْلَامِ، فَأَصَابَ الْأَعْرَابِيَّ وَعْكٌ بِالْمَدِينَةِ، فَجَاءَ الْأَعْرَابِيُّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَقِلْنِي بَيْعَتِي، فَأَبَى، ثُمَّ جَاءَهُ فَقَالَ: أَقِلْنِي بَيْعَتِي، فَأَبَى، فَخَرَجَ الْأَعْرَابِيُّ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّمَا الْمَدِينَةُ كَالْكِيرِ تَنْفِي خَبَثَهَا وَتَنْصَعُ طِيبَهَا»[1].

**واتە: جابری کوڕی عەبدوڵلا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: دەشتەکیەک بەیعەتیدا بە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ئیسلام، کابرای دەشتەکی لە مەدینە تووشی تاو نەخۆشی بوو، هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: بەیعەتەکەم لێ داڕنە (پێی وابوو ئەوەی تووشی بووە بە هۆی شومی بەیعەتەکەوەیە) پێغەمبەر ﷺ ڕازی نەبوو، دەشتەکیەکە دەرچوو لە مەدینە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: مەدینە (بۆ کەسە خراپەکان) وەکو ئامرازی ئاگر خۆشکردنی ئاسنگەرە، پیسی ئاسنەکە ناهێڵێت و پاکیەکەی جیادەکاتەوە.**

## ئەو کەسەی هەڵدەگەڕێتەوەو دەبێتەوە دەشتەکیەکی (بێ دین) دوای ئەوەی کە هیجرەتی کردوە

**٤١٨٦-** «عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ ﷺ، أَنَّهُ دَخَلَ عَلَى الْحَجَّاجِ فَقَالَ: يَا ابْنَ الْأَكْوَعِ، ارْتَدَدْتَ عَلَى عَقِبَيْكَ، «وَذَكَرَ كَلِمَةً مَعْنَاهَا» وَبَدَوْتَ، قَالَ: لَا، وَلَكِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَذِنَ لِي فِي الْبُدُوِّ»[2].

**واتە: سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ﷺ، چوو بۆ لای حەجاج، وتی: ئەی کوڕی ئەکوەع هەڵگەڕاویتەوە لە هیجرەت کردن لە ئیسلام «وە باسی وشەیەکی کرد ماناکەی»، بووی بە دەشت نشین، وتی: نەخێر، بەڵکو پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی پێدام لە دەشت بژیم.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٢٠٩ و ٧٢١١ و ٧٣٢٢، ومسلم: ١٣٨٣، والترمذي: ٣٩٢٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٠٨٧، ومسلم: ١٨٦٢.




## بەیعەتدان بەوەی لە توانای مرۆڤ دا هەیە

**٤١٨٧-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كُنَّا نُبَايِعُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ ثُمَّ يَقُولُ: فِيمَا اسْتَطَعْتَ وَقَالَ عَلِيٌّ: فِيمَا اسْتَطَعْتُمْ»(١).

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ئێمە بەیعەتمان دەدا بە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر گوێڕایەڵی و ملکەچی، پاشان دەیفەرموو: لەوەی لە تواناتدایە، عەلی (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودە) وتی: لەوەی لە تواناتان دا هەیە.**

**٤١٨٨-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كُنَّا حِينَ نُبَايِعُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ يَقُولُ لَنَا: فِيمَا اسْتَطَعْتُمْ»(٢).

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ئێمە کاتێ بەیعەتمان دەدا بە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر گوێڕایەڵی و ملکەچی، پێی دەوتین: لەوەی لە تواناتان دا هەیە.**

**٤١٨٩-** «عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: بَايَعْتُ النَّبِيَّ ﷺ عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ، فَلَقَّنَنِي فِيمَا اسْتَطَعْتَ، وَالنُّصْحِ لِكُلِّ مُسْلِمٍ»(٣).

**واتە: جەریری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: بەیعەتمدا بە پێغەمبەر ﷺ لەسەر گوێڕایەڵی و ملکەچی، فێری کردم بە گوێرەی لە توانات دا هەیە، وە ئامۆژگاری دڵسۆز بوون بۆ هەموو مسوڵمانێکیش.**

**٤١٩٠-** «عَنْ أُمَيْمَةَ بِنْتِ رُقَيْقَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: بَايَعْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي نِسْوَةٍ، فَقَالَ لَنَا: فِيمَا اسْتَطَعْتُنَّ، وَأَطَقْتُنَّ»(٤).

**واتە: ئومەیمەی کچی ڕوقەیقە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: بەیعەتماندا بە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ کۆمەڵێک لە ئافرەتان، پێمانی فەرموو: لەوەی لە تواناتان دا هەیە.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٢٠٢، ومسلم: ١٨٦٧، وأبو داود: ٢٩٤٠، والترمذي: ١٥٩٣.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




## باسی ئەوەی پێویستە لەسەر ئەو کەسەی بەیعەتی داوە
## بە ئیمام و دەستی خستۆتە نێو دەستی و دڵی پێیداوە

**٤١٩١-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ رَبِّ الْكَعْبَةِ قَالَ: انْتَهَيْتُ إِلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو وَهُوَ جَالِسٌ فِي ظِلِّ الْكَعْبَةِ، وَالنَّاسُ عَلَيْهِ مُجْتَمِعُونَ، قَالَ: فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: بَيْنَا نَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي سَفَرٍ إِذْ نَزَلْنَا مَنْزِلاً، فَمِنَّا مَنْ يَضْرِبُ خِبَاءَهُ، وَمِنَّا مَنْ يَنْتَضِلُ، وَمِنَّا مَنْ هُوَ فِي جَشْرَتِهِ، إِذْ نَادَى مُنَادِي النَّبِيِّ ﷺ: الصَّلَاةُ جَامِعَةٌ، فَاجْتَمَعْنَا، فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ فَخَطَبَنَا، فَقَالَ: إِنَّهُ لَمْ يَكُنْ نَبِيٌّ قَبْلِي إِلَّا كَانَ حَقّاً عَلَيْهِ أَنْ يَدُلَّ أُمَّتَهُ عَلَى مَا يَعْلَمُهُ خَيْراً لَهُمْ، وَيُنْذِرَهُمْ مَا يَعْلَمُهُ شَرّاً لَهُمْ، وَإِنَّ أُمَّتَكُمْ هَذِهِ جُعِلَتْ عَافِيَتُهَا فِي أَوَّلِهَا، وَإِنَّ آخِرَهَا سَيُصِيبُهُمْ بَلَاءٌ، وَأُمُورٌ يُنْكِرُونَهَا تَجِيءُ فِتَنٌ فَيُدَقِّقُ بَعْضُهَا لِبَعْضٍ، فَتَجِيءُ الْفِتْنَةُ، فَيَقُولُ الْمُؤْمِنُ: هَذِهِ مُهْلِكَتِي، ثُمَّ تَنْكَشِفُ، ثُمَّ تَجِيءُ فَيَقُولُ: هَذِهِ مُهْلِكَتِي، ثُمَّ تَنْكَشِفُ فَمَنْ أَحَبَّ مِنْكُمْ أَنْ يُزَحْزَحَ عَنِ النَّارِ، وَيُدْخَلَ الْجَنَّةَ، فَلْتُدْرِكْهُ مَوْتَتُهُ وَهُوَ مُؤْمِنٌ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، وَلْيَأْتِ إِلَى النَّاسِ مَا يُحِبُّ أَنْ يُؤْتَى إِلَيْهِ، وَمَنْ بَايَعَ إِمَاماً، فَأَعْطَاهُ صَفْقَةَ يَدِهِ وَثَمَرَةَ قَلْبِهِ، فَلْيُطِعْهُ مَا اسْتَطَاعَ، فَإِنْ جَاءَ أَحَدٌ يُنَازِعُهُ فَاضْرِبُوا رَقَبَةَ الْآخَرِ، فَدَنَوْتُ مِنْهُ فَقُلْتُ: سَمِعْتَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ هَذَا؟ قَالَ: نَعَمْ وَذَكَرَ الْحَدِيثَ»[1].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی (عَبْدِ رَبِّ الْكَعْبَةِ) دەڵێ: ڕۆیشتم بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ لە سێبەری کەعبەدا دانیشتبوو، خەڵکیش دەوریان دابوو، وتی: گوێ لێ بوو دەیووت: لە کاتێکدا ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین لە گەشتێکدا دابەزینە جێگایەک، تیاماندا بوو دەوارەکەی هەڵدەدا، تیاشماندا بوو پێشبڕکێی تیرهاوێشتنی دەکرد، وە تیاماندا بوو وڵاخەکەی دەلەوەڕاند، لە ناکاو بانگبێژی پێغەمبەر ﷺ بانگی کرد: نوێژ کۆکەرەوەیە، پاشان کۆبووینەوە، پێغەمبەر ﷺ هەڵسا وتارێکی بۆ داین و فەرمووی: هەر پێغەمبەرێک پێش من هاتبێ حەق بووە لەسەری کە ڕێنمایی ئوممەتەکەی بکات بۆ ئەو شتەی خێری هەیە بۆیان، وە بیان ترسێنێ لەو شتەی زیانی هەیە بۆیان، وە بەڕاستی سەلامەتی ئوممەتەکەی ئێوە لە فیتنەو بەڵا لە سەرەتاوە بووە، وە کۆتاییەکەیشی توشی فیتنەو بەڵا دەبێ، وە کاروبارێک نکوڵی لێ دەکەن فیتنەو بەڵایەک لە دوای یەکتر دێت، بڕوادار دەڵێ: ئەمە لەناوم دەبات، پاشان دەڕواو ئاشکرا دەبێ، پاشان جارێکی تر فیتنە دێتەوە، دەڵێ: ئەمە

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٦ و ١٨٤٤/٤٧، وأبو داود: ٤٢٤٨، وإبن ماجه: ٣٩٥٦.




لەناوم دەبات، پاشان دەڕوا، جا هەرکەس لە ئێوە ئەگەر پێی خۆشە لە ئاگر ڕزگاری ببێت و بچێتە بەهەشتەوە، با کاتێ کە دەمرێ بڕوای بەخواو بە ڕۆژی دوایی و هەبێت، با کاری خەڵکی ڕایی بکات وەکو چۆن پێی خۆشە کاری خۆی ڕایی بکرێ، هەرکەسیش دەستی بخاتە ناو دەستی پێشەوایەک و لەناخ دڵەوە بەیعەتی پێ بدات، ئەوە با بەگوێرەی توانا گوێڕایەڵی بکات، جا ئەگەر کەسێک هاتوو دژایەتی کرد ئەوە بدەن لە گەردنی، لێی نزیک بوومەوەو وتم: گوێت لە پێغەمبەری خوا ﷺ وای دەفەرموو؟ وتی: بەڵی، ئینجا فەرموودەکەی باسکرد.

## هەڵنان لەسەر گوێڕایەڵی کردنی پێشەوا (ئیمام)

**٤١٩٢**- «عَنْ يَحْيَى بْنِ حُصَيْنٍ قَالَ: سَمِعْتُ جَدَّتِي تَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ: وَلَوِ اسْتُعْمِلَ عَلَيْكُمْ عَبْدٌ حَبَشِيٌّ يَقُودُكُمْ بِكِتَابِ اللَّهِ فَاسْمَعُوا لَهُ وَأَطِيعُوا»[١].

واتە: یەحیای کوڕی حوصەین دەڵێ: گوێم لە داپیرەم بوو دەیووت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لە حەجیماڵئاواییدا دەیفەرموو: ئەگەر چی بەندەیەکی حەبەشیش کرا بە کاربەدەستتان، بە کتێبی خوا کاری دەکرد لەگەڵتان ئەوە گوێڕایەڵی بکەن و ملکەچی ببن.

## هاندان بۆ گوێڕایەڵی کردنی پێشەوا (ئیمام)

**٤١٩٣**- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ أَطَاعَنِي فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ، وَمَنْ عَصَانِي فَقَدْ عَصَى اللَّهَ، وَمَنْ أَطَاعَ أَمِيرِي فَقَدْ أَطَاعَنِي، وَمَنْ عَصَى أَمِيرِي فَقَدْ عَصَانِي»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس گوێڕایەڵیم بکات ئەوە گوێڕایەڵی خوای کردوە، هەرکەسیش سەرپێچیم بکات ئەوە سەرپێچی خوای کردوە، هەرکەسیش گوێڕایەڵی ئەمیرەکەم بکات ئەوە گوێڕایەڵی منی کردوە، هەرکەسیش سەرپێچی ئەمیرەکەم بکات ئەوە سەرپێچی منی کردوە.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٣١١ و ١٢٩٨/٣١٢ و ١٨٣٨، وإبن ماجه: ٢٨٦١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٩٥٧ و ٧١٣٧، ومسلم: ٣٢ و ٣٣ و ١٨٣٥/٣٤، وإبن ماجه: ٣ و ٢٨٥٩.

## فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ ﴿٥٩﴾ ﴾[1].

**٤١٩٤-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ ﴿٥٩﴾ ﴾النساء، قَالَ: نَزَلَتْ فِي عَبْدِ اللَّهِ بْنِ حُذَافَةَ بْنِ قَيْسِ بْنِ عَدِيٍّ بَعَثَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي سَرِيَّةٍ»[2].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) لەبارەی فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ ﴿٥٩﴾ ﴾ (واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتان هێناوە گوێڕایەڵی خواو گوێڕایەڵی پێغەمبەر بن)، دەڵێ: لە بارەی عەبدوڵڵای کوڕی حوزافەی کوڕی قەیسی کوڕی عەدیەوە دابەزی، پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ لەشکرێکدا بە ئەمیر ناردبووی.

## هەڕەشەی توند لەسەر سەرپێچی کردنی پێشەوای مسوڵمانان

**٤١٩٥-** «عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: الْغَزْوُ غَزْوَانِ: فَأَمَّا مَنِ ابْتَغَى وَجْهَ اللَّهِ وَأَطَاعَ الْإِمَامَ، وَأَنْفَقَ الْكَرِيمَةَ، وَاجْتَنَبَ الْفَسَادَ، فَإِنَّ نَوْمَهُ وَنُبْهَتَهُ أَجْرٌ كُلُّهُ، وَأَمَّا مَنْ غَزَا رِيَاءً، وَسُمْعَةً وَعَصَى الْإِمَامَ، وَأَفْسَدَ فِي الْأَرْضِ، فَإِنَّهُ لَا يَرْجِعُ بِالْكَفَافِ»[3].

واتە: موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جەنگ دوو جەنگە، جا هەرکەس مەبەستی ئەوە بێت لە پێناو خوادا بجەنگێ و گوێڕایەڵی ئیمام بکات و ماڵی چاکی ببەخشێ و دووربکەوێتەوە لە خراپە، ئەوە خەوتن و نەخەوتنی هەمووی پاداشتە، بەڵام هەرکەس جەنگ بکات لەبەر ڕووپامایی و ناوبانگ و سەرپێچی ئیمامیش بکات، وە فەسادو خراپەش لەسەر زەوی بڵاو بکاتەوە، ئەوە بە خێر پاداشتێک ناگەڕێتەوە بەس بێت بۆی لە ڕۆژی دوایی.

---

(١) واتە: وە پاشانیش گوێڕایەڵی کاربەدەستە (دادپەروەرە)کانی خۆتان بکەن.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٥٨٤، ومسلم: ١٨٣٤، وأبو داود: ٢٦٢٤، والترمذي: ١٦٧٢.

(٣) حسن. أخرجه أبو داود: ٢٥١٥.




## باسی ئەوەی پێویستە بۆ پێشەوا پێی هەڵسێت و ئەوەشی پێویستە لەسەری

**٤١٩٦-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَال: عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّمَا الْإِمَامُ جُنَّةٌ يُقَاتَلُ مِنْ وَرَائِهِ وَيُتَّقَى بِهِ، فَإِنْ أَمَرَ بِتَقْوَى اللَّهِ وَعَدَلَ فَإِنَّ لَهُ بِذَلِكَ أَجْراً، وَإِنْ أَمَرَ بِغَيْرِهِ فَإِنَّ عَلَيْهِ وِزْراً»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئیمام و پێشەوا قەڵغانە لە پشتیەوە جەنگ دەکرێ و خۆشی پێ دەپارێزرێت و دەبێتە پەناگە، ئەگەر فەرمانی بە خۆپارێزی کردو دادپەروەر بوو، ئەوە بەو هۆیەوە پاداشتی بۆ هەیە، وە ئەگەر بە غەیری ئەوە فەرمانی کرد، ئەوە بۆی دەبێتە بارگرانی (لە ڕۆژی دوایی).

## ئامۆژگاری بۆ پێشەوا (ئیمام)

**٤١٩٧-** «عَنْ تَمِيمٍ الدَّارِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّمَا الدِّينُ النَّصِيحَةُ، قَالُوا: لِمَنْ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: لِلَّهِ وَلِكِتَابِهِ وَلِرَسُولِهِ، وَلِأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ»[2].

واتە: تەمیمی داری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان ئاینی ئیسلام تەنها دڵسۆزیی و ئامۆژگاریە، وتیان: بۆ کێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: بۆ خوایە (واتە: بەوەی بڕوای پێ بهێنێت و فەرمانەکانی بە مەزن دابنێت)، وە بۆ کتێبی خوایە (بەوەی بڕوای پێ بهێنێت کردەوەی پێ بکات) وە بۆ پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ (بەوەی پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺو بەڕاست بزانێت و گوێڕایەڵی بکات لەوەی فەرمانی پێکردووەو لەوەشی قەدەغەی کردوە)، وە بۆ پێشەوایانی مسوڵمانانیشە، (بەوەی گوێڕایەڵیان بکرێت لە حەقدا)، وە بۆ هەموو مسوڵمانان (بەوەی ئامۆژگاری یەکتر بکەن لەسەر خێرو چاکە).

**٤١٩٨-** «عَنْ تَمِيمٍ الدَّارِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّمَا الدِّينُ النَّصِيحَةُ، قَالُوا: لِمَنْ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: لِلَّهِ وَلِكِتَابِهِ وَلِرَسُولِهِ، وَلِأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٩٥٧، ومسلم: ١٨٤١، وأبو داود: ٢٧٥٧.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٥٥، وأبو داود: ٤٩٤٤.

(٣) )صحيح.




واتە: تەمیمی داری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان دین ئیسلام تەنها دڵسۆزیی و ئامۆژگاریە، وتیان: بۆ کێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: بۆ خوایە (واتە: بەوەی بڕوای پێ بهێنێت و فەرمانەکانی بە مەزن دابنێت)، وە بۆ کتێبی خوایە (بەوەی بڕوای پێ بهێنێت کردەوەی پێ بکات) وە بۆ پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ (بەوەی پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺو بەڕاست بزانێت و گوێڕایەڵی بکات لەوەی فەرمانی پێکردوەو لەوەشی قەدەغەی کردوە)، وە بۆ پێشەوایانی مسوڵمانانیشە، (بەوەی گوێڕایەڵیان بکرێت لە حەقدا)، وە بۆ هەموو مسوڵمانان (بەوەی ئامۆژگاری یەکتر بکەن لەسەر خێرو چاکە).

**٤١٩٩-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ الدِّينَ النَّصِيحَةُ، إِنَّ الدِّينَ النَّصِيحَةُ، إِنَّ الدِّينَ النَّصِيحَةُ، قَالُوا: لِمَنْ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: لِلَّهِ وَلِكِتَابِهِ وَلِرَسُولِهِ، وَلِأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ»(١).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان دینی ئیسلام دڵسۆزیی و ئامۆژگاریە، بێگومان دینی ئیسلام دڵسۆزیی و ئامۆژگاریە، بێگومان دینی ئیسلام دڵسۆزیی و ئامۆژگاریە، وتیان: بۆ کێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: بۆ خوایە (واتە: بەوەی بڕوای پێ بهێنێت و فەرمانەکانی بە مەزن دابنێت)، وە بۆ کتێبی خوایە (بەوەی بڕوای پێ بهێنێت کردەوەی پێ بکات) وە بۆ پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ (بەوەی پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺو بەڕاست بزانێت و گوێڕایەڵی بکات لەوەی فەرمانی پێکردوەو لەوەشی قەدەغەی کردوە)، وە بۆ پێشەوایانی مسوڵمانانیشە، (بەوەی گوێڕایەڵیان بکرێت لە حەقدا)، وە بۆ هەموو مسوڵمانان (بەوەی ئامۆژگاری یەکتر بکەن لەسەر خێرو چاکە).

**٤٢٠٠-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: الدِّينُ النَّصِيحَةُ، قَالُوا: لِمَنْ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: لِلَّهِ وَلِكِتَابِهِ وَلِرَسُولِهِ، وَلِأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ»(٢).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دینی ئیسلام دڵسۆزیی و ئامۆژگاریە، وتیان: بۆ کێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: بۆ خوایە

---

(١) حسن. أخرجه الترمذي: ١٩٢٦.

(٢) حسن صحيح.




(واتە: بەوەی بڕوای پێ بهێنێت و فەرمانەکانی بە مەزن دابنێت)، وە بۆ کتێبی خوایە (بەوەی بڕوای پێ بهێنێت کردەوەی پێ بکات) وە بۆ پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ (بەوەی پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺو بەڕاست بزانێت و گوێڕایەڵی بکات لەوەی فەرمانی پێکردووەو لەوەشی قەدەغەی کردوە)، وە بۆ پێشەوایانی مسوڵمانانیشە، (بەوەی گوێڕایەڵیان بکرێت لە حەقدا)، وە بۆ هەموو مسوڵمانان (بەوەی ئامۆژگاری یەکتر بکەن لەسەر خێرو چاکە).

## هاوەڵی پێشەوا (ئیمام)

**٤٢٠١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَا مِنْ وَالٍ إِلَّا وَلَهُ بِطَانَتَانِ: بِطَانَةٌ تَأْمُرُهُ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَاهُ عَنِ الْمُنْكَرِ، وَبِطَانَةٌ لَا تَأْلُوهُ خَبَالاً، فَمَنْ وُقِيَ شَرَّهَا فَقَدْ وُقِيَ، وَهُوَ مِنَ الَّتِي تَغْلِبُ عَلَيْهِ مِنْهُمَا»(١).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ دەسەڵاتدارێک نیە ئیللا دوو هاوەڵی هەن: هاوەڵێکی فەرمانی پێ دەکات بە چاکەو ڕێگری لێ دەکات لە خراپە، هاوەڵێکیشی هەیە درێغی لێ ناکات لە هیچ شەڕو خراپەیەک، هەرکەس لە شەڕی پارێزراو بێت ئەوە پارێزراوە، ئەوەی زاڵ دەبێ بە سەر هاوەڵە خراپەکەدا زاڵ دەبێ بە سەر ئەوی دیکەشدا.**

**٤٢٠٢-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَا بَعَثَ اللَّهُ مِنْ نَبِيٍّ، وَلَا اسْتَخْلَفَ مِنْ خَلِيفَةٍ، إِلَّا كَانَتْ لَهُ بِطَانَتَانِ: بِطَانَةٌ تَأْمُرُهُ بِالْخَيْرِ، وَبِطَانَةٌ تَأْمُرُهُ بِالشَّرِّ وَتَحُضُّهُ عَلَيْهِ، وَالْمَعْصُومُ مَنْ عَصَمَ اللَّهُ ﷻ»(٢).

**واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا ﷻ هیچ پێغەمبەرێکی نەناردوە، وە هیچ کەسێکیشی نەکردوە بە جێنشین، ئیللا دوو هاوەڵی هەن: هاوەڵێک فەرمانی پێدەکات بە خێر و چاکە، وە هاوەڵێک فەرمانی پێدەکات بە شەڕو خراپە و هانی دەدات لەسەری، پارێزراویش ئەو کەسەیە خوا پاراستوویەتی.**

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٥١٢٨، والترمذي: ٢٣٦٩ و ٢٨٢٢، وإبن ماجه: ٣٧٤٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٦١١ و ٧١٩٨.




**٤٢٠٣-** «عَنْ أَبِي أَيُّوبَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَا بُعِثَ مِنْ نَبِيٍّ، وَلَا كَانَ بَعْدَهُ مِنْ خَلِيفَةٍ إِلَّا وَلَهُ بِطَانَتَانِ: بِطَانَةٌ تَأْمُرُهُ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَاهُ عَنِ الْمُنْكَرِ، وَبِطَانَةٌ لَا تَأْلُوهُ خَبَالاً، فَمَنْ وُقِيَ بِطَانَةَ السُّوءِ فَقَدْ وُقِيَ»[1].

**واتە: ئەبو ئەیوب ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هیچ پێغەمبەرێک نەنێردراوە، وە لە دوای ئەویش هیچ جێنشینێک نەهاتووە ئیللا دوو هاوەڵی هەبووە: هاوەڵێک فەرمانی پێدەکات بە خێرو چاکەو ڕێگری لێ دەکات لە خراپە، وە هاوەڵێکیش درێغی لێ ناکات لە هیچ شەڕو خراپەیەک، هەرکەس پارێزراو بێ لە شەڕی هاوەڵە خراپەکەی ئەوە پارێزراوە.**

## وەزیری پێشەوا (ئیمام)

**٤٢٠٤-** «عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَمَّتِي تَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ وَلِيَ مِنْكُمْ عَمَلاً فَأَرَادَ اللَّهُ بِهِ خَيْراً جَعَلَ لَهُ وَزِيراً صَالِحاً، إِنْ نَسِيَ ذَكَّرَهُ، وَإِنْ ذَكَرَ أَعَانَهُ»(٢).

**واتە: قاسمی کوڕی موحەممەد دەڵێ: گوێم لە پورم بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس لە ئێوە دەسەڵاتێکی پێ بدرێ، خوا ﷻ خێری بۆی بوێ وەزیرێکی خواناسی بۆ دادەنێ، ئەگەر بیری چوو یادی دەخاتەوە، وە ئەگەر لە یادی بوو پشتیوانی لێ دەکات.**

## سزای ئەو کەسەی فەرمانی پێکراوە بە سەرپێچی و گوێڕایەڵی کردوە

**٤٢٠٥-** «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَعَثَ جَيْشاً وَأَمَّرَ عَلَيْهِمْ رَجُلاً، فَأَوْقَدَ نَاراً فَقَالَ: ادْخُلُوهَا، فَأَرَادَ نَاسٌ أَنْ يَدْخُلُوهَا، وَقَالَ الْآخَرُونَ: إِنَّمَا فَرَرْنَا مِنْهَا، فَذَكَرُوا ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ لِلَّذِينَ أَرَادُوا أَنْ يَدْخُلُوهَا: لَوْ دَخَلْتُمُوهَا لَمْ تَزَالُوا فِيهَا إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَقَالَ لِلْآخَرِينَ خَيْراً، وَقَالَ أَبُو مُوسَى فِي حَدِيثِهِ: قَوْلاً حَسَناً، وَقَالَ: لَا طَاعَةَ فِي مَعْصِيَةِ اللَّهِ، إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي الْمَعْرُوفِ»[3].

---

(١) صحيح. علقة البخاري بإثر ٧١٩٨.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٩٣٢.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٣٤٠ و ٧١٤٥، ومسلم: ١٨٤٠، وأبو داود: ٢٦٢٥.

واتە: عەلی ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ سوپایەکی ناردو پیاوێکی کرد بە فەرماندەیان، ئەویش ئاگرێکی کردەوە وتی: بچنە ناویەوە، هەندێ لە خەڵکەکە ویستیان بچنە ناویەوە، هەندێکی تریان وتیان: بێگومان ئێمە لە ئاگر هەڵهاتووین (نەچوونە نێوی)، ئەوەیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس کرد، بەوانەی فەرمووی کە ویستیان بچنە ناویەوە: ئەگەر بچوونایەتە ناویەوە بە هەمیشەیی تیایدا دەمانەوە تا ڕۆژی دوایی، بەوانی دیکەیشی فەرموو: کارێکی چاکتان کرد، پاشان فەرمووی: گوێڕایەڵی هیچ کەس ڕەوا نیە لە سەرپێچی خوادا، بەڵکو گوێڕایەڵی لە کاری چاکەدایە.

**٤٢٠٦-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: عَلَى الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ السَّمْعُ وَالطَّاعَةُ فِيمَا أَحَبَّ وَكَرِهَ إِلَّا أَنْ يُؤْمَرَ بِمَعْصِيَةٍ، فَإِذَا أُمِرَ بِمَعْصِيَةٍ، فَلَا سَمْعَ وَلَا طَاعَةَ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێویستە لەسەر کەسی مسوڵمان گوێڕایەڵ و ملکەچ بێ لەوەی پێی خۆشەو لەوەیشی پێی ناخۆشە، مەگەر فەرمانی پێ بکرێ بە سەرپێچی، ئەگەر فەرمانی پێکرا بە سەرپێچی کردن، ئەوە نە گوێڕایەڵ دەبێ و نە ملکەچ.

## باسی هەڕەشەکردن لەو کەسەی یارمەتی دەسەڵاتدارێک دەدات لەسەر ستەم

**٤٢٠٧-** «عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ ﷺ قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَنَحْنُ تِسْعَةٌ، فَقَالَ: إِنَّهُ سَتَكُونُ بَعْدِي أُمَرَاءُ مَنْ صَدَّقَهُمْ بِكَذِبِهِمْ، وَأَعَانَهُمْ عَلَى ظُلْمِهِمْ، فَلَيْسَ مِنِّي وَلَسْتُ مِنْهُ، وَلَيْسَ بِوَارِدٍ عَلَيَّ الْحَوْضَ، وَمَنْ لَمْ يُصَدِّقْهُمْ بِكَذِبِهِمْ، وَلَمْ يُعِنْهُمْ عَلَى ظُلْمِهِمْ، فَهُوَ مِنِّي وَأَنَا مِنْهُ، وَهُوَ وَارِدٌ عَلَيَّ الْحَوْضَ»[٢].

واتە: کەعبی کوڕی عوجرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ نێومان ئێمەیش نۆ کەس بووین، فەرمووی: بێگومان ماوەیەکی کەم لە دوای من دەسەڵاتدارانێک پەیدادەبن، هەرکەس بە ڕاستیان دابنێ لەوەی درۆ دەکەن، وە پشتیوانیان بکات

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٩٥٥ و ٧١٤٤، ومسلم: ١٨٣٩، وأبو داود: ٢٦٢٦، والترمذي: ١٧٠٧، وإبن ماجه: ٢٨٦٤.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢٢٥٩.

لەسەر ستەم کردنیان، نە ئەو لە منەو نە منیش لە ئەوم، هەرگیز نایەت بۆ لای من لەسەر حەوزەکە، هەرکەسیشیش درۆکانیان بە ڕاست دانەنێ و پشتیوانیان لێ نەکات لەسەر ستەمەکانیان، ئەوە لە منەو منیش لە ئەوم، ئەو کەسە دێتە لای من لەسەر حەوزەکە. »

## ئەو کەسەی یارمەتی دەسەڵاتدارێک نەدات لە سەر ستەم

**٤٢٠٨-** «عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ ﷺ قَالَ: خَرَجَ إِلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَنَحْنُ تِسْعَةٌ خَمْسَةٌ وَأَرْبَعَةٌ، أَحَدُ الْعَدَدَيْنِ مِنَ الْعَرَبِ، وَالْآخَرُ مِنَ الْعَجَمِ، فَقَالَ: اسْمَعُوا، هَلْ سَمِعْتُمْ أَنَّهُ سَتَكُونُ بَعْدِي أُمَرَاءُ، مَنْ دَخَلَ عَلَيْهِمْ فَصَدَّقَهُمْ بِكَذِبِهِمْ، وَأَعَانَهُمْ عَلَى ظُلْمِهِمْ، فَلَيْسَ مِنِّي وَلَسْتُ مِنْهُ، وَلَيْسَ يَرِدُ عَلَيَّ الْحَوْضَ، وَمَنْ لَمْ يَدْخُلْ عَلَيْهِمْ، وَلَمْ يُصَدِّقْهُمْ بِكَذِبِهِمْ، وَلَمْ يُعِنْهُمْ عَلَى ظُلْمِهِمْ، فَهُوَ مِنِّي وَأَنَا مِنْهُ، وَسَيَرِدُ عَلَيَّ الْحَوْضَ»[١].

واتە: کەعبی کوڕی عوجرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ نێومان ئێمەیش نۆ کەس بووین پێنج کەس، یان چوار کەسمان یەکێک لەو دوو ژمارە لە عەرەب بوو، ئەوی تریش غەیری عەرەب بوو، فەرمووی: گوێ بگرن، ئایا بیستووتانە ماوەیەکی کەم لە دوای من دەسەڵاتدارانێک دێنە دونیاوە، هەرکەس بچێ بۆ لایان بە ڕاستیان دابنێ لەوەی درۆ دەکەن، وە پشتیوانیان بکات لەسەر ستەم کردنیان، نە ئەو لە منەو نە منیش لە ئەوم، هەرگیز نایەتە لام لەسەر حەوزەکە، هەرکەسیشیش نەچێت بۆ لایان و درۆکانیان بە ڕاست دانەنێ و پشتیوانیان لێ نەکات لەسەر ستەمەکانیان، ئەوە لە منەو منیش لە ئەوم، ئەو کەسە دێتە لام لەسەر حەوزەکە.

## ڕێزو شکۆی ئەو کەسەی قسەی حەق دەکات لە بەرانبەر دەسەڵاتدارێکی ستەمکاردا

**٤٢٠٩-** «عَنْ طَارِقِ بْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ وَقَدْ وَضَعَ رِجْلَهُ فِي الْغَرْزِ، أَيُّ الْجِهَادِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: كَلِمَةُ حَقٍّ عِنْدَ سُلْطَانٍ جَائِرٍ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٣٩٤، وإبن ماجه: ٢٥٩٥.

واتە: تاریقی کوڕی شیهاب ﷺ دەگێڕێتەوە: پیاوێک کاتێ قاچی خستە نێو ئاوزەنگی وشترەکەی، پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ: گەورەترین و باشترین جیهاد کامەیە؟ فەرمووی: وتنی وشەیەکی حەق لە بەرانبەر دەسەڵاتدارێکی ستەمکاردا.

تێبینی: (ئاوزەنگ) ئەو شتەیە کە پێ دەخرێتە نێوی بە مەبەستی سواربوون بۆ سەر پشتی وڵاخ.

## پاداشتی ئەو کەسەی وەفای کردوە بەو بەیعەتەی داویەتی

**٤٢١٠-** «عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فِي مَجْلِسٍ فَقَالَ: بَايِعُونِي عَلَى أَنْ لَا تُشْرِكُوا بِاللَّهِ شَيْئاً، وَلَا تَسْرِقُوا، وَلَا تَزْنُوا، وَقَرَأَ عَلَيْهِمُ الْآيَةَ، فَمَنْ وَفَى مِنْكُمْ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ، وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئاً فَسَتَرَ اللَّهُ عَلَيْهِ، فَهُوَ إِلَى اللَّهِ ﷻ، إِنْ شَاءَ عَذَّبَهُ، وَإِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُ»[1].

واتە: عوبادەی کوڕی صامت ﷺ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەردا بووین ﷺ لە کۆڕێکدا فەرمووی: بەیعەتم پێ بدەن لەسەر ئەوەی هاوبەش بۆ خوا پەیدا نەکەن و دزی و زینا نەکەن، پاشان ئایەتەکەی بە سەریاندا خوێندەوە، هەرکەسیش لە ئێوە پەیمانی خۆی بە چاکی بەجێهێنا پاداشتی لای خوایە، هەرکەسیش تووشی شتێک لەو گوناهانە بوو، پاشان خوا بۆی پۆشی ئەوە فەرمانی لای خوایە، ئەگەر ویستی سزای دەدا، وە ئەگەر ویستی لێی خۆش دەبێ.

## سوربوون لەسەر وەرگرتنی پلەو پایەو دەسەڵات ناپەسندە

**٤٢١١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِنَّكُمْ سَتَحْرِصُونَ عَلَى الْإِمَارَةِ، وَإِنَّهَا سَتَكُونُ نَدَامَةً وَحَسْرَةً فَنِعْمَتِ الْمُرْضِعَةُ، وَبِئْسَتِ الْفَاطِمَةُ»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان ئێوە لە داهاتویەکی نزیکدا زۆر پێداگری دەکەن لەسەر وەرگرتنی دەسەڵات، بێگومان ئەو بەرپرسیارێتیەیش دەبێتە مایەی پەشیمانی و حەسرەت، جا گەیشتن بە دەسەڵات

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨ و ٣٨٩٢ و ٣٩٩٩ و ٤٨٩٤ و ٦٧٨٤ و ٦٨٠١ و ٧٢١٣ و ٧٤٦٨، ومسلم: ١٧٠٩، والترمذي: ١٤٣٩.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٧١٤٨.




خۆشترین ژیانە (لە دونیادا)، وە نەمانیشی ناخۆشترین شتە (ئەویش مردنە).(واتە: لە دونیادا خۆشترین ژیانیان هەیە، لە دوای مردنیش ناخۆشترین ژیانیان هەیە، خوا زاناترە).




**(العقيقة): بریتیە لەو ئاژەڵ سەربڕینەی کە بۆ منداڵی تازە لە دایک بوو ئەنجام دەدرێ.**

**٤٢١٢-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﵁ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْعَقِيقَةِ فَقَالَ: لَا يُحِبُّ اللَّهُ ﷻ الْعُقُوقَ، وَكَأَنَّهُ كَرِهَ الِاسْمَ، قَالَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ: إِنَّمَا نَسْأَلُكَ أَحَدُنَا يُولَدُ لَهُ، قَالَ: مَنْ أَحَبَّ أَنْ يَنْسُكَ عَنْ وَلَدِهِ، فَلْيَنْسُكْ عَنْهُ عَنِ الْغُلَامِ شَاتَانِ مُكَافَأَتَانِ، وَعَنِ الْجَارِيَةِ شَاةٌ، قَالَ دَاوُدُ سَأَلْتُ زَيْدَ بْنَ أَسْلَمَ عَنِ الْمُكَافَأَتَانِ قَالَ: الشَّاتَانِ الْمُشَبَّهَتَانِ تُذْبَحَانِ جَمِيعاً»(١).

**واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، لە باپیرەیەوە ﵁ دەڵێ: پرسیارکرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ سەبارەت بە گوێزەبانە فەرمووی: خوا ﷻ حەزی لە (الْعُقُوقَ) نیە، وەک چۆن بڵێی ئەو ناوەی پێ باش نەبوو، بە پێغەمبەری خوای ﷺ وت: بەڵکو یەکێک لە ئێمە پرسیاری ئەوەت لێ دەکات منداڵێکی ببێ، فەرمووی: هەرکەس پێی خۆشە ئاژەڵ سەر ببڕێ بۆ منداڵەکەی، با سەر ببڕێ بۆی، بۆ کوڕ دوو مەڕی هاوشێوەی یەکتر سەر ببڕێ و بۆ کچیش یەک مەڕ، داود (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودە) دەڵێ: پرسیارم کرد لە زەیدی کوڕی ئەسلەم لە بارەی (الْمُكَافَأَتَانِ) وتی: دوو مەڕی هاوشێوەی یەکترن پێکەوە سەر دەبڕدرێن.**

**٤٢١٣-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَقَّ عَنِ الْحَسَنِ وَالْحُسَيْنِ»(٢).

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی بورەیدە دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﵁، پێغەمبەری خوا ﷺ گوێزەبانەی بۆ حەسەن و حوسێن کرد.**

## گوێزەبانە بۆ کوڕ

**٤٢١٤-** «عَنْ سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: فِي الْغُلَامِ عَقِيقَةٌ فَأَهْرِيقُوا عَنْهُ دَماً، وَأَمِيطُوا عَنْهُ الْأَذَى»(٣).

**واتە: سەلمانی کوڕی عامری ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: منداڵ گوێزەبانەی بۆ هەیە، لە بری ئەو خوێنەکەی بڕێژن و پیسی لێ بکەنەوە (واتە: قژی بتاشن).**

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٢٨٤٢.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٤٧١ و ٥٤٧٢، وأبو داود: ٢٨٣٩، والترمذي: ١٥١٥، وإبن ماجه: ٣١٦٤.




**٤٢١٥-** «عَنْ أُمِّ كُرْزٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: فِي الْغُلَامِ شَاتَانِ مُكَافَأَتَانِ، وَفِي الْجَارِيَةِ شَاةٌ»[١].

**واتە: ئوممو کورز (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بۆ کوڕ دوو مەڕی هاوشێوەی یەکتر سەر دەبڕدرێ، وە بۆ کچیش یەک دانە.**

## بابەت: گوێزەبانە بۆ کچ

**٤٢١٦-** «عَنْ أُمِّ كُرْزٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: عَنِ الْغُلَامِ شَاتَانِ مُكَافَأَتَانِ، وَعَنِ الْجَارِيَةِ شَاةٌ»[٢].

**واتە: ئوممو کورز (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بۆ کوڕ دوو مەڕی هاوشێوەی یەکتر سەر دەبڕدرێ، وە بۆ کچیش یەک دانە.**

## چەند ئاژەڵ بۆ کچ دەکرێ بە گوێزەبانە؟

**٤٢١٧-** «عَنْ أُمِّ كُرْزٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ بِالْحُدَيْبِيَةِ أَسْأَلُهُ عَنْ لُحُومِ الْهَدْيِ، فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: عَلَى الْغُلَامِ شَاتَانِ، وَعَلَى الْجَارِيَةِ شَاةٌ، لَا يَضُرُّكُمْ ذُكْرَاناً كُنَّ أَمْ إِنَاثاً»[٣].

**واتە: ئوممو کورز (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لە حودەیبیە پرسیاری لێ بکەم دەربارەی (الْهَدْيِ) گۆشتی ئەو قوربانیەیە کە بە دیاری دەهێنرێ بۆ مەککە، گوێم لێ بوو دەیفەرموو: لەسەر کوڕ دوو مەڕە، وە لەسەر کچیش یەک مەڕە، زیانتان پێ ناگات ئەگەر ئەو مەڕانە نێر بن یان مێ.**

**٤٢١٨-** «عَنْ أُمِّ كُرْزٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: عَنِ الْغُلَامِ شَاتَانِ، وَعَنِ الْجَارِيَةِ شَاةٌ لَا يَضُرُّكُمْ ذُكْرَاناً كُنَّ أَمْ إِنَاثاً»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٨٣٤ و ٢٨٣٥ و ٢٨٣٦، والترمذي: ١٥١٦، وإبن ماجه: ٣١٦٢.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




**واتە: ئوممو کورز (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بۆ کوڕ دوو مەڕ سەر دەبڕدرێ، وە بۆ کچیش یەک دانە، زیانتان پێ ناگات ئەگەر ئەو مەڕانە نێر بن یان مێ.**

**٤٢١٩-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: عَقَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْحَسَنِ وَالْحُسَيْنِ بِكَبْشَيْنِ كَبْشَيْنِ»[1].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ گوێزەبانەی بۆ حەسەن و حوسێن کرد بە دوو بەران، دوو بەران.**

## کەی گوێزەبانە دەکرێ؟

**٤٢٢٠-** «عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: كُلُّ غُلَامٍ رَهِينٌ بِعَقِيقَتِهِ تُذْبَحُ عَنْهُ يَوْمَ سَابِعِهِ وَيُحْلَقُ رَأْسُهُ وَيُسَمَّى»[2].

**واتە: سەمورەی کوڕی جوندوب ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی، هەموو منداڵێک بارمتەیە بە گوێزەبانەکەیەوە، (واتە: هەر دەبێت گوێزەبانەی بۆ بکرێ تا بتوانێ شەفاعەت بۆ دایک و باوکی بکات) لە ڕۆژی حەوتەمدا بۆی سەر دەبڕدرێ و سەری دەتاشرێ، ناویشی لێ دەنرێ.**

**٤٢٢١-** «عَنْ حَبِيبِ بْنِ الشَّهِيدِ قَالَ لِي مُحَمَّدُ بْنُ سِيرِينَ: سَلِ الْحَسَنَ مِمَّنْ سَمِعَ حَدِيثَهُ فِي الْعَقِيقَةِ، فَسَأَلْتُهُ عَنْ ذَلِكَ فَقَالَ: سَمِعْتُهُ مِنْ سَمُرَةَ»[3].

**واتە: حەبیبی کوڕی شەهید دەڵێ: موحەممەدی کوڕی سیرین پێی وتم: پرسیار بکە لە حەسەن فەرموودەکەی گوێزەبانەی لە کێ بیستووە، منیش پرسیارم لەو بارەوە لێکرد، وتی: لە سەمورە بیستوومە.**

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٨٤١.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٨٣٧ و ٢٨٣٨، والترمذي: ١٥٢٢، وإبن ماجه: ٣١٦٥، وانظر البخاري: ٥٤٧٢.

(٣) صحيح.




**(الْفَرَعِ): یەکەم سکی وشترە کە لە دایک دەبوو، لەسەردەمی پێشی ئیسلام سەریان دەبڕی دەیانکرد بە خێر بە مەبەستی فەڕو بەرەکەت.**

**(الْعَتِيرَةِ): ئەو ئاژەڵەیە لە دەی مانگی ڕەجەبدا خەڵکی بەر لە ئیسلام بە مەبەستی نزیکبوونەوە لە خوا سەریان دەبڕی.**

**٤٢٢٢-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا فَرَعَ وَلَا عَتِيرَةَ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نە فەرەع (واجبە) و نە عەتیرەیش (واجبە).**

**٤٢٢٣-** «عَنْ مَعْمَرٍ وَسُفْيَانَ عن الزُّهْرِيِّ عن سَعِيدِ بن الْمُسَيَّبِ عن أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ أحدهما: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْفَرَعِ، وَالْعَتِيرَةِ، وَقَالَ الْآخَرُ: لَا فَرَعَ، وَلَا عَتِيرَةَ»[٢].

**واتە: مەعمەرو سوفیان دەگێڕنەوە، لە زوهری لە سەعیدی کوڕی موسەیەب لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ، یەکێکیان (مەعمەر یان سوفیان) وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە فەرەع و عەتیرە، ئەویتر وتی: نە فەرەع (واجبە) و نە عەتیرەیش (واجبە).**

**٤٢٢٤-** «عَنْ مِخْنَفِ بْنِ سُلَيْمٍ ﷺ قَالَ: بَيْنَا نَحْنُ وُقُوفٌ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ بِعَرَفَةَ فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّ عَلَى أَهْلِ بَيْتٍ فِي كُلِّ عَامٍ أَضْحَاةً، وَعَتِيرَةً، قَالَ مُعَاذٌ: كَانَ ابْنُ عَوْنٍ يَعْتِرُ أَبْصَرَتْهُ عَيْنِي فِي رَجَبٍ»[٣].

**واتە: میخنەفی کوڕی سولەیم ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا ئێمە وەستابووین لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ لە عەرەفە فەرمووی: ئەی خەڵکینە، بەڕاستی پێویستە لەسەر هەمووماڵێک لە هەموو ساڵێکدا قوربانیەک و عەتیرەیەک بکەن، موعاز وتی: بە چاوی خۆم بینیم ئیبنو عەون عەتیرەی دەکرد لە مانگی ڕەجەبدا.**

**٤٢٢٥-** «عَنْ دَاوُدِ بْنِ قَيْسٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَمْرَو بْنَ شُعَيْبِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ أَبِيهِ، وَزَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ ﷺ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، الْفَرَعَ، قَالَ: حَقٌّ، فَإِنْ تَرَكْتَهُ حَتَّى يَكُونَ بَكْرًا،

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٤٧٣ و ٥٤٧٤، ومسلم: ١٩٧٦، وأبو داود: ٢٨٣١، والترمذي: ١٥١٢، وإبن ماجه: ٣١٦٨.

(٢) صحيح.

(٣) حسن. أخرجه أبو داود: ٢٧٨٨، والترمذي: ١٥١٨، وإبن ماجه: ٣١٢٥.



فَتَحْمِلَ عَلَيْهِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، أَوْ تُعْطِيَهُ أَرْمَلَةً، خَيْرٌ مِنْ أَنْ تَذْبَحَهُ، فَيَلْصَقَ لَحْمُهُ بِوَبَرِهِ، فَتُكْفِئَ إِنَاءَكَ، وَتُولِهُ نَاقَتَكَ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَالْعَتِيرَةُ قَالَ: الْعَتِيرَةُ حَقٌّ»[١].

**واتە: داودی کوڕی قەیس دەڵێ: گوێم لە عەمڕی کوڕی شوعەیبی کوڕی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕ بوو دەیگێڕایەوە، لە باوکیەوە، وە زەیدی کوڕی ئەسلەمیش ﷺ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرەع دروستە؟ فەرمووی: بەڵێ حەقە، ئەگەر وازی لێ بهێنی تا دەبێتە وشترێکی لاو، لە پێناوی خوادا باری لێ بنێی بۆ جیهاد کردن، یان بیبەخشی بە بێوەژنێک، لەوە چاکترە سەری ببڕی، گۆشتەکەی بە پێستەکەیەوە نوسابێت (لەبەر لاوازی) و مەنجەڵەکەت پڕ بکەیت (گۆشتەکەی بخۆیت و) وشترەکەیشت لە دەست بچێت، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی عەتیرە، فەرمووی: عەتیرەیش حەقە.**

**٤٢٢٦-** «عَنِ الْحَارِثِ بْنِ عَمْرٍو الْبَاهِلِيِّ ﷺ قَالَ: أَنَّهُ لَقِيَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ، وَهُوَ عَلَى نَاقَتِهِ الْعَضْبَاءِ، فَأَتَيْتُهُ مِنْ أَحَدِ شِقَّيْهِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي اسْتَغْفِرْ لِي، فَقَالَ: غَفَرَ اللَّهُ لَكُمْ ثُمَّ أَتَيْتُهُ مِنَ الشِّقِّ لآخَرِ، أَرْجُو أَنْ يَخُصَّنِي دُونَهُمْ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، اسْتَغْفِرْ لِي، فَقَالَ بِيَدِهِ: غَفَرَ اللَّهُ لَكُمْ. فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ النَّاسِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، الْعَتَائِرُ، وَالْفَرَائِعُ، قَالَ: مَنْ شَاءَ عَتَرَ، وَمَنْ شَاءَ لَمْ يَعْتِرْ، وَمَنْ شَاءَ فَرَّعَ، وَمَنْ شَاءَ لَمْ يُفَرِّعْ فِي الْغَنَمِ أُضْحِيَّتُهَا، وَقَبَضَ أَصَابِعَهُ إِلَّا وَاحِدَةً»[٢].

**واتە: حارثی کوڕی عەمڕی باهلی ﷺ دەڵێ: گەیشتم بە پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەجی ماڵئاواییدا، ئەو بەسەر وشترەکەیەوە بوو کە ناوی (الْعَضْبَاءِ) بوو، هاتم بۆ لای لە تەنیشتیەوە وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، دایک و باوکم بە قوربانت بێ داوای لێ خۆشبوونم بۆ بکە، فەرمووی: خوا لێتان خۆش بێت، پاشان لە لایەکی ترەوە هاتم بۆ لای، بەڵکو بەو نزایە تایبەتم بکات: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، داوای لێ خۆشبوونم بکە، بە دەستی فەرمووی: خوا لێتان خۆش بێت، پیاوێک لە نێو خەڵکەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ عەتیرەو فەرەع دروستە؟ فەرمووی: هەرکەس ویستی با عەتیرە بکات، هەرکەسیش نەیویست با عەتیرە نەکات،**

**(١) حسن.**

**(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٧٤٢.**

**هەرکەس ویستی با فەرەع بکات، هەرکەسیش نەیویست با فەرەع نەکات لە مەڕی قوربانیەکەیدا، هەموو پەنجەکانی گرتەوە تەنها یەک پەنجەی نەبێت.**

**٤٢٢٧-** «عَنِ الْحَارِثِ بْنِ عَمْرٍو الْبَاهِلِيِّ ﷺ قَالَ: أَنَّهُ لَقِيَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ، فَقُلْتُ: بِأَبِي أَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَأُمِّي، اسْتَغْفِرْ لِي، فَقَالَ: غَفَرَ اللَّهُ لَكُمْ، وَهُوَ عَلَى نَاقَتِهِ الْعَضْبَاءِ، ثُمَّ اسْتَدَرْتُ مِنَ الشِّقِّ الْآخَرِ، وَسَاقَ الْحَدِيثَ»[1].

**واتە: حارثی کوڕی عەمڕی باهلی ﷺ دەڵێ: گەیشتم بە پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەجیماڵئاواییدا، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دایک و باوکم بە قوربانت بێت داوای لێخۆشبوونم بۆ بکە، فەرمووی: خوا لێتان خۆش بێت، ئەو بەسەر وشترەکەیەوە بوو کە ناوی (الْعَضْبَاءِ) بوو، پاشان لە لایەکی ترەوە هاتم بۆ لای. فەرموودەکەی باس کرد.**

## شیکردنەوەی (الْعَتِيرَة):

**(الْعَتِيرَة): ئەو ئاژەڵەیە لە دەی مانگی ڕەجەبدا نەفامەکان بە مەبەستی نزیکبوونەوە لە خوا سەریان دەبڕی.**

**٤٢٢٨-** «عَنْ نُبَيْشَةَ ﷺ قَالَ: ذُكِرَ لِلنَّبِيِّ ﷺ قَالَ: كُنَّا نَعْتِرُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، قَالَ: اذْبَحُوا لِلَّهِ ﷻ فِي أَيِّ شَهْرٍ مَا كَانَ، وَبَرُّوا اللَّهَ ﷻ وَأَطْعِمُوا»[2].

**واتە: نوبەیشە ﷺ دەڵێ: باسکرا بۆ پێغەمبەر ﷺ کە ئێمە لە سەردەمی نەفامیدا عەتیرەمان دەکرد، فەرمووی: لە پێناوی خوا ﷻ سەرببڕن لە هەر مانگێکدا بێت، وە چاکە بکەن لە پێناوی خواداو خواردنیش ببەخشنەوە.**

**٤٢٢٩-** «عَنْ نُبَيْشَةَ ﷺ قَالَ: نَادَى رَجُلٌ وَهُوَ بِمِنًى فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا كُنَّا نَعْتِرُ عَتِيرَةً فِي الْجَاهِلِيَّةِ فِي رَجَبٍ، فَمَا تَأْمُرُنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: اذْبَحُوا فِي أَيِّ شَهْرٍ مَا كَانَ، وَبَرُّوا اللَّهَ ﷻ وَأَطْعِمُوا، قَالَ: إِنَّا كُنَّا نُفْرِعُ فَرَعاً فَمَا تَأْمُرُنَا؟ قَالَ: فِي كُلِّ سَائِمَةٍ فَرَعٌ تَغْذُوهُ مَاشِيَتُكَ، حَتَّى إِذَا اسْتَحْمَلَ ذَبَحْتَهُ وَتَصَدَّقْتَ بِلَحْمِهِ»[3].

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه مختصراً مسلم: ١١٤١، وأبو داود: ٢٨١٣ و ٢٨٣٠، وإبن ماجه: ٣١٦٠ و ٣١٦٧.

(٣) صحيح.




**واتە: نوبەیشە ﷺ دەڵێ: پیاوێک هاواری کرد لە مینا بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئێمە لە سەردەمی نەفامیدا عەتیرەمان دەکرد لە مانگی ڕەجەبدا، فەرمانی چیمان پێ دەکەیت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: سەربڕین لە هەر مانگیدا بێت، وە چاکە بکەن لە پێناوی خواداو خواردنیش ببەخشنەوە، وتی: ئێمە فەرەعمان دەکرد فەرمانی چیمان پێدەکەیت؟ فەرمووی: لە هەموو کۆمەڵە مەڕو ماڵاتێکدا کە لە دەرەوە دەلەوەڕێ (مەسرەفی زۆر نیە) فەرەعێک هەیە، مەڕەکەت تێر دەکەی تا بەکەڵکی سەربڕین دێت، ئینجا سەری ببڕەو گۆشتەکەی بکە بە خێر.**

**٤٢٣٠-** «عَنْ نُبَيْشَةَ ﷺ رَجُلٍ مِنْ هُذَيْلٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِنِّي كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنْ لُحُومِ الْأَضَاحِيِّ فَوْقَ ثَلَاثٍ كَيْمَا تَسَعَكُمْ، فَقَدْ جَاءَ اللَّهُ ﷻ بِالْخَيْرِ، فَكُلُوا وَتَصَدَّقُوا وَادَّخِرُوا، وَإِنَّ هَذِهِ الْأَيَّامَ أَيَّامُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ، وَذِكْرِ اللَّهِ ﷻ فَقَالَ رَجُلٌ: إِنَّا كُنَّا نَعْتِرُ عَتِيرَةً فِي الْجَاهِلِيَّةِ فِي رَجَبٍ، فَمَا تَأْمُرُنَا؟ قَالَ: اذْبَحُوا لِلَّهِ ﷻ فِي أَيِّ شَهْرٍ مَا كَانَ، وَبَرُّوا اللَّهَ ﷻ وَأَطْعِمُوا، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا كُنَّا نُفْرِعُ فَرَعاً فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَمَا تَأْمُرُنَا؟ قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: فِي كُلِّ سَائِمَةٍ مِنَ الْغَنَمِ فَرَعٌ تَغْذُوهُ غَنَمُكَ، حَتَّى إِذَا اسْتَحْمَلَ ذَبَحْتَهُ، وَتَصَدَّقْتَ بِلَحْمِهِ عَلَى ابْنِ السَّبِيلِ، فَإِنَّ ذَلِكَ هُوَ خَيْرٌ»[1].

**واتە: نوبەیشە ﷺ پیاوێک بوو لە هوزی هوزەیل دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: من ڕێگریم لێکردن لە هەڵگرتنی گۆشتی قوربانی لە سەرووی سێ ڕۆژەوە، خوا ﷻ خێرو بەخششی هێنا، ئێوەیش بخۆن و ببەخشنەوەو لێی هەڵبگرن، ئەم ڕۆژانەش ڕۆژانی خواردن و خواردنەوەو یادی خوای گەورەیە، پیاوێک وتی: ئێمە لە سەردەمی نەفامیدا لە مانگی ڕەجەبدا عەتیرەمان دەکرد، فەرمانی چیمان پێ دەکەی؟ فەرمووی: لە پێناوی خوادا سەر ببڕن لە هەر مانگێکدا بێت، وە چاکە بکەن لە پێناوی خواداو خواردنیش ببەخشنەوە، پیاوێکی تر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئێمە لە سەردەمی نەفامیدا فەریعەمان دەکرد فەرمانی چیمان پێ دەکەی؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لە هەموو کۆمەڵە مەڕو ماڵاتێکدا کە لە دەرەوە بەبێ مەسرەفی زۆر دەلەوەڕێ فەرەعێک هەیە، مەڕەکەت تێر دەکەی تا بە کەڵکی سەربڕین دێت، ئینجا سەری ببڕەو گۆشتەکە بکە بە خێر بۆ ڕێبوار بەڕاستی ئەوە دەبێتە خێر.**

---

(١) صحيح.




## شیکردنەوەی (الْفَرَع)

**(الْفَرَع): یەکەم سکی وشترە کە لە دایک دەبوو، لە سەردەمی نەفامی سەریان دەبڕی بە مەبەستی فەڕو بەرەکەت.**

**٤٢٣١-** «عَنْ نُبَيْشَةَ ﷺ قَالَ: نَادَى النَّبِيَّ ﷺ رَجُلٌ فَقَالَ: إِنَّا كُنَّا نَعْتِرُ عَتِيرَةً «يَعْنِي فِي الْجَاهِلِيَّةِ» فِي رَجَبٍ، فَمَا تَأْمُرُنَا؟ قَالَ: اذْبَحُوهَا فِي أَيِّ شَهْرٍ كَانَ، وَبَرُّوا اللَّهَ ﷻ وَأَطْعِمُوا. قَالَ: إِنَّا كُنَّا نُفْرِعُ فَرَعاً فِي الْجَاهِلِيَّةِ، قَالَ: فِي كُلِّ سَائِمَةٍ فَرَعٌ، حَتَّى إِذَا اسْتَحْمَلَ ذَبَحْتَهُ وَتَصَدَّقْتَ بِلَحْمِهِ، فَإِنَّ ذَلِكَ هُوَ خَيْرٌ»[١].

**واتە: نوبەیشە ﷺ دەڵێ: پیاوێک بانگی پێغەمبەری ﷺ کرد وتی: ئێمە عەتیرەمان دەکر «واتە: لە سەردەمی نەفامیدا» لە مانگی ڕەجەب، فەرمانی چیمان پێدەکەی؟ فەرمووی: لە هەر مانگێکدا بێت ئاژەڵ سەر ببڕن وە چاکە بکەن لە پێناوی خواداو خواردنیش ببەخشنەوە، وتی: ئێمە لە سەردەمی نەفامیدا فەرەعمان دەکرد، فەرمووی: لە هەموو کۆمەڵە مەڕو ماڵاتێکدا کە لە دەشت دەلەوەڕێ فەرەعێک هەیە، مەڕەکەت تێر دەکەی تا بە کەڵکی سەربڕین دێت، پاشان گۆشتەکەی بکە بەخێر، چونکە ئەوە خۆی لە خۆیدا خێرە.**

**٤٢٣٢-** «عَنْ نُبَيْشَةَ الْهُذَلِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا كُنَّا نَعْتِرُ عَتِيرَةً فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَمَا تَأْمُرُنَا؟ قَالَ: اذْبَحُوا لِلَّهِ ﷻ فِي أَيِّ شَهْرٍ مَا كَانَ، وَبَرُّوا اللَّهَ ﷻ وَأَطْعِمُوا»[٢].

**واتە: نوبەیشە هوزەلی ﷺ دەڵێ: پیاوێک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئێمە عەتیرەمان دەکرد لە سەردەمی نەفامیدا فەرمانی چیمان پێدەکەی؟ فەرمووی: لە پێناوی خوادا ﷻ سەر ببڕن لە هەر مانگێکدا بێت، وە چاکە بکەن لە پێناوی خواداو خواردنیش ببەخشنەوە.**

**٤٢٣٣-** «عَنْ أَبِي رَزِينٍ لَقِيطِ بْنِ عَامِرٍ الْعُقَيْلِيِّ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا كُنَّا نَذْبَحُ ذَبَائِحَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ فِي رَجَبٍ، فَنَأْكُلُ وَنُطْعِمُ مَنْ جَاءَنَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا بَأْسَ بِهِ»[٣].

---

**(١) صحيح.**

**(٢) صحيح.**

**(٣) صحيح لغيره.**




**واتە: ئەبو ڕەزین لەقیتی کوڕی عامری عوقەیلی ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئێمە لە مانگی ڕەجەبدا ئاژەڵمان سەردەبڕی و لێمان دەخواردو دەرخواردی ئەوانەمان دەدا کە دەهاتن بۆ لامان، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هیچ گرفتێکی تێدانیە.**

## پێستی مردارەوە بوو

**٤٢٣٤-** «عَنْ مَيْمُونَةَ رَضِيَ اللَّهُ عنها، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ مَرَّ عَلَى شَاةٍ مَيِّتَةٍ مُلْقَاةٍ، فَقَالَ: لِمَنْ هَذِهِ؟ فَقَالُوا: لِمَيْمُونَةَ. فَقَالَ: مَا عَلَيْهَا لَوِ انْتَفَعَتْ بِإِهَابِهَا، قَالُوا: إِنَّهَا مَيْتَةٌ فَقَالَ: إِنَّمَا حَرَّمَ اللَّهُ ﷻ أَكْلَهَا»[١].

**واتە: مەیمونە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ تێپەڕی بەلای مەڕێکی مردارەوە بوودا، فەرمووی: ئەمە هی کێیە؟ وتیان: هی مەیمونەیە. فەرمووی: گوناهبار نابێ ئەگەر سوود لە پێستەکەی وەربگرێ، وتیان: ئەوە مردار بووەتەوە، فەرمووی: بێگومان خوا تەنها خواردنی قەدەغە کردوە.**

**٤٢٣٥-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: مَرَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِشَاةٍ مَيِّتَةٍ كَانَ أَعْطَاهَا مَوْلَاةً لِمَيْمُونَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: هَلَّا انْتَفَعْتُمْ بِجِلْدِهَا؟ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهَا مَيْتَةٌ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّمَا حُرِّمَ أَكْلُهَا»[٢].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ تێپەڕی بە لای مەڕێکی مردارەوە بوودا، کە دابوی بە خزمەتکارێکی مەیمونەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: بۆ سودتان لە پێستەکەی وەرنەگرتووە؟ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوە مردار بۆتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: تەنها خواردنی قەدەغە کراوە.**

**٤٢٣٦-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: أَبْصَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ شَاةً مَيِّتَةً لِمَوْلَاةٍ لِمَيْمُونَةَ، وَكَانَتْ مِنَ الصَّدَقَةِ، فَقَالَ: لَوْ نَزَعُوا جِلْدَهَا فَانْتَفَعُوا بِهِ، قَالُوا: إِنَّهَا مَيْتَةٌ قَالَ: إِنَّمَا حَرَّمَ أَكْلُهَا»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٣٦٣، وأبو داود: ٤١٢٠، وابن ماجه: ٣٦١٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٩٢ و ٢٢٢١ و ٥٥٣١ و ٥٥٣٢، ومسلم: ١٠٠ و ٣٦٣/١٠٢، وأبو داود: ٤١٢٠ و ٤١٢١، والترمذي: ١٧٢٧.

(٣) صحيح الإسناد.

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی بە مەڕێکی مردارەوە بوو کەوت کە هی خزمەتکارەکەی مەیمونە بوو بەخێرو صەدەقە پێی درابوو، فەرمووی: خۆزگە پێستەکەیان لێدەکردەوەو سوودیان لێ وەردەگرت، وتیان: ئەوە مردار بۆتەوە فەرمووی: تەنها خواردنی قەدەغە کراوە.**

**٤٢٣٧-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَخْبَرَتْنِي مَيْمُونَةُ، أَنَّ شَاةً مَاتَتْ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: أَلَا دَفَعْتُمْ إِهَابَهَا فَاسْتَمْتَعْتُمْ بِهِ»[1].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: مەیمونە (خوا لێی ڕازی بێ) هەواڵی پێدام، مەڕێک مردار بوویەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بۆچی پێستەکەیتان خۆشە نەکرد تاکو سوودی لێوەربگرن.**

**٤٢٣٨-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ ﷺ بِشَاةٍ لِمَيْمُونَةَ مَيِّتَةٍ فَقَالَ: أَلَا أَخَذْتُمْ إِهَابَهَا فَدَبَغْتُمْ فَانْتَفَعْتُمْ»[2].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ تێپەڕی بەلای مەڕێکی مەیمونەدا مرداربوو بوویەوە، فەرمووی: بۆچی پێستەکەیتان هەڵنەگرت، خۆشەتان بکردایەو سودتان لێ وەربگرتایە.**

**٤٢٣٩-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى شَاةٍ مَيِّتَةٍ فَقَالَ: أَلَّا انْتَفَعْتُمْ بِإِهَابِهَا»[3].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ تێپەڕی بەلای مەڕێکی مردارەوە بوودا، فەرمووی: بۆچی سودتان لە پێستەکەی وەرنەگرت.**

**٤٢٤٠-** «عَنْ سَوْدَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: مَاتَتْ شَاةٌ لَنَا فَدَبَغْنَا مَسْكَهَا، فَمَا زِلْنَا نَنْبِذُ فِيهَا حَتَّى صَارَتْ شَنًّا»[4].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٦٨٦.




**واتە: سەودە (خوا لێی ڕازی بێ) کە خێزانی پێغەمبەرە ﷺ دەڵێ: مەڕێکمان مردار بوویەوە، پێستەکەیمان خۆشە کرد، کردمان بە کوندە، بەردەوام شلەمەنیمان تێ دەکرد تا بوو بە کوندە.**

**٤٢٤١**- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَيُّمَا إِهَابٍ دُبِغَ فَقَدْ طَهُرَ»[1].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر پێستەیەک خۆشە بکرێ ئەوە پاک بۆتەوە.**

**٤٢٤٢**- «عَنِ ابْنِ وَعْلَةَ، أَنَّهُ سَأَلَ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا فَقَالَ: إِنَّا نَغْزُو هَذَا الْمَغْرِبَ، وَإِنَّهُمْ أَهْلُ وَثَنٍ، وَلَهُمْ قِرَبٌ يَكُونُ فِيهَا اللَّبَنُ وَالْمَاءُ فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: الدِّبَاغُ طَهُورٌ، قَالَ ابْنُ وَعْلَةَ: عَنْ رَأْيِكَ أَوْ شَيْءٌ سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: بَلْ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ»[2].

**واتە: ئیبنو وەعلە دەگێڕێتەوە، ئەو پرسیاری لە ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) کردووەو وتوویەتی: ئێمە جەنگی خۆرئاوا دەکەین، ئەوانیش بت پەرستن، کوندەیان هەیە شیرو ئاوی تێدەکەن (واتە: ئایا لێی بخۆینەوە؟)، ئیبنو عەبباس وتی: پێستی خۆشەکراو پاکە، ئیبنو وەعلەش وتی: ئەمە بۆچوونی خۆتە، یان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستووتە، وتی: بەڵکو لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستوومە.**

**٤٢٤٣**- «عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْمُحَبِّقِ ﷺ، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ دَعَا بِمَاءٍ مِنْ عِنْدِ امْرَأَةٍ، قَالَتْ: مَا عِنْدِي إِلَّا فِي قِرْبَةٍ لِي مَيْتَةٍ، قَالَ: أَلَيْسَ قَدْ دَبَغْتِهَا؟ قَالَتْ: بَلَى، قَالَ: فَإِنَّ دِبَاغَهَا ذَكَاتُهَا»[3].

**واتە: سەلەمەی کوڕی موحەبیق ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەنگی تەبووکدا داوای ئاوی کرد لە لای ژنێک، وتی: هیچم لە لا نیە جگە لە کوندەیەک کە هی مەڕێکی مردارەوە بووە، فەرمووی: ئایا خۆشەت نەکردوە؟ وتی: بەڵێ، خۆشەم کردوە، فەرمووی: خۆشەکردنی (لە جیاتی) سەربڕینیەتی (واتە: پاکەو ئاوی تێدا دەخورێتەوە).**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٣٦٦، وأبو داود: ٣١٢٣، والترمذي: ١٧٢٨، وإبن ماجه: ٣٦٠٩.

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤١٢٥.




**٤٢٤٤-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْ جُلُودِ الْمَيْتَةِ فَقَالَ: دِبَاغُهَا طَهُورُهَا»[١].

**واته: عائیشه (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پرسیارکرا له پێغەمبەر ﷺ دەربارەی پێستی مردارەوە بوو، فەرمووی: خۆشەکردنی پاک بوونەوەیەتی.**

**٤٢٤٥-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ جُلُودِ الْمَيْتَةِ، فَقَالَ: دِبَاغُهَا ذَكَاتُهَا»[٢].

**واته: عائیشه (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پرسیارکرا له پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی پێستی مردارەوە بوو، فەرمووی: خۆشەکردنی (له جیاتی) سەربڕینیەتی.**

**٤٢٤٦-** «عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: ذَكَاةُ الْمَيْتَةِ دِبَاغُهَا»[٣].

**واته: عائیشه (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە:پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خۆشەکردنی پێستەی مردارەوە بوو (لەجیاتی) سەربڕینیەتی.**

**٤٢٤٧-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: ذَكَاةُ الْمَيْتَةِ دِبَاغُهَا»[٤].

**واته: عائیشه (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆشەکردنی پێستەی مردارەوە بوو (لەجیاتی) سەربڕینیەتی.**

## ئەو شتەی پێستی مردارەوە بووی پێ خۆشە دەکرێ

**٤٢٤٨-** «عَنِ الْعَالِيَةِ بِنْتِ سُبَيْعٍ، أَنَّ مَيْمُونَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ حَدَّثَتْهَا، أَنَّهُ مَرَّ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ رِجَالٌ مِنْ قُرَيْشٍ يَجُرُّونَ شَاةً لَهُمْ مِثْلَ الْحِصَانِ، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَوْ أَخَذْتُمْ إِهَابَهَا؟ قَالُوا: إِنَّهَا مَيْتَةٌ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يُطَهِّرُهَا الْمَاءُ وَالْقَرَظُ»[٥].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤١٢٤، وابن ماجه: ٣٦١٢.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.

(٥) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤١٢٦.




**واتە: عالیەی کچی سوبەیع دەگێڕێتەوە: مەیموونەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ بۆی باس کردوە، کە کۆمەڵە پیاوێک لە قورەیش تێپەڕین بە لای پێغەمبەری خوادا ﷺ، مەڕێکیان ڕادەکێشا بە قەد ئەسپێک گەورە بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون: بۆچی پێستەکەیتان خۆشە نەکرد وتیان: ئەو مەڕە مرداربۆتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئاوو (الْقَرَظُ) پاکی دەکاتەوە، (الْقَرَظُ) (گەڵای داری بەڕوە وەرد دەکرێت ڕووکەشی پێستەکەی پێ پاک دەکرێتەوە).**

**٤٢٤٩-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُكَيْمٍ، قَالَ: قُرِئَ عَلَيْنَا كِتَابُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَأَنَا غُلَامٌ شَابٌّ: أَنْ لَا تَنْتَفِعُوا مِنَ الْمَيْتَةِ بِإِهَابٍ، وَلَا عَصَبٍ»[1].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عوکەیم دەڵێ: نوسراوی پێغەمبەری خوامان ﷺ بۆ خوێندرایەوە، من گەنجێکی تازە پێگەیشتوو بووم: نە سوود لە پێستی مردارەوە بوو وەربگرن، نە لە دەمارەکەیشی.**

**٤٢٥٠-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُكَيْمٍ ﷺ قَالَ: كَتَبَ إِلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَنْ لَا تَسْتَمْتِعُوا مِنَ الْمَيْتَةِ بِإِهَابٍ، وَلَا عَصَبٍ»[2].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عوکەیم دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نوسراوێکی بۆ کردین: نە سوود لە پێستی مردارەوە بوو وەربگرن، نە لە دەمارەکەیشی.**

**٤٢٥١-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُكَيْمٍ ﷺ قَالَ: كَتَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى جُهَيْنَةَ: أَنْ لَا تَنْتَفِعُوا مِنَ الْمَيْتَةِ بِإِهَابٍ، وَلَا عَصَبٍ، قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: أَصَحُّ مَا فِي هَذَا الْبَابِ فِي جُلُودِ الْمَيْتَةِ، إِذَا دُبِغَتْ حَدِيثُ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ عَنْ مَيْمُونَةَ وَاللَّهُ تَعَالَى أَعْلَمُ»[3].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عوکەیم ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوسراوی نارد بۆ لای هۆزی جوهەینە کە سوود لە پێستی مردارەوە بوو وەرنەگرن، هەروەها لە دەمارەکەیشی، ئەبو عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: ڕاسترین فەرموودە لەم بەشەدا، ئەوەیە**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤١٢٧ و ٤١٢٨، والترمذي: ١٧٢٩، وإبن ماجه: ٣٦١٣.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




پێستی مردارەوە بوو ئەگەر خۆشە کرا، (ئەوە پاکە)، فەرموودەی زوهری لە عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵا لە ئیبنو عەبباس لە مەیمونە، خوا زاناترە.

## مۆڵەت دان بە سوود وەرگرتن لە پێستی مردارەوە بوو ئەگەر خۆشە کرا

**٤٢٥٢-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَمَرَ أَنْ يُسْتَمْتَعَ بِجُلُودِ الْمَيْتَةِ إِذَا دُبِغَتْ»[١].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد سوود وەربگیرێ لە پێستی مردارەوە بوو ئەگەر خۆشە کرا.

## قەدەغەکردنی سوود وەرگرتن لە پێستی دڕندەکان (وەکو سەگ و بەرازو شێرو پڵنگ)

**٤٢٥٣-** «عَنْ أَبِي الْمَلِيحِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنْ جُلُودِ السِّبَاعِ»[٢].

واتە: باوکی مەلیح دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ بەکارهێنانی پێستی دڕندەکانی قەدەغە کرد.

**٤٢٥٤-** «عَنِ الْمِقْدَامِ بْنِ مَعْدِيكَرِبَ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْحَرِيرِ، وَالذَّهَبِ، وَمَيَاثِرِ النُّمُورِ»[٣].

واتە: میقدامی کوڕی مەعد یەکریب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەکارهێنانی حەریرو ئاڵتون و پێستی پڵنگی قەدەغە کرد. (کە لەسەر زین و کورتانی وڵاخ دادەنرا بۆ لووت بەرزی نەک هەموو پێستی پڵنگێک).

**٤٢٥٥-** «عَنْ خَالِدٍ قَالَ: وَفَدَ الْمِقْدَامُ بْنُ مَعْدِ يكَرِبَ عَلَى مُعَاوِيَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا فَقَالَ لَهُ: أَنْشُدُكَ بِاللَّهِ، هَلْ تَعْلَمُ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ لُبُوسِ جُلُودِ السِّبَاعِ، وَالرُّكُوبِ عَلَيْهَا، قَالَ: نَعَمْ»[٤].

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤١٣٢، والترمذي: ١٧٧١.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤١٣١.

(٤) صحيح.




واتە: خالد دەڵێ: میقدامی کوڕی مەعد یەکریب بە نوێنەری هات بۆ لای موعاویە (خوا لێیان ڕازی بێ) ئەویش پێی وت: سوێندت ئەدەم بە خوا، ئایا دەزانی پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەرکردنی پێستی درندەکان و سواربوونیانی قەدەغە کردوە، وتی: بەڵێ.

## قەدەغەکردنی سوود وەرگرتن لە بەزی مردارەوە بوو

**٤٢٥٦-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَامَ الْفَتْحِ وَهُوَ بِمَكَّةَ يَقُولُ: إِنَّ اللَّهَ ﷻ وَرَسُولَهُ حَرَّمَ بَيْعَ الْخَمْرِ، وَالْمَيْتَةِ، وَالْخِنْزِيرِ، وَالْأَصْنَامِ. فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ شُحُومَ الْمَيْتَةِ، فَإِنَّهُ يُطْلَى بِهَا السُّفُنُ، وَيُدْهَنُ بِهَا الْجُلُودُ، وَيَسْتَصْبِحُ بِهَا النَّاسُ. فَقَالَ: لَا، هُوَ حَرَامٌ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عِنْدَ ذَلِكَ: قَاتَلَ اللَّهُ الْيَهُودَ، إِنَّ اللَّهَ ﷻ لَمَّا حَرَّمَ عَلَيْهِمُ الشُّحُومَ جَمَّلُوهُ، ثُمَّ بَاعُوهُ، فَأَكَلُوا ثَمَنَهُ»[١].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: ئەو بیستوویەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی ڕزگارکردنی مەککەدا دەیفەرموو: خوا ﷻ و پێغەمبەرەکەی فرۆشتنی مەی و مردارەوە بوو بەرازو بتەکانیان قەدەغە کردوە، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئایا چی دەڵێی دەربارەی بەزی ئاژەڵی مردارەوە بوو، چونکە کەشتی پێ چەور دەکرێت، پێستەکانی پێ چەور دەکەن، وە خەڵکی دەیکەن بە ڕۆن و بۆ سووتەمەنی چرا بەکاری دەهێنن، فەرموی: (نا، ئەوە قەدەغەیە) پێغەمبەری خوا ﷺ لەو کاتەدا فەرمووی: (خوا ﷻ جولەکە بکوژێ، خوا کاتێ بەزەکەی لەسەر حەرامکردن ڕۆنەکەیان دەرهێناو، پاشان فرۆشتیان و نرخەکەیان خوارد).

## قەدەغەکردنی سوود وەرگرتن لەوەی خوا ﷻ قەدەغەی کردوە

**٤٢٥٧-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: أُبْلِغَ عُمَرُ أَنَّ سَمُرَةَ بَاعَ خَمْراً، قَالَ: قَاتَلَ اللَّهُ سَمُرَةَ، أَلَمْ يَعْلَمْ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَاتَلَ اللَّهُ الْيَهُودَ حُرِّمَتْ عَلَيْهِمُ الشُّحُومُ فَجَمَّلُوهَا، قَالَ سُفْيَانُ: يَعْنِي أَذَابُوهَا»[٢].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٣٦ و ٤٦٣٣، ومسلم: ١٥٨١، وأبو داود: ٣٤٨٦ و ٣٤٨٧، والترمذي: ١٢٩٧، وإبن ماجه: ٢١٦٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٢٣ و ٣٤٦٠، ومسلم: ١٥٨٢، وإبن ماجه: ٣٣٨٣.

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: بە عومەر ڕاگەیەنرا کە سەمورە ئارەقی فرۆشتووە، وتی: خوا سەمورە بکوژێ، ئایا نازانێ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا جولەکە بکوژێ، بەزیان لەسەر قەدەغە کرا هەڵسان ڕۆنەکەیان دەرهێنا، سوفیان وتی: واتە: تواندیانەوە.

## بابەت: مشک بکەوێتە ناو ڕۆنەوە

**٤٢٥٨-** «عَنْ مَيْمُونَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ فَأْرَةً وَقَعَتْ فِي سَمْنٍ، فَمَاتَتْ، فَسُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: أَلْقُوهَا وَمَا حَوْلَهَا وَكُلُوهُ»(١).

واتە: مەیمونە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: مشکێک کەوتە ناو ڕۆنەوە مردار بوویەوە، پرسیارکرا لە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: فڕێی بدەن و ئەوەیشی لە دەوروبەرێتی، پاشان بیخۆن.

**٤٢٥٩-** «عَنْ مَيْمُونَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سُئِلَ عَنْ فَأْرَةٍ وَقَعَتْ فِي سَمْنٍ جَامِدٍ، فَقَالَ: خُذُوهَا وَمَا حَوْلَهَا فَأَلْقُوهُ»(٢).

واتە: مەیمونە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پرسیارکرا لە پێغەمبەر ﷺ لە بارەی مشکێکەوە کەوتبێتە ناو ڕۆنێکی بەستوەوە، فەرمووی: بیگرن، وە ئەوەیشی لە دەوروبەرێتی و دواتر فڕێی بدەن.

**٤٢٦٠-** «عَنْ مَيْمُونَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ سُئِلَ عَنِ الْفَأْرَةِ تَقَعُ فِي السَّمْنِ، فَقَالَ: إِنْ كَانَ جَامِداً فَأَلْقُوهَا وَمَا حَوْلَهَا، وَإِنْ كَانَ مَائِعاً فَلَا تَقْرَبُوهُ»(٣).

واتە: مەیمونە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پرسیارکرا لە پێغەمبەر ﷺ لە بارەی مشکەوە بکەوێتە ناو ڕۆن، فەرمووی: ئەگەر بەستوو بوو مشکەکەو دەوروبەری فڕێ بدەن، وە ئەگەر شل بوو نزیکی مەکەونەوە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٥ و ٢٣٦ و ٥٥٣٨ و ٥٥٤٠، وأبو داود: ٣٨٤١ و ٣٨٤٣، والترمذي: ١٧٩٨.

(٢) صحيح.

(٣) شاذ.




**٤٢٦١-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ يَقُولُ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَرَّ بِعَنْزٍ مَيِّتَةٍ، فَقَالَ: مَا كَانَ عَلَى أَهْلِ هَذِهِ الشَّاةِ لَوِ انْتَفَعُوا بِإِهَابِهَا»[١].

واتە: سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: گوێم لە ئیبنو عەبباس (خوا لێی ڕازی بێ) بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ تێپەڕی بە لای بزنێکی مردارەوە بوودا، فەرمووی: ئایا نەدەکرا خاوەنی ئەم بزنە سوودی لە پێستەکەی وەربگرتایە.

## مێش بکەوێتە ناو قاپەوە

**٤٢٦٢-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِذَا وَقَعَ الذُّبَابُ فِي إِنَاءِ أَحَدِكُمْ فَلْيَمْقُلْهُ»[٢].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر مێش کەوتە ناو قاپی یەکێکتانەوە، با لەناویا نوقمی بکات.

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح. أخرجه من حديث أبي هريرة البخاري: ٣٣٢٠ و ٥٧٨٢، وأبو داود: ٣٨٤٤، وإبن ماجه: ٣٥٠٤ و ٣٥٠٥.

## ناوەرۆك

